# پەندوەرگرە لە ٩١٩

## چیرۆکی بەهێزو بەپێز



نووسینی: خالس مەولود

## ناسنامەی کتێب


ناوی کتێب: پەند وەرگرە

لە ٩١٩ پیرۆکی بەهێزو بەپێز

نووسینی: خالس مەولود

بابەت: کورتە چیرۆك

دیزاین: محمد حسێن خەتی

چاپ: یەکەم چاپ

ساڵی چاپ: ٢٠١٦

بڵاوکراوەی: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی-هەولێر

کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

دیزاین چاپکردن - بڵاوکردنەوە

٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨

٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧

عێراق - کوردستان - هەولێر





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٥٥) ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە



07504671394

Mdmaktaba@gmail.com

**پێشکەشە بە :-**

بە گیانی پاکی پێشەواو سەرداری مرۆڤایەتی (محمد) ی سەرومر ﷺ .

یارو یاوەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ کە لە چاکی و باشی دا بەشی شێریان بەرکەوتووە.

دایك و باوکم کە لەناو ئازارەکانی ژیاندا زۆریان چەشت .

هەموو ئەو مامۆستا بەڕێزانەی لەخزمەتیان تۆزقالێك زانست فێربووم

وە پێشکەشە بە مامۆستای بەڕێزم (م.عبدالقادر ابراهیم بالیسانی) ، پێش نوێژو وتار خوێنە لە مزگەوتی (سەفین) لە شەقلاوە ، کە هۆکاری ئەوە بوو بخوێنم بۆ خوێندنی مەلایەتی

**پێشەکی :**

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەرێنی مەزن درووودو سلاّو بۆ گیانی پاکترین دروست کراوی خوای گەورە (محمد المصگفی ﷺ ) ، سلاّو بۆ یارو یاوەرانی ئال و بەیتی بەرێزی.

چیرۆك لە هەموو کاتێکدا ڕۆڵ و کاریگەری هەبووە لە قورئانی پیرۆزدا چیرۆك بەشێکی پێك هێناوە بە شێوەیەك کە خوای گەورە چیرۆکەکەی (حەزرەتی یوسف)ی (علیه السلام) بە (أحسن القصص) ناو زەد کردووە ، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە چیرۆك کاریگەری بوەو دەبێ لە وتارو کۆڕو کۆبوونەوەکان دا.

ئەم نامیلکەیە (٩١٩) هەزارو یەك چیرۆکی بەهێزن لە چەندین تەوەرو بابەتی جیا کە لەچەندین پەرتووك دا کۆمان کردوونەتەوە ، بەم مەبەستەی کەلێنێکی بچووکی پەرتوکخانەی کوردی ئاوەدان بکاتەوەو وتاربێژو کەسانی تر سوودیان لێ ببینن و تکاکەری بارەگای خودای بالاّدەستم کەلێم قەبوڵ بفەرمووێت و بیخاتە تەرازووی چاکەکانمەوە.

**خالص مولود تۆفیق**

**پێش نوێژو وتار خوێن**

**١٤٣٦ی کۆچی ، ١٥ی نەورۆزی ٢٧١٥ی کوردی ، ٢٠١٥/٤/٤ی میلادی**

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

سوپاس و ستایشی بێ پایان و نەبڕاوە بۆ زاتی پاکی بەدیهێنەری گەردون (الله) خودای بوونەوەر کە مرۆڤ لەگەڵ ناوهێنانی چێژی ڕوحی وەردەگرێ ، ڕەحمەت و سلاو و دروودی خودا لەسەر جوانترین و پاکترین دروستکراوی خوای گەورە پێشەوامان (محمد المصگفی) ﷺ کە وەك چرایەکی ڕووناکی بەخش تاریکیەکانی نەهێشت ، هەروەها دروودی خودا بۆ یارو یاوەرە بەڕێزەکانی .

ئەم کتێبە کە (٩١٩) چیرۆکی لەخۆگرتووە بەناوی (چەند وەرگرە لە ٩١٩ چیرۆکی بەهێزو بەپێز) ، مامۆستا مەلا خالص کاوانی کۆی کردۆتەوە نوسراوێکە وەك ئاوێنەیەك ژیانی کەسانێك تیایدا دەبینی کەسوود گەلێك و ئەزموونێك لە ژیانیان دا فێردەبین.

بێ گومان ڕەنگە مامۆستا لەم کارە جوانەی دا ڕووبەڕووی ڕەخنەی هەندێك کەسان ببێتەوە کەخۆی بە چیرۆك خەریك کردووەو چیرۆك حەرامەو نابێت و بێ کەڵکن و زۆرێك لەم ڕەخنان دیارە ئەم کەسانە لە وتارەکانیاندا چیرۆك نابیسترێ ، ئەوان بۆ ئەم ڕایە ئەم فەرمایشتە دەهێننەوە (عن عوف بن مالك الاشجعي (رچي الله عنه) قال سمعت رسول الله ﷺ يقول لا يقص الا أمير أو مأمور أو مختال) ئەم فەرمایشتە لە ڕێگای (عبدالله بن عمر بن العاص)یشەوە هاتووە ، ئەوە مەبەست بێت ئەوەیە کە وشەی (مختال) واتە کەسانێك کە بە فیزەوە چیرۆك دەگێڕنەوە بۆ خۆدەرخستن ، پێغەمبەر ﷺ لەوە نەفی کردووە ، بەلام ئایا ئەم مامۆستا بەڕێزانەی لە پەرتووکەکانیان یان وتارەکانیان چیرۆك دەگێڕنەوە بۆ مەبەستی فیزلێدان و تەکەببور وا دەکەن یان بۆ سوود بینین و زیاتر کاریگەربوونی وتارەکە ؟!

چیرۆك یەکێکە لە شێوازەکانی ئاخاوتنی قورئانی پیرۆز (نحن نقص عليك أحسن القصص) (یوسف -٣-) ستایشی چیرۆك و بەسەرهاتەکەی کردووە بە (احسن القصص) ناوی هێناوە ، هەروەها لە سورەتی (الاعراف -١٧٦-) دا فەرمان بە چیرۆك هێنانەوە دەکات لە بانگەوازدا (فاقصص القصص لعلهم يتفكرون) بە شێوەیەکی گشتی چیرۆك هێنانەوە لە

پیشەی پێغەمبەران بووە (یا معشر الجن والإنس ألم یأتكم رسل منكم یقصون علیكم ئایاتی) (الانعام -١٣٠-) ئەمانەو لە چەندین ئایەتی تردا باسی چیرۆك كراوە ، لەم باسەدا دەتوانین چیرۆك بۆ دوو بەش دابەش بكەین (چیرۆكی ڕاست و چیرۆكی هەڵبەستراو) ڕەنگە هەندێك چیرۆك نووس هەبێت لە بیرو مێشكی خۆیەوە چیرۆك دەنووسێت و دروستی دەكات ، ئەوە ئەو بەشەیە كە ستایش كراو نیە لە ئیسلامدا ، ئەگینا چیرۆكێك لە قورئان بێت یان فەرمایشتێكی پێغەمبەر ﷺ یاخود كەسێكی باوەڕ پێكراو بینیبێتی ئەوە بێگومان كاریگەری خۆی بووەو هەیە دەشبێت .

باسێكی حاشا هەڵنەگرە كە وتارو بەرنامەكانی (مامۆستا شێرزاد عبدالوهاب) چەندە كاریگەرییان هەبووەو هەیە ، كەچی كەسێك بەناوێكی خوازراوەوە لە نامیلكەیەكی بچووكدا بەناوی (ناسنامەی بیدعەكاران) كارو بانگەوازی چەندین مامۆستای بەڕێزی دابەزاندۆتە ژێر سفرەوە ، ئەو ناوە خوازراوە ئەو هەمموو هەوڵ و ماندووبوونەی مامۆستا شێرزادی بەنیو دێڕ هەڵسەنگاندووەو دەڵێ : (شێرزاد عبدالوهاب ، حیزبی بیدعەكار ، قصاص —چیرۆك گێڕەرەوە-) !!!

یاخود وتارە بەپێزەكانی مامۆستا (فاتیح شارستێنی) كە بێ گومان زۆر چیرۆكی تێدایەو زۆریش كاریگەرو بەسوودو زانستین .

مامۆستا مەلا (خالص كاوانی)یش كارێكی باشی كردووە كە ئەم پەرتووكە دەبێتە یاریدەدەرێكی باشی وتار دان و سوودبینین ، خوای گەورە لێ ی قەبوڵ فەرمووێت و بیخاتە تەرازووی چاكەكانی و كاری جوانتری لەدوا بێت و لە گوناهەكانی هەموو لایەكمان خۆشبێت و كوردستانمان هەر ئاوەدان و ڕەنگین بێت.

**عبدالمجید هەریری**
**پێش نوێژو وتار خوێن**

### ١. پاداشتی ئەوە وەردەگری کە کردووتە

پیاوێك یەكێك دەكوژێ‌و فڕێی دەداتە چاڵێكەوە، پاش ماوەیەكی زۆر یەكێك پەیدا دەبێ لە كێشەكەیەوە، دەیەوێ ئەم بكوژێ، ئەویش ڕادەكات‌و نازانێ لە كوێدا خۆی بشارێتەوە، سەرەنجام دەچێتە ئەو شوێنەی كە خۆی پیاوەكەی تیا كوشتبوو، دوژمنەكەی هات‌و لەوێدا دۆزییەوەو لەهەمان شوێندا كوشتیەوە (الجَزاءُ مِن جِنسِ العَمَل) سزا بە گوێرەی جۆری كردەوەیە[1].

### ٢. هۆیەكانی جوانی مرۆڤ

پرسیاریان لە ئافرەتێكی ئیماندار كرد بەچی خۆت ئەوها جوان دەكەیت، ئایا چ شتێك بە كار دەهێنی؟ ئافرەتەكە گوتی: لێوەكانم بە ڕاستی‌و ڕاستگۆیی جوان دەكەم، (واتە: ڕاستگۆیی بەكاردەهێنم، بۆ دەنگم قورئان بەكار دەهێنم، بۆچاوەكانم ڕەحمەت‌و بەزەیی بەكار دەهێنم، بۆ دەستەكانم چاكەو ئیحسان بەكاردەهێنم، بۆ بەهێزیی لاشەم ئیستیقامەو بەردەوام بوون لەكارەكانم بەكاردەهێنم، بۆ دڵ‌و دەروونم نیاز پاكیی (ئیخلاص) بۆ خوا بەكاردەهێنم[2].

### ٣. نەرم‌و نیانی‌و گەورەیی‌و لێبوردەیی سەلەفی صالح

هاوەڵێكی پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێ شەو لەماڵیان میوان دەبێ، سەیر دەكات ئەو شەوە پێشەوا ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێ زۆر دەگریێ، بەیانی لێی دەپرسێ بۆچی ئەم شەو ئەوەندە گریای؟ ئەویش دەڵێ: بیرم لە لێدان‌و قامچیەكانی خەلیفە موعتەصەم كردەوە (كە كاتی خۆی پێشەوا ئەحمەدی بەند كردبوو)، لەلایەك‌و لەلایەكی تریشەوە بیرم لەم ئایەتە كردەوە كە دوێنێ لە وانەیەكدا بە قوتابیەكانم گوتەوە، كە دەفەرمووێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠ ﴾ الشورى، بۆیە منیش سوجدەم بۆ خوا بردو گەردنی هەموو

---

[1]) ژیانەوە ل ١٦٦.

[2]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن ل ٢٤٩، م. هارون نوح.

ئەوانەم ئازاد کرد کە ئازاریان داوم، ئێمە چ سوودێك وەردەگرین ئەگەر برایەکی مسوڵمان بەهۆی ئێمەوە سزا بدرێت، لە کاتێکدا ئەگەر لێی خۆشبین چاکترە چونکە خوا لێمان خۆش دەبێ[1].

### ٤. باشترین ڕەوشت

کوڕی لوقمانی حەکیم گوتی: باوکە چ ڕەوشتێك لە ئینسان لە هەمووی باشترە؟ لوقمانی حەکیم گوتی: ئایین، گوتی: ئەگەر ببن بە دوو؟ لوقمانی حەکیم گوتی: ئایینو سامان، گوتی: ئەگەر ببن بەسێ؟ لوقمانی حەکیم گوتی: ئایینو سامانو حەیا، گوتی: ئەگەر ببن بە چوار؟ لوقمانی حەکیم گوتی: ئایینو سامانو حەیاو ڕەوشت، گوتی: ئەگەر ببن بە پێنج؟ لوقمانی حەکیم گوتی: ئایینو سامانو حەیاو ڕەوشتو سەخاوەت، گوتی: ئەگەر ببن بە شەش؟ لوقمانی حەکیم گوتی: کوڕم ئەگەر کەسێك ئەم پێنج شتەی هەبێ ئەوەی پاکەو لە خوا ترسەو دۆستی خوایە لە شەیتان دوورە[2].

### ٥. گەورەیی و ئیعجازی قورئان

لە کاتی بەستنی کۆنگرەی هەشتەمی پزیشکی ئیعجازی زانستی قورئانو سوننەت لە وڵاتی سعودیەدا یەکێك لە گەورە زانایانی زانستی کۆرپەلە زانی (مارشاڵ جۆنسۆن) لە دوای گوێگرتن لەو باسو خواسانەی کە لەسەر ڕاستییەکانی زانستی قورئان دەدوێت، کە ئەویش چۆنیەتی دروست بوونی کۆرپەلەیە، گوتی: ئەگەر ئەو ڕاستییانەی کە بۆ ئێمەتان باس کرد لە پەرتووكو بەرنامەی ئێمەدا هەبوایە ئەوە (دنیامان هەڵدەگرتو پاشان دەماندایەوە بە زەوییدا) چۆن ئەو بەڵگەنامانەتان لایە لەسەر ڕاستی قورئانو پێغەمبەرەکەتانو ئینجا بێدەنگیشن؟[3].

---

[1]) بەهاری دڵان ل ١٤٦-١٤٧.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٧٩- ٢٨٠.

[3]) ڕاستیەکانی زانستی سەردەم ل ٣. دانانی عەبدوڕەحمان عەصاف چاپی یەکەم.

### ٦. قورئان وەڵامی هەموو پرسیارێکی تێدایە

جارێك كەسێك پرسیار لە مامۆستایەك دەكات دەڵێ: ئایا قورئان باسی هەموو شتێكی تێدایە؟ مامۆستاكەش دەڵێ: بەڵێ، كەسەكە گوتی: دەی لە یەك فەردە ئارد چەند نانی دەكەویتێ؟ مامۆستاكەش گوتی: باشە بەیانی وەڵامت دەدەمەوە، بەیانی مامۆستا هاتە لای كابراو گوتی: لەیەك فەردە ئارد ئەوەندە نانەی دەكەوێتێ، كابرا گوتی: كوا لە كوێ قورئان باسی ئەوەی كردوە؟ مامۆستا گوتی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ...فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النحل. منیش پرسیارم لە نانەوا كردا.

### ٧. سەركردەیەكی پاكو موجاهیدێكی كورد

پێشەوا صەلاحەددین ئەیوبی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ویستی فەتحی قودس بكاتو بە یەكجاری خاچ پەرستەكانی لێ دەربكات، بەبێ ئەوەی هیچ مەرجێكی لەسەر دابنرێ، هەندێك لە سەركردەكانی سوپاكەی هەرچەندە عەرەب بوون هەروەك زۆر لە سەركردە عەرەبەكانی ئەمڕۆ سەرو ساختیان هەبوو لەگەڵ دوژمندا، بۆیە ئایەتەكانی صوڵحیان بۆ صەلاحەددین دەخوێندەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ دوژمندا ڕێك بكەوێو ئاوی ڕووی خاچ پەرستەكان پارێزراو بێ، ئەویش تووڕەبوو داواكەی ئەوانەی دایە دواوە، گوتی: {أنا كُرْدي أفهَم القُرْآنَ أكثَر مِنْكُم} واتە: من كوردم لە ئێوە باشتر لە قورئان تێدەگەم، قودسیش فەتح دەكەمو بەیەكجاریش خاچ پەرستەكان دەردەكەم[1].

### ٨. ئایەتەكانی میرات یاساناسێكی جوولەكە مسوڵمان دەكات

مامۆستایەكی پسپۆڕ لە بواری یاسادا كە لە زانكۆیەكی ئەمریكی دا كار دەكات دەڵێ: لە دانوستانێكدا لەبارەی یاساوە مامۆستایەكی یاسایی جوولەكەمان لەگەڵدا بوو، كەوتە تانەو تەشەردان لە ئیسلامو مسوڵمانان منیش بۆ ئەوەی دەمكوتی بكەم لێم پرسی: ئایا دەزانی قەبارەی یاساكانی میرات لە دەستووری ئەمریكیدا چەندە؟ گوتی: بەڵێ، زیاترە لە هەشت بەرگ (مجلد)، منیش پێم گوت: ئەگەر یاسایەكی میراتت بۆ بهێنم كە لە (دە) دێڕ

---

[1]) لە خزمەت قورئاندا ل ٤.

زیاتر نەبێت ئەوسا بڕوا دەکەی کە ئیسلام ئایینێکی ڕاستەو هەقە؟ گوتی: هەرگیز شتی وا نابێ، منیش ئایەتەکانی میراتم لە قورئان بۆ دەرهێناو دامێ، پاش چەند ڕۆژێك هات بۆلام‌و گوتی: هەرگیز عەقڵی مرۆڤ ناتوانێ حیساب بۆ میراتی هەموو خزمان بکات بەو گشتگیرییەو کەسی لەبیر نەچێ‌و ئینجا بەشی هەریەکە لەو کەس‌و کارە بدات لە میرات، بەو عەدالەتەو بەبێ ئەوەی ستەم لە کەس بکات، پاشان مسوڵمان بوو.

بەڕاستی ئەمەیە گەورەیی‌و موعجیزەی قورئان‌و ئیسلام تەنها ئایەتەکانی میرات بەس بوو کە مامۆستایەکی بواری یاسای جوولەکەی پێ مسوڵمان بێ[1].

### ٩. قورئانی پیرۆز سەیر کردنیشی بەرەکەت‌و پاداشتە

د. طارق جمیل کە پسپۆڕی نەشتەرگەرییەو بۆردی ئەمریکی هەیەو یەکێکە لە بانگخوازەکان دەگێڕێتەوە دەڵێ:

بۆ کاری بانگەوازو گەیاندنی پەیامی خوا چووینە گوندێك لە پاکستان، لە مزگەوت بینیمان سەرداری گوندەکە تەوبەی کردووە لە خراپەو گەڕاوەتەوە لای خوا، خەریکی نوێژو خواپەرستییە، لێمان پرسی چی وای لێکردی ئاوا پەشیمان ببیتەوەو تەوبە بکەیت؟ گوتی: شوانێکمان هەبوو پیاوێکی پیری نەخوێندەواری خواناس بوو، کە مرد لەگەڵ تەرمەکەیدا چووین بۆ ئەوەی بە خاکی بسپێرین، کە خەریك بووین بیخەینە گۆڕەکەوە مەلای گوندەکەو خەڵکەکە سەریان سوڕما لەو بۆنە خۆشەی کە لەناو قەبرەکەیەوە دەهات، لێم بوو بە مەراق‌و چووم بۆ لای پیرێژنەکەی هاوسەری، گوتم: ئەو پیرەمێدەی تۆ چی دەکرد بێجگە لە نوێژو ڕۆژووە فەرزەکان، ئەویش گوتی: زیاتر لە نوێژو ڕۆژووە فەرزەکان هیچی دیکەی نەدەکرد، بەڵام بەیانیان دوای نوێژ، ئەو قورئانەی دادەگرت‌و لەسەر کۆشی دایدەنا، جا لەبەر ئەوەی نەیدەزانی بیخوێنێ پەنجەی دەهێنا بەسەر ئایەتەکانداو دەگریاو دەیگوت: خوایە گیان! ئەمەی لێرەدا دەیفەرمووی هەمووی هەقەو ئیمانم پێیەتی، ئەمانە

---

[1]) ژیانەوە ل٤١٢-٤١٣ ئەندازیار عوسمان.

هەمووی فەرمایشتی ڕاستی تۆن ئیتر هۆن هۆن فرمێسك بە چاویا دەهاتنە خوارەوە، بۆ زیاتر لە کاتژمێرێك ڕۆژانە ئەمە کاری بوو [1].

### ١٠. خۆشویستنی ئیسلام بریتیە لە فێربوونی قورئان

پیاوێك لەبەر خۆشەویستی ئیسلامو خەلیفەی مسولمانان پێی خۆشبوو هەمیشە لەبەر دەرگای خەلیفە عومەردا بێ خوا لێی ڕازی بێ، کە پێشەوا عومەر سەرنجی دا ئەو پیاوە زۆر دڵسۆزە، وای بە چاك زانی کە تێیبگەیەنێ، کە خۆشەویستی ئیسلام بریتیە لە فێربوونی قورئان، پێی گوت: بچۆ فێری قورئان ببە، کابرا ڕۆیشتو دەستی بە خوێندنی قورئان کرد، دوای ماوەیەك خەلیفە تووشی بوو لێی پرسی: لەبەرچی دیارنیت؟ گوتی: لە قورئان شتانێکم دەستکەوتووە ئیتر پێویستم بەبەردەرگای عومەر نیە[2].

### ١١. بە نیازی ڕەخنەگرتن سەیری قورئان دەکات بەڵام مسوڵمان دەبێ!

د. گاری ملیری کەنەدی مامۆستای زانکۆی مەلیك فەهدە لە بەشی نەوت لە وڵاتی سعودیەو زۆر حەزی بە زانستی ماتماتیك (ریاضیات)ە، زانیاریەکی تەواویشی هەیە لەبارەی کتێبە پیرۆزەکانەوە، یەکێکە لە موبەششیرە وریاو چالاکەکان... ڕۆژێك ویستی قورئان بخوێنێو لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکات، تاوەکو بە گومانی خۆی کەمو کورتیو ناتەواوییەکانی ئاشکرا بکاتو دڵی مسولمانانی پێ ساردبکاتەوە، وایدەزانی کە پەڕاوێکی کۆنی پێش چواردە سەدە باسی بیابانو ئەو زەمانە دەکات، کەچی سەرسام بوو لەوەی کە ئەو شتانەی لەم کتێبەدایە لە هیچ کتێبێکی دیکەدا نییە لە جیهاندا، وای دەزانی ئێستا باسی ئەو ڕووداوە ناخۆشانەی تیایە کە بەسەر موحەممەد ﷺدا هاتووە، وەك مردنی خەدیجەی خێزانیو مرنی منداڵەکانی، کەچی هەرچی گەڕاو لاپەڕەکانی پشکنی شتی وای نەبینی.

ئەوەی کە زیاتر سەرسامی کرد ئەوەبوو کە بینی سوورەتێکی تەواو بە ناوی (مەریەم)ەوە ناونراوە، کە هاوشێوەی نییە لە تەوراتو ئنجیلدا، لە کاتێکدا سوورەتێك نییە

---

[1]) لە خزمەت قورئاندا ل ٤١٤.

[2]) وتەی داناتانو زانایان ل ١٩٣.

بە ناوی (عائیشە) یان (فاطمة)ەوە، هەروەها دیقەتی دا کە (٢٥) جار ناوی پێغەمبەر عیسا هاتووە (علیه السلام)، بەڵام تەنها (٥) جار ناوی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە.

ئنجا زۆر زیاتر سەرسام بوو بە ئایەتی ژمارە (٨٢)ی سوورەتی (النساء) کە دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء، ئەم ئایەتە وای لێکرد بە چاکی بگەڕێ بە قورئاندا، بەڵکو کەم و کورتی و ناتەواوییەکی تیا بدۆزێتەوە، د. ملیر دەڵێ: هیچ نووسەرێك نییە لە دنیادا بتوانێ زاتی ئەوە بکات بڵێ نووسراوەکەم بگەڕێن هیچ هەڵەیەکی تیا نییە، دیارە ئەم قسەیە لە مرۆڤەوە نییە، فەرمایشتی پیرۆزی خوایە، هەروەها د. ملیر لەبەردەمی ئەو ئایەتە وەستا کە دەفەرموێ:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنبياء، گوتی: ئەم ئایەتە دەقاو دەق باسی ئەو تەقینەوە گەورەیە دەکات کە ئاسمانەکان و زەوی و ئەستێرەکانی لێوە دروست بوون...، کە وشەی (رَتْقًا )، باسی بەیەکەوە بوون دەکات، (فَفَتَقْنَٰهُمَا) (فتق)یش باسی لەیەك جیابوونەوە دەکات، هەروەها باس لە دروست بوونی هەموو زیندەوەرانیش دەکات لە ئاو، ئەمە بە هیچ جۆرێك لای کەس نەزانرا بوو، هەتا لەم ساڵانەی دواییدا، ئەو زانایەی وەك بیردۆزێك ئەمەی دۆزییەوە خەڵاتی نۆبڵیان دایە لەساڵی (١٩٧٣)دا بەڕاستی کەسێکی نەخوێندەواری پێش هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر ناتوانێ خۆی لەقەرەی دەنگ و باس و مەسەلەی ئاوا گرنگ بدات.

بەڵێ د. ملیر لە ساڵی (١٩٧٧)دا مسوڵمان بوو، کەوتە هەوڵ و کۆشش و وتاردان لەبارەی ڕاستییەکانی ئیسلام، جارێك لە وتارێکی دا بەرامبەر مسوڵمانان گوتی:

ئەی مسوڵمانان ئەگەر فەزڵی ئەوەی لاتانە بتانزانیایە لەچاو ئەوەی لای خەڵکی ترە، ئەوا سوجدەی شوکرتان دەبرد بۆخوا کە لەدایكو باوکی مسوڵمان دروستی کردوونو لەکەشو هەوایەکی مسوڵمانەتی دا گەورەبوون[1].

**١٢. لەبەر ئەوەی قورئان خوێندنو فێربوون قەدەغەبوو بزانە دەیانەوێ بەچ فێڵێك کەسێکی قورئان خوێن پەیا بکەن تا قورئانیان فێر بکەن.**

دوو کەسی خەڵکی یەمەن بۆ مەشقی سەربازیو خوێندن دەچنە ڕوسیاو لەوێ لەبەر ئەوەی خەڵکی وڵاتی عەرەبینو کەس نایانناسێتو بیروباوەڕیشیان لاواز بوو، بڕیار دەدەن بێ دڵی خۆیان نەکەنو سڵ نەکەنەوە لەکاری بەدڕەوشتی، بۆیە هەر چاو دەگێڕنو لەدەرفەت دەگەڕێن، ڕۆژێك کچێکی جوان دەبینن، لەدوورەوە ئاماژەیان بۆدەکاتو ئەوانیش بەخۆشیەوە ئەو جادەو ئەم جادە شوێنی دەکەون، تا دەگەنە ماڵێك، کچە دەچێتە ژوورەوەو یەکێکیشیان لە پێشدا دەچێتە ژوورەوە، گوایە ئەگەر وەزعەکەی بەدڵ بوو هیچ مەترسییەك نەبوو ئەوی تریش بەدوایدا بچێ، کە یەك بەدوای یەکداچوون لەناو حەوشەو باخێکدا پیرەژنێك دانیشتبوو، ئەوانیش کەلای پیرەژنەکە دانیشتن، ئەو کچەی کە ئاماژەی بۆکردبوونو ئیغرای کردبوون بەجلێکی سەرتاپۆشەوەو بەدوو پەرداخ شەربەتەوە زۆر بەشەرمەوە هاتو شەربەتەکەی پێشکەش کردنو بەجێی هێشتن، پیرێژنەکە لێی پرسین ئێوە خەڵکی کوێن؟ گوتیان: خەڵکی یەمەنین، گوتی: یەمەن... یەمەن... زۆر چاکە، ئنجا بەچاوی پڕ ئەسرینەوە گوتی: کوڕەکانم ئێمە لەو وڵاتەدا مەحرومین لەفێربوونی ئیسلامەتیو چاومان گێڕاوە کەسێکمان دەست بکەوێ عەرەبی بزانێو لێی ئەمین بینو خەبەرمان لێنەدات، بۆیە کە کچەزاکەم هەستی بە زمانی عەرەبی ئێوە کردبوو لەو ڕێگاو بانەدا کە هاتو چۆتان دەکرد، بەو فێڵە بانگمان کردن، تا خۆمو ئەو کچەزایەمو ئەو مناڵانە فێری قورئان خوێندنو نوێژ کردن بکەن چونکە بەڕاستی کاتی خۆی باوو باپیرانی ئێوە ئیسلامەتییان بۆ ئێمە هێناو لەو پێناوەدا شەهید بوون...

---

[1]) بەهاری دڵان، ئەندازیار عوسمان ل ٢٣١-٢٣٢.

ئەو دوو برادەرە هەروەك‌و لەبانێك بەریان دەیتەوە، لەجێی خۆیان سڕبوون ئەمان بۆچی هاتوون‌و ئەویش داوای چییان لێدەکات!!، سەرەنجام ئەو ڕووداوە وای لێکردن تەوبە بکەن‌و پابەند بن بە فەرمانەکانی شەریعەتەوە[1].

## ١٣. نیازپاکیی (ئیخلاص) بۆ خوای پەروەردگار

دەگێڕنەوە لە یەکێك لە غەزاکاندا پێشەوا عەلی کوڕو ئەبو طالب خوا لێی ڕازیبێ لەگەڵ پاڵەوانێکی بت پەرست دا زۆرانبازییان دەکرد، لە ئەنجامدا ئیمام عەلی دای بەزەوییدا ویستی بیکوژێت کافرەکە تفێکی لە دەم‌و چاوی پێشەوا عەلی کرد، ئەویش مەردانە وازی لێهێناو دەستبەرداری کوشتنی بوو، پیاوە بت پەرستەکە لەم کارەی ئیمام عەلی سەری سوڕماو پرسی بۆ کوێ؟ ئیمام عەلی پێی گوت: من لەبەر خاتری خوادا لەگەڵت دەجەنگام، بەڵام کە ئەو کارەت کرد (تف کردن)ەکە، ترسام ئەگەر بتکوژم، ئەوە تۆڵەسەندنی خۆمی لەگەڵ تێکەڵ بێ، لەبەر ئەوە لەپێناوی خوادا ئازادم کردی، کافرەکە وەڵامی دایەوە دەبوایە ئەو کارەم زیاتر کاری تێ بکردیتایەو خێرا بت کوشتمایە، جا مادام ئێوە ملکەچی فەرمانی دینێکن کە ئەوپەڕی چاوپۆشی تێدایە بێگومان دینێکی حەقە[2].

## ١٤. نیاز پاکی صەلاحەددینی ئەییوبی بۆ خوای کاربەجێ

پێشەوا صەلاحەددینی ئەییوبی ڕەحمەتی خوای لێبێ، ئەو هەموو نەخشە جوانەی دانا بۆ ڕزگارکردنی قودس، لێیان پرسی چۆن قودست ڕزگار کرد؟ گوتی: بە شەونوێژ، ئەو سیفاتانەی کە باسی دەکەین بە پاڕانەوەو بەتەوبە کردن بەڵام ئایا هۆکاری بەجێهێشتووە؟ نەخێر کتێب بخوێننەوە بزانن چ هۆکارێکی گرتووەتە بەر، بەجلی قەشەوەو بەخاچی ملەوە چەندەهای ناردووە بۆ ئەوەی بچنە قودسەوە، ئاوها مەفرەزەی خستۆتە ناویانەوە.

هۆکارەکانی هەموو جێبەجێ کردووە هێزی ئەو وەختەی هەموو بەکارهێناوە، بەڵام پشت بەستنی سەرەکی تەنها خوای گەورە بووە ، گوتی: بدەن لەیەك شوێن با ئەو دیوارە بڕوخێ، هەتا دەلاقەیەك کەوتە شورەی قودسەوە، ئەوانیش هەموو هێزەکانیان هێنا بۆ

[1]) بەهاری دڵان- ئەندازیار عوسمان ل ٦٦-٦٧.

[2]) ژیاننامەی ئیمامی عەلی خوا لێی ڕازی بێ- م. حبیب محمد سعید.

ئـەوەی کـەس نێتـە ژووریَ، صەلاحەددین گـوتی: بـا یـەکێك بەقەڵغانەکەیـەوە خـۆی بکات بــەناویانا، ئێمــەش دوای ئەکــەوین، قســەکەی تــەواو نــەکرد برادەرێــك خێــرا بەپەلــە بەقەڵغانەکەی چـوو بـەناویاناو ئەوانی تـریش بەدوایدا، خـوای گـەورە ئـەو ئینسانەی کـرد بەهۆکار کە قودس ڕزگاری ببێ، (١٩٧) ساڵ جەنگ کۆتـایی هـات، گەڕا بەشوێنیا پـاش دوو ڕکعەتی نوێژی شوکر، پرسی کێیە؟ کەسێك نەبوو بیناسی خەڵاتی بکات.

پاشـان نامەیـەکی بۆهـات کـە تیایـدا نووسـرابوو ئـەو کەسـە بـۆ خۆئاشـکراکردن سـێ مەرجی هەیە:

یەکـەمیان/ نـاوی نـەڵێی بەکـەس. دووەمیـان/ هـیچ خـەڵاتێکی نەکـەی. سـێیەم/ هـیچ پلەو پایەیەکی نەدەیتێو نزیك خۆیتی نەخەیتەوە.

هەر ئەو نامەیەو بەس تـا ئـەمرۆش کەسـێ نییـە بزانـێ ئـەو مـەردە دڵسۆزە کـێ بـوو؟ ناوی چی بوو؟ مێژوو ئەو کابرایە ناناسێ ئەوەیـە نیازپـاکی بۆخـوا، قـودس پـاش (١٩٧) سـاڵ ڕزگاری ئەبێت کەس نازانێ کێ ڕزگای کردووە[١].

## ١٥. ئارام گرتن

یـەکێك لـەهاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەواڵیان دایـە کـە کوڕەکـەت مـرد، گـوتی: پێشتر دەمزانی کە دەمرێت، گوتیـان چۆن؟ گوتی: ئـەی خـوا بەپێغەمبـەر ﷺ نافـەرمووێ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الزمر، تۆش دەمریتو ئەوانیش دەمرن[٢].

## ١٦. گەورەیی زیکری (لا إله إلاّ الله)

پێغەمبەر نوح (علیه السّلام) لەسـەرە مەرگیـدا دوو کوڕەکەی بـانگ کـردو فـەرمووی: من وەسیەتتان بۆ دەکەم، بەوەی کە فەرمانتان پێ بـدەم بـە دووشـتو جڵەو گیریتـان دەکـەم لەدووشت: کە هاوەڵ بۆخوا پەیداکردنو خۆبەزل زانینە لەبەردەم هەقدا، وە فەرمانەکەشـم بە (لا إله إلاّ الله)یە، کـە بەڕاسـتی ئەگـەر ئاسمانـەکانو زەویو هەرچی لەناویاندایـە لـەتای

---

[١]) میحراب م. شەماڵ موفتی ل ٢٩١- ٢٩٢.

[٢]) ژیانەوە ل ٤٣٥.

تەرازوویەکدا دابنرێن و (لا إلـه إلا الله)ش لـە تاکـەی تریانـدا دابنرێـت ئـەوا (لا إلـه إلا الله)ەکـە قورسـترە وە ئەگـەر ئاسمانـەکان و زەوی ئەڵقەیـەك بـن و (لا إلـه إلا الله) بخرێتـە سەریان دەیانشکێنێ[1].

### ١٧. گرنگی کات

(ذنون)ی مصری ڕەحمەتی خوای لێبێ، پێیان گوت عابیدێك چل ساڵە خواپەرستی دەکا، لەو ئەشکەوتە ئـەویش چوو بـۆ سـەردانی، چەندی قسە لەگەڵ کـرد جـوابی نـەداوە زەننون گوتی: تو ئەو خوایەی کە تۆی بێدەنگ کردووە چەند ساڵە عیبـادەتی خـوای گـەورە دەکەی لێرە؟ عابیـد گـوتی: ئـەوە ڕۆژێکە، زەننـون گـوتی: لەبـەر چـی؟ عابیـد گـوتی: لەبـەر ئەوەی دوێنێ ڕۆیشت، بەیانیش هێشتا نەهاتووە، کەواتە: هەر ئەمڕۆ شەرتە.

### ١٨. پشت بەستن بەخوای پەروەردگار

جارێك ئافرەتێك لە یەکێ لە سریەکاندا لەگەڵ سوپای مسوڵمانانـدا دەرچوو بـۆ غـەزا، لەماڵەوە هەندێ مەڕو بزنی بەجێهێشت، لەگەڵ دەرزییـەکی چنین، کاتێـك گەڕایـەوە بـینی بزنێـك لـەناو ماڵاتەکـەدا نـەماوەو بـزر بـووە، هـەروەها دەرزییەکـەش دیـار نـەماوە، گـوتی: پـەروەردگار تـۆ زەمانــەتی ئــەو کەســەت کــردووە کــە لەڕێگــەی تــۆدا غــەزا دەکــات، کــە پێداویسـتیەکانی بپـارێزی تـا دەگەڕێتـەوە مـن لـە پێنـاوی تـۆدا دەرچـووم، وا بزنێـك و دەرزییـەکم لـێ ون بـووە!!، ئنجـا ئافرەتەکـە داوای لـەخوا کـرد کـە شـتە ون بووەکـانی بـۆ بگێڕێتـەوە، بـە دڵێکی پـاکو بێگـەرد زۆر لـەخوا پاڕایـەوە، بـۆ بـەیانی ئافرەتەکـە بـینی دوو بـزن و دوو دەرزی وا لەماڵەکەیدایـە، ئەمـەش پاداشـتی متمانـەی ئـەو ئافرەتـە بـوو بـەخوای کاربەجێ، کە بەو شێوەیە پشتی بەخوا (سبحانە و تعالی) بەست[2].

---

[1]) بەهاری دلان ل ٤١٣.

[2]) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ل ١٢٢.

### ١٩. ئایا حەز بەبینینی پێغەمبەر ﷺ دەکەی لەخەودا؟؟

پیاوێـك دێتـە لای زانایـەکی خوانـاسو پێـی دەڵـێ: حـەز دەکـەم خـەو ببیـنم بـە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەویش پێی دەڵێ: ئاسانە سبەینێ بەڕۆژووبە، کە ئێوارە بەربانگت کردەوە نان بخۆ بەڵام چەند دەتوانی ئاو مەخۆرەوە، ئەویش بەگوێی دەکاتو ڕۆژێکی گەرم دەبێت، ڕۆژوو دەگرێـتو ئێـوارەش نـان دەخـوات بـەڵام ئـاو ناخواتـەوە، پاشـان کـە دەنوێـت چەند جارێك خـەون بـەئاوەوە دەبـینێو دادەچڵەکێ بـەیانی دێتـە لای زاناکەو مەسـەلەکەی بۆ دەگێڕێتەوە ئەویش پێی دەڵێ: ویستم تێبگەیت کە هەرکاتێ وەك چۆن دڵت لای ئـاوەو خەوی پێوە دەبینێ، دڵت لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـێو خـەمی بینینـت بێـت وەك ئاوەکە لەخەودا بەخزمەتی دەگەیت(١).

### ٢٠. خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن ژنە صەحابییەکانەوە

لەکاتی شەڕی ئوحود هەواڵ گەیشتە مەدینە کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ شـەهید کـراوە، ژنێـك لـە ئەنصـارییەکان بـەپیلی هەواڵەکـەوە چـوو، لـەڕێگادا بەسـەر تـەرمی بـابو کـوڕو مێردەکـەیو براکـەی تێپـەڕی، هەرچـواریان شـەهید کرابـوون، هـەرکاتێك دەگەیشـت بەتەرمێك دەیگوت: ئـەو تەرمـە کێیـە؟ دەیـانگوت: باوکـت، بـرات، مێـردت، کـوڕت، ژنەکەش دەیگوت: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ چـی لێهـاتووە؟ ئـەوانیش دەیـانگوت: ئـەوە لەپێشـتە هـەتاکو گەیشتە پێغەمبەر ﷺ لایەکی کراسەکەی گرت لەپاشان گوتی: بـابو دایکـم بـەقوربانت بـن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ باکم نییە مادەم تۆ سەلامەت بووی(٢).

### ٢١. خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ لەلای منداڵانی سەردەمی پێشەوا عومەر خوا لێی ڕازیبێ

جارێکیان چەند منداڵێکی خەڵکی بەحرەین یاریان بە تۆپێك دەکـرد، (ئەسـقف)ێك کە لەپلەی قەشە گەورەترەو نەگەیشتۆتە پلەی مطـران، پیاوی ئایینی مەسیحی بـەحرەین بـوو، لـەوێ دانیشـتبوو، لـەناکاو تۆپێـك بـەر سـنگی کـەوت، ئـەویش تۆپەکـەی لـێ زەوت کـردن، منداڵـەکان زۆر لێـی پاڕانـەوە تۆپەکـەیان پـێ بداتـەوە، ئـەویش نەیـدەداوە، یـەکێك لـە

---

(١) لەخزمەت قورئان ل ١٩٩.

(٢) هۆشیارکردنەوەی باوەڕداران لە پیلانی بێ باوەڕان م. ئەحمەد ل٤٤.

منداڵەکان گوتی: داوات لێدەکەم لەبەر خاتری پێغەمبەر ﷺ تۆپەکەمان بدەوە، بەڵام ئەو نەیدانەوەو جنێویشی بە پێغەمبەر ﷺ دا، منداڵەکانیش لەتاوی خاتری پێغەمبەر ﷺ بەدارەکانی دەستیان کەوتنە سەری ئەوەندەیان لێدا هەتا مرد، پاشان هەواڵەکە گەیشت بە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، پێشەوا عومەر گوتی: سوێند بەخوا ڕزگارکردنی هیچ وڵاتێكو دەستکەوتێکی گەورە بەئەندازەی کوشتنی ئەو (ئەسقف)ە لەلایەن ئەو منداڵانەوە عومەری دڵخۆش نەکردووە، پاشان گوتی: ئیسلام ئێستا بەرزو سەرفرازە، منداڵانێکی بچووك قسە بە پێغەمبەرەکەیان گوترا لەسەری تووڕە بوون، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، دوژمنێکی پێغەمبەری خوایان ﷺ لەناو برد[١].

## ٢٢. خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەڵێ: ئافرەتێك هاتە لای دایکی بڕواداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پێی گوت: دایە گیان گۆڕەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ پێشان بدە، دایکی ئیماندارانیش گۆڕەکەی پێشاندا، ئافرەتەکە ئەوەندە گریا بۆی تا گیانی دەرچوو[٢].

## ٢٣. شەونوێژی هاوەڵانی بەڕێزو خێزانەکانیان خوا لێیان ڕازی بێ

زەیدی کوڕی حاریث خوا لێی ڕازی بێ، لە خوا پەرستیدا شەوی دابەش دەکرد لەنێوان خۆیو کوڕەکانیدا، ئەگەر بینیبای یەکێکیان سستی هەیە، لەجیاتی ئەویش هەڵدەستاو شەوەکەی زیندوو دەکردەوە، ئەوەیە نموونەی خێزانی پاکو چاك هەمیشە هانی یەکتر دەدەن لەنێوان خۆیاندا لەسەر خواپەرستی[٣].

---

[١]) منداڵە ژیرەکان- یەعقوب حسێن ل٩١.

[٢]) صفة الصفوة م٢ ص ١٢٧.

[٣]) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ل٨٧.

**٢٤. بیلالی حەبەشی پێی خۆشە بمرێ تا بگاتە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی رضي الله عنهم**

کاتێ هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ بیلالی حەبەشی خوا لێی ڕازی بێ گەیشتە سەرەمەرگو گیانەڵڵا، کەمێ لەهۆش خۆی چوو، لەو کاتەدا خێزانەکەی وایزانی وەفاتی کردووە، بۆیە بەهەموو دەنگی هاواری کرد: ئای کە جێگەی خەفەتە، بیلال گوێی لێبوو چاودکانی کردەوەو گوتی: نەخێر جێگای خەفەت نییە بەڵکو ئای کە خۆشە گوتی:

(واطرباه غدا ألقى الأحبة محمدا وحزبه)[1].

**٢٥. سزای ئەو کەسەی بە قسە بەشداری کوشتن دەکات**

ڕۆژێ کاربەدەستی یەمەن یەعلای کوڕی ئومەییەی نارد بۆ لای پێشەوای مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێیان ڕازی بێ، دەربارەی کۆمەڵێك خەڵك کە بەشدار بوون لە کوشتنی منداڵێکدا، پێشەوا عومەر فەرمانی دا بە کوشتنی هەموو ئەوانەی کە بەشدار بوون لەکوشتنی ئەو منداڵە، گوتی: سوێند بەخوا ئەگەر خەڵکی صەنعا هەموویان بەشداربوونایە لەکوشتنەکە هەموویانم دەکوشتەوە، ئەو کەسەی هاوکاری یەکێ بکات لەبێ فەرمانیو خراپە وەکو ئەوە وایە خۆی کردبێتی، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس هاوکار بێ لە کوشتنی مسوڵمانێکدا بە نیوە وشەیەکیش بێ، کاتێ ددگا بەخوای گەورە لەنێوچەوانی نووسراوە بێبەش لە ڕەحمەتی خوا[2].

---

[1]) بگە بەکاروانی صالّحان- م. عمر توفیق ل ٣١٨.

[2]) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ل ٨٦. {«مَنْ أعانَ علَى قتلِ مُؤمنٍ بشطرِ كَلِمَةٍ لقيَ اللهَ عزّ وجَلَّ يوْمَ القيامَةِ مكْتوبٌ بيْنَ عيْنيْهِ آيسٌ من رحْمَةِ اللهِ.} ضعيفٌ جدًا. اخرجَهُ البَيْهقيُّ برقم: (١٥٦٤٣)، وابْنُ ماجَهْ برقم: (٢٦٢٠) عنْ أبي هُريرَةَ، قالَ البوصيري: هذا إسنادٌ ضعيفٌ، وأخرجَهُ الطبَرانيُّ برقم: (١١١٠٢) عن ابنِ عبَّاسٍ، قالَ الهَيْثميُّ: فيهِ عبْد الله بن خِراشٍ ضعّفَهُ البُخاريُّ، وقالَ: مُنْكَرُ الحَديث، سئِل أبو زرْعَة عن عبْد الله بن خِراشٍ قالَ: ليْسَ بشَئٍ، ضعيف الحَديث، ضعّفَهُ الدارقُطني، وقالَ النسائيُّ: ليْسَ بثِقَة.

### ٢٦. خۆشەویستی مسوڵمانان

لە جەنگی یەرمووکدا کۆمەڵێك لە ئەصحاب شەهید بوون لەوانەش عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، سوهەیلی کوڕی عەمر، حارثی کوڕی هیشام ﷺ، کۆمەڵێك لەنەوەی موغیرە بریندار بوون، پێش ئەوەی شەهید بن ئاویان بۆ هێنان، هیچیان لە ئاوەکەیان نەخواردەوەو شەهید بوون، چونکە کاتێ ئاوەکەیان بۆ عیکریمە هێنا تەماشای سوهەیلی کوڕی عەمری کرد ئاوەکەی نەخواردەوە گوتی: بیبەن لەوەوە دەست پێ بکەن، ئاوەکەیان برد بۆ سوهەیل، ئەویش سەیری کرد حارث تەماشای دەکا گوتی: بیبەن بۆ حارث بەو شێوەیە هەریەکەیان لەخۆی بورد بۆ ئەوی تریان، هەموویان شەهید بوون، بێ ئەوەی لەئاوەکە بخۆنەوە، لەوکاتەدا خالیدی کوڕی وەلید بەلایاندا تێپەڕی، گوتی هێندەی خۆم خۆشم دەوێن، خوا لە هەموویان ڕازی بێ[1].

### ٢٧. خۆشەویستی مسوڵمانان بۆ یەکتری

کۆمەڵێك مسوڵمان لە شوێنێکدا شەو مانەوە، برسییان بوو هەندێ نانی کەمیان لەلابوو بەشی نەدەکردن، نانەکەیان لەت لەت کردو ڕوناکییان کوژاندەوە تا هەرکەس بە ئارەزووی خۆی نان بخوا، پاش کەمێك ویستیان سفرەکە هەڵگرن چرایان داگیرساند بینیان نانەکە هیچ کەمی نەکردووە، لەبەر ئەوەی هەریەك لەلای خۆیەوە دەستی درێژ نەکردبوو بۆ ئەوەی هاوڕێکەی تێر بخوا، هەموویان لەخۆیان بوردبوو بۆ یەکدی[2].

### ٢٨. خۆشەویستی مسوڵمانان بۆ شەهید بوون

سەرۆکێکی کافرەکان پرسیاری لە سەربازێکی خۆیان کرد لەبارەی تێکشکاندنی کافرەکانو سەرکەوتنی مسوڵمانانەوە، سەربازەکە گوتی: ئێمە هەریەکەمان حەز دەکات هاوڕێکەی لە پێش خۆی بمرێ، بەڵام هەریەکە لە مسوڵمانەکان حەز دەکات کە خۆی لە پێش هاوڕێکەیدا بمرێ[3].

---

[1]) وتەی دانایانو زانایان – سەردار ڕەزا ل٣٥.

[2]) هەمان سەرچاوە ل٣٤.

[3]) هەمان سەرچاوە ل٢٥.

## ٢٩. شەو نوێژ

دەگێڕنــە یــەکێك لــە پیاوچــاکان ژنێکــی هــەبوو هەرچــەندجار ئــەو پیــاوە لەخــەو هەڵدەستا، ژنەکەی دەدیت وا خەریکی یادی خوایە (شەنوێژ دەکات)، شەوێك پێی گوت: دەوەرە ئافرەت تۆزێك بنوو بۆ شەوێك پشوو نادەی؟ ژنەکە لەوەڵامدا گوتی: گەورەم چۆن دەتوانم بنوم لەکاتێکدا دەزانم خۆشەویستەکەم بەخەبەرەو نەنوستووە، لەدواییدا پیاوەکە گوێی لەدەنگی ئافرەتەکە بوو بەدەنگەوە دوعای دەکردو دەیگوت:

ئەی خۆشەویستی دڵ تۆ لەدڵ نزیکتری

تۆ هاودەمی خزمو دۆستی لە هەنگوین شیرین تری

تۆ پزیشکی هەم دەرمانی ژیانی منی

بۆ هەموو دەردو نەخۆشی، هەر ئەتۆ دکتۆر تری

ڕۆژی ڕووناکو بەشەوقی بۆ کەسێ خۆشت بوێ

تاریکی نادینی لەژیان کات بەکات بەتین تری

هەرچەند ڕۆژێ ڕۆژ بەشەودا لەبەرچاو ئاوادەبێ

ڕۆژێ دڵ ڕوناکی گیانە قەت بەچاو نادیترێ

ڕاستە پەردەی تاریکی دێ ڕۆژت لێ ئاوا دەکا

خۆشەویستی خوا لەدڵدا هیچ زەمانێك نامرێ[1]

---

١) دۆستی باوەڕداران - صفوك سعدالله ل١٥٢.

### ٣٠. شەو نوێژ بۆ مرۆڤ خۆیەتی

خوا پەرستێك بەپیاوێکی گوت: شەوانە لە نیوە شەودا هەستەو خواپەرستی بکە، پیاوەکە گوتی: ئایا خوا پێویستی بەوە هەیە من بەو نیوە شەوە هەستمو خواپەرستی بکەمو خەو لەخۆم بزڕێنم؟ خواپەرستەکە لەوەڵامدا پێی گوت: نەخێر خوای پەروەردگار پێویستی پێ نییە، بەڵام ئێمە خۆمان پێویستمان بە پاداشتەکەی هەیە، پیاوەکە لەوەڵامدا گوتی: ڕاست دەکەی[١].

### ٣١. یارمەتی دانی یەکتر هۆکاری ئازادیە

سەلمانی فاسی خوا لێی ڕازی بێ کۆیلەیەکی خاوەندار بوو، گەورەکەی داوای لێکرد (٣٠٠) دار خورمای بۆ بنێژێ هەروەها (٤٠) ئوقیەشی پێ بدات، لەبەرانبەردا ئازادی دەکات، سەلمان چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺو بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: (یارمەتی براکەتان بدەن)، هاوەڵان کۆبوونەوە (٣٠٠) چڵە دارخورمایان پێداو گوتیان: بڕۆ چاڵیان بۆ هەڵکەنە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی هەرکاتێ تەواو بوو بانگی من بکەن تا بۆی بنێژم، هاوەڵان یارمەتیان دا لە چاڵ هەڵکەندندا، کاتێ تەواو بوو چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لەگەڵیان ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنە کە چاڵەکانیان لێدەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی پیرۆزی دارێکی ناشت سەلمان دەڵێ: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە تەنها یەك داری لێ ووشك نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پارچەیەك ئاڵتوونی پێدام کاتێك کە کێشام (٤٠) ئوقیە دەرچوو بردم بۆلای گەورەکەمو ئازادی کردم[٢].

---

[١]) وتەی دانایانو زانایان- سەردار ڕەزا ل١٥٢.

[٢]) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ل ٨٠-٨١.

### ٣٢. گریان لە ترسی خوای (عز وجل)

بە غالبی کوڕی عەبدوڵڵایان گوت: بۆ ئەوەندە دەگریت ناترسی چاوەکانت کوێر بن؟ گوتی: من قازانجی ئەوانم (چاوەکانم) دەوێ، دەمەوێ بەهۆی ئەو گریانە لە ئاگری دۆزەخ بیانپارێزم[1].

### ٣٣. گریانی ئافرەتێك لەترسی خوا

سابتی بەنانی دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئافرەتێك هەبوو ناوی بوردەی سەریمیە بوو لەترسی خوای پەروەردگار زۆر دەگریا، تا وای لێهاتبوو چاوەکانی تێکچوبوو، پێیان گوت: لەخوا بترسە!! ناترسی چاوەکانت بەتەواوی لەدەست بدەیت (کوێر ببیت)؟ لە وەڵامدا پێی گوتن: وازم لێ بێنن چونکە ئەگەر ئەهلی دۆزەخ بم (پەنا بە خوا) ئەوە خۆشم و چاوەکانیشم لەناو دەچن، خۆ ئەگەر ئەهلی بەهەشت بم ئەوە خوای گەورە لەوێ دووچاوی باشترم پێ دەبەخشێ لە چاوەکانی ئێستای خۆم زۆر جوانترو باشتر[2].

### ٣٤. ترسان لە هاتنی رۆژی قیامەت

بشری کوڕی مەنصور دەڵێ: لە خزمەت عەتای سولەمی دابووم خەریك بوو ئاگرم بۆخۆش دەکرد چونکە رۆژێکی تا بڵێی سارد بوو، رووم تێکردو پێم گوت: ئایا ئەگەر پێت بڵێن عەتا برۆ نێو ئەو ئاگرە، ئەگەر برۆیتە نێویەوە لە قیامەتدا زیندووت ناکەینەوە، ئایا وا دەکەیت؟

عەتا گوتی: بە پەروەردگاری کەعبە ئەگەر وام پێ بڵێن وادەکەم، پاشان گوتی: نەك هەر ئەوە وەڵڵاهی دەترسم لەخۆشیاندا نەگەمە نێو ئاگرەکە گیانم دەربچێ[3].

---

[1]) سۆمای دیدە ل ١٨٨.

[2]) بگە بە کاروانی صالحان- عمر تۆفیق ل ٢٩.

[3]) هەمان سەرچاوە ل ٢٣١- ٢٣٢.

## ٣٥. كە گوناهت كرد دوای تەوبە كردن دەبێ چاكەیەك بكەیت لەگەڵ كەسێكی نزیكت

جارێكیان پیاوێك گوناهێكی كرد پاشان زۆر بێتاقەتو پەشیمان بوو، سەرزەنشتی خۆی دەكرد بۆ وام كرد؟ بیری لەو تاوانە دەكردەوە ئایا تەوبەم بۆ هەیە یان نا؟ كابرا ناچار بوو ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا گوناهێكی گەورەم ئەنجام داوە ئایا تەوبەو پەشێمانیم بۆ هەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا دایكو باوكت هەیە؟ كابرا گوتی نەخێر، فەرمووی: ئەی پوورت هەیە؟ كابرا گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی دەی بڕۆ چاكەی لەگەڵدا بكە، ئا بەو شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەكات چاكە كردن گوناح دەسڕێتەوە، بۆیە با هەموومان سووربین لەسەری تا خوای بەبەزەیی لەگوناهەكانمان خۆش بێ[1].

## ٣٦. ترسان لە ئاگری دۆزەخ

خواردن خرایە بەردەم ڕابیعەی عەدەوی خوا لێی ڕازی بێ، لەو كاتەدا تەمەنی شەش ساڵان بوو، خواردنەكەی نەخوارد، باوكی لێی پرسی ئەوە بۆچی خواردنەكەت ناخۆی؟ ڕابیعە گوتی: نایخۆم تا نەزانم خواردنەكەت بە حەلاڵی پەیدا كردوە یان حەرامە؟ باوكی پێی گوت: باشە ئەگەر حەرام بێو لەو خواردنەش زیاتر شك نەبەیت چی دەكەی؟ ڕابیعە گوتی: بابەگیان لە دنیادا ئارام دەگرم لەسەر برسێتی چاكترە لەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا ئارام بگرم لەسەر ئاگر[2].

## ٣٧. ترسانی یەكێ لە هاوەڵان لە ناخۆشیەكانی دۆزەخ

سەهلی كوڕی سەعد بۆمان دەگێڕێتەوە كە ترسو لەرزێكی زۆر دەچێتە دڵی گەنجێكی ئەنصارییەوە، بەڕادەیەك كە هەرچی باسی ئاگر بكرایە دەستی بەگریان دەكرد، تا وای لێهات لەماڵ دەرنەدەچوو، ئەمە بۆ پێغەمبەر ﷺ باس كرا بۆیە تەشریفی برد بۆ لای، كە چووە ژوورەوە باوەشی بە پێغەمبەر ﷺ كرد، كەچی گەنجەكە گیانی لەدەستدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {هاوەڵەكەتان كفنو دفن بكەن، ترسی ئاگری دۆزەخ

---

[1]) چیرۆكی ڕەوشتە جوانەكان ل٦٧.

[2]) وتەی دانایانو زانایان- سەردار ڕەزا ل١٢٨.

جەرگی بڕیوە، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە خوا پەنای داوە لێی، هەرکەسێ شتێکی بیست هەوڵ بۆ ئەو شتە دەدا، هەر کەسیش لە شتێ ترسا لە دەستی هەڵدێو خۆی قوتار دەکات}[1].

### ٣٨. مافی دایكو باوك

ڕۆژێك لاوێك لەگەڵ باوكیدا چوون بۆلای ئەبی حازمی قازی بە نیازی شكانی كوڕەكە بە باوكی لەسەر ئەوەی هەندێ قەرزی لای باوكی بوو، قازی وتی: باوكت ماڵی هەیە؟ كوڕەكە وتی: نازانم، دووبارە قازی وتی: لەكەیەوە ئەم قەرزەت لای باوكتە؟ پیاوەكە وتی: لەو كاتەوە واتە: ماوەیەكی دیاری كرد، قازی وتی: كەواتە: تۆ لەو كاتەوە نەفەقەی باوكت دەدەیت لەبەر ئەوە كوڕەكەی بەند كردو باوكەكەی ئازاد كرد[2].

هەر لەسەر مافی دایكو باوك برایەك دەگێڕێتەوە لە ئوسترالیاوە ئەڵێت: كە من جار بەجار یارمەتی ئەنێرمەوە بۆ باوكم، خەڵكی ئەوێ سەریان سوڕ دەمێنێ، ئەڵێن چۆن حەقی خۆت دەدەی بە یەكێكی تر؟ ئەڵێم باوكمەو هەژارە، ئێمە لە وڵاتێكدا دەژین ئەگەر لای ئێوە لە (٩- ١٠٪) گەنجتان ئیشی نەبێ لای ئێمە لە (٨٥٪) زیاتر ئیشیان نیە، باوكم منی بەخێو كردووە پەكی كەوتووە، ناچێت بە عەقڵیاندا چۆن ئەو گرفتی هەیە تۆ بۆی چارەسەر دەكەی؟ ئەو (مەبدەئە) چی لێكردوون[3].

### ٣٩. مافی دایكو باوك لەلای كوڕو كچانی هەندەران

پرۆفیسۆر زەغلول نەجار دەڵێت: جارێك لەماڵی بازرگانێكی سعودی چاوم كەوت بە كۆمەڵێك جەنەڕاڵی ئەمریكی، دیار بوو حەزیان دەكرد شتێك لەبارەی ئیسلامەوە بزانن، یەكێكیان سەرنجی دابوو كە كەسێك دەهاتو دەناسێنرا دەگوترا ئەمە باوكی فلانەو برای فلانە. یان برازای فلانە، ئەو كەسە زۆر سەرسام بوو لە پەیوەندی خێزانی نێو موسوڵمانانو لە ڕێزی دایك باوك لای منداڵ، باسی خۆی بۆ كردینو گوتی: من چیم هەبوو لە كوڕو

---

[1] ژیاننامەی عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ- حبیب موحەممەد سەعید.

[2] سۆمای دیدە ل ٢١١ بەرگی ١.

[3] میحراب م- شەماڵ موفتی ل ٥٤٦.

کچەکەمدا سەرفم کرد، تا گەورەم کردنو خوێندنیان تەواو کرد، کەچی هەرکەسێکیان چوو بەلای ژیانی خۆیەوەو لێم ناپرسنەوە، ئەگەر لەسەری ساڵدا کارتێکی جەژنە پیرۆزەم بۆ بنێرن، ئیتر بەم کارتە وادەزانن هیچیان تێدا نەهێشتۆتەوە، ئەمە بێجگە لەوەی ناوم دەبەن بە پیرەمێردو هەرگیز پێم نالێن بابە!!، ئەمەش وای لە جەنەڕاڵەکە کرد کە مسولمان بێت[1].

٤٠. هەقی دراوسێ لەسەر دراوسێ

پێشەوا ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێبێ لەشاری کوفەدا دراوسێیەکی عەرەق خۆری دەبێت، ئەو دراوسێیەی هەموو شەوێك دەستی دەکرد بە گۆرانی گوتنو سەماکردن، بەزمو ڕەزمی ئەو پیاوە پێشەوای ناڕەحەت دەکرد، شەوێکیان ئەبو حەنیفە سەیر دەکات وەك شەوانی ڕابردوو ئەو هەرایە نەماوە دەبێ چی بووبێ؟ بۆ بەیانی دەپرسێت پێی دەڵێن قوربان لەخوا بەزیاد بێ پیاوەکە گیراوەو ئێستا لە زیندانە، پێشەوا ئەبو حەنیفە نەیگوت: بەخوا باشە نەجاتمان بوو لەو چەناگە شکاوە، نەخێر ئەو قسانە هەڵسو کەوتی دەروناسی ئیسلام نییە، بۆیە خۆی کۆکردەوەو بۆ لای والی کەوتە ڕێ، تکای ئازادکردنی ئەو لاوەی کرد کارمەندانیش داواکەی پێشەوا ئەبو حەنیفەیان نەشکاندو پیاوەکەیان بۆ ئازاد کرد، ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی کوڕە گەنجەکە وازی لە هەموو خراپەکارییەك هێناو تەوبەی کردو هاتە سەر ڕێگاکەی پێشەوا ئەبو حەنیفە[2].

٤١. مافی دراوسێ

عەبدوڵڵای کوڕی عامر خانوویکی لە خالیدی عوقبە کڕی کە لەبازاڕەکەدا بوو، بەنەوەد هەزار درهەم کاتێ شەو داهات عەبدوڵڵا گوێی لە گریانی خێزانی خالید بوو بۆیە بە خێزانەکەی گوت: ئەوە بۆچی دەگریەی؟ گوتی: ئەوە بۆ خانووەکەیان دەگریت، عەبدوڵڵا بە کوڕەکەی گوت: بڕۆ پێیان بڵێ: خانووەکەشو پارەکەش هەمووی بۆخۆیان[3].

---

[1]) ژیانەوە ل ٤٢٢. — ئەندازیار عوسمان.

[2]) هونەری هاوڕێ گرتن ل ٩٨.

[3]) وتەی دانایانو زانایان ل ١٠١.

**٢: پیرۆزو بەرەکەتی مزگەوت**

جارێکیان کابرایەك نەخۆش دەکەوێت چەند دکتۆری پێ دەکرێت کەچی هەر چاك نابێتەوە، دکتۆرەکان گوتیان: بیبەنەوە ماڵ تا خوا ڕەحمی خۆی پێدەکات، ئامانەتی خۆی لێ وەردەگرێتەوە (واتە: دەمرێ)، کە کابرایەکەیان بەرەو ماڵ هێنایەوە پێش ئەوەی بگاتەوە گوتی بمبەنە نێو مزگەوتێ، (دیارە مزگەوت لە ماڵیان نزیك بووە)، دەڵێ: کە جێیان هێشت پاشی نیو سەعات بەپێی خۆی هاتەوە ماڵ، لێیان پرسی چۆن چاك بوویتەوە؟ گوتی بەیەکی فێنك هات خوای بەبەزەیی بەو بایە فێنکە شیفای بۆ هێنام‌و چاکی کردمەوە[1].

**٣: نوێژی جەماعەت**

سێ کەسی خەڵکی یابان چوون بۆ وڵاتی مصر، یەکێکیان مامۆستای قۆناغی ناوەندی بوو. یەکێکی تریان پزیشك، ئەوەی تریشیان بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك، چوون بۆ ئەزهەر بۆ دیراسەتی ئیسلام پاش ئەوە بوون بە مسوڵمان، هۆی مسوڵمان بوونی ئەو سێ کەسە، تێبینیان بوو بەلای مزگەوتی (طوکیو)دا، کاتی نوێژی جەماعەت بوو چۆنیەتی ڕیز بوونی مسوڵمانان بەیەکەوەو جووڵەکردنیان دوای ئیمام بوو بەهۆی ئەوەی بیر بکەنەوەو بزانن ئەمانە کێن؟ چ دینێکن؟ پێشەوایان کێیە؟ پاکو خاوێنی مزگەوتەکەو ئیمانداران‌و چۆنیەتی ڕیز بوونیان لە هیچ دینێکی تردا نییە، چوون پرسیاریان کرد لە هاوزمانانی خۆیان لە مسوڵمانە یابانییەکان، بۆیان باس کردن کە ئیسلامەتی چییە، وردە وردە دیراسەی ئیسلامیان کرد باسی کرداری چاك‌و شوێنی کرداری چاك لە شەریعەتدا زۆر سەرنجی ڕاکێشان‌و وای لێکردن کە ئیمان بهێنن[2].

هەر سەبارەت بە نوێژی جەماعەت ئەگێڕنەوە کە سولتان موحەممەد خان بانگیان کرد بۆ شایەدی، بۆ لای قازی موحەممەد حەمزە، بەڵام ئەو شایەدییەکەی لێ وەرنەگرت‌و

---

[1]) سۆمای دیدە.

[2]) میحراب- م.شەماڵ موفتی ل ٥٨.

پێی گوت: تۆ تەرکی نوێژی بە کۆمەڵت کردووە، ئیتر پاشا مزگەوتێکی لە کۆشکەکەیدا دروست کرد هەمیشە نوێژی بە کۆمەڵی تێدا دەکرد تا وەفاتی کرد[1].

هەروەها دەگێڕنەوە جارێکیان عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕەحمەتی خوای لێبێ لە قۆناغی منداڵیدا، لەنوێژێکی جەماعەت دوادەکەوێت، کە مامۆستا لەهۆی دواکەوتنی پرسیاری لێکرد؟ ئەویش تێیگەیاند کە خەریکی چاکردنو داهێنانی قژی سەری بووە، مامۆستاکەش دووبارە پرسی: ئەوەت بەلاوە گرنگ تربوو لەنوێژی جەماعەت؟ لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ باوکی لە میصر ناردو ئاگاداری ئەو دواکەوتنەی کرد، باوکیشی دەست بەجێ پیاوێکی ڕەوانەی مەدینە کردو بەر لەوەی قسە لەگەڵ عومەردا بکات سەری تاشی، کە مامۆستاو باوکی ئەو کارە لەگەڵ عومەردا دەکەن ئەو قژە ڕێکو پێکانەی دەتاشن، عومەریش ئەوپەڕی خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بەو سەرتاشینەی بۆ ئەوەی ببێتە کەفارەتی ئەو تاوانە تا فێری ئەوەش ببێ گوێڕایەڵی مامۆستاکەی بێت[2].

## ٤٤. چۆن کەسی بەرانبەر دەناسی؟

پیاوێك لای پێشەوا عومەر ﷺ گوتی: فلانە کەس پیاوی چاکەو ڕاستگۆیە، پێشەوا عومەر لێی وەدەنگ هاتو پێی گوت ئایا لەگەڵ ئەو پیاوە سەفەرت کردووە؟ گوتی نا، فەرموی: ئایا لەمابەینی تۆو ئەو پیاوە هیچ کێشە ڕووی داوە؟ گوتی: نا، گوتی ئایا کردۆتە ئەمیندار لەسەر شتێك؟ گوتی: نا، گوتی مادەم لەخۆتەوە تەزکیەی هیچ کەس مەکە کەهیچ زانستێکت دەربارەیەوە نییە، تەنها ئەوەندەیە بینیوتە لەمزگەوت سەری خۆی بەرز دەکاو نەوی دەکا، ئەو بینینەش بۆ ناسینی کەسێك بەس نییە[3].

---

[1]) سۆمای دیدە بەرگی ١ ل٢١٧.

[2]) وتەی دانایانو زانایان ل ١٤٩.

[3]) ژیاننامەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب- حبیب محمد سعید ل٢٦٧.

**:: تامەزرۆیی بۆ بەهەشت**

ھاودڵی بەرێزی پێغەمبەری خوا ﷺ جابر لە غەزای ئوحوددا بە عەبدوڵڵای کوڕی دەڵێ: کوڕم تۆ لەلای دایكو خوشکەکانت بمێنەرەوە، با من شەهید بم، لەوەڵامدا عەبدوڵڵا دەڵێ: باوکە بۆ هەموو شتێك بەگوێت دەکەم بەڵام ئەوەیان بەهەشتە بەهەشت!! خوا لێیان ڕازی بێ[1].

**:: گیانت بە نرخە هەرزان فرۆشی نەکەی**

حەسەنی بەصری ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: {نەفسی تۆ بە نرخە ئەی مرۆڤ بە بەهەشت نەبێ مەیفرۆشە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کەس نەفسی خۆی تاڵان فرۆش دەکات...}[2].

**:٧ ڕەوشت بەرزی مسوڵمانان دەبێتە هۆی مسوڵمان بوونی گاورێك**

عەمر خالید دەڵێ: ساڵی ١٩٨٨ کۆلێژی بازرگانیم لە قاهیرە تەواو کرد، بۆ ماوەی ...ێك لەگەڵ چەند برادەرێك لە وڵاتی بەریتانیا کارمان کرد، ئافرەتێکی ئینگلیزمان ...گەڵدا بوو، برادەرەکان کە بە تەنیا دەبوون بە عەرەبی قسەیان دەکرد، ئەو کاتانەی ...فرەتەکە لەگەڵیان بوایە بە زمانی ئینگلیزی قسەیان دەکرد بۆ ئەوەی ئەویش تێبگاتو ...ێ شتێك نەکات، ئافرەتەکەش پاش ماوەیەك هەستی بەمە کردو لەو بارەیەوە پرسیاری ...ێکردن ئەوانیش گوتیان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێداوین کە لە شوێنێکدا ئەگەر ...ێ کەس بوون دووانیان چرپە نەکەنو نەبنە هۆی دڵەڕاوکێ بۆ کەسی سێیەم، ئافرەتەکە ...ەم ڕەفتارەی زۆر پێ جوان بوو، گوتی: بەڕاستی پێغەمبەرەکەتان زۆر شارستانی بووە، ...ش شەش مانگ ئافرەتەکە مسوڵمان بوو، لەبارەی هۆی مسوڵمان بوونەکەشیەوە گوتی: یەکەم شتێك کە کاری تێکردم لەو دینەدا ڕەفتاری جوانو مامەڵەی شارستانی بوو لەگەڵ هەموو خەڵکیدا، کە مسوڵمانانی لەسەر پەروەردە دەکات[3].

---

[1]) میحراب ل ٤٩١.

[2]) ژیانەوە ل ٦.

[3]) ژیانەوە ل ٥٠.

## ٤٨. بەرپرسیارەتی

ڕۆژێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ سەردانی شاری (حمص)ی کرد، لەناو ئاپۆڕای خەڵکیدا پرسیاری لەبارەی سەعیدی کوڕی عامری کرد کە بەرپرسی ئەو شارە بوو ئاخۆ خەڵك چی دەڵێن دەربارەی؟

هەندێ کەس سکاڵایان لێی هەبوو، بەڵام بەهۆی ئەو سکاڵایەوە لایەنێکی سەرسوڕهێنەری ئەو پیاوە دەرکەوت، پێشەوا عومەر داوای لەو کەسانە کرد کە سکاڵایان هەبوو خاڵەکانی سکاڵاکانیان بخەنە ڕوو، قسەکەرێك بەناوی ئەو کۆمەڵە هەستایەوەو گوتی: چوار سکاڵامان لەسەری هەیە:-

١- تا ڕۆژ نەبێتەوە نایەتە دەرەوە بۆ لامان!

٢- بەشەو وەڵامی هیچ کەس ناداتەوە!

٣- لە مانگێکدا دوو ڕۆژی هەیە نایەتە دەرەوەو نایبینین!

٤- ناوە ناوە بێ هۆش دەبێ دەبوورێتەوە هەرچەندە لە دەستەڵاتی ئەو نییە بەڵام ئەو حاڵەتە ئێمەی بێزار کردووە!

قسەکەرەکە ئەوەندە قسەیەی کردو دانیشت، پێشەوا عومەر بۆ ماوەیەك بێ دەنگ بوو لەپاشان ڕووی لەخوا کردو بەچرپەوە دەیگوت: {خوایە من وەك یەكێ لەچاکترین بەندەکانی تۆ ناسیومە، خوایە ئەو گومانەی من بۆ ئەو هەیتم ڕاست دەربچێ} .

ئنجا بانگی کرد تا بەرگری لە خۆی بکات سەعید گوتی: سەبارەت بە سکاڵای یەکەمیان کە دەڵێن تا ڕۆژ نەبێتەوە نایەتە لامان، سوێند بە خوا پێم خۆش نەبوو باسی هۆیەکەی بکەم، بەڵام دەبێ ڕوونی بکەمەوە، سوێند بە خوا خێزانەکەم خزمەتکاری نییە، خۆم هەویری بۆ دەشێلم، ئنجا چاوەڕێ دەکەم تا هەویرەکە هەڵدێ، ئنجا نان دەکەم، دوای ئەوەی دەستنوێژ دەگرم بۆ نوێژی چێشتەنگاو، پاشان دێمە دەرەوە بۆ لای خەڵکەکە.

ڕوخساری پێشەوا عومەر گەشایەوەو گوتی: سوپاس بۆخوا، ئەی سەبارەت بەهی دووەمیان؟

ـــەعید درێــژەی بەقســەکانی داو گــوتی: ئەوەشــی کــە دەڵــێن بەشــەو وەڵامــی کــەس ـ ـ تەوە. سوێند بەخوا پـێم خـۆش نـەبوو باسـی هۆیەکـەی بکـەم، بـەڵام ناچـار کـرام، لەبـەر ـەوەیە من ڕۆژم داناوە بـۆ ئـەوانو شـەویش بـۆ پـەروەردگارم، سـەبارەت بـەوەش کـە دەڵـێن: ئەوە لە مانگێکدا دوو ڕۆژم هەیە ناچمە دەرەوە بـۆ لایـان، لەبـەر ئەوەیـە خزمـەتکارم نییـە جگە لە بەرگەکانم بـۆ بشـوات، جلو بـەرگی دیکەشـم نییـە تـا بیگـۆڕم، هەربۆیـە خـۆم جلو بەرگەکانم دەشـۆمو چـاوەڕوان دەکـەم تـا ماوەیـەك بـۆ ئـەوەی وشـك دەبێتـەوە، لـەکۆتایی ڕۆژەکەدا دەچمە دەرەوە بۆلایان، ئەوەشی کە دەڵێن نـاو بـەناو بێهـۆش دەبم، لەبـەر ئەوەیـە ـەنێر خوبــەیبی ئەنصــاری بــووم لەمەککــە کــاتێ قــوڕەیش گۆشــتەکەیان لێــدەکردەوە ـــتبوویانە ســەر حوشــترێك پێیــان دەگــوت: پێــت خۆشــە موحەممــەد ئێســتا لەشــوێنی تۆبوایــە؟ تــۆش لەشــوێنی ئــەو بووایــەو ســەلامەت بــووای، لەوکاتــەدا وەڵامــی دەدانــەوەو ـیگوت: سوێند بەخوا پێم خۆش نییـە لـەنێو مـاڵو منداڵـەکانم بم، پێغەمبـەری خـوا ﷺ ـ ڕکێـك بچێ بەپێیدا.

بۆیە هەرکاتێك ئەو دیمەنەم دێتەوە یاد ئـەو کـات مـن هێشـتا نـەبووبووم بـە مسـوڵمان ـەتـوانی خوبەیب لەدەستیان دەربێـنم بـەڵام نـەمکرد، لەترسـی سـزاو ئەشـکەنجەی خـوادا ـەلەرزمو لەهۆشی خۆم دەچم.

قسـەکانی سەعید کۆتایی هات پێشەوا عومەر خۆی پێ ڕانـەگیراو لەخۆشـیاندا بـەدەنگی ـەرز گوتی: {سوپاس بۆ ئەو خوایـەی کە پێشبینیو گومانەکەمی بەهەڵـە نـەبرد} دەسـتی ـەعی سـەعید کردو نێوچەوانی ماچ کرد[1].

## ٤: بەرپرسی ستەمکار

دەگێڕنەوە حەکیمێکی چینی لەگەڵ چەند قوتابییەکیدا بەکێوەکانـەوە دەژیـان، ڕۆژێـك ـەدەوروەدوە ئافرەتێکیان بینی، کـە لێـی نزیـك بوونـەوە سـەیر دەکـەن ئافرەتەکە بەسـەر سـێ گۆڕدا دانیشتوەو دەگری، لێیان پرسی: ئەو سـێ مـردووە چـی تـۆن وا بـەکوڵ بۆیـان دەگـری؟ ئەویش لەوەڵامدا گوتی: ئەمەیان گۆڕی باوکمەو ئەو دوانەشیان گۆڕی براکـەمو مێردەکەمـە،

---

[1] ژیاوانی دەوری پێغەمبەر ل ۱۸۱-۱۸۲-۱۸۳ خالید موحەممەد خالید.

گوتیان: بەچی مردوون؟ گوتی: گیانداری درندەی ئەو کێوانە هەموویانی لەناوبردوون، گوتیان: ئەی تۆ چی دەکەی لێرەو بۆ ناچی بۆناو شار؟ تاوەکو تووشی هەمان دەرد نەبی؟ ئافرەتەکە دەڵێت چونکە لەشار دەستەڵاتدارێکی زاڵمی لێیە لەترسی ئەو هەڵهاتووین لێرەدا حەکیمەکە بە قوتابییەکانی دەڵێ: بزانن کە کاربەدەستە زاڵمەکان لە گیاندارە درندەکانی ئێرە بێ بەزەییترن[1].

٥٠. بەرپرسی پاکو چاک

ڕۆژێکیان پیاوێک چوو بۆلای بەرپرسی مسوڵمانان (موسلیمی کوڕی قوتەیبە) سەبارەت بە پێویستییەکی خۆی، پیاوەکە شمشێرێکی بەدەستەوە بوو لەکاتی قسە کردنەکەدا، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات نووکی شمشێرەکەی خستبووە سەر پێی موسلیم، بەشێوەیەك برینداری کرد خوێنی لێهەدەهاتە خوار، بەڵام موسلیم هیچ قسەیەکی نەکردو خۆی تێك نەدا، ئارامی گرتو پێی نەگوت شمشێرەکەت لابە، لەکاتێکدا زۆر ئاسایی بوو ئەگەر پێی بگوتایە، پاش ئەوەی پیاوەکە قسەکانی تەواوکرد ڕۆیشت، موسلیم داوای پارچەیەك قوماشی کرد بۆ پاك کردنەوەی برینەکەی، لەو کاتەدا پرسیاریان لێکرد: بۆچی قاچت لانەبرد بۆ ئەوەی بریندار نەبووایە، یان داوات لێکردبا شمشێرەکەی لابردایە، موسلیمیش لەوەڵامدا فەرمووی: لەوە ترسام کە قسەکەی پێببڕمو پێویستیەکەی خۆی نەڵێت[2].

٥١. مافی ژن لەسەر پیاو

یەکێك لە پیاوچاکان خێزانەکەی ئافرەتێکی خراپ بوو، ژیانی لێ تاڵ کردبوو، بۆیە یەکێك لە هاوڕێکانی پێی گوت: تەڵاقی بدەو خۆتی لێ ڕزگار بکە، لەوەڵامدا گوتی: ئاخر دەترسم تەڵاقی بدەمو پیاوچاکێکی تری پێ گیرۆدە بکەم، هاوڕێکەی گوتی: ئەی چارت چییە؟

---

[1]) سۆمای دیدە بەرگی ١ ل ٢٩٥.

[2]) سۆمای دیدە ب١، ل١٤٢.

پیاو چاکەکە گوتی: ئارام دەگرم لەبەر ئەو قسەیەی کە دەڵێ: هەر پیاوێك ئارام بگرێ لەسەر خراپی هاوسەری خوای پەروەردگار پاداشتی وەك ئەییوبی پێ دەبەخشێ، هەر ئافرەتێکیش ئارام بگرێ لەسەر خراپی پیاوەکەی خوای گەورە وەك ئاسیای خێزانی فیرعەونی پێ دەبەخشێ[1].

### ٢: چاکەکردن بۆ چارەسەری نەخۆش

زانایانی رۆژئاوا وا بەچاك دەزانن کە نەخۆش خێر بکاتو یارمەتی کەسانی تر بدات، بەم کارەیان دەزگای بەرگری لەشیان بەهێز دەبێو زووتر چاك دەبنەوە، ئەو ڕاستیەش (د. وزنیسن) جەختی لەسەر دەکاتەوە، جارێك دوو نەخۆش کە دژایەتی یەکتریان دەکرد داوای لێکردن کە هەریەکەیان جلی ئەوی تربشواو هاوکاری یەکتر بکەن تا زووتر چاك ببنەوە.

لێرەوە گەورەیی ئەو فەرموودەیەی حەزرەت ﷺ تێدەگەین کە دەفەرموێ: {دَاوُوا مَرْضَاكُمْ بِالصَّدَقَةِ}[2]، واتە: نەخۆشەکانتان بەخێرو چاکە کردن چارەسەر بکەن، یان دەفەرموێ: صیلەی ڕەحمو سەردانی خزمو کەسو چاکەکردن دەبێتە مایەی تەمەن درێژی[3].

### ٣: ئارام گرتنی ژن لەگەڵ پیاوی خۆی

پیاوێك لە ژنەکەی تووڕە بوو پێی گوت: پەیمان بێ دەبێ ژیانت لەسەر گران بکەم، ژنەکەش زۆر بەهێمنیەوە گوتی: ناتوانیت ژیانم لەسەر گران بکەیت مێردەکەی پێی گوت: بۆچی؟ ژنەکە گوتی: ئەگەر بەختەوەری لەساماندا بێت ئەوا بێ بەشت کردووم، ئەگەر لەزێڕو خشڵو ملوانکە دابێت هەر بێ بەشت کردووم، بەڵام بەختەوەری لە شتێکدایە

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن.

[2]) السنن الكبرى للبيهقي، حديث حسن.

[3]) ثبت علميا- مؤلف محمد كامل عبدالصمد و الشخصية المغناطيسية، مهندس علي غانم الطويل ص١٢٣.

نەتۆو نەکەسی تر دەستەڵاتی بەسەریدا نییە، من بەختەوەی لە ئیماندا دەبینم، ئیمانیشم لەنێو دڵمدایە، دڵیشم کەس توانای بەسەریدا نییە، تەنها خوای پەروەردگار نەبێ[1].

٥٤. **مافی خەڵك**

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص دەگێڕێتەوە کە پێشەوا ئەبو بەکری صیددیق ﷺ ڕۆژی جومعە جاڕی داو گوتی: بەیانی ئامادەی دابەش کردنی وشترەکانی زەکات بن، بەڵام بەبێ مۆڵەت کەس نەیەتە ژوورەوە، ژنێك بەپیاوەکەی گوت: ئەم ڕەشووە (بەرتیل) لەگەڵ خۆتدا ببە، بەلکو خوا وشترێکمان بەنسیب بکات، مسوڵمانەکە هاتو سەیری کرد پێشەوا ئەبو بەکرو عومەر ﷺ چوونەتە نێو وشترەکانەوە، ئەویش چووە ژوورەوە پێشەوا ئەبو بەکر ئاوڕی دایەوە پێی گوت: چی تۆی هێناوەتە ژوورەوە؟ ڕەشوەکەی لێ وەرگرتو پێی لێیدا کاتێ لەدابەش کردنی وشترەکان بۆوە بانگی کردە مسوڵمانەکەو ڕەشوەکەی دا بەدەستەوە، پێی گوت: تۆڵەی خۆتم لێبکەوە، پێشەوا عومەر گوتی: بەخوا نابێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە، ئەمە مەکە بەدەستوور، پێشەوا ئەبو بەکر گوتی: ئەی کێ لە قیامەتدا لەبەرانبەر خوادا بگاتە فریام؟ پێشەوا عومەر گوتی: ڕازی بکە، ئەویش فەرمانی دا بە خزمەتکارەکەی وشترێك‌و کورتانەکەی‌و قەدیفەیەکی مەخمەل‌و پێنج دیناری بۆ بهێنێ‌و پێی ڕازی کرد[2].

٥٥. **میوان دەبێ ڕێزی بگیرێ ئەگەر بێباوەڕیش بێ**

مرۆڤی سەخی بەتەنها نان ناخوات، پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه السلام) هەرگیز بەتەنها نانی نەخواردووە، جارێکیان نانی لەبەردەمدا بوو کەسی لەگەڵ نەبوو، چاوەڕوانی کرد لەدوورەوە ڕێبوارێکی بینی بانگی کرد پیاوێکی پیر بوو یەکسەر پەلاماری خواردنەکەی دا، پێغەمبەری ئیبراهیم پێ فەرموو: (بسم الله) بکە، گوتی خوا کێیە من خوا ناناسم؟ فەرمووی بڵێ: (بسم الله) ئەمە ڕزقی خوایە، گوتی: ناڵێم، پێغەمبەر ئیبراهیمیش فەرمووی: دەهەستە برۆ، دەری کرد، خوای پەروەردگار وەحی نارد بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم

---

[1]) وتەی دانایان‌و زانایان ل ١٥٠- سەردار ڕەزا.

[2]) ژیاننامەی پێشەوا ئەبو بەکر ﷺ - حبيب محمد سعيد ل١٠٢.

پێی فەرموو: ئەی ئیبراهیم ئەو پیاوە پیرە حەفتا دانە ساڵە لە ڕزقی من دەخواو عیبادەتم ناکا و نامناسێ تەحەممولم کردووە، تۆ دەقیقەیەك تەحەممولت نەکرد، لەسەر سفرەی خۆت. وە لە گێڕانەوەیەکی دیکە دەڵێ: کاتێ وەحی بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم هات بەپەلە چوو بەدوای پیرەمێردەکە پێی فەرموو: وەرە کاکە لەسەرتۆ عیتابم لێ گیرا، خوای پەروەردگار پێی ناخۆش بوو کە وام بەتۆ گوت، کابرا گوتی: کەواتە خوای گەورە لەسەر من عەجیب هات وەڵڵاهی ئەو خوایە هەقە یەکسەر باوەڕی هێنا[1].

٣: میـــــــــوان

کەسێکی هەژاری ناسراو لەدەرگای ماڵی پیاو چاکێکی دا، پیاوچاکەکە دەرگای بکردەوە هێنایە ژوورەوە زۆر ڕێزی لێگرت، پارەو خواردنێکی چاکی پێدا، بەو پەڕی ڕێزو حورمەتەوە خوا حافیزی لێکرد، کە ڕۆیشتو دوور کەوتەوە پیاو چاکەکە دەستی کرد بەگریان. خێزانەکەی پێی گوت: تۆ خێرت پێ کرد، ڕێزت لێگرت، خواردنێکی چاکت دایە، پارەیەکی زۆرت دایە، ئیتر بۆچی ئەگری؟ گوتی: دەگریم چونکە من کەمتەرخەمم ئەبوایە بەپێشتایە سواڵ بکات، ئەبوایە بەر لەوەی ئەو سواڵی بکردایە ئەو پارەیەم بۆ ببردایە[2].

٤: گەنجی مسوڵمان

خوای پەورەدگار گەنجی تۆبەکاری خۆش دەوێت، گەنج کاریگەری زۆری هەیە لەسەر خەڵك. ئەگەر بیەوێ دین بڵاو بکاتەوە، موصعەبی کوڕی عومەیر ئەو خانەدانەو ئەو ناوسانە گەنجەی کە بەنازداری بەخێوکرابو، ئیمانەکەی گەیشتە ڕاددەیەك نیشتیمانی خۆی بەجێهێشت، نادریان بۆ بڵاوکردنەوەی دین، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: وەڵڵاهی ماڵێك نەماوە لەمەدینەدا یادی خوای تێدا نەکرێ، هەر هیچ نەبێ خەڵکێکدا یەکێکیان مسوڵمان بووە[3].

---

١- میحراب ل٢٨١.

٢- میحراب ل ٢٨٢.

٣- میحراب ل ٢٢٣.

هەر سەبارەت بەگەنجی مسوڵمان ئەو بەسەرهاتەش هەیە، دەگێڕنەوە کە خەلیفەی عەبباسی مەهدی، کاتێ کە چووە ناو شاری بەصرە، بینی وا ئیاسی کوڕی موعاویە کە گەنجێکی منالکار بوو، بەرێگادا دەڕۆیشت بەرێگادا لەدوایەوە چوار سەد کەس لە زاناو پیاو ماقوڵان دەڕۆیشتن، ، مەهدی گوتی: ئەوە بەساڵاچوویەك نییە پێش بکەوێ، جگە لەو منداڵە؟ ئینجا مەهدی ئاوڕی بەلای ئیاس دایەوەو پێی گوت: ئەی گەنج تەمەنت چەند ساڵە؟ ئیاس لەوەڵامدا گوتی: خوای گەورە ئەمیرتان بهێڵێ تەمەنم بەقەد تەمەنی ئوسامەی کوڕی زەیدە ﷺ، کاتێك کە پێغەمبەری خوا کردی بە سەرکردەی سوپایەك کە پێشەوایان ئەبو بەکرو عومەری تێدابوو، مەهدی پێی گوت: پێش بکەوە پیرۆزت بێ[1].

### ٥٨. ڕەزیلی

سوالکەرێکی ڕۆژئاوایی مەغریبی لە گوزەری بازرگانەکانی حەلەب ئەیگوت: ئەی خاوەن سامانەکان ئەگەر ئێوە بەخشندە بوونایەو ئێمەش بەقەناعەت، سوالکردن لەجیهانا نەئەما.

ئەی قەناعەت دە دەوڵەمەندم کە

تۆ نەبی خۆ نیە ئیتر سامان

گەنجی سەبر ئیختیاری لوقمانە

ئەوەی بێ سەبرە لای نییە عیرفان[2].

### ٥٩. جەژنی ڕاستەقینە

ڕۆژێك پرسیاریان لە شێخ حەسەنی بەسری کرد گوتیان: چ ڕۆژێك لەلای تۆ بەجەژن دادەنرێت؟ گوتی: ئەو ڕۆژەی بێ فەرمانی خوای تێدا نەکەم لەلای من جەژنە.

---

[1]) وتەی دانایانو زانایان- سەردار ڕەزا ل ٩٧.

[2]) گوڵستانی سەعدی ل١٧٦ بەشی ٣ چیرۆکی ١.

• صیلەی رەحم

ئەگێڕنەوە پیاوێك سەفەری حەجی کرد، هەزار دیناری لای پیاوێك دانا کە ناوداربوو بە پیاوێکی دەست پاك، کاتێك لەکێوی عەرەفە گەڕایەوە چوو بۆ ئەوەی پارەکەی وەرگرێتەوە، بەڵام کە پرسیاری کابرای کرد گوتیان مردووەو ئێمەش هیچ هەواڵی پارەکەی نازانین. کابرای خاوەن پارەکەش نەیزانی چی بکات چوو بۆلای پیاوێکی خواپەرست تا ڕێگەیەکی بۆ دابنێ کابرای خواپەرست پێی گوت: بچۆ لە نیوە شەودا لەسەر بیری زەمزەم بانگی لێبکە، ئەگەر مردووەکە ئەهلی بەهەشت بێت وەڵامت دەداتەوە، کابرای خاوەن پارەکە (حاجی)یەکە وای کرد، بەڵام هیچ وەڵامی نەبیست، دیسانەوە هاتەوە بۆ لای کابرای خواناس باسەکەی بۆ گێڕایەوە، کابرای خواناس پێی گوت: (سبحان الله)!! دەترسم هاوڕێکەت ئەهلی دۆزەخ بێت، ئەوجارە بڕۆ سەر بیری (بەرهوت) کە لەوڵاتی یەمەنە لە نیوە شەودا بانگی لێبکە وەڵامت دەداتەوە، کابرای حاجی لەنیوە شەودا چووە سەر بیرەکەو بانگی کرد هۆ فلانەکەس، ئەویش وەڵامی دایەوە پرسیاری پارەکەی لێکرد؟ کابرای مردوو گوتی: لەناو ژوورەکە چاڵێکم بۆ هەڵکەندووە بچۆ بیدۆزەرەوە، حاجی پێی گوت: خۆتۆ پیاوێکی چاكو خواناس بویت چۆن هاتویتە ئەو جێگەیە؟ لەوەڵامدا گوتی: چونکە خوشکێکم هەبوو سەردانم نەدەکرد[1].

• داوێن پاکی

دەگێڕنەوە لە سولەیمانی کوڕی یەسار، جارێکیان لە مەدینە دەردەچێ بۆ زیارەتی کەعبە. هاوڕێیەکی لەگەڵدابوو لە ڕێگادا لەنزیك مەککە دابەزین، هاوڕێکەی هەڵسا بچێ بۆ بازاڕ بۆ کڕینی نانو هەندێ پێداویستی تر، سولەیمانیش کە گەنجێکی جوان بوو لەژێر چادرێك دانیشت لە چاوەڕوانی هاوڕێکەی، لەناکاو ئافرەتێکی دەشتەکی چاوی پێکەوت عەقڵی بۆی فڕی، چوو بەرامبەر سولەیمان ڕاوەستاو عەبایەکەی بۆ لابرد، ڕوخساری دەرکەوتو درەوشایەوە لەجوانیدا، ڕووی کردە سولەیمانو گوتی: دڵم خۆشکە، سولەیمان وایزانی دایە سفرەکەی کەخواردنی تێدابوو گوتی: فەرموو بیخۆ، ئافرەتەکە گوتی:

---

[1] کتاب الکبائر ص٤٩.

مەبەستم ئەوە نییە، بەڵکو مەبەستم ئەو شتەیە کەپیاو لە خێزانەکەی خۆی دەوێ، سولەیمان گوتی: خوا ڕووت ڕەشکا، سەری خۆی لەنێوان هەردوو ئەژنۆی خۆیدا بەهەموو هێزو توانای هاواری کردو گریا، ئافرەتەکە کە ئەمەی بینی یەکسەر عەباکەی بەسەر خۆیدا هێنا بەپەلە ڕای کردو ڕۆیشت، پاشان هاوڕێکەی هاتەوە لەبازاڕ بینی وا سولەیمان دەگری‌و ناڕەحەتە، پێی گوت چییە ئەو گریانەت؟ ئەویش هەواڵی ئافرەتەکەی بۆ گێڕایەوە، هاوڕێکەشی دەستی کرد بەگریان، سولەیمان گوتی تۆ بۆدەگری؟ هاوڕێکەی گوتی: من هەقترم لەتۆ کە بگریم، چونکە دەترسم ئەگەر من بام خۆم پێنەگیرایە، بەڵام تۆ ئارامت گرت، ئنجا بەڕێکەوتن تاکو گەیشتنە مەککەو تەوافیان کرد، سولەیمان لەبەر ئەوەی زۆر ماندووبو لەلای حیجری کەعبە کەمێ چاوی چووە خەو، لەخەودا چاوی بەگەنجێکی زۆر جوان‌و شۆخ‌و شەنگ کەوت، کە بۆنێکی زۆر خۆشی لێدەهات سولەیمان سەری سوڕما لەجوانی ئەو گەنجە، پێی گوت: تۆ کێی ڕەحمەتی خوات لێبێ؟ گوتی من یوسفم، سولەیمان گوتی: یوسفی ڕاستگۆ؟ گوتی: بەڵێ، سولەیمان گوتی: دەزانی کاری ئێمە لەگەڵ ئافرەتی خراپ، من لەگەڵ ئافرەتە دەشتەکییەکە تۆش لەگەڵ خێزانی عەزیزی میصر کارێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو؟ پێغەمبەر یوسف (علیه السلام) فەرمووی: کاری تۆ لەگەڵ ئافرەتەکەی (ابواب) شوێنێکە لەنێوانی مەککەو مەدینە زۆر سەیرتر بوو لەکاری من لەگەڵ خێزانی عەزیزی مصر[1].

### ٦٢. سوودی بەڕۆژوو بوون

یەکێك لە ئۆپۆزسیۆنەکانی وڵاتی هیندستان بەناوی (تاراسینگ) مانی لەخواردن گرت‌و بەڕۆژوو بوو، لەوکاتەدا تەمەنی ٧٦ ساڵ بوو، ڕۆژووەکەی گرنگی زۆری پێدرا لەلایەن ڕاگەیاندنەکانەوە، لەگەڵ ئەوەی ڕۆژوو مانگرتنەکەی (٤٨) ڕۆژی خایاند بەڵام ئەو پزیشکانەی کە (تاراسینگ)یان پشکنی دوای ڕۆژوو گرتنەکەی گوتیان: وازهێنانی لەخواردن بۆتە هۆی گەنج بوونەوەی (سینگ) بۆ ماوەیەك کە ئەو ماوەیە زیاترە لە (١٠) ساڵ.

---

[1]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن ل١٩١- هارون نوح.

هەروەها کەسایەتی ناسراوی هیندی (گاندی) لەتەمەنی (٦٤) سالی بەرۆژوو بوو، پزیشکەکان لە دەیەم ڕۆژی بەرۆژوو بوونەکەیدا پشکنینیان بۆ ئەنجامدا گوتیان لەرووی فسیۆلۆجیەوە تەندروستی وەك کەسێکە کە لەتەمەنی (٤٠) سال دابێت، واتە: ٢٤ سال تەمەنی گەنج کردۆتەوە[1].

هەر لەسەر سوودی بەرۆژوو بوون د. ئەحمەد قازی لە پەیمانگای پزیشکی ئیسلامی بۆ تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە لە فلۆریدا (٨) ئافرەتو (١٢) پیاوی خستە ژێر تاقیکردنەوە، کە تەمەنیان لەنێوان (١٢ بۆ ٥٢) سالان بوو، دکتۆر هەموو پشکنینێکی بۆ کردن پێش بەرۆژووبوونو دوای بەرۆژووبوون، سەرەنجام بۆی دەرکەوت کە ڕۆژوو لەهەموو لایەنێکەوە سوودمەندە بۆ مرۆڤ[2].

** ئەنجامدانی تاوان لە دنیادا

دەڵێن جارێك دزێك دەچێتە سەر ڕێگای خواناسێك تا ڕووتی بکاتەوە، خوداناسەکە پێی دەڵێ: ئەگەر زوڵم بکەیت خوای گەورە تۆڵەت لێدەکاتەوە، دزەکە گوتی: باشە کەی خوای گەورە تۆڵەم لێدەکاتەوە؟ خواناسەکە دەڵێ: لەوانەیە دوای چل سالی تر، دزەکە گوتی: ئێستا من تۆ ڕووت دەکەم تا چل سالی تریش گرنگ نییە، دزەکە خواناسەکەی ڕووت کردەوە چی پێ بوو لێی سەند، ویستی بڕوات لەناکاو چەند هەنگاوێك ڕۆیشتو کەوت قاچێکی شکا، بەخواناسەکەی گوت: باشە تۆ گوتت لەوانەیە چل سالی دیکە بخایەنێ، خۆ سەعاتێکی پێ نەچوو، خوا تۆڵەی لێکردمەوە؟ خواناسەکە گوتی: ئەی قوربەسەر ئەو تۆڵەیە لەوانەیە هی گوناهێکی چەند سال لەمەوبەر بێ، هێشتا تۆڵەی منت لەسەر ماوە[3].

*: نەرمو نیانیو لەسەرخۆیی (الحلم)

ڕۆژێك پیاوێکی جوولەکە بەلای ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم تێپەڕی، پیاوە جوولەکەکە سەگێکی پێبوو، بە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمی گوت: ڕیشی تۆ پاکترە یان کلکی ئەو سەگە؟

---

(١) ڕۆژوو موعجیزەیەکی زانستییە- د. کاوە فەرەج ل ٢١٢.

(٢) بەهاری دلان ل٧٩.

(٣) وتەی دانایانو زانایان ل ٨٠.

ئیبراهیم بەلەسەرخۆیی گوتی: ئەگەر ئەو ریشەم لەبەهەشت بێ ئەوە پاكترە لەكلكی سەگەكەی تۆ، بەلاَم بە پێچەوانەوە ئەگەر لەدۆزەخ بێت ئەوە كلكی سەگەكەی تۆ پاكترە لە ریشی من، پیاوە جوولەكەكە گوتی: بەراستی ئەوە رەوشتی پێغەمبەرانە (علیهم السّلام) كە تۆ بەم نەرمو نیانیەوە وەلاَمی منت دایەوە، گوتی: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله. واتە: مسولْمان بوو[1].

هەر سەبارەت بەنەرمو نیانی، دەگێرنەوە پیاوێك ئەبو عوسمان حیری بانگهێشت كرد بۆ نان خواردن، ئەویش وەلاَمی دەعوەتەكەی دایەوەو چوو بۆ مالْی پیاوەكە، كە گەیشتە بەردەرگا كابرا گوتی: رەحمەتی خوات لێبێ مۆلْەت نییە بێیە ژوورەوە برۆ!، ئەبو عوسمان رۆیشت كە گەیشتەوە بەر دەرگای مالْی خۆی كابرا بانگی كرد، گوتی: ئێستا مۆلْەت هەیە وەرە، ئەبو عوسمان هاتەوە، بەلاَم كابرا دووبارە پێی گوت: مۆلْەت نییە بگەرێوە، چوار جاران وای لێكرد، هەر دەهاتو دەرۆیشت، ئنجا پیاوەكە گوتی: ئەی ئەبو عوسمان من مەبەستم تاقیكردنەوەی تۆبوو، راوەستان لەسەر رەوشت بەرزی، ئنجا داوای لێبوردنی لێكردو بەچاكی باسی كرد، ئەبو عوسمان پێی گوت: بەچاك باسم مەكە لە رەوشتێك كەوا لەسەگدا هەبێت، چونكە سەگ كە بانگت كرد دێ كە دەرت كرد دەروات[2].

## ٦٥. ترسان لە ریبا

یەزیدی كوری هارون دەلْێ: هیچ كەسێ وەكو ئەبو حەنیفە نییە كە بەتەقواو خۆپارێز بێ لە حەرام، جارێك بینیم دانیشتبوو لەبەر گەرمای خۆر لەلای دەرگای خانووێك، منیش پێم گوت: بۆ ناچیتە بەر ئەو سێبەرە با گەرمات نەبێ؟ گوتی: خاوەنی ئەم خانووەی كە سێبەری هەیە هەندێ پارە قەرزاری منە، منیش نامەوێ لەگەلْ ئەم قەرزە سوود لە شتێكی تری ئەو پیاوە وەربگرم، ئەوەك تووشی ریباو مالْی حەرام بم، زانایان لەهەموو كەس زیاتر پێویستیان بەم جۆرە وەرعو تەقوایە هەیە[3].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٥٧.

[2]) المستطرف في كل فن مستظرف- شهاب الدين محمد المكتبة العصرية ص١٧٥.

[3]) الف قصة وقصة ج١ ص٢٣٤.

**پشت کردنە دونیا (الزهد)**

پیاوێك هات بۆ لای حاتەمی ئەصەم، گوتی ئەی ئەبو عەبدرەحمان سەری زوهدو پشت کردنە دونیا چییە، ناوەڕاستو کۆتاییەکەی چییە؟ حاتەمی ئەصەم گوتی: سەری زوهد باوەڕ بوونە بەخوا، ناوەڕاستەکەی ئارامگرتنە کۆتاییەکەشی نیازپاکیی ئیخلاصە[1].

هەر سەبارەت بە دونیا بەکەم گرتن (الزهد) جارێکیان جۆرە حەڵوایەکی چاك دەهێنن بۆ پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەیخەنە بەردەستی تا بیخوات، ڕووی لە حەڵواکە کردو گوتی: تۆ حەلوایەکی بۆن خۆشی، جوانو ڕازاوەی، بەتامو بەلەزەتی، بەڵام من پێم ناخۆشە دەروونم لەسەر شتێك ڕابهێنم کە لەوەو پێش لەسەری ڕانەهاتبێ[2].

دیسان سەبارەت بە دونیا بەکەم گرتن ئەو بەسەرهاتە هەیە ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەر ﷺ کیسەیەکی پڕی بەدیاری بۆ هێنا، ئیبنو عومەر لێی پرسی ئەمە چییە؟ ئەویش گوتی: ئەمە دەرمانێکی زۆر گەورەیە لە عێراقەوە بۆم هێناوی، ئیبن عومەر گوتی: باشەو ئەو دەرمانە بۆچی چاکە؟ پیاوەکە گوتی: بۆ هەرس کردنی خۆراك، ئیبن عومەر ﷺ زەردەخەنەیەك گرتیو بە هاوەڵەکەی گوت: خواردن هەرس دەکات!!، من ماوەی چل ساڵە هەرگیز خواردنم بەتێری نەخواردووە!!، ئەو پیاوەی کە ماوەی چل ساڵ خواردنی تێر نەخواردووە، تێر نەخواردنەکەی بەهۆی نەبوونیەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی دونیا بەکەم گرتنو تەقواوە بووە، بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا بووە ﷺ، ئەو دەترسا لەوەی کە لەڕۆژی دواییدا پێی بگوترێ: ﴿...أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا ...﴿٢٠﴾﴾ الأحقاف[3].

---

[1]) وتەی دانایانو زانایان ل٢٢١.

[2]) ژیاننامەی پێشەوا عەلی حبیب محمد سعید ل ٢١٧.

[3]) پیاوانی دەوری پێغەمبەر ﷺ ل: ١٣١.

### ٦٧. بەهای دونیا لای خوا پەرستانەوە

خوا پەرستێك لە ئەشکەوتێکدا خوا پەرستی دەکرد، پیاوێك لێی پرسی دنیا بەلای تۆوە چۆنە؟؟ ئەویش گوتی: دونیا لەشی مرۆڤ کون دەکاتو دەیرزێنێ، هیواو ئومێد تازە دەکاتەوە، خۆزگەو ئاوات دوور دەخاتەوە، مردنیش نزیك دەکاتەوە!!، پیاوەکە پێی گوت: باسێکی خەڵکی دونیام بۆ بکە، خواپەرستەکە گوتی: ئەوەی دونیای دەست دەکەوێ ماندوو دەبێ، ئەوەی لەدەستی دەچێتو پێی ناگات تووشی داخو حەسرەت دەبێ، پیاوەکە گوتی: ئەی چۆن دەتوانیت لێی بەهرەمەند بیت؟ خواپەرستەکە گوتی: کاتێ هیوات پێی نەبێ، گوتی چار چییە؟ خواپەرست گوتی: ئەوەی لەتواناتدا هەیە بەکاری بهێنێ، ڕازی بیت بەوەی کە هاتە دەستت[1].

### ٦٨. ژیانی دونیا کورتە

لە پێغەمبەر نوحیان پرسی: دونیا چۆن دێتە هاتە پێش چاوت لەگەڵ ئەوەدا کە ژیانێکی دوورو درێژت هەبوو (٩٥٠) ساڵ لەناو گەلەکەتدا بوویو بانگەوازیت دەکردن؟ ئەویش فەرمووی: وا دێتە پێش چاوم وەك خانووێك دوو دەرگای هەبێت لە یەکێکیان بچیتە ژوورەوەو لەوی دیکەیان بێیتە دەرەوە[2].

### ٦٩. دونیا لە هیزرو تەرازووی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

ساڵێکیان خەلیفە سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك چوو بۆ حەجی ماڵی خوا، عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیشی لەگەڵدا بوو، کاتێك گەیشتە عوسفان بە سەرنجی سەربازخانەو حوجرەو بیناکانی سەرسام بوو پرسی: ئەوەی وا لێرەدایە چۆنی دەبینی ئەی عومەر؟ عومەریش گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەوە دەبینم کە دونیا هەندێکی هەندێکی دەخواتەوەو تۆش لێپرسراوی لەسەری، تۆڵەت لێدەکرێتەوە، لەو کاتەدا لە حوجرەکەی سولەیمانەوە قەڵە ڕەشێك هەڵفڕیو دەیخوێندو پارچە نانێکی بەدەنووکەوە بو، سولەیمان پرسی: تۆ دەزانی ئەو قەڵە ڕەشە چی دەڵێ؟ عومەریش گوتی: وا ئەزانم دەڵێ: ئەو پارچە

---

[1]) سۆمای دیدە ل ٢٣٩-٢٤٠. بەرگی ١.

[2]) هەمان سەچاوەی پێشوو ل٢٤٠.

... ئەکوێ چووە ژوورەوەو چۆنیش هاتە دەرەوە!!، گوتی: تۆ شتی سەیر باس دەکەی ئەی ... عومەریش گوتی: ئەگەر بتەوێ هاوالّی لەوە سەیرتریشت دەدەمێ، گوتی: دەی ... بدەرێ، عومەریش گوتی: ئەو کەسەی کە خوا دەناسێو لێی یاخی دەبێ، شەیتانیش ...و گوێرایەڵی دەکات، دونیاشی دیوە لەگەڵ خەڵکیدا چەندە بێ باکە، هێشتا دڵیشی بێ خۆش دەکات[1].

- غەیبەت کردن

سوفیانی کوڕی حوسەین گوتی: لەلای ئیاسی کوڕی موعاویە باسی کابرایەکم بەخراپە کرد. ئەویش سەیری دەمو چاوی کردمو گوتی: ئایا تۆ غەزای ڕۆمت کردووە؟ گوتم نەخێر، گوتی: ئەی غەزای سەندو هندو تورکت کردووە؟ گوتم نەخێر، گوتی: ڕۆمو سەندو هاندو تورک سەلامەت بوون لێت، بەڵام براکەت سەلامەت نییە لێت، سوفیان گوتی: ئیتر ئەو کارە دووبارە نەکردەوە[2].

هەر سەبارەت بە غەیبەت کردن، پیاوێك هات بۆ لای پێشەوا جەعفەری صادق، جنێو ... موسڵمانێك دا، پێشەوا جەعفەر پێی گوت: ئایا جیهادی ڕۆمت کردووە؟ گوتی نەخێر، گوتی ئایا جیهادی فارست کردووە؟ گوتی نەخێر، ئایا جیهادی کافرانت کردووە؟ گوتی: نەخێر. گوتی: سبحان الله کافرو ڕۆمو جوولەکەو گاور لەدەستت سەلامەتن، کەچی موسڵمانان لەدەستتو دەمت سەلامەت نین[3]، ئەدی باشە پێغەمبەری خوا ﷺ نافەرمووێ: {المُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ}[4].

---

[1] ژیانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز- حەبیب مەحەممەد سەعید- ل٦٣-٦٤

[2] ...وتەی دانایانو زانایان ل٤٠.

[3] ...ژیانەوە ل ٧١.

[4] رواه مسلم.

### ٧١. نەمیمی دووزمانی

کاتێ پێغەمبەری موسا ﷺ موناجاتی دەکرد لەگەڵ خوادا سبحانە و تعالی، بینی عەبدێك لەژێر عەرشی خوای پەروەردگارە، فەرمووی: ئەی پەروەردگار ئەو عەبدە کێیە (بەچی گەیشتۆتە ئەم پلەیە) تا منیش ئەو کردەوەیە ئەنجام بدەم؟ پەروەردگار پێی فەرموو: ئەی موسا ئەوە عەبدێکە لەگەڵ دایكو باوکی باشە، حەسوودی بەخەڵك نابات، نەمیمی ناکات[1].

### ٧١. مەترسی ژن نەهێنان و گۆشەگیری

لە توێژینەوەیکدا کە نۆ ساڵی خایاند زانای ئافرەتی ئەمریکی د. لیزا بیرکمان لە زانکۆی کالیفۆرنیان لەسەر حەوت هەزار کەس کردی لەسەر لادێیەکی سەر بە ویلایەتی کالیفۆرنیا، بۆی دەرکەوت کە ڕێژەی مردنی ئەو کەسانەی کە خێزانیان نیەو گۆشەگیرن لە (٢٠٠٪)ە لەچاو ئەوانەی کە باری خێزانیان باشەو تێکەڵ بە خەڵکی دەبن[2].

### ٧٢. شەرم کردن لە خوا ﷻ

پێشەوا مالیکی کوڕی دینار لە ڕۆژێکی زۆر سارد سەیری کرد (عتبة الغلام) لەبەر ئەو سەرمایە کراسێکی دڕاوی لەبەرەو ئارەقەی کردووە، مالیك پێی گوت بۆ لەم جێگایە وەستاوی؟

ئەویش گوتی: لەبەر گوناهێك کە کردوومە لەبەر ئەو سەرمایە وەستاوم، لەشەرمی خوا ﷻ ئارەقەی کردبوو[3].

---

[1]) شعب الإيمان ج٥ ص٢٧١.

[2]) ژیانەوە ل٤٤٢.

[3]) پەندو ئامۆژگاری لەبەسەرهاتی پیاوچاکان- موحەممەد حوسەین ل٦٩.

٧. **متمانە نەبوون بە خوا ﷻ**

دەگێڕنەوە لە زەمانی پێشوودا کابرایەك لەسەفەر بوو، تەنها پارچە نانێکی پێمابوو، لەدڵی خۆیدا ئەیگوت: ئەگەر ئەو پارچە نانە بخۆم ئەوە دوایی چیبکەم ئەگەر برسیم بوو یەکە دەکەوێ، خوا ﷻ فریشتەیەکی نارد پێی فەرموو: ئەگەر بیخوات من یەکی ناخەمو ەشی دیکەی بەقسمەت دەکەم، بەڵام ئەگەر هەروا نەیخواتو بیهێڵێتەوە بەشی دیکەی ـدەم ئەها دەمێنێتەوە هەتا دەمرێ، لە کۆتاییدا هەر نەیخوارد تا مرد، نانەکەش وەك خۆی مایەوە(١).

٧. **خێرکردن**

لە ٢٠٠١/٨/٢١ لە شاری موصڵی خۆمان ڕوویداوە، پیاوێك شوفێری تەکسی دەبێ، ـخۆی بەحاڵی خراپی خۆیو ئۆتۆمبێلەکەی بەهەر چۆنێك بێ بژێویماڵو منداڵی دابین ـەکات. ڕۆژێك چوار تایەی ئۆتۆمبێلەکەی پەنچەر ئەبێتو تێك ئەچێت، هەرچی ئەکات ـڕەی بۆ کۆنابێتەوە بۆچاکردنەوەی ئۆتۆمبێلەکەی، داوا لەخێزانەکەی دەکات بچێت لای ـۆکی پارەی بۆ قەرز بکات، ئەڵێ ئەگەر تایەی نوێی لەسەر بێ ئیشم باشتر بۆ دەکرێت، ـەڵام ئەگەر وانەبێ ئۆتۆمبێلەکەم تێکچێ لەشەقام دەمێنمەوە، ئافرەتەکە دەچێتە لای ـۆکی پێی دەڵێ: بابە گیان زۆر پێویستمان بەهەندێك پارەیە ئەگەر بتوانی بەقەرز پێمان ـدەی، بۆ ئەوەی چوار تایەی پێ بکڕین، باوکیشی پارەکەی پێ دەدا، ئەویش ـەوپاسگوزاریو خۆشحاڵییەکی زۆرەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوە.

بۆ بەیانی پیاوەکە دەچێت بۆ ئەوەی چوار تایەی نوێ بکڕێت، لەڕێگادا ئەڕوات ـفردتێك دەستی لێ ڕادەگرێ بۆ ئەوەی لەگەڵی سەرکەوێ، ئەمیش بۆی ڕادەگرێ، لەدڵی خۆی ئەڵێ ئەگەر ڕێگاکەی نزیك بێ ئەیگەیەنم، ئافرەتەکە دێتو لەپێشەوە دائەنیشێت

پیاوەکە زۆری پێ ناخۆش دەبێ، چونکە نەریت وایە ئافرەت ئەگەر سواری تەکسی بێ ـیشتەوە سەرکەوێ، پیاوە شوفێرەکە لەڕێگادا ئەپرسێ ئەڕۆیتە کوێ؟

---

١ هەمان سەرچاوە- ل٨٧.

ئافرەتەکەش پێی ئەڵێ: هەرشوێنێك کە تۆ پێت خۆشە، پیاوەکەش سەیارەکەی ڕائەگرێت پێی ئەڵێ: دابەزە بێ شەرم کەس نەماوە لەم شارە تووشی گوناهی بکەی من نەبێ؟؟ ئافرەتەکەش دەستی بەگریان کرد، پیاوەکەش گوتی: تۆ ئەگریت و گوناهیش دەکەی؟ ئافرەتەکەش گوتی: برا گیان بەخوا من بێشەرم نیمو خاوەن ئابڕووم، بەلام تۆ نازانی من بۆ ئەمەوێ ئەو ئیشە بکەم!!، تۆ لەماڵو حاڵی من نییت تا بزانی بۆ ئەم کارە دەکەم، من پیاوەکەم لە شەڕی قادسیەی صەددامدا کوژراوە، چوار کچیشم هەن لە خانوویەکی زۆر خراپدا دەژین، نازانم چۆن بژێوی ئەو منداڵانە پەیدا بکەم، ئەم بڕە پارەیەی شەهیدانە کە پێمان ئەدەن بەشم ناکاتو شوێنێکیش نییە تا کاری تێدا بکەم، بۆیە ئەو کارە دەکەم، پیاوەکەش زۆری پێ ناخۆش بوو، بەزەیی پیادا هاتەوەو پێی گوت: ئەگەر تۆ ڕاست بکەی، من دەتوانم یارمەتیت بدەم.

ئافرەتەکەش گوتی: وەرە لەگەڵم بۆ ئەوەی ماڵو حاڵم ببینی وە لەدراوسێکانیشم بپرسی تا بزانی حاڵم چۆنە، ئەگەر ئەوەی دەیڵێم وانەبوو ئەوە هەق بەتۆیە، پیاوەکە لەگەڵی چوویەوە تا گوزەرانی ببینێ، کە بینی حاڵی چۆنە، ئافرەتەکەی برد بۆ بازاڕ لێی پرسی تۆ چ پیشەیەك دەزانی؟ ئافرەتەکەش گوتی من کاری بەرگدروویی دەزانم، پیاوەکەش مەکینەیەکی دورمانی چاکی بۆ کڕی لەگەڵ هەندێ خواردن ئنجا بردیەوە بۆ ماڵەوە، پێی گوت: نە دەمناسیت نەدەتناسم بەلام بەڵێن بدە کارێکی وەها نەکەیت، ئافرەتەکە گوتی بەڵێن دەدەم هیچ کارێکی خراپ نەکەم بەڕەنجی خۆم بژێوی منداڵەکان دابین بکەم، پیاوەکە گەڕایەوە ماڵەوە ئافرەتەکەی لێی پرسی ئەی کوا تایەی ئۆتۆمبێل؟؟

ۆ هەر تایە کۆنەکانی لەسەرە، ئەمیش ئەڵێ چووم بۆ لای هاوڕێیەکم گوتی: دوای دوو ڕۆژی تر تایەی چاکم بۆ دێو هەندێ پارەشتان بۆ دەمێنێتەوە، هەموو ڕۆژێك کە ئەهاتەوە ماڵەوە ئافرەتەکەی لێی دەپرسی کوا تایەی نوێت نەکڕیوە؟ ئەمیش ئەیگوت: ئافرەت ئارام بگرە هاوڕێکەم دەڵێ: تایەی باشمان بۆ دێ، تا ڕۆژێك پیاوە شوفێرەکە هاتە ماڵەوە بینی چوار تایەی نوێو جوان لەماڵەوەیە، سەری سوڕما، گوتی ئافرەت ئەو تایانە هی کێن؟ ئافرەتەکەش گوتی: هی خۆمانن پیاوێك هات ئەو تایانەی هێناو ناونیشانی خۆیشی جێهێشت، گوتیشی کە تۆ سەردانی بکەیت!!، پیاوەکەی زۆر سەری سوڕما، بۆ

ـﻨﯿﻨﯽ بەدوای ئەو ناونیشانە دەچێ کە بۆیان جێهێشتبوو، کە ئەچێت سەیر دەکات ـﯚﻣﭙﺎنیایەکی زۆر گەورەیە، جۆرەها تایەی لێیە کە هەمووی نوێن، سەلامی کردو گوتی: ئـ ـە کەس کێیە؟ پیاوێك گوتی فەرموو منم، ئەمیش گوتی: ئەرێ تۆ چوار تایەی نوێت ـﻨـێرد بۆ ماڵی ئێمە تۆ کێیت؟ کێ ئەو پارەیەی پێ داویت تا لەشوێنی خۆت ئەو تایانە بۆ ـﻤـ بنێنی!!؟؟ خاوەن کۆمپانیاش هەڵساو ماچی کردو پێشوازی لێکرد، شوفێرەکەش لێی ـﭘﺮسی تۆ پێم بڵێ بۆ ئەم چوار تایەت بۆ ماڵی ئێمە هێناوە، ئەمشەو خەو لەچاوم ـﻫﻪڵگرتووە تۆ کێی و کێ پێی گوتی: ئەو تایانەم بۆ بێنی؟

خاوەن کۆمپانیاکە گوتی: برا گیان خۆم نەمهێناوە بەڵکو پێغەمبەر ﷺ هاتە خەوم پێی گوتم کە چوار تایە بهێنمە ماڵی ئێوە، ناونیشانی ئێوەی پێدام لەخەودا.

خوێنەرانی خۆشەویست ئەوەیە ئەنجامی خۆپاراستن لەگوناهی خێرو چاکە ـﻛﺮدﻧـدان تۆ چاکە بکە خواو پێغەمبەر ﷺ ئاگادارن، پاداشتی خۆت وەردەگریەوە لە دنیاو ـﻗﯿﺎمەتیش .

### ٠٠ ئایەتەکانی شیفا

ئە شێخ ئەبو قاسمی قوشەیری دەگێڕنەوە کوڕەکەی نەخۆشییەکی زۆر کوشندە تینی ـﻮ دەخشێنێ، دەڵێ: شەوێك لەخەو چاوم بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوت، هەواڵی کوڕەکەم پێ ـﮔـێڕاند. ئەویش پێی گوتم: ئەی ئەبو قاسم بۆچی ئایەتەکانی شیفات لەسەر ـﻧـﺎﺧوێندۆتەوە؟ یەکسەر لەم خەوە بەخەبەر هاتم هەڵسام گەڕام بەدوای ئەو ئایەتانە بۆم ـﺪەرکەوت کە خوای گەورە لە شەش شوێندا باسی ئایەتەکانی شیفای کردووە، منیش بەسەر ـﻛـوڕەکەمدا خوێند خوا شیفای بۆهێنا بەبەرەکەتی قورئان، ئایەتەکانیش ئەمانەن:

١) ﴿...وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾﴾ التوبة.

٢) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾﴾ یونس.

---

- پەند وەربگرین لە ٢٩ بەسەرهاتی ڕاستەقینە م. شێرزاد ل ٣٨-٤١.

٣) ﴿ ...يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾ النحل.

٤)﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء.

٥) ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ الشعراء.

٦)﴿ ... قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ فصلت.

### ٧٧. چارەسەر كردنی نەخۆش بە قورئان

پرۆفیسۆر د. ئەحمەد قازی لە ئەزموونێكیدا لەسەر ئەو كەسانەی كە حاڵەتێكی دەروونی نائاساییان هەیە، كە پێی دەڵێن: (تێنشن)، گرژ بونی دەروونی (التوتر العصبي)، ئەو كەسانەی ئەو حاڵەتەیان هەیە كردنی بە دوو گروپەوە:

گروپی یەكەم: ئەو پیرو گەنجو ئافرەتانەی كە باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نیەو ئایینێكی تریان هەیە، وەك: مەسیحی یان جوولەكە.

گروپی دووەم: ئەوانەی كە باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام هەیەو مسوڵمانن.

گروپی یەكەمی هێنا بۆ ژوورێكی هێمنو بە ڕیكۆردەرێك قورئانی پیرۆزی بۆ لێدان، جا بۆ ئەوەی بزانرێ ڕاددەی كاریگەری ئەو قورئانە لەسەر دەروونی ئەو نەخۆشانە چەندە، بەچەند كەناڵێك پشكنینەكە ئەنجام دەدرێت، چونكە شایەنی باسكردنە ئەو نەخۆشییە ئەم نیشانانەی بەسەردا دەردەكەون:

١- (تا)و پلەی گەرمی لەشی زیاد دەكات.

٢) توانای كارەبایی لەشی كەسە نەخۆشەكە زیاد دەكات.

٣) لێدانی دڵی زیاد دەكات.

ئامێری تایبەت هەیە بۆ پێوانە کردنی ئەو سێ نیشانەی سەرەوە، ئەو کەسەی کە ...یتە ژوورەوە ئامێرەکە دەبەستن بەلەشیەوە، لەوێشەوە ئامێرەکە بەستراوەتەوە بە شاشەی کۆمپیوتەریکەوە، بۆ ئەوەی بزانرێ ئایا گوێبیست بوونی قورئان ڕێژەی گرژ بوونی ...ووتکە دادەبەزێنێ، لەئەنجامدا دەرکەوت کە:

یەکەم/ بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نەبوو ڕێژەی گرژ بوونەکە ٦٠٪ ...ەزی.

دوو/ بۆ ئەوانەی کە مسوڵمان بوون ٩٧٪ ڕێژەی گرژبوونەکەیان دابەزی.

بەڵام هەندێ کەس گومانیان هەبوو لەوەی ئەو دابەزینە بەهۆی زمانی شیرینی عەرەبیەوە بووە نەك لە خودی قورئانەکە.

بۆیە د. ئەحمەد قازی هەمان تاقیکردنەوەی دووبارە کردەوە بەسەر کۆمەڵێك ...خۆشدا. لەهەردوو گرووپەکە، بەڵام لەبری قورئان کاسێتی شیعری سەردەمی نەفامی بۆ ...کارهێنان وەك شیعرەکانی (أمرؤ القیس)، ئەو شیعرانە بەسەریان خوێنرایەوە، بەڵام هیچ ڕۆڵی بەرچاویان لەسەر نەبوو، ئەوجارە هەندێکی تر گوتیان: کاریگەریەکە بەهۆی خوێندنەوە نییە بەڵکو بەهۆی شێوازی خوێندنەکەیە کە بریتیە لە (مرتّل).

دووبارە د. ئەحمەد قازی هێنای شیعرەکانی کرد بە شێوازی تەرتیل ئامادەی کرد بۆ ...ەوەی بخوێنرێ بەسەر نەخۆشەکاندا، بەڵکو دیسان هیچ کاریگەرییان دروست نەکرد ...سەر نەخۆشیەکەیان.

لەئەنجامدا دەرکەوت کە نەزمانی عەرەبیو نە ئاوازەکە کاریگەریان نەبووە لەسەر ...خۆشەکان. بەڵکو تەنها خودی قورئانەکەیە کە کاریگەری درووست کردووە. خوای تەعالا ...ەرموێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ الإسراء. ئەو ئایەتە موبارەکە ئاماژەی گەورەی تێدایە بۆ ئەو مەسەلەیە، چونکە خوای تەعالا دەفەرمووێ: شیفا دەنێرێ، نەك چارەسەر (عیلاج)[1].

---

[1] میحراب ل ١٠٧- ١٠٨- شەماڵ موفتی.

### ٧٨. دوعاكردن دەبێتە مايەی نەمانی هەژاری

ئافرەتێکی خواپەرست دەڵێ: لەماڵمان هیچ خواردنێك نەبوو، لەبەر ئەوەی تەنها بایی ئەوەندەمان پارە هەبوو کە هەندێ کەل‌و پەلی پێویستی ماڵمان پێ کڕیبوو، ترسم لەدڵ درووست بوو بەهۆی نەبوونی خواردن، کە زیان بەماڵ‌و منداڵەکان بگات، دڵم زۆر نارەحەت بوو، لەکۆتایی شەودا کە بەزەیی خوا دەبارێ‌و نزاو پاڕانەوە وەردەگیرێ، دەست نوێژم گرت‌و لەشوێنی نوێژکردنم وەستام، تاکو بەیانی دوعام کرد، بۆ بەیانی منداڵێکی بچووکی ڕەوزەم هاتەوە ماڵەوە، یەکێ لەدەرگای دا منداڵەکەم نارد بۆ ئەوەی دەرگا بکاتەوە، بینیم پیاوێکی خێرخوازە هەندێ گۆشت‌و کەل‌و پەل‌و پێداویستی لەگەڵ خۆی هێناوە، گوێم لێبوو منداڵەکەم بەو پیاوەی گوت: تۆ کێی؟ پیاوەکە وەڵامی نەدایەوە، منداڵەکە دەرگای داخست، منیش سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەو چاکەیەی کەلەگەڵمان کرا[١].

### ٧٩. شەرم کردن لە خوا

بە ڕابیعەی عەدەویەیان گوت: بۆ بە خزم‌و کەسەکەت ناڵێی خزمەتکارێکت بۆ بگرن تا لە ئیش‌و کاری ماڵدا یارمەتیت بدات؟ ئەویش گوتی: وەڵڵاهی من شەرم دەکەم داوای دونیا لە خاوەنی دونیا بکەم، ئیتر چۆن داوا لە کەسێ دەکەم دونیای بەدەست نییە[٢].

### ٨٠. کاریگەری دوعا

پیاوێك هەبوو ماوەیەك لە بەندیخانەی حەججاجی سەقەفی بەند کرابوو، پیاوێکی تر هاتە لای پێی گوت: بۆخۆت دوعا بکە بەڵکو خوای تەعالا ئازادت بکا، پیاوە بەندییەکە گوتی: بەچی دوعا بکەم؟ پیاوەکە گوتی بڵێ: {ئەی پەروەردگار ئەی ئەو کەسەی کە کەس نازانێ چۆنی مەگەر خۆت نەبی، ئەی ئەو کەسەی کەس نازانێ هێزو دەستەڵاتت چۆنە مەگەر خۆت نەبی، ڕزگارم بکە لەوە کە تێیدامە}، ئەو چەند وشەیەی گوت یەکسەر بەرەڵلا کرا[٣].

---

[١]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن ل ١٣٨.

[٢]) وتەی دانایان‌و زانایان ل١٢٨.

[٣]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن ل٢٠٤.

**ژنە ئەفسەرێکی ئەمریکی تازە مسوڵمان بوو ناخی کۆمەڵە پزیشکێکی مسوڵمان دەهەژێنێ**

لە جەنگی دووەمی کەنداودا جەنەراڵ (شوارز کۆف) بەرپرسی یەکەمی جەنگەکە بوو، بە بێ تەواو پاسەوانیان دەکرد، حیسابی بۆ کەس نەدەکرد، تا بینە قاقای لەخۆی بایی بۆ، هەر گۆڵێك ئەو بیکردایە بەسێ گۆڵ هەژمار دەکرا، تەنانەت ئەمیر خالید بن سوڵتان پێی لێدەرکرد، چونکە خۆی وەکو میوان دەهاتە بەرچاوو جەنەراڵ شوارزیشی وەك خاوەن ماڵ دەهاتە بەچاو، ڕۆژێك پیاوێکی پاکستانی دەیەوێ جەنەراڵ ببینێ، بۆ ئەو مەبەستە سێ سەعات لە پرسگە ڕادەگیرێ لەلایەن ئەو جەنەراڵەوە، ئەفسەرێکی ئافرەتی ئەمەریکی کە لەلای ئەو جەنەراڵە بوو لێی پرسی بۆچی ئاوا مامەڵە لەگەڵ ئەو پیاوە پاکستانیە دەکەیتو سێ سەعاتە چاوەڕێت دەکا، ئایا تۆ ئینسانیەتت لا نییە؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی: ئەو کابرایە مسوڵمانەو دەمەوێ سوکایەتی پێ بکەم!، ئافرەتەکە گوتی: دەی کەواتە من لە سەرەوەی خۆت شکاتت لێ دەکەم.

دواتر ئەفسەرە ئافرەتەکە خۆی بەپیاوە پاکستانییەکە ناساندو پێی گوت کە بگەڕێتەوە چونکە جەنەراڵ شوارز دەیەوێ سووکایەتی پێ بکا، پیاوە پاکستانییەکەش ناوی ئەو ئافرەتەی کردو ناوونیشانی خۆی دایە، ئافرەتەکە سەردانی ماڵو منداڵی ئەو پیاوە پاکستانییەی کرد، ئەوانیش زۆر ڕێزیان لێگرتو باسی ئیسلامیان بۆ کرد، چەند کتێبێکیشیان دایە، سەرەنجام پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە ئیسلام، ئافرەتەکە چوو بۆ نووسینگەی جالیاتو مسوڵمان بوو، خۆی داپۆشی، کاتێك بەسەرپۆشەوە چوو بۆ سەرکاردکەی سەرزەنشتیان کردو هەڕەشەی فەصڵ کردنیان لێکرد، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو واز لە ئیسلام بێنێ لە پێناوی دینی خوادا پۆستو پلەو پایەو کارەکەی کردە قوربانی، وڵاتی سعودیە داوایان لێکرد وتارێك بدات بۆ پزیشکە ئافرەتە سعودیەکان لە هۆڵی نەخۆشخانەدا، پزیشکەکانیش زۆر بەپەرۆشەوە لە هۆڵەکەدا کۆبوونەوە، چاوەڕێی ئەو میوانەیان دەکرد.

جا لەبەر ئەوەی دەیانزانی هۆڵەکە هەمووی ئافرەتەو میوانەکەش ئافرەتە، تەواو خۆیان کردەوەو سەرپۆشەکانیان لاداو بنێشت لەدەمیاندا، چاوەڕوانیان دەکرد ئافرەتێکی سەرکۆتی ڕووتی ئەمریکی بێ ووتارەکەیان بۆ بدات، کاتێکیان زانی ئافرەتێکی تەواو

داپۆشراو لەلایەن ئافرەتێکی ترەوە پێشکەش بە ئامادەبووان کرا، هیچیان باوەڕیان نەدەکرد ئەو ئافرەتە تەواو داپۆشراوە ئەفسەرێکی ئەمریکی بێ، بەهەر حاڵ دەستی بە وتارەکەی کرد باسی ئەزمونی خۆی‌و چۆنیەتی مسوڵمان بوونی بۆ کردن، لە ناوەندی قسەکانی ئامادەبووانی هەژاند بەچەند وشەیەك‌و گوتی:

{سوپاسی خوا دەکەم ئیسلامم بەهۆی ئێوەوە وەرنەگرت، بەهۆی ئێوەوە نەبووم بەمسوڵمان، بەڵکو لەرێگەی کتێبەوە ئاشنای ئیسلام بووم}، ئەمەش وەك هەروە بروسکەیەك بوو، دای بەڕووی پزیشکەکان کە بەناو مسوڵمانن، بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو پابەندبن بە ئیسلامەوە، کوردەواری خۆمان چاکیان گوتووە: {نرخی زێر لای زێرینگرە}[1].

٨١. مەترسی بەجێنەگەیاندنی صیلەی ڕەحم

لە زانکۆی میشیگان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، زانای ئەمریکی (جیمس هاوس) لێکۆڵینەوەیەکی کرد لەسەر (١٧٠٠) کەس بۆی دەرکەت ئەوانەی کەسی دوورە پەرێزن‌و تێکەڵ نابن‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان لاوازە بە ڕێژەی ٢٥٠٪ زیاتر دەمرن لەچاو ئەو کەسانەی باری کۆمەڵایەتیان گونجاوەو لە پەیوەندییەکانیاندا لەگەڵ دەورو بەریان ئاسوودەن[2].

٨٢. نەفس

لە کۆندا پیاوچاکێك هەبوو چەند دوژمنێکی هەبوو، ئەو پیاو چاکە شمشێرێکی هەبوو هەموو شەوێك کە دەخەوت سەیرێکی شمشێرەکەی دەکردو ئەو دوعایەی دەکرد: خوایە ئەو شمشێرە بدەی بە ملی گەورەترین دوژمنەکانم، شەوێکیان ئەو دوعایە دەکاو دەخەوێت، لەخەودا دەبینێ هەمان شمشێر کە دوعای بەسەردا دەکات دێتە سەر ملی خۆی‌و خەریکە سەری دەبڕێ، بۆ شەوی دووەم‌و سێیەم هەمان خەو دەبینێ، بۆ شەوی سێیەم بەیانییەکەی دەچێ بۆ لای زانایەك خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش دەڵێ: تۆ گوتووتە

---

[1]) بەهاری دڵان ل٢٤٧.

[2]) ژیانەوە ل٤٤٢.

حۆیە ئەو شمشێرە بدەی لە گەردنی گەورەترین دوژمنم، بەڵام دەزانی گەورەترین دوژمنت نەفسی خۆتە!!(1).

- دوڕوویی و بێوەفایی خەڵك

پێشەوا جەعفەری صادق لەسەردەمی خۆیدا زۆر لە مسوڵمانان بەگلەیی بووە، ڕۆژێیەك دوورە پەرێز ژیاوە، سوفیانی ثوری دەچێتە خزمەتی پێی دەڵێ: دەزانی خەڵك زۆر ئارەزووی دیداری تۆن؟ بۆچی خۆت لەخەڵك شاردۆتەوە؟ لەوەڵامدا جەعفەری صادق دەڵێ:

ذهب الوفاء ذهاب أمس الذاهب ... فالناس بين مخاتل وموارب

يفشون بينهم المودّة والصفا ... وقلوبهم محشوّة بعقارب

پێی دەڵێ: ئەی سوفیانی ثوری، چۆن بێمە ناو ئەو خەڵکەو دڵم پێیان خۆشبێ، وەفا لەنێوانیاندا نەماوە، وەکو چۆن دوێنێ ڕۆژێك بوو ڕۆیشت، بەم شێوەیە وەفاش لەناویان هەڵبڕدو ڕۆیشتووە، خەڵك بەخەیاڵ و ئارەزووی نەفسەوە دەژین، ڕاستە بەڕواڵەت قسە خۆشەکان یەکدی دەکەن و یەکتر دەدوێنن، بەڵام دڵیان پڕە لە بوغزو کینەو حەسادەت، ئەگەر دەستیان بڕوا وەك دووپشك بەیەکتر وەدەدەن(2).

- گوناهبار وەکو شێت وایە

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت، بینی وا کۆمەڵێك خەڵك دەوریان لە پیاوێك داوە، ئەمیش چووە پێشەوە فەرمووی: ئەوە چییە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە شێتە، ئەویش چووە لای پیاوەکە، فەرمووی: نەخێر ئەوە شێت نییە، بەڵکو نەخۆشە. چونکە شێت ئەو کەسەیە کە گوناح دەکات و تەوبەی نەصوحی لەدوا ناکا(3).

---

(1) سەرچاوەی پێشوو ل٢٦٤.

(2) مەجلیسی ئەولیا- م. موحەممەدی شەڵماسی ل١٨- ١٩.

(3) سەرچاوەی پێشوو ب١ ل١٧٩.

## ٨٦. مەترسی تەوبە نەكردن

ئەگێڕنەوە یەكێ لە هاوەڵەكانی پێغەمبەری مووسا ﷺ كە لەهەموو غەزاكانـدا لەگەڵی بەشدرا بوو، وەفات دەكا، مووسا ﷺ دوعای بۆ دەكات دەفەرموێ: خوای پەروەردگار لەم وەلییە خۆشبە، خوای تەعالا جوبریل دەنێرێ بۆ لای مووسا ﷺ كە پێی ڕابگەیەنێ ئەو هاوەڵەی لەناو دۆزەخ دایە دوعای بۆ نەكات!!، پێغەمبەر مووسا دەفەرمووێ: خوایە چۆن لەئاگردایە ئەو پیاوە لەهەموو غەزاكانـدا لەگەڵم بەشدار بووە؟ خوای پەروەردگاریش پێی ڕادەگەیەنێ كە ئەو هاوەڵەی هەركاتێ باسی تاوانەكانی ڕابردووی دەكرد پێدەكەنی، واتە: پەشیمانی دای نەدەگرت كە یەكێكە لە مەرجەكانی قبوولّ بوونی تەوبەیە[1].

## ٨٧. ڕاگەیاندن (التبلیغ)

پێشەوا دارمی بۆمان ڕیوایەت دەكات كە خەلیفە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ڕەحمەتی خوای لێبێ ڕۆژێكیان وتار دەداتو دەڵێت:

{ئەی خەڵكینە خوای پەروەردگار دوای پێغەمبەرەكەتان پێغەمبەرێكی دیكەی نەناردووە، دوای ئەم كتێبەش كە قورئانە هیچ پەیامو كتێبێكی تری دانەبەزاندووە، ئیتر خوای تەعالاو پێغەمبەرەكەی هەرچییان حەڵاڵ كردبێ هەتا ڕۆژی دوایی هەر حەڵاڵە، هەرچییەكیشیان حەرام كردبێ هەتا قیامەت هەر حەرامە، منیش دادوەر نیم بەڵكو جێبەجێكەرم، داهێنەریش نیم بەڵكو شوێنكەوتەم، لە ئێوەش چاكتر نیم بەڵام باری سەرشانم لەهی هەمووتان قورسترە، هیچ درووستكراوێكی خواش لەخوا یاخی بووبێ مافی گوێڕایەڵ بوونی بۆ نییە}[2].

---

[1]) میحراب ل ٤٩٢.

[2]) ژیاننامەی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز- حبیب محمد سعید ل ٥٤.

### ٨٨. خۆشویستنی یەکتر لە پێناو خوای پەروەردگار

ئەبو ئیدریسی خەولانی دەڵێ: چوومە مزگەوتی دیمەشق، پیاوێکی ڕوو گەشم بینی خەڵکی لەدەوری کۆبووبوونەوەو پرسیاریان لێدەکرد، پرسیارم کرد ئەو پیاوە کێیە؟ گوتیان موعاذی کوڕی جەبەل، بۆ بەیانی زوو چومە مزگەوت بینیم پێش من ئەو لەوێ بوو، نوێژی دەکرد، چاوەڕێم کرد تا لەنوێژەکەی بوویەوە چوومە بەردەمی‌و سەلامم لێکردو گوتم: بەخوا من لەبەر خاتری خوا تۆم خۆش دەوێ، پێی گوتم: توخوا؟ گوتم بەخوا، دووبارە گوتی: توخوا؟ گوتم: بەخوا، ئنجا ڕای کێشام بۆ لای خۆی‌و باوەشی پیاکردم، گوتی مژدەت لێبێ من گوێم لە پێغەمبەری خوابووە ﷺ فەرموویەتی: {وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ ، وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ ، وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ}[1]. واتە: خۆشەویستی من بۆ ئەو کەسانەی کە: لەبەر من یەکتریان خۆش دەوێ، لەبەر من لەگەڵ یەکتردا دادەنیشن‌و کۆڕو کۆبوونەوە دەبەستن، لەبەر من سەردانی یەکتر دەکەن، لەبەر من بەرەمەتی یەکتر دەدەن‌و شت بەیەکتر دەبەخشن[2].

هەر سەبارەت بە خۆشویستنی یەکتر لەپێناوی خوادا، ڕەبیعی کوڕی خیثم کە یەکێکە لە پیاوچاکان، شەوان خەوی لێنەدەکەوت لەبەر خۆشەویستی خوای تەعالا، جارێکیان کچەکەی لێی پرسی باوکە گەورەترین دروستکراوی خوا کێیە؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوایە ﷺ کچەکەی گوتی سوێندت دەدەم بەحورمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ ئەمشەو بخەوی‌و پشوو بدەی، ئەویش گوتی: ئەی خوایە تۆ دەزانی مانەوەی شەوم لا خۆشەویستترە لە نووستن، بەڵام لەبەر ئەوەی کچەکەم ئەو سوێندەی دام ئەمشەو ئەخەوم، نووست، لەخودا بینی کە لەشاری بەصرەدایە ئافرەتێکی تیایە بەناوی مەیمونە واتە: پەسەند کراو، پێیان گوت: کە ئەو ئافرەتە لەبەهەشتدا دەبێتە خێزانی تۆ،

کاتێ ڕۆژ بوویەوە بەڕێکەوت بۆ شاری بەصرە، کاتێ ئەهلی بەصرە بیستیان تەشریفی هێناوە چوون بۆ پێشوازی، دوای چەند قسەو باسێك لە خەڵکەکەی پرسی: ئایا ئافرەتێ

---

[1] ) حدیث صحیح رواه مالك.

[2] ) بەهاری دڵان ل ١٢٦- ١٢٧.

هەیە لەو دەورو بەرە بەناوی مەیمونە؟ عەرزیان کرد کارت بەو ئافرەتە شێتە چییە؟ ئەو ئافرەتە بەرۆژ شوانی ئاژەڵە ئەو کرێیەی بەرامبەر ئیشەکەی وەریدەگرێ ئەیدات بەخورماو ئەیبەخشێتەوە بەسەر هەژاران، شەوانیش دەچێتە سەربان و دەیکات بە گریان و هاوار خەو لەخەڵکیش حەرام دەکات ناهێڵێ کەس بخەوێ، ڕەبیع گوتی: لەگریان و هاوارەکانی شەوانەی چی دەڵێ؟ ئەوانیش گوتیان دەڵێ: {عجبت للمحب كيف ينام كل نوم علي المحب حرام!!}.

ڕەبیع گوتی: وەڵڵاهی ئەو قسانە قسەی شێت نین، لەکوێیە پێشانم بدەن؟ گوتیان: ئەوەتا لەو دەشتەیە ئاژەڵ دەلەوەڕێنێ، ئەویش ڕێگای گرتەبەرو چوو بۆلای، سەیری کرد بەردە نوێژێکی بۆخۆی چاکردووەو نوێژ دەکات، ئاژەڵەکانیشی دەلەوەڕێن و گورگیش بەچوار دەوریان نۆبەتچێتی دەکات، ئافرەتەکەش شوانە وانوێژ دەکات، سەری سوڕما لەکاری خودا، کاتێ لەنوێژ بوویەوە ڕەبیع چووە لای و پێی گوت: سەلامی خوات لەسەر ئەی مەیمونە، ئەویش گوتی: سەلامی خوات لەسەر ئەی ڕەبیع، ڕەبیع گوتی: چۆن ناوت زانیم؟ ئافرەتەکە گوتی: سبحان الله! ئەو کەسە هەواڵی ناوی تۆی پێدام کە دوێنێ هەواڵی بەتۆدا کە من دەبمە خێزانی تۆ لەبەهەشت، بەڵام مەوعیدی ئێمە ئێستا نییە بەڵکو جێژوانمان بەیانییە لەبەهەشتدا، ڕەبیع گوتی: ئەی ئەو گورگانە چۆن پاسەوانی لەو ئاژەڵانە دەکەن؟ مەیمونە گوتی: کاتێ خۆشەویستی خوا پەیوەندی لەگەڵ دڵمدا پەیدا کردو بەهێزبوو، وازم لە خۆشەویستی دنیا هێناو لەدڵی خۆمدا هەڵمکەند، خوای تەعالاش ئەوکات ئیصلاحی نێوان مەڕەکان و گورگەکانی بۆ کردم، چونکە ئەگەر شوان پاك بێ ژێر دەستەکانیشی پاك دەبن، ئەگەر سەرچاوە پاك بێ جۆگەکانیش پاك دەبن، لەپاشان گوتی: ئەی ڕەبیع داوات لێدەکەم کە لەفەرمایشتەکانی خوادا شتێکم بەرگوێ بخەی، تا باشتر موحیببەتی خوا دامگرێ، ڕەبیعیش ئەو ئایەتانەی بۆ خوێندەوە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٢﴾ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ
تَرۡتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ
سَبۡحٗا طَوِيلٗا ﴿٧﴾ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا

﴿وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾﴾ المزمل، ئافرەتەکە کاتێ ئەو ئایەتانەی لە ڕەبیع بیست خۆی ... هاواری کردو یەکسەر گیانی دەرچوو، ڕەبیع زۆر سەرسام بوو، کۆمەڵێ ئافرەت ... گوتیان ئێمە دەیشۆین‌و کفن‌و دفنی دەکەین، لێی پرسین چۆن زانیتان ئەو ئافرەتە ...؟ گوتیان: پێش ئێستا زۆر دوعای ئەو ئافرەتەمان دەبیست دەیگوت: خوایە ... لەبەر دەستی ڕەبیع نەبێ، کاتێ زانیمان تۆ هاتی بۆلای زانیمان دوعاکەی قەبووڵ ... دڵنیا بووین لەبەردەم تۆ وەفات دەکات بۆیە هاتین[١].

٨- ڕووخۆشی‌و زەردەخەنە مایەی لەش ساغییە

پێغەمبەری خوا ﷺ هەردەم زەردەخەنە لەسەر لێوە موبارەکەکانی بووە، هەرگیز ... بێهیوا نەبووە، بۆیە دەفەرمووێ: {تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ}[٢]، ڕووگەشی‌و زەردەخەنەت بەرووی براکەت خێرێکە بۆت، کۆمەڵێك زانای دەروونی‌و کۆمەڵایەتی ... لێکۆڵینەوەیان کرد دەربارەی ڕووخۆشی‌و ڕووگەشی‌و زەردەخەنە، ڕایانگەیاند کە ... سیفاتە دەبێتە هۆی پاراستنی مرۆ لە نەخۆشیەکانی سەردەمدا، هەروەها زانای دەروونناسی ئەمریکی (د. جیمس ئەریکسۆن) پاش تاقیکردنەوەیەکی زۆر لەسەر (٣٥٠٠) ... لە چین‌و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگا، کردنی بەسێ گرووپ، (ئەوانەی کە زەردەخەنەیان نییە، ئەوانەی تەنها لەهەندێ کاتدا زەردەخەنەیان هەیە، وە ئەوانەشی کە ... زەردەخەنە لەسەر لێویانە) ڕایگەیاند کە بۆ دەرکەوتووە کۆمەڵی سێیەم زۆر ... گورج‌و گۆڵن‌و باوەڕیان بەخۆیانەو تەندروستییەکی باشیان هەیە، ڕاشیگەیاند کە ... کەسانە زیاتر کاریگەرییان هەیە لەسەر خەڵکانی دەورو بەریان‌و دەتوانن زووترو ... قەناعەتیان پێ بێنن[٣].

---

١- خۆشویستنی خوا- شێخ موحسین موفتی ل ٣١- ٣٢.

٢- رواه إبن حبان والبزار.

٣- ...ژیانەوە ل ٤٤٤.

## ٩٠. خۆبەکەم زانین

ئەحمەدی کوڕی موحەممەد دەڵێ: هەندێ لە هاوڕێکانمان دەربارەی وەکیعی کوڕی جەڕاع بۆیان باسکردووین کە جارێکیان پیاوێك زۆر بەخراپی دادەبەزێتە سەر وەکیعی کوڕی جەڕاع‌و قسەی سووکی زۆری پێ دەڵێ، وەکیعیش خۆی کرد بەماڵداو هەندێ خۆڵی کرد بەدەم‌و چاوی خۆیدا پاشان هاتە دەرەوە بۆلای پیاوەکەو گوتی: دەی زیاتر قسە بەوەکیع بڵێ دیارە لەبەر گوناهەکانییەتی، ئەگەر ئاوا گوناهبار نەبوایە تۆ پێی نەدەوێرای قسەت پێی نەدەگوت[1].

هەر سەبارەت بەخۆبەکەم زانین (تواضع)، صاڵحی کوڕی عەبدولکەریم دەڵێ: ئافرەتێکی ڕەش پێستم بینی لە بەصرە خەڵکی دەوریان لێدابوو، ئەویش خەریکی خواناسی خۆی بوو، هەرکەزانی خەڵك دەوریان لێداوە هەستا چووە خانوێکی ترەوە، هەموو خەڵکەکە بەدوایدا چوونە ژوورەوە، هەر لەخواناسی‌و بەندایەتی کردنەکەی ورد دەبوونەوە، چێژی ئیمانیان لێ وەردەگرت، منیش لێی نزیك بوومەوەو لێم پرسی لەوە ناترسی غرور بیت‌و تووشی لەخۆبایی بوون بێیت؛ ئافرەتەکە سەری هەڵبڕی‌و سەیری کردم‌و گوتی: مرۆڤ چۆن بە کردەوەیەك غرور دەبێ کە هێشتا نازانێ لێی وەرگیراوە یان دەدرێتەوە بەنێوچەوانی[2].

هەر سەبارەتی بەمەسەلەی خۆ بەکەم زانین، ئەبو جەعفەر ئەلحەووا دەڵێ: لە (فضیل بن عیاض)م بیست دەیگوت: دەستی سوفیانی کوڕی عویەینەم گرت ئا لەم دۆڵەدا، پێم گوت: ئەگەر گومان دەبەیت کەسێك لەسەر زەوی ماوەو لە من‌و تۆ خراپتر بێ، ئەوە خراپترین گومانت بردووەو بەهەڵەدا چوویت[3].

---

[1]) صفة الصفوة ج٢ ص١١٣.

[2]) هەمان سەرچاوە ج٣ ص٤٣.

[3]) هەمان سەرچاوە ج٢ ص١٦

### گەورەیی تاوانی كوشتن

[illegible] زەمانی ئەبو جەعفەری مەنصوردا ئاژاوەیەك ڕوویدابو لە ویلایەتی موصل، پاش [illegible] دووبارە ئەو ئاژاوەیە ڕوویدا تالانی كراو چەندین كەس زەرەرو زیانی بەركەوتو [illegible] كرا، ئەبو جەعفەری مەنصور كەسێكی سیاسی بوو، بەرپرسانی موصڵی بانگ [illegible] بەڕێوەبەری ئاسایشو بەڕێوەبەری پاسەوانانو پارێزگاری بانگ كرد، گوتی ئەوە [illegible] هاووڵاتیان زیانیان پێ دەگات بەهۆی ئاژاوەو فیتنەوە، هیچتان لێناكەم تەنها [illegible] بۆ بكەن كە جارێكی دی ئەگەر شتێكی لەو بابەتە ڕووبدات ئیعدامتان دەكەم، [illegible] بۆ كرد، هاوكات حەزی كرد كەسانی شەرعزانیش ئاگادار بنو بڕیاری شەرعیش [illegible] وەرگرێ، بۆیە كۆمەڵێك زانای بانگ كرد واژووی بە زاناكانیش كرد، بۆ ئەوەی [illegible] سەنگو قورسایی هەبێ ناردی بەشوێن پێشەوا ئەبو حەنیفە بۆ ئەوەی ئەویش [illegible] دانی پێدا بنێ.

[illegible] ئەبو حەنیفە كە سەیری نووسراوەكەی كرد گوتی ئەی ئەمیری ئیماندارن ئەم [illegible] شەرعییە، ئەبو جەعفەر گوتی: چۆن ئەی ئەوان بەرپرس نیین لە ئاسایشی ئەو [illegible] پێشەوا ئەبو حەنیفە گوتی: قوربان ئەوەی مافی كۆتایی پێهێنانی ژیانی خەڵكی [illegible] تەنها خوای پەروەردگارە، تەنها خوا ئەو مافەی هەیە چونكە ئەو خۆی ژیانی پێ [illegible]. ئەگەر بتەوێ كۆتایی بەژیانی كەسێك بهێنی ئەبێ بەگوێرەی دەستوورو یاسای [illegible]. ئەمە حاڵەتی دزییە، تۆڵەی دزی ئیعدامی تێدا نییە، لەبەر ئەوە ئیمزای بۆ [illegible].

### بەگەورە سەیركردنی تاوان

[illegible]بولواحید دەڵێ: لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوەڵانمدا چووین بۆ سەردانی ئافرەتێكی [illegible]. لە گەڕەكێكی شاری بەصرە، تا سڵاوی لێبكەینو هەواڵی بزانین، پێیان گوتین [illegible]. چونكە ناتوانن ببینن، گوتمان بۆچی ناتوانین؟ گوتیان: چونكە ماوەی سێ ڕۆژە [illegible] لەسەر خۆی داخستوەو هەر دەگری، گوتمان ئاخر لەبەرچی وادەكات؟ گوتیان: [illegible] مێروولەیەكی كوشتوە[٢].

---

[illegible]یحراب ل ٢٤٢- ٢٤٣.

[illegible] الصفوة ج٣ ص٤١.

### ٩٣. کەرامەتی هاوەڵان

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێوارەیەك ئوسەیدی کوڕی خوزەیرو عوبادەی کوڕی بەشیر ﷺ ئیشیان هەبوو لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوێکی زۆر ساردو تاریکەشەودا، لەدواییدا هەستان و بەرەو ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە، هەریەکەیان گۆچانێکی پێبوو، بەفەرمانی خوا ئەو گۆچانانە وەکو چرا ڕێگایان ڕووناك دەکردەوە، هەتاکو گەیشتنە ماڵەکانی خۆیان[1].

### ٩٤. خۆبەگەورە زانین

دەگێڕنەوە پیاوێك زۆر خۆی بەگەورە دەزانی، لەسەفەری حەجدا بوو لەکاتی بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی حەج سواری ولاخێك بوو، هەر لەکاتی ڕۆیشتندا خۆی دەکرد بەناو قەرەباڵەغی خەڵکیدا، لەو کاتەدا بەندەیەك و غولامێك لەسەر ڕێگاکەی وەستابوون، کابرا ڕقی هەستا کەوتە لێدانی هەردووکیان و شوێنی خۆی کردەوە، خەڵکەکە زۆر ڕقیان لەو کابرا لووت بەرزە هەڵسا بەڵام هیچ دەستەلاتێکیان نەبوو.

پاش چەند ساڵێك یەکێك کە لەشوێنی ئەو ڕووداوە ئامادەبوو، ئەو حاجییە لووت بەرزەی بینی لەسەر یەکێك لە پردەکانی بەغدا، بینی وا زەلیل دانیشتووەو چاوەڕوانی یارمەتی خەڵکە، دەڵێ: چوومە لای زانیم کە ئەو کابرا لووت بەرزەیە لێم پرسی: تۆ ئەو حاجییە نیت کە فلان ساڵ زۆر بە لەخۆبایی بوونەوە بەناو خەڵکەکەدا دەڕۆیشتیت و کەوتیە ئازاردانی بەندەو غولامەکە؟ گوتی: بەڵێ من بووم، دوایی پرسیارم لێکرد ئەی بۆچی وات لێهاتووە؟ لەوەڵامدا گوتی: من لەجێگایەکدا خۆم بەگەورە دەزانی کە پادشاو گەدا وەك یەك بێ هەواو فیزن، ئێستاش خوا لەجێگایەکدا زەلیلی کردووم کە ژێر دەستەو هەژار خۆیان بە گەورە ئەگرن لەسەرم[2].

هەر سەبارەت بە خۆبەزل زانین، ئەگێڕنەوە ڕۆژێکیان پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەی دانیشتبوو نانیان دەخواردو مریشکێکی سوورکراوە لەبەردەمیان بوو، لەو کاتەدا هەژارێك

[1]) دۆستی باوەڕداران ل ٨٧.

[2]) سۆمای دیدە بەرگی ١ ل ٢٠٧-٢٠٨.

...رگای دا، بەڵام پیاوەکە هەژارەکەی دەرکردو دەرگای بەڕوودا داخست، ساڵ هاتو چوو، ...بوو کە هەژارەکەی دەرکردبوو خێزانەکەی خۆی تەڵاقدا، ئەو ژنە شووی بەپیاوێکی ... کرد. ڕۆژێکیان لەگەڵ پیاوەکەیدا نانیان دەخواردو مرشکێکی برژاو لەبەردەمیان بوو، ...کاتەدا هەژارێك دای لە دەرگا، کە بینیان هەژارێکە پیاوەکە گوتی: ئافرەت ئەو گۆشتەو ...ی بۆ بەرە، کاتێ ئافرەتەکە خواردنەکەی بۆ برد بینی پیاوەکەی پێشوویەتی، کاتێك ...ڕەوە ژوورەوە دەستی کرد بەگریان، پیاوەکەی گوتی: بۆچی دەگریت؟ ئافرەتەکە گوتی: ...بوو هەژارە مێردەکەی پێشوومە، ئافرەتەکە سەرگوزەشتەی پیاوە هەژارەکەی بۆ ...کەی خۆی گێڕایەوە کە چۆن مێردەکەی پێشووی دەرگای بەڕوودا داخست، یەکسەر ...کەی گوتی: بەخوا ئەو سواڵکەرەی کە پیاوەکەی پێشووت دەرگای بەڕوودا داخست من ...بووم بەڕاستی خوا دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ۝١٠﴾ الضحی.

...ر سەبارەت بە دەردی کوشندەی لەخۆبایی بوون ئەو بەسەرهاتەش هەیە، جارێکیان ... (...علاء المعري) لە شوێنێکدا زۆر لەخۆی بایی دەبێتو دەیەوێ خۆی هەڵکێشێت ...: من دەتوانم شتی وا بکەمو بڵێم کە کەس پێش من نەیگوتبێو نەیکردبێ، هەر لەو ...دا منداڵێکی تازە پێگەیشتوو لێی ڕادەپەڕێو دەڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەی پیتێکی تازەم ... جگە لەو (٢٨) پیتەی کە ڕۆژانە بەکاری دەهێنین، ئیتر ئەبو عەلا هیچی پێ ...بوو بێدەنگ بوو[٢].

## ...: ئایینی ئێمە ئایینێکی سرووشتیە

...ە عەرەبێکی دەشتەکییان پرسی چۆن ئیمانت بە موحەممەد ﷺو بە ئیسلام هێنا؟ ...ی لەوەڵامدا گوتی: باوەڕم بە موحەممەد ﷺ هێنا لەبەر ئەوەی فەرمانی بەهیچ ...ێك نەکردووە عەقڵی سەلیم (ژیریی) بڵێ خۆزیا فەرمانی پێنەکردبا، قەدەغەی هیچ ...ێکی نەکردووە ژیریی بڵێ: خۆزگە ئەو شتەی قەدەغە نەکردبا[٣].

---

...ی دیدە ب١ ل٢٩٢٧.

...و ئامۆژگاری لەبەسەرهاتی پیاوچاکان- محمد حسین- ل٢٦.

...ستی باوەڕداران ل ١٠٥.

## ٩٦. بەرهەمو کاریگەریی خۆپاریزیی (تەقوا)

کچێك لە تەمەنی (٢٠)ساڵیدا بەڕووداوی ئۆتۆمبێل دەمرێ، تۆزێك بەر لەمردنی کەس و کاری لێیان پرسیبوو حاڵت چۆنە؟ گوتبووی باشم سوپاس بۆخوا، بەڵام دوای کەمێك لەو پرسیارە دەمرێت خوا لێی خۆشبێت، دەگێڕنەوە دەڵێن دوای مردنی هێنامان بۆ ئەوەی بیشۆین، کاتێك لەسەر تەختە دارەکە دامانـا دەستمان کرد بەشوشتنی، سەیرمان کرد ڕوخساری دەدرەوشایەوە وەکو کەسێکی خەوتووی دەم بەپێکەنین وابوو، هیچ برینێك و شکان و خوێن پرژانێکی نەبوو، مردوو شۆرەکە دەڵێت: کاتێك ویستمان بەرزی بکەینەوە بەتەواوی بیشۆین، ئاوێکی سپی لەلووتی هاتە دەرەوە، ژوورەکەی پڕکرد لەبۆنی میسك، ئێمەش هەموو دەستمان بە ماشاءالله و سبحان الله کرد!!، پاشان پرسیم لەکەسە نزیکەکانی ئەو کچە ژیانی چۆن بوو؟ گوتیان هەر لەتەمەنی (١٠) ساڵیەوە هەموو فەرزەکانی جێبەجێ دەکرد، بەبێ دواخستن و وازهێنان، هیچ کاتێك سەیری فیلم و تەلەفزیۆنی نەدەکرد، گوێی لە گۆرانی نەدەگرت، هەر لەتەمەنی (١٢) ساڵیەوە هەموو دووشەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو، نیەتی وابوو خۆی تەرخان بکات بۆ شوشتنی مردووان، بەڵام بەر لەوەی مردووێك بشوات خۆی بەمردوویی شوورا، مامۆستاو هاوپۆلەکانی باسیان لە ڕەوشت بەرزیو ڕەفتار جوانی ئەو کچە دەکرد، بۆیە ژیان و مردنی کاریگەریی هەبوو لەسەر دەورو بەری[1].

## ٩٧. داوێن پاکی

لاوێکی خواناس لە وڵاتی مصر شتی دەفرۆشت، ئافرەتێك بانگی دەکاتە ماڵەوە دەرگای لەسەر دادەخات بۆ ئەوەی کاری خراپی لەگەڵ بکات، لاوەکەش دەزانێ هیچ چارەی نەماوە دەڵێ: ڕێم بدە دەچم بۆ سەرئاو، ئەویش ڕێی پێدەدا، کە دەچێ بۆ سەرئاو هەندێ پیسایی لە خۆی هەڵدەسوێ بۆ ئەوەی ئافرەتەکە بێزی لێبکات و وازی لێبێنێ، کە دێتە دەرەوە ئافرەتەکە بەو حاڵە دەیبینێ دەری دەکاتە دەرەوە، هەرکە دێتە دەرەوە منداڵان بەم شێوەیە دەیبینن دەکەونە دوایی و گاڵتەی پێ دەکەن، وا دەزانن شێتە، تا دەگاتە ماڵەوە خۆی

---

[1]) منداڵە ژیرەکان- یەعقوب حوسەین- ل٧٦.

دەشوات‌و جلەكانی دەگۆڕێ‌و زۆر سوپاسی خوا دەكات كە لەو تاوانە قێزەونە ڕزگاری كرد، ئیتر دەڵێن لەو ڕۆژە بەدواوە هەتا دەمرێ ئەو لاوە بۆنی میسكی لێهاتووە، دوای ئەوەش كە وەفات دەكات گۆڕەكەی بۆنی میسكی لێدێ، تا ئێستاش گۆڕەكەی بەناو بانگە بە گۆڕی موحەممەدە بۆن خۆشەكە[1].

بۆ زانیاریتان ئێستا گۆڕی ئەو لاوە لەولاتی مصرە بەگۆڕی موحەممەدی بۆن خۆش بەناوبانگە، لەسەری نووسراوە (قبر محمد المعطر) خوێندكارێكی كوردی هاوڕێم لە ولاتی مصر سەردانی گۆڕەكەی كردووە[2].

### ٩٨. یادی خوا

عەلی كوڕێكی فەلەستینی چەپرەو بوو، لەبەر خراپی باری گوزەرانی كۆچی كرد بۆ ولاتی پۆڵەندا، لەبارەی گەڕانەوەی بۆ ئیسلام لە چاوپێكەوتنێكی كەناڵی تەلەفزیۆنی (إقرأ) بەرنامەی (المسلمون في الغرب)دا شەوی (١٩) لەسەر (٢٠)ی مانگی (٣)ی ساڵی (٢٠٠٤)دا گوتی: من كە لەولاتی پۆڵەندا بووم ئەو مسوڵمانانەی لە (جمعيات طلبة الإسلامي)یەوە دەهاتن بۆ كاری بانگەوازی دژایەتیم دەكردن‌و كارەكەم لێ تێكدەدان، (ئیڤۆنا) ئافرەتێكی ڕێك‌و پێكی پۆڵەندی بوو، خووڕەوشتی زۆر جوان بوو، پاش ئەوەی ناسیم خواستم، ئەویش لەبەر ئەوەی من بەناو مسوڵمان بووم هەندێ پرسیاری ئایینی لێدەكردم، منیش زۆر بە مەنتیقی (لۆژیكی) وەڵامم دەدایەوە؟

ڕۆژێك ویستم بچم بۆ سەردانی خزمانم لە ولاتی یۆنان، لەبەر ئەوەی پارەكەم كەم بوو نەمتوانی هاوسەرم لەگەڵ خۆم ببەم، ناچاربووم لەبەشی ناوخۆیی زانكۆ بەتەنیا بەجێی بهێڵم، لەبەر ئەوەی كاتی پشووی هاوینیش بوو زانكۆ چۆڵ ببوو قوتابی تیا نەمابوو، ئیڤۆنای هاوسەرم پێی گوتم باشە ئەگەر بەتەنها ترسام‌و تووشی دڵەڕاوكێ بووم چیبكەم؟ منیش سورەتی ئیخلاص‌و (لا إله إلا الله)م لەسەر كاغەزێك بۆ نووسی گوتم ئەوانە بخوێنە، ئیتر چووم بۆ سەفەرەكەم، كاتێ گەڕامەوە هاوسەرەكەم یەكسەر پێمی گوت:

---

[1]) لە خزمەت قورئاندا ل ٤٣٢- ٤٣٣.

[2]) عەبدولەجید هەریری.

دەمەوێ مسوڵمان بم، منیش گوتم: ئەوە دەڵێی چی ئیسلامی چی؟ من وا شەڕابم بەدیاری هێناوە بۆ هاوڕێیەکانم بەنیازم بۆیان بەرم!! بزانم چی وای لێکردوویت ئەو بڕیارە بدەیت؟ گوتی شەوێکیان کە تەنیا بووم ترسێکی زۆر زۆورم لێ نیشت وەکو شۆڕەبی هەموو گیانم دەلەرزی، وەك گاورەکان نوێژم کرد هیچ سوودی نەبوو، بیرم کردەوە ئەو کاغەزە بخوێنمەوە کە بۆت نووسیومە، کە کاغەزەکەم چەند جارێك خوێندەوە دڵم ئارام بوو، بەجۆرێك بەدڵنیاییەوە خەوتم تا بەیانی دڵم هەر ئارامو دڵنیا بوو، بەمە بۆم دەرکەوت کە ئەو دینە هەقەو ڕاستە مایەی دڵ ئارامیی‌و ئاسوودەییە.

بەڵێ خێزانەکەم بەڕاستی ئیسلامی وەرگرت ئەو ئیسلام بوونەی ئەو بووە مایەی هیدایەتی منیش، ئێستا بەیەکەوە خەریکی بانگەوازیین‌و خزمەتی ئیسلام دەکەین، بەفەزڵی خوا توانیومانە چەندەها کتێب وەربگێڕینە سەر زمانی پۆڵەندی، کە کتێبی ئیسلامی بەو زمانە نەبوو لە کتێبخانەکاندا، هەروەها لە زۆربەی شارەکاندا وتار دەدەین‌و خەڵکیش مسوڵمان دەبن، تەنانەت لەدوا خێوەتگای ئافرەتاندا نزیکەی (١٠٠) ئافرەتی پۆڵەندی مسوڵمان بوون، دەمانەوێ قورئانیش بەزمانی پۆڵەندی ڕاڤە بکەین تا خەڵکی بتوانن زیاتر تێیبگەن، سوودی لێ ببینن، شایانی باسیشە زۆر لەو قوتابیانەی ئێستا بوون بە پزیشك‌و ئەندازیار لەم وڵاتە پێشتر چەپڕەو بوون ئێستا گەڕاونەتەوە باوەشی ئیسلام‌و خزمەتی بەرنامەی خوا دەکەن، ئیڤۆناش دەڵێ: پۆڵۆنییەکان پرۆتستانتن لەبەر ئەوەی پاپاش لەو مەزهەبەی ئەوانە بۆیە شانازیی پێوە دەکەن، خەڵکیی شتێکی وا نازانن سەبارەت بە ئیسلام ئەوەشی کە دەیزانن ناتەواوو شێوێندراوە.

من کە چاوو گوێم کرایەوە هەستم بە بۆشاییەکی گەورە دەکرد لە دەروونمدا، بۆیە کە ئیسلامم ناسی هەروەك ئیسفەنجێکی وشك چۆن ئاو هەڵدەمژێ‌و تێر ئاو دەبێ، بەو شێوەیە بۆشایی دەروونم بەئیمان‌و ئیسلامەتی پڕ بوویەوە، من قەدەرم وابوو عەلی بناسم‌و ببێتە هاوسەرم لەو ڕێگایەشەوە ئیسلام بناسم، سوپاس بۆخواش دوای دووساڵ لە ئیسلامەتییەکەم کە زانیم حیجاب فەرزە خۆم داپۆشی لە کۆمەڵگایەکدا کە زۆر لایان سەیر

بوو، جا خەڵك چۆن بۆ حیجاب بڕوانن من شانازی دەكەم بە حیجابەكەمەوە، چونكە فەرمانی خوایە[1].

هەر سەبارەت بەیادی خوای گەورە، (طبراني) ئەو ڕیوایەتەمان بۆ دەكات: {أن رجلا سأله فقال: أي المجاهدين أعظم أجرا ؟ قال: أكثرهم لله ذكرا قال: وأي الصائمين أعظم لله أجرا؟ قال: أكثرهم لله ذكرا ثم ذكر الصلاة والزكاة والحج والصدقة كل ذلك رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: أكثرهم لله ذكرا فقال أبو بكر الصديق لعمر رضي الله عنهما: يا أبا حفص ذهب الذاكرون الله بكل خير فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: أجل}.

پیاوێك پرسیار لە پێغەمبەری خوا دەكات ﷺ چ موجاهیدێك پاداشتی گەورەترە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەیان زیكرو یادی خوای گەورە زۆر بكات، گوتی: ئەی چ ڕۆژووگرێك پاداشتی زیاترە؟ فەرمووی: ئەوەیان زیكرو یادی خوا زۆرتر بكات، بەهەمان شێوە پرسیاری نوێژكەرو حەجو خێركەری كرد كە كامەیان پاداشتی زیاترە واتە كامە حاجی، كامە نوێژكەر، كامە خێركەر؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموویان فەرمووی: ئەوەیان زیكرو یادی خوای پەروەردگار زیاتر دەكات، لەو كاتەدا پێشەوا ئەبو بەكری صیددیق بە پێشەوا عومەری كوڕی خەتتابی گوت: ئەی باوكی حەفص یادی خوا كەرەوەكان هەموو خێرێكیان بۆخۆیان برد، پێغەمبەری خوا گوێی لەو قسەیەی پێشەوا ئەبو بەكر بوو، فەرمووی: بەڵێ وایە[2].

### ٩٩. مەرجی قەبووڵ بوونی كردەوەی چاك

پێشەوا جەعفەری صادق ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: سەیری كردەوەی چاكەم كرد بۆم دەركەوت بە سێ مەرج نەبێ لای خوا وەرناگیرێ:

یەكەم: پەلەكردن لە ئەنجامدانی.

دووەم: بەنهێنی بكرێت.

---

[1]) ژیانەوە ل ١٦٠- ١٦١.

[2]) ژیاننامەی پێشەوا ئەبو بەكر- حەبیب موحەممەد سەعید- ل ٩٢-٩٤.

سێیەم: بەبچووك زانینی، ئەگەر پەلەی تیا بکریٚ ئەوە پیرۆزی تیایە، ئەگەر بەنهێنی بکرێت ئەوە نیەت پاکی تیایە، ئەگەر بەبچووك زانرا لای خوا گەورە ئەبێت[1].

### ١٠٠. پاداشتی سەردانی نەخۆش

دەگێڕنەوە کە ئەبو موسای ئەشعەری خوا لێی ڕازی بێ سەردانی پێشەوا حەسەن ﷺ دەکات، لەو کاتەدا پێشەوا حەسەن دێتە ژوورەوەو دەپرسێ: ئەبو موسا بۆ سەردانی نەخۆش هاتووی یان بۆ سەردان؟ گوتی: نەخێر ئەی ئەمیری ئیماندااران بۆ سەردانی نەخۆش هاتووم، ئنجا پێشەوا حەسەن گوتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە دەیفەرموو: {مَا عَادَ مُسْلِمٌ مُسْلِمًا إلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ مِنْ حِينَ يُصْبِحُ إِلَى أَنْ يُمْسِيَ وَجَعَلَ اللَّهُ تَعَالَى لَهُ خَرِيفًا فِي الْجَنَّةِ}[2]، واتە: هەرکەسێك سەردانی مسولمانێکی نەخۆش بکات ئەوە هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە (٧٠٠٠٠) فریشتە صەڵەواتی لەسەر دەدەن واتە: ڕەحمەت بارانی دەکەن‌و خوای گەورەش لەبەهەشتدا خەریفێکی پێشکەش دەکات، گوتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران خەریف چییە؟ ئەویش گوتی: ئەو جۆگە ئاوەیە کە دارخورمای پێ ئاو دەدرێ[3].

### ١٠١. پاداشتی کەسی نەخۆش کەوتوو

جارێکیان پیاوێك ئاسنێکی بەسەر لاقیدا بەربوویەوە، لاقی کون بوو، خەڵکیش سەردانیان دەکرد، ئەویش هەر زەردەخەنەی دەهاتێ لەجیاتی ئۆفو هاوار کردن، خەڵکەکەش پێیان گوت لەجیاتی ئەوەی هاوار بکەیت غەمبار بیت زەردەخەنە دەکەی، ئەویش گوتی: لەبەر پاداشتی ئەو ئازارە لەلایەن خواوە ئەو ناخۆشییەم لەبیر چۆتەوە[4].

---

[1] سۆمای دیدە ل٢٧٩.

[2] رواه أحمد.

[3] ژیاننامەی پێشەوا عەلی- حبيب محمد سعيد- ل ٤٣٨- ٤٣٩.

[4] وتاری م. موحەممەد گۆڕسینی.

### ١٠٢. باوەڕی نەخۆش دەبێ وابێ

پێشەوا ئـەبو بـەکر ﷺ جارێکیـان نـەخۆش دەکـەوێت، خـەڵك سـەردانیان دەکـردو دەیانگوت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پزیشکت بۆ بانگ نەکەین تا سەیرت بکات؟ ئەویش فەرمووی: سەیری کردووم، ئەوانیش پرسیان: ئەی چی پێگوتی؟ گوتی: ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾ البـروج، مەبەسـتی پێشـەوا ئـەبو بـەکر خـوای تـەعالا بـووە کـە دەفەرمووێ: هەرشتێکی بمەوێ دەیکەم[١].

### ١٠٣. هۆکارە سەرەکییەکان بۆ نەخۆش کەوتن

یەکێك لە پادشاکانی عەجەم پزیشکێکی باشی نارده خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، چەند ساڵێك لەناو مسوڵمانانی دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، کەسێك بۆ نەخۆشی نەهاتە لای تا داوای چارەسەری لێبکات، پزیشکەکە هاتە حزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گلەیی ئەوەی کرد کە ئەویان بۆ دەرمان کردنی هاوەڵان ناردووە، کەچی لەو ماوەیە زۆرەدا کەسێ ڕووی تێنەکردووم تا چارەسەری بۆ بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {«نَحْنُ قَوْم لا نَأكُلُ حَتّى نَجُوع، وَإذَا أكَلْنَا لا نَشْبَعُ»}[٢] واتە: ئێمە گەلێکین (نان) ناخۆین تا برسیمان نەبێ، ئەگەر خواردیشمان تێر ناخۆین! پزیشکەکە گوتی: ئەمەیە هۆی لەش ساغییان[٣].

### ١٠٤. بەردە ڕەشەکەی کەعبە (حجر الأسود)

لە ساڵانی پەنجاکاندا وڵاتی بەریتانیا بە ماوەی حەوت ساڵ ئەفسەرێکیان فێری زمانی عەرەبی کرد، ، لەپاشان ناردیان لەڕێگەی وڵاتی مەغریب، وەك حاجییەك کە بچێتە وڵاتی مصرو پاشان بۆ مەککەی پیرۆز، ئەمەش بۆ ئەوەی پارچەیەك لەبەردە ڕەشەکە لێبکاتەوەو تاقیکردنەوەی لەسەر بکەن، پیاوەکە ناوی (ریتشارد) بوو، فرسەت دێنێو پارچەیەك

---

[١]) ژیاننامەی پێشەوا ئەبو بەکر- م. حبیب محمد سعید- ل ٩٨.

[٢]) قال السخاوي: "لا وجود له في كتب الحديث المشهورة، ولا الأجزاء المنثورة، وجزم العراقي بأنه لا أصل له، وكذا أنكره المزي وغيره. انظر "المقاصد الحسنة" برقم: (١٧٨).

[٣]) گوڵستانی سەعدی- بەزمانی کوردی- ل ١٧٨.

لەبەردە ڕەشەکە دەکاتەوە، لەکاتێکی چۆڵدا، دەیباتە سەفارەتی بەریتانیو ئەوشەوە لەخۆشیدا ئاهەنگ دەگێڕن، پاشان بەخێرایی دەگەڕێتەوە وڵاتی بەریتانیا، لە مۆزەخانەی بەریتانی پشکنینی بەردەکە دەکرێ لەلایەن پرۆفسۆر (رید)ەوە، سەرەنجام ڕایدەگەیەنێ: کە ئەو بەردە بەردی سەر ئەم زەویە نییە، کە ئەم ئەنجامە بە (ریتشارد) دەڵێن یەکسەر دەبووریتەوە، پاشان ناوبراو ئەمەی لە پەڕاوێکدا بەناوی (گەشتێك بۆ مەککە) لە دوو بەرگدا تۆمار کرد[1].

### ١٠٥. ئاوی زەم زەم

لە سوێدی کوڕی سەعیدەوە دەگێڕنەوە گوتویەتی: لە وڵاتی مەککەدا چاوم بە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك کەوت، کە هاتە لای ئاوی زەم زەمو مشتێکی لێ هەڵگۆزی، دوای ئەوە ڕووی کردە کەعبەو گوتی: خوایە کوڕی ئەبو مەوالی بۆی گێڕاینەوە لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە ئەویش لە جابیرەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ}[2]، واتە: ئاوی زەم زەم بەکەڵکە بۆ هەر شتێك کە نیازی لێبکرێو بۆی بخورێتەوە، وا منیش بۆ تێنوێتی ڕۆژی قیامەت دەیخۆمەوە، دوای ئەوە ئاوەکەی خواردەوە.

### ١٠٦. ڕۆژی عەرەفە

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﵁ دەگێڕنەوە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفاتدا ڕاوەستا لەکاتێکدا کە خەریك بوو خۆر ئاوا ببێ، فەرمووی: {يا بلال أنصت لي الناس} واتە: ئەی بیلال خەڵکەکەم بۆ بێدەنگ بکە، بیلال هەستا گوتی: بێدەنگ بن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کە خەڵکەکە بێدەنگ بوون فەرمووی: {يا معشر الناس أتاني جبريل أنفا فاقرءني من ربي السلام، وقال إن الله عز وجل غفر لأهل عرفات، وأهل المشعر الحرام، وضمن عنهم التبعات} فەرمووی: ئەی خەڵکینە کەمێك بەر لە ئێستا جبریل هاتە لامو سەلامی پەروەردگارمی پێ ڕاگەیاندمو فەرمووی: خوای گەورە لە ئەهلی

---

[1]) ژیانەوە ل ٣١٥.

[2]) رواه أحمد.

عەرەفاتو ئەهلی مەشعەرولحەرام خۆشبوو هەموو تاوانێکی بۆ بژاردنەوە، پێشەوا عومەر هەستایە سەر پێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە بەتایبەتی بۆ ئێمەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {هذا لكم ولمن أتى من بعدكم إلى يوم القيامة} فەرمووی: ئەمە بۆ ئێوەو بۆ هەرکەسێکیشە کە دوای ئێوە بێت تا ڕۆژی قیامەت، پێشەوا عومەر گوتی: خێری خوا گەلێ زۆرو چاکە[1].

### ۱۰۷. داهاتوو بۆ ئیسلامە

پرۆفیسۆری بەریتانی (آرثر أليسون) سەرۆکی بەشی ئەندازەی کارەبایی‌و ئەلیکترۆنی لە زانکۆی لەندەن، مسوڵمان بوونی خۆی لە کۆنگرەی ئیعجازی زانستی قورئاندا لە قاهیرە ڕاگەیاند، گوتی ئیسلام بەو شێوەیەی کە لەقورئان‌و سوننەتدا هاتووە، ڕاستی زانستی زۆری تێدایە، ئەگەر زانایانی ڕۆژئاوا تێبگەن هەموو مسوڵمان دەبن، ڕۆژێك دادێ لێی حاڵی بن[2].

### ۱۰۸. یەکێ لە لێکۆڵینەوەکان لەسەر ئاوی زەم زەم

لێکۆڵینەوەی زۆر لەسەر ئەو ئاوە کراوە، یەکێك لەو لێکۆڵینەوانە ئەوەبوو کە د. عبدالباسط لە بەرنامەیەکی تایبەتدا باسی کرد کە نزیکەی (۱۰۰) ئافرەتی دوو گیان کە ئاوی دەوری کۆرپەلەی سکیان کەم بووە، خستیانە بەر لێکۆڵینەوە، بەوەی کە ماوەیەك ئاوی زەمزەمیان پێدان سەرەنجام بۆیان دەرکەوت کە ئەو ئاوەی دەوری کۆرپەلەکە درووست بۆتەوەو بۆیان بۆتە شیفا، ئەم تاقیکردنەوەیەش بۆ ماوەی سێ ساڵ دووبارە کرایەوە لەگەڵ ئافرەتانی دووگیانی تردا هەمان ئەنجامی دا بەدەستەوە، کە ئەمەش ڕاستی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای سەلماند[3].

---

[1]) رواه إبن المبارك، ڕێبازی خواناسان- حبيب محمد سعيد- ل ۱۰۲.

[2]) لە خزمەت قورئاندا ئەندازیار عوسمان ل ٤٦١.

[3]) ژیانەوە ل ۳۱٦.

١٠٩. سوودو گرنگی باوەڕی مسوڵمان

ڕۆبەرت کانزی تاقیکردنەوەیەکی لەسەر زۆر کەس لە وڵاتانی ئەوروپا کرد بۆی دەرکەوت ڕەنگەکان وەك پێویست نین و شێواوییەکی تێدایە، کەچی مسوڵمانێکی پشکنی بینی ڕەنگەکان هاوسەنگی و ڕێکو پێکی تێدایە، تەنانەت لە کاتی دەستنوێژدا زۆر زیاتر بەرەوە پێستی دەچێ و زیاتر هێمنی و دڵنیای و پاکێتی لە کەسەکەو ڕەنگەکەی دەردەکەوێ، ئەمەش بووە مایەی مسوڵمان بوونی ئەو زانایە[1].

١١٠. گەورەیی و کاریگەری عومرە کردن

د. ڕۆبەرت لە مەککەی پیرۆز تاقیکردنەوەیەکی کرد لەسەر (٣٧) کەس، بەر لەوەی عومرە ئەنجام بدەن، بۆی دەرکەوت هەندێکیان ڕەنگی ڕووناکییەکەی دەوری لەشیان قاوەیی تۆخەو هەندێکی تریان ڕەش و هەریەکەی بەجۆرێکە، پاش ئەنجامدانی عومرە دووبارە پشکنینی بۆ کردنەوە، ڕەنگی ڕووناکیەکەی دەوری لەشیان هەموو بووە سپی[2].

١١١. کچ بەشوودان

پیاوێك بە پێشەوا حەسەنی کوڕی عەلی گوت: من کچێکم هەیە دەمەوێ بەشووی بدەم، بەکێی بدەم چاکە؟ پێشەوا حەسەن پێی گوت: بیدە بە لەخوا ترسێك ئەگەر خۆشی ویست ڕێزی لێدەگرێ، ئەگەر خۆشی نەویست زوڵمی لێناکا[3].

هەر سەبارەت بەمەسەلەی کچ بەشوودان لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان ﭫ خۆیان بانگەوازیان دەکرد بۆ کەسێکی باش کە بێت کچی خۆیانی بدەنێ بێ ئەوەی هیچ لە کەسێتی ئەو باوکە یان ئەو کچە کەم بکاتەوە، پێشەوا عومەر ویستی کچەکەی خۆی بدا بە پێشەوا ئەبو بەکر بەڵام ئەم وەڵامی نەدایەوە واتە: بێدەنگی نواند، بەخشی بە پێشەوا عوسمان ئەویش چەند بیانووی هێنایەوە، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عومەر کچەکەت یەکێك مارەی دەکات لە ئەبو بەکرو

[1]) هەمان سەرچاوە ل ٣١٦.

[2]) هەمان سەرچاوە ل٣١٧.

[3]) وتەی دانایان و زانایان ل ٢٧.

عوسمان باشتر دەبێت، عوسمانیش کچێك بۆخۆی مارە دەکات کە لەکچەکەت باشتر دەبێ، لەدواییدا بۆخۆی مارەی کرد[1].

### ١١٢. خوا ڕزقی هەموو کەس دەدا

مالیکی کوڕی دینار ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: ڕۆژێك خواردنم دەخوارد پشیلەیەك نزیکم کەوتەوە پارچەیەك گۆشتی لێڕفاندمو ڕۆیشت، منیش کەوتمە شوێنی تابزانم ئەو کەرتە گۆشتە چی لێدەکاو بۆ کێی دەبا؟ بینینم پارچە گۆشتەکەی بردو لەبەردەم کونێك داینا خۆیشی گەڕایەوە، دەڵێ: چووم سەیری کونەکەم کرد هیچم تیا نەدی، زۆری پێنەچو مارێکی کوێر لە کونەکە هاتە دەرەوەو پارچە گۆشتەکەی خوارد[2].

هەر سەبارەت بە سیفەتی ڕزقو ڕۆزی دانی خوای ڕۆزیدەر، جارێکیان لە پێشەوا عەلییان ﷺ پرسی: ئەگەر پیاوێك لە شوێنێك دەرگای لەسەر داخرا لەکوێوە ڕزقی بۆ دێ؟ گوتی: هەر لەو شوێنەوە ڕزقی بۆ دێت کە ئەجەلی بۆ دێت[3].

### ١١٣. کارکردن

پیاوێك بە یەحیای کوڕی مەعازی گوت: تۆ دنیات خۆش دەوێ؟ ئەویش گوتی: ئایا ئاخیرەت بەخوا پەرستی دەست دەکەوێ یان بەیاخی بوون؟ پیاوەکە گوتی: بەخوا پەرستی، ئەویش گوتی: ئایا خوا پەرستی بە زیندوویی دەکرێ یان بە مردوویێتی؟ پیاوەکە گوتی: بە زیندوێتی، یەحیاش گوتی: ئایا بۆ ئەوەی بە زیندوێتی بمێنیەوە پێویستت بەخواردن هەیە یان نا؟ پیاوەکە گوتی: پێویستمان پێ هەیە، یەحیا پێی گوت: باشە ئێستا بۆ ئێمە خواردن لە دنیادایە یان لە ئاخیرەت؟ پیاوەکە گوتی: لەدونیادایە، یەحیاش گوتی: کەواتە دونیام چۆن بای ئەوەندە خۆش نەوێ کە پێویستییەکانی ژیانی تێدا جێبەجێ بکەم، تاوەکو بتوانم خواپەرستی بکەمو ئاخیرەت بەدەست بێنم، پیاوەکە گوتی: دانی پێدا دەنێم کە ئەو

---

[1]) سۆمای دیدە بـ١ ل ٢٠٢- ٢٠٣.

[2]) وتەی داناپانو زاناپان لا١٦٩.

[3]) سۆمای دیدە ل ١٨٥.

فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قسەکانت بەرجەستە بووە[1] کە دەفەرمووێ: {إِنَّ مِنَ البَيان لَسِحْراً}[2].

هەر سەبارەت بە مەسەلەی کارکردن، دەگێڕنەوە جارێك پیاوێك دێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ داواکردنی چەند شتێكو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خێزانێکەوە هاتووم ئەوەندە برسیو نەدارن لەوانەیە تا دەگەڕێمەوە لایان لەبرسان مردبن!!، پێغەمبەری خوا پێی دەفەرمووێ: هیچ شتێکتان نییە لەماڵەوە؟ پیاوەکە دەڵێ: تەنها پەڵاسێکمان هەیە بەشێکی ڕادەخەین بەشەکەی دیکەی دەدەین بەخۆمان، دەفرێکیشمان هەیە ئاوی پێ دەخۆینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: بچۆ بیهێنە، پیاوەکە دەچێ ئەو دوو شتانە دەهێنێو لەبەر دەستی پێغەمبەر ﷺ دایان دەنێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کێ ئەوانە دەکڕێ؟ پیاوێك دەڵێ من بەدرهەمێك دەیان کڕم، دووبارە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: کێ دەیان کڕێ؟ پیاوێکی دی دەڵێ من بەدوو درهەم دەیان کڕم، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەوە بەدوو درهەم پێمان فرۆشتی، بەپارەکە تەشوێکی پێ کڕیو پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستە موبارەکەکانی خۆی کلکێکی داری لە تەشووەکە خستو بەکابرای فەرموو: بڕۆ دار بکەو بیهێنە بیفرۆشە تاکو پانزە ڕۆژی دیکە، ئنجا وەرەوە لام، پیاوەکە دەستی بەو کارە کرد تاکو ماوەی پانزە ڕۆژ بینی (۳۰) درهەمی پاشەکەوت کردووە، هاتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی پێی ڕابگەیەنێ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموی: ئەمە لەوە باشترە لە ڕۆژی قیامەت سواڵو داواکردن لەخەڵك ڕوخسار لەکەدار کردبێ[3].

---

[1]) وتەی دانایانو زانایان ل ١٣٦.

[2]) رواه أبو داود.

[3]) رواه أبو داود في الزكاة برقم ١٦٤١، وإبن ماجة في التجارات برقم ٢١٩٨.

## ١١٤. خواناسین و باوەڕبوون بە خوا

عبدالواحدی كوڕی زەید دەڵێ: جارێكیان سواری كەشتیەك بووین ئێمەی بردە سەر دوورگەیەك لەو دوورگەیەدا پیاوێكمان بینی (بت)ی دەپەرست، پێمان گوت ئەوە چی دەپەرستی؟ ئەویش ئاماژەی بۆ بتەكەی كرد، پێمان گوت: ئێمە هەندێك دارمان پێیە لە شێوەی خوایەكەی تۆ، بەڵام ئەوانە خوا نین و ناپەرسترێن، پیاوە بت پەرستەكە گوتی: بۆ ئێوە كێ دەپەرستن؟ گوتمان خوا دەپەرستین، گوتی: خوا كێیە؟ گوتمان ئەو خوایەی كە عەرشی لەسەرووی ئاسمانەكانەوە دەستەڵاتی لەزەویە، كار لە زیندوو مردووو دەكات، پیاوە بتپەرستەكە پێمانی گوت: چۆنتان ناسی؟ گوتمان ئەو خوایە پێغەمبەرێكی بۆ ڕەوانە كردین، ئەو پێغەمبەرە خوای بە ئێمە ناساند، پیاوە بت پەرستەكە گوتی: ئەو پێغەمبەرە چی بەسەرهات؟ گوتمان كە پەیامەكەی تەواو بوو خوای تەعالا بۆخۆی بردیەوە، پیاوە بتپەرستەكە گوتی: هیچ نیشانەیەكی بەجێ نەهێشتووە دوای خۆی بۆ ئێوە؟ گوتمان: با كتێبێكی ئەو خوایەی بۆ ئێمە بەجێهێشتووە، پیاوە بت پەرستەكە گوتی: كوا پێمی بدەن، چونكە دەبێ پەرتووك و نووسراوی پادشاكان زۆر جوان بن.

ئێمەش قورئانێكمان لابوو دامانە دەستی، گوتی: نازانم بیخوێنمەوە، ئێمەش هەندێكمان بۆی خوێندەوە، پیاوە بت پەرستەكە گوێی بۆ ڕادەگرت و دەگریا، تاكو سورەتەكەمان تەواو كرد، ئنجا پیاوە بت پەرستەكە گوتی: بەڕاستی نابێ خاوەنی ئەو قسانە گوێڕایەڵی نەكرێت، بۆیە مسوڵمان بوو، لەگەڵ خۆمان هەڵمان گرت و فێری هەندێ لە بنچینەكانی ئیسلاممان كرد، لەگەڵ هەندێ سورەتی قورئانی پیرۆز، كە بوو بەشەو نوێژی عیشامان كرد ویستمان بخەوین، پیاوەكە پێمانی گوت: هاوڕێیان ئەو خوایەی بەمنتان ناساند دەخەوێ؟ گوتمان نەخێر ئەی بەندەی خوا ئەو خوایە نەدەخەوێ و نە وەنەوز دەدا، پێمانی گوت: دەزانن ئێوە بەندەی زۆر خراپن، گەورەكەتان ناخەوێ كەچی ئێوە دەخەون؟

دەڵێ: ئێمەش سەرمان سوڕما لە قسەكانی، كە گەیشتین بە عەبادان بە هاوڕێكانم گوت: ئەو پیاوە تازە مسوڵمان بووە با هەندێ پارەی بۆ كۆبكەینەوە، هەڵسایین هەندێ پارەمان بۆ كۆكردەوەو دامانێ، گوتی: ئەوە چییە؟ گوتمان: بۆخۆت خەرجی بكە، گوتی: لا

إله إلا الله ئێوە ڕێگایەکتان پێ گوتم کەچی بۆخۆتان نایگرنەبەر، من لەناو دوورگەیەك بووم لەناوەڕاستی دەریا بتم دەپەرست خوا منی بەزایە نەدا، ئایا ئێستا بەزایەم دەدا کە دەیپەرستم‌و دەیناسم‌و لە ئاوەدانیشم؟؟ عەبدولواحید دەڵێ: چەند ڕۆژێکی پێچوو پێیان گوتم وا لەسەر مردنە، منیش چوومە لای دوایی پێم گوت: هیچ کارێکت بەمن نییە؟ پێی گوتم: ئەوەی لە دوورگەکەدا ئێوەی هێنا بۆ لای من‌و دوایی منی دەگەڵ ئێوەدا کارەکانی بۆ جێبەجێ کردم.

عەبدولواحید دەڵێ: پاشان لای ئەو کەمێك مامەوە چاووم چووە خەو، لەخەومدا بینیم گۆڕستانەکەی عەبادان هەمووی ببوو بەمێرگ‌و باخ، لەنێو ئەو باخانەدا خانووێکی تێدا بوو زۆر ئارەزووم بۆی چوو، کاتێ لەخەوەکەم بەخەبەر هاتم بینیم گیانی دەرچووە، هەڵسام شۆردم‌و کفنم کرد، کە بوو بەشەو نووستم لەخەومدا بینینم لەگەڵ حۆریەکدا لەبەهەشت لە کۆشکێکی زۆر خۆشدابو، ئەو ئایەتە موبارەکەی دەخوێند: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٍ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الرعد[1].

### ١١٥. دەرئە نجامی دزی کردن

حاجی شێخ عومەر قەرەداغی لە جادەی خانەقا دوکانداره دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەساڵەکانی پەنجاکان لاو بووم، لەبەنداوی دەربەندیخان کە تازە دروست دەکرا پاسەوان بووم، هەندێ خەڵکی ئەو ناوە فێر ببوبان لەگەڵ پاسەوانەکاندا ڕێك دەکەوتن بەشەو شتیان دەدزی بە شەریکی، هاتنە لام‌و پێیان گوتم: لەگەڵمان ڕێك بکەوە بەشەو دێین هەندێ شت دەدزین دوایی دەیفرۆشین بە شەریکی، منیش گوتم: من خیانەت ناکەم، یەکێکیان گوتی: تا تۆ ئەمە عەقڵت بێ نابی بەخاوەنی هیچ‌و ناتوانی ژن بهێنی، خوا ئاگادارە ڕێم پێنەدان دزیەکە بکەن‌و خوای تەعالاش ڕزقی حەڵاڵی زۆری پێ بەخشیم، پاش نزیکەی بیست ساڵێك ئەو کابرایەی ئەو قسەیەی بەمن گوتبوو: کوڕەکەی دەستی گرتبوو

---

[1]) صفة الصفوة ج٤ ص٥٠٤.

هاتنە بەر دوكانەكەی من سوالّیان دەكرد، بۆ پارەی عەیادەی دكتۆر، كە ئەوەم بینی گوتم: سبحان الله لای خۆی بەتەمابوو بەدرۆو دزی پێ بگاتو دەولّەمەند بێ بەلاّم كەس خێر لەدزی نابینێو بێ بەرەكەتە[1].

### ١١٦. ئیمانی تەواو

زەیدی كوڕی حاریث ﷺ یەكێكە لەو هاوەلاّنەی خۆشەویستی پێغەمبەری خوابوو ﷺ، لەماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ گەورە بوو، كاتێ جەنگی موئتە هاتە پێشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ سەركردەی دیار كرد، فەرمووی: با زەید سەركردایەتی سوپاكە بكات، ئەگەر ئەو شەهید بوو با جەعفەری كوڕی ئەبو تالیب ببێتە سەركردەی سوپاكە، ئەگەر ئەویش شەهید بوو با عەبدوللاّی كوڕی ڕەوواحە ﷺ ببێتە سەركردە، كە ئەو دەنگو باسە بلاّو بوویەوە جوولەكەیەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی (أبا القاسم) لە كتێبەكانمان هاتووە ئەگەر پێغەمبەرێك چەند سەركردەیەك دابنێ بۆ جەنگێك مانای وایە دەزانێ دەكوژرێن، پێغەمبەری خواش ﷺ خوا خستبویە دڵیەوە كە چی دەبێت، بەلاّم هەرچیەكی بە جوولەكەكە بگوتایە كێشە دروست دەبوو، بۆیە هیچی وەلاّم نەدایەوە، پاشان جوولەكەكە چووە لای زەیدو پێی گوت: دەزانی ئەگەر پێغەمبەرێك چەند سەركردەیەك دابنێ بۆ جەنگێك، ئەوە مانای وایە هەموویان دەكوژرێن؟ جا ئەگەر پێغەمبەرەكەی خۆتان پێ ڕاستە ئەوە بچۆ ماڵەوە خواحافیزی یەكجاری بكە ئیتر نایان بینیتەوە، ئەگەر ئەوەش نەهاتە دی مانای وایە موحەممەد پێغەمبەر نییە، زەید لە مەبەستی گلاّوی جوولەكەكە گەیشت زانی دەیەوێ دڵی سارد بكاتەوەو بیخاتە دڵەڕاوكێ، بۆیە بەباوەڕی پتەوەوە گوتی: من شایەدی ئەدەم كە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ ناشگەڕێمەوەدو سەر لەماڵو منداڵم نادەم، پشت بەخوا دەبەستم چی دەبێت با ببێت[2].

### ١١٧. ڕۆڵی ئافرەتو خەبات كردنیان لە پێناو دینی خوا

---

[1]) ژیانەوە ل ١٦٧.

[2]) بەهاری دلاّن ل ٧١.

"أردە کچی حارث"، لەو کاتەی کە (أرقباذ) خەڵکی میسانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی دژی مسوڵمانان هەستن، موغیرەی کوڕی شوعبە بەرەنگاریان بوویەوە، نزیك ڕوباری دیجلە بە دوژمنان گەیشت، "أردە" بیری کردەوە کە هەروا دانەنیشێ کارێك بکات، بۆیە ژنانی هاندا بۆ ئەوەی لەگەڵیا بەرەو جەنگەکە بچن، هەندێ قوماش‌و لەچکی زیادیان کرد بە ئاڵاو لەدوورەوە ئەو هەموو ئافرەتە دەرکەوتن تەپو تۆز بەری ئاسمانی گرت، فارسەکان ترسان وایانزانی یارمەتی سوپا هاتووە بۆ کۆمەکی مسوڵمانان، سەرەنجام ورەیان ڕووخاو هەڵاتن[١].

هەر سەبارەت بە ڕۆڵی ئافرەت سوڵتان (قطز) لە ڕۆژی هەینیدا بەهیوای دوعای مسوڵمانان‌و یارمەتی خوای گەورە پەلاماری تەتەرەکانی دا لە شەڕی عەین جالوت، لە شەڕەکەدا پێنج تەتەر فرسەتیان هێناو هەڵیانکوتایە سەر سوڵتان (قطز)، خەریك بو بیکوژن لەو کاتەدا سوارێکی دەم‌و چاو بەستراو فریای کەوت‌و پەلاماری پێنج تەتەرەکەیدا، خۆیشی بە خەستی بریندار بوو، کاتێ خەریك بوو بکەوێت، هاواری کرد ئاگات لەخۆت بێت سوڵتانی مسوڵمانان، وا من پێشت کەوتم بۆ بەهەشت، سوڵتان هاتە لای ئەو سواریە بریندارە بینی وا خێزانەکەی خۆیەتی، هەڵیگرت‌و بردیەوە خێمەکەی خۆی وە نێوچەوانی ماچ کرد، سوڵتان لەسەر خێزانەکەی دەگریاو دەیگوت: {وا حبيبتاه وا حبيبتاه} ژنەکەی لە گیانەڵادا بوو بە دەنگێکی نزم‌و بەزەحمەت گوتی: مەڵێ {وا حبيبتاه}، بەڵکو بڵێ: {وا إسلاماه}.

ئیتر گیانی سپاردو شەهید بوو، سوڵتانیش بەجێی هێشت‌و چۆوە ناو شەڕەکەو هاواری کرد {وا إسلاماه}، ئەو هاوارەی سوڵتان‌و شەهید بوونی خێزانەکەی بوونە هۆی بەرز بوونەوەی ورەی مسوڵمانان، بە گوڕو تینێکی بێوێنەوە پەلاماری دوژمنانیان داو تێکیان شکاندن[٢].

هەر سەبارەت بە ڕۆڵی ئافرەتان، لەساڵی (٦٠٦)ی کۆچیدا ئافرەتێك بەناوی (مەیسونە) لە دیمەشق چاوەڕێی هەواڵی چوار براکەی بوو کە دەرچوبوون بۆ جیهادی خاچپەرستان،

---

[١]) هەمان سەرچاوە ل ١٦٥.

[٢]) بەهاری دڵان ل ١٦٤- ١٦٥.

پاش ماوەیەك دەنگو باس هات كە هەر چواریان شەهید بوونە، لەگەڵ ئەو موسیبەتە گەورەیەدا ئافرەتەكە بیری كردەوە لەگەڵ دەستە خوشكەكانیدا كارێك بكەن ورەی رووخاوی مسوڵمانان بەرز بكەنەوە، غیرەتو حەماسەتیان بەرز بكەنەوە، بۆ روبەروبونەوەی خاچپەرستە داگیركەرەكان.

ئەو ئافرەتە ژیرە خواناسە هانی دەستە خوشكەكانیدا كە ژمارەیان سەدەها ئافرەت بوون كە پرچی خۆیان ببڕن، بەڵێ هەموویان پرچی خۆیان بڕیو نزیكەی سێسەد پارچە گوریسیان لێ دروستكردو ناردیان بۆ (سبط إبن الجوزي)، كە وتاربێژی مزگەوتی ئەمەوی بوو لە دیمەشق، گوتیان: با موجاهیدان كەڵو پەلی شتومەكی جیهادیان بەو پرچانەی ئێمە ببەستن، وەك بەشداریەك لە جیهاددا، كاتێك ئیمام چووە سەر مینبەر چەند پرچێكی بەدەستەوە بوو، بەگریانەوە كەوتە وتار دانو گوتی: ئەی ئەوانەی كە ئاینەكەیان فەرمانی جیهادی داوە پێیان بۆ ئەوەی دونیا ئازاد بكەن، كەچی ئێستا دانیشتوونو دوژمن خاكیانی داگیر كردووە، ئەی ئەوانەی كە باوو باپیرانیان سەروماڵیان دانا لە پێناوی ئاینەكەیان، چیتانە بۆچی ئاینەكەتان لەیاد كردووە؟ بۆچی دانیشتوونو دینی خوا سەرناخەن؟ ئای بۆ ئێوە ئەوە ئازارتان نادات كە دوژمنی خواو دوژمنی ئێوە خاكتان داگیر دەكات، لەكاتێكدا ئێوە گەورەی دونیا بوون؟

ئەو پرچەی بەدەستییەوە بوو بەرزی كردەوەو گوتی: دەزانن ئەمانە لەچی دروستكراون؟ ئافرەتانتان لە پرچەكانی خۆیان دروستیان كردوو، تا قودسی پێ رزگار بكەن، دەی ئێوە ئەگەر بۆجیهاد بەكاری ناهێنن بیكەن بەپرچ بۆخۆتان ئنجا پرچەكەی هەڵدایە ناویان، بەو وتارە ئاگرینە نوێژخوێنان دەستیان كرد بەگریانو هاواریان لێ بەرز بوویەوە، دوایی كۆمەڵ كۆمەڵ رێك كەوتونو سوپایەكیان پێك هێنا، هێرشیان كردە سەر شارەكانی (نابلس)و (تەرابلوس)، سەركەوتنی باشیان بەدەست هێنا بەسەر خاچپەرستانی ئەو ناوچانە[1].

### ١١٨. دونیا نەویستی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

---

[1]) مواقف لخريجي مدرسة القرآن- د. عماد الدين.

پێغەمبەری خوا ﷺو جبریل (علیه السّلام) لەسەر گردی صەفا دەبن، پێغەمبەری ﷺ دەفەرموێ: {یا جبریل والذي بعثك بالحق ما أمسى لآل محمد سفة من دقيق ولا كف من سويق} فەرمووی: ئەی جوبریل بەو خوایەی کە تۆی بەهەق ناردووە خاوو خێزانی موحەممەد ئێوارەیەکیان بەسەر نەهاتووە مشتێك ئاردیان یاخود مشتێك سوێقیان هەبێت، هەر ئەوەندە فەرمایشتە کە لەدەمی پیرۆزی دەرچوو گوێی لە گرمەیەکی گەورە بوو کە لەئاسمانەوە هات، ڕای چڵەکاندو فەرمووی: {أمر الله القيامة أن تقوم}، واتە: ئەوە خوا فەرمانی دا قیامەت هەستێ، جوبریل فەرمووی: نەخێر، کە خوای گەورە فەرمایشتەکەی بیست فەرمانی دا بەسەر ئیسراڤیل بێتە خزمەتی فەرمووی: ئەی موحەممەد ئەوەی باست کرد خوای گەورە بیستی‌و کلیلی خەزنەی زەویی پێمدا نارد بۆتۆ، فەرمانی پێمدا ئەگەر بتەوێت پێغەمبەرێکی پادشا بیت یاخود دەتەوێ پێغەمبەرێکی بەندە بیت، جوبریل ئاماژەی بۆ پێغەمبەری خوا کرد خۆت بەکەم بگرە، پێغەمبەری خواش ﷺ سێ جاران فەرمووی: {بل نبيا عبدا}[1][2].

هەر سەبارەت بە زوهدو دونیا نەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبو هورەیرە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیم بە دانیشتنەوە نوێژ ئەنجام دەدا، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چیتە وا دەبینم بە دانیشتنەوە نوێژ ئەنجام دەدەی؟ ئەویش فەرمووی: {الجوع يا أبا هريرة} فەرمووی: لەبەر برسێتی ئەی ئەبو هورەیرە، ئەبو هورەیرە دەڵێ: دەستم کرد بەگریان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {لا تبك يا أبا هريرة فإن شدة الحساب يوم القيامة لا تصيب الجائع إذا احتسب في دار الدنيا}واتە: ئەی ئەبو هورەیرە مەگری، هەرکەسێ لە دونیادا برسی بێ وە بەتەمای پاداشتی خوابێ لەسەری، ئەوا تووشی توندو تیژیی‌و زەحمەتی قیامەت نابێ[3][4].

---

[1]) رواه الطبراني- معجم الأوسط.

[2]) ژیاننامەی پێشەوا عومەر- م. حبیب محمد سعید ل ٢١٢.

[3]) رواه أبو نعيم، والخطيب، وابن عساكر.

[4]) ژیاننامەی عومەری کوڕی خەتتاب- حبیب محمد سعید ل ١١٩.

### ١١٩. کارکردن بە زانیاری

دەگێڕنەوە کابرایەك لە بەنی ئیسرائیل هەشتا صندوقی پڕ کردبوویەوە هەمووی پڕ بوون لە زانستو مەعریفەت، هیچ کەڵکێکی لەو زانستانەش وەرنەگرتبوو، خوای پەروەردگاریش وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی نارد کە بەو پیاوە بڵێ: ئەو هەموو عیلمەی کە کۆت کردۆتەوە هیچ سوودت پێ ناگەیەنێ تەنها بەوە نەبێ کار بەسێ شت بکەیت:

١- دونیات خۆش نەوێ چونکە دونیا ماڵی ئیماندار نییە.

٢- برادەرایەتی لەگەڵ شەیتان مەکە چونکە شەیتان ڕەفیقی ئیماندار نییە.

٣- وە ئەزیەتی کەس مەدە چونکە ئەزیەت دان عادەتی ئیماندار نییە[1].

هەر سەبارەت بەکارکردن بە زانیاری، جارێك پێشەوا عومەر لەسەر مینبەر وتاری دەدا فەرمووی: ئاگاداری مونافیقی زانابن، گوتیان چۆن کەسێك موناف‌یق بێ زانا دەبێ؟ گوتی: باسی شتی باش دەکات، کەچی کردەوەی خراپ ئەنجام دەدات[2].

### ١٢٠. ترسان لە فتوادان

ئیبن مەهدی دەڵێ: جارێکیان پیاوێك پرسیارێکی شەرعی لە پێشەوا مالیك دەکات، پێشەوا مالیکیش دەڵێ: لەو مەسەلەیەدا هیچی لێنازانم یان دەڵێ: باش نیم تیایدا، پیاوەکەش بەسەرسوڕمانەوە دەڵێ: من لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتوم بۆلای تۆ تەنیا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە کەچی تۆ دەڵێی نازانم؟!!، پێشەوا مالیکیش پێی گوت: ئەگەر گەڕایتەوە بۆ شارەکەی خۆت پێیان بڵێ: کە مالیك گوتوویەتی لەو مەسەلەیەدا شارەزا نیم[3].

هەر دەربارەی ترسانی زانایان لە مەسەلەی فەتوا، نافیع دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك پرسیارێکی لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر کرد عەبدوڵلا سەری داخستو بێدەنگ بوو

---

[1]) الأستعداد لیوم المعاد ل١٣٠.

[2]) وتەی دانایانو زانایان ل ٢٧٧.

[3]) صفة الصفوة، ج٢ ص١٢١.

خەڵکەکە وایان گومان برد کە گوێی لە پرسیارەکەی نەبووە، بۆیە پیاوەکە پێی گوت: ڕەحمەتی خوات لێبێ ئەوە گوێت لە پرسیارەکە نەبوو؟ عەبدوڵڵا گوتی: بەڵێ گوێم لێبوو بەڵام بۆ ئێوە وادەزانن لەسەر وەڵامی ئەو پرسیارانە خوای پەروەردگار لێپرسینەوەمان لەگەڵ ناکات؟ دەی لێمگەڕێ با لەپرسیارەکەت ورد بمەوەو تێبگەم ئەگەر وەڵامەکەی هەبوو لام ئەوە وەڵامت دەدەمەوە، ئەگەر نەشم زانی ئەوە پێت دەڵێم وەڵامەکەی نازانم[1].

### ١٢١. ئاواتی شەهید بوون

حومەیدی دەڵێ: پیاوێك هەبوو پێیان دەگوت: حممە، یەكێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەردەمی پێشەوا عومەردا بەشداری فەتحی ئەسفەهانی کردووە، خۆی بەخۆی گوتووە: ئەی پەروەردگارم حممە وا گومان دەبات کە حەز بە لیقای تۆ دەکات، دەی ئەگەر ڕاست دەکات بەو ڕاستیەی خۆی لەگەڵ بکەیتو شەهیدی بە قسمەت بکەی، ئەگەر درۆش دەکات هەر شەهیدی بەقسمەت بکەی با پێشی ناخۆش بێ[2].

هەر سەبارەت بە ئاواتی شەهید بوون، خالیدی کوڕی وەلید لەسەرە مەرگدا ئەسەفی ئەوەی دەخواست کە بەشەهیدی کۆتایی بە ژیانی نەهاتووە، دەیگوت: من بەشداری ئەوەندەو ئەوەندە جیهادەم کردوە، لە لەشمدا شوێنێك نییە ئاسەواری شمشێرێك یان ڕمێك یان تیرێکی پێوە نەبێ، کەچی نەکوژرام، وەك چۆن حوشتر دەمرێ وا لەسەر جێگا دەمرم، دەی خوایە چاوی ترسنۆکان تێر خەونەبێ[3].

### ١٢٢. کاری جاسووسی

لە ناپلیۆنیان پرسی چۆنە تا ئێستا نەتتوانیوە ئیسپانیا بگریت؟ لەکاتێکدا هەموو ئەوروپات هێناوەتە لەرز؟ ناپلیۆن گوتی: چۆن بتوانم ئیسپانیا بگرم لەگەڵ ئەم هەموو تێکۆشانەمدا تا ئێستا نەمتوانیوە یەك جاسووسی تێدا پەیدا بکەم کە کارم لەگەڵ بکات[4].

---

[1]) هەمان سەرچاوە ج١، ص ٢٨٩.

[2]) حیاة الصحابة بە کوردی ج١ ل ٥٦٠.

[3]) هەمان سەرچاوە ج١ ل ٦٠٧.

[4]) سۆمای دیدە ب١ ل ٣٢.

### ١٢٣. خراپی سیفەتی حەسوودیو ئەنجامەکەی

بەکری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێ: پیاوێك هەبوو هاموشۆی یەکێ لە پادشاکانی دەکرد، هەموو کات کە دەچووە لای پێلاوەکانی بۆ ڕێکدەخستو بۆی ئامادە دەکرد، پێی دەگوت: {أحسِن إلى المُحسن بإحسانِه، فإن المسيء سيكفيك إساءتهُ}، واتە: هەرکەسێ چاکەی لەگەڵ کردی تۆیش چاکەی لەگەڵ بکە، کەسی خراپەکاریش خراپەکەی خۆی بەسیەتی، پیاوێکی تر لەلایان دەبێ، دەبینێ پادشا گوێ لەو پیاوە دەگرێو ڕێزی لێدەگرێ، حەسوودی پێ دەبا، دەیەوێ لەناوی ببا.

ڕۆژێك ئەو پیاوە حەسودە دەچێتە لای پادشاو پێی دەڵێ: ئەو کابرایەی دێتە لاتو پێلاوت بۆ دادەنێو قسەی خۆشت بۆ دەکات لە شوێنان باست دەکات دەڵێ: پادشا بۆنی دەمی زۆر ناخۆشە، پادشا بە کابرای حەسودی گوت: من چۆن ڕاستی ئەو قسەیە بزانم؟ کابرای حەسودیش گوتی: بانگی بکە لەنزیك خۆت دایبنێ بزانە چۆن دەستی دەنێ بەدەمیەوە، پادشا گوتی: باشە بابزانم وایە، پیاوە حەسودەکە لەلای پادشا دەرچوو، هەستا بانگهێشتی ئەو کابرایەیی لای پادشای کرد بۆ نان خواردنو خواردنێکی بۆ دروست کرد پڕی کرد لەسیر، کاتێ نان خورا پیاوەکە لەماڵی کابرای حەسوود هەستاو چوو بۆ لای پادشا بۆکاری خۆی، قسەکەی هەموو جارەی گوتەوە : {أحسِن إلى المُحسِن...} پادشا بەپیاوەکەی گوت: لێم نزیك بەرەوە، پیاوەکەش لێی نزیك بوویەوە، دەستی لەسەر دەمی خۆی دانا تا بۆنی سیرەکە نەگاتە لووتی پادشا، پادشا گوتی: ئەو کابرایە ڕاستی گوت (مەبەستی کابرای حەسوود بوو)، ئەو پادشایەش عادەتی وابوو بەدەستو خەتی خۆی کاخەزی بۆکەس نەدەنوسی، مەگەر بۆ بەخشینێکی زۆر گەورە نەبا، کاغەزێکی نووسی بەخەتی خۆی بۆ لای یەکێ لە کارمەندەکانی هەر بەو پیاوەی دانارد، لێی نووسیبو هەرکات هەڵگری ئەو نامەیە هاتە لات سەری ببڕەو کەوڵی بکە پێستەکەی پڕ بکە لە (کا) ئنجا بۆمی بنێرە، کابرا بەدڵخۆشیەوە کاغەزی پادشای گرت بەدەستەوەو نەیزانی چی لێنووسراوە چوو بۆ شوێنی مەبەست ، لە ڕێگا کابرای حەسوودی تووش هات، پێی گوت: ئەو نامەیە چییە لەلات ؟ پیاوەکەش گوتی: پادشا نامەی بەخششی بۆ نوسیوم، کابرای

حەسوودیش گوتی: تۆش ببیەخشە بەمن ، کابرا لەبەر ئەوەی پیاوێکی چاك‌و دڵ ساف بوو گوتی ها نامەکە بۆخۆت.

کابرای حەسوود نامەکەی بەپەلە برد، کاتێ کارمەندەکە نامەکەی نامەکەی کردەوە بەکابرای حەسوودی گوت: دەبێ سەرت ببڕم، کابرای حەسوود دەستی کرد بە پاڕانەوە گوتی تخوا ئەو کارە مەکە بەخوا ئەو نامە هی من نییە، ئارام بگرە تا هەواڵێك لەلایەن پادشا دەگەڕێتەوە، کارمەندەکە گوتی: نامەی پادشا هەواڵ گەڕاندنەوەی پێ ناوێ، سەری بڕی‌و کەوڵەکەی پڕکرد لە کا گەڕاندیەوە بۆ پادشا، پیاوە دڵ سافەکە وەك جاری جاران گەڕایەوە لای پادشا بۆ خزمەت کردنی، پادشا لێی پرسی ئەوە نامەکەت چی لێکرد؟ گوتی: فلانە کەس تووشم هات داوای لێکردم نامەکەی پێ بدەم منیش پێمدا، پادشا گوتی: ئەو کەسەی نامەکەت پێی داوە پێمی گوت: کە تۆ لای خەڵکی دەڵێی پادشا دەمی بۆگەنە.

پیاوە دڵ سافەکە گوتی: من هەرگیز شتی وام نەگوتوە، پادشا پێی گوت: ئەی بۆچی ئەو ڕۆژە دەستت نا بەدەمی خۆتەوە؟ پیاوەکە گوتی: ئەو پیاوەی نامەکەم پێی دا ئەو ڕۆژە بانگهێشتی کردبووم بۆ نان خواردن، خواردنەکەی پڕ بوو لەسیر، منیش بۆ ئەوەی تۆ ئەزیەت نەدەم بەبۆنی ئەو سیرە دەستم نا بەدەممەوە، پادشا گوتی: ڕاست دەکەی بەڕاستی خراپەکار خراپەکەی خۆی بەسسە بۆ ئەوەی لەناوی ببا[1].

### ١٢٤. وازهێنان لە ڕق‌و کینە

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی دانیشتبوو چاوی بڕیبووە ئاسمان وەك ئەوەی گوێی لە قسەیەکی پەنهان ڕاگرتبێ، پاشان سەرنجی ئەو هاوەڵانەی دا کە لەدەورو بەری بوون فەرمووی: ئێستا کەسێك دێتە ژوورەوە ئەهلی بەهەشتە، پاش ماوەیەکی کەم سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص هاتە ژوورەوە، پاشان عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خۆی گەیاندە لای سەعدو زۆر تکای لێکردو پێی گوت: ئەو عیبادەتانەی پێ بڵێ کە ئەنجامی دەداو وای لێکردووە شایستەی ئەو پاداشتە گەورەیە بێ،

[1]) إحياء علوم الدين ج٣ ص١٧٨.

سەعد گوتی: هیچ شتێکی زیاترم نییە لەوەی کە ئێوە دەیکەن، ئەوە نەبێ کە من هیچ ڕقو کینەیەك بەرامبەر بە مسوڵمانان هەڵناگرم[1].

هەر سەبارەت بە ڕقو کینە هەڵنەگرتن، زین العابدین جارێکیان ئامۆزایەکی لێی تووڕە دەبێو قسەی پێ دەڵێ: ئەویش هیچ وەڵامی ناداتەوە، کە شەو دادێ دەچێتە لای و پێی دەڵێ: {برام ئەگەر ئەوەی پێمت گوت ڕاستە خوا لێم خۆشبێ، وە ئەگەر ئەوەی پێمت گوت وا نییەو من بەو شێوەیە نیم خوا لەتۆ خۆشبێ}، ئیتر خوات لەگەڵ، ئامۆزاکەی بەهۆی ئەو ڕەفتارە جوانەی زین العابدین زۆر شەرمەزار بوو پەشیمان بوویەوە، پەیمانی پێدا کە جارێکی تر شتی وا دووبارە نەکاتەوە[2].

### ڕق لێبوونەوە بەبێ هیچ پاساوێکی شەرعی

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ڕۆژێکیان پیاوێك بەلای کۆمەڵێك لە هاوەڵاندا تێدەپەڕێو سەلامیان لێدەکات، ئەوانیش وەڵامی سەلامەکەی دەدەنەوە، کە تێپەڕی یەکێك لە هاوەڵان گوتی من ڕقم لەو پیاوەیە لەبەر خوا، ئەهلی مەجلیسەکە گوتیان قسەیەکی خراپت کرد بەخوا پێی دەڵێین، یەکێکیان نارد پێی گوت کە فلانە کەس وای پێگوتی، ئەویش هەستا چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ شکاتی لەو پیاوە کرد کە وای پێگوتبو، پێغەمبەری خواش ﷺ ناردی بەشوێنی ئەو کابرایەی کە قسەکەی گوتبوو، لێی پرسی تۆ وات گوتووە؟ گوتی بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسی بۆچی ڕقت لێی دەبێتەوە؟ کابرا گوتی: لەبەر ئەوەی من دراوسێی ئەوم غەیری نوێژە فەرزەکان نابینم هیچ نوێژێکی تر بکات، کابرای کە شکاتی کردبوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بپرسە بزانە نوێژەکانم هیچ دواخستووە؟ یان ئایا بەخراپی دەستنوێژم گرتووە؟ یان ئایا ڕکوعو سەجدەم بەخراپی بردووە؟ کە پێغەمبەری خوا لێی پرسی کابرا گوتی: نەخێر ئەوانەی هەموو بەباشی ئەنجام داوە، کابرای خاوەن ڕق نەوجارە گوتی: لە غەیری ڕۆژووی ڕەمەزان کە هەندێ ڕۆژ بەچاکیو هەندێ ڕۆژ بەخراپی دەیگرێ نەمدیوە هیچ ڕۆژووێکی تر بگرێ،

---

[1]) پیاوانی دەوری پێغەمبەر- خالید محمد خالید- ل ١٣٥-١٣٦.

[2]) بەهاری دڵان ل ١٤٦.

خاوەن شکایەت گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە بزانە ڕۆژێك دیویەتی ڕۆژوەکەم شکاندبێ؟ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی پرسی: پیاوەکە گوتی: نەخێر نەمدیوە هیچ ڕۆژوویەکی فەرز بشکێنێ، ئەوجارە کابرای خاوەن ڕق گوتی: تا ئێستا نەمدیوە یارمەتی کەسێکی هەژاری دابێ، نەمدیوە هیچ شتێکی بەخشیبێ لەڕێی خوا، مەگەر ئەو زەکاتە نەبێ کە هەندێ جار یەچاكو هەندێ جار بەخراپی دەیدات، خاوەن سکالاً گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بپرسە ئایا لەو زەکاتانەی داومە هیچ کەمو کوڕیەکم هەبووە؟ یان ئایا دوام خستووە؟ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی پرسی، گوتی: نەخێر دوای نەخستووە، پێغەمبەری خوا ﷺ کە زانی بەخۆڕایی ڕقی لەو مسوڵمانەیەو خۆشی نازانێ لەبەر چییە، بە پیاوە خاوەن ڕقەکەی فەرموو: {قُم فَلعَلّهُ خَيْرٌ مِنْكَ} واتە: هەستە ڕەنگە ئەو زۆر لەتۆ باشتر بێت[1].

### ١٢٥. ئەمانەت پارێزی

جارێکیان گەنجێکی (طَيٍّ) لەلای ئەحنەف دانیشتبوو، ئەحنەفیش گەنجەکە زۆر بەلاوە ژیر بوو، بۆیە لێی پرسی: ئەی گەنج ئایا قەت جوانی خۆت بە شتێك ڕازاندۆتەوە؟ گەنجەکە گوتی: بەڵێ: ئەگەر قسەم کردبێ ڕاستم گوتووە، ئەگەر قسەیان بۆ کردبم گوێم گرتووە، ئەگەر پەیمانێکم بەستبێ وەفام کردووە، ئەگەر وەعدێکم دابێ جێبەجێم کردووە، ئەگەر ئەمانەتیان لام دانابێ ناپاکیم تێدا نەکردووە، ئەحنەف گوتی: بەڕاستی ئەوە پیاوەتیی نییە[2].

### ١٢٦. چۆن شەیتان لەخۆت دوور دەخەیەوە

دەگێڕنەوە مامۆستایەك بە قوتابییەکەی گوت: چۆن بەرەنگاری شەیتان دەبیتەوە کاتێ هێرشت بۆ دێنێ؟ قوتابییەکە گوتی: منیش بەرەنگاری دەبمەوەو تێدەکۆشم لەدژی، مامۆستاکە گوتی: ئەی ئەگەر دووبارە هاتەوە بۆت؟ قوتابییەکە گوتی: دەی منیش هەر بەرەنگاری دەبمەوە، مامۆستاکە گوتی: ئاخر ئەوە درێژە دەکێشێ؟ باشە ئەگەر بەلای ڕانە

---

[1]) فقه الدعوة الميداني، ئەو بەسەرهاتە پێشەوا ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە عامری کوڕی واثل.

[2]) وتەی دانایانو زانایان ل ١٥٧.

مەڕێكدا ڕۆیشتیت سەگی ڕانە مەڕەكە نەیهێشت بەوێدا تێپەڕی تۆش ڕێگای دیكەت شك نەدەبرد چی دەكەی‌و چۆن تێدەپەڕی؟ قوتابیەكە گوتی: توانای خۆم دەخەمە كار بۆ پەڕینەوە، مامۆستاكە گوتی: ئاخر ئەوە درێژە دەكێشێ تۆ هەر بتەوێ بڕۆی‌و ئەویش هەر نەهێڵێ، چاكتر وایە بۆ ئەوەی بتوانی بپەڕیتەوە هانا بۆ شوانەكە ببەی كارەكەت بۆ ئاسان دەبێ، ڕۆڵە لەسەر بەندە پێویستە بۆ خۆپاراستن لە شەیتان پشت بە پادشاو خاوەنی هەموو زەوی‌و ئاسمانەكان ببەستێ‌و پەنای پێ بگرێ، ئەوكاتە خواش كارەكەت بۆ ئاسان دەكات[1].

### ١٢٧. دادگەری

یەكێ لە كوڕەكانی هارونە ڕەشید بە توڕەییەوە هاتە لای باوكی، گوتی: فلان كەس (یەكێ لە سەركردەكانی سوپا بوو) جوێنی بە دایكم داوە، هاروون بە پایەكانی دەوڵەتەكەی گوت: سزای كەسێكی وا دەبێ چیبێ؟ یەكێ گوتی كوشتن، یەكێ گوتی زمان بڕین، یەكێ گوتی دوورخستنەوەی لە وڵات، هارون بە كوڕەكەی خۆی گوت: كوڕەكەم باشترین شت ئەوەیە لێی ببووری، ئەگەر نەشت توانی جنێو مەدە بەدایكی ئەگینا ئەگەر جوێنت پێدا ئەوە تۆش وەكو ئەو لەسنوو دەرچووی ئەوكات ستەمەكە لەلایەن تۆوە دەبێ‌و سكاڵا لەو[2].

هەر سەبارەت بە دادگەریی، دەگێڕنەوە پاش فەتحی خەیبەر پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵای كوڕی ڕەوواحەی نارد بۆ لای جوولەكەكان تا بەروبومی ئەهلی خەیبەر بخەملێنن‌و لەگەڵیاندا بیكات بە دوو بەشەوە، بەپێ ئەو پەیمانەی كە بەستبویان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، جوولەكەكان ویستیان بەرتیل بدەن بە عەبدوڵڵا بۆ ئەوەی خەملاندنەكە كەم دابنێ‌و چاوێكی لێیان بێ، ئەویش گوتی: بەخوا لای خۆشەویسترین كەسمەوە هاتووم، ئێوەش لەلای من لە مەیموون‌و بەراز خراپترن‌و ڕقم لێتانە، بەڵام

---

[1] سۆمای دیدە ب١ ل ٦١.

[2] گوڵستانی سەعدی ل ١٠٣- ١٠٤.

دڵنیابن لەوەی نە خۆشەویستەکەم بۆ ئەو نە ڕقەکەم لە ئێوە وام لێناکات دادپەروەر نەبم لەگەڵتان[1].

## ۱۲۸. خشوع لەکاتی دەست نوێژدا

پێشەوا ئیبن و حەجەر وەسفی دینداریی و خواناسی و متمانەیی کەسێکمان بۆ دەکات دەڵێ: {شێخێکی خەڵکی واسط کە نازناوەکەی ئەبا سەعیدەو دراوسێی مەنصوری کوڕی زازان بوو، مەنصوڕ باسی دەکات و دەڵێ: ڕۆژێك بینیم ئەو شێخە دەستنوێژی دەگرت کە تەواو بوو چاوەکانی پڕ بوبوون لە فرمێسك تا وای لێهات دەنگی گریانەکەی بەرز بوویەوە، مەنصوڕ دەڵێ: پێمگوت ڕەحمەتی خوات لێبێ چیت بەسەر هاتووە؟ گوتی: جا چ شتێك لەوەی من گەورەترە، ئەوەتا من دەمەوێ لەبەر دەم خوایەك بوەستم نە دەخەوێ و نە وەنەوز دەدا، خۆزگە ئەو خوایە لێم دەگەڕاو نەیدەسوتاندم، مەنصوڕ دەڵێ: وەڵڵاهی بەو وتەیەی گریاندمی[2].

## ۱۲۹. فیتنەی سەرەمەرگ و هەوڵی شەیتان

عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە لای باوکم بووم لەکاتی وەفاتی دا دەستی کردە ناو ڕیشی و توند گرتی تا ماوەیەك لەهۆش خۆی چوو، پاشان هەنسکێکی داو هۆشی هاتەوە، لەبەر خۆیەوە دەیگوت: نا هەرگیز ئەو ناکەم ئەوە دوورە لەمن، چەند جارێك ئەو ڕستەیەی دووبارە کردەوە، منیش پێم گوت: بابە گیان ئەوە چی دەبینی وا دەڵێی؟ باوکیشم گوتی: شەیتان لەتەنیشتم وەستاوە پەنجەکانی خۆی دەگەزێ و دەڵێ: ئەحمەد وەرە لەو ئایینە لابدە، منیش پێی دەڵێم: نا، ئەوە دوورە لەمن هەرگیز ئەو کارە ناکەم ئەوە دوورە لەمن[3].

هەر سەبارەت بە فیتنەی سەرەمەرگ و هەوڵی شەیتان، ئیبن و ڕەجەب دەڵێ: عەبدولعەزیزی کوڕی ڕەواد گێڕایەوەو گوتی: لەلای پیاوێك بووم لەسەرەمەرگ بوو

---

[1]) بەهاری دڵان ل ۱۱۵- ۱۱۶.

[2]) صفة الصفوة ج۳ ص ۱۲.

[3]) التذكرة ص ٥٠.

دەمویست شایەتمانی پێ بێنم پێمگوت: بڵێ: لا إله إلا الله، بەڵام شتێکی گوت کە بەهۆی ئەو شتەوە بێباوەڕ دەبوو، بەم جۆرە لەسەر ئەو حاڵەتە وەفاتی کرد، دوایی بۆم دەرکەوت ئەو پیاوە گیرۆدەی شەراب خواردن بوو[1].

### ١٣٠. ڕیاکاری (الرياء)

دەگێڕنەوە لە هەندێ لە پیاوباشان کە یەکێکیان گوتوویەتی: شەوێك لە کاتی بەرەبەیان لە ژوورێکی خۆم سورەتی (طـه)م دەخوێند، کاتێك سورەتەکەم تەواو کرد، سەرخەوێکم کرد بینیم کەسێك لە ئاسمانەوە هاتە خوار کاغەزێکی لەدەست بوو لەبەر دەستی منی دانا، لە کاغەزەکەدا هەمان سورەتی لێ نوسرابوو، لەژێر هەر پیتێك (١٠) چاکە هەبوو تەنها پیتێك نەبێ بینیم سڕاوەتەوە، هیچم لەژێر وشەکە نەبینی، گوتم سوێند بەخوا من ئەم وشەیەم خوێندۆتەوە، بەڵام بۆ چاکەکە نابینم لە ژێری، ئەو کەسەی کە کاغەزەکەی بۆ هێنابووم لە ئاسمانەوە، گوتی: ڕاست دەکەی خوێندۆتەوەو ئێمەش نووسیمان، بەڵام گوێمان لێبوو بانگدەرێك بانگی کرد لەلای عەرشی خواوە، بیسڕنەوە پاداشتەکەی حیساب مەکەن، ئێمەش سڕیمانەوە، دەڵێ: منیش لەخەوەکەدا گریام گوتم بۆ ئەوەتان کرد؟ گوتی: چونکە لەو کاتەدا پیاوێك تێپەڕی تۆش دەنگی خۆت بەرز کردەوە بۆ ئەوەی ئەو پیاوە بزانێ تۆ قورئان دەخوێنی ئێمەش بۆیە ڕەشمان کردەوە[2].

### ١٣١. شەیتان

فُضَيل بن عِيَاض دەڵێ: هەندێ لە زانایانو پیاوچاکان بۆیان باس کردم کە: شەیتان هات بۆلای پێغەمبەر مووسا لەو کاتەی کە موناجاتی لەگەڵ خوادا دەکرد، فریشتەیەك بە شەیتانی گوت: وەرە ئەو لاوە تۆ چیت لەم دەوێ کە ئەو خەریکی موناجاتە لەگەڵ خوای خۆی، شەیتان گوتی: تەمەنناى ئەوەی لێدەکەم کە لەباوکی ئەوم تەمەننا کرد کە ئادەمە[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوەو ل پەڕە.

[2]) حكايات الصوفية- محمد أبو اليسر ص ٢١٦- ٢١٧.

[3]) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٢.

**١٣٢.   بێ ئاگابوون لە یادی خوا مردنە**

دەگێڕنەوە كە شێخ نەجمەددین ئەصفەهانی لە شاری مەككە لەگەڵ جەنازەیەكدا دەڕوا بۆ بەخاك سپاردنی، كاتێ جەنازەكەیان شاردەوە مەلایەك دانیشت بۆ ئەوەی تەڵقینی بدا، تەڵقینی جەنازەكەی دا لەو كاتەدا شێخ نەجمەددین پێكەنی كە لە ڕەوشتی ئەودا نەبوو لەو كاتەدا پێبكەنێ، هاوڕێكانی پرسیاری هۆكاری پێكەنینەكەیان لێكردو گازاندەشیان لێكرد، شێخ نەجمەددین گوتی: من كە پێكەنیم لەبەر ئەوەبوو كاتێ مامۆستای تەڵقین دەر دانیشتو مردووەكەی تەڵقین دا، گوێم لێبوو مردووەكە دەیگوت: ئایا سەرتان سوڕ نامێنێ لە مردووێك كە زیندووێك تەڵقینی بدا، مەبەستی ئەوەبوو كە مامۆستای تەڵقین دەر هەرچەندە لە ڕیزی زیندووان هەژمار دەكرێ بە ڕواڵەت، بەڵام لە ڕاستیدا لە ڕیزی مردووانە بەهۆی دڵ مردنیو بێئاگایی لەخوای پەروەردگار[1].

**١٣٣.   پاراستنی زمان**

شێخ ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم پیاوێكی بینی كە قسەی پڕو پوچو بێسوودی دەكرد، ئیبراهیم پێی گوت: ئایا چاوەڕێی پاداشتی خێر دەكەی بۆ ئەو وتانەت؟ پیاوەكە گوتی: نەخێر، ئیبراهیم پێی گوت: ئەی دڵنیای لەوەی لەسەر ئەو قسانەت سزا نادرێی؟ گوتی: نەخێر، شێخ پێی گوت: ئەی چۆن قسەیەك دەكەی كە چاوەڕێی پاداشتی نیت، لەسزاكەشی دڵنیا نییت![2].

**١٣٤. چارەسەر زمان پیسی**

حوزەیفەی كوڕی یەمان ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەی خوا ﷺ پرسیم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زمانێكی تیژم هەیە بەرامبەر خاوو خێزانەكەم دەترسم بەهۆیەوە بخرێمە نێو ئاگر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی داوای لێخۆشبوون لە خوای پەروەردگار ناكەی، من لە ڕۆژێكدا سەد جار داوای لێخۆشبوون لە خوای بەبەزەیی دەكەم،

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ١٨٨.

[2]) وتەی دانایانو زانایان ل ٢٢٣.

واتە: گوتنی (أستغفر الله)، دیارە ئەمە چارەسەرە بۆ زمانپیسی بۆیە پێغەمبەری خوا وای پێ فەرمووە[1].

### ١٣٥. دڵو زوبان

یەکێ لە فەرمانڕەواکان بەرخێکی دایە دەست لوقمانی حەکیم پێی گوت: ئەو بەرخەم بۆ سەربڕەو لە پاکترینو خراپترین گۆشت پارچەیەکم بۆ بێنە، لوقمانی حەکیم بەرخەکەی سەربڕیو دڵو زمانەکەی بۆ هێنا، فەرمانڕەوا هۆیەکەی پرسی کە لەبەرچی تەنها ئەو دوو پارچەیەت هێناوە، لوقمانی حەکیم لەوەڵامدا گوتی: ئەگەر ئەو دوو جێگایە پیسو خراپ بن لە هەموو شوێنێکی تری جەستە پیسو خراپتر دەبن، خۆ ئەگەر ئەو دوو شوێنەش پاکو چاك بوون لەو دوو شوێنە پاکو چاکتر نییە[2].

### ١٣٦. ڕێزی ئافرەتان لە ئیسلام

ژنێکی ئەمریکی پاش ئەوەی کە مسوڵمان بوو دەڵێ: حەز دەکەم بە هەموو توانایەکمەوە هاوار بکەمو ئافرەتانی ئەمریکا لە دەورم کۆببنەوە پێیان بڵێم: وەرن ئایینێکم دۆزیوەتەوە کە بەڕاستی ڕێز لە ئافرەت دەگرێ[3].

هەر سەبارەت بە ڕێزی ئافرەتان لە ئیسلام، لە بەرواری ١/ ٤/ ١٩٩٧ ڕیفراندۆمێك دەستی پێکرد لەو ڕیفراندۆمەدا داوایان دەکرد چەند خاڵێك هەیە پێویستە کاری جیدی لەسەر بکرێ، لە ناو ئەو خاڵانەدا چەند شتێك هەبوون زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا ئیسلام بۆ ئافرەتی بڕیار داوە، لە گرنگترین خاڵەکان ئەمانە بوو:

١- پارێزراو بن لەو دەست درێژییانەی کە دەکرێتە سەریان لەلایەن پیاوانەوە، جۆرە یاسایەك دەربچێ ببێتە ڕێگر لەبەردەم پیاوان نەتوانن ئەو جۆرە دەستدرێژییانە بکەنە

---

[1] پیاوانی دەوری پێغەمبەر ﷺ ل ٢٢٥.

[2] وتەی دانایانو زانایان ل ٣٠.

[3] بەهاری دڵان ل ٢٣٦.

سەر ئافرەتان، کەچی سوپاس بۆ خوا لەناو کۆمەڵگای ئیسلامی ڕەسەن ئەو جۆرە کارە زۆر دوورە لە مسوڵمانان.

٢- داوایان دەکرد ئافرەتان لە پێدانی مووچە وەکو پیاوان بن، ئەو ڕاستییە شتێکە لای زۆربەی خەڵکی شاردراوەیە، لەوڵاتانی ئەوروپا کورو کچێك لە هەمان کۆلێژ یاخود هەمان پەیمانگا دەربچن، لە فەرمانگەیەك دابمەزرێن بەهەمان ناوونیشانو لە یەك ژووردا پیاوەکە مووچەی ٣٠٪ زیاترە لە ئافرەتەکە، کە ئەو دیاردەیە سوپاس بۆخوا لەوڵاتانی مسوڵمانا نابینرێ[1].

## ١٣٧. کاتێ خوا منداڵت نادانێ بزانە خێری تێدایە

ژنی کابرایەکی دەروێش سکی پڕ دەبێ، دەروێشەکە لە ژیانیدا منداڵی نەبووبو، کە یەکەم منداڵی بوو، پێشتر گوتبووی: ئەگەر خوا کوڕێکم پێ ببەخشێ غەیری ئەو جلەی بەرم هەرچی هەیتم دەبێ بیبەخشم بە دەروێشان، قەدەری خواش وابوو منداڵەکەی کوڕ بوو، بەو هۆیەوە خوانێکی گەورەی بۆ دەروێشان ساز کرد، یەکێ لە هاوڕێکانی سەفەرێکی دوورو درێژ دەکات، دوای ئەوەی لەسەفەرەکەی دەگەڕێتەوە لە حاڵی کابرای دەروێش دەپرسێ، ئەوانیش پێی دەڵێن وا لە بەندیخانەیە، ئەویش دەپرسێ لەبەرچی؟ دەڵێن کوڕەکەی شەرابی خواردۆتەوە دوایی بەشەڕهاتووەو کەسێکی کوشتوە پاشان هەڵاتووە، ئێستا باوکی لە شوێنی ئەو گیراوە، برادەرەکەی دەڵێ: گوتم ئەو بەڵایە بوو کاتی خۆی کە داوای لەخوا دەکرد پێی ببەخشێ[2].

## ١٣٨. فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگری گرتن لە خراپە

کاتێ خاتوو خەدیجەی دایکی ئیمانداران لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتنە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە پیاوێکی بەتەمەن بوو شارەزای ئایینەکان بوو، وە خزمی نزیکی دایکمان خەدیجە بوو بۆ ئەوەی پرسیاری لێبکەن سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[1]) میحراب- ل ١٨.

[2]) گوڵستانی سەعدی ل ٣٠٨.

بینیویەتی لە ئەشکەوتەکە، ئەویش پێی گوتن: کە ئەوە وەحییە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە هەمان ئەو وەحییەیە کە بۆ پێغەمبەرانی تری وەکو مووساو عیسا هاتووە، پێی گوتن: خۆزگە بمتوانیایە بەرگرییت لێبکەم کاتێ گەلەکەت دەرت دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەبەرچی دەرم دەکەن؟ گوتی بەڵێ هەرکەسێ ئەو پەیامەی تۆ هێناوتە هێنابێتی دەرکراوەو دژایەتی کراوە[1].

### ١٣٩. وازهێنان لە ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپە

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ کە هاوەڵان بە وێنەی خەرمان دەوریان لێدابوو، هەموو ئەندامەکانی لەشیان کردبوو بەگوێ بۆ بیستنی فەرمایشتەکانی، ئەمەی فەرموو: {كيف بكم أيها الناس إذا طغى نساؤكم وفسق فتيانكم ؟ قالوا: يا رسول الله إن هذا لكائن ؟ قال: نعم وأشد منه كيف بكم إذا تركتم الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر ؟ قالوا : يا رسول الله إن هذا لكائن؟ قال: نعم وأشد منه كيف بكم إذا رأيتم المنكر معروفا والمعروف منكرا؟}[2]فەرمووی: ئەی خەڵکینە بەلاتانەوە چۆنە ئەگەر ئافرەتەکانتان لە سنوور دەربچن‌و گەنجەکانیشتان دەست بکەن بە خراپەکاری، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا شتی وا ڕوودەدات؟ فەرمووی: بەڵێ لەوەش خراپتر ڕوو دەدات پێتان چۆنە ئەگەر واز لە فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگری کردن لە خراپە بێنن؟ گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا شتی وا ڕوودەدات؟ فەرمووی: بەڵێ لەوەش خراپتر ڕوودەدات، بەلاتانەوە چۆنە ئەگەر خراپەتان بەچاکەو چاکەشتان بە خراپە زانیی؟ هاوەڵان سەرسام بوون بەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا ﷺ واقیان وڕما چونکە عەقڵیان بەرگەی شتی وای نەدەگرت[3].

### ١٤٠. حیکمەتی بانگەوازی کردن لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاوازە

عەمرو خالید دەڵێ: لە شاری لەندەن دەگەڕامەوە بە فڕۆکە پیاوێك لەلامەوە بوو وا پێدەچوو لە هیچ حەڵاڵ‌و حەرامێك سڵ نەکاتەوە، منیش لە بابەتی خراپی زینا کردندا

[1]) لە خزمەت قورئاندا ل ٤١٦- ٤١٧.

[2]) رواه أبو يعلى قال حسين سليم أسد : إسناده ضعيف

[3]) ئیرشادو تەبلیغ- محمد گولەن- ل ٣٣- ٣٥.

پێم گوت: تۆ پێت خۆشە دایكو خوشكو كچەكەت زینایان لەگەڵ بكرێ، پیاوەكە وەڵامێكی دامەوە سەرسامی كردم، گوتی: ئنجا چییە ئازادی خۆیانە!، بەڕاستی ئنجا تێگەیشتم پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ ئەو گفتو گۆیەی لەگەڵ لاوێكدا كرد كە داوای لێكردبوو ڕێگای پێبدا بۆ ئەوەی بچێ زینا بكات گەنجەكەی چارەسەر كرد، جیاوازە لەو زەمانو سەردەمەی ئێمە، ئەوكات خوو ڕەوشتی خەڵكی وەك سەردەمی ئێستای لێنەهاتبوو، ئێستا دەبێ لە ڕێگەی ترەوە لەگەڵ خەڵكی بدوێیت[1].

### ١٤١. بانگەوازی كردن بۆ دینی خوا لە دڵێكی پڕ ئیمانەوە

كوڕێك بە باوكی دەڵێ: باوكە كاتێ تۆ باسی دینی خوا بۆ خەڵك دەكەی خەڵكی زۆر پێت كاریگەر دەبنو بە قسەكانت دەهەژێن، كەچی كەسانی تر وانین لە بانگەوازی كردنیان؟ ئەویش گوتی: كوڕم (لیس النائحة كالثكلى)، واتە: شینو ڕۆڕۆی بەكوڵی كەسێكی جەرگ سووتاو وەكو گریانو لالانەوەی كەسێكی بەكرێ گیراو نییە[2].

### ١٤٢. ئیسلام ئایینێكی ڕاستو مایەی هیدایەتو ڕەحمەتە

كابرایەك كە ناوی (سیلیی)یە دەڵێ: قەشەیەكی چالاك بووم بەهەموو توانامەوە كارم دەكرد، لەگەورە قەشەكانی خوارووی ئەفریقیا بووم، لەبەر ئەوەی زۆر چوستو چالاك بووم فاتیكان منی هەڵبژارد كە هەستم بە كاری تەبشیری، پارەو پارمەتیم لەوێوە بۆ دەهات، منیش هەموو هۆكارێكم بەكار دەهێنا بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانم، گەشتو سەردانی بەردەوامم دەكرد بۆ پەیمانگاو قوتابخانەو نەخۆشخانەو دامو دەزگامانی تر، لە شارو لادێكان، بەو پارمیەی بۆم دەهات دەستی هەژارو لێقەوماوانم دەگرت، ئەمەش بۆ ئەوەی ئایینی مەسیحیەتییان لەلا شیرین بكەم، كەنیسەش پارەی زۆریان بۆ ڕشتبووم، بەو هۆیەوە گوزەرانم زۆر باش بوو، پلەو پایەیەكی بەرزم هەبوو لەناو سەرجەم قەشەكاندا، ڕۆژێك چووم بۆ بازاڕێكی گەورەی شار كە هەندێ كەلو پەل بكرم، لێرەدا موفاجەئەكە ڕوودەدات، هەر لەو بازارەدا بازرگانێك بەسەرو ڕیشو جلو بەرگیدا دیار بوو كە مسوڵمانە، منیش

---

[1] ) ژیانەوە ل ٢٢٠.

[2] ) لە خزمەت قورئاندا ل ٥٣٨.

جل‌و بەرگێکی تایبەتی قەشەم لەبەردا بوو، پاش مامەڵە کردنی کەل‌و پەلێك کە دەمویست بیکڕم بۆ دیاریی، بازرگانەکە لێی پرسیم تۆ قەشە نییت؟ گوتم با، گوتی کێ خواتە، منیش گوتم: مەسیح خوایە، گوتی: من تەحەددات دەگەم کە تەنها یەك ئایەتم بۆ بێنی لە ئینجیل لەسەر زمانی حەزرەتی مەسیح بڵێ: (أنا الله وأنا إبن الله)، قەشە سیلیی دەڵێ قسەکانی وەکو چەکوش دای لەسەرما نەمتوانی هیچ وەڵامێکی بدەمەوە، هەرچەند بیرم کردەوە بەدڵ پیاچوونەوەم بۆ ئینجیل کرد نەمتوانی ئایەتێکی وەها بدۆزمەوە لەسەر زمانی مەسیح، بۆیە زۆر ئیحراج بووم لەبەردەم پیاوە مسوڵمانەکە هەستم بە دڵتەنگی کرد، لەدڵی خۆم گوتم: باشە چۆن وەڵامی ئەو پرسیارە نازانم؟ پیاوەکەم بەجێهێشتوو گەڕامەوە بەبێ ئەوەی بزانم بەرەو کێ دەچم، بۆیە بڕیارمدا کە بگەڕێم بەدوای ئەو باسەدا، چەند گەڕام هیچم دەست نەکەوت، ناچار بووم داوای کۆبوونەوەیەکم کرد لە ئەندامەکانی مەجلیسی کەنیسە، ئەوانیش ڕازی بوون، لە کۆبوونەوەکەدا ئەوەی ویستم پێم گوتن، ئەوانیش هەموو پێیان گوتم: کابرای هیندی تۆی خەڵەتاندووە (ئەوان لەوێ بە مسوڵمانان دەڵێن هیندی)، پێیان گوتم: ئەو ویستویەتی هەڵت خەڵەتێنێ.

گوتم ئێ باشە ئێوە وەڵامم بدەنەوە، وەرن وەڵامی پرسیارەکەی ئەو کابرا مسوڵمانە بدەنەوە، کەس نەیتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، ڕۆژی یەکشەممە چووم بۆ ئەوەی دەرس بڵێمەوە ئامۆژگاری پێشکەس بکەم لە کەنیسە، هەرچەندی خۆم هێناو برد دەمم بووە تەڵەی تەقیو نەمتوانی هیچ بڵێم، ناچار داوام کرد کەسێکی تر لەشوێنی من قسە بکا، چونکە لە ڕاستیدا من ڕووخا بوم‌و دەروونم شپرزە بوو!!، ڕۆیشتمەماڵەوە زۆر خەفەتبار بووم لە سووچێکدا دانیشتبووم دەستم کرد بە گریان، پاشان سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان کەوتمە دوعا کردن، بەڵام داوا لە کێ بکەم؟ ڕووم کردە ئەو خوایەی کە بەدیهێنەرمانە، گوتم: پەروەردگارو بەدیهێنەرم هەموو دەرگاکان بە ڕوومدا داخراوە، تەنها دەرگای میهرەبانی تۆ نەبێ، بێبەشم مەکە لە زانینی ڕاستی، هەق‌و ڕاستی لەکوێیە؟ پەروەردگارا لەم سەرگەردانییە مەمهێڵەوە، ڕێی هەق‌و ڕاستیم نیشان بدە.

پاشان خەوم لێکەوت لە خەومدا بینیم بەتەنها لە هۆڵێکی زۆر گەورەدا بووم، لەلای پێشەوەی هۆڵەکە کەسێکم لێ وەدەر کەوت لەبەر ڕۆشنایییەکەی نەمتوانی تەواو دیقەتی

بدەمو ببینم، پیاوەکە بانگی کردم گوتی ئیبراهیم، منیش سەیری دەورو بەری خۆم کرد کەسم نەبینی لە هۆڵەکەدا، پیاوەکە پێی گوتم تۆ ئیبراهیمی ناوت ئیبراهیمە، تۆ داوات نەکرد لەخوا هەقو ڕاستی بناسیت؟ گوتم: بەڵێ، گوتی سەیری لای ڕاستت بکە، سەیرم کرد کۆمەڵێك پیاوم بینی کەلو پەلیان بەکۆڵەوە بوو دەڕۆیشتن، جلی سپیان لەبەر بوو عەمامەی سپیشیان لەسەر بوو، پیاوەکە پێی گوتم دوای ئەوانە بکەوە، بۆ ئەوەی هەقو ڕاستی بناسی، زۆر خۆشحاڵ بووم، بەڵام نیگەران بووم لەوەی دەگەڕام بەدوای ئەو کەسانەدا بەڵام نەمدەبینین، بڕیارمدا کۆڵ نەدەمو بەدوای هەقدا بگەڕێم هەروەك لەخەوەکەدا پێم گوترابوو دڵنیاش بووم لەوەی کە ئەوانە هەمووی لەخواوەیە، مۆڵەتم وەرگرت لە کارەکەم کەوتمە گەڕان شارەو شار هەر مسوڵمانێکم دەبینی سەیرم دەکرد پانتۆڵی لەبەر بوو، عەمامەیان بەسەرەوە نەبوو، تا گەیشتمە شاری (جوهانسبێرگ) لە نووسینگەی مسوڵمانای ئەفریقیا خۆم بینینەوە، پرسیاری ئەوەم کرد ئەو مسوڵمانانە لە کوێن کە جلی سپیان لەسەرەو عەمامەی سپیشیان لەسەرە، وایانزانی هاتووم سواڵ دەکەم، ویستیان هەندێ پارەم پێ بدەنو بەڕێمکەن، گوتم کاکە من داوای پارە ناکەم، پەرستگای نزیکتان نییە لەو ناوچەیە؟ ئەوانیش مزگەوتێکی نزیکی شوێنەکەیان پیشان دام، ئەوەی سەیر بوو لەلام پیاوێك لەبەر دەرگای مزگەوتەکە وەستابوو جلێکی سپی لەبەر دابوو حەمامەیەکی سپیشی لەسەربوو، زۆر دڵخۆش بووم گەشامەوە لەدڵی خۆمدا گوتم ئەمە ئەوەیە کە بەدوایدا دەگەڕێم، ڕۆیشتمە لای بەبێ ئەوەی هیچ بڵێم پیاوەکە دەستپێشخەری کردو گوتی: مەرحەبا ئیبراهیم، تووشی سەرسوڕمان بووم، ئەو پیاوە چۆن ناوم دەزانێ؟ ئنجا پێمی گوت: لەخەوما بینیومە کە بەدوامانا دەگەڕای، ئەتەوێ بگەیتە هەقو ڕاستی، هەقو ڕاستی ئەو ئاینەیە کە خوا پێی ڕازییە کە بریتییە لە ئیسلام، منیش پێم گوت: خەونێکی لەم جۆرەم بینیوە دەتوانی پێم بڵێی ئەو پیاوە کێیە کە لەخەوما بینیومە؟

ئەویش پێی گوتم: ئەوە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە لەخەودا بینیت، لەخۆشیان باوەشم کرد بەو مسوڵمانە گوتم: بەڕاست ئەوە پێغەمبەرەکەتان بوو بینیومە لە خەودا، پیاوەکە گوتی: بەڵێ، ئیتر چوومە ناو مزگەوتەکەوە پێشەوازیەکی گەرمیان لێکردم، لە سووچێکەوە دانیشتم لە پشتەوە، ئەوانیش نوێژی نیوەڕۆیان ئەنجامدا، بینیم سوجدەو

ـکۆع دەبەن بۆخوا، لەدڵی خۆم گوتم: بەخوا ئەو ئایینە ئایینی هەقو ڕاستییە، لەزۆر بەراودا خوێندوومەتەوە کە پێغەمبەران نێوچەوانیان لە زەوی دادەنێن بۆخوای پەروەردگار.

پاشان شایەتمانم هێنا زۆر گریام لە خۆشی ئەوەی کە خوا هیدایەتی دام بۆ ئیسلام، ماوەیەك لەلایان مامەوە بۆ ئەوەی فێری ئیسلام بم، پاشان لەگەڵیان دەرچووم بۆ دەعوە کردن، سەردانی چەندەها شارو لادێمان کرد، زۆر دڵخۆشبووم لەگەڵیاندا فێری نوێژو ڕۆژوو شەونوێژو ئەمانەت پارێزیو ڕاستگۆیی بووم، تێگەیشتم کە مسوڵمانان ئوممەتێکن خوای تەعالا بەرپرسیاری کردوون لەوەی ئایینەکەیان بڵاو بکەنەوە، پاش چەند مانگێك گەڕامەوە شارەکەی خۆم بینیم خزمو کەس بەدوامدا دەگەڕێن، کە منیان بینی بە جلو بەرگی مسوڵمانانەوە زۆر نارەحەت بوون داوایان لێکردم بەزویی لەگەڵ مەجلیسی کەنیسەدا دانیشم، لەکاتی دیاری کراودا کۆبوونەوەم لەگەڵ کردن، زۆر سەرزەنشتیان کردم کە وازم لە گاورێتی هێناوە، منیش پێم گوتن کەس سەری لێ نەشێواندوومو هەڵنەخەڵەتاووم، بەڵکو لەخەوما پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە ڕێنمایی کردووە، پێم گوتن: بۆیە من لێرەوە داواتان لێدەکەم بۆ ئەوەی ئایینی ئیسلام هەڵبژێرن، ئەوانیش زۆر سەرسام بوون بە قسەکانم، ئنجا لە ڕێگەیەکی ترەوە ویستیان پەشیمانم بکەنەوە ئەویش لە ڕێگەی پارەو کورسیو مەنصەب، گوتیان: فاتیکان داوای کردووە شەش مانگ لەلایان بمێنییتەوە خەرجییەکەی هەموو لەسەر کەنیسە دەبێ سەیارەیەكو خانوویەکی تازەشت پێ دەدەین، پلەشت بەرز دەکەینەوە لە کەنیسە، منیش گوتم: بەخوا واز لە ئیسلام ناهێنم ئەگەر پارچە پارچەشم بکەن، ئنجا من لەبەرامبەردا کەوتمە ئامۆژگاریی کردنیان، سوپاس بۆخوا دوو قەشەی تر مسوڵمان بوون، جا کە زانییان سوورم لەسەر ئیسلامەتی، هەرچی پێیان دابووم لێیان سەندمەوە، ئەمە چیرۆکی ئیبراهیم سیلی بوو[1].

[1]) بەهاری دڵان ٢١٠- ٢١٤.

### ١٤٣. لەبەر خوا خۆشم دەوێیت

ڕۆژێـك پیاوێـك بـەلای كـۆڕو مەجلیسـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ تێپـەڕی یـەكێك لـە ئامادەبووان گوتی: من ئەم پیاوەم خۆش دەوێ، پێغەمبەری خواش ﷺ ویستی هاوەڵان فێـر بكات چۆن كەسێكیان خـۆش بوێـت بـۆی دەربـبڕن، بۆیـە بـە پیاوەكەی فـەرموو: ئایـا پێـت گوتـووە كـە خۆشـم دەوێـی؟ گـوتی: نـەخێر تـا ئێسـتا پـێم نـەگوتووە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی هەركەسێك براكەی خۆی خۆش ویست با پێـی ڕابگەیـەنێ كـە خۆشـم دەوێ، بۆیـە پێی فەرموو: بچۆ پێی بڵێ كە خۆشم دەوێی، بۆیە پیاوەكە بەپەلە چوو بـۆلای كـابراو پێـی گوت: كە لەبەر خوا تۆم خۆش دەوێ، بۆیە كابراش پێی گوت: بەو ئەندازەی كە منـت خـۆش دەوێ خواش تۆی خۆش بوێ[1].

### خۆڕاگریو دانایی

ئەبو طەڵحەی ئەنصاری كە هاوسـەرەكەی نـاوی ئـوم سولەیم بـوو، منـاڵێكی بچووكیان هـەبوو، منداڵەكـەیان نـەخۆش دەكـەوێ لـەو كاتەشـدا ئـەبو تەڵحـەی بـاوكی سـەفەرێكی دەكەوتـە پـێش بـە خێزانەكـەی دەڵـێ: ئاگـاداری منداڵەكـەمان بـە تـا دەگەڕێمـەوە، بـەڵام قەدەری خـوا وابـوو تـا دەگەڕێتـەوە ماڵـەوە منداڵەكـەیان دەمـرێ، خێزانەكەشی منداڵەكەی كفنو دفن دەكاتو داوادەكات كە كەس هەواڵ نـەدات بـە پیاوەكـەی كـاتێ دەگەڕێتـەوە، بۆیـە كـاتێ ئـەبو تەڵحـە دەگەڕێتـەوە ماڵـەوە نـازانێ كـە وەفـاتی كـردووە، پرسـیاری حـاڵی منداڵەكـەیان لـە خێزانەكـەی دەكـات؟ خێزانەكەشـی دەڵـێ: لێیگـەڕێ بۆخـۆی بـە ئـارامی خەوتووە، بۆیە خواردن بۆ پیاوەكەی ئامادە دەكات، هیچ هـەواڵێكی پـێ نـادات، بـەڵكو خـۆی بۆ دەڕازێنێتەوە ئەو شەوە وەكو بووكو زاوایەكی تازە دەخـەون، پاشـان بـە پیاوەكـەی دەڵـێ: پیاوەكـە ئەگـەر كەسـێ شـتێكی بـە ئەمانـەت لای كەسـێك دانـا پاشـان داوای كـردەوە دەبـێ نەیداتـەوە؟ پیاوەكـەی گـوتی: نـەخێر، گـوتی: دەبـێ پێـی نـاخۆش بـێ ئەمانەتەكـەی بـۆ بگەڕێنێتـەوە؟ دووبـارە گـوتی نـەخێر نـابێ پێـی نـاخۆش بـێ، ئنجـا هـەواڵی وەفـاتی منداڵەكەیانی پێدا كە ئەو منداڵە لای وان ئەمانـەت بـووەو ئێسـتاش خـوای بێوێنـە بۆخـۆی

---

[1] ئەم بەسەرهاتە پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی كردووە.

بردوویتیەوە، ئەبو تەڵحە بەیانی چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەموو ئەو قسانەی بۆ گێرایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ، دوعای خێری بۆ کردو دوعای بەرەکەتی بۆ کرد، پێی فەرموون خوا بەرەکەت بهاوێتە ئەو شەوەتانەوە، پاشی ماوەیەك خوای تەعالا منداڵێکی پێ بەخشین، ئوم سولەیم هێنایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، خورمای کرد بەددمیەوە، ناویان نا عەبدوللا، پیرۆزی کەوتە ژیانی ئەو منداڵەوە، خوای بەخشەر پاش گەورە بوونی ئەو منداڵە حەوت کوڕی پێ بەخشی هەموویان بوون بە حافزی قورئان[1].

### ١٤٤. خۆڕاگری

جارێك هاوسەری مامۆستا مەلا حەمە کەریم داوای لێدەکات دەڵێ: مامۆستا بەڵکو مۆڵەتم بدەیت تا سەردانی ماڵی باوکم بکەم، ئەویش پێی دەڵێ: باشە مۆڵەتت دەدەم بەڵام حەز ناکەم منداڵەکان لەگەڵ خۆت ببەیت (ئەحمەدو سەبری) خێرا دەڵێ: ئەوان بێ من ئیدارە ناکەن حەز دەکەم لەگەڵ خۆم بیانبەم، مامۆستا دەڵێ: وا هەست دەکەم ئەگەر لەگەڵ خۆت بیانبەی لەوێ نەخۆش دەکەونو دەمرن لەگەڵ خۆت نایانهێنییەوە، کەشو هەوای ئەوێ زۆر گەرمە (مەسۆیی بەرگەچ)، خێزانی مامۆستا دەڵێ: مامۆستا ژیانو مردن بەدەست خوایە ئینشائەڵلا شتی وا ڕوونادات، مامۆستا مۆڵەتیان دەداتو دەڕۆن، قەدەری خوا وا دەبێ هەردوو منداڵەکە لەماڵی باپیرەیان نەخۆش دەکەونو دەمرن، وە هەر لەوێ دەیاننێژن، خێزانی مامۆستا زۆر خەم دایدەگرێ قسەکانی مامۆستای بیر دێتەوە، ئەو ڕووداوە جەرگ بڕە زۆر کاری تێدەکات، کاتێ دەگەڕێتەوە ماڵەوە لەگەڵ برایەکی دەگەڕێتەوە، خێزانەکەی کە مامۆستا دەبینێ زۆر ڕەنگی تێك دەچێو دەشڵەژێ، مامۆستا حەمە کەریمیش بەزەردەخەنەوە بەخێر هاتنەوەیان لێدەکاتو دەڵێتە خێزانەکەی: ئەی کوا ئەحمەدو سەبری؟ هاوسەرەکەی گەرووی پڕ دەبێ لە گریان دەیەوێ وەڵام بداتەوە مامۆستا یەکسەر دەڵێ: ﴿...إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ البقرة. ویستی خوای لەسەر بووە، خوای گەورە پاداشتی ئارام گرتنمان بداتەوە، خەفەت مەخۆ، بەبێ ئەوەی ووشەیەکی وا بەزاری دابێ کە خوای تەعالا پێی ناخۆش بێ، ساڵ دێتو دەڕوا خوای بەخشەر کوڕ کچی

[1] ) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ل١٥٣.

تریان پێ دەبەخشێ، کوڕێکیان ناو دەنێن ئەحمەد، کچێکیشیان ناو دەنێن سەبری، مامۆستا خوا عەفوی کا پاشی خۆی چوار کوڕو دوو کچی لە ژیاندا ماون بەناوەکانی (موحەممەدو ئەحمەدو مەحمودو جەمالو سەبریو ڕەحمە)[1].

### ١٤٥. ئافرەتێکی تێکەڵ لەگەڵ قورئاندا

عەبدوڵلای واصتیی ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: ڕۆژێکیان چوومە مزگەوتی حەرام چاوم بە ئافرەتێك کەوت زۆر بە ویقارو ڕێکو پێکییەوە قورئانی دەخوێند، منیش گوتم: سەلامی خوات لەسەربێ ئەی جاریەی خوا، ئەویش وەلامی دامەوەو گوتی: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾ ﴾ یس واتە: ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە لەلایەن پەروەردگاری بەبەزەییانەوە سەلامیان لێدەکرێ، دەڵێ پێم گوت ناوت چییە؟ ئەی جاریەی خوا؟ پێی گوتم: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ ...﴿١٦﴾ ﴾ مریم واتە: لە قورئاندا باسو یادی مەریەمیان بۆ بکە، پێم گوت: بۆچی هاتویتە ئێرە؟ گوتی: ﴿ ...وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ ...﴿٩٧﴾ ﴾ ال عمران مەبەستی ئەوە بوو کە هاتووە بۆ بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج، دەڵێ: منیش پێم گوت: شووت کردووە؟ ئەویش گوتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ...﴿١٠١﴾ ﴾ المائدة واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە پرسیار لە هەندێ شتێك مەکەن کە ئەگەر بۆتان ڕوون بێتەوە تووشی سەغڵەتی دەبن، دەڵێ پێم گوت منداڵت هەیە؟ دەڵێ یەکسەر گوتی: ﴿ ...وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ ﴾ الشورى واتە: هەندێ لەخەڵکی خوای تەعالا نێرینەیان پێ دەبەخشێ، دەڵێ ئەو جارە پرسیارم لێکرد منداڵەکەت ناوی چییە؟ ئافرەتەکە گوتی: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ ...﴿٥١﴾ ﴾ مریم دەڵێ تێگەیشتم کوڕێکی ناوی موسایە، دەڵێ: دوایی ئافرەتەکە گوتی ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ ...﴿٢٦﴾ ﴾ ص واتە: ئەی داود ئێمە تۆمان کردە جێنشینی پێغەمبەرانی پێشوو لەسەر زەوی بۆ گەیاندنی فەرمانی خوا، هەروەها ئافرەتەکە

[1]) وتەی دانایانو زانایان ل ١٥٤- ١٥٥.

گوتی: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَ ...﴿٤١﴾ ﴾ مریم مەبەستی ئەوەبو كە كوڕێكی تری ناوی ئیبراهیمە، دەڵێ: بەو ئافرەتەم گوت دەتەوێ سواری حوشترەكەم بی؟ ئافرەتەكە گوتی: ﴿ ... وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ﴿١٢٧﴾ ﴾ النساء واتە: ئەگەر كردەوەی چاك بكەیت خوا ئاگادارەو چاكە ون نابێ، ئنجا كاتێ ویستی سواری حوشترەكە بێ گوتی: ﴿ قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ ...﴿٣٠﴾ ﴾ النور واتە: بە ئیماندارانی پیاو بڵێ چاوەكانیان لەسەیر كردنی حەرام بپارێزن، كاتێ سواری حوشترەكە بوو گوتی: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ الزخرف كاتێ ویستیشی لە حوشترەكە دابەزێ گوتی: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ المؤمنون واتە: بڵێ پەروەردگارم دامبەزێنە بۆ شوێنێكی بەفەڕو پیرۆز، دەڵێ: كاتێ گەیشتینەوە جێ بە ئافرەتەكەم گوت: خواردنت بۆ بێنم؟ ئافرەتەكە گوتی: ﴿ ...إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾ ﴾ مریم واتە: من پێویستم كردووە لەسەر خۆم بۆ پەروەردگاری بەبەزەییم بەڕۆژوو بم، كاتێ ڕۆژ ئاوابوو منداڵەكانی هاتن پێی گوتن: ﴿ ...فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ﴿١٩﴾ ﴾ الكهف واتە: یەكێكتان بنێرن نەختێك پارە لەگەڵ خۆی ببا بۆ ئەوەی خواردنێك بهێنێ، كاتێ لەسەر خوانەكە دانیشت كۆتایی بە قورئان خوێندنەكە هێنا لەدوای ماوەیەك خەمو پەژارە دایگرت پێم گوت: لەبەر چی پەژارە دای گرتووی ئەی جاریەی خوا؟ لەوەڵامدا ئافرەتەكە گوتی: ﴿ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ ﴾ ق واتە: لەدونیا ژیانت كۆتایی دێو مردن دەتگاتێ، لەدوای ئەوە گیانی دەرچوو وەفاتی كرد، ئنجا نوێژمان لەسەر كردو شاردمانەوە، پاشان لەخەودا پێم گوت: خوای پەروەردگار چی لەگەڵ كردی لێپرسینەوەی چۆن بوو لەگەڵت؟ ئافرەتەكە پێی گوتم: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾ ﴾ القمر واتە: بێگومان ئەوانەی پارێزكارن لە باخو

باخاتی بەهەشت دان لە جێگای دانیشتنێکی خۆش دان کە جێگەی ڕەزامەندی خوای بەبەزەییە[1].

١٤٦. **مردن خۆشە**

بە کەسێکی لادێییان گوت: تۆ هەر دەمری!، ئەویش گوتی: مردن بۆ کوێم دەبا؟ گوتیان بۆ لای خوای بەبەزەیی، ئەویش گوتی: کەواتە چوونم بۆ لای خوا هیچ زیانێکم پێ ناگەیەنێ، ئەو کە لەدنیادا سەرپەرشتی کردووم لەدوای مردنیشدا هەر ئاگای لێم دەبێو سەرپەرشتیم دەکا[2].

١٤٧. **کە ئەجەل هات بەنەخۆشیو لەش ساغی نییە**

کەسێك دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لەگەڵ کاروانێکدا لە حیجازەوە بەرەو کووفە دەگەڕاینەوە، پیاوێکی ڕووتو ڕەجاڵو پێ پەتی لەگەڵ کاروانەکەمان بوو، سەیرم کرد پارەی پێنییەو ڕووتو ڕەجاڵو پێ پەتییە، خەرامان ئەڕۆیشتو لەبەر خۆیەوە ئەیگوت:

نە خەمم بوونو نەبوونە

ئەوەندە لەم دەروونە

هەناسەیێ ئەدەم من

وەها تەمەن گوزارم

لەو کاتەدا حوشتر سوارێکی دەوڵەمەند پێی گوت:

ئەی دەروێش بۆکوێ ئەچیت لە سەختیا تۆ ئەمریت.

کابرای پێ پەتی گوێی پێنەدا، پێی نا بەبیابانو ڕۆیشت، کاتێ گەیشتینە شوێنێك کە پێی دەگوترا: نەخلەی مەحموود پیاوە حوشتر سوارە دەوڵەمەندەکە حاڵی تێکچوو کەوتە سەرە مەرگ، کابرای دەروێشی پێ پەتی هاتە ژوور سەریو پێی گوت:

---

[1]) دۆستی باوەڕداران ل ١٤٨- ١٥١.

[2]) وتەی دانایانو زانایان- ل ٢٢٣.

ئێمە لە سەختیا نەمردین

تۆ لە پوختیا مردی

پیاوێ بۆ نەخۆشێ شەو تا ڕۆژ گریا

کەڕۆژ بوویەوە خۆی مرد نەخۆش ژیا

زۆر ئەسپی خۆش ڕەو لەڕێ مایەوە

کەری شەل گیانی گەیاندە قۆناغ

زۆرمان لەلەش ساغ لەخاکا ون کرد

بریندار نەمرد مایەوە لەش ساغ[1]

---

[1]) گوڵستانی سەعدی ل. ١٣٢.

## ١٤٨. ترسی باوەڕدارن لەسەرە مەرگ

کاتێ سوفیانی ثوری کەوتە حاڵی سەرەمەرگ دەستی کرد بە گریان، پیاوێك لەلای بوو پێی گوت: لە تاوانەکانت دەترسی؟ سوفیان کەمێ تۆزی لەسەر زەویەکە هەلگرتەوەو گوتی: وڵڵاهی تاوانەکانم لەلام لەمە ساناترە، بەڵام لەوە دەترسم کە لەحاڵی سەرە مەرگدا بەبێ ئیمان بمرم[١].

## ١٤٩. سەرەمەرگو پێشوازی کردن لە ( ملك الموت )

سەلمانی فارسی ﷺ کەسێك بوو هیچ لە خۆشییەکانی دونیای نەبوو بۆ تەنها چرکە ساتێ، سەلمان ڕووی تێکردبێ، یاخود دەروونی وابەستە کردبێ پێوەی، تەنها یەك شتێك نەبێ کە بە ئەمانەت دابووی بە خێزانەکەی لە شوێنێکی دوورە دەست بۆی هەڵبگرێ، لەکاتی سەرەمەرگیدا، سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژەی کە تێیدا گیانی سپارد، بە خێزانەکەی گوت: ئەو شتەی پێم دابووی بیشاریتەوە بۆمی بێنە، خێزانەکەی بۆی هێنا، قوتوویەك بو میسکی تێدابوو، لە ڕۆژی ڕزگار کردنی جەلەولادا بەری کەوتبوو، پاراستبووی تا ئەوەی ببێتە عەتری ڕۆژی مردنی، دوای ئەوە داوای ئاوی کرد میسکەکەی تێکەڵ بەئاوەکە کرد، پاشان بەدەست تێکی وەردا وە بەخێزانەکەی گوت: کەمێکی تر بیپرژێنە بەلاشەمدا، درووستکراوانێکی خوا دێن بۆلام کە ناخۆن و ناخۆنەوە، حەزیان بەبۆنی خۆشە (مەبەستی فریشتەکان بوو) خێزانەکەشی بۆنەکەی بەسەردا پرژاند، ئنجا بە خێزانەکەی گوت: تۆ بڕۆ دەرگاکەم لەسەر پێوەبدە، پاشی ماوەیەك هاتەوە لای بینی گیانی سپاردووەو ماڵئاوایی لە دونیادا کردووە[٢].

---

[١]) وتەی دانایانو زانایان ل ٦٤.

[٢]) پیاوانی دەوری پێغەمبەر ﷺ ل ٦٥- ٦٦.

## ١٥٠. مردن لەناوبردنی خۆشیەكان

كاتێ هارونە ڕەشید كۆشكێكی خۆشی لەسەر دیجلە بۆخۆی درووست كرد، خەڵكی هاتن بۆ ئەوەی پیرۆزبایی لێبكەن، یەكێ لەوانەی هاتبوو بۆ پیرۆزبایی (أبو العاتهە)ی شاعیر بوو بەخەلیفەی گوت:

عــش مـا بدا لك سالماً . . . في ظل شاهقة القصور

يسعى إليك بما اشتهيت . . . لدى الرواح وفي البكور

فـإذا النفوس تغرغرت . . . في وقت حشرجة الصدور

فـهنـاك تعلم مـوقناً . . . مـا كنت إلا فـي غـــرور

واتە: بژی چەند دەتوانی بەخۆشی لەم كۆشكو تەلارەبەرزە خۆشەدا، هەرچیت بوێ خزمەتكارەكان دەیهێننە بەردەستت بەیانیانو ئێواران، بەڵام بەداخەوە ئەم خۆشییە بەردەوام نابێ، كاتێ ڕووح گەیشتە كونە لووتت ئەوسا چاك دەزانی تۆ لە غرورو سەركەشیدا بوویت، هارونە ڕەشید پێی گوت: بۆمی بڵێوە، ئەویش بۆی گوتەوە، دووبارە پێی گوت: بۆمی بڵێوە، ئەویش دیسان بۆی گوتەوە، ئنجا هارونە ڕەشید زۆر گریا فەرمانی دا بگەڕێتەوە كۆشكە كۆنەكەی، كەمتر لە مانگێكی نەبرد وەفاتی كرد.

هەروەها عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان فەرمانڕەوای زۆربەی شارەكان بوو، لەسەرە مەرگدا لەسەر تەختی فەرمەنڕەواییەكەی دابەزی گوێی لە جل شۆرێك بوو لە حەوشەی كۆشكەكە جلی دەشووشتو لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەگوت، عەبدولمەلیك گوتی: خۆزگە منیش جل شۆرێك بوومایە هەرگیز بەلای خەلافەتدا نەهاتمایە، زۆری نەخایاند گیانی سپاردو مرد، كە ئەو هەواڵەیان دا بە سەعیدی كوڕی موسەییب، گوتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی وای لە دەستەڵاتداران كردووە لەسەرە مەرگدا ئاوات بە ئێمە بخوازنو وای لە ئێمەش كردووە ئاوات بەوان نەخوازین[1].

---

[1]) ژیانەوە ل ٥٧.

### ١٥١. مردن و گۆڕ لە بیری صەحابەیەکەوە

لەکاتێکدا حوزەیفەی کوڕی یەمان خۆی بۆ دواهەمین گەشتی ساز دەکردا، هەندێك هاوەڵی هاتنە لای پێیانی گوت: ئایا کفنتان لەگەڵ خۆتان بۆ هێناوم؟ گوتیان بەڵێ، گوتی بێنن پێشانم بدەن، کاتێك سەیری کرد بینی کفنێکی تازەو جوانە، زەردەخەنەیەکی هاتە سەر لێو گوتی: ئەم کفنە بۆمن نابێ، من دوو لەفاق سپیم بەسسە، پێویست ناکات کراسی لەگەڵدا بێت، چونکە من بۆ کەمێك لە گۆڕدا دەمێنمەوە، دواتر شوێنەکەم دەگۆڕێت بۆ باشتر یان خراپتر لە شوێنەکەی خۆم[1].

### ١٥٢. پردی سەر پشتی دۆزەخ (صراط)

ئەبو مەریەم دەڵێ: گوتم بە ئەبی عەبدوڵڵای بەڕاتی بۆچی ئەوەندە دەگریت و تاکەی دەگری؟ ئەویش پەنجەی پێ پیشاندام موویەکی لوولکراو بەسەری پەنجەیەوە بوو، موویەکەی کردەوەو درێژی کرد، پاشان گوتی: ئەگەر پەڕینەوەی ڕۆژی قیامەت بەسەر پردێکی ئالەم جۆرە دابێت کام قاچ لەسەرمە خۆی دەگرێ!، پاشان دەستی کرد بەگریان[2].

### ١٥٣. شەیتانی برسی و شەیتانی تێر

شەیتانی پیاوێکی ئیماندار گەیشت بە شەیتانی پیاوێکی کافر، شەیتانی پیاوە کافرەکە هەتا بڵێی قەڵەوو تێر بوو، بەڵام شەیتانی پیاوە ئیماندارەکە لاوازو برسی و ڕووت بوو، شەیتانی پیاوە کافرەکە بە شەیتانی پیاوە ئیماندارەکەی گوت: بۆچی ئەوها لەڕو لاوازو برسی؟

ئەویش گوتی لەبەر ئەوەی من لەگەڵ پیاوێکدام هەرکە نان دەخوات دەڵێ: {بسم الله}، منیش بە برسێتی دەمێنمەوە، کە ئاو دەخوات بەهەمان شێوە دەڵێ: {بسم الله}، منیش بە توێنێتی دەمێنمەوە، کە پۆشاك لەبەر دەکات دەڵێ: {بسم الله}، منیش بە ڕووت و ڕەجاڵی دەمێنمەوە، کە پرچی شانە دەکات دەڵێ: {بسم الله}، منیش بە ڕوخسار

---

[1]) پیاوانی دەوری پێغەمبەر ﷺ- خالید موحەممەد خالید.

[2]) بگە بەکاروانی صالحان ل ٤١.

ناشیرینی دەمێنمەوە، شەیتانی پیاوە کافرەکە گوتی: دەنا من لەگەڵ پیاوێکم بەهیچ شێوەیەك {بسم الله} ناکات، بۆیە من بەشداری هەموو کارەکانی دەکەم بۆیە وا قەڵەوو تێرو پڕم[1].

### ١٥٤. گرنگی کات لەبەسەرهاتی پیاوێکی دەشتەکی لەگەڵ حەججاجی سەقەفی

سەعیدی کوڕی عەروبە دەڵێ: ساڵێکیان حەججاج چوو بۆ سەفەری حەج، لەسەر ئاوێك دابەزی لەنێوان مەککەو مەدینە، فەرمانی کرد بەخزمەتکارەکانی خوانێکی نان خواردنی بۆ ئامادە بکەن، ئنجا بانگی یەکێك لە پاسەوانەکانی کرد پێی گوت: بزانە کەس لەم ناوە نییە بێ لەگەڵمان نان بخواو هەندێ پرسیاریشی لێبکەم، پاسەوانەکە سەیری بەرزاییەکی کرد بینی پیاوێکی دەشتەکی خۆی حەشارداوە لەنێو هەندێ پارچە مووی چنراو، وە خەویشی لێکەوتووە، پاسەوانەکەش چووە لای شاپێکی لێداو گوتی: هەڵسە ئەمیر بانگت دەکات، بردیە لای حەججاج، حەججاجیش پێی گوت: بڕۆ دەستت بشۆو نانم لەگەڵ بخۆ، پیاوە دەشتەکیەکە گوتی کەسێکی زۆر لەتۆ گەورەترو باشتر بانگی کردووم، حەججاج گوتی: کێیە ئەو کەسە؟ پیاوە دەشتەکیەکە گوتی: خوای گەورەو بالا دەستە، بانگی کردووم کە بەڕۆژوو بم منیش بەڕۆژووم، حەججاج گوتی: بەو ڕۆژە گەرمە؟ پیاوە دەشتەکیەکە گوتی: گەرمای قیامەت بەهێزترە، حەججاج گوتی: ئێستا بیشکێنە لەگەڵم نان بخۆ بەیانی بەڕۆژووبە، پیاوە دەشتەکیەکە گوتی: تۆ گەرەنتی ئەوەم دەدەی تا بەیانی بمێنم؟ حەججاج گوتی: ئەوە پەیوەندی بەمنەوە نییە، پیاوە دەشتەکیەکە گوتی: کەواتە بۆ داوای حازرێکم لێ دەکەی بەقەرز کە توانای دانەوەت نییە، حەججاج گوتی: ئاخر خواردنەکە خۆشە؟ پیاوە دەشتەکیەکە گوتی: نەتۆ خۆشت کردووە نەخزمەتکارەکەشت بەڵکو لەش ساغیو عافییەت خۆشی کردووە[2].

---

[1]) قصص الصالحين ص ١٨١.

[2]) صفة الصفوة ج٤ ص٥١٢.

### ١٥٥. دوعای هیدایەت بۆ خراپەکاران بکە

ڕۆژێك شێخ مەعروفی کەرخی لەگەڵ کۆمەڵە قوتابیەکی دەچنە قەراغ دیجلە دەبینن وا کۆمەڵە گەنجێك لەسەر ئاوی دیجلە دانیشتوون، خەرکی کەیفو خۆشی بوون، شەرابیان دەخواردەوە، یەکێ لە قوتابیەکانی گوتی: قوربان بۆچی دوعایەکیان لێناکەیت، بەڵکو خوای گەورە هەموویان لەناو ببات، بۆئەوەی ئێمەش بەر غەزەبی خوا نەکەوین، شێخ مەعروفیش گوتی: باشە بڕۆن دەستنوێژێك بگرن بابەکۆمەڵ دوعایان لێ بکەین، من دوعاکە دەکەم ئێوەش ئامین بکەن، گوتیان باشە، شیخ مەعروف دەستی بەرز کردەوە گوتی: خوایە چۆن لە دونیادا ئەو گەنجانەت کەیف خۆش کردووەو ئاسوودەن، لە قیامەتیشدا کەیف خۆش‌و ئاسوودەیان بکە، هەموویان گوتیان ئامین بەڵام دوعاکەیان بەدڵ نەبوو، چونکە بڕیار وانەبوو ئەو دوعایە بکا، لەپاشان ڕوویان کردە شێخ موعروف‌و گوتیان: بۆچی ئەو دوعایەت کرد؟ ئەویش گوتی: تۆزێ سەبرتان هەبێ ئێستا تێدەگەن، گەنجەکان کاتێ شێخ مەعروفیان بینی دڵیان بەتەواوی گۆڕا، حاڵیان شێوا وازیان لەشەراب خواردن‌و کەیف‌و سەفای خۆیان هێنا، هاتنە لای شێخ‌و تەوبەیان کرد[1].

### ١٥٦. بەهۆی پۆشینی حیجابەوە داخوازی کرا

کچێکی تەمەن (٢٣) ساڵی خەڵکی مەدینە دەڵێ: لەگەڵ خانەوادەکەم چووین بۆ یەکێ لە مزگەوتەکانی وڵاتی تورکیا، خەڵکی ئەو شوێنە سەیری ئێمەیان دەکرد، بەڵام سەیرکردنەکەیان جیاواز بوو، سەیر کردنێکی بەڕێزو حەورمەتەوە بوو، هەندێ لەوان سەلامیان لێدەکردین، وە هەندێکی تریان کە ئێمەیان دەبینی دەگریان، داوایان لێ دەکردین دوعای خێریان بۆ بکەین، داوایان لێدەکردین کە گەڕاینەوە مەدینە سەلامیان بگەیەنین بە پێغەمبەر ﷺ، ئنجا هەندێ لەو خەڵکە باسی خۆیان دەکرد کە خوێندنی قورئانیان لێ قەدەغە دەکرێ لە شارەکانی خۆیان، ئەمەش بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەو عەلمانیەتە کە ئەوکات زاڵ بوو بەسەر خەڵکی مسوڵمانی تورکیا، ئنجا ئەم کچە دەڵێ: گەنجێك هاتە لای باوکم خوازبێنی منی لێکرد، باوکم بە گەنجەکەی گوت: باشە کچانی لای خۆتان زۆر جوان‌و

---

[1]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن – هارون نوح –ل ١٦٢، ١٦٣.

شۆخ و شەنگن بۆچی داخوازیان ناکەی؟ گەنجەکە گوتی: کچانی ئێرە زۆربەیان بەهۆی ئەو سیستەمە فاسیدەی عەلمانیەت ڕەوشتیان لەدەست داوە، بەلام ئافرەتانی لای ئێوە بەشەرمو حەیان، منیش نامەوێ کەسێکی تر سەیری خێزانم بکات بەم شێوە سفوریە جگە لەخۆم، باوکم داوای لێم کرد کە ڕازیم یاخود نا، پێمی گوت: ئەو گەنجە سوورە لەسەر ئەوەی زدماوەند لەگەڵ تۆدا بکات، بەلام من ڕەتم کردەوە، چونکە من ماوەی مانگێك کە لەو ولاتەدا بووم نەمدەتوانی خۆم ڕابهێنم لەسەر ئەو هەڵسوکەوتانەی ئەوان ئیتر چۆن دەتوانم ژیان لەوێدا ببەمە سەر[1].

١٥٧. **خوای پەروەردگار هەرکەسێکی بیەوێ شیفای دەدا**

دەگێڕنەوە لە مێژونووسانەوە پیاوێك هەبوو تووشی نەخۆشی شەلەل بوو، ئەو پیاوە لەماڵ دانیشتبوو پەکی کەوتبو، تەنانەت نەیدەتوانی خۆی بجووڵێنێ، چەندەها ساڵ بەسەر ئەو نەخۆشیەیدا تێپەڕی بێ ئومێد بوو لەوەی چاك ببێتەوە، پزیشکەکان لە چارەسەر کردنی بێتاقەت بوون، ماڵو خێزانەکەشی ئاگادار بوون بەم حاڵە، ڕۆژێکیان دووپشکێك لەنێو کاریتەکانی سەقفی خانووەکەیان دەکەوێتە خوارو لەسەر سەری ئەو پیاوە نەخۆشە دەکەوێت، ئەویش لەبەر ئەوەی شەلەل بوو نەیتوانی لای ببا، دووپشکەکەش سێ چوار جاران لەسەر یەك بەو پیاوە نەخۆشەی وەدا، کابرا لەشوێنی خۆی دوای پێوەدانەکە هەموو لاشەی کەوتنە جووڵە، لەگەڵ ئەو پێوەدانە لە بنی پێی تاوەکو تۆقی سەری جارێکی تر ژیان گەڕایەوە ناو لاشەی مردووی، بەپێی خۆی چوو بۆ لای ماڵو منداڵەکەی ئەوان باوەڕیان نەدەکرد کە چۆن چاك بۆتەوە، پاکیو بێگەردی بۆ ئەو خوایە[2].

١٥٨. **خراپی مردنی کەسێك لەسەر غەیری بەرنامەی خواو پێغەمبەر ﷺ**

پیاوێك پرسیاری لە أبو ئیسحاق فەززازی کرد سەبارەت بە هەڵکەندنی گۆڕی کەسێك لەدوانی ناشتنی، ئایا ئەو کەسەی ئەو کارەی کردووە بۆی هەیە تەوبە بکا؟

[1]) الحجاب في الإسلام- يوسف حاج أحمد- ص ٣٦٤.

[2]) لا تحزن – محمود المصري- ص ١٣١.

ئەبو ئیسحاق گوتی: بەڵێ ئەگەر ئەو کەسە بەڕاستو درووستی تەوبە بکات خوا تەوبەکەی وەردەگرێ، پیاوەکە گوتی: من گۆڕم هەڵدەکەندو کفنەکەم دەدزی، بەڵام هەندێ لەو مردووانەم دەبینی ڕوویان لە قیبلە وەرگێڕرا بوو ، ئنجا ئەبو ئیسحاق هەواڵەکەی گەیاندە پێشەوا ئەوزاعی، ئەویش پێی گوت: ئەم پیاوە بۆی هەیە تەوبە بکات بەمەرجێ تەوبەکەی ڕاستگۆیی تێدابێو نیەتی پاك بێ، سەبارەت بە وەرگێڕرانی ئەو مردوانەش لە قەبرەکانیان گوتی: ئەو کەسانە لە دونیادا لەسەر بەرنامەی غەیری خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ژیاون[1].

## ١٥٩. ئازاری ڕووح کێشان

کاتێك پێغەمبەر ئیبراهیم وەفاتی کرد ڕووحانیەتی پێغەمبەرەکان لەدەوری کۆدەبنەوە پێیان گوت: ئەی خەلیل چۆن ڕووحت کێشرا؟ لەوانەیە هی تۆ ئاسان بووبێ، ئەویش پێی گوتن: چیتان پێ بڵێم، کاتێ فریشتەی گیان کێشان هات قولابێکی بەناو هەموو دەمارەکانم بڵاو کردەوە، ئنجا زۆر بەتوندی ڕای کێشا هەموو ڕووحەکەم لەناو سنگم کۆبۆوە، وەك ئەوەی کە هەزار جار بمسووتێنن لەناو مەنجەڵ، پێغەمبەران گوتیان هی تۆ زۆر ئاسان بووەو خوا زۆر ڕەحمی بەتۆ کردووە، بەئاسانی ڕووحی کێشاوی[2].

## ١٦٠. لەسەر هەر شتێك بمری لەسەر ئەو شتە زیندوو دەکرێیتەوە

دەگێڕنەوە دوو برا هەبوون یەکیان خواپەرست بوو ئەوی تریان گوناحو تاوانی ئەنجام دەدا، ڕۆژێك خوا پەرستەکە گوتی: واباشە دەست هەڵگرم لەخوا پەرستی وەکو براکەم سەرقاڵی خۆشییەکانی دنیا بم، پاشان بەر لەوەی بمرم بۆخۆم تەوبە دەکەم، خۆ خوا بەڕەحمە، لەو کاتەدا ئەو بڕیارەی دا لە سەربانی ماڵەوە بوو ویستی بچێتە خوار بۆ لای برا خراپەکەی، لەهەمان کات برایە خراپەکەی لەخوارەوەی ماڵەکە بوو لە بیری خۆی گوتی: بەڕاستی من تەمەنی خۆم هەموو بەزایە داوە لەخراپە واباشە بچم لەگەڵ برا خواپەرستەکەم دابنیشمو خوا پەرستی بکەم، لەو کاتەدا ئەوەیان کە بڕیاری دابوو دەست

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ل ١٦٣.

[2]) بستان الواعظين ص ١٧٣.

بە گوناهو تاوان بکات هاتە خوارەوە، ئەوەی تریان کە دەیویست تەوبە بکات چووبۆ سەردوە، ئەوەی سەرەوەیان پێی خلیسکاو بەربۆوە بەبراکەی کەوت قەدەری خوا هەردووکیان مردن، ئەمیان لەبەر ئەوەی بڕیاری دابوو تەوبە بکات لەسەر ئەو نیەتەی زیندوو دەکرێتەوە، ئەوەی تریان کە نیەتی هێنابوو دەست بکات بەگوناهو سەرپێچی لەسەر ئەو نیەتە خراپەی زیندوو دەکرێتەوە[1].

### ١٦١. فێرو تەڵەکەی بێبڕوایان بۆ لەناو بردنی بیرو بڕوای مسوڵمانان

لە ساڵی (١٩٣٢)ز ڕۆژنامەی جمهوریەتی تورکیا یەکەم پێشبڕکێی ڕێکخست لەو وڵاتەدا بۆ دەستنیشانکردنی شاجوانی وڵات، لە پێشبڕکێیەدا (کریمان خالص) بەیەکەم دەرچوو، لەهەمان ساڵدا لەشاری (سپا)ی بەلجیکا پێشبڕکێی جیهانی بۆ هەمان مەبەست سازکرا، (٢٨) وڵات تێیدا بەشدارییان کرد، لەو پێشبڕکێیەدا سەرۆکی لیژنەی هەڵبژاردنەکە وتارێکی پێشکەش کرد، ئەم وتارە لە (دائرة المعارف)ی تورکیا بەرگی (١١) لاپەڕە (٣٥٧) تۆمار کراوە، لە وتارەکەیدا گوتی: ئەمڕۆ لەناوماندا کریمانی شاجوانی تورکیا ئامادەیە بە (مایۆ)وە نوێنەرایەتی ئافرەتانی مسوڵمانان دەکات، بۆیە ئێمەش بڕیارماندا ئەو هەڵبژێرین (تاج)ی سەرکەوتنی پێ دەبەخشین، دەیکەین بە شاجوانی هەموو جیهان، ڕەنگە جوانتری تیا بێ، بەڵام ئەمە لای ئێمە گرنگ نییە ئەمساڵ مەبەستمان شاجوان نییە، بەڵکو سەرکەوتنی مەسیحیەتمان مەبەستە، ئاهەنگی بۆ دەگێڕین!.

سوڵتان سولەیمانی قانونی کاتی خۆی ڕێی نەدا بە ئاهەنگەکانی سەمای فەڕەنسا، ئەمڕۆ نەوەی ئەو بەجلو بەرگی قەراغ دەریاوە ئامادەیە لەگەڵمان، ئێمەش سەرسامین بەو ئافرەتەو ئەو هەڵدەبژێرین، چونکە شوێن ئێمە کەوتووە، وە لەوتارەکەیدا بەردەوام بوو گوتی: هیواداریین هەموو مسوڵمانان وایان لێبێ‌و شوێنمان کەون لە داهاتوودا، جا بەم هیواو ئاواتەوە ئەمڕۆ ئێمە شاجوانی تورکیا هەڵدەبژێرین بەسەر هەموو جیهان، لەگەڵیدا پێکی شەرابی سەرکەوتنیش دەنۆشین بەسەر مسوڵماناندا، ئەمە قسەکانی بوو، وابزانم پێویست

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٢٦ ٢٢٧.

بەهیچ وشەیەك ناکات بیڵێین ئەمە پیلانی ئەوانە بۆ ئێمەی بێئاگا {لا حول ولا قوة إلا بالله}[1].

**١٦٢. غیرەتی ئافرەتی مسوڵمان لەسەر لەچکەکەی سەری**

ڕۆژێك ئەفسەرێکی ئافرەتی مسوڵمان دەچێتە سەر کارەکەی بەلەچکی سەریەوە، بەڕێوەبەرەکەی پێی دەڵێ: برۆ ئەو بەرگەت بگۆڕەو لەچکەکەشت لادە، ئافرەتەکەش پێی دەڵێ: ئەم لەچکە فەرمانی خوایە هیچ هێزێك ناتوانێ ڕێم لێبگرێت لە پۆشینی[2].

**١٦٣. بڵاو بوونەوەی ئیسلامو سێ نامە**

شێخ موحەممەد حەسسان لە وتاری (الإسلام قادم)دا دەڵێ: لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا کە چووم بۆ ئەمریکا چاوم کەوت بە ئەفسەرێکی ئەمریکی کە ناوی (مایکڵ) بوو، پاش ئەوەی ببوو بە مسوڵمان ناوی خۆی نابوو (عبدالصبور) ڕێکخراوێکی مسوڵمانانی لە ئەمریکا دامەزراندبوو، منیش لەبارەی مسوڵمان بوونیەوە پرسیارم لێکرد؟ ئەویش گوتی: من لەگەڵ ئەوەی پلەیەکی گەورەم هەبوو لە سەربازییدا قەشەش بووم‌و خەریکی ڕێنمایی کردن بووم، بەڵام دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئان‌و وەرگێڕانەکەی وە خوێندنەوەی فەرموودەکانی بوخاری‌و موسلیم، برادەرێکم هەبوو پێش من مسوڵمان ببووبوو، چووم بەدوایدا لە مزگەوت بینینم، کاتی بانگ بوو، کە مسوڵمانانم بینی نوێژ دەکەن بەجۆرێك هەژاندمی ناتوانم وەسفی بکەم، پاشان یەکسەر پرسیارم کرد چۆن مسوڵمان بم، گوتیان خۆت بشۆو شایەتمان بێنە، منیش ئەوەی پێویست بوو کردم هاتمە ڕیزی مسوڵمانانەوە.

ئەو مسوڵمانە ئەمریکییە دەڵێ: بەڕاستی ئیسلام لە ئەمریکادا زۆر بەخێرایی بڵاو دەبێتەوە، لەکۆی (٥٤٠٠٠) ئەفسەری پیاوو ئافرەتی ئەمریکی تا ئێستا لە فەزڵی خوا (١٣٠٠٠)یان مسوڵمان بوون، تەنها لەو ئەفسەرو سەربازانەی لەجەنگی کەنداودا بەشدار بوون (٧٠٠٠)یان مسوڵمان بوون.

---

[1]) لە خزمەت قورئاندا ل ٢٧٠- ٢٧١.

[2]) بەهاری دڵان ل ٢٣٣.

ئەو ئەفسەرە مسوڵمانە ئەمریكییە بە شێخ موحەممەد حەسسان دەڵێ: من سێ پەیامم هەیە بەتۆدا دەینێرم:

پەیامی یەكەمم بۆ ئەمریكییەكانە: پێیان دەڵێم ئێمەی مسوڵمان ئیمانمان بە پێغەمبەر عیسا هەیە ﷺ هەروەك چۆن ئیمانمان هەیە بە موحەممەد ﷺ.

پەیامی دووەمم بۆ مسوڵمانەكانی ئەمریكایە: پێیان دەڵێم ئارام بگرن‌و پەلە مەكەن هیچ كارێك بێ ئارامگرتن ناگاتە ئەنجام، دەست بەخۆتان شۆڕ مەكەنەوە بەهۆی هەڵەو كەم‌و كورتییتان لەكاتێكدا تەوبەی لێدەكەن‌و لەسەری سوورنین لەسەری.

پەیامی سێیەمم بۆ هەموو مسوڵمانانە بە گشتی‌و مسوڵمانانی میصرە بەتایبەتی: هەرچەندە هەزاران میل لێتان دوورین بەڵام بەڕاستی خۆشمان دەوێن لەبەر خواو بەبراو خوشكی خۆمانتان دەزانین[1].

**١٦٤. چارەسەری هەموو كێشەكان بە زیكری ( أستغفرالله )**

پیاوێك هاتە لای حەسەنی بەصری‌و پێی گوت: لای ئێمە قات‌و قڕی‌و گرانییە چی بكەین؟ ئەویش پێی گوت: بڕۆن تۆبەو داوای لێخۆشبوون بكەن (أستغفر الله) زۆر بكەن.

پیاوێكی تر هات پێی گوت: من كابرایەكی هەژارم‌و ماڵ‌و خێزانێكی زۆرم لە ئەستۆدایە، ئەویش پێی گوت: بڕۆ تەوبە بكەو داوای لێخۆشبوون بكە، خوا حاڵت باش دەكاو دەرگات لێدەكاتەوە، پیاوێكی تر هاتە لای گوتی: مندالّم نابێ‌و چ دوعایەك بكەم‌و چ ڕێگەیەك بگرمە بەر؟ بەهەمان شێوە بەویشی گوت بڕۆ تەوبە بكەو داوای لێخۆشبوون بكە، پاشان ئەوانەی لەوێ ئامادەبوون لێیان لە حەسەنی بەصرییان پرسی لەبەرچی یەك وەڵامت بەهەموویاندا خۆ هەریەكێ لەوانە پرسیارێكی جیاوازی هەبوو؟ ئەویش گوتی: لەبەر ئەو ئایەتە موبارەكانەی لە سورەتی (نوح)دا هاتووە كە دەفەرمووێ: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ ﴾ واتە: نوح بەگەلەكەی گوت: داوای لێخۆشبوون لەخوا بكەن

---

[1]) وتارەكانی شێخ موحەممەد حەسسان بە ناونیشانی (الإسلام قادم).

بارانتــان بــۆ دەبــارێنێ، مــاڵو منــداڵو سـامانتان پێـدەدا، بـاخو باخچـەو کانیاوەکانتــان بــۆ دەبوژێنێتەوە[1].

### ١٦٥. دەبێ منداڵەکانمان وا پەروەردە بکەین

جارێك حەجحاج کە پیاوێکی ناسراوە بـە زوڵمو خـوێن رێـژیو دڵرەقـی لـەناو کۆشـکە جوانەکەی دانیشتبوو، وە هەنـدێ لـە پیاومـاقوڵانی خـەڵکی عێـراقی لا دانیشـتبوون، لـەناکاو منداڵێك هات کە تەمەنی نزیکەی (١٠) ساڵان دەبـوو، زۆر بـە زیرەکانـە خـۆی بـەژووردا کـرد هـیچ سـەیری حـەجحاجی نـەکرد بـەڵکو هـەر سـەیری دارو بـەردی کۆشـکەکەی دەکـرد، بەڕاسـتو چـەپ ئـاوڕی دەدایـەوە لـە دیمەنـە جوانـەکانی کۆشکەکە، پاشـان یەکسـەر ئـەو ئایەتـەی گـوت: ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ الشـعراء. کـە حـەجحاج ئەمـەی لـە منداڵەکە بیست پـاڵ کـەوتبوو هەسـتایەوە دانیشت بەمنداڵەکـەی گـوت: دەبیـنم عـەقڵێکی چاکت هەیە ئایا قورئانت لەبەرە (حیفزت) کردووە؟

منداڵەکــە گــوتی: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجـر. منداڵەکــە مەبەستی ئەوەبوو قورئـان پێویستی بـەمن نییـە حیفـزی بکـەم خـوا خـۆی حیفـزی دەکـات، حەجحاج وای زانی منداڵەکە لەمەبەستەکەی ئـەو نەگەیشـتووە پرسـیارەکەی بـە شـێوەیەکی تر لێکرد پێی گوت: أفجمعت القرآن؟ واتە قورئانت جەمع کردووە (لە سینەت)؟

منداڵەکــە گــوتی: ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْءَانَهُ ﴿١٧﴾ ﴾ القیامــة. مەبەســتی ئــەوەبوو کۆکردنەوەی قورئان پەیوەندی بەخواوە هەیـە خـوا خـۆی کـۆی دەکاتـەوە، حـەجحاج دیسـان وای زانــی منداڵەکـە لـە پرسـیارەکەی ئـەو نەگەیشـتووە بۆیــە دیســان پرسـیارەکەی بــە شێوەیەکی تر لە منداڵەکە کرد؟ پێی گوت: أفأحكم بالقرآن؟ واتـە کـار بـەقورئان دەکـەیتو حوکمی پێ دەکەیت، حەجحاج هەم دیسان مەبەستی لە پرسیارەکەی ئەوەبوو کە بزانـێ ئـەو منداڵە قورئانی لەبەرە یان نا، لەوەڵامدا منداڵەکە گوتی: ﴿ لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٣٩٠.

خَلْفِهِۦ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت، ئەوجارە حەجاج پێی گوت: إستظهرت القرآن؟ واتە: قورئانت بەدیار خستووە مەبەستی هەر ئەوەبوو بزانێ لەبەری کردووە یان نا؟

منداڵەکە گوتی: ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ البقرة، هەموو پرسیارەکانی حەجاجی بە ئایەتێك لە قورئان وەڵام دەدایەوە، حەجاج هاواری لێ هەڵساو لە منداڵەکە تووڕەبو چونکە هەر دەیویست بزانێ منداڵەکە قورئانی لەبەرە یان نا، کەچی منداڵەکە بەهەر جۆرێکی پرسیاری لێدەکرا لەلایەن حەجاجەوە بە ئایەتێك وەڵامی دەدایەوە، حەجاج بە منداڵەکەی گوت: هاوار بۆتۆ خوا بتکوژێ چۆنت تێبگەیەنم؟ دەی هەندێ قورئانمان بۆ بخوێنە؟

منداڵەکە گوتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ (يخرجون) فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ ﴾، حەجاج گوتی: هاوار بۆتۆ (يخرجون) نییە، بەڵێ: (يدخلون)، واتە پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئیسلام، منداڵەکە گوتی: ئەوە کاتی خۆی پێشی تۆ (يدخلون) بوو، خەڵك دەهاتنە نێو ئیسلام بەڵام ئێستا (يخرجون)ە خەڵك لە دینی ئیسلام دێتەدەر؟ حەجاج گوتی: بۆچی ئێستا بەپێچەوانەیە خەڵك لەدین دێتەدەر؟

منداڵەکە گوتی: لەبەر کارە خراپەکانی جەنابت، حەجاج گوتی: تۆ دەزانی قسە لەگەڵ کێ دەکەی؟ منداڵەکە گوتی: بەڵێ دەزانم لەگەڵ شەیتانی تیرەی سەقیف کە حەجاجە، حەجاج گوتی هاوار بۆتۆ ئەمە کێ پەروەردەی کردووە؟

منداڵەکە گوتی: ئەوەی کە منی چاندووە، حەجاج گوتی: کێ دایکتە؟ منداڵەکە گوتی ئەوەی کە لێی بوویمە، حەجاج لێی پرسی لەکوێ لەدایك بووی؟ گوتی: لە یەکێ لە بیابانەکان، حەجاج گوتی: ئایا تۆ شێتی تاکو چارەسەرت بکەم؟

منداڵەکە گوتی: ئەگەر شێت بام نەمدەتوانی بێمە لاتو لەگەڵ تۆدا دابنیشم، حەجاج گوتی: باشە سەبارەت بە ئەمیری ئیمانداران چی دەڵێی؟

منداڵەکە گوتی: ڕەحمەتی خوا لە (أبو الحسن) خوا بیباتە بەهەشت، حەججاج گوتی: مەبەستم پێشەوا عەلی نییە، بەڵکو مەبەستم عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوانە، منداڵەکە گوتی: لەعنەتی خوا لەو بێدین و فاسیقە بێ، حەججاج گوتی: چۆن شیاوی ئەو لەعنەتەی دەکەی؟ منداڵەکە گوتی: لەبەر ئەوەی هەڵەیەکی ئەوەندە گەورەی کردووە ئاسمانەکان و زەوی پڕ کردووە، حەججاج گوتی: ئەو هەڵەیە چییە؟ منداڵەکە گوتی: هەڵەکەی ئەوەیە تۆی لەدوای خۆی داناوە کە خوێنی مسوڵمانان دەڕێژی و بەحەلاڵی دەزانی، ماڵەکانیان داگیر دەکەی، حەججاج بە پیاوەکانی دەوروبەری خۆی گوت: ڕاتان چییە سەبارەت بەو منداڵە؟ پیاوەکانی دەورو بەری گوتیان لەسەری بدە، ئەوە لە گوێڕایەڵی تۆ دەرچووە، منداڵەکە گوتی: ئەی حەججاج دەزانی پیاوانی دەوری فیرعەونی برات زۆر لە پیاوانی دەوری تۆ چاکتربوون، حەججاج گوتی: بۆ؟ منداڵەکە گوتی: لەبەر ئەوەی ئەوان بە فیرعەونیان گوت: مووساو هاڕوون لە وڵات دووربخەوە، بەڵام پیاوانی دەوری تۆ دەڵێن: بیکوژەو لەسەری بدە، سوێند بەخوا ئەو زوڵمانەی دەیکەی دەبێتە بەڵگە لەسەرت لەڕۆژی دوایی ڕیسواو سەر شۆڕ دەبی، حەججاج گوتی: زمانت پاک کەوە قسەی زیادەو ناڕەوا مەکە، با بەپەلە حوکمت لەسەر نەدەم و لەناوت ببەم، ئێستا (٤٠٠٠) درهەمت دەدەمێ و برۆ، منداڵەکە گوتی: پێویستم پێ نییە، خوا ڕووت سپی بکات و پاژنە پێیەکانت بەرز بکا، حەججاج بە پیاوەکانی دەوری خۆی گوت: تێگەیشتن مەبەستی چیبوو لەو قسەیە؟ گوتیان نەخێر قوربان، حەججاج گوتی: کە دەڵێ خوا ڕووت سپی بکا واتە: خوا چاوەکانت سپی و کوێر کا، هەروەها کە دەڵێ: پاژنە پێیەکانت بەرز بێ مەبەستی ئەوەیە کە لەسێدارە بدرێم، ئنجا بە منداڵەکەی گوت: مەبەستت ئەوەبوو وایە یان نا؟ منداڵەکە گوتی: خوا بتکوژێ چۆن تێگەیشتی، حەججاج هەڵسا ویستی منداڵەکە بکوژێ، بەڵام یەکێك لەو پیاوانەی لەوێ ئامادەبوو گوتی: ئەی ئەمیر بیبەخشە بەمن، منداڵەکە بە پیاوەکەی گوت: نازانم تۆو حەججاج کامەتان بێ عەقڵ ترن؟ پیاوەکە گوتی: من وا ڕزگارت دەکەم لەمردن لەبەرچی ئاوام پێدەڵێی؟ منداڵەکە گوتی: بۆچی ڕزگارم دەکەی، با نۆشی گیانم بێ ئەو شەهیدییە، سوێند بەخوا بکوژرێم لەبەرخوا زۆر پێم خۆشترە لەوەی بگەڕێمەوە نێو خانەوادەکەم، پاشان حەججاج فەرمانی کرد سەد هەزار درهەمی پێدرا، حەججاج پێی

گوت: ئەمە دیارییە بۆتۆ چونكە منداڵێكی زۆر ژیرو عاقڵی پشتت بەخوا بەهێزە، بەڵام وریابە رێز لە پیاوانی دەستەڵاتدار بگرە، بەتایبەتی ئەوانەی كە لێت نابوورن.

منداڵەكە گوتی: لێبوردن بەدەست خوایەو بەدەست تۆ نییە، سوپاس‌و ستایش بۆخوا نەك بۆتۆ، یاخوا من‌و تۆ بەیەكەوە كۆنەبینەوە، ئنجا منداڵەكە ویستی دەربچێ لە كۆشك، پاسەوانەكان بۆی چوون بیكوژن، حەججاج گوتی وازی لێبێنن منداڵی وا ژیرو چاو نەترسم نەبینیوە، دەڵێن: پاشان حەججاج فەرمانی كرد بە پیاوانی خۆی ژ ەهـری دەرخـوارد بدەن سەرەنجام بەهۆی ئەو ژەهرەوە مرد[1].

### ١٦٦. كۆشكی دونیای فرۆشت لە پێناو كۆشكێكی بەهەشت

جەعفەری كوڕی سولەیمان دەڵێ: رۆژێكیان لەگەڵ مالیكی كوڕی دینار لەنێو شەقامەكانی بەصرە دەسووڕاینەوە، كۆشكێكی گەورەمان بینی گەنجێك سەرپەرشتی دەكرد بە وەستاو كرێكارەكانی دەگوت: وا بكەن‌و وابكەن، ئەو گەنجە هەتا بڵێی گەنجێكی جوان بوو، مالیك پێی گوتم: ئەی جەعفەر دەبینی ئەو گەنجە جوانە چەند سوورە لەسەر دروووست كردنی ئەو كۆشكە، چەند پێویستە ئەو گەنجە وای لێبێ ببێتە گەنجێك لە ئەهلی بەهەشت، پێی گوتم با بچین بۆلای، سەلاممان لێكرد ئەو گەنجە لەسەرەتا مالیكی نەناسی، بەڵام دوایی كە زانی مالیكە هەڵساو گوتی: فەرموو ئەی مالیك چییت پێویستە؟ مالیك لێی پرسی: بە نیازیت چەند پارە سەرف بكەیت بۆ تەواوكردنی ئەو كۆشكە؟ گەنجەكە گوتی: سەد هەزار درهەم، مالیك پێی گوت: بۆچی ئەو سەد هەزار درهەمە نادەیت بەمن لە شوێنی خۆی بۆت دابنێم؟ پاشان گرەنتی كۆشكێكی لەوە زۆر چاكترت پێ دەدەم لای خوا بەكۆمەڵێك خزمەتكارەو هەموو پێداویستییەكانیەوە، ئەو كۆشكەی تۆ درووستی دەكەی یان تۆ بەجێی دێڵی یان ئەو تۆ بەجێدێڵێ‌و دەڕوخێ، بەڵام ئەو كۆشكەی من پێت دەڵێم هەرگیز هیچی بەسەرنایەت‌و تۆش بە هەمیشەیی تێیدا دەژی، گەنجەكە گوتی: دەمەوێ ئەمشەو بیری لێبكەمەوە، بەیانی وەڵامت دەدەمەوە، مالیك گوتی باشە، جەعفەر دەڵێ: ئەو شەوە مالیك بیری هەر لای ئەو گەنجە بوو بەرەبەری بەیانی هەر دوعای بۆ دەكرد، پاشان

[1]) مأة قصة وقصة ص ٢٩.

چووین بۆ لای گەنجەكە بینیمان وا دانیشتووە لە ژوورەوە كە مالیكی بینی هەستایەوە بەرەو ڕووی، مالیك پێ گوت: چی دەڵێی بیكە پەشیمان نابیتەوە، گەنجەكە گوتی: ڕازیم، ئنجا هەندێ مەرەكەبو كاغەزیان هێنا مالیكی كوڕی دینار نووسی:

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەوە گرەنتی مالیكی كوڕی دینارە بۆ فلانی كوڕی فلان، من گرەنتی دەدەم بە كۆشكێكی زۆر چاكتر لەم كۆشكە لەلای خوادا لەبەهەشت، ئەم كۆشكەم لەم گەنجە كڕی لەگەڵ سەد هەزار درهەم بەكۆشكێك لەبەهەشت كە جیرانی خوا (سبحانه و تعالى) بێ.

پاشان كاغەزەكەی لوول دا دایە دەست گەنجەكە ئێمەش پارەكەمان وەرگرت لە گەنجەكە تاكو ئێوارە داهات مالیك هەموو پارەكەی دابەش كرد بەسەر هەژاران، تاكو چل ڕۆژ نەچووین بەلای ئەو گەنجە، ڕۆژێك بینیمان نووسراوێك لە میحراب دانرابوو مالیك سەیری كرد تێیدا نووسرابوو:

ئەوە بەریی بوونێكە لەلای خوا بۆ مالیكی كوڕی دینار كە ئەو قەسرو كۆشكەی بە گرەنتی دابوو بەو گەنجە، ئەوە لای ئێمە پێی گەیشت بەزیادەی (٧٠) پلە.

پێشەوا مالیك نووسراوەكەی هەڵگرت چووین بۆ ماڵی ئەو گەنجە بینیمان دەرگای ماڵەكەیان داخراوە، خەڵكیش وا دەگرین، گوتمان ئەو گەنجە چی بەسەرهاتووە؟ گوتیان لە دوێنێوە مردووە، مالیك دوای مردوو شۆرەكە گەڕا تاكو دۆزیمانەوە، پرسیاری لێكرد چیت لەو گەنجە كرد؟

گوتی: بەر لەوەی بمرێ بانگی كردم گوتی ئەم نووسراوەم لە نێوان كفنو لاشەم دابنێ، منیش وام كرد، مالیك نووسراوەكەی دەرهێنا گوتی ئەم نووسراوەبوو؟ مردوو شۆرەكە گوتی بەڵێ خۆیەتی، ئنجا مالیك زۆر گریا پاشان هەركاتێك ئەو گەنجەی بیر دەكەوتەوە زۆر دەگریا[1].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٣٦- ٢٣٨.

## ١٦٧. ڕێزی مرۆڤــــ لە ئیسلام

ئەگێڕنــەوە صـلاح الـدینی ئـەییوبی بـۆ ڕزگـار کردنـی شـاری نەینـەوا لەدەسـتی خـاچ پەرستان هێزێك ئامادە دەکات بۆ هێرش کردنـە سـەر ئـەو شـارە، لـەو کاتـەدا شاژنی موصڵ سك پڕ دەبێ کـاتی بـوونی منداڵەکەشی نزیـك دەبـێ، لەکۆشـکدا هـەموو خـەمیان دەکەوێتـە بەر کە ئەگەر ئەو هێرشەی مسوڵمانان بکرێت شاژن لـە ترسـان سکەکەی لـەبار بچـێ، بۆیـە دایکی پاشا بڕیـار دەدا بچـێ بـۆ لای سـەرکردەی مسـوڵمانان صـەلاحەددینی ئـەییوبی، تکـای ئـەوەی لێبکـا بـۆ ئـەوەی دوو مـانگ ئـەو هێرشـە دوا بخـات، تـا کچـەکەی بـە هـێمنیو بـێ دڵـەڕاوکێ منـداڵی بـبێ، پاشـا بـەدایکی گـوت: دایـە چـوونەکەت بـێ سـوودە چـونکە سـۆزو بەزەییو شەڕکردن بەیەکەوە کۆنابنەوە، کاتێ پیرەژن هاتـە خزمـەت سـەرکردەی مسـوڵمانان داواکاریـەکی خسـتە ڕوو، صـەلاحەددین بـێ دوودڵـی بـەدایکی پاشـای گـوت: ئێمـە بـۆ ئـەوە نـەهاتووین ببینـە مایـەی تـرسو تۆقانـدنی ئافرەتـانی سکپڕو لـەبار چـوونی کۆرپەلـە بـێ گوناهـەکانیان، ئـەوە بڕیارمانـدا مـاوەی دوومـانگ هێرشـەکەمان دواخـەین، ئـەو هەڵوێسـتە مسوڵمانە جوامێرانیە وای کرد پاش کۆتایی هـاتنی ئـەو دوو مانگـە پاشـاو دایکـیو خێزانـیو کۆرپەلەکـەیان بێنـە خزمـەت سـەرکردەی مسـوڵمانان صـەلاحەددینی ئـەییوبی کلیلـی شـاری نەینەوای تەسلیم بکەن، ئەو هەڵوێستە وای کـرد کـە خـەڵکی ئـەو ناوچـەیە خۆیـان فـەرموو لـە سـەرکردەی مسـوڵمانان بکـەن ئـەوە مـافی مرۆڤـە لای مسـوڵمانان بـۆ منـداڵێك کـە هێشـتا لەدایك نەبووە وە لەدایکو باوکێکی نامسوڵمانە[1].

## ١٦٨. یەکڕیزی مرۆڤەکان لە ئیسلامدا

پرۆفیسۆر زەغلول نەججار کە زانایەکی میصـریەو پسـپۆڕە لـە جیۆلۆجیا دەڵـێ: سـاڵی (١٩٧٥) لەسـەر داوای مسـوڵمانانی خـواروری ئـەفریقیا چـووم بۆلایـانو ماوەیـەك لـەلایان مامەوە، هـەموو ڕۆژێ چـەند وتـارێکم بـۆ دەدان لـە چـەند شـوێنێکی جیـاوازدا، لـەو وڵاتـەدا جیاوازی هەبوو لەنێوان ڕەش پێستو سپی پێستەکاندا، شوێنی بـڕینی پلیـت لـەنێوان ڕەش پێستو سپی پێست جیـاواز بـوو، تەنانـەت چێشـتخانەو پاصەکانیشـیان جیـاواز بـوون، بـەڵام

---

[1]) هونەری هاوڕێ گرتن- ل ٩٩- ١٠٠.

لەگەڵ هەموو ئەو ستەمە زۆرەی لەو وڵاتە لە مسوڵمانان دەكرا كەچی مسوڵمانانم دەبینی زۆر پاكو تەمیز بوون، سەیری مزگەوتەكانیانم دەكرد زۆر پاكژ بوو، دەیانزانی ئەوەی كە جیاوازی ناكات لە نێوان كەسێكی سپی پێست لەگەڵ كەسێكی ڕەش پێست تەنها ئیسلامە، ڕۆژێكیان لە زانكۆیەكی جوولەكە هەر لەو وڵاتە وتارم دا، پاشان گفتو گۆ درووست بوو، ژنێك هەستا زۆر بە توندی قسەی كرد گوتی ئێوەی مسوڵمانان دواكەوتوون ماڧی ژن نادەن، ئێوە هەموو كاربەدەستەكانتان دیكتاتۆرن...هتد، منیش زۆر بەنەرمی وەڵامی ڕەخنەكانیم دایەوە، پاشان ڕۆیشتم، پاش دووساڵ ئەو ئافرەتە پەیوەندی پێوە كردم من لە كوەیت بووم بینیم مسوڵمان بووە پاش ئەوەی بۆی ڕوون بۆتەوە.

جارێكیان لە دێیەكی نزیك شاری جۆهانسبێرگ وتارم دەدا دوای قسەكانی من ڕەشپێستێكی چوار شانە هەستا سەر پێیان ویستی قسە بكات، هەڵسوڕێنەرانی كۆڕەكە خەریك بوون نەهێڵنو ڕێی پێندەن قسە بكا، پێم گوتن بۆچی ڕێی پێدەگرن؟ گوتیان ئەمە قەشەی ئەو دێیەیە دەترسین قسەی نارێك بكات بەرامبەرت، منیش گوتم: ڕێی بدەن ئاساییە هەرچی دەیەوێ با بیڵێ، ئیتر ڕێیان پێدا هاتە لای مایكەكەو دەستی كرد بە قسەكردن، هەموو ئامادەبووانی خستە گریان، بەهۆی ئەو قسانەی كردی، گوتی: پێش ئەوەی كۆڕەكە ببەستن هەمووتان دەستتان كرد بەنوێژ كردن بەكۆمەڵ هیچ جیاوازییەك نەبوو لەنێوانتان ڕەشو سپی گەورەو بچووك هەموو شان بەشانی یەكتر وەستان بۆ نوێژ كردن، ئەو دیمەنە زۆر كاری تێكردم، بەڕاستی من فێری مەسیحییەت بووم لە خوارووی ئەفریقیا ئەوەتا ئێستا قەشەم لەم لادێیەدا، من جیاوازیی زۆر دەبینم لەنێوان خۆم كە قەشەیەكی ڕەش پێستم لەگەڵ قەشەیەكی تردا كە سپی پێستە، بۆیە نزیكەی ساڵێكە وێڵم بەدوای دینێكدا كە بەیەك چاو سەیری هەموو مرۆڤەكان بكات، وا ئێستا لە ئیسلامدا دۆزیمەوە.

لە قسەكانی بەردەوام بوو گوتی: من زۆر گلەییم لە مسوڵمانەكانی ئەو دێیەی خۆمان هەیە، كە بۆچی بە سنگێكی فراوانو نەفەسێكی درێژەوە ئەو ئیسلامە ناگەیەنن بە خەڵكی!! من دەمەوێ مسوڵمان بم.

زەغلول نەججار دەڵێ: پێم گوت برا جارێ پەلە مەکە باشتر لێکۆڵینەوە بکە لەسەر ئیسلام، بۆ ئەوەی قەناعەتت زیاتر بێ، بەڵام ئەو قەشە ڕەش پێستە ڕازی نەبوو گوتی: من لێکۆڵینەوەی تەواوم کردووە لەهەموو دڵمەوە قەناعەتم بە ئیسلام هەیە، بۆیە مسوڵمان بوونی خۆم ڕادەگەیەنم، {أشهَدُ أن لا إلـهَ إلا الله وَأشْـهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله} بەدوای ئەویشدا خەڵکانێکی زۆر مسوڵمان بوون بە قسەو دیمەنەکانی کۆڕەکە کاریگەر بوون[١].

### ١٦٩. یەك ڕیزیو یەکسانی مرۆڤەکان لە ئیسلام

قەشەیەکی ولاتی تەنزانیا کوڕێکی دوانزە ساڵانی دەبێ، ڕۆژێك کوڕەکەی لێی دەپرسێ: باوکە خوای سپی پێستو ڕەش پێستەکان جیاوازە!!؟

باوکی پێی دەڵێ بۆچی ئەو پرسیارە دەکەی کوڕەکەم؟ کوڕەکەی دەڵێ: چونکە دەبینم ڕەش پێستەکان بەجیا دەچنە کەنیسە، تا ئەوان نێنە دەرەوە سپی پێستەکان ناچنە ژوورەوە، پاشان کوڕەکەی دەستی باوکی گرت تا دیمەنێکی پێشان بدات، باوکی بردە لای مزگەوتێکی نزیك کاتی نوێژی هەینی بوو، سەیریان کرد هەموو ڕەنگەکان لە مزگەوتەکەدا لەتەنیش یەکتر بێ جیاوازیی دانیشتوون، کوڕەکە گوتی سەیرکە باوکە بزانە لێرەدا هەموو خەڵکەکە یەك خوایان هەیە، بۆ ئێمەش تەنیا ئەو خوایە نەپەرستین؟

باوکەکەی واقی ورما نەیدەزانی چی بڵێو چی بکات!! دیارە کوڕەکەی پێشتر مسوڵمان ببوو بێ ئەوەی باوکی بزانێ، ئنجا کوڕەکە باوکی بەجێهێشت چوو بۆ ناو مزگەوتەکە بۆ نوێژی هەینی، زۆر پاڕایەوە کە خوا هیدایەتی باوکی بدا، خوای بەبەزەیی پاڕانەوەکانی لێ قەبووڵ کرد، باوکیشی ئیسلامەتی قەبووڵ کردو مسوڵمان بوو[٢].

### ١٧٠. بەزەیی خوای بەبەزەیی

لە یەکێك لە جەنگەکاندا ئافرەتێك لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوترا کوڕەکەت شەهید بووە، بەڵام قەدەری خوا دیارە کوڕەکەی ئەو شەهید نەبوو، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەدیار کەوت، ئافرەتەکە کە کوڕەکەی خۆی لێ بەدیار کەوت یەکسەر

---

[١]) برنامج إسلام بلا حدود- قناة المحور.

[٢]) ژیانەوە ل ٣٧١ – ٣٧٢.

باوەشی لێداو ماچی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو هاوەڵانەی لەگەڵی بوون فەرمووی: ئێوە باوەڕ دەکەن ئەو ئافرەتە دڵی بێت ئەو کورەی بخاتە نێو ئاگرەوە؟ گوتیان نەخێر شتی وا نابێ، ئنجا فەرمووی: دەی کەواتە موژدەتان لێبێ خوای بەبەزەیی بەرامبەر بەندەکانی زۆر لەو دایکە بەڕەحم ترە بۆ منداڵەکەی[1].

هەر سەبارەت بە ڕەحم و بەزەیی خوا، پێشەوا بەیهەقی لە کتێبەکەی خۆیدا (شعب الإیمان) گفت و گۆی نێوان کابرایەکی دەشتەکی و پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ ڕیوایەت دەکات لە ئەبو هورەیرەوە بەم شێوەیە هێناویەتی:

{عن أبي هريرة قال : قال أعرابي يا رسول الله من يحاسب الخلق يوم القيامة؟ قال: الله قال: الله؟ قال: الله قال نجونا ورب الكعبة! قال: وكيف يا أعرابي ؟ قال: لأن الكريم إذا قدر عفا} جارێکیان دەشتەکییەك بە پێغەمبەری خوای گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا کێ لێپێچینەوە لە درووستکراوەکانی دەکا؟ ئەویش وەڵامی دایەوە فەرمووی: خوا، دەشتەکیەکە گوتی: خوا؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: بەڵێ خوا، دەشتەکیەکە گوتی: سوێند بەپەروەردگاری کەعبە دەی کەواتە ڕزگارمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی چۆن؟ کابرای دەشتەکی گوتی: لەبەر ئەوەی (الكريم إذا قدر غفر) واتە: لەبەر ئەوەی خوا سەخییە، سەخییش کاتێ قودرەت و توانای هەبێ تۆڵە ناکاتەوە، بەڵکو چاوپۆشی دەکات[2].

### ١٧١. وتەی حیکمەت و بەجێ لەگەڵ کەسانی نەزان

لە زەمینی یونانا لە یەکێ لە کاروانەکاندا سامانێکی زۆریان برد، بازرگانەکان هێندەی کڕوزانەوەو پاڕانەوە خواو پێغەمبەریان ﷺ کرد بە تکاکار هیچ کەڵکی نەبوو.

کە پیرۆزی دی دزی تاریك گیان

چ باکی هەیە لە گریەی کاروان

بکەی هاوارو بپاڕێیتەوە

---

[1]) میحراب ل ٦٦.

[2]) شعب الإيمان- ج١- ص ٢٤٧.

دز ئالتوونی خۆی ناگێڕێتەوە.

لوقمانی حەكیم لەگەڵ كاروانەكەدا بوو یەكێ پێی گوت: واباشە ئامۆژگاری ئەو دزانە بكەیت، بەڵكو لەهەندێ لەوماڵەی كە دەیانەوێ بیدزن دەست هەڵگرن، جێی داخە ئەو هەموو شتانەمان لێ بدزن، لوقمانی حەكیم گوتی: داخ وتەی حیكمەتە لەگەڵ ئەمانە.

ئاسنێ دەگەڵ مۆرانە خواردی

زاخاو دانەوە لێی لانابا ژەنگ

لەگەڵ دڵ ڕەشا وەعز بێ سوودە

مێخی ئاسنین داناچێ لە سەنگ[1].

## ١٧٢. بەڵگەی عەقڵیی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ بۆ ئەهلی كیتاب

ڕۆژێكیان ئیبنولقەییم ڕەحمەتی خوای لێبێ بەیەكێك لە ئەهلی كیتاب دەڵێ: ئێوە زۆر بێئەدەبی دەكەن بەرامبەر بەخوای پەروەردگار، بەوەی كە دەڵێن موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوا نییە، پیاوەكە بەسەرسوڕمانێكەوە گوتی: بۆچی؟

ئیبنولقەییم گوتی: ئاخر پێم ناڵێن ئەو خوایەی ئێوە باسی دەكەن لەكوێ بوو كاتێ موحەممەدێك هاتو ئەو هەموو ئایەتەی بەناوی خواوە هێنا بۆچی ئەو خوایە هیچ دەنگی نەكرد؟ نەك هەر دەنگی نەكرد بەڵكو سەریشی خست ئایینەكەی لەرۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بۆ بڵاو كردەوە، ئەوەتا لە قورئانەكەی ئێمەدا هاتووە خوای تەعالا دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ (٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ (٤٧)﴾ الحاقة، واتە: ئەگەر موحەممەد تەنها بەچەند وشەیەك درۆ بكات بەدەم ئێمەوە (نەك قورئان هەمووی بەڵكو چەند وشەیەك) ئەوا ئێمە لەناوی دەبەین، باشە ئەگەر بە قسەی

---

[1]) گوڵستانی سەعدی ل ١٣٤.

ئێوەبێ نەك تەنها چەند وشەیەك بەڵکو زیاتر لە (٦٠٠٠) ئایەتی هێناوە کەچی لەناوی نەبرد، کابرای ئەهلی کیتاب سەری داخستو نەیتوانی هیچ بڵێ[1].

[1]) لە خزمەت قورئاندا ل ٢٢٦.

### ١٧٣. یەکێك لە سوودەکانی سوجدە بردن بۆ خوا

خوای زاناو توانا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾ الحجر، واتە: سوێند بەخوا ئێمە دەزانین کە تۆ دڵت توند دەبێ بەرامبەر بەو قسە نابەجێیانەی کە بێ بڕواکانان دەیڵێن، (جا لەهەموو کاتێکدا بەتایبەتی لەکاتی دڵ توندیدا) تەسبیحاتی خوا بکەو سوپاسو ستایشی پەروەردگارت بکە لەڕیزی سوجدە بەراندابە، کەواتە سوجدە بردن مایەی ئارامی دەروونو لاچوونی دڵ توندییە.

م. عبدالحلیم خواجە دەڵێت: پیاوێکی ئەڵمانی مسوڵمانێك دەبینێ لەنوێژدا سوجدە دەبا، زۆر سەری سوڕ دەمێنێ، چاوەڕێ دەکات تا مسوڵمانەکە لە نوێژەکەی دەبێتەوە، لێی دەپرسێ ئەوەی دەتکرد چی بوو؟ ئەویش وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێ ئەوەی من دەمکرد نوێژ بوو، وە ئەوەش کە سەرم لەسەر زەوی دادەنا بریتی بوو لە سوجدە بردن بۆ خوای تەعالا، کابرای ئەڵمانی دەڵێ: من بۆیە ئەوەندەم مەبەست بوو بزانم چونکە چەند ساڵێکە کە تووشی بارێکی دەروونی ناخۆش دەبم‌و دڵم تەنگ دەبێ ناوچەوانم دەخەمە سەر زەوی لەو حاڵەتە ڕزگارم دەبێ، دڵو دەروونم دەگەشێتەوە، ئنجا لەگەڵ ئەو پیاوە مسوڵمانەدا دەچن بۆ مەرکەزی ئیسلامی لەشاری میونخ پاش ئەوەی بە تێرو تەسەلی باسی ئیسلامی بۆ دەکەن ئەویش مسوڵمان دەبێ[1].

### ١٧٤. خشوع لەناو نوێژدا

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ لە یەکێ لە غەزاکان تیرێك بەر قاچی دەکەوێ لەترسی نەزیف بوونو ئازار ناتوانن بۆی دەربێنن، بەڵام بە فرسەتیان زانی کاتێ نوێژی ئەنجامدا تیرەکەیان بۆ دەرهێناو بۆیان تەداوی کرد بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، پاشی نوێژ پرسی ئەوە تیرەکە چی لێهات؟ گوتیان دەرمانهێناو تەداویمان کرد لەو کاتەی لە نوێژبووی.

---

[1]) واحات الإيمان عبدالحميد البلالي ص ٧.

هەر سەبارەت بە خشوع لە نوێژدا ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێبێ ڕۆژێکیان ئیمامەتی دەکردو مسوڵمانان لە پشتییەوە نوێژیان دەکرد، کتو پڕ لە سەقفی مزگەوتەکەوە مارێك کەوتە خوار، نوێژ خوێنەکان زۆربەیان بڵاوەیان لێکردو نوێژەکەیان بەتاڵ کردەوە، کاتێ ئەبو حەنیفە سەلام دەداتەوە دەپرسێ ئەوە مسوڵمانان لەکوێن؟ ئاگای لەو هەموو هەراو ڕاکە ڕاکە نەبووە لە پشتیەوە، ئەوەیە خشوع لەنوێژ[1].

**١٧٥. جیهاد**

غورو، یەکێکە لە سەرکردەکانی سوپای فەڕەنسا چووە سەر قەبری صەلاحەددینو شەقێکی تێهەڵداو گوتی: ئێمە ڕۆڵەکانی ڕیکاردوس‌و خاچپەرستانین ئەی کوا ڕۆڵەکانی تۆ سەلاحەددین؟[2].

**١٧٦. ئارام گرتن لە پێناوی خوادا لەکاتی جیهاد کردن**

ئیبن شەدداد دەڵێ جارێکیان صەلاحەددینی ئەییوبی پاش فەتح کردنی شارێك کچێکی بچووکی بینی، لە وڵاخەکەی دابەزی‌و ماچی کرد، زۆر گریا، منیش پێم گوت قوربان ئەوە دەناسی؟

گوتی: نەخێر، هەرئەوەندەیە کچەکەی خۆمم بیر هاتەوە کە ماوەی سێ ساڵە جێمهێشتووەو نەمدیوە[3].

**١٧٧. جیهادو کەم ئەندامی**

عەمری کوڕی جەموح تەمەنی (٤١) ساڵ بوو، کوڕەکانی مسوڵمان بوون، کەچی خۆی هێشتا بتێکی هاوشێوەی مەناتی درووست کردبوو لەماڵەوە دانابوو دەیپەرست، شەوێکیان مناڵەکانی بەدزی ئەوەوە بتەکەیان هێناو هاوێشتیانە نێو چاڵێکی پیسایی، بەیانی هەستا بینی بتەکە لەشوێنی خۆی نەماوە زۆر شپرزە بوو بەدوایدا گەڕا بینی وا لەنێو چاڵێکی

---

[1]) میحراب ل٤٥٤.

[2]) ژیانەوە ل ١٥٢.

[3]) لە خزمەت قورئاندا ل ٢٣٥.

پیسایی فڕێدراوە، هەڵی گرتەوەو پاكژی كردەوە گەر دەمزانی كێ وای لێكردووی خۆم دەمزانی چیم بەسەر دەهێنا، شەوی دووەمو شەوی سێیەم منداڵەكانی هەمان كاریان دووبارە كردەوە، شەوی چوارەم شمشێرێكی لای بتەكە دانا بۆ ئەوەی ئەگەر كەسێك هات فڕێی بدا بتەكە بەو شمشێرە بەرگریی لەخۆی بكا، دووبارە منداڵەكانی بتەكەیان بردو خستیانەوە هەمان شوێن، بۆ بەیانی كە هەڵسایەوە دووبارە ئەمەی بینی، گوتی: باشە تۆ خوای چیت كەی هەقی ئەوەت هەیە بتپەرستم، كە نەتوانی بەرگری لەخۆت بكەی؟

پاشان مسوڵمان بوو، چوار ساڵ بەسەر مسوڵمانەتییەكەی تێپەڕی شەڕی ئوحود هاتە پێشەوە، بە منداڵەكانی گوت: لە شەڕی بەدردا نەتانهێشت بەشداری بكەم، ئێستا بێڵن با بەشداری ئەو شەڕە بم بەڵكو شەهید دەبمو بەم پێیە شەلانەوە دەچم بۆ بەهەشت.

منداڵەكانی چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان گوت: كە خۆت دەزانی كە باوكمان شەلەو خوای تەعالا مۆڵەتی داوە كە نەچێ بۆ جیهاد كردن، كەچی ئەو هەر سوورە بچێ بۆ ئەو شەڕەو شەهید بێ، عەمریش بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ڕێم پێبدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵكو ئەو پێیە شەلانەم بخەمە سەر خاكی بەهەشت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وازی لێبێنن بەڵكو شەهید بێو بەهەشتی بەقسمەت بێ، كە ڕێگەیاندا بچێ بۆ شەڕەكە لە خۆشیا هەر لەبەر خۆی دەیگوت: {شَوقاً إلى الجَنَّة، شَوقاً إلى الجَنَّة} كە گەیشتنە لای ئوحود لە ڕۆژی غەزاكەدا دەیگوت: {ركضاً إلى الجَنَّة، ركضاً إلى الجَنَّة}، لەگەرمەی شەڕەكەشدا دەیگوت: ئای لە بۆنی بەهەشت، ئای لە بۆنی بەهەشت، كاتێ لەسەر چیای ئوحود وەستا بوو ئاوڕی دایەوە شاری مەدینە لە پشتییەوە بوو، گوتی: خوایە نەمگێڕیەوە بۆ مەدینە، پاشان لەشەڕەكەدا خۆیو كوڕێكی بەناوی خەللاد شەهید بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەخوا چاوم لێیە وا پێیە شەلەكانی لەسەر خاكی بەهەشت دانا، (دیارە لە بەهەشتدا كەم ئەندامی نییە بەڵام ئەو لەسەر داوای خۆی خوای بەبەزەیی ڕێگەی دا قاچە شەلەكانی بنێ بەخاكی بەهەشتەوە)، لەبەر ئەوەی لە شەڕەكەدا هەواڵی شەهید بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵاو بوویەوە، خێزانەكەی عەمر بەپەلە هات بە پیلی سوپای مسوڵمانانەوە دەگەیشت بە هەركەسێك پرسیاری پێغەمبەری خوای ﷺ دەكرد، ئەوانیش بە خێزانەكەی عەمریان گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر

چاكەو سەلامەتە سوپاس بۆخوا، بەڵام پیاوەكەت و كوڕەكەت شەهید بوونە، هەر دەیگوت: كوا پێغەمبەری خوام پێشان بدەن بزانم كە سەلامەتە، كاتێ پێغەمبەری خوایان ﷺ پێشاندا ئنجا دڵنیا بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو بەڵاو موصیبەت و گرفتارییەك ئاسانەو هیچ نییە بەمەرجێك تۆ سەلامەت بی.

ئنجا ویستییان لاشەی عەمرِ بە وڵاخێك بەرنەوە بۆ مەدینە، هەرچیان كرد وڵاخەكە غەزری و نەچوو بۆ مەدینە، ئنجا تێیگەیشتن كە خۆی دوعای كردووە خوای گەورە نەیگێڕێتەوە بۆ مەدینە، بۆیە هەر لەوێ لە گۆڕەپانی جەنگدا بەخاك سپێردرا[1].

### ١٧٨. بێنازی و هەژار كەوتن لە پێناو ئسلامدا

موصعەبی كوڕی عومەیرِ لاوێكی بەنازو نازدارو دەوڵەمەند بوو بەر لەوەی ببێتە مسوڵمان، هەردەم باشترین جل و بەرگی دەپۆشی و نایابترین بۆنی لەخۆی دەدا، ئەگەر بە شوێنێكدا گوزەری بكردایە ماوەیەك پاشان بەهۆی بۆنە خۆشەكەی دەیانزانی موصعەب بەو شوێنەدا گوزەری كردووە، كە بوو بە مسوڵمان دایكی بێ بەشی كرد لەهەموو ئەو نازو نیعمەتە دونیاییانە، لە شەڕی ئوحود یەكێ بوو لە هاوەڵە ئاڵا بەدەستەكان، قۆڵی ڕاستییان پەڕاند بەدەستی چەپی ئاڵاكەی هەڵگرت، دەستی چەپیشیان پەڕاند بە ڕان و سنگی ئاڵاكەی هەڵگرت، پاشان یەكێ لە كافرەكان هێرشی بۆ هێناو شەهیدی كرد، پاشی جەنگەكە پارچە قوماشێكیان هێنا لاشەی موصعەبی پێ داپۆشن، ئەیاندا بەلای سەری لای قاچی دەردەكەوت، ئەیاندا بەلای قاچی لای سەری دەردەكەوت، لەبەر كەمی قوماشەكە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە موصعەبی بینی زۆر گریا، فەرمووی: خوا ڕەحم بە موصعەب بكات كاتی خۆی لە چ نازو نیعمەتێكدا بوو[2].

### ١٧٩. كاریگەری ئامۆژگاری

مسوڵمانێك لە وڵاتی سعودیەوە دەچێ بۆ وڵاتی ئەمریكا بۆ خوێندنی ماجستێرو دكتۆرا، لە یەكێ لە زانكۆكانی ئەمریكا، كە دەگاتە ئەو وڵاتە بیر لەوە دەكاتەوە كە

---

[1]) لە خزمەت قورئاندا ل ٤٤٥- ٤٤٧.

[2]) لە خزمەت قورئاندا ل ٤٤٧.

شوقەیەك بەكرێ بگرێ لە نزیك بەندیخانەیەك (سجن)ێك بێ بۆ ئەوەی هەركاتێ دەرفەت هەبێ بچێ بانگەوازی خوایان بەگوێدا بدا، ڕۆژێك چوو بۆ لای بەڕێوەبەری ئەو بەندینخانەیە بۆ ئەوەی ڕێگەی بدا بۆ بانگەوازی كردن، ئەویش ڕێگەی پێدا، پاش سەعاتێك ئامۆژگاری كردنی بەندییەكان سێ كەس لە ڕەش پێستەكان مسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند، ئیتر بەجێی هێشتن‌و خەریكی حوێندنی خۆی بوو، پاشی مانگێك بەڕێوەبەری بەندیخانەكە چوو بۆ لای ئەو قوتابیە مسوڵمانە لە شوقەكەی خۆیدا، داوای لێكرد بێ وتار بدات بۆ ئەو گیراوانی بەندیخانەكەی، ئەویش بە بەڕێوەبەرەكە دەڵێ بۆچی حەز دەكەیت من بێم تۆ نازانی دەیانكەم بە مسوڵمان؟ ئەویش دەڵێ: گرنگ نییە بەلامەوە دەیانكەیت بەچی، لەوەتەی تۆ هاتوویت بەندییەكان بەردەوام سەرقاڵی وتووێژو كیتاب خوێندنەوەن، ڕەفتاریان زۆر چاك بووە بەمەش بەندیخانەكەی من لەم مانگەدا بەباشترین بەندیخانە لەقەڵەم دراوە لەلایەن حكومەتەوە، وە پاداشتم لەسەری وەرگرتووە.

بەڵێ ئەمەیە هیممەتی بۆخوا صوڵحان ئەگینا گەنجێكی سەرقاڵ بە دیراسەوە چیداوە بە بانگەوازی كردن لە بەندیخانەدا، ئنجا بۆ بەندیخانەكانی تری ئەمریكا كە نزیكەی (٥٠٠٠) بەندیخانەن ئەو گەنجە پاش هەوڵی زۆرو پەیوەندی كردن بە خێرخوازانەوە توانی هەزار كتێبخانە درووست بكات بۆ (١٠٠٠) بەندیخانە، هەر بەندیخانەیەكیش بایی (١٠٠٠) ڕیاڵی سعودی پەڕاوی ئیسلامیان بۆ دابین كرد[1].

### ١٨٠. گوناهی جنێودان

مەلا موخلیصی برام بۆی گێڕامەوە كە جارێك سۆفی خدری سەییاخ هاتە ماڵمان پیاوێك بوو زۆر ئەهلی تەقوا بوو، ڕۆژێك نا ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبو، هەموو شەوێكیش سەد ڕكعات شەو نوێژی دەكرد، دەڵێ: لێم پرسی قوربان زاهیر چییەو باتین چییە؟ وەلامی دامەوەو گوتی: زاهیر ئەوەیە كە ئێوەی مەلاكان دەیزانن، ئێمە نایزانین، باتینیش ئەوە ئێرانەیە ئاماژەی بەسووچێكی ژووری میوانان كرد، گوتی ئەو شوێنە لە عەرشی خواوە ڕەحمەتی لێ پڕاوە بۆ ماوەی بیستو چوار سەعات، چونكە ئەمرۆ عەسرێ جوێنێك لەم

[1]) لە خزمەت قورئاندا- ل ٢٣٥.

شوێنە دراوە، مەلا موخلیص دەڵێ: ئەو ڕۆژە عەسرەکەی دوو میوانم هەبوو بە گاڵتە جوێنیان بەیەکتر دابوو لەو شوێنەدا، بۆ ئێوارەکەی ئێمەش شیومان بۆی کرد فتاری کردەوەوە هەندێ گۆشتی خوارد، گوتی: بۆ بەیانیش بەڕۆژوو دەبم، دەڵێ: منیش پرسیم قوربان ئەی ڕۆژێك نا ڕۆژێك بەڕۆژوو نابی، گوتی: با بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمشەو گۆشتم خواردووە لەباتی گۆشت خواردنەکە بەیانیش بەڕۆژوو دەبم، ئەمەیە ئەهلی تەقوا.

### ١٨١. باوەڕی تەواوی هاوەڵان بە پێغەمبەری خوا ﷺ

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: کێ لە ئێوە چۆتە بەهەشتەوە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گوتی: من، عومەری کوڕی خەتتاب، لەوێدا بوو، وەڵامی عەبدوڵڵای کوڕی لەلا سەیر بوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ لە ئاوی بەهەشتی خواردۆتەوە؟ دووبارە عەبدوڵڵا گوتی: من، ئەوجارە فەرمووی ئەی کێ لە خواردنی بەهەشتی خواردووە؟ دیسان عەبدوڵڵا گوتی: من، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئادەی عەبدوڵڵا بزانم چۆن؟

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ لە سەفەری ئیسراو میعراجدا هەواڵت پێماندا کە بەهەشتت دیوەو لە ئاوەکەی‌و خواردنەکەییت خواردووەو خواردۆتەوە، جا کە تۆ چوویت، ئەوا هەواڵی تۆش هیچ گومانی تێدا نییە، هەروەك خۆم چووبم وایە، ئەمەش جێی سەرسوڕمانی هاوەڵان بوو[١].

### ١٨٢. مردووەکان چاوەڕوانی زیندووەکان دەکەن

ڕۆژێکیان باڵوڵ لە گۆڕستان دەگەڕایەوە لێیان پرسی لە کوێوە دێیتەوە؟ گوتی: لای کاروانێکەوە دێم کە سەرزەوییان جێهێشتووە، گوتیان ئایا پرسیارت لێکردن؟ گوتی: بەڵێ، لەوانم پرسی کەی لێرە دەڕۆن‌و کۆچ دەکەن؟ وەڵامیان دامەوە گوتیان: ئێمە چاوەڕێی ئێوەین هەرکاتێ ئێوە پەیوەست بوون بە ئێمەوە ئەوسا دەڕۆین[٢].

---

[١]) ژیانەوە ل- ٢٢٣.

[٢]) بەسەرهاتە شیرین‌و پەند ئامێزەکانی باڵوڵی دانا ل ٩٣- ٩٤.

## ١٨٣. دونیا بەرەحمەت بۆ ئەو دوو کەسەیە

لوقمانی حەکیم بە کورەکەی گوت: رۆڵەکەم هیچ خێرو خۆشیو چاکەیەك لەم دونیایەدا نییە تەنیا بۆ یەکێك نەبێ لەم دوو کەسانە، یەکێکیان پیاوێکە کردەوەی خراپی هەبووبێ لە رابردوو، ئنجا پاشان سوور بێ لەسەر پرکردنەوەی ئەم خراپەیە بەکاری چاك بۆ ئەوەی خوا لە خراپەکانی خۆشبێ، هەروەها بۆ پیاوێك کە بگەرێ بۆ پلەو پایەی دوارۆژ پێشبرکێی بۆ بکات تاکو دەیگاتێ.

## ١٨٤. ئافرەتی باش بۆ پیاوەکەی

پێشەوا ئیبنولجەوزی دەڵێ: شەوێك خێزانی حەبیبی عەجەمی بەخەبەر هات، لەو کاتەدا حەبیب خەوی لێکەوتبوو لە پێش نوێژی بەیانی بانگی کرد پێی گوت: هەڵسە ئەی پیاو وا شەو رۆیشتو رۆژ هات بەرەو روومان، رێگایەکی دوورت لە پێشە بەتوێشوێکی کەم، کاروانی چاکان رۆیشتن لە پێشمان ئێمەش لێرە بەجێماین(١).

## ١٨٥. هەندێ لە سیفاتەکانی پیاو چاکان

رۆژێکیان شێخ ئیبراهیمی ئەدهەم دەچوو بۆ زیارەتی ماڵی خوا پیاوێکی دەشتەکی بینی لەسەر وشترێك بوو پیاوە دەشتەکییەکە لێی پرسی: ئەی شێخ بۆ کوێ دەرۆی؟ ئەویش گوتی: بۆ زیارەتی ماڵی خوا، پیاوە دەشتەکیەکە گوتی: پێدەچێ تۆ شێت بیت چونکە هیچ ولاخو پێرۆیەکت پێ نییە کە سواری ببی، هیچ زادو خواردەمەنیەکت پێ نییە، گەشتەکەشت دوورە، شێخ ئیبراهیم گوتی: من پێرۆو ولاخم هەیە بەلام تۆ نابینی، پیاوە دەشتەکیەکە گوتی: کوا؟

شێخ گوتی: ئەگەر تووشی موصیبەتێك بووم سواری پێرۆی صەبرو ئارامی دەبم، ئەگەر نیعمەتێك بەسەرم دابەزی سواری پێرۆی شوکرو سوپاس دەبم، ئەگەر قەزاو قەدەریش هات ئەوە سواری پێرۆی رازی بوون دەبم، ئەگەر نەفسم بانگی کردم بۆ شتێك

---

(١) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢١٠.

ئەوە دەزانم کە ئەم تەمەنەی ماومە لە دونیا کەمترە لە ڕابردووەکەی، کابرای دەشتەکی گوتی: برۆ کاکە لەسەر ئیزنی خوا بەڕاستی تۆ سواری‌و من پیادەم![1].

### ١٨٦. سەرەنجامی خواردنی ماددەی هۆشبەر لە دونیادا

ئەمە بەسەرهاتی پیاوێکە کە شەوو ڕۆژ سەرقاڵی ماددەی هۆشبەرەکانە، تاکو وای لێهاتووە لەگەڵ دەمارەکانی لاشەی تێکەڵ بووە، ئەمەش بەهۆی هاوڕێیەتی کردنی کەسانی خراپ، ڕۆژێکیان دەچێتە لای خێزانەکەی زۆر بەناشیرینییەوە سەرزەنشتی دەکات‌و جوێنی پێدەدا، پاشانیش لێی دەدا، ڕۆژێکیان دێتەوە ماڵەوە لەدوای خواردنی ئەو ماددە پیسە، دەبینێ وا خێزانەکەی شیر دەدا بە منداڵە ساواکەی، کاتێ کە منداڵەکە دەگریێ دایکی پێی دەڵێ: بێدەنگ بە ڕۆڵەکەم، لایە لایەی بۆدەکات، بەڵام منداڵەکە هەر بێدەنگ نابێ، پیاوەکەی پێی دەڵێ ئافرەت ئەگەر ئەو منداڵە بێدەنگ نەبێ دەیکوژم، دایکەکەش بەردەوام هەوڵ دەدات بێدەنگی بکات، بەڵام سوودی نابێ، یەکسەر پیاوە سەر خۆشەکە هەڵسا منداڵەکەی لە مەمکی دایکی کردەوەو بردی بۆ چێشتخانەکە بۆ ئەوەی چەقۆیەك ئامادە بکا، ئافرەتەکە هاواری کرد بۆ ئەوەی بانگی دراوسێکانی بکات، وەرن وا منداڵەکەم دەکوژێ، خەڵکەکە هاتن بەدەم هاواری ژنەکەوە، کە هاتنە ژوورەوە پیاوەکە سەری منداڵە شیرە خۆرەکەی لە لاشەی جیا کردبۆوە، هەر پێش دەکەنی، ئێستا ئەو پیاوە لەنێو دیوارەکانی بەندیخانە ژیانی دەباتە سەر، ئەمەش هەمووی بەهۆی خواردنی ئەو ماددە هۆشبەرانەیە[2].

### ١٨٧. مافی جیران‌و چاکە کردن لەگەڵی

شێخ حەسەنی بەصری دراوسێیەکی گاوری هەبوو، زۆر ئازاری دەدا، ئەو پیاوە گاورە لە سەربانەکەی خۆیدا دەچوو بۆ سەربانی ماڵی شێخ حەسەنس بەصری، ڕۆژێك کونێکی لە سەربانی ماڵی شێخ حەسەنی بەصری کردەوە، هەموو جارێ میزی دەکردە نێو ئەو کونەوە، ئەویش لە ماڵەکەی خۆی قاپێکی دادەنا لەژێر کونی سەربانەکەدا، بەم شێوەیە

[1]) قصص الصالحين- مصطفى مراد ص ٣٢.

[2]) ساعة وساعة- محمود المصري ج٢ ص ١٦١.

(٢٠) دانە ساڵی لەگەڵ ئەو دراوسێیە بردە سەر، قەدەری خوا وابوو شێخ نەخۆش کەوت، دراوسێیەکەی هاتە سەردانی چاوی کەوت بە قاپەکە کە میزی ئەوی تێدا بوو، گوتی: ئێوە چەند ساڵە ئەو ئازارە هەڵدەگرن، شێخ گوتی: ئەوە بیست ساڵە ئێمە حاڵمان ئەوهایە، پیاوە گاورەکە زینارەکەی لە ژێر جل‌و بەرگییەوە پچڕاندو یەکسەر مسوڵمان بوو[1].

### ١٨٨. کێ یارمەتی دەری ستەمکارانە؟

دەگێڕنەوە پیاوێکی بەرگدروو هاتە لای سوفیانی ثوری گوتی: ئەی سوفیان من بەرگی کاربەدەستان دەدوورم ئایا لەو کەسانە دەژمێردرێم کە یارمەتیدەری ستەمکاران بم، سوفیان گوتی: تۆ بەو کارەت خۆت ستەمکاری نەك یارمەتی دەری ستەمکاران بیت، کە بچن دەرزی‌و دەزووت بۆ کڕن تۆش بەرگی بۆ ئەوان پێ بدروی[2].

### ١٨٩. ئافرەتی خیانەت کار

ئیبن جەوزی دەڵێ: پێمان گەیشتووە لە خەلیفە منصور کە جارێك پیاوێکی خەمبار لە کۆڕەکەی دادەنیشێ، ئەویش پرسیاری لێکرد، کابرا گوتی: من جارێ دەرچووم بۆ بازرگانی ماڵێکی زۆرم قازانج کرد، هێنامەوە ماڵەکەی خۆم، دام بەدەستی خێزانەکەم، ڕۆژێك خێزانەکەم گوتی: هەموو پارەو کەل‌و پەلەکانت دزراون، خەلیفە منصور گوتی: چەند دەبێ ئەو ژنەت هێناوە؟ گوتی ساڵێك، مەنصور گوتی: ئایە کچە؟ پیاوەکە گوتی: نەخێر، مەنصور گوتی: کوڕی تری هەیە لە مێردەکەی تر؟ پیاوەکە گوتی: نەخێر، مەنصور گوتی: گەنجە یان پیرە؟ پیاوەکە گوتی تازە پێرادەگا، مەنصور شوشە بۆنێکی تایبەتی پێدا گوتی: ئەمە خەمەکانت لادەبا، خۆت بەم بۆنە بۆن خۆش بکە، پیاوەکە ڕۆیشت لەلای مەنصور، مەنصور فەرمانی بە چوار پیاوی ڕاستگۆ کرد پێی گوتن: بڕۆنە سەر هەر چوار دەروازەی شار، هەریەکێك ئەم بۆنەی لێهات خێرا بیگرن‌و بیهێنن بۆلام، پیاوە خەمبارەکەش بۆنەکەی بردەوە ماڵەوە دای بە خێزانەکەی گوتی: ئەمە دیاری خەلیفەیە، کە ژنەکە بۆنی کرد یەکسەر دای بە پیاوێك کە خۆشی دەویست، ماڵە

---

[1]) ألف قصة وقصة- ج١ ص٣٩.

[2]) إرشاد العباد ص ٢٩٦.

دزراوەکەش هەمووی بەخشرابوو بەم پیاوە، ژنەکە گوتی: خۆت بۆن خۆش بکە بەمە، ئەمە دیاری خەلیفەیە، پیاوەکەش بۆنەکەی لەخۆیدا ئنجا دەرچوو لەشار پاسەوانەکانی دەروازە هەرکەسێکی دەیانبینی بۆنیان لێدەکرد تاکو ئەو پیاوە هات کە بۆنەکەی لەخۆی دابوو، بۆنیان لێکردو گوتیان ئەو بۆنە چییە؟ دەست بەجێ کابرایان هێنایە لای خەلیفە، پرسیاری لە کابرا کرد ئەم بۆنەت لە کوێ هێناوە؟ پیاوەکە زمانی تێکەڵ کردو قسەی بۆ نەهات، بەدەرکەوت هەموو پارەکانی ئەو پیاوەی دزیوە، خەلیفەش هەموو پارەکانی لێوەرگرتەوە، دای بەخاوەنەکەی وە ژنەکەشی پێ تەڵاق دا[1].

### ١٩٠. سەرئەنجامی فێڵ کردن لە تەرازوو

ڕۆژێك مالیكی كوڕی دینار سەردانی دراوسێیەکی خۆی کرد، لەسەرە مەرگ بوو، دراوسێکەی بە مالیکی گوت: ئەی مالیك دوو کێوی گەورەی لە ئاگر لە پێشمە، هەوڵ دەدەم بەسەریان بکەوم، پێشەوا مالیك دەڵێ: پرسیارم لە خانەوادەکەی کرد کە حاڵی ئەم پیاوە چۆن بووە پێشتر گوتیان دوو پێوانەی هەبوو، (ڕوبە) بەیەکێکیان وەری دەگرت بەوەی تریان دەی فرۆشتەوە، (واتە فێڵی تێدا دەکرد)، مالیك گوتی: بۆم بێنن کە بۆیان هێنا ڕوبەکانی پێکدادا تاکو شکاندی، پیاوەکە گوتی: هەر ئازارم لەسەر گرانتر دەبێ ئنجا بەم نەخۆشییەوە مرد[2].

### ١٩١. بەرهەمی ئارام گرتن لەگەڵ ئافرەتی خراپ

یەکێ لە پیاوچاکان برایەکی هەبوو هەموو ساڵی جارێك سەردانی دەکرد، جارێکیان براکەی هات بۆ سەردانی، لە دەرگای دا خێزانی پیاو چاکەکە گوتی: کێیە؟ گوتی: برای مێردەکەتە، خێزانەکەی گوتی: پیاوەکەم چووەتە چیا بۆ دارکردن، یاخوا نەیەتەوە، پاشان هەر بەخراپی باسی کردو جوێنی بە پیاوەکەی دا، لەو سەین و بەینەدا بوون براکەی هاتەوە، شێرێك بارە دارەکەی بۆ هەڵگرتبوو، کە گەیشتەوە ماڵ بینی براکەی هاتووە زۆر خۆشحاڵ بوو، ئنجا دارەکانی دابەزاند لەسەر پشتی شێرەکەو بە شێرەکەی گوت: بڕۆ خوا

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٧٧- ٢٧٨.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٤٠.

بەردەکەت دارت بکا، ئنجا براکەی بردە ژووری خێزانەکەشی هەر جوێنی پێدەدا، ئەویش هیچ خۆی نارەحەت نەدەکرد، برا بچووکەکەی کە ڕۆیشت سەری سوڕما لە سەبرو ئارامی برا گەورەکەی، بۆ سالی داهاتوو هاتەوە سەردانی برا گەورە پیاو چاکەکەی، لەدەرگای دا ئافرەتێك گوتی: کێیە؟ برا بچووکەکەی گوتی: برای مێردتە، ئافرەتەکە گوتی: یاخوا بەخێر بێیت پیاوەکەم چووە بۆ چیا بۆ دارکردن ئێستا دەگەڕێتەوە، زۆر بەچاکی باسی کرد لای براکەی، پاشان پێی گوت: دەبێ تۆزێ چاوەڕوانی بکەی تاکو دەگەڕێتەوە، برا گەورەکەی هاتەوە، برا بچووکەکەی بینی وا داری لەسەر پشتی خۆی بار کردووە، ئنجا براکەی بەخێر هێناو زۆری ڕێز لێگرت ئافرەتەکەشی زۆر بەگەرمی پێشوازی لە مێردەکەی کرد بەخێرهاتنەوەی کرد، برا بچووکەکەی گوتی: برام سالی پار کە هاتم لەسەر پشتی شێر دارەکانت بار کردبوو ئێستا بۆچی لەسەر پشتی خۆت بارت کردووە؟ برا گەورەکەی گوتی: برام ئەو ئافرەتەی یەکەمم ئافرەتێکی تا بلێی خراپ بوو بەلام من ئارامم دەگرت لە سەر خراپەکانی خوای گەورە بەو شێوەیە یارمەتی دەدام، ئەو شێرە درندەی بۆ ڕام هێنابووم، بەلام ئەو ئافرەتە خراپەم وەفاتی کرد، ئێستا ئەو ئافرەتەم هێناوە ئافرەتێکی زۆر چاکە زۆر لەگەلی ئاسوودەم، بۆیە ئەو شێرەم لەدەست نەما لەگەل هێنانی ئەو ئافرەتە[1].

### ١٩٢. لە میوانداریدا زۆر مەمێنەوە

موبەڕید دەلێ: پیاوێك بە میوانداری چوو بۆ مالێك، مالەکە لە میوانداری کردنی ئەو پیاوە بێزار بوون، خاوەن مالەکە بە خێزانەکەی گوت: چۆن بزانین ئەو میوانە چەند ڕۆژ دەمێنێتەوە؟ ژنەکە گوتی لەنێوان خۆماندا شەڕێك درووست دەکەین ئنجا بۆ نێوەنگیری دەچینە لای ئەو کات دەزانین، ئیتر شەڕەکەیان درووست کرد، ژنەکە هاواری هێنا بۆ میوانەکەو پێی گوت: توو حەقی ئەو خوایەی کە سەفەری بەیانیت لێ پیرۆز دەکات حەقی منە یان هی پیاوەکەم، میوانەکە گوتی: بە هەقی ئەو خوایەی کە مانەوەی یەك مانگم لێ پیرۆز دەکات نازانم هەقی کامتانە[2].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٤١- ٢٤٢.

[2]) چیرۆکی زیرەکان – إبن القیم الجوزیة.

### ١٩٣. سۆزو بەزەیی بۆ منالآن

رۆژێك ئەقرەعی كوڕی حابیس هاتە لای پێشەوا عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لەو كاتەدا بینی پێشەوا عومەر لەگەڵ منداڵەكانی یاری دەكات یەكێكیان لەسەر قۆڵی یەكێكیان لەسەر پشتی بوون، ئەقرەع گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەوە چییە؟ ئایا ئێوە بەم شێوەیە یاریی لەگەڵ منداڵەكانتان دەكەن؟

پێشەوا عومەر گوتی: بۆچی تۆ لەماڵەوە یاری لەگەڵ منداڵەكانت ناكەی؟ ئەقرەع گوتی: من كە دەچمەوە ماڵەوە ئەوەی قسە دەكات بێدەنگ دەبێ ئەوەی دانیشتووە هەڵدەستێتەوە، ئەوەی خەوتوە بێدار دەبێتەوە، وە تاكو ئێستا (١٠) منداڵم هەیە هیچیانم ماچ نەكردووە، پێشەوا عومەر گوتی: كەواتە تۆ ناشێی بۆ ئەوەی ببیتە والی مسوڵمانان، بۆیە فەرمانی كرد لە ویلایەت بخرێ[١].

### ١٩٤. گەورەیی دینی ئیسلام

(لیامیلا) كچێكی ئەمریكیی تەمەن (٢٨) ساڵە، قوتابی بوو لە زانكۆی (میزۆری) لەبەشی كۆمەڵناسی لە ولاتی كۆلۆمبیا، ماوەی دوو ساڵ هەستا بە دیراسەكردنو لێكۆڵینەوەیەكی ورد سەبارەت بە ئیسلام، دوای ئەو دوو ساڵە ئەو كچە ئەمریكییە مسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، بۆ ئەوەی زیاتر پەیوەست بێ بە دینی خواوە ناوی خۆی گۆڕی بۆ (هاجەر)، هاجەر خاتوون باسی توێژینەوەكەی خۆی دەكات سەبارەت بە ئیسلام، دەڵێ: ماوەیەكی زۆر بوو پرسیاری زۆر لە مێشكمدا درووست بوو سەبارەت بە درووست بوونی ئەم گەردوونەو ژیانی ئینسان، هەرچەندە دیراسەی زۆری توێژینەوە ئەمریكییەكانم كرد بەلام وەلامێكی دڵنیاكەرم دەست نەكەوت، زۆر جار وشەی ئیسلامم دەبیست بەلام ناوەڕۆكەكەی لە مێشكمدا نادیار بوو، نەك هەر ئەوە بەڵكو زۆر بە شێواوی لە ئیسلام گەیستبووم وام دەزانی جیاوازی دەكات لە نێوان ژنو پیاو وە تێگەیشتبووم، كە لەسەر بناغەی توندو تیژی مامەڵە دەكات لەگەڵ مرۆڤەكان، بەردەوام بەو نەزانییە مامەوە تاكو ڕاستی ئیسلامم بۆ دەركەوتو بەرەنگاری جیهانی ماددی بوومەوە، لەو كاتەوە دەستم كرد

---

[١]) لقمان الحكيم- محمد عبدالرحيم.

بە دیراسە کردنی تەواوی ئیسلام، هەرچەندە لە سەرەتاوە زۆر قورس بوو بەلامەوە بەهۆی ئەوەی سەرچاوەی ئینگلیزیی زۆر دەگمەنە سەبارەت بە ئیسلام، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە سەرەتاوە هەستم بە خۆشەویستییەکی یەکجار زۆر دەکرد بەرامبەر بە ئیسلام، جار لەدوای جار تێگەیشتنم بەرامبەر بە ئیسلام زیادی دەکرد، خوای گەورەش هیدایەتی دام بۆ شارێگەی ئیسلامو بەهاو خووڕەوشتی بەرز، ئیسلام کاریگەری زۆری لەسەر ئەو خاتوونە درووست کردووە، پێشتر وەك هەر ئافرەتێکی تری ئەمریکی شوێن ئارەزووەکانی دەکەوت، بەڵام ئێستا پابەندە بە یاساو ڕێساکانی ئیسلام، خۆی دەڵێ: ئێستا مەبەستی سەرەکیم خۆ بەخت کردنە بۆ ئیسلام، چونکە بەڕاستی ئایینی خوای پەروەردگارەو ئینسانییەت بەرەو ئاشتیو خۆشبەختی دەبا، کاتێ پرسیار لە خاتوو هاجەر کرا بۆچی تەنها ئیسلام ڕێگا چارەیە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی؟

لە وەڵامدا گوتی: چونکە تەنها ئیسلامە دەتوانێ چارەسەر بدۆزێتەوە بۆ هەموو کێشە کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابوریو هەموو ڕەهەندو کایەکانی ئینسان، ئیسلام تاکە بەرنامەو نیزامێکە کە دەتوانێ هاوسەنگی درووست بکات لەنێوان پێویستییە ڕۆحیەکانو پێویستیە ماددیەکان، بەلای هاجەرەوە تێکۆشانو هەوڵ دانو خەبات کردن گرنگترین لایەنی ئیسلامە بۆ مسوڵمانانی ئەو سەردەمە.

هەر لەو کاتەی مسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، خاتوو هاجەر هەموو شێوازەکانی ژیانی خۆی گۆڕیو پابەندی تەواوی خۆی ڕاگەیاند، ئێستا پۆشاکی شەرعی لەبەر دەکاتو نوێژەکان لەکاتی خۆی ئەنجام دەدات، هەوڵ دەدات بە یارمەتی خوا قورئانی بەرزو بە پێز لەبەر بکات، سەبارەت بە خانەوادەو هاوڕێکانی دەڵێ: هەرچەندە زۆر تانەو تەشەرم لێدەدەن بەڵام من هیچ شتێکم بەقەد ئیسلام پێ گرنگ نییە، خاتوو هاجەر توانیویەتی لە بواری سیاسەتیشدا ئەسپی خۆی تاوبدات، وە ڕۆڵێکی بەرچاوو گرنگی هەبێ، بەتایبەت لەسەر مەسەلەی فەڵەستینی داگیر کراو، بەڕاستی جێگای شانازییو خۆشحاڵیە ئافرەتێکی سپی پێستی ئەمریکی بەو شێوەیە بگۆڕێتو ئێستا بانگەوازی بۆ دینی خوا بکات، وە بتوانێ بەرگریی لە خواستو مافەکانی مسوڵمانانی بەش خوراوو داگیر کراوی فەڵەستین بکات، پەیامو ئامۆژگاری ئەو خاتوونە بۆ گەلانی مسوڵمان ئەوەیە :

ئێوەی مسولمان دەتوانن شادیو خۆشگوزەرانیو ئاشتی بلاو بکەنەوە، هەلسن نەهێشتنی شەڕو ئاژاوەو هەژارییو نادادپەروەری ڕابگەیەنن بۆ گشت جیهان، لە ڕێگەی ئەو بەرنامە خواییەوە، داواتان لێدەکەم ماندوو نەناس بن بەرامبەر شالاوی نەزانیو تاریکیو خراپەکاریی، هیوام وایە ببن بە کێوێکی پۆلایین بەرامبەر هەموو پیلانێکی ئاشکراو نهێنی، کە بەردەوام لەلایەن دوژمنانی ئیسلامو مسولمانان لە ئارادایە[١].

### ١٩٥. تێگەیشتن لە دینی ئیسلام

ڕۆبەرت کۆنتین ڕاوێژکاری سەرۆکی ئەمریکی نیکسۆن بوو، هەلگری بڕوانامەی دکتۆرا بوو لە (دیراسەی شارستانێتیەکان) یەکێکە لە کەسایەتیە دیارەکانی ئەمریکا، وە بۆماوەی (٣٠) سال کاری کردووە لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاو کۆشکی سپیدا، نیکسۆنی سەرۆك ویستی پەرتووکێك بنووسێ لەسەر ئیسلامی ئوصولی، بۆ ئەو مەبەستە داوای لە دەزگای هەوالگریی ولاتەکەی کرد ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلی پێ بدەن، ئەوانیش مەلەفێکی تێرو تەسەلو فراوانیان خستە بەردەمی، بەلام لەبەر ئەوەی بۆخۆی کاتی نەبوو دیراسەی بکا، دای بە ڕاوێژکارەکەی کۆنتین، بۆ ئەوەی دیراسەی بکاتو دوایی بە گوشراوی بیداتێ، کاتێك ڕۆبەرت هەلسا بە دیراسەکردنی ئەو مەلەفە، کاری زۆری تێکردو مسولمان بوو، ئێستا ئەو پیاوە بەرێزە لە گرنگترین بلاوکراوەکانی ئەوروپا شت دەنووسێو بانگەوازی بۆ دینی خوا دەکات[٢].

### ١٩٦. بەزەییو میهرەبانی خوای بێوێنە

دەگێڕنەوە پیاوێك فەرمانی پێ دەکرێ بچێتە ناو دۆزەخ، کە ڕۆیی بۆ ئەوەی بچێ بۆ دۆزەخ لەو کاتەدا کە سێیەکی ڕێگەکەی بڕیبوو ئاوڕی دایەوە، پاشان کە نیوەی ڕێگاکەی بڕی دووبارە ئاوڕی دایەوە، پاشان کە سێ بەشی ڕێگەکەی بڕی دیسان ئاوڕی دایەوە، خوای بەبەزەیی فەرمووی: بیگێڕنەوە، لێی پرسی بۆچی ئاوڕت دایەوە؟ (خوا خۆی زاناترە بەلام بۆ ئەوەی ئێمە تێبگەین)، پیاوەکە دەلێ: خوای پەروەردگار کاتێ سێیەکی ڕێگاکەم بڕی ئەو

---

[١]) سلسلة رسائل التوجيهات من الكتاب والسنة الصحيحة.

[٢]) ژیانەوە ل ٤١٣- ٤١٤.

ئایەتەم بیر هاتەوە کە دەفەرمووی: ﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ...﴿٥٨﴾ ﴾ الكهف، گوتم: لەوانەیە لێم خۆشبێ، کاتێ نیوەی ڕێگاکەم بڕی ئەو ئایەتەم بیر هاتەوە کە دەفەرمووی: ﴿ ...وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ ...﴿١٣٥﴾ ﴾ آل عمران، گوتم لەوانەیە لێم خۆشبێت، وە کاتێ سێ بەشی ڕێگاکەم بڕی ئەو ئایەتەی تۆم بەبیر هاتەوە کە دەفەرمووی: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر، تا دەهات ئومێدی لێخۆشبوونی تۆم زۆرتر دەبوو[1].

هەر سەبارەت بە ڕەحم و بەزەیی خوا، ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی ئافرەتەکە خەریکی نان کردن بوو، منالێکیشی لەلا بوو، ئافرەتەکە بینی وا پێغەمبەری خوا ﷺ بەوێدا تێدەپەڕێ چوو بۆ لای و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا پێم گەیشتووە کە تۆ فەرمووتە: خوای بەبەزەیی لە دایکێك بە ڕەحم ترە بۆ منداڵەکەی لەگەڵ بەندەکانیدا، ئایا ڕاستە خوای گەورە ئاوایە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئافرەتەکە گوتی: بەڕاستی دایك منداڵەکەی خۆی ناهاوێتە نێو ئەو تەندوورەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: خوای تەعالا بەندەکانی خۆی ئازار نادا مەگەر ئەو کەسەی دان نەنێ بە یەکتاپەرستی خواو نەڵێ: لا إله إلا الله[2].

### ١٩٧. سەردانی گۆڕستان

عەبدوڵڵای کوڕی مولەیکە بۆمان دەگێڕێتەوە کە بینیویەتی دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، چووەتە سەردانی قەبری براکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری صدیق، عەبدوڵڵا دەڵێ پێم گوت: باشە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی نەکردووە لەوەی کە ئافرەتان بچن بۆ سەردانی گۆڕستان؟ دایکمان عائیشە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: بەڵێ لەسەرەتادا

[1] شرح أسماء الله الحسنی- أبي قاسم القشيري- ص١٠٢.

[2] هەمان سەرچاوە ص ٢٤٢.

نەهی لێکرد بەڵام دوایی ڕێگەی پێداین لەبەر ئەوەی سەردانی گۆڕسان ئاخیرەتمان بیر دەهێنێتەوە[1].

### ١٩٨. تێگەیشتن لە قورئان

دەگێڕنەوە کە پیاوێك هاتە لای پێشەوا عومەر ﷺ گوتی: من ئاژاوەم خۆش دەوێ‌و ڕقم لە هەقە دان بە شتێکدا دەنێم باوەڕم پێی هەیە نەشم دیوە، پێشەوا عومەر ﷺ کابرای زیندانی کرد، بەسەرهاتەکە گەیشتە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ پێشەوا عەلی گوتی: ئەی عومەر ئەو پیاوەت بە ستەم زیندانی کردووە، پێشەوا عومەر گوتی چۆن؟ پێشەوا عەلی گوتی: لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە ماڵ‌و منداڵی خۆی خۆش دەوێ ئێ خواش (سبحانە و تعالى) دەفەمووێ: ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ ...﴿٢٨﴾ ﴾ الأنفال، وە ئەو پیاوە ڕقی لە مردنە مردنیش هەقە خوای تەعالا دەفەرمووێ: ﴿ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّ ...﴿١٩﴾ ﴾ ق، وە دانیش بە پەرستراوێتی خواشدا دەنێت کەچی نەشیبینیوە، پێشەوا عومەر گوتی: ئەگەر عەلی نەبوایە عومەر دەفەوتا[2].

### ١٩٩. گفتوگۆی پێشەوا عەلی ﷺ لەگەڵ مردووان

دەگێڕنەوە جارێك پێشەوا عەلی دەچێتە سەر گۆڕستان‌و ڕوویان تێدەکات دەڵێ: ئەی خەڵکی گۆڕستان هەواڵی خۆتانمان پێ ڕابگەیەنن ئێمەش هەواڵی خۆمانتان پێ ڕادەگەیەنین، هەواڵی ئێوە لەلای ئێمە ئەوەیە کە ماڵ‌و سامانتان هەمووی بوو بە میراتی نەوەکانتان‌و پەرش‌و بڵاو بوویەوە، ئافرەتەکانتان شوویان کردەوە، خانووەکانتان کەسانی تر تێیدا دەژین، دواتر گوتی: سوێند بەخوا ئەگەر بتان توانیبایە وەڵام بدەنەوە ئێوەش پێتان دەگوتین: ﴿ ...وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۚ ...﴿١٩٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: تێشوو زیاد بکەن، بەڕاستی باشترین توێشووش بریتییە لە تەقواو خۆپارێزی[3].

---

[1] صحيح البخاري بشرح إبن حجر العسقلاني ج٣ ص١٤٩.

[2] موسوعة الخطباء والمرشدين ص٥١٩.

[3] هەمان سەرچاوە ص٣٢١.

### ٢٠٠. پرسیاری ناو گۆڕ

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هێناویەتی لە موسنەدەکەی خۆی هەروەها ئیبن سەعد لە (الطبقات)ەکەیدا لە ئیبن و عەبباسەوە، دەڵێ: پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب برادەرو خۆشەویستم بوو کاتێك وەفاتی کرد یەك ساڵ لە خوا پاڕامەوە کە لەخەوما ببینم، کاتێ ساڵێکی تەواو بەسەر وەفاتیدا تێپەڕی لە خەوما بینیم کە ئارەقەی لە نێوچەوانی دەسڕی، پێم گوت: ئەی پێشەوای ئیمانداران خوای گەورە چی لەگەڵ کردی؟ گوتی: ئەوە کاتی کۆتایی هاتنمە لە لێپێچینەوەی خوای تەعالا، وەئەگەر خوای میهرەبان بەبەزەیی نەبوایە لەگەڵمدا ئەوە من لەناو دەچووم[1].

### ٢٠١. شوکرانەی نیعمەتەکانی خوا

دەگێڕنەوە کە داوود پێغەمبەری ﷺ فەرموویەتی: خوایە چۆن سوپاسگوزارت بم کە سوپاسگوزاریش هەر بەخشینی تۆیە، خوای تەعالاش پێی فەرموو ئێستا تۆ شوکرانە بژێری منت کردووە، پێغەمبەر داوود فەرمووی: ئەی خوای پەروەردگار بۆ سولەیمانی کوڕیشم بەم شێوەیە ببە هەر وەك چۆن بۆمن بووی، خوا (سبحانه و تعالى)ش پێی فەرموو: بڵێ بە سولەیمان کە وەك تۆ بێ بۆمن، منیش وەك و چۆن بۆتۆ بووم ئاوا ئەبم بۆی[2].

هەر سەبارەت بە شوکرانەی نیعمەتەکانی خوا، دەگێڕنەوە کە هەندێ لە خەڵکی باسی خراپی حاڵی خۆیان دەکرد سەبارەت بە هەژاریو نەدارییان، لەلای خاوەن زێڕەکان، دەیانگوت کە حاڵیان زۆر خراپەو زۆر نەدارن، ئەویش بە یەکێکیانی گوت: ئایا پێت خۆشەو لات ئاسانترە دە هەزار درهەمت هەبێ بەڵام چاوەکانت کوێر بێ؟ کابرا گوتی: نەخێر، ئەمجارە گوتی: پێت خۆشە زمانت نەبێو قسەت پێ نەکرێ بەڵام دە هەزار درهەمت بێ؟ کابرا گوتی نەخێر هەرگیز، ئەمجارە گوتی: پێت خۆشە هەردو دەستو هەردو لاقت بڕاوبن بەڵام دە هەزار درهەمت هەبێ؟ گوتی نەخێر، ئەمجارە گوتی پێت خۆشە عەقڵت نەبێو شێت بی بەڵام دە هەزار درهەمت هەبێ؟ گوتی نەخێر، ئنجا پێی

[1]) هەمان سەرچاوە ص ٣٢١.

[2]) هەمان سەرچاوە ص ١٠٦.

گوت: ئایا شەرم ناکەی سکاڵا لە دژی خوا دەکەی؟ شەرم ناکەیت سوپاسگوزار نیتو سپڵەیت بەرامبەر بەخوا؟[1].

## ٢٠٢. حەسوودی نەبردن بە خەڵك

ئیبن‌و مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر موسا ﷺ جارێك دەبینێ پیاوێك لەبن عەرشی خوا دانیشتووە، پێغەمبەر موسا فەرمووی: ئەی پەروەردگار ئەو بەندەیەی تۆ چۆن گەیشتۆتە ئەو پلەو پایە؟ خوای پەروەردگار فەرمووی: بە سێ شتان:

یەکەم/ حەسوودی بەخەڵك نابات لەو بەخششانەی خوا داویەتی، سوپاسگوزارەو قەناعەتی هەیە.

دووەم/ چاکە کارە لەگەڵ دایك‌و باوکی.

سێیەم/ نەمیمی ناکات لە نێوانی خەڵك.

مووسا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار خۆشەویسترین کار لای تۆ چییە تاوەکو ئەنجامی بدەم؟

خوا ﷻ فەرمووی: یادم بکەیت‌و لەبیرم نەکەی، ئەوجارە پێغەمبەر مووسا فەرمووی: پەروەردگار کامە لە بەندەکانت باشترین کارو کردەوە دەکا؟ خوای پەروەردگار فەرمووی: ئەوەی درۆ ناکات، زینا ناکات، دڵی خۆی خراپ ناکات.

ئنجا پێغەمبەر مووسا فەرمووی: خوای پەروەردگار کامە بەندەت کردەوەی خراپ دەکات؟ خوای زاناو توانا فەرمووی: پیاوێکی داوێن پیس، کردەوەکانی خراپ‌و بۆگەنە، بەشەوو بەڕۆژ بێکارە[2].

---

[1] ) هەمان سەرچاوە ص ١٠٧.

[2] ) هەمان سەرچاوە ص ١١٢.

۲۰۳. داهێنراوی باش

لە رەفاعەی کوڕی ڕافع دەگێڕنەوە دەڵێ: ئێمە نوێژمان دەکرد لە پشت پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکوع سەری بەرز کردەوەو فەرمووی: {سَمِعَ الله لِمَن حَمِده} پیاوێك لە پشتیەوە گوتی: {رَبَّنا وَلَكَ الحَمْد حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فيه}، کاتێك پێغەمبەری خوا لە نوێژەکەی تەواو بوو فەرمووی: کێ بوو ئاوای گوت؟ کابرا گوتی: من، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بینیم سی‌و ئەوەندە فریشتە پێشبڕکێیان دەکرد پاداشتەکەی بۆ بنووسن[1].

هەر سەبارەت بە داهێنانی باش، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ: جارێك پیاوێك هات بۆ نوێژ لەو کاتەدا خەڵکی لەناو نوێژبوون نوێژەکەی دابەستاو گوتی: (الله أكبر كبيرا، والحمد لله كثيرا، وسبحان الله بكرةً وأصيلا) کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەنوێژەکەی تەواو بوو، فەرمووی: کێ ئەم زیکرەی کرد؟ پیاوەکە گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەخوا مەبەستم چاك بوو لەو وتانەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {بەڕاستی دەرگاکانی ئاسمانم بینی کرانەوە بۆ ئەو زیکرەی تۆ کردت}، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ: لەو کاتەوەی ئەمەم بیستووە، بەهیچ شێوەیەك وازم لەو زیکرانە نەهێناوە[2].

۲۰٤. وەفاداریی

دایکی ئیمانداران خەدیجە خوا لێی ڕازی بێ ناوازەترین نموونەیە لە وەفاداری بەرامبەر بە مێردەکەی، چونکە ئەو کاتێك دڵخۆش دەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵخۆشبوایە، کاتێك خەمبار دەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەمبار بووایە، هەموو کات پشتگیری لە پیاوەکەی دەکرد، لەکاتی خۆشی‌و ناخۆشیدا، ئازارو زەحمەتییەکی زۆری هەڵدەگرت لە پێناوی خوادا، لەبەرامبەریشدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو کات ئەو چاکەو بەخششانەی خێزانەکەی لەیادو لەبەرچاو بوو، پێزان‌و بەوەفا بوو بەرامبەری، دوای ئەوەی

[1]) أخرجه البخاري (٩٩٧) والنسائي (١٠١٧) وأبو داود (٧٧٠).

[2]) أحرجه مسلم ١٣٥٧، والترمذي ٣٥٩٢، والنسائي ٨٨٤، وأحمدج٢ ص ١٤.

کە خەدیجە کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەفاترین کەسی بوو بۆی‌و هەموو کات بەچاکەو باشە باسی دەکرد، هەرکاتێك هاوەڵێك یان خزمێکی خەدیجەی بینیبا زۆر دڵخۆش‌و شادومان دەبوو تا ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای عائیشەی دایکی ئیمانداران زۆر باسی خەدیجەی کردووەو وەسفی چاکەکانی لەلا کردووە، ڕۆژێك عائیشە گوتی: ئایا هەر ئەو پیرەژنێك نەبوو کە خوا بۆتی گۆڕیویەتەوە بە ئافرەتێکی باشتر، پێغەمبەری خواش ﷺ بەو قسەیەی عائیشە زۆر تووڕە بو، پاشان فەرمووی سوێند بەخوا لەو باشتری پێنەداوم، کاتێك کە خەڵکی بڕوایان پێنەدەهێنام ئەو بڕوای پێ هێنام، وە کاتێ کە خەڵکی بە درۆزنیان دانام، ئەو بەڕاستگۆی دانام، کاتێ کە خەڵکی لێیان دەگرتمەوە، ئەو پێی دەبەخشیم، جگە لەویش پەروەردگارم لە هیچ ئافرەتێکی تر منداڵی پێ نەبەخشیوم[1].

## ٢٠٥. پەیمان پارێزی

دەگێڕنەوە کە پیاوێك چوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بۆ ئەوەی داخوازی کچەکەی لێبکا، عەبدوڵڵاش نەوەڵامی قەبوڵ بوون بوو، نە بەرپەرچ دانەوە، بەڵکو تەنها گوتی: ئینشائەڵڵا، دوای ماوەیەك عەبدوڵڵا کەوتە جێگای سەرەمەرگەوە بە کەسانی دەورو بەری گوت: بڕۆن فلان کەسم بۆ بانگ بکەن چونکە من لە وەڵامی ئەودا لەبارەی کچەکەمەوە قسەیەکم پێ گوتوە کە لەبەڵێن پێدان دەچێ، ئێوە شاهێد بن ئەوە من کچەکەی خۆمم پێشکەش کردو نامەوێ بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگارم‌و سیفەتێکی دووڕوویی لەمندا هەبێ، مەبەستی لەمەبوو کە پەیمان شکاند یەکێکە لە سیفاتەکانی مرۆڤی دوڕوو[2].

## ٢٠٦. نوێژ نەکەر

کچێك دەگێڕێتەوە دەڵێ من تەمەنم (١٨) ساڵە، حەز دەکەم بەسەرهاتێکتان بۆ بگێڕمەوە، ئەو بەسەرهاتە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دڵم هەبووە، لەو کاتەی کە لەسەر ئەنجامدانی نوێژەکانم زۆر ڕێك‌و پێك نەبووم، بەڵام پاش ئەوەی بابەتێکم

[1]) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ل ١٨٧.

[2]) چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ل ١٨٩.

خوێندەوە وام لێهات هەموو نوێژەكان لەكاتی خۆی ئەنجام بدەم، ڕۆژێكیان لە قوتابخانە لە وانەی ئایین پارچە كاغەزێكی بچووكیان دابەش دەكرد، كە تێیدا باسی بەسەرهاتی مردوو شۆرێكی دەكرد، بەسەرهاتەكە بەم شێوەیە بوو: مردوو شۆرەكە دەڵێ: تەرمی كچێك هەبوو ویستیان بیشۆن بۆ ئەوەی كفنی بكەن، پەیوەندییان پێمەوە كرد ئەویش چوو بۆ ئەوەی بیشوا، چووە ماڵەكەو پرسی مردووەكە لە كوێیە؟ ئەوانیش بانگی ژوورێكیان كرد كە مردووەكەی لێبوو كە چووە ژوورەوە یەكسەر دەرگاكەیان لەدوا داخست، ئەویش زۆر ترسا دەستی كرد بە لەدەرگا دان بەڵام دەرگایان لێنەكردەوە، سەیری كرد ئاوو كفنیان لە تەنیشت مردووەكە بۆ داناوە، بەڵام كە سەیری مردووەكەی كرد بۆ ئەوەی بیشوا بینی تەرمێكی ڕەشی وەك خەڵوزی تێدایە، سەری سوڕما لە شێوەی مردووەكە، دەستی كرد بە خوێندنی (معوذات)و ئایەتی كورسی، بەهەر شێوەیەك بێ دەستی كرد بە شوشتنی زۆر بەزەحمەت، چونكە پێستەكەی وەكو خۆڵەمێشێكی خۆڵاوی لێ هاتبوو، كە لە شوشتنی بوویەوە لە دەرگای داو گوتی: تەواوم كرد، ئنجا دەرگاكەیان لەسەر كردەوە بە خێرایی لە ماڵەكە چووە دەرەوە، پاش چەند ڕۆژێك مردوو شۆرەكە سەردانی یەكێ لە زاناكانی كردو باسەكەی بۆ گێڕایەوە، زاناكە گوتی: بڕۆ لە كەس و كاری مردووەكە بپرسە كە كردەوەی ئەو مردووە چۆن بووە لە ژیان، ئەویش سەرەتا پرسیاری ئەوەی كرد كە بۆچی دەرگاكەیان لەسەر داخست بەتەنها لەگەڵ مردووەكە، ئەوانیش گوتیان: لەبەر ئەوەی هەرچی مردوو شۆرێكمان دەهێنا بۆ ئەوەی بیشوا، كە مردووەكەی دەبینی بەم شێوەیە یەكسەر دەڕۆیی، تۆ دەیەمین مردوو شۆر بووی كە هاتی، ترساین تۆش نەیشۆی و بڕۆی بۆیە ئەو كارەمان كرد، مردوو شۆرەكە گوتی: باشە بەس لەبەر چی مردووەكەتان شێوەو شكڵی وا گۆڕا بوو كردەوەكانی چۆن بوون لە ژیاندا؟

ئەوانیش پێیانگوت: كردەوەی خراپی ئەو كچە ئەوەبوو كە نوێژنەكەر بوو[1].

---

[1]) قصص الهداية- عمرو خاليد ص ٩٨.

### ۲۰۷. ترسی قەبر

ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ: جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مزگەوت، هەندێ کەسی بینی بەدەنگێکی بەرزو بە قاقا پێدەکەنین، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ئەگەر ئێوە بیرتان لە مردن بکرادیەوە بەم شێوەیە پێنەدەکەنین چونکە بەڕاستی مردن خۆشییەکان لەناو دەبات، قەبری هەر کەسێ لە ئێمە هەموو ڕۆژ بانگی خاوەنەکەی دەکاتو دەڵێ: من ماڵی تەنیاییم، من لانەی جوداییم، من لانەو شوێنی کرمو ماروم[1].

### ۲۰۸. زیکرو یادی خوا بەدەنگی بەرز

زەیدی کوڕی ئەسلەم بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئیبن ئەدرەع گوتی: شەوێك لەتەك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتم بەلای پیاوێکدا تێپەڕین، لەمزگەوت بەدەنگی بەرز زیکری خوای دەکرد، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆ ڕییایی وا دەکا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر بەڵکو ئەو پیاوە بریندارە بە خۆشەویستی خوا[2].

هەر سەبارەت بە زیکرو یادی خوا بەدەنگی بەرز دەگێڕنەوە کە حەسەنی کوڕی موسلیم دەڵێ: پیاوێك لە ئەهلی نەجد هەبوو ئەگەر دوعای کردبایە دەنگی بەرز دەکردەوە، هەرکاتێ قورئانی بخوێندایە دەنگی بەرز دەکردەوە، ئەبو زەڕ هاتە لای پێغەمبەر ﷺ شکاتی لەو پیاوە کرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیاوە زۆر ئەزیەتم دەدا ئەگەر قوران بخوێنێ دەنگی بەرز دەکا، ئەگەر زیکر بکات دەنگی بەرز دەکا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازی لێبێنە ئەو پیاوە بریندارە[3].

### ۲۰۹. خێرکردن بۆ مردوو

صاڵحی مەڕڕی دەڵێ: شەوێکی جومعە لەدوای نیوە شەو دەچوومە مزگەوتی (جامعة) بۆ نوێژی بەیانی، لە ڕێگاکەمدا گۆڕستانێکی گەورە هەبوو هەر دەبوایە بەوێدا تێپەڕم، کە گەیشتم بە گۆڕستانەکە لە نزیك قەبرێك ویستم پشوو بدەم خەوم لێکەوت، خەونم بینی

---

[1]) دیمەنی مەرگ- موحەممەد ئیسلام- ل ۹۵.

[2]) أخرجه أحمد ١٥٩/٤.

[3]) أخرجه عبدالرزاق في المصنف ص ٦٥٥٩.

نەخەونەکەمدا بینیم تەواوی مردووەکانی گۆڕستان قەبرەکانیان شەق بوو هاتنە دەرەوە زۆر بە خۆشحاڵییەوە، دەستیان کردە گفتو گۆ، لەنێو مردووەکاندا گەنجێکم بینی زۆر بەغەمگینی چوو لە گۆشەیەك دانیشت، پاش ماوەیەکی کەم چەند فریشتەیەك کە ژمارەیان زۆر بوو هاتنە سەر زەوی، سفرەو خواردنیان لەدەست بوو داپۆشرابوو بە سەرپۆشی نوور، دەیاندا بە مردووەکان هەریەکێك لەو مردووانە سفرەیەکی وەردەگرت، گەنجەکەم بینی خەریك بوو بەدەستی بەتاڵەوە دەگەڕایەوە، منیش لێم پرسی بۆچی وا غەمباری؟ ئەو سفرانە چین کە هاوڕێکانت وەری دەگرن؟ گوتی: ئەو خوانانە جومعان دەدرێن بە مردووەکان بریتین لەو دیارییانەی کە زیندووەکان بۆ مردووەکان دەینێرن، بەڵام من لەدونیادا کەسم نییە تا سفرەی وام بۆ بێنێ، تەنها دایکێکم هەیە ئەویش مێردی کردۆتەوەو لەبەر کارو باری مێردەکەی ئاگای لەمن نەماوە، منیش لە خەوەکەمدا ناوو نیشانی دایکیم وەرگرت، بۆ بەیانی چوومەماڵیان بانگم کردو خەونەکەم بۆ گێڕایەوە، ئافرەتەکە گوتی هیچ گومانی تێدا نییە ڕاست دەکەی ئەوە کوڕی منە، لەپاشان ژنەکە هەزار درهەمی دامێ، گوتی: ئەو پارە بکە بەخێر بۆ کوڕەکەم، لەئەمڕۆوە بەدواوە بەردەوام دوعای بۆ دەکەم، لەبیری ناکەم، دەڵێ دووبارە جارێکی دی خەونم بەو کوڕە بینیەوە، بینیم لیباسێکی بەنرخی لەبەردا بوو بەڕاکردن هاتە لامو گوتی: ئەی صاڵحی مەڕڕی دیاریەکەتم پێ گەیشت خوا پاداشتی خێرت بداتەوە[1].

## ٢١٠. ڕێگریو کوشتن

سەدەقەی کوڕی خالید لە هەندێ مەشایخی دیمەشق ڕیوایەت دەکا، کە گوتوویانە: جارێك دەچووین بۆ سەفەری حەج، یەکێك لەو کەسانەی کە لەگەڵمان بوو لە ڕێگادا وەفاتی کرد، پاچو خاکەناسێکمان لە خەڵکی ناوچەکە وەرگرتو قەبرێکمان لێداو ناشتمان، پاشان بیرمان کردەوە کە پاچەکەمان لە قەبرەکەدا لەبیر کردووە، قەبرەکەمان هەڵدایەوە سەیرمان کرد ملو هەردوو دەستی مردووەکەیان بە پاچەکەوە بەستووە، کە ئەو دیمەنەمان بینی قەبرەکەمان پڕکردەوە، نەمان توانی پاچەکە بهێنینە دەرەوە، بەپارە خاوەنی پاچەکەمان ڕازی کرد، کاتێ لەسەفەری حەج گەڕاینەوە لە حاڵی ئەو پیاوەمان

[1]) دیمەنی مەرگ ل ١٢٤- ١٢٥.

پرسی لە خێزانەکەی: ئەویش گوتی: جارێك پیاوەکەم لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەند چوو بۆ سەفەر لە ڕێگادا کوشتبوی‌و هەرچی پێیبوو لەگەڵ خۆیدا هێنابووی[1].

### ٢١١. شێوەی فریشتەی گیان کێشان بۆ خراپەکاران‌و چاکەکاران

دەڵێن جارێك پێغەمبەر ئیبراهیم بە (ملك الموت)ی فەرموو: بەو شکڵەی کە ڕووحی خراپەکارانی پێ دەکێشی خۆتم پێشان بدە؟ (ملك الموت) فەرمووی: ئەی ئیبراهیم ناتوانی خۆت ڕاگری‌و سەیرم بکەی؟ ئەویش فەرمووی: خۆم ڕادەگرم؟ (ملك الموت) فەرمووی: ڕووت وەرگێڕە، پاشان پێی فەرموو: سەیرم بکە، کە سەیری (ملك الموت)ی کرد بینی جلێکی ڕەشی زۆر ناشیرینی لەبەردایە، وەك دێو لەبەردەمی ڕاوەستابوو، بۆنی دەمی زۆر ناخۆش بوو، بڵێسەی ئاگر لە کونی لووتی دەهاتنە دەرەوە، پێغەمبەر ئیبراهیم کە بەم شێوەیە بینی لەهۆش خۆی چوو، کاتێ بەهۆش خۆی هاتەوە، (ملك الموت) بە شێوەی ئاسایی خۆی لەسەر سەری ڕاوەستابوو، پێغەمبەر ئیبراهیم فەرمووی: تەنها بینینت بەسە بۆ ئەوەی خراپەکاران گیانیان دەرچێ لە ترسان، پاشان بە (ملك الموت)ی فەرموو: بەو شکڵە خۆتم پێشان بدە کە گیانی ئیماندارانی پێ دەکێشی، (ملك الموت) خۆی پێشاندا بینی گەنجێکی زۆر جوان بە جلێکی زۆر جوان بەبۆنێکی زۆر خۆش‌و ڕوویەکی زۆر گەش لەبەردەمی وەستاوە، پێغەمبەری ئیبراهیم فەرمووی: ئیمانداران بەس بەبینینت ئەوەندە خۆشحاڵ دەبن بەسە بۆ ئەوەی لە خۆشیا بمرن بێ ئەوەی گیانیان بکێشی[2].

### ٢١٢. فریشتەی گیان کێشان‌و سەرە مەرگ

ڕۆژێك پاشایەك ویستی چاوێك بە شارەکەیدا بخشێنێتەوەو بزانێ حاڵی خەڵکەکەی چۆنە؟ داوای جل‌و بەرگی پاشایەتی کرد، دەستە جلێکیان بۆ هێنا بەدڵی نەبوو، دەستە جلێکی تریان بۆ هێنا ئەویشی بەدڵ نەبوو، لەپاش گۆڕینی چەند دەستە جلێك ئنجا یەکێکیانی بەدڵ دەبێ، ئەوجارە داوای ولاخێکی کرد، چەند ولاخێکیان بۆ هێنا هیچیانی بەدڵ نەبوو، هەڵسان هەموو ئەو ولاخانەی لە تەوێڵەی کۆشکی پاشایەتی بوون بۆیان هێنا،

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ١٥٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦.

ئەناو هەموویاندا ئنجا یەکێکیانی هەڵبژارد بەسەد نازو گۆزەوە سواری بوو، بەشێوەیەك ئەیتان لە خشتەی بردبوو زۆر لووتی بەرز بوو وە زۆر لەخۆبایی بوو کاتێ تەماشای ئەو هەموو وەزیرو غەلامو دەستو پێوەندەی خۆی دەکرد، لەو کاتەدا پیاوێکی بەرگ شڕ هاتە پێشیو سەلامی لێکرد، بەلام پاشا هیچ گوێی بەو پیاوە نەدا، کابرا جڵەوی ئەسپەکەی پاشای گرت، پاشا زۆر تووڕە بو و بە پیاوەکەی گوت: بێ ئەدەب جڵەوی ئەسپەکەم بەردە، کابرا گوتی: پاشا کارم پێتە پاشا گوتی: با دابەزم ئنجا کارەکەتم پێ بڵێ، کابرا گوتی: نەخێر دەبێ هەر ئێستا پێت بڵێم، بەزۆرە ملێ جڵەوەکەی لەدەست پاشا دەرهێنا، پاشا گوتی: باشە بڵێ بزانم کارەکەت چییە؟ کابرا گوتی: من گیان کێشم هاتووم گیانت بکێشم، کاتێ پاشا ئەوەی بیست یەکسەر ڕەنگی گۆڕا زمانی تێکئالا، پاشا گوتی: باشە بەس یەك تۆز مۆڵەتم بدە با بگەڕێمەوە ماڵەوە هەندێ پێویستی هەیە بیکەم وە ماڵئاوایی لە کەسو کارم بکەم، فریشتەی گیان کێشان گوتی: هەرگیز ئەمە ناتوانی بکەی، ئەمەی گوتو گیانی کێشا پاشا وەك دارێکی وشك بەلادا هات، پاشان فریشتەی گیان کێشان چوو بۆ لای پیاوێکی مسوڵمانی چاك پیاوەکە خۆی بۆ سەفەر ئامادە دەکرد، سەلامی لە کابراکە کرد، کابراش گوتی: و علیکم السلام، بە کابرای گوت: دەمەوێ قسەیەکت بەگوێدا بچرپێنمو پێت بڵێم من فریشتەی گیان کێشانم (ملك الموت)م، کابرا گوتی: زۆر بەخێرهاتی، لەلای من زۆر موبارەکە هاتنی کەسێك کە دەمێکە دوورە، من ئارەزووی گەیشتن بووم بەتۆ، زۆر زیاتر لە ڕەفیقە خۆشەویستەکانم کە لێم دوورن، فریشتەی گیان کێشان فەرمووی: ئەو کارەی کە بۆی دەچووی زوو ئەنجامی بدە، کابرا گوتی: هیچ کارێکم لە گەیشتن بەدۆستی ڕاستەقینە لەلا گرنگتر نییە، فریشتەی گیان کێشان فەرمووی: زۆر چاکە بەلام لە چ حاڵەتێکدا پێت خۆشە گیانت بکێشم؟

کابرا گوتی: بە ئارەزووی خۆت، من لەو بارەوە هیچ قسەیەکم نییە، فریشتەی گیان کێشان گوتی: ئاخر من وا فەرمانم پێکراوە کە چۆنی تۆ بتەوێ وا ڕەفتار بکەم، کابرا گوتی: مادەم کە وایە کاتم بدە با دەستنوێژێك بگرمو دوو ڕکعات نوێژ بکەم لە سوجدە گیانم بکێشە[1].

---

[1]) دیمەنی مەرگ ل ٢٨.

## ٢١٣. منداڵێکی زیرەك و پەروەردە کراو

بـەهلول ڕەحمـەتی خـوای لـێبێ، دەڵـێ: جارێـك بەیـەکێك لـە بازارەکـانی بەسـرەدا دەرۆیشتم چاوم بەچەند منداڵێك کەوت یاریان بـە گوێزو بـادام دەکـرد، لـەنزیك ئەوانـەوە منداڵێکی بچووك بەتـەنیا دانیشتبو دەگریـا، چوومە لای پێم گوت: کوڕەکەم مـەگری مـن گوێزو بادامت بۆ دەکڕم، بۆ ئـەوەی تـۆش یارییان لەگەڵدا بکەی، منداڵەکە بـە تووڕەییـەوە سەیری کردمو گوتی: بۆ تۆ وائەزانی ئێمە بۆ یاری کردن هاتووینەتە دنیاوە؟

منـیش پـێم گـوت: ئـەی بۆچـی هاتووینەتـە سـەر دونیـا؟ گوتی: بـۆ بەدەسـت هێنـانی عیلمو ئەنجامدانی عیبادەت، منیش پێم گوت: خوا تەمەنت درێژکا ئەو قسانە لـەکوێوە فێـر بـووی؟ گـوتی: خـودای تـەعالا لـە سـوڕەتی (المؤمنـون)دا دەفـەرمووێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾، واتــە: ئایـا وا دەزانـنو وا گومـان دەبـەن کـە ئێوەمان هەروا بە خۆڕایی درووست کردووەو ناگەڕێنەوە لامان؟

پێم گوت: کوڕەکەم دیارە تـۆ زانایـەکی گـەورەی هەنـدێك ئامۆژگارییم بکە، لەوەڵامـدا ئەو شیعرەی بۆ خوێندمەوە (دەقە کوردیەکەی بەم شێوەیە):

(تەماشـا دەکـەم دونیـا دەبڕێتـەوە، ئـەو کەسـەی لـە دنیـادا دەژی خـەریکی ڕۆیشـتنە، کەواتـە: نـەدنیا بـۆ کـەس بـاقی دەبـێو نەکـەس بـۆ دنیـا، وا دێتـە بەرچـاوم کـە مـەرگو بەدبەختی وەك دوو ئەسپی سەرکێش زۆر بەپەلە دێـن بـۆلای ئینسان، دەیانـەوێ قاچەکانی بشکێنن، جا ئەی نـەزان تـۆ کـە خـەریکی دونیـای زووکـە لـەم دونیـا فانییـە شتێك بەدەسـت بێنە، بۆ ئەوەی لەو دونیا لەدەردت کەم کا).

منداڵەکە پاش خوێندنەوەی ئەو شیعرە سەیری ئاسمانی کرد دەستی بـەرز کـردەوە بـۆ دوعاکردن، فرمێسکەکان وەك دانەی مرواری لە چاوەکانی دەهاتنە خوارو دەیگوت:

ئەی ئەو زاتەی شایەنی ئەوەی خۆمان لەئاستت بەکەم بگرین، شایەنی ئـەوەی پشتت پێ ببەستین، هەرکـەس نومێـدی بـەتۆ بـێ نائومێـدی ناکەیو ئارەزووەکانی دەهێنیتـە جـێ، بـەهلول دەڵـێ: پاشـان منداڵەکـە بێهـۆش کـەوت، منـیش سـەریم لەسـەر ڕانم دانـاو تـۆزی

لاشـەییم هەڵتەکانـد، کـە بـەهۆش خـۆی هاتـەوە گـوتم: کـوڕم بـۆ ئەوەنـدە خـۆت ئەزیـەت دەدەی‌و دەترسیت؟ تۆ ئێستا زۆر منداڵی خۆ هیچ گوناهێکت لە دەفتەری کردەوەکان نییە؟

منداڵەکە گوتی: بـڕۆ بـەو لاوە تـۆ چـی دەڵێـی، مـن هـەموو جارێ کە تەماشای دایکم دەکرد کە دەیویست ئـاگر هـەڵبکا لەسـەرەتا دارە بچووکەکانی دەسوتاند، تـا ئاگرەکـە خـۆش دەبوو پاشان دارە گەورەکانی دەنا بەئاگرەکـەوە، منیش پـێم گـوت: هێشتا ئامۆژگاریم بکـە، من‌و ئەو کەسانەی لەدەوری بوون بەچەند قسەیەك ئامۆژگاری کرد گوتی:

من هەرچی تواناو تەمەنم بوو هـەموویم لـەبێ ئاگایی‌و نـەزانی لەدەسـتدا، لـەو کاتـەی کە فریشتەی گیان کێشان چاوەڕێم دەکات، ئەگـەر ئـەمڕۆش لـەدونیا دەرنەچـم بـەیانی هـەر دەبێ دەرچـم، ئێسـتا پۆشـاکی نـەرم نیـان لەبـەر دەکـەم بـەڵام بـەیانی کفـنی سـپی دەپۆشـم، ئێستا لەسەر جێگای نـەرم‌و نیـان دەخـەوم بـەیانی لـەناو گـۆڕی ڕەق‌و تەقدا ڕادەکشـێم، مـن ڕێبـوارم‌و سـەفەرێکی دوورو درێـژم لەپێشـە، کـە هێشـتا توێشـووی ئـەو سـەفەرەم ئامـادە نـەکردووە، ڕاوەسـتان لەبـەردەم خوایـەك کـە ئاگـاداری هـەموو شـتێکی نهێنی‌و ئاشکرایەکە بەکۆمەڵێك گوناهو تاوانەوە زۆر قوڕس‌و گرانە.

کاری نابەجێم زۆرن هـەرگیز بـۆم قـەرەبوو ناکرێتـەوە، ئـەو کـردەوە نابەجێیانـەی کـە بەنهێنی ئەنجامداون بەیانی لەبەردەم خوادا هەمووی ئاشکرا دەبـێ، هـەروەك چـۆن ئێسـتاش لای ئاشکرایە، بەڵام بەهۆی ئومێدی زۆرم بـە ڕەحـم‌و بـەزەیی ئـەو زۆر دڵخـۆش‌و شـادومانم، ئای خۆزگە خوای گەورە لە گوناهەکانم خۆش دەبوو، بێگومان مـن خـراپترین کەسـم پـەیمان شکێنیم کرد لەگەڵ خوای خۆم.

بەهلول دەڵێ: وتەکانی ئەو منداڵە ئەوەنـدە کاری تێکـردم لـەهۆش خـۆم چـووم، کـاتێ بەهۆش خۆم هاتمەوە بینیم ئەو منداڵە لەوێ نـەماوە، پرسـیارم کـرد ئـەو منداڵـە کـێ بـوو؟ منداڵەکان گوتیان: دیارە نایناسیت ئەو منداڵـە نـەوەی حوسـەینە، دەڵـێ: بەڕاسـتی قسـەکانی ئەو منداڵە غیرەت هێنەر بوو، بەڵام دەبوایە زوو بمزانیبا ئـەوە بەرهـەمی دارێکە کـە بنـك‌و ڕەگ‌و ڕیشەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ[1].

---

[1]) منداڵە ژیەکان ل ١٢١.

### ٢١٤. ترسی تاریکی نێو گۆڕ

خەلەف کوڕی سالم دەڵێ: بە ئەبو عەلیم گوت: ئەی ئەبو عەلی تۆ بۆچی شوێنی حەوانەوەت نییە؟ گوتی: با هەمە، گوتم ئەی کوا لەکوێیە ماڵت حاڵت خانووت من هەر دەبینم سەرگەردانیت؟

گوتی: ماڵم لە خانووێکە پیاوی گەورەو بچووك تێیدا یەکسانن، گوتم ئەو خانووە لە کوێیە؟ گوتی: شاری مردووان، گۆڕستان، گوتم تۆ ناترسی لە تاریکی ئەو شوێنە لەشەودا؟ گوتی: نەخێر ناترسم، لەبەر ئەوەی زۆر بیر لە تاریکی نێو گۆڕ دەکەمەوە خوای زاناو توانا ئەو تاریکیەی لەپێش چاو ئاسایی کردووم، گوتم ئەوەندەی لەنێو گۆڕستان ژیاوی هیچ شتێکت نەبینیوە دڵت پێی ناخۆش بێ؟

گوتی: با، بەڵام لەبەر ناخۆشی ڕاوەستان لەبەردەم خوا لە ڕۆژی مەحشەر ئەوەم لا ئاسایی بووە، گوتم: کەواتە: زیاتر سەرقاڵی ژیانەکەی تری[١].

### ٢١٥. کاریگەری نیازپاکی (الإخلاص) بۆ خوای تاکو تەنیا

ڕیوایەت کراوە کە لەشوێنێك دارێك هەبوو خەڵکی لێیدەپاڕانەوەو کردبوویان بەجێی نیازی خۆیانو دەیانپەرست، پیاوێکیش کە دەیزانی ئەمە هاوبەش پەیداکردنە بۆخوا بڕیاریدا بچێ ئەو دارە ببڕێ: لە ڕێگادا تووشی پیاوێك بوو، ئەو پیاوە پێی گوت: بۆ کوێ دەچی؟ پیاوەکەی تر گوتی: بیستوومە دارێك هەیە خەڵکی لێیدەپاڕێنەوە دەچم دەیبڕم، پیاوەکە گوتی: خۆ تۆ نایپەرستی چ زیانی هەیە بۆتۆ؟ گوتی: ڕاستە بەڵام هەر دەیبڕم چونکە ئەمە تاوانێکی گەورەیە، کابرا گوتی: نابێ بیبڕی، بوو بەشەڕیان ئەوەیان کە دەیویست دارەکە ببڕێ کابرای تری بەزەوی داداو خەریك بوو بیکوژێ، کابراش گوتی: وازم لێبێنە دارەکەش مەبڕە من ڕۆژانە دوو دینارت پێ دەدەم بەیانیان کە لەخەو هەڵسای سەیری ژێر سەرینەکەت بکە دوو دینارت بۆ دێ، گوتی باشە نایبڕم بەس کێ ئەو پارە بۆمن دێنێ؟ کابرا گوتی: تۆ هیچ مەپرسە من بۆت دێنم. پیاوەکە وازی هێنا چوو بۆ ماڵەوە کاتێ بەیانی داهات سەیری ژێر سەرینەکەی کرد بینی دوو دیناری لەژێرە، بۆ ڕۆژی

---

[١]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٩.

دووەم سەیری ژێر سەرینەکەی کرد بینی هیچ پارەیەك دانەنراوە، بۆیە ڕقی هەڵساو تووڕەبو بڕیاری دا دووبارە بچێ دارەکە ببڕێ، لەڕێگادا تووشی هەمان پیاوبوو پیاوەکە لێی پرسی ها بۆ کوێ دەچیت؟ گوتی: دەچم دارەکە دەبڕم چونکە تۆ پارەکەت بۆ نەهێناوم، پیاوەکەش گوتی: هەرگیز ناهێڵم بیبڕی، کەوتنە شەڕ ئەو پیاوەی کە دەیویست دارەکە ببڕێ بەزەوی کەوت و پیاوەکەی تر خەریك بوو بیکوژێ، پیاوە بەزەوی کەوتووەکە گوتی: پێم بڵێ بۆچی جاری یەکەم تۆم بەئاسانی بەزەوی دادا ئێستا بە پێچەوانەوە تۆ منت بەزەوی دادا؟

پیاوەکە گوتی: با پێت بڵێم من شەیتانم لەسەر شێوەی ئینسان بۆت هاتووم، نهێنیی ئەو کارەش ئەوەیە تۆ جاری یەکەم کە بڕیارت دا ئەو دارە ببڕی تەنها لەبەر خوا دەتویست ئەو کارە بکەی، بۆیە کاتێ من ڕێگر بووم تۆ منت بەزەوی داداو خەرك بوو بمکوژی، بەڵام جاری دووەم کە ئەو بڕیارەت دا لە پێناوی خوا نەبوو بەڵکو لە پێناوی ئەو دوو دینارە بوو کە پێم نەدای، لەبەر ئەوەی کارەکەت بۆخوا نەبوو منیش بەئاسانی بەزەویم دادایو خوای گەورە یارمەتی نەدایت[1].

### ٢١٦. بێ ئومێد نەبوون و ڕازی بوون بەقەزاو قەدەری خواو نیازپاکی

لەنێو بەنی ئیسرائیلدا پیاوێکی خواپەرست هەبوو، بەردەوام سەرقاڵی پەرستنی خوا بوو، پێغەمبەر موسا (علیه السلام) زۆر سەردانی ئەو پیاوەی دەکرد، ڕۆژێکیان بەو پیاوەی گوت: هیچ داواکاریەکت نییە بەخوای تەعالای ڕاسپێرم؟ خواپەرستەکە گوتی: با، داوای لێبکەو بزانە لێم ڕازییە؟، موسا کاتێ بەخوای پەروەردگاری ڕاگەیاند، خوا (عز وجل) فەرمووی: هەرچەند خۆی ماندوو دەکات بەڵام نەخێر من لێی ڕازی نیم، پێغەمبەری موساش پەیامەکەی خوای بەو پیاوە خواپەرستە ڕاگەیاند، پیاوەکە گوتی: ئەوە بڕیارو حوکمی خۆیتی کە لێم ڕازی نییە، بڕیارو حوکمی ئەویش سەر سەرو سەرچاو، ئەی موسا هەر چۆنێك بێ من هەرگیز پشت لەخوا پەرستی ناکەمو وازی لێناهێنم، من هەر

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ١٤.

لەدەرگای ڕەحمەتی ئەو دەدەم ئەگەر دەریشم بکات، پیاوەکە بە موسای فەرموو: بەخوای تەعالا ڕابگەیەنە کە پەیامەکەییم پیێ گەیشت بەڵام بە ئارام گرتنو ڕازی بوون پێشوازی لێکرد، خوای تەعالاش بە موسای فەرموو: لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە بەقەزاو قەدەرو فەرمانی من ڕازی بوو ئەوە من ئەگەر بەقەد ئاسمانەکانو زەویش تاوانی هەبێ لێی خۆشبووم، موساش ئەو فەرمایشتەی خوای تەعالای بە پیاوەکە ڕاگەیاند، پیاوەکە ئەو وتانەی لە موسا بیست یەکسەر چووە سوجدە بردن بۆ خوا، سوجدەکەی ئەوەندە درێژ کردەوە کاتێ هەڵیانساندەوە بینیان گیانی دەرچووە[1].

## ٢١٧. سزای ئەو کەسەی کە کاتی مسوڵمانان بەفیڕۆ دەدا

پیاوێك هاتە بەردەرگای خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصور، گوتی هاتووم بۆ ئەوەی هەندێ ئازایەتیو شتی سەرسوڕهێنەری خۆم پێشانی خەلیفە بدەم ئەگەر مۆڵەتم بدا، خەلیفە گوتی: ڕێگەی بدەن با بێتە ژوورێ، پیاوەکە هەندێ پارچە کاغەزی هێناو بڵاوی کردنەوە پاشان بەهەوای دادا بێ ئەوەی کاغەزەکان بکەونە سەر زەوی، ئەبو جەعفەر گوتی: چیتر؟

پیاوەکە ئەوجارە هەندێ بەردی وردی هێنا لە شوێنێك، شوێنی پێکەوە لکانیانی دیاری کرد، پاشان بەردێکی کە لەدیواردا شوێنی کونەکەی دیار بوو، بەردی دووەمی لەشوێنی یەکەم دا چووە ناو بۆشایی بەردەکەی تر، کە لەو شتانەی تەواو بوو لەبەرامبەر ئەوەی کە خەڵکی سەیریان دەکرد سەرقاڵی کردوون، خەلیفە بە خەیاڵی داهات پاداشتی بداتەوە، بە پاسەوانەکانی گوت: بڕۆن سەد داری لێبدەن، کابرا هاواری کرد لەسەر چی لێم دەدەن، خەلیفە گوتی: چونکە تۆ کاتی مسوڵمانانت بە فیڕۆ داوە سەرقاڵت کردوون بەشتی بێ سوود[2].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٤٠.

[2]) مائة قصة وقصة ص ٣٥.

۲۱۸. خواناسی چارەسەر بۆ هەموو خەمەکانی ئینسان

ڕۆژێك ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم پیاوێکی غەمباری بینی پێی گوت: ئەی پیاو سێ پرسیارت لێدەکەم، وەڵامم بدەوە، پرسیاری لێکرد: ئایا ئەم بوونەوەرە بە هەموو شتەکانی ناویەوە بێ ویستی خوا بەڕێوە دەچن؟

کابرای غەمبار گوتی: نەخێر هەموو شتێك بە ویستی ئەوە، شێخ ئیبراهیم گوتی: ئایا لەو ئەندازە رزق‌و ڕۆزییەی کە خوا بۆی نووسیوی هیچی لێ کەم دەبێتەوە؟

پیاوەکە گوتی: نەخێر چەندەی بۆ نووسیبم هیچی لێ کەم نابێتەوە، ئەو جارەیان شێخ ئیبراهیم گوتی: ئایا ئەو تەمەنەی کە خوا بۆی نووسیوی یەك چرکە ئەجەلت دێتە پێش؟

پیاوەکە گوتی: نەخێر چەندە تەمەنم بۆ دانرا بێ ئەوەندە دەژیم[1].

۲۱۹. مسوڵمان دەبێ بەم شێوەیە زیرەك‌و بەغیرەت بێ

کاتێ کە سەعیدی کوڕی جوبەیریان هێنا بۆ لای حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، حەججاج گوتی: ناوت چییە؟ گوتی: ناوم سەعیدی کوڕی جوبەیرە، حەججاج گوتی: نەخێر ناوت شەقی کوڕی کوسەیرە، سەعیدیش گوتی: دایکم لەتۆ باشتر دەزانێ ناوم چییە.

حەججاج بە سەعیدی گوت: خۆت‌و دایکت لاتان داوەو بێ فەرمانی منتان کردووە، سەعید گوتی: تەنها خوا پەنهان دەزانێ، حەججاج گوتی: ئەو دونیایەت لێ دەکەم بە ئاگرێکی بڵێسەدار، سەعید گوتی: ئەگەر بمزانیبا ئەو دونیایە لەدەستی تۆیە، تۆم دەکرد بەخواو دەمپەرستی، حەججاج گوتی: چی دەڵێی سەبارەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ؟

سەعید گوتی: پێغەمبەری ڕەحمەت‌و بەرەکەتە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، پێشەوای هەموو بوونەوەرە، وە نێردراوی خوای گەورەیە، بۆ هەموو خەڵکی نێردراوە بە ئامۆژگاریەکی جوان.

---

[1]) قصص الصالحين.

حەججاج گوتی: سەبارەت بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب چی دەڵێی ئایا لەبەهەشتە یان دۆزەخ؟

سەعید گوتی: من نەچوویمە بەهەشتو دۆزەخ تا بزانم کێی تێدایە، ئەوە ج پرسیارێکە کاتێ تۆ دەتەوێ شتێك بزانی کە پەنهانە.

حەججاج گوتی: سەبارەت بە خەلیفەکان دەڵێی چی؟

سەعید گوتی: هەڵسەنگاندنی ئەوان بەمن نەسپێردراوە، هەر پیاوێك دەبێ خەریکی کارێك بێ کە پێی دەسپێردرێ.

حەججاج گوتی: جوێنیان پێ دەدەی یان بەباش باسیان دەکەی؟

سەعید گوتی: ئەوەی نەیزانم نایڵێم، تەنها ئەوەندەی لەبەرم بێ باسی دەکەم.

حەججاج گوتی: بەبڕوای تۆ کامیان لە هەموویان چاکتر بوو؟

سەعید گوتی: ئەوەیان کە خوا زۆر لێی ڕازی بێ.

حەججاج گوتی: کامیان خوا لەوانی تر زیاتر لێی ڕازییە؟

سەعید گوتی: وەڵامەکەی لای یەکێکە کە زانای ئاشکراو پەنهانە.

حەججاج گوتی: پێت وایە من لەوانە کام پیاوەبم لە قیامەت؟

سەعید گوتی: من لەوە بچووکترم شتێك پەیوەندی بە غەیبەوە هەبێ بیزانم.

حەججاج گوتی: وابزانم تۆ من بەڕاستگۆ دانانێیت؟

سەعید گوتی: پێم نەگوتوی کە درۆ دەکەیت.

حەججاج گوتی: واز لەمانە بێنە بۆ پێناکەنیت؟

سەعید گوتی: شتێك نابینم تا پێی پێبکەنم، چۆن کەسێك بە تۆ پێبکەنێ کە لەخۆڵەوە درووست بووە خۆڵەکەش ئاگر دەیخوات.

حەججاج گوتی: ئەی بۆچی ئێمە پێدەکەنین؟

سەعید گوتی: دڵی مرۆڤەکان وەك یەك نین، خوا هەریەکەیانی بەجۆرێك دروست کردووە.

حەجاج گوتی: هیچ ئامرازێکی یاریو ڕابواردنو مۆسیقات بینیوە؟

سەعید گوتی: نەخێر، حەجاج بانگی کرد هەندێ ئامێری میوزیکی ڕابواردنی وەك عودو نایو بهێنرێو لەبەردەم سەعید لێبدرێ، سەعید کە ئەمەی بینی گریا، حەجاج گوتی: بۆچی دەگری؟

سەعید گوتی: شتێکی زۆر گەورەت بیر هێنامەوە کە زۆر پێی دڵتەنگ بووم، حەجاج گوتی: چیت بیر هاتەوە؟

سەعید گوتی: ئەو بووقەی کە ئێستا فەرمانت کرد لە پێشم لێبدرێ نەفخی صوری بیر هێنامەوە، ئەم عودەش، دارەکەی بیر هێنامەوە کە بەناهەق بڕاوە.

حەجاج گوتی: من لە تۆ خۆشەویستترم لای خوا؟

سەعید گوتی: کەسێ نییە کاتێ گەڕایەوە لای خوا شوێنەکەی خۆی نەزانێ.

حەجاج گوتی: چۆن من لای خوا لەبەهەشت نییم لەکاتێکدا من لەگەڵ کۆمەڵی مسوڵمانانم تۆ لەگەڵ کۆمەڵی فیتنەو ئاژاوە گێڕانی.

سەعید گوتی: من دەرنەچووم لە کۆمەڵی مسوڵمانان و بەئاژاوەش ڕازی نیم بەڵام حوکمو ئەندازەگیریی خوا وایە دەبێ بێتەجێ.

حەجاج گوتی: ڕات چییە هەندێ پارەو پووڵ کۆبکەینەوە بۆ پێشەوای ئیمانداران؟

سەعید گوتی: نەخێر ڕام لەسەری نییە.

حەجاج داوای کیسەیەکی زێڕو زیوو یاقوتو زەبەرجەدی کرد بۆیان هێناو لەبەردەم سەعیدی کوڕی جوبەیری دانا، سەعید گوتی: ئەمە شتێکی چاکە ئەگەر بەمەرج مامەڵەی لەگەڵ بکەی.

حەجاج گوتی: مەرجەکە چییە؟

سەعید گوتی: مەرجەکەی ئەوەیە لەبەر خوا کۆکرابێتەوەو لە پێناو خوا خەرج بکرێ، ئەگەرنا هیچ خێرێکی تیدا نییە ئەگەر بۆ دونیا کۆکرابێتەوە.

حەججاج گوتی: بە بڕوای تۆ ئەوەی کۆمان کردۆتەوە پاك نییە؟

سەعید گوتی: ئەوەی کۆی کردۆتەوە دەزانێ پاکە یان پاك نییە.

حەججاج گوتی: پێت خۆشە لەو ماڵە شتێکت پێ بدەم؟

سەعید گوتی: شتێکم پێ خۆش نییە گەر خوا پێی خۆش نەبێ.

حەججاج گوتی: هاوار (وَیْل) بۆتۆ، سەعید گوتی: هاوارو وەیل بۆ کەسانێکە کە دەیانەوێ بچنە دۆزەخو نایانەوێ بچنە بەهەشت.

حەججاج گوتی: دەی سەعید حەز دەکەی بەچ جۆرێك بتکوژم؟

سەعید گوتی: خۆت هەڵبژێرە چۆنم بکوژی، سوێند بەخوا چۆنم بکوژی خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی بەم شێوەیە دەتکوژێتەوە.

حەججاج گوتی: دەتەوێ لێت خۆشبم؟

سەعید گوتی: ئەگەر لێخۆشبوونم بۆ بێ‌و نەکوژرێم ئەوە لەلایەن خواوە ئەو لێخۆشبوونەم بۆ هاتووەو خوا نایەوێ بکوژرێم.

حەججاج گوتی: بڕۆن بیبەن بیکوژن؟ سەعید کە دەرچوو پێکەنی، دارو دەستەکەی بە حەججاجیان گوت: ئەوە پێدەکەنێ، حەججاج گوتی: بیگێڕنەوە، پێی گوت: بەچی پێدەکەنی؟

سەعید گوتی: بەئازایەتی‌و جورئەتی تۆ بەرامبەر خواو نەرم‌و نیانی خواش لەسەر تۆ.

حەججاج گوتی: پارچەیەك پێستم بۆ بێنن ڕایخەن لەژێری ئنجا بیکوژن.

سەعید گوتی: مۆڵەتم بدەن تا دوو ڕکعات نوێژ ئەنجام بدەم، ڕووی کردە قیبلەو گوتی: {وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ}.

حەججاج گوتی: ڕووی لە قیبلە وەرگێڕن، ڕوویان لە قیبلە وەرگێڕا، سەعید گوتی: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ... ﴿١١٥﴾ ﴾ البقرة.

حەججاج گوتی: لەسەر ڕوو بیخەنە سەرزەوی، سەعید گوتی: ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾ طـه. حەججاج گوتی: سەری ببڕن، سەعید گوتی: ئەی حەججاج شاهید بە کە هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بی جگە لە خوای تاکو تەنها، موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەی حەججاج ئەو وشانە لەبەر بکە تا ئەو ڕۆژەی بەیەکتر دەگەین لای خوای پەروەردگار، ئنجا سەعید پاڕایەوە لەخواو گوتی: ئەی خوایە هیچی دیکە حەججاج زاڵ نەکەی بەسەر هیچ کەسێك تا بتوانێت بیکوژێت لەدوای من، پاشان حەججاج سەعیدی کوڕی جوبەیری سەربڕیو شەهیدی کرد.

هەندێ دەڵێن: حەججاج لەدوای سەعید پانزە ڕۆژ ژیاوە هەتا مرد هەر لەبەر خۆیەوە هاواری دەکردو دەیگوت: چیم لەخۆم کرد سەعیدم کوشت، وە دەڵێن حەججاج دوای کوشتنی سەعید هەرکاتێ دەخەوت، سەعید هەردوو قاچەکانی دەگرت.

هەندێکی تر دەڵێن: حەججاج دوای سەعید چل ڕۆژ ژیاوە وە دەڵێن هەرکاتێ حەججاج خەوی لێدەکەوت سەعیدی کوڕی جوبەیر دەهاتە خەوی حەججاجو زۆر ئازاری دەدا، سەرزەنشتی دەکرد، دەڵێن: حەججاج جارێکیان گوتی: لەخەونمدا سەعیدی کوڕی جوبەیرم بینی پێی گوتم: ئەی دوژمنی خوا بۆچی منت کوشت؟ وە حەججاج تاوەکو ئەو ڕۆژەی مرد هەر دەیگوت: چیم کرد بەخۆم بۆچی سەعیدم کوشت؟

هەروەها دەڵێن: حەججاج چەند ڕۆژێکی کەم لەدوای سەعید ژیاوە خوای گەورە تووشی نەخۆشیەکی کرد بەردەوام هەستی بەساردییەکی زۆر زۆر دەکرد، ئاگریان بەلاشەی دادەهێنا هەستی پێ نەدەکرد.

جارێکیان بردیان بۆ لای حەسەنی بەصری، حەسەنی بەصری پێی گوت: ئەی حەججاج پێم گوتیت پەلاماری زانایان نەدەیت خوای تەعالا بەلات بەسەردا دەهێنێ،

حەجاج گوتی: من بۆ ئەوە نەهاتووم وام پێ بڵێی، هاتووم هەندێ دڵم خۆشبکەی‌و خوای تەعالا تۆزێ حەسانەوەم پێ بدا، پاشان یەکسەر مرد[1].

۲۲۰. **پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل‌و بە درووستکراودانان ( خلق )ی قورئان**

مەئموونی خەلیفەی عەبباسی لەساڵی (۲۱۸)دا بڕیارێکی بۆ ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم نارد کە والی بەغداد بوو، بەوەی کە سەرجەم دادوەریەکان‌و زانایان کۆبکاتەوە هەموویان دان بنێن بەوەی کە قورئان درووستکراوی خوایە نەك کەلامی خوا، هەر زانایەك بڕوای وانەبێ لایبدا لە شوێنی خۆی هەر کەسێك بڕوای بەمە نەبێ شاهێدی لێ وەرنەگیرێ، پاشان قۆناغ بە قۆناغ مەئموون مەسەلەکەی دژوارتر کرد، تا گەیشتە ئەو ڕاددەیەی کە هەرکەسێ باوەڕی بەم مەسەلەیە نەبێ لە گەردنی بدرێ، ئیدی والی دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خەلیفە، بڕیارەگەی خەلیفەشی بەسەر خەڵکیدا خوێندەوە، سەرەنجام هەموو ئەو زانایانەی والی کۆی کردبوونەوە بەناچاری هاتنە ژێر باری ئەو مەسەلەیەو دانیان پێدا هێنا کە قورئان درووستکراوی خوایە نەك کەلام‌و سیفەتی بێ وێنەی خوا، بەڵام چوار کەس لە زانایانی ئەو سەردەمە ئەمەیان نەسەڵاند کە بریتی بوون لە:

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، موحەممەدی کوڕی نوح، سەججاد، قەواریری، خەلیفە هەر زوو بڕیاری دا ئەو چوارە بخرێنە ژێر کۆت‌و زنجیری زیندانەوە، سەججاد کە یەکێك بوو لەو چوار زانایە دانی بەمەسەلەکەدا هێناو تەسلیمی بۆچوونەکەی خەلیفە بوو ئازادیان کرد، ڕۆژێك پاشی ئەو، قەواریریش کە یەکێکی تر بوو لەو چوار زانایە ئەویشیان تەسلیم بوو ئازادیان کرد، پێشەوایان ئەحمەدی کوڕی حەنبەل‌و موحەممەدی کوڕی نووح مانەوە، پاش گرتنیان‌و کۆت‌و زنجیر کردنیان ڕەوانەی لای مەئموون کران، لەڕێگادا بوون بۆ لای مەئموون، هەواڵ هات کە خەلیفە مەئموون مرد، والی بەغداش زۆربەی ئەو خەڵکەی لەسەر ئەو مەسەلەیە گرتبوونی ئازادی کردن، موحەممەدی کوڕی نوح لە گەڕانەوەی بۆ بەغدا وەفاتی کرد، بەم جۆرە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەتەنیا لەمەیدانەکە مایەوە، هەر بەکۆت‌و زنجیر کراوی گەیشتەوە بەغداد، سەرەتا لە (دار عمارة) سجن کرا،

---

[1]) ألف قصة وقصة ج۲.

پاشان گوێزرایەوە بۆ بەندیخانەی گشتی (سجن عام)، بۆ ماوەی (٣٠) دانە مانگ لە سجندا مایەوە، کوڕەکەی دەڵێ: ئێمە لە سجندا دەچووینە لای کتێبی (الإرجاء)و چەند کتێبێکی تری بەسەردا دەخوێندینەوە، دەڵێ: دەمبینی بە کەلەپچە کراوی پێش نوێژی بۆ بەندیەکان دەکرد، دەڵێ: تەنها لەکاتی خەوتنیدا کۆتو زنجیریان لەپێ دەکردەوە، ئێستاش با گوێ لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بگرین بزانین خۆی چۆن بەسەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

دەڵێ: کە شەوی چوارەمم بەسەرداهات لە زیندان موعتەصیمی برای مەئموون بوو بە خەلیفە، موعتەصیمیش فەرمانی کردبوو کە بمبەن بۆ لای ڕەبیع کە ئەبو ئیسحاقیان پێ دەگوت، کاتێ منیان بردە لای ئەبو ئیسحاق پێی گوتم:

ئەی ئەحمەد وەرە ژێر باری ئەو مەسەلەیەو دان بنێ بەوەی کە قورئان مەخلووقە، سوێند بەخوا ئەگینا کۆتایی ئەو مەسەلەیە بەنرخی ڕۆحت کۆتایی پێ دێ، ئەگینا بە پێچەوانەوە موعتەصیم بڕیاری داوە بەشمشێر نەتکوژێ، بەڵکو هەموو ڕۆژ ئازارت بدا تاوەکو لەژێر ئازارو ئەشکەنجە دەمریت، بڕیاری داوە لە شوێنێك بتکوژێ کە خۆرو مانگی تێدا نەبینرێ.

پاشان منیان برد، تا گەیشتینە ئەو شوێنەی کە بە (باب البستان) ناسراوە، وڵاخێکیان هێنا بەکۆتو زنجیرەوە منیان سوارکرد، هیچ کەسێکیشم لەگەڵ نەبوو بمگرێ، چەند جارێك لەبەر قورسی کۆتو زنجیرەکان خەریك دەبوو دەمەو ڕوو بەزەویدا بەربمەوەو بکەوم، ئنجا هێنرام بۆ ماڵی موعتەصیم، منیان خستە ژوورێکەوە هیچ چرایەکی لێنەبوو کاتیش نیوە شەو بوو، ویستم تەیەمموم بکەم بۆ نوێژ کە دەستم کوتا بەزەوی بینیم تەشتێك ئاوو دەفرێك دانراوە، دەست نوێژم گرتو نوێژم کرد، بۆ بەیانی بەنی شەرواڵەکەم دەرهێنا بۆ ئەوەی کۆتو زنجیرەکەمی پێ خڕ بکەمەوەو بەیەکەوەیان ببەستمەوە بۆ ئەوەی جووڵەم ئاسانتر بێ، شەرواڵەکەشم بەتوندی پێچایەوە، نوێنەری موعتەصەم هاتو دەستی گرتم هێنامیە دەرەوە، بردمیە لای موعتەصەم، موعتەصەم لەشوێنی خۆی دانیشتبوو، ئیبنو ئەبی داوودیش لەلای بوو، خەڵکێکی زۆری لە هاوڕێکانی لای خۆی کۆکردبوویەوە، هەر نزیکی خستمەوە تا گەیشتمە بەردەمی، ئنجا پێمی گوت: دانیشە،

دانیشتبووم‌و کۆت‌و پێوەندەکان باریان زۆر قورس کردبووم، پاشان بە مەعتەصەمم گوت: مۆڵەتم دەدەی قسە بکەم؟ گوتی: قسە بکە.

گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی بۆ چ شتێك بانگی خەڵکی دەکەن؟ تۆزێك بێدەنگ بوو پاشان گوتی: بۆ شایەتمان کە هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە خوا پێغەمبەریش نێرراوی خوایە.

منیش گوتم: دەجار من شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە خوا، پێغەمبەریش نێرراوی خوایە، پاشان گوتم: ئیبن عەبباسی باپیرت گوتوویەتی: کاتێ نوێنەری (عبدالقیس) هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئیمانەوە لێی پرسین؟ دەزانن ئیمان چییە؟ گوتیان خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون:

{...شَهَادَةُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ وَإِقَامُ الصَّلاةِ وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ وَصَوْمُ رَمَضَانَ وَأَنْ تُعْطُوا الْخُمُسَ مِنْ الْمَغْنَمِ...}، پێشەوا ئەحمەد دەڵێ: موعتەصەم گوتی: ئەگەر لەدەستی ئەو کەسەدا نەبووای کە لەپێش مندا بووە، هەقم نەبوو بەسەرتەوە، پاشان پێشەوا ئەحمەد دەڵێ: ئیبن‌و ئەبی داوود کە لەلای خەلیفە دانیشتبوو هاتە قسەو گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەگەر ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بۆت بسەلمێنێ من لە (١٠٠٠٠٠) دینارو سەد هەزار دینارو....هتد، زۆری ژماردن لەلام خۆشترە، موعتەصەمیش گوتی: بەخوا ئەگەر وەڵاممان بداتەوەو دان بنێ بەوەی کە قورئان مەخلووقە، بەدەستەکانی خۆم کۆت‌و زنجیرەکانی دەکەمەوەو لەپشتیەوە دەڕۆم، ئنجا پێمی گوت: بەخوا ئەی ئەحمەد پەرۆشی تۆم هێندەی هاروونی کوڕم، چ دەڵێی دانی پێدا دەنێی؟

منیش پێم گوتن بەس بەوەندە وەڵامتان دەدەمەوە دەڵێم: {إعطوني شيئاً من كتاب الله أو سنة رسوله} واتە: تەنها بەڵگەیەکم بۆ بێنن لە کتێبی خوا یان لە سوننەتی پێغەمبەر بۆ پاڵپشتی ئەو قسەیەتان، پاشان موعتەصەم پێمی گوت: قسەیەکم لەدەست بنێ تۆزێك مەجالی ئەوەی تێدا بێ تاکو بەدەستەکانی خۆم کۆت‌و زنجیرەکانت بۆ بکەمەوە، منیش دووبارە گوتم: ئێوە یەك شتم بۆ بێنن لە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، مەجلیسەکە درێژەی کێشا خەلیفە هەستا ڕۆیی، منیشیان بردەوە شوێنی خۆم، پاشان

ئەوی سێیەم هات لەدڵی خۆم گوتم: لەوانەیە بەیانی وەزعی من یەکلا بێتەوە وە بە پاسەوانەکەم گوت: پەتێکم بدەرێ ئەویش پەتێکی پێدام کۆتو زنجیرەکەم پێ پێچایەوەو، پاشان شەرواڵەکەم تێخستەوە، شەرواڵەکەم پێ توند کردەوە نەبادا لەگەڵ ئەشکەنجەدانم بکەوێت ببمەوەو لاشەم دەرکەوێ، بۆ بەیانیەکەی دووبارە برامەوە لای خەلیفە، مەجلیسی خەلیفە جممەی دەهات، لە ڕێگادا کە بەرەو خەلیفە دەیانبردم کۆمەڵێکی زۆر لە پاسەوانەکانی بە شمشێرو هەندێکی تریان بە قامچی وەستابوون، پێی گوتم: دانیشە، بە پیاوێ بەردەکەی گوت: بیدوێنن قسەی لەگەڵدا بکەن، دەستیان کرد بە موناقەشە، ئەمیان قسەی دەکرد وەڵامم دەدایەوە، ئەویان قسەی دەکرد وەڵامم دەدایەوە بەردەوام قسەم لە سەرووی قسەی وانەوە بوو بەهۆی بەهێزی بەڵگەکانم، پاشان خەلیفە خۆی نزیکم بوویەوە گوتی: ئەحمەد دانی پێدا بهێنە با ئازادت کەم، منیش هەمان ئەو قسەیەم دووبارە کردەوەو گوتم: تەنها بەڵگەیەکم بۆ بێنن لە قورئانو سوننەت؟

کە وام پێ گوت تووڕە بوو فەرمانی کرد ڕایکێشن بەزەویداو بەرگی لەبەردا دادڕن، دەڵێ: بەرگیان لەبەردا دارنیم ئەوەندەیان ئەشکەنجە دام تا لەهۆش خۆم چووم، بەو حاڵەشەوە بەبێ هۆشی بەسەر پشتم دەکەوتن، دەڵێن: کە بەهۆش خۆی هاتۆتەوە شۆربایان بۆ هێناوە تا بیخوا، کەچی پێشەوا ئەحمەد بەو حاڵەشەوە بەڕۆژوو بووە ئامادە نەبووە ڕۆژووەکەی بشکێنێ، پاشان پێشەوا ئەحمەد دەڵێ: هێنامیان بۆ ماڵی ئەبو ئیسحاق، ئیبن سەعە لەوێ بوو کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو پێش کەوتو پێش نوێژی بۆ کردین، کە سەلامی دایەوە گوتی: ئەی ئەحمەد چۆن نوێژت کرد لە کاتێکدا کە خوێن بە پۆشاکەکەتدا دێتە خوارێ؟

منیش وەڵامم دایەوە بەوەی کە پێشەوا عومەریش نوێژی کردووە کەچی پۆشاکەکەی خوێنی پێدا هاتۆتە خوار، دەڵێن: تێکڕای ئەو قامچیانەی کە لە پێشەوا ئەحمەد دراون زیاترە لە (١٠٠٠) قامچی، لە ماوەی دەسەڵاتی هەرسێ خەلیفە: مەئموونو موعتەصەمو وەسیق، پێشەوا ئەحمەد هەر لە بەندیخانە بووە، بەڵام لەسەردەمی واسیقدا لەماڵی خۆیدا دەست بەسەربووە، دەرس گوتنەوەی لێ قەدەغە کراوە، سەرەنجام لە سەردەمی هاتنە سەر دەسەڵاتی خەلیفە موتەوەککیلدا کۆتایی بەو مینەتیو گرفتاریەی هاتووە، هەموو دامو

دەزگا سەرکوتکەرەکانی ئەو سێ خەلیفە عەبباسیە لەبەرامبەر ئیرادەی پۆڵایینی پێشەوا ئەحمەددا بەچۆکدا هاتوون، سەبارەت بەمەسەلەی خەڵقی قورئان، هەتا ساڵی ٦٥٦ی کۆچی، ئەم بیرۆکەیە کۆتایی هات کە لەلایەن تاقمی موعتەزیلە ئەو عەقیدە داهێنراوە پەیدا بوو.

کۆتا ئەم هەڵوێستەی پێشەوا ئەحمەد بەدوو قسەی زۆر بەنرخی خۆی دەهێنین کە دەڵێ:

١- کاتێ ئیسحاقی کوڕی حەنبەلی مامی بە پێشەوا ئەحمەد دەڵێ تۆزێك نەرمی بنوێنێ بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ لەو میحنەتە قورسە، پێشەوا ئەحمەد بەو وتە بەنرخە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: {إذا أجاب العالم تقية، والجاهل يجهل فمتى يتبين الحق؟}، واتە: ئەی مامە، ئەگەر بابای زانا بە شاردنەوە وەڵام بداتەوە، نەزانیش بەنەزانی خۆی وەڵام بداتەوە، کەی هەق دەردەکەوێ؟

٢- یەحیای بن موعین لەکاتی ناخۆشییەکەی پێشەوا ئەحمەددا دەچێتە سەردانی کردنی، هەرچەندە یەحیای کوڕی موعین ئەو ئایەتە بۆ پێشەوا ئەحمەد دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی دەستبەرداری ئەو هەڵوێستەی بێ، ئایەتەکەش ئەوەیە کە خوای تەعالا سەبارەت بە عەمماری کوڕی یاسر کاتێ کافرەکان کوفریان پێ کرد بۆی دابەزی کە دەفەرمووێ: ﴿ ... إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ ... ﴿١٠٦﴾ ﴾ النحل، بەلام پێشەوا ئەحمەد ڕووی لە یەحیا وەرگێڕا، یەحیاش پێی گوت: عوزر قەبووڵ ناکەیت! پێشەوا ئەحمەد بە یەحیای گوت: بەسەرهاتی عەممار بەبەلگە دەهێنیتەوە، عەممار خۆی دەڵێ: من بەلای کافرەکاندا ڕەت بووم جنێویان بەتۆ دەدا ئەی پێغەمبەری خوا منیش بەرگرییم لێکردی ئەوانیش لێیاندام، بەلام ئەی یەحیا ئێوە پێتان گوترا: (دەمانەوێ لێتان بدەین) یەحیا گوتی: بەخوا لەژێر سایەی ئاسمان لەتۆ زاناترم نەبینیوە).

بەڵێ ئەمەبوو کەسایەتیو هەڵوێستی پرشنگداری ئیمام ئەحمەد لەبەرامبەر داهێنراوی بە داهێنراوی قورئان، ئەوەیە پابەندیی پێشەوا ئەحمەد بە قورئانو سوننەت، هەر بۆیە عەلی کوڕی مەدینی کە یەکێکە لە پێشەوایانی فەرمووده وە مامۆستای پێشەوا بوخاریشە ڕەحمەتی خوایان لێبێ، گوتوویەتی:

{نصر الإسلام على يدي أبي بكر رضي الله عنه يوم الردة.. والإمام أحمد رحمه الله يوم المحنة}، هەر بۆیە دەڵێن لەکاتی بەخاك سپاردنی پێشەوا ئەحمەد (١٠٠٠٠٠٠) پیاوو (٦٠٠٠٠) ئافرەت بەشداری نوێژی جەنازەکەیان کردووە[1].

## ٢٢١. گرنگیی نیەتی سەرکردە بەرامبەر خەڵکەکەی

دەگێڕنەوە ئەنو شێروان ڕۆژێك دەچێتە ڕاو بەدوای نێچیرێك دەکەوێت، بەهۆی ئەوەی بەدوای نێچیرەکەی دەکەوێت لەلەشکرەکەی دادەبڕێت، زۆر ماندوو هیلاكو تێنوو دەبێ، ڕێگای دەکەوێتە باخێكو مێرد منداڵێك لە باخەکەدا دەبێ، ئەویش داوا لەو مێرد منداڵە دەکات هەنارێکی بداتێ، مێرد منداڵەکەش هەنارەکەی پێدەدا، ئەنوشێروان هەنارەکە دەکاتە دوو لەت، دەیکوشێ ئاوێکی زۆری لێ دەگرێ، دەیخواتەوە سەری سوڕ دەمێنێ لەو هەنارە، هەر بۆیە بڕیار دەدات ئەم باخە لە خاوەنەکەی زەوت بکات، پاشان بە منداڵەکە دەڵێ: هەنارێکی ترم بدەرێ، منداڵەکە هەنارەکەی پێدەدا، ئەویش دووبارە هەنارەکە لەت دەکا بۆ ئەوەی بیکوشێ بەڵام دەبینێ هەنارەکە ووشکەو تامێکی ناخۆشی هەیە، ئەویش لە مێرد منداڵەکەی پرسی ئەی منداڵ ئەمە بۆ ئەو هەنارە وەکو ئەوەی دیکە نەبوو؟ منداڵەکەش گوتی: لەوانەیە پادشای ئەم وولاتە نیەتی ستەمی هەبێ، بۆیە ئەم هەنارە بەم شێوەی لێهات، (منداڵەکە نەیدەزانی وا لەگەڵ پادشای وولات دەدوێ)، ئەنوشێروان کاتێ گوێی لەم قسەیەی منداڵەکە بوو، لەدڵی خۆیدا پەشیمان بوویەوە لەو نیەتەی، ئنجا دووبارە گوتی: هەنارێکی ترم پێ بدە، کە هەنارەکەی لەت کرد بینی وەکو هەنارەکەی یەکەم تامێکی خۆشو ئاوێکی زۆری هەیە، بەمنداڵەکەی گوت: ئەوە بۆ هەنارەکە گەڕایەوە دۆخی جارانی؟

منداڵەکە گوتی: وادیارە پادشای وڵات پەشیمان بۆتەوەو نیەتی ئەوەی هێناوە کە ستەم نەکات، پێشەوا ڕازیی دەڵێ لەبەر دادپەروەریەکەی ئێستاش ئەنوشێروان ناوی هەر ماوەو نازناوی بەپادشای دادپەروەر ڕۆشتووە[2].

---

[1]) زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن؟- عەلی باپیر- ل ٢١٨- ٢٢٣.

[2]) منداڵە زیرەکان ل ١٦٩.

## ٢٢٢. بەهەشت لەژێر پێی دایکانە

لەیەکێك لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا، مامۆستایەکی وانەی عەرەبی کاغەزی تاقیکردنەوە بە قوتابیەکان دەداتەوە، یەکێك لە قوتابیەکان لە مامۆستاکەی پرسی: ببورە مامۆستا تۆ لەسەر دە هەشتت بۆ داناوم، هیچ هەڵەیەکیشم نییە، مامۆستاکە گوتی: من لەبەر خەت ناخۆشی دوو دەرەجەم لێ شکاندووی، قوتابیەکە گوتی: من دەمەوێ لەسەر دە، دەم بدەیتێ، کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستاکە، مامۆستاکەش نەیدەویست ئەو قوتابیە لەنێو هاورێکانی بشکێنتەوە، چونکە یەکێك بوو لە قوتابییە زیرەکو باشەکان، بۆ ئەوەی چیدیکە قوتابییەکە دەمەقاڵێ نەکات پێی گوت: ئەگەر هەندێ خۆڵم لەبەهەشت بۆ بێنی ئەوە نمرەی تەواوت دەدەمێ، قوتابییەکەش گەڕایەوە ماڵ بۆ بەیانی یەك کیس عەللاگە خۆڵی بۆ مامۆستاکەی هێنا، مامۆستاکە پرسی ئەمە چییە؟

قوتابییەکە گوتی: ئەوە خۆڵی بەهەشتە، مامۆستاکە گوتی: چۆنت هێنا؟ قوتابییەکە گوتی: وام لەدایکم کرد بۆ ئەوەی بەسەر هەندێ خۆڵ بکەوێ پاشان خۆڵەکەم کۆکردەوەو لەناو ئەو کیسەیەم دانا، بۆتۆم هێنا، ئەی تۆ هەموو جار نالێی: بەهەشت لەژێر پێی دایکانە، مامۆستاکەش سەرسام بوو بە زیرەکی ئەم قوتابییە بۆیە نمرەی تەواوی پێدا[1].

## ٢٢٣. جەژنی ڕەمەزان بۆ ئەو کەسانەیە کە بەڕۆژوبوونە

مامۆستا حەسەن موفتی لەیەکێك لە بەسەرهاتەکانیدا دەڵێ: ڕۆژێکیان دەچووم بۆ گەڕەکی شێخ محیەددین، دەستم لەئۆتۆمبێلێك ڕاگرت بۆ ئەوەی بمگەیەنێ، کە بەڕێکەوتین کاکی شوفێر گوتی: مامۆستا گیان ئەرێ زۆری ماوە بۆ مانگی ڕەمەزان؟

گوتم: بۆ؟ گوتی: هەر حەزدەکەم بزانم، منیش گوتم: ئینشائەڵلا بەڕۆژوو دەبیت؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: ساڵی ڕابردوو چۆن بوویت لەگەڵ مانگی ڕەمەزان؟

گوتی: مامۆستا گیان ساڵی ڕابردوو زۆر خراپ بووم، بەڵام ئەمساڵ بڕیارم داوە زۆر باش بم، گوتم: چۆن؟ گوتی: ساڵی ڕابردوو لەجەژنی ڕەمەزاندا خۆم دەگۆڕی، کوڕێکی

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ١٢٨.

بچووکیشم هەیە ئەویش خۆی دەگۆڕی گوتی: بابە گیان ئەمە بۆ خۆت دەگۆڕی؟ گوتم: ڕۆڵە گیان ئەی نازانی ڕۆژی جەژنەو دەچین بۆ جەژنانە؟

منداڵەکەم پێی گوتم: بابە گیان ئەمە جەژنی تۆ نییە چونکە تۆ بەڕۆژوو نەبوویت، بەڵکو جەژنی ئەو کەسانەیە کە لەڕەمەزاندا بەڕۆژوو بوون، منیش لەو کاتەدا پشتێنەکەم لەدەستم بوو لەتاو ئەم قسەیە بۆم نەبەسترا، چۆکم داداو دانیشتم بیرم لەم قسەیە دەکردەوە، چونکە قسەکەی کاریگەریی یەکجار زۆر بوو، لەدڵی خۆمدا گوتم: بۆچی ئەو منداڵە هەست بەمە دەکات کەچی من هەستی پێ ناکەم؟

بۆیە بڕیارم دا هەر لەڕۆژی دووەمی جەژنەوە بەڕۆژوو بم، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانم گێڕایەوە سوپاس بۆخوا، ئەم منداڵە بووە هۆی ڕێنمایی کردنم، بۆیە هەر چاوەڕوانی مانگی ڕەمەزانم، مامۆستا حەسەن موفتیش دەڵێ: بەقسەکانی ئەو کاکی شوفێرە دڵم گەشایەوەو دوعای خێرم زۆر بۆی کرد[1].

### ٢٢٤. چەند ڕەوشتێك کە دەبێ لە کەسانی بەرپرسدا هەبن

شێخ شەقیقی بەڵخی لەسەردەمی خەلیفە هارونە ڕەشید هاتە بەغداد، کاتێ کە خەڵکی زانیان شێخ شەقیق هاتووە بۆ بەغدا ئیتر سەردانیان دەکرد، خەلیفەش یەکێك بوو لەو کەسانەی کە سەردانی شێخی کردو لەلای دانیشت، خەلیفە هارون بە شێخ شەقیقی گوت: ئەی شێخ زۆر دڵم خۆشە بەهاتنەکەت زۆر دەمێکە حەودالی بینینی تۆم، پێم خۆشە هەندێ ئامۆژگارییم بکەی، شێخ گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران بزانە کە خوای گەورە تۆی لەشوێنی ئەبو بەکری صدیق داناوە، داوای ڕاستگۆییت لێ دەکات، تۆی داناوە لە شوێنی عومەری کوڕی خەتتاب، داوات لێدەکات کە تۆش فاروق بیتو ڕاستی خواری لەیەك جیا بکەیتەوە، واتە دادگەربیت، هەروەها تۆی لە شوێنی عوسمانی کوڕی عەففان داناوە، داوات لێدەکات کە بەشەرمو حەیاو دەست کراوە بیت، لەجێگای عەلی کوڕی ئەبو تالیبی داناوی داوات لێدەکات کە نەرمو نیانو زانابیت، خەلیفە هارون کەمێك بێدەنگ بوو، جا سەری بەرز کردەوەو گوتی: من چۆن کار بە ڕاستگۆیی بکەمو چۆن ڕاستگۆبم؟

---

[1]) منداڵە ژیرەکان ل ٣٦.

شێخ گوتی: وادابنێ کە تۆ ئەمیرو کاربەدەستی خەڵك نییت بەڵکو بە کرێکاری کار بۆ خەڵك دەکەیت، هەروەها وابزانە کە تۆ کەسێکی هەژاریت‌و دەوڵەمەند نیت، وادابنێ تۆ کۆیلەیت‌و کەسێکی ئازاد نییت، ئنجا خەلیفە کەمیك بێدەنگ بوو دواتر سەری بەرز کردەوە ڕووی کردە شێخ‌و گوتی: چۆن کارێك وا بکەم پێم بگوترێ فاڕوق حەق‌و ناهەق ڕاست‌و چەوت لەیەك جیابکەمەوە؟

شێخ پێی گوت: دەبێ ئەم خەڵکە بکەیتە سێ بەش:

- بەشێکیان لەخۆت گەورەتر - بەشێکیان لەخۆت بچووکتر - بەشێکیان وەك خۆت.

ئەوەی کە لەخۆت گەورەترە بیکەی بەباوکی خۆت، ئەوەی وەك خۆتە بیکەی بەبرای خۆت‌ئەوەی لەخۆت بچووکترە بیکەی بە منداڵی خۆت، ڕێز لەباوکت بگرە چاك بە لەگەڵ برات، بەڕەحم‌و بەزەیی بە لەگەڵ منداڵەکانت.

پاشان هارونە ڕەشید گوتی: چۆن وابکەم کە بەحەیاو شەرم‌و دەست کراوەبم (سەخیی) بم؟

شێخ گوتی: شەرم لەدراوسێکەت بکە، خۆت بکە بەوەکیلی کەسێك کە ماڵ‌و سەروەتەکەی لەدەستی تۆدایە.

هارونە ڕەشید گوتی: چۆن کەسێکی زاناو نەرم‌و نیان بم؟

شێخ گوتی: گوێڕایەڵی کەسانی بەتەمەن بە لەچاکەدا لەفەرمانیان دەرمەچوو، بەپێچەوانەوە گوێڕایەڵی هەواو ئارەزووەکانی خۆت مەبە.

هاروون گوتی: هێشتا زیاتر ئامۆژگارییم بکە، شێخ گوتی: بزانە کە خوا ئاگری دروست کردووە ناوی ناوە جەهەننەم، تۆیشی لەسەر دەرگاکان داناوە، ماڵی مسوڵمانانی خستۆتە دەستی تۆ، شمشێرو قامچی پێداوی، فەرمانی پێ کردووەی کە لەو ماڵەی پێی داوی بیبەخشی بەخەڵکی، بۆ ئەوەی هەژاران بەهۆی نەبوونیانەوە تووشی لادان‌و گوناح نەبن، فەرمانی پێکردووی کە کەسێك بکوژی کە کەسێکی بەناهەق کوشتووە.

هارونە ڕەشید گوتی: زیاتر ئامۆژگاریم بکە، شێخ گوتی: بزانە ئەی خەلیفە تۆ کانیاوی کرێکارەکانیش ڕووبارن، ئەگەر کانیاو وشك بوو ڕووبارەکانیش وشك دەبن، ئەگەر کانیاو لێڵ بێ، ڕوبارەکانیش لێڵ دەبن، ئەگەر ئەوەندە ئامۆژگارییە بۆتۆ بەس نەبێ ئەوە من هیچ دڵم بەتۆ خۆش نابێ[1].

٢٢٥. **عاشقی ( عيناء المرضيّة )**

عەبدولواحیدی کوڕی زەید دەڵێ ڕۆژێك لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم خۆمان ئامادە دەکرد بۆ غەزایەك، منیش پێیانم گوت: بەیانی ڕۆژی دووشەممە ئامادەبن، یەکێك لە هاوڕێکانمان بۆ هاندانی مسوڵمانان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ ...﴿١١١﴾﴾ التوبة، لەو کاتەدا منداڵێکی تەمەن پانزە ساڵان کە دایك و باوکی مردبوون میراتێکی زۆریان بۆ بەجێ هێشتبوو هەڵسایەوە گوتی: ئەی عەبدولواحید ئایا خوای گەورە ماڵ و گیانمان لێدەکڕێ بەبەهەشت؟

منیش گوتم: بەڵێ خۆشەویستەکەم، مێرد منداڵەکە گوتی: دە کەواتە شاهێد بە ئەوە من گیان و ماڵ و سەروەت و سامانی خۆم فرۆشت بۆ خوا لە پێناو بەدەست هێنانی بەهەشت.

منیش گوتم: ڕۆڵە تۆ هێشتا بچووکی دەترسم بەرگەی ئەو شەڕە نەگریت، ئارام نەگریت لەم کڕین و فرۆشتنە، گوتی: نەخێر من دەیفرۆشم بەخوا، بەشاهید بە عەبدولواحید، ئنجا ئەو مێرد منداڵە هەموو ماڵەکەی خۆی بەخشی تەنها ئەسپێك و چەکەکەی و نەبێ لەگەڵ هەندێ خواردن، کە ویستمان دەرچین بۆ ئەو شەڕە، یەکەم سەرباز کە هاتە لام ئەو منداڵە بوو پێمی گوت: السلام عليك يا عبدالواحد، منیش وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە، بەردەوام چاودێری ئەو منداڵەم دەکرد دەمبینی بەڕۆژ بەڕۆژوو بوو و بەشەویش شەونوێژی دەکرد، خزمەتی ئێمەشی دەکردو چاودێری وڵاخەکانمانی دەکرد،

---

[1]) جليس الصالح ص ٢١٧.

کاتێ دەنووستین پاسەوانی لێدەکردین تاکو گەیشتیین بەخاکی ڕۆمەکان، بەیانیەك بینیم هەر هەڵسا لەخەو دەنگی بەرز کردەوەو لەبەر خۆیەوە گوتی: ئای چەند عەودالّم بۆ (عیناء المرضیة)، منیش پێم گوت: ئەوە چییە خۆشەویستم چی دەڵێی: پێی گوتم ئەی عەبولواحید کەمێك چاوم چووە خەو یەکێك لەخەونمدا پێی گوتم: وەرە با بچین بۆ لای (عیناء المرضیة) منی برد بۆ ناو باخو باخچەیەکی دڵڕفێن ئاوێکی سازگاری بەبەردا دەڕۆیی، لەسەر ئاوەکە هەندێ حۆری چاو جوان، ئەوەندە جوان بوون کە ناتوانم وەسفیان بکەم دانیشتبوون، کە منیان بینی زۆر خۆشحاڵ بوون گوتیان ئەوە پیاوەکەی (عیناء المرضیة) هات، منیش بەو حۆریانەم گوت: سەلامی خواتان لێبێ کامە لەئێوە (عیناء المرضیة)یە؟

گوتیان ئێمە هیچ کامێکمان ئەو نیین بەڵکو ئێمە هەمو خزمەتکاری ئەوین، هێشتا بڕۆ وا چاوەڕوانت دەکا، منیش هەندێکی تر سەرکەوتم بەناو باخچەو باخێکی زۆر جوانتر تێپەڕیم ئاوێکی سافو سازگاری پێدا تێدەپەڕی، هەندێ حۆری ترم بینی لەسەر ئاوەکە دانیشتبوون زۆر لەوانی تر جوانتر بوون، ئەوانیش کە منیان بینی دڵیان زۆر خۆش بوو گوتیان ئەمە پیاوەکەی (عیناء الرضیة)یە، منیش گوتم: کامە لە ئێوە (عیناء المرضیة)یە، گوتیان: ئێمە هەمووما خزمەتکاری ئەوین، هێشتا بڕۆ سەرکەوە وا چاوەڕوانت دەکا، منیش ڕۆیشتم لەناکاو گومەزێکم بینی، هەمووی نەخشێنراو بوو بە دوڕوو یاقوت لە بەردەرگای گوممەزەکە خزمەتکارێك وەستابوو ئەوەندە جوان بوو ناتوانم وەسفی جوانیەکەی بکەم کە منی بینی یەکسەر گوتی: ئەی (عیناء المرضیة) ئەوە هاوسەرەکەت هات بۆلات، منیش نزیك بوومەوە لەدەرگایەك چوومە ژوور بینینم وا لەسەر تەختەکەیەك دانیشتووە، کە تەختەکەی هەموو زێڕ بوو، واقم وڕما لەجوانی ئەو حۆریە، پێمی گوت بەخێر بێی ئەی خۆشەویستی خوا نزیکە بێیە لام، منیش بۆی چووم تا لەباوەشی بگرم گوتی: ئارام بگرە کاتی ئەوە نەهاتووە کە لەباوەشم بگری چونکە هێشتا تۆ لە ژیانی دونیای، بەڵام موژدەت لێبێ ئەو ئێوارەیە لای ئێمە فتار دەکەیەوە ئینشائەڵلا، بەم شێوەیە لەخەوەکەم هەڵسام، عەبدولواحید دەڵێ: کاتێ ئەو گەنجە قسەکانی تەواو کرد یەکسەر سریەیەکی دوژمن بۆمان هات، هێزەکانی ئیچمەش بۆیان چوون ئەو گەنجەش

یەکسەر لەگەڵیان دەرچوو، تەماشام کرد نۆ دانە لە ڕۆمەکانی کوشتن دواتر خۆی بوو بەهی دەیەمو شەهیدیان کرد، بینیم لەناو خوێنەکەی ڕووحی دەداو پڕ بەدەنگی خۆی پێدەکەنی هەتا گیانی دەرچوو[1].

### ٢٢٦. دوعای دایك بۆ کوڕەکەی

دەڵێن جارێکیان ئافرەتێك دەڵێ: ڕۆمەکان کوڕی منیان بەدیل گرتووە هیچ ماڵو سامانێکم نییە جگە لە خانووێکی بچووك کە ناتوانم بیفرۆشم، ئەگەر کەسێك هەبێت بتوانێت فیدیە بدات بە ڕۆمەکان بۆ ئەوەی کوڕەکەم ئازاد بکەن، ئافرەتەکە لەم قسانەدا بوو پیاوێکی پیری ڕیشسپی لەوێدا بوو سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان لێوەکانی دەجووڵاندو دیاربوو هەندێ قسەی کرد، دوای ماوەیەك ئافرەتەکە خۆیو کوڕەکەی دیارکەوتنو هاتن بۆ مەجلیسی ئەو پیاوەو خۆیو کوڕەکەی هەر دوعایان بۆ ئەو پیاوە دەکرد، ئافرەتەکە بە پیاوەکەی گوت: گوێ بگرە بزانە کوڕەکەم چی دەڵێ هەندێ قسەت لەگەڵدا دەکات، کوڕەکە گوتی: ئێمە کەوتینە دەست پادشایەکی ڕۆمەکان بەدیل گیراین، ئەم پادشایە باخچەیەکی زۆر گەورەی هەبوو خزمەتی باخچەکەی بە ئێمە دەکرد، هەموو ڕۆژێك ئێمە بەدەستو قاچی زنجیر کراو دەچووین خزمەتی ئەو باخچەیەمان دەکرد.

مەغریبێك لەناکاو ئەو کۆتو زنجیرەی دەستو قاچەکانمی پێ بەسترابوو سەربەخۆ کرایەوە، کەوتە سەر زەوی، ئەو کاتو ساتەی کە کۆتو زنجیرەکەی کرایەوە لەگەڵ ئەو کاتو ساتە یەك بوو کە پیاوە پیرەکە دوعاکەی کرد، کوڕەکە دەڵێ: پاسەوانەکە کاتێ منی بینی کۆتو زنجیرەکەم کرایەوە هاواری کرد ها کۆتو زنجیرەکەت شکاند، منیش گوتم نەخێر خۆی شکاو کەوتە خوار، پاسەوانەکە سەیری کۆتو زنجیرەکەی کرد سەری سوڕما لەو کارە بانگی قەشەکانی خۆیانی کرد، ئەوانیش هاتن سەیریان کرد، پرسیاریان لێکردم ئەی کوڕە گەنج تۆ دایکت هەیە؟

---

[1] ) تنبیه الغافلین ل ٥٨٦.

گوتم: بەڵێ، گوتیان دایکت دوعای کردووە کاریگەری دوعای دایکتە بووەتە هۆی ڕوودانی ئەو کارە، ئنجا قەشەکان گوتیان: خوا ئازادی کردی ئێمە ناتوانین دووبارە تۆ زنجیر بکەینەوە، منیان بردە سەر سنوور لەوێ بەهەندێ مسوڵمانانیان سپاردمو هاتمەوە[1].

### ٢٢٧. بەناو خۆشەویستی نێوان کوڕو کچ

کچێکی داماو دەڵێ بەهۆی تەلەفۆنەوە گەنجێکم ناسی، ڕۆژێکیان تەلەفۆنێکم بۆ هات گوتی: داوای ماڵی فلاّن کەس دەکەم، منیش بەدەنگێکی ناسکەوە گوتم: ژمارەکەت بەهەڵە لێداوە، پاشان هەندێ قسەم بەنازەوە لەگەڵ کرد.

کوڕەکە وای لێهات چەند جارێکی تر تەلەفۆنی بۆ کردم، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئاشنای یەکتر بین‌و گوایە یەکترمان خۆش دەوێ، چەند جارێك یەکترمان بینی وێنەی خۆمان دا بەیەکتر، خۆشەویستیمان بۆ یەکتر دەربڕی، ئەو سەین‌و بەینە چوار ساڵی خایاند، دواتر ڕۆژێکیان کوڕەکە گوتی: خۆتم تەسلیم بکە، هیچ جیاوازی نییە ئێستا خۆتم تەسلیم بکەی یان دوای مارە کردن من هەر مارەت دەکەم.

منیش گوتم: لەسەرەتادا وەرە مارەم بکە ئنجا، بەلاّم کوڕەکە گوتی: ئەگەر ئەوەی پێت دەڵێم نەیکەی ئابڕووت دەبەم، هەموو قسەکانی تۆم تۆمار کردووە، نهێنی خۆت‌و خانەوادەکەت لای منە، ئافرەتەکە ناچار خۆی تەسلیم کرد بەم گورگەو خۆی ژیانی خۆی کرد بە دۆزەخێك نەتوانێ ڕزگاری بێ[2].

### ٢٢٨. بەزەیی هاتنەوە بە گیانداران مایەی لێخۆشبوونی خوایە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: جارێکیان پیاوێك بەلای بیرێکی ئاودا تێپەڕی زۆری تینو بوو، دابەزی‌و لە بیرە ئاوەکەدا تێر ئاوی خواردەوە، پاشان ڕۆیشت، بینی سەگێك لەبەر تینوێتی وا زمان بە خۆڵی بەرپێکانیدا دەهێنێ، پیاوەکە بەزەیی پێدا هاتەوە لەبەر خۆیەوە گوتی: بەڕاستی ئەو سەگە وەکو من تینووە، ئنجا هەندێ ئاوی لە بیرەکەدا هێنایە دەرەوە

---

[1]) البر والصلة لإمام إبن الجوزي ص ١١٧.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٥٨.

لەناو پێڵاوەکانی دای بە سەگەکە، زۆر سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەوەی کە خوا یارمەتی دا بۆ ئەم کارە خوای گەورەش بەو هۆیەوە لێی خۆش بوو[1].

[1]) هەردوو پێشەوا بوخاری‌و موسلیم ئەم بەسەرهاتەیان هێناوە.

## ٢٢٩. ڕەخنەی کچی ئیمام ئەحمەد لە ئیمام شافعی

ئیمامی ئەحمەد زۆر جار لای کچەکەی خۆی باسی تەقواو زانستو وەرعی ئیمام شافعی دەکرد، ڕۆژێکیان پێشەوا ئەحمەد بانگی پێشەوا شافیعی دەکات بۆ نانخواردنی ئێوارە، کاتێ لەنوێژی عیشا گەڕانەوە، دەستیان کرد بەنانخواردن، دوای نانخواردن پێشەوا شافیعی یەکسەر چوو بۆ سەر جێگای نووستن، کچەکەی پێشەوا ئەحمەد بە باوکی گوت: باوکە ئەوە ئەو شافیعیەیە کە تۆ باسی دەکەی؟

گوتی بەڵێ کچەکەم بۆ؟

کچەکەی گوتی: لە شەویوە چاودێری دەکەم سێ ڕەخنەم لێی هەیە، کاتێ نانمان بۆی هێنا زۆر زۆری خوارد، کە چووە سەرجێگای نووستن شەو هەڵنەستا بۆ شەو نوێژ کردن، بەیانی کاتێ نوێژی بەیانی بۆ کردین نەمبینی دەست نوێژ بشوات، پێشەوا ئەحمەد ئەو قسانەی کچەکەی بۆ پێشەوا شافیعی گێڕایەوە، پێشەوا شافیعی گوتی: سەبارەت بەزۆر خواردنەکەم لەبەر ئەوە بوو کە من هیچ گومانم نییە ماڵەکەی تۆ هەمووی حەلاڵە، تۆ پیاوێکی سەخی ماڵی پیاوی سەخیو حەلاڵیش دەبێتە شیفا بۆ لەشی ئینسان هەروەك چۆن ماڵی پیاوی ڕەزیلو حەرام دەبێتە دەردو ژان، بۆیە زۆرم خوارد تا بێتەو هێزو تواناو شیفا بۆ لاشەم، سەبارەت بە هەڵنەستانەوەم بۆ شەو نوێژ لەبەر ئەوە بو کاتێ سەرم دانایە سەر سەرین هەندێ فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی هاتنە بەرچاوم، منیش لەو فەرمایشتانەدا (٧٢) مەسئەلەم دەرهێنا بۆ ئەوەی خەڵکی سوودی لێببینن تاکو نوێژی بەیانی خەریك بووم، دەرفەتی ئەوەدم نەبوو هەستم بۆ شەو نوێژ، سەبارەت بە دەستنوێژ نەگرتنم بۆ نوێژی بەیانی لەبەر ئەوەبوو کە من پاشی نوێژی عیشا هیچ نەخەوتووم تا دەستنوێژم هەڵگرمەوە بۆیە هەر بەو دەستنوێژەی عیشا نوێژی بەیانیم ئەنجامدا[1].

## ٢٣٠. بەرهەمی ڕێزگرتن لە ناوەکانی خوای پەروەردگار

ئیمام قوشەیری دەڵێ: هۆکاری تەوبە کردنی بیشری حافی ئەوەبوو ڕۆژێك بە شوێنێکدا دەڕوات دەبینێ پارچە کاغەزێك لەزەویدا کەوتووە، کە هەڵیدەگرێتەوە لێی

---

[1]) ألف قصة وقصة ج١ ص ٣٣٦.

نووسراوە {بسم الله الرحمن الرحيم} ئەویش جوان خاوێنی دەکاتەوە، دەچێتە بازاڕ بە درهەمێك بۆنێکی خۆش دەکرێ بۆنەکەی لێدەدا، لەماڵەوە بەدیوار هەڵیدەواسێ، شەو لەخەودا دەنگێك پێی دەڵێ: ئەی بیشر ناوی ئێمەت پاکو بۆن خۆش کرد، ئێمەش ناوی تۆ لە دونیاو قیامەت بۆن خۆش دەکەین[1].

### ٢٣١. گەورەیی خزمەتکردنی تێکۆشەران

یەکێ لە پیاوچاکان هاوڕێیەتی کەسێکی کرد لەسەفەری جیهاددا، بەمەرجی دانا لەسەر خۆی کە خزمەتیان بکات، هەرکاتێ یەکێکیانی دەدی وا جلو بەرگی خۆی دەشوا دەیگوت: بیدە بەمن من پێویستم کردووە لەسەر خۆم خزمەتتان بکەم، بەهەمان شێوە هەموو کارەکانی تری بۆ ئەنجام دەدان، کاتێ ئەو پیاوچاکە مرد، سەیریان کرد لەسەر دەستی نووسرابو (مِن أَهْلِ الجَنَّةِ)، واتە ئەمە لەخەڵکی بەهەشتە، کە سەیریان کرد بینیان نووسینەکە لەنێوان پێستو گۆشتیدا بوو[2].

### ٢٣٢. سەرەنجامی نەکردنی نوێژی جەماعەت

عەبدوڵڵای قەواریری دەڵێ: لە ژیانمدا نوێژی عیشام بە جەماعەت نەفەوتاوە، قەدەری خوا شەوێکیان بەهۆی میوانەوە نوێژی جەماعەتی عیشام لەدەست چوو، زۆربەی مزگەوتەکانی شاری بەصرە گەڕام بەهیوای ئەوەی لەیەکێکیان بەنوێژی عیشا بگەم، بەڵام بێسوود بوو هەمو ئەو مزگەوتانەی من بۆی چووم نوێژی بەکۆمەڵیان ئەنجام دابوو، منیش بەناچاری گەڕامەوە ماڵەوە بەدڵێکی سارد، بیرم کردەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: نوێژی بەکۆمەڵ خێری (٢٧) نوێژی هەیە لەماڵەوە، منیش کە هاتمەوە (٢٧) جار لەسەر یەك نوێژی عیشام ئەنجامدا، پاشان خەوتم، لەخەونمدا بینیم کە لەگەڵ هاوڕێکانی مزگەوت پێشبڕکێم دەکرد من لەهەموویان زیاتر دوادەکەوتمو بە سستی دەڕۆیشتم، لەناو هاوڕێکانم یەکێکیان پێی گوتم: وولاخەکەت ماندوو مەکە چونکە هەر ناتوانی بمانگەیێ، منیش گوتم بۆچی؟

---

[1]) الرسالة القشيرية ص ٣٠.

[2]) لطائف المعارف.

گوتیان ئێمە نوێژی عیشامان بەکۆمەڵ کردووە بەڵام تۆ بەتەنیا کردووتە، بۆیە دوادەکەویت، لەو کاتەدا لەخەوەکەم خەبەرم بوویەوە زانیم کە ئەگەرچی (٢٧) نوێژم کردووە بەڵام ناتوانم بگەم بە هاوڕێکانم کە نوێژیان بەکۆمەڵ کردووە[١].

## ٢٣٣. ڕێزو حورمەت دانان بۆ ناوو سیفەتەکانی خوای بێوێنە

دەگێڕنەوە شەوێکیان زانای خواناس مالیکی کوڕی دینار بەیەکێك لە کۆڵانەکانی شاری بەصرەدا دەڕۆیشت، چاوی بە سەرخۆشێك کەوت شەڕابی بەدەمدا دەهاتە خوار لەسەر پشت درێژ بوو، لەبەر خۆیەوە هەر دەیگوت: الله...الله...الله، مالیکی کوڕی دینار کە پیاوە سەرخۆشەکەی بەم شێوەیە بینی گوتی: بەڕاستی شتێکی نەشیاوو نەگونجاوە ناوی خوا لەدەمێکی وا پیس بێتە دەرەوە، بۆیە هەندێ ئاوی هێنا دەمی پیاوەکەی جوان شوشت دوعای هیدایەتی بۆ کرد، ئنجا کابرای سەرخۆشی جێهێشتو گەڕایەوە بۆماڵەوە، کە گەیشتە ماڵەوە خەوی لێکەوت، دەڵێ: خەوم بینی، لەخەوەکەمدا پێیان گوتم: ئەی مالیك تۆ لەبەر خاتری ئێمە دەمیت خاوێن کردەوە ئێمەش لەبەر خاتری تۆ دڵیمان خاوێن کردەوە، پاشان دەڵێ: بۆ بەیانی چووم بۆنوێژی بەیانی، لەهەمان ڕێگا چاوم بەو پیاوە کەوت هەناسەی پەشیمانی هەڵدەمژی، دەیگوت: ئەی خوای بەبەزەیی لەبەردەگای میهرەبانیت وەستاووم، پەشیمانیم لێوەرگرە، مالیك دەڵێ: گوێم لەو قسانە بوو نزیکی کەوتمەوە بینیم هەمان پیاوە سەرخۆشەکە بوو، پرسیارم لێکرد حاڵت چۆنە ئەی بەندەی خوا؟

لەوەڵامدا گوتی: ئەی مالیك ئەو کەسەی کە هیدایەتی داوم تۆی ئاگادار کردووە بەحاڵم[٢].

---

[١]) دۆستی باوەڕداران ل ١٠٠.

[٢]) دۆستی باوەڕداران ل ١٠١- ١٠٢.

## ٢٣٤. ڕەوشت بەرزی پێغەمبەری خوا ﷺ

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەیەكێك لە شەقامەكانی مەككەدا دەڕۆیشت، چاوی بە پیرەژنێكی پشت چەماوە كەوت كۆڵێكی گەورەی پێ بوو، پیرەژنەكە چاوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ كەوت پێی گوت: ئەی ڕۆڵە وەرە ئەو كۆڵەم بە پشتی دادە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دایە گیان تۆ ناتوانی ئەمە هەڵگریو بە پشتی خۆتی دادەی من بۆتی هەڵدەگرم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ كۆڵەكەی بە پشتی خۆی داداو بەرەو ماڵی پیرەژن بەڕێكەوتن، كاتێ گەیشتن بە شوێنی مەبەست پیرەژن گوتی: كوڕم دەمەوێ لەبەرامبەر ئەو چاكەی لەگەڵ منت كرد ئامۆژگارییەكت بكەم، دەڵێن: پیاوێك پەیدابووە ناوی موحەممەدە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكا، دەڵێ: تەنها یەك خوا هەیە شایەنی پەرستن بێ، نەكەی بە قسەكانی ئەو باوەڕ بكەیو هەڵت خەڵەتێنێ، چونكە ئەو پیاوە درۆ دەكات، پیرەژن نەیدەزانی كە ئەوەی كە بارەكەی بەسەر پشتی خۆی داداوەو یارمەتی داوە ئەو پێغەمبەرەیە كە ئەو باسی دەكات، لەدوای تەواو بوونی قسەكانی پیرەژنەكە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەنەرمو نیانییەوە فەرمووی: دایە گیان ئەو پیاوەی تۆ باسی دەكە كە داوای پێغەمبەرایەتی دەكات ئەوە منم، پیرەژنەكە كە ئەو قسانەی پێغەمبەری خوای بیست بەخەجاڵەتییەوە گوتی: چۆن تۆ ئەو پیاوەی وا بەم شێوەیە بەزەییت پێمدا دێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا كە دەزانی من بێ باوەڕم، بێگومان بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوای[1].

## ٢٣٥. تووڕەبە لەو كەسانەی كە خوای كاربەجێ لێیان تووڕەیە

دەڵێن خوای پەروەردگار وەحی بۆ پێغەمبەر یوشەع نارد پێی فەرموو من لەقەومی تۆ (٤٠٠٠٠) كەس لەناو دەبەم لەوانە كە چاكن، (٦٠٠٠٠) كەسیش لەوانەی كە خراپن، یوشەع فەرمووی: خوای گەورە تۆ خراپەكان لەناو دەبەی لەبەر ئەوەی كە خراپن، ئەی چاكەكان سووچیان چییە؟

---

[1]) دۆستی باوەڕداران ل ١١٩- ١٢٠.

خوای گەورە فەرمووی: چونکە ئەوان بۆ تووڕە بوونی من تووڕە نەبوون لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لێیان تووڕەم دادەنیشتن‌و خواردن‌و خوارنەوەیان هەر لەگەڵ ئەوان بوو[1].

### ٢٣٦. فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگریی کردن لە خراپە

مالیکی کوڕی دینار دەڵێ: خوای پەروەردگار فەرمانی کرد بە فریشتەکان عەزاب بنێرن بۆ فلانە لادێ، فریشتەکان گوتیان: خوای پەروەردگار لەناو ئەم لادێیە فلانە کەس هەیە پیاوێکی زۆر خواپەرستە، خوای گەورە فەرمووی: بەسەر ئەویشدا خراپ بکەن، چونکە ئەو پیاوە ڕۆژێك لە ڕۆژان نێوچەوانی گرژ نەبوو لە پێناوی من کاتێ دەیبینی ئەو خەڵکە چۆن سنوورەکانی من دەبەزێنن[2].

### ٢٣٧. نهێنی پاراستن

دەگێڕنەوە یەکێ هەندێ قسە بۆ هاوڕێیەکی دەکات، قسەکان نهێنی بوون دەبوا بپارێزرێن، لەبەر ئەوە کە لە قسەکانی بوویەوە بە هاوڕێکەی گوت: تێگەیشتی؟ هاوڕێکەی گوتی: نەمزانی (واتە: وابزانە ئەو قسانەم هەر نەزانیوە)، هاوڕێکەی وای زانی لە بابەتەکە نەگەیشتووە ئەو جارە پێی گوت: قسەکانت لەبەر کرد؟ هاوڕێکەی گوتی: لەبیرم چوو، (واتە: وابزانە هەر لەبیرم چووە).

هەروەها بە ئەبو موسلیمی خەولانییان گوت: بەچی گەیشتیتە ئەو پلەو پایە؟ گوتی: من عەبای شاردنەوەی نهێنیم پۆشیوە، پۆشاکی بەستنەوەی نهێنییم بەستووە[3].

---

[1]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن ل ١٨٣.

[2]) مرشد الخطیب- عبدالرحمن المصطاوي- ص ١٦٨.

[3]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن ل ١٨٥.

### ٢٣٨. ئامۆژگارییەکی بەنرخ بۆ ئەو کەسانەی کە دەچنە لای بەرپرسان

ئەبو حەنیفە بەیەکێ لە قوتابییەکانی کەناوی ئەبو یوسف بوو گوتی: ڕێز لە کاربەدەستان (السلطان)ەکان بگرە بەبایەخەوە سەیری پلەو پایەکەی بکە، ووریابە لای کاربەدەستان درۆ نەکەیت، لەهەموو کاتێك نەچیتە لای، مەگەر بۆ کارێکی پێویست نەبێ وەك بلاو کردنەوەی زانست، چونکە ئەگەر زۆر بچیتە لای ئەوە فەرامۆشت دەکاو سووك دەبیت لەبەر چاوی،کارەکەشت سووك دەبێ، کە دەچیتە لای وا سەیری خۆت بکە کە لەنزیك ئاگری سووریت، هەم سوودی لێدەبینی هەم خۆشت لێی بپارێزە، ئەگەر بەم شێوەیە سەیری بکەی خۆتی لێدەپارێزی، وریابە زۆر لە مەجلیسی ئەو قسە مەکە، لەوانەیە لەم زۆر قسە کردنەت هەڵە بکەیت، بەم هەڵە کردنەشت لەبەرچاوی دەکەویت، بەلام کە چوویتە لای ڕێزی خۆتو غەیری خۆشت بگرە، چونکە بەم کارەت ڕێزدار دەبیت[1].

### ٢٣٩. پەروەردەی چاکی منداڵو چاودێری کرنی باش

کابرایەك خاوەنی دوکانێکی جوانو ڕازاوە بوو لەنێو جەرگەی بازاڕ، کوڕێکی بچووکی هەبو تەمەنی (٥) ساڵان دەبوو، زۆری خۆش دەویست، زۆر بەکەمی دەیهێنایە دەرەوە، پەروەردەیەکی چاکی دەکرد، قەدەری خوا وابوو ڕۆژێکیان بەمەبەستی کڕینی جلو بەرگ هێنایە بازاڕ لە دوکانەکەی خۆی داینا، بەنیاز بوو دوای ئەوەی دوکانەکانی بازاڕ هەموو دەکرێنەوە لە دەرفەتێکدا بچێ جلو بەرگی بۆ بکڕێ، کڕیارەکانی دوکانەکەی یەك یەكو دوو دو دێن بۆلای دەورو بەری قەرەباڵەغ دەبێ ئاگای لە منداڵەکەی نامێنێ، منداڵەکەشی لە دوکان دەچێتە دەرو دیار نامێنێ، کابرا وەختێك دەبینێ منداڵەکەی لەناو دوکان نەماوە، بەدوای دا دەگەڕێ لە دراوسێکانی دەپرسێ کەسێك نەیبینیوە، سەرسام دەبێ لەدیار نەمانی منداڵەکەی وە زۆر بێتاقەت دەبێ، دوکانەکەی دادەخاتو بەدوای دا دەگەڕێو بانگەوازی بۆ دەکات، چەندی دەکات نایبینێتەوە، بانگەواز دەکات هەرکەسێ بۆی بدۆزێتەوە یەك لیرەی پێدەدا، کابرایەك کە منداڵەکەی لابوو گوێی لەم بانگەوازە دەبێ، لەبەر خۆیەوە دەڵێ ئەمە

[1]) ساعة وساعة- محمود المصري- ص ٢٤٠.

جگەر گۆشەیتی، یەك لیرە کەم نییە بەڵام دڵنیام بەیانی زیادی دەکات، ئەوسا دەیدەمەوە، ئەو شەوە منداڵەکە بێ بەش دەکات لە خاوو خێزانەکەی، منداڵەکە لەماڵی ئەو پیاوەدا لەگەڵ منداڵەکانی ئەو پیاوە دەکەوێتە یاری کردن، تا کفت دەبێو خەوی لێدەکەوێت، بۆ بەیانی ئەو پیاوەی منداڵەکەی لایە دەچێتە بازاڕو هەستی خۆی ڕادەگرێ بۆ هەواڵی نوێ، چاوەڕێ دەکات باوکی منداڵەکە خەڵاتەکە زیاد بکات بەڵام هیچ هەواڵێك نابیستێ، ناچار دەچێتە دوکانی باوکی منداڵەکە، دوای چاکو چۆنیو هەواڵ پرسین پێی دەڵێ: ئایا ڕاستە منداڵێکت لێ ون بووە؟

کابرا هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژێو دەڵێ: بەڵێ ڕاستە خەڵاتێکیشم ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە بەڵام هەر نەمدۆزیەوە.

پیاوەکە گوتی: ئەی ئەمڕۆ...، باوکی منداڵەکە گوتی: ئەمڕۆ، ئەمڕۆ خەلات نادەم بەکەس وە هەرکەسێك منداڵەکەمی لابێو گوێی لەو بانگەوازە بووبێ بە تاوانباری لەقەڵەم دەدەم، پیاوەکە گوتی: بۆچی ئەی دوێنێ لیرەیەکت نەکردە خەڵات؟

باوکی منداڵەکە گوتی: ڕاست دەکەیت بەڵام من مەبەستم ئەوەبوو منداڵەکەم شەو لەماڵی کەس نەمێنێتەوە، ئەو پەروەردەی کە خۆم کردوومە نەشێوێ، مەبەستم ئەوەبو کەوچکی هیچ ماڵێکی بەدەمدا نەچێ، ئێستاش ئەگەر لای تۆیە بڕۆ بیهێنەوە دڵنیاشم ڕیسەکەم لێ بۆتەوە خوری[1].

**٢٤٠.ئەوانەی بەرپرسن زۆر هەژارو بێ ماڵن**

ڕۆژێك خەلیفە هارونە ڕەشید هەندێك پارەی دا بە بەهلول بۆ ئەوەی لەنێوان هەژاراندا دابەشی بکات، بەهلول پارەکەی وەرگرت کەمێك لای خۆی هێشتییەوە دوایی دایەوە بە خەلیفە، خەلیفەش هۆکاری ئەمەی لێپرسی، بەهلول گوتی: زۆر بیرم کردەوە لەوەی هەژارێکی شایستە ببینمەوە پارەکەی پێ بدەم، لەتۆ هەژارترم نەبینیەوە، بۆیە

[1]) ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم- ئاوات ئەبو بەکر- ل ٩٩- ١٠٠.

پارەکەم گەڕاندەوە بۆتۆ، تۆ لەهەموو خەڵك پێویستتری چونکە دەبینم چۆن سەربازەکانو پاسەوانەکانت باجو پارە لەخەڵك وەردەگرنو دەیخەنە خەزێنەی تۆوە[1].

**٢٤١.مردووەکان باشترن لە زیندووەکان**

ڕۆژێکیان بەهلولیان بینی لە گۆڕستاندا لەتەنیشت قەبرێك دانیشتبوو، پێیان گوت: تۆ هێشتا زیندوووی بۆچی لەگەڵ مردووەکان دانیشتووی؟

گوتی: لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵك دانیشتووم تا لەگەڵیان بم لە گومراییو لەخۆبایی بوون دوور دەبم، هەرکاتێ لێیان دوور بکەومەوە پاشەملە باسم ناکەن[2].

**٢٤٢. ئەوەی زینا دەکا بێ عەقڵو نەزانە**

جارێکیان بەهلول دەچێتە چۆڵەوانیەك خەریکی خواپەرستی دەبێ ژنێك لەو چۆڵەوانیە تێدەپەڕێ چاوی بە بەهلول دەکەوێت بانگی دەکات بۆ کاری خراپ، بەهلول گوتی: کێشی (وەزن)ی دەستەکانی من چەندە؟ کێشی پێیەکانم چەندە؟ کێشی هەموو ئەندامەکانی لەشی لێ پرسی، پاشان گوتی: کام مرۆڤی عاقڵ لەبەر چێژی ئەندامێکی بچووکی تەواوی ئەندامەکانی تری لە دۆزەخ بسووتێنێ[3].

**٢٤٣.ماڵی بەرپرسان هی خەڵکە**

ڕۆژێك هارونە ڕەشید فەرمان دەکات دیارییەك بدەن بە بەهلول، دارو دەستەکەشی دیارییەکەیان پێدا، بەڵام بەهلول ئامادە نەبوو وەریگرێ، پێی گوتن: ئەو دیارییە بدەن بە کەسانێك کە لێتان وەرگرتوە، ئەگەرنا ڕۆژێك دێ داوا لە خەلیفە دەکرێ ئەو ماڵە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی لەو ڕۆژەدا خەلیفە هیچی نییە بیدات، هارونە ڕەشید بەم وتەیەی بەهلول دەستی کرد بەگریانو گوتی: بەهلول ڕاست دەکات[4].

---

[1]) بەسەرهارتە شیرینو پەند ئامێزەکان- ل ٣٠- ٣١.

[2]) هەمان سەرچاوە ل ٩٧.

[3]) هەمان سەرچاوە ل ٩١- ٩٢.

[4]) هەمان سەرچاوە ل ٥٧- ٥٨.

## ٢٤٤. خوا کچێکی عاقڵت بداتیّ باشترە لە کوڕێکی شێت

ئەمیری کوفە ئیسحاقی کوڕی موحەممەد ژنەکەی سك پڕ بوو پاشان کچێکی بوو، ئەمیر لەم ڕووداوە زۆر غەمبارو غەمگین بوو، خۆی لەخواردنو خواردنەوە گرتەوە هەر لەخەفەتی ئەوەی کچێکی بووە، بەهلول ئەمەی بیست چوو بۆلای، گوتی: ئەی ئەمیر ئەو خەمبارییەت لە چییە؟

ئەمیر گوتی: من ئارەزووی منداڵێکی کوڕم دەکرد کەچی خێزانەکەم کچێکی بوو، بەهلول گوتی: حەزت دەکرد پێت خۆشبوو لەجیاتی ئەو کچە کوڕێکی شێتی وەك منی پێدابای؟ ئەمیر دەستی کرد بە پێکەنین سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەو کچەی کە پێیداوە[1].

## ٢٤٥. بەرپرسان پرسیاریان لێدەکریّ لەسەر بەرپرسیارێتییەکەیان

ڕۆژیّ بەهلول چووە کۆشکی هاروونە ڕەشید، لەو کاتەدا شوێنەکەی هارونە ڕەشید چۆڵ بوو بۆیە بیّ ترس لەشوێنەکەی دانیشت، کاتێك پاسەوانە تایبەتییەکان ئەمەیان بینی بەخێرایی بەهلولیان لەسەر کورسی هارونە ڕەشید هێنایە خوارەوە، بەهلول دەستی کرد بەگریان، لەو کاتەدا هارونە ڕەشید بەژووریّ کەوت بینی بەهلول دەگری، پاسەوانەکان بابەتەکەیان بۆ باس کرد، خەلیفە پاسەوانەکانی سزا دا، دڵی بەهلولی دایەوە، بەهلول گوتی: ئەی خەلیفە من بۆ حاڵی تۆ دەگریم نەك بۆ حاڵی خۆم، من کەمێك لەشوێنی تۆ دانیشتم ئەو ئەزیەتو ئازارەم بینی، ئەی تۆ چی تەواوی ژیانت لەسەر ئەو کورسییەی دەستەڵاتیت؟

دەبیّ لەڕۆژی دوایی چەندە ئازارت بدەن ئەی خەلیفە ئەو هەموو تەمەنەت لەسەر ئەم کورسییە بردۆتە سەر؟[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ٣٤- ٣٥.

[2]) هەمان سەرچاوە ل ٨- ٩.

## ٢٤٦. ئادابەکانی قسەکردنو نووستنو خوارن

دەگێڕنەوە شێخ جونەیدی بەغدادی بەمەبەستی تۆزێك گەڕان لەشاری بەغدا چووە دەرەوە قوتابییەکانی لەپشتیەوە دەڕۆیشتن، شێخ جونەید هەواڵی بەهلولی پرسی: قوتابیو موریدەکانی گوتیان: چ کارێکت بەو پیاوە شێتەیە؟

گوتی: بۆمی بانگ بکەنو بیهێنن، کارم پێیتی، گەڕان بەشوێنی بەهلول لە بیابانێك دا بینییان، نەیانتوانی بانگی بکەن، شێخ جونەید بۆخۆی دەچێتە لای بەهلول، خشتێکی ناوەتە ژێر سەریو پاڵی داوەتەوە، شێخ جونەید سەلامی لێکرد بەهلول وەڵامی سەلامەکەی دایەوەو گوتی تۆ کێی؟

شێخ گوتی: من شێخ جونەیدم، بەهلول گوتی: تۆی ئەی باوکی قاسم؟شێخ گوتی: بەڵێ، بەهلول گوتی: تۆی شێخی بەغدادی خەڵکی ئامۆژگاری دەکەی؟

شێخ جونەید گوتی: بەڵێ، بەهلول گوتی: بەهەرحاڵ پێم بڵێ چۆن نان دەخۆی؟

شێخ گوتی: (بسم الله) دەکەم لەپێش خۆمەوە دەخۆم پارووی بچووکیش دەکەم هێواش دەیجووم، سەیری پارووی خەڵکی دیکە ناکەم، لەکاتی نان خواردندا لەیادی خوا غافڵ نابم، پاشان سوپاسی خوا دەکەم، لەپێشو پاشی نان خواردنەکەش دەستەکانم دەشۆم، بەهلول کراسی شێخی گرتو گوتی: تۆ ڕێنمویی خەڵك دەکەیت کەچی هێشتا نازانی نان بخۆی، ئەو قسەیەی کردو شێخی جێهێشت، قوتابییەکانی شێخ گوتیان: ئەو پیاوە شێتە ئەی شێخ، شێخ جونەید گوتی: ئەو پیاوە شێتێکە لەکاتی خواپەرستیدا هۆشیارو عاقڵە، دەبێ قسەی ڕاستی لێ ببیسترێ، بەدوایدا ڕۆیشت گوتی: من ئیشم پێیەتی، بەهلول گەیشتە کەلاوەیەك دووبارە دانیشت، شێخ جونەید گوتی: بەهلول چ کەسێك پێتی گوتووە شێخ جونەید ئادابی نان خواردن نازانێ؟

بەهلول گوتی: ئەوە هیچ کە تۆ ئادابی نان خواردن نازانی، ئەی ئادابی قسەکردن دەزانی؟ شێخ گوتی: بەڵێ دەزانم، بەهلول گوتی: چۆن قسە دەکەی؟ شێخ گوتی: بە ئەندازە قسە دەکەم، قسەی بێهوودە ناکەم، بەو ئەندازەیە قسە دەکەم کە بەرامبەرەکەم تێم بگات،

هەروەها قسەکانم بەو ئاراستەیە کە خەڵکی بانگ کەم بۆلای خوا، هێندەش قسە ناکەم خەڵکی بێزار بکەم.

بەهلول گوتی: جگە لە ئادابی نان خواردن ئادابی قسەکردنیش نازانی، دیسان هەڵسایەوەو ڕۆیشت، قوتابییەکانی شێخ گوتیان: ئەی شێخ بینیت کە ئەو پیاوە شێتە؟ شێخ گوتی: ئێوە نازانن من ئیشم پێیەتی، دووبارە کەوتەوە شوێنی، بەهلول گوتی: تۆ چیت لەمن دەوێ تۆ ئادابی نانخوارن‌و قسەکردنت نەزانی ئایا ئادابی خەوتن دەزانی؟

شێخ جونەید گوتی: بەڵێ دەزانم، بەهلول گوتی چۆن؟ شێخ گوتی: کاتێ لەنوێژی خەوتنان بوومەوە ئارام‌و ئاسوودە دەچمە شوێنی خەوتنمەوە، پاشان هەرچی ئادابی خەوتن بوو بۆی باس کرد، بەهلول گوتی: زانیم ئادابی خەوتنیش نازانی، شێخ جونەید گوتی: ئەی بەهلول من دەزانم تۆ زۆر نزیکی لەخوا ئامۆژگارییم بکە؟

بەهلول گوتی: لەبەر ئەوەی دانت نا بە نەزانی خۆت ئامۆژگارییت دەکەم، بزانە ئەوانەی تۆ گوتت هەمووی لقێك بوون لە دارێك بەنسبەت نان خواردن ئەوانەی گوتت لقێك بوون سەرچاوەکەی بریتییە لەوەی دەبێ پارووی حەڵاڵ بەدەست بێنی ئەگەر پاروەکەت حەرام بوو هەرچی ئادابە جێبەجێی بکەی بای پوولێکی قەڵپە، شێخ جونەید گوتی: خوا خێرت بنووسێ ڕاست دەکەی، سەبارەت ئادابی قسەکردنیش یەکەم شت دەبێ نیەتت پاك بێ دڵت ساف بێ قسەکانت بۆ خوا بێ ئەگەر ئەوە نەبوو هەرچی گوتووتە جێبەجێی بکەی هیچ سوودت پێ ناگەیەنێ، لەخەوتندا ئەوانەی تۆ گوتت هەمووی لق‌و پۆپ بوون بەڵام سەرچاوەی ئادابی خەوتن ئەوەیە کە سەرت خستە سەر سەرین ڕق‌و کینەو حەسادەتت بەرامبەر هیچ کەسێك نەبێ،لەزیکرو یادی خوادا بیت تا خەوت لێدەکەوێ، شێخ جونەید بەو ئامۆژگارییانە دەستی بەهلولی ماچ کردو دوعای خێری بۆکرد قوتابییەکان سەریان سوڕما لەو گفت‌و گۆیەی نێوان شێخ‌و بەهلول[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٤- ٦٥.

**٢٤٧. موناقەشە دەربارەی شەراب**

ئەگێڕنەوە جارێك بەهلول دەچێ بۆلای یەکێ لە هاوڕێکانی دەبینێ هاوڕێکەی خەریکی شەراب خواردنەومیە، کاتێ بەهلول هاتە لای، هاوڕێکەی ویستی خۆی لەوەو بدزێتەوە کە شەراب خواردنەوە حەرامە، بۆیە پرسیاری لە بەهلول کردو گوتی: ئایا ترێ خواردن حەرامە؟ بەهلول گوتی: نەخێر ترێ خواردن حەرام نییە، هاوڕێکەی گوتی: ئەی پاش خواردنی ترێکە ئاو بخۆیەوە بەدوایدا هیچی تێدایە؟

بەهلول گوتی: نەخێر هیچی تێدا نییەو حەڵاڵە، پاشان هاوڕێکەی گوتی: ئەی دوای خواردنی ترێکەو ئاوەکە بچی لەبەر هەتاو دانیشی حەرامە؟

بەهلول گوتی: نەخێر هیچ حەرام نییە.

ئەوجارە هاوڕێکەی گوتی: هەر ئەو ئاوو ترێیە ماوەیەك لەبەر هەتاو دابنێی حەرامە؟

بەهلول گوتی: ئەگەر هەندێ خۆڵ بکەوێتە سەر سەری ئینسان هیچ زیانێکی پێدەگات؟ هاوڕێکەی گوتی: نەخێر، ئەوجارە بەهلول گوتی: هەندێ ئاو بکەیتە سەر ئەو خۆڵە هیچ زیانێك دەگەیەنێ؟ هاوڕێکەی گوتی: نەخێر، بەهلول گوتی: ئەگەر هەر ئەو ئاوو خۆڵە تێکەڵ بکرێو بکرێت بە خشت، بەسەر سەری مرۆڤەوە دابنێی زیانی پێدەگات یان نا؟ هاوڕێکەی گوتی بێگومان زیانی پێدەگات، لەوانەیە سەری بشکێنێ، بەهلول گوتی: کەواتە ئێستا تێگەیشتی هەر ئەو ئاوو ترێیە گەر تێکەڵ بکرێو لەبەر هەتاو دابنرێ ئەوە بزانە شتێکی لێ درووست دەبێ کە شەرعی خوای پێ دەبەزێنرێ، بۆیە هاوڕێکەی پەشیمان بوویەوەو دەستی هەڵگرت لەو شەراب خواردنە کە شەیتان فێڵی لێکردبوو بۆخۆی حەڵاڵی کردبوو[١].

---

[١]) هەمان سەرچاوە ل ٧١- ٧٣.

### ٢٤٨. خۆپارێزی لە ڕیا

فەزڵی کوڕی ڕەبیعە لەشاری بەغدا مزگەوتێکی دروووست کرد، کاتێ مزگەوتەکە تەواو بوو پێیان گوت: ناوەکەی چی بێ؟ بەس هەڵکۆڵینی ناوەکەی مابوو، قەدەری خوا لەو کاتەدا بەهلول لەوێ دەبێ بە فەزڵ دەڵێ: مزگەوتەکەت بۆ کێ دروووست کردووە؟

فەزڵ دەڵێ: بۆ خوا، بەهلول گوتی: ئەگەر بۆخوات دروووست کردووە ناوی خۆتی لەسەر مەنووسە، فەزڵ تووڕەبو گوتی: بۆچی ناوی خۆمی لەسەر نەنووسمو هەڵینەکۆڵم ئاخر خەڵکی دەبێ بزانن دروووستکەری ئەو مزگەوتە کێیە، بەهلول گوتی: دەی کەواتە لەسەری بنووسە دروووستکەری ئەو مزگەوتە بەهلولە، فەزڵ گوتی چۆن کاری وادەکەم، بەهلول گوتی: ئەگەر ئەو مزگەوتەت بۆ ناوبانگی خۆت دروووست کردووە ئەوە خۆت خستۆتە هیلاکەتەوە، فەزڵ لەسەرەتادا لەو قسانەی بەهلول دلگران بوو، پاشان گوتی: هەرچی بەهلول دەڵێ بینووسن، بەهلولیش گوتی: لەدەروازەی مزگەوتەکە ئایەتێك هەڵبکۆڵنو لەسەری بنووسن[1].

### ٢٤٩. تووڕەبوون

ئەگێڕنەوە کەسێکی تووڕەو توند پرسیاری لە بەهلول کرد زۆر حەز دەکەم شەیتان ببینم، بەهلول گوتی: ئەگەر ئاوێنەتان نییە لەماڵەوە بڕۆ سەیری ئاوێکی پاك بکە شەیتان دەبینی[2].

### ٢٥٠. دەتوانی لە ڕێگەی ئایەتەکانی قورئانەوە بزانی تۆ بەهەشتی یان دۆزەخی

دەگێڕنەوە هارونە ڕەشید لە بەهلولی پرسی: دواڕۆژی من چۆن دەبینی ئایا دۆزەخیم یان بەهەشتیم؟ بەهلول گوتی: لەو ئایەتەوە دەتوانی دواڕۆژی خۆت بزانی ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾﴾ الانفطار، هارونە ڕەشید گوتی: ئەی نزیکی من لەگەڵ نێردراوی خوادا سوودم پێدەگەیەنێ لەبەر ئەوەی هارون سەیید بوو بۆیە ئەو پرسیارەی

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ٢٧- ٢٨.

[2]) هەمان سەرچاوە ل ٧٧- ٧٨.

کـرد، بـەهلول گـوتی: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ المؤمنون، لـە قیامەتـدا نزیکیو خزمایـەتی هـیچ سـوودت پـێ ناگەیـەنێ ئەگـەر کـردەوەی باشت نەبێ، هارونە ڕەشید گوتی: ئـەی شـەفاعەت بـۆکردنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەهلول گوتی: کەسێ زوڵمو ستەم لـە وەچـەی پێغەمبـەر ﷺ بـەڕەوا بزانـێ شـەفاعەتو تکای بـۆ ناکرێ، هارون گوتی: چ ستەمێکم لەوەچەی نێرراوی خـوا کـردووە؟ بـەهلول گـوتی: سـتەم لـەوە گـەورەتر کـە موسای کوڕی جەعفـەرت بـەبێ هـیچ تاوانێك زینـدانی کـردووە، هـارون سەری داخستو دەستی کرد بە گریان، گوتی: ئایا ئەگەر تەوبـە بکـەم تەوبەکـەم گـیرا دەبـێ؟ بەهلول گوتی: خۆشەویستی پلەو پایـە بەشـێوەیەك تـۆی بێئاگـاو گـومڕا کـردووە کـە ئەگـەر خودی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێستا زیندووو بوایەو ئامۆژگاری کردبای دەستت هەڵنـەدەگرت لەو پلەو پایە، بەبێ مەبەست من مەعتەل مەکەو مەموەستێنە ئەمەی گوتو ڕۆیشت[1].

## ٢٥١. پرسیارێك بکە لەزانایان کە پێویستت بەوەڵامەکەیەتی

الحزنی دەڵێ گوتم: ئەوەی بتـوانێ گومـانو پرسـیارەکانی نـاو دڵـم وەڵام بداتـەوە تـەنها پێشەوا شافیعیە، بۆیە هەڵسام چووم بۆ میصر، پرسـیارم سـەبارەت بـە یەکتاپەرسـتی لێکـرد، پێشـەوا شـافیعی تـووڕە بـوو گـوتی: تـۆ دەزانـی لـەکوێی، لـە شـوێنێکی کـە خـوای تـەعالا فیرعەونی تێدا غەرق کرد، ئایـا پێـت گەیشـتووە کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی کردبـێ پرسیاری بەم شێوەیە بکرێ؟ گوتم: نەخێر، گوتی ئایا هاوەڵانی قسەیان لـەم شـتانە کـردووە؟ گوتم: نەخێر، پێی گوتم: دەزانی چەند ئەستێرە هەیە لە ئاسمان؟ گوتم نـەخێر، گـوتی: ئایـا دەزانـی هەریـەکێ لـەو ئەسـتێرانە چـۆن هەڵـدێو چـۆن ئـاوا دەبـێ؟ گـوتم نـەخێر، گـوتی کەواتە: شتێك کە لەبوونەوەردا بەچاوی خۆت دەیبـینی نایناسیو نـازانی چۆنە، ئـەی چـۆن پرسـیار لـە خاوەنەکـەیو درووسـتکەرەکەی دەکـەی؟ پاشـان پێشـەوا شـافیعی پرسـیارێکی لێکردم سەبارەت بەدەست نوێژ، منیش وەڵامم دایەوە بەڵام وەڵامەکەم هەڵەبوو، پێـی گـوتم: شتێك کە لەڕۆژێکدا پێنج جار ئیشت پێی دەبێ نـایزانیو پرسـیاری لـەبارەوە ناکـەی، کەچـی پرسیار لە زانستی خوا دەکـەی، ئامۆژگـاری کـردم بـەوەی کـە ئەگـەر تووشـی وەسوەسـە هـاتم

[1]) هەمان سەرچاوە ل ٩٤- ٩٥.

بگەڕێمەوە لای خواو بۆ لای ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾ البقرة، پێی گوتم لە ڕێگەی بوونەوەرەوە خوا بناسە، بەدوای شتێك مەگەڕێ کە عەقڵت پێیدا ناشکێ‌و لە سنووری عەقڵی ئینسان بەدەر بێ، ئەمەش وای لێکردم تەوبە بکەم‌و چیدیکە پرسیار لە شتێك نەکەم کە سوودی لێ نەبینم[1].

### ٢٥٢. خۆشەویستی ئافرەتێك بۆ کەعبە

عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی ڕەواد دەڵێ: کۆمەڵێك لە پیاوەکانی حەججاج چوون بۆ سەفەری حەج، ئافرەتێکی لەخوا ترسیان لەگەڵ بوو، لە ڕێگادا هەر پرسیاری دەکرد کوا ماڵی خوا؟ کە نزیك کەعبە بوونەوە پێیان گوت: ئەمە ماڵی خوایە، ئافرەتەکە خۆی بۆ نەگیراو بەڕاکردن ڕای کرد، هەر دەیگوت: ماڵی خوای من ماڵی خوای من، عەبدولعەزیز دەڵێ: سوێند بەخوا بینیم نێوچەوانی لەسەر دیواری کەعبە دانا هەڵی نەگرت تا گیانی دەرچوو[2].

### ٢٥٣. وتووێژی مالیکی کوڕی دینار لەگەڵ دوو کەسی ڕێگر

مەنیع دەڵێ: بازرگانێکی دەوڵەمەند بەکەشتیەکەوە تێدەپەڕی، لەو کاتەدا دوو ڕێگر کەشتیەکەیان لێ داگیر کرد، بازرگانەکە چووە لای مالیکی کوڕی دینار باسی ئەو دوو ڕێگرەی بۆ کرد، مالیك هەڵسا لەگەڵ کابرای بازرگان چوو بۆ لای ئەو دوو ڕێگرە، ڕێگرەکان کە چاویان بە مالیکی کوڕی دینار کەوت گوتیان: ئەی باوکی یەحیا بۆچی تۆ هاتی هەواڵت بداباین خۆمان دەهاتین، چ کارێکت هەیە؟

---

[1]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن ل ٢٢٥.

[2]) هەمان سەرچاوە ل ٢٢٨.

مالیك گوتی: كەشتیەكەی ئەو پیاوە بدەنەوە، ڕێگرەكان گوتیان: باشە، ڕێگرەكان گۆزەیەكیان لای خۆیان دانابو، ئەو پارانەیان تێدەكرد كە لەخەڵكیان وەردەگرت، بە مالیكیان گوت: دوعامان بۆبكە، مالیك گوتی: با گۆزەكەتان دوعاتان بۆ بكا، من چۆن دوعاتان بۆبكەم لە كاتێكدا هەزاران كەس دوعاتان لێ دەكات، چۆن دەگونجێ دوعای هەزاران كەس قەبووڵ نەبێ لەبەر دوعای یەك كەس[1].

## ٢٥٤. باوەڕی مسوڵمان دەبێ وابێ

جارێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری ئیبن و عەبباس دەكات كە ئەو كات مێرد مندالێك بووە پێی دەفەرموێ: {يَا غُلامُ إِنِّي مُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظْ اللهَ يَحْفَظْكَ احْفَظْ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ وَإِذَا سَأَلْتَ فَأَسْأَلِ اللهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ رُفِعَتْ الأَقْلامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ}[2]

واتە: ئەی غولام با چەند وشەیەكت فێر بكەم، خوا بپارێزە (سنوورەكانی خوا بپارێزە) خواش تۆ دەپارێزێ، سنوورەكانی خوا بپارێزە خودا فریات دەكەوێ، كە داوات كرد تەنها لەو داوا بكە، ئەگەر یارمەتیو كۆمەكیشت ویست تەنها داوای یارمەتیو كۆمەك لەو بكەو تەنها پشت بەو ببەستە، بزانە، ئەگەر هەموو ئوممەت كۆببنەوە لەسەر ئەوەی بیانەوێ سوودێكت پێ بگەیەنن ناتوانن ئەو سوودەت پێ بگەیەنن، مەگەر خوا بۆتی نووسیبێ، ئەگەر بە پێچەوانەوە هەموویان كۆ ببنەوە لەسەر ئەوەی بیانەوێ زیانێكت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر خوا بۆتی نووسیبێ، تازە قەڵەمەكان هەڵگیرانەو مەرەكەبەكەش وشك بۆتەوە (واتە: هەموو شتێك دیاری كراوە لەلایەن خواوە، كۆتایی پێ هاتووە)[3].

---

[1]) ألف قصة وقصة ج٢ ص ٣١٥.

[2]) رواه أحمد في مسنده ١/ ٢٩٣، ٣٠٧.

[3]) مێرگەكانی باوەڕ لا ٢٣١- ٢٣٢.

## ٢٥٥. ئەدەبی پێشەوا مالیك بەرامبەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ

هەرکاتێ پێشەوا مالیك فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ خەڵك باس کردبا، لەسەرەتادا دەستنوێژی دەگرت ئنجا زۆر بەئەدەبەوە دادەنیشت بۆ گێڕانەوەی فەرموودەکان، لێیان دەپرسی بۆچی هەر کات باسی فەرموودەکانی خۆشەویست بکەی دەست نوێژ هەڵدەگری؟ دەیگوت: وەکو ڕێزێك بۆ فەرمایشتەکانی ئەو سەروەرە نامەوێ بێ دەستنوێژ باسی ئەو فەرمایشتانە بکەم، زۆری پێناخۆش بوو لەسەر ڕێگا یاخود بە پێوە یاخود بەپەلە فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویست بۆ خەڵکی بڵێ، لەناو شاری مەدینە هەرگیز سواری وولاخ نەدەبو دەیگوت: حەزناکەم لەسەر پشتی وڵاخ بەخاکێکدا گوزەر بکەم کە لاشەی موبارەکی پێغەمبەری خوای ﷺ تیادا نێژراوە[1].

## ٢٥٦. ڕێزنان لە ڕۆژی عاشوڕادا

دەڵێن دادوەریەك هەبو ڕۆژێك پیاوێکی هەژار هاتە لای ڕۆژەکە ڕۆژی عاشوڕابوو، پیاوە هەژارەکە گوتی: خوا پلەی دادوەر بەرز بکاتەوە من پیاوێکی هەژارم هاتوومەتە لات تا یارمەتیم بدەی، لەبەر خاتری ئەو ڕۆژە هەندێ ئاردو گۆشتو دوو درهەمم بدەیتێ، دادوەر پێی گوت: باشە نیوەڕۆ وەرەوە، کە نیوەرشۆ کابرای هەژار چوویەوە لای دادوەر گوتی: عەسر وەرەوە، عەسریش هاتەوە بەڵام دادوەر هیچی پێنەدا، کابرا بەدڵ شکاوی گەڕایەوە، بەلای پیاوێکی گاور تێپەڕی کە لەبەر دەرگای ماڵی خۆی دانیشتبوو، بەپیاوە گاورەکەی گوت: لەبەر خاتری ئەو ڕۆژە هەندێ یارمەتیم بدە، پیاوە گاورەکە گوتی: بۆ ئەو ڕۆژە چییە؟

کابرای هەژار گوتی: ڕۆژی عاشوڕایە، کابرای گاور گوتی: چیت دەوێ؟ گوتی: هەندێك ئاردو گۆشتو دوو درهەم، کابرای گاور گوتی: ها بگرە ئەوەی داوات کرد هەموو مانگ وەرە لەبەر خاتری گەورەیی ئەو ڕۆژە پێت دەدەم، کە شەو داهات دادوەر لەخەودا بینی دوو کۆشکی بەرز یەکیان لەزێڕ ئەوی تریان لەزیو لەبەردەمیدایە، دادوەر گوتی: خوایە ئەمە بۆ کێیە؟ پێیان گوت: ئەمە بۆتۆبوو ئەگەر یارمەتی ئەو هەژارەت بدابا، بەڵام ئێستا درا بە

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٣٣.

کابرایەکی گاور چونکە ڕێزی لەم ڕۆژەو درووشمەکانی ئیسلام گرت، کە بەیانی بوویەوە چوو بۆلای کابرای گاور پێی گوت: دوێنێ چ چاکەیەکت کردووە؟

پیاوە گاورەکە بۆی گێڕایەوە کە چی کردووە، دادوەر گوتی: بێنە ئەو چاکەیەی خۆت بفرۆشە بەمن بەسەد هەزار درهەم، کابرای گاور گوتی: هەرشتێ لای خوا وەرگیرێ من نایفرۆشم ئەگەر بەقەد زەوی زێڕم پێ بدەی، ئایا بەخیلیم پێ دەبەی لەبەر ئەو دوو کۆشکە؟ دادوەر گوتی: بۆچی تۆ مسوڵمان بوویت؟ کابرای گاور گوتی بەڵێ: {أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله}[١].

## ٢٥٧. هۆکاری جوان بوونی ئافرەتی مسوڵمان

پرسیاریان کرد لە ئافرەتێکی مسوڵمان تۆ بەچی خۆت جوان دەکەیت؟ ئافرەتەکە گوتی: ئافرەتی مسوڵمان دەبێ لێوەکانی بە ڕاستگۆیی جوان بکات، دەنگی بە قورئان خوێندن جوان بکات، چاوەکانی بەبەزەیی هاتنەوە، دەستەکانی بە چاکەکاری، هەروەها بۆ بەهێزی لاشەی ئیستیقامەو بەردەوامی لەسەر دینداریی، دڵیشی بە نیازپاکی بۆخوا جوان بکات[٢].

## ٢٥٨. هۆکاری بەرەکەتی ماڵ و سامان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: پیاوێك لە شوێنێکی چۆڵ دەڕۆیشت، لەناکاو لەئاسمان گوێی لەدەنگێك بوو لەناو پەڵە هەورێکی ڕەش دەیگوت: بڕۆ لەناو باخچەی فلان کەس بباری و ئاوی بدە، هەورەکەش نزم بوویەوە لەسەر پارچە زەوییەك باری، پیاوەکەش بەدوای ئاوەکە ڕۆشت تا بزانێ دەچێ بۆ زەوی چ کەسێ؟ بینی پیاوێك خۆی و خاکەناسەکەی وەستاوە ئاوەکە وەردەگێڕێتە سەر نەمامەکانی، پیاوەکەش پرسیاری لەخاوەن باخەکە کرد ناوت چییە؟

---

[١]) هەمان سەرچاوە ل ٢٣٨- ٢٣٩.

[٢]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ل ٢٤٩.

باخەوانەکە هەمان ئەو ناوەی پێگوت کە لەناو هەورەکە بیستبووی، کابرای باخەوان بە کابرای تری گوت: بۆچی لەناوەکەم دەپرسی: کابراش مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە، پاشان لە باخەوانەکەی پرسی تۆ چۆن مامەڵە لەگەڵ باخەکەت دەکەی؟

باخەوانەکە گوتی: لەبەر ئەو مەسەلەیەی کە بۆت باس کردم وەرە با پێت بڵێم من بەرهەمی بەروبومی باخەکەم دەکەم بە سێ بەش، بەشێکی دەکەم بەخێرو دابەشی دەکەم،بەشێکی دەکەمە خەرجی باخەکەم، بەشی سێیەمیشی خۆمو ماڵباتم لێی دەخۆین[1].

### ٢٥٩. جیاوازی نێوان خۆبەزل زانینو خاکی بوون

پیاوێك بەشوێنێکدا تێدەپەڕێ ئاسەواری دەوڵەمەندیو پیاوماقووڵی بەجلو بەرگو قەدو قیافەیەوە دیار دەبێ، بەشێوازێك دەڕۆیشت کە لەخۆبایی بوونو خۆبەزل زانینی پێوە دیار بوو، پێغەمبەر ﷺو پیاوێکی در ئەو پیاوە دەبینن، پێغەمبەر ﷺ بەپیاوەکە دەفەرمووێ: ڕات چییە بەرامبەر ئەو پیاوە؟ کابرا گوتی: ئەو کابرایە لە پیاو ماقووڵانە وە بۆ هەر خوازبێنییەك بڕوا ڕەت ناکرێتەوە، هەر تکایەکیش بۆ کەسێك بکات تکاکەی وەردەگیرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو، پاشان پیاوێکی تر بەوێدا تێپەڕی، بەمل کەچی بەرێدا دەڕۆیشت ئاسەواری هەژاری پێوە دیار بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بەرامبەر بەو پیاوە ڕات چییە؟

کابرا گوتی: ئەوە یەکێکە لە هەژارەکان، بێ دەستەڵاتەو بۆ هەر خوازبێنییەك بڕوا ڕەت دەکرێتەوە، هەر تکایەکیش بکات بۆ هەر کەسێك لێی وەرناگیرێ، لەپێش چاوان نییە، ئەگەر قسە بکات بۆ خەڵك کەس گوێی لێ ناگرێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو پیاوە هێندەی زەوی باشترە لە پیاوەکەی یەکەم[2].

---

[1]) ئەم بەسەرهاتە پێشەوا موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە.

[2]) پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا ئەم بەسەرهاتەی هێناوە.

### ٢٦٠. وەفایەك لە هەڵوێستە پڕ وەفادارەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ

پادشای حەبەشە نەجاشی پیاوێكی خاوەن ڕێز بووە بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو كاتەی كە مسوڵمانان بە فەرمانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ كۆچیان كرد بۆ لای ئەو لە وڵاتی حەبەشە، نەجاشی بەو پەڕی ڕێزو تەقدیرەوە لەلای خۆی هێشتنیەوە، دڵنیای كردن كە ناهێڵێ كەس دەست درێژییان بكاتە سەر، كاتێك كە ئەو پیاوە وەفات دەكات پێغەمبەری خوا ﷺ وەكو وەفایەك بۆ هەڵوێستە جوامێرانەكەی نەجاشی هەر لە شوێنی خۆیەوە نوێژی جەنازەی بەشێوەی غائیب لەسەر دەكات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە ئەو هەڵوێستانەی نەجاشی لەبەر چاو بوو، دەڵێن ڕۆژێك وەفدێكی لای نەجاشی دێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەریان هەڵدەستێ‌و خۆی خزمەتیان دەكات، هاوەڵانی دەڵێن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ دانیشە ئێمە خۆمان خزمەتیان دەكەین، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوان ڕێزیان لە هاوەڵانی من گرت، منیش حەز دەكەم ڕێزیان لێگرم[1].

### ٢٦١. هەڵوێستی زانایان بەرامبەر بەو كەسانەی كە غەیبەتیان دەكەن

پیاوێك بە شێخ حەسەنی بەصری گوت: فلانە كەس بە خراپە باسی كردویت‌و غەیبەتی كردووی، شێخ حەسەنیش هەڵدەستێ یەك تەبەقە حەڵوا بۆ ئەو پیاوە دەبات كە غەیبەتی كردووە، كابرای غەیبەتكەر بە شێخ حەسەنی گوت: ئەم حەڵوایە بەبۆنەی چییە؟ حەسەنی بەصریش گوتی: هەواڵم پێگەیشتووە كە جەنابت چاكەكانی خۆت بەدیاری بۆم ناردووە، منیش دەمەوێ وەكو وەفاداریەك تۆڵەت بۆ بكەمەوە[2].

### ٢٦٢. سەرگوزەشتەی پێشەوا شافیعی لەگەڵ ناحەزانی

دەگێڕنەوە هەندێ زانای خەڵكی عێراق زۆر ڕقیان لە پێشەوا شافیعی دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی لە زانست‌و خواپەرستیدا لەسەرەوەی وانەوە بوو دەیانویست فێڵ‌و تەڵەكەی بەرامبەر بكەن، بڕیاریان دا بە ئامادەبوونی خەلیفە هارونە ڕەشید چەند پرسیارێكی

---

[1]) پێشەوا ئەبو داود ئەم بەسەرهاتەی لە سونەنەكەی خۆیدا هێناوە.

[2]) مواقف وعبَر ص ٢٧١.

زەحمەت لە پێشەوا شافیعی بکەن بەبەر چاوی خەڵکەوە، بە ئومێدی ئەوەی پرسیارەکان نەزانێ‌و لەبەر چاوی ئەو خەڵکە بکەوێ، هارونە ڕەشیدی خەلیفەش هەتا بڵێی پێشەوا شافیعی خۆش دەویست، زۆر ڕێزی لێدەگرت، زاناکان گوتیان ئێمە ئەو پرسیارانە ئاراستەی شافیعی دەکەین بەمەرجێ تۆش ئامادە بی، پێشەوا شافیعیش هاتە بەرامبەریان ئامادەیی خۆی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی وان دەربڕی، پرسیارەکان ئەمانە بوون:

پرسیاری یەکەم گوتیان: پیاوێك لە ماڵەکەیدا مەڕێك سەردەبڕێ، پاشان دەڕواتە دەرەوەی ماڵەوە بۆ کارێکی پێویست، کە گەڕایەوە بە خێزان‌و منداڵەکانی گوت: ئێوە ئەو گۆشتە بخۆن لەسەر من حەرامە، خانەوادەکەشی دەڵێن لەسەر ئێمەش هەر حەرامە، ئەمە چۆنە؟

پێشەوا شافیعی وەڵامەکەیان دەداتەوە دەڵێ: پیاوەکە کافرە، ئەم مەڕەی لەسەر ناوی بت‌و صەنەم، کە دەڕواتە دەر لەدەرەوە مسوڵمان دەبێ، کە دەگەڕێتەوە ماڵەوە دەڵێ ئەو گۆشتە لەسەر من حەرامە، خانەوادەکەشی مسوڵمانن کەواتە لەسەر ئەوانیش حەرام دەبێ.

پرسیاری دووەم دەڵێن: دوو مسوڵمانی عاقڵ شەراب دەخۆنەوە، یەکێکیان دارکاری دەکرێ ئەوی تریان دارکاری ناکرێ ئەمە چۆنە؟

پێشەوا شافیعی وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: یەکێك لەو دوو مسوڵمانە بڵوغی بووەو تەکلیفی شەرعی کەوتۆتە سەر، ئەوی تریان بڵوغی نەبووەو منداڵە بۆیە حەددی لێ دەرناکرێ.

پرسیاری سێیەم دەڵێن: پێنج پیاو زینایان لەگەڵ ئافرەتێك کرد، لەسەر پیاوی یەکەمیان کوشتن واجب بوو، لەسەر هی دووەمیان ڕەجم واجب بوو، لەسەر هی سێیەمیان دارکاری کردن واجب بوو، لەسەر هی چوارەمیان نیو دارکاری، لەسەر هی پێنجەمیان هیچی لەسەر نییە، ئەمە چۆنە؟

پێشەوا شافیعی وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: پیاوی یەکەم زینا بە حەلاڵ دەزانێ، بۆیە لەبەر ئەو هەڵوێستەی بە کەسێکی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام دادەنرێ بۆیە دەکوژرێ، هی دووەمیان لەبەر ئەوەی هاوسەردارەو زینای کردووە بۆیە دەبێ ڕەجم بکرێ، پیاوی

سێیەمیان ژنی نەهێناوە بۆیە دارکاری دەکرێ، هی چوارەمیشیان لەبەر ئەوەی کۆیلەیە (عەبد)ە نیو دارکاری دەکرێ، هی پێنجەمیشیان لەبەر ئەوەی عەقڵی نییەو شێتە، بۆیە هیچی لێناکرێ.

پرسیاری چوارەمی لێدەکەنو دەڵێن: پیاوێك نوێژ ئەنجام دەدات کە سەلامی لای ڕاست دەداتەوە تەڵاقی خێزانەکەی دەکەوێ، کەسەلامی چەپە دەداتەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، کەسەیری ئاسمان دەکات واجب دەبێ لەسەری هەزار درهەم بدات، ئەمەیان چۆنە؟

پێشەوا شافیعی وەڵامی پرسیارەکەیان دەداتەوەو دەڵێ: ئەو پیاوە کە سەلامی لای ڕاستە دەداتەوە پیاوێك دەبینێ کە پێشتر ئەو پیاوە خێزانەکەی ئەوی مارە کردووە، واتە مێردی یەکەمی خێزانەکەیتی، کە ئەمیشی بینی ئەوە تەڵاقی لێدەکەوێ، کە سەلامی لای چەپەی دایەوە شتێکی پیسی بینی بەلاشەیەوە بۆیە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، کەسەیری ئاسمان دەکات مانگ دەبینێ بۆی دەردەکەوێ سەری مانگەو قەرزاریشە دەبێ قەرزەکەی بداتەوە کە هەزار درهەمە.

پرسیاری پێنجەمی لێدەکەنو دەڵێن: ئیمامێك نوێژ بۆ خەڵکی دەکات لە مزگەوت چوار کەسی لەگەڵدایە، پیاوێك دێتە ژوورەوە لای ڕاستی ئیمام دەست بەنوێژ کردن دەکا، کە ئیمامەکە سەلامی لای ڕاستەی دایەوە پیاوەکەی بینی، بەم هۆیەوە کوشتن لەسەر ئەو ئیمامە واجب دەبێ، دارکاریی کردنیش لەسەر چوار کەسەکەی دی واجب دەبێ، هەروا واجب دەبێ کە مزگەوتەکە بڕوخێنرێ، ئەمە چۆنە؟

پێشەوا شافیعی وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: ئەو پیاوەی کە هاتە ناو مزگەوت ژنێکی هەیە، ژنەکەی خۆی جێهێشتووەو لەسەفەردایە، کە هاتووە بۆ ئەم سەفەرەی ژنەکەی خۆی لەماڵی برای ئیمامەکە جێهێشتووە، ژنەکە برای ئیمامەکەی کوشتووە، بۆیە گوتوویانە ئەو ژنە خێزانی کوژراوەکەیە ئیمامەکەش ژنەکە لەخۆی مارە دەکات، ئەم چوار نوێژ خوێنانەش شاهێدیان بۆ داوە، مزگەوتەکەش ماڵی کابرای کوژراوە ئیمامەکە کردوویەتی بە مزگەوت، بۆیە دەبێ بڕوخێنرێ.

پرسیاری شەشەمیان ئەوەبوو گوتیان: چ دەڵێی بەرامبەر بە خزمەتکارێکی کۆیلە کە رابکات لەدەست گەورەکەی، دوایی گەورەکەی بڵێ: ئەگەر تا نان دەخۆم نەیدۆزمەوە ئەوە ئەو خزمەتکارەم ئازاد بێ، ئەو تێکەو لێکە چۆن لێك دەدەیەوە؟

وەڵامەکەی: خزمەتکارەکە بە دیاریی دەداتە یەکێك لە منداڵەکانی خۆی ئنجا نان دەخوات، پاشان لێی وەردەگرێتەوە.

پرسیاری حەوتەم: دوو ژن گەیشتن بە دوو منداڵ ژنەکان گوتیان: سەلامتان لێبێ ئەی کوڕەکانمان ئەی مێردەکانمان ئەی کوڕی مێردەکانمان، ئەمە چۆنە؟

پێشەوا شافیعی وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێ: دوو منداڵ کوڕی دوو ژن بوون، هەریەکێ لەو دوو ژنە خۆیان مارە بریوە لە کوڕی ئەوی تر کەواتە: هەر دوو منداڵەکە هەم کوڕیانن‌و هەم مێردیانن‌و کوڕی مێردیانن.

پرسیاری هەشتەمی لێدەکەن‌و دەڵێن: پیاوێك پیاڵەیەك ئاوی هێنا بۆ ئەوەی بیخواتەوە، نیوەی ئاوەکەی خواردەوە حەڵاڵ بوو نیوەکەی تریشی حەرام بوو، ئەمە چۆنە؟

پێشەوا شافیعی وەڵامیان دەداتەوەو بەم شێوەیە: ئەم پیاوە نیوەی ئاوەکەی بە پاکی خواردۆتەوە، بۆیە ئەمەیان حەڵاڵە، لەئاوی نیوەکەی تریشی خوێن لە لووتی هاتووە کەوتۆتە نێو ئاوەکەی کە ماوەتەوە، بۆیە ئەو نیوەی لەسەر حەرام دەبێ.

پرسیاری نۆیەم: پیاوێك کیسەیەکی پڕ دەدات بە خێزانەکەی سەری کیسەکە بەسترابوو بە خێزانەکەی گوت: دەبێ بەتاڵی بکەیت بەمەرجێ سەری کیسەکە نەکەیتەوە مۆرەکەی نەشکێنی، بەهیچ شێوەیەك کیسەکە نەدڕێنی، ئەگەر هەریەکێ لەمانە بکەی ئەوە تەڵاقم کەوتبێ ئەمەیان چۆنە؟

وەڵام: ئەو کیسەیە پڕە لە شەکر یان لەخوێ، ژنەکە دەتوانێ کیسەکە لەناو ئاودا بنێ تا دەتوێتەوە، ئەو کاتە تەڵاقی ناکەوێ.

پرسیاری دەیەم: ژنو پیاوێك دوو منداڵیان بینی لە ڕێگادا هەردوکیانیان ماچ کردن، کە لێیان پرسین پیاوەکە گوتی: باوکم باپیری هەردووکیانە، برام مامیانە، خێزانیشم ژنی باوکیانە ژنەکەش گوتی: دایکم داپیریان خوشکم پووریانە، ئەمە چۆنە؟

وەڵام: ئەو پیاوە باوکی منداڵەکانە ژنەکەش دایکیانە!.

پرسیاری یانزەم: دوو پیاو لەسەربانی ماڵێك بوون یەکیان کەتە خوارەوەو مرد، ژنی مردووەکە لەسەر پیاوەکەی تریان حەڕام بوو.

وەڵام: ئەوەی کە کەتو خوارەوەو مرد ئەوە کچی خۆی مارە کردبوو لە خزمەتکارێکی خۆی، کە پیاوەکە مرد، کچەکەی دەبێتە موڵکی ئەو کۆیلەیە کە مێردی بوو، بەم شێوەیە خێزانەکەی لە پیاوەکەی تر حەڕام دەبێ.

لێرەدا هارونە ڕەشید نەیتوانی ئەو ئازایەتییەی پێشەوا شافیعی لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە بشارێتەوە، پێی گوت: ئەی کوڕی عەبدولمەناف بەڕاستی ڕوونت کردەوەو وەڵامی تەواوت دانەوە زۆر مەدحی پێشەوا شافیعی کرد، پێشەوا شافیعی لەبەرامبەردا گوتی: خوا تەمەنی ئەمیری ئیمانداران درێژ بکات بەڵام ئەگەر ئێوە مۆڵەت بفەرموون منیش پرسیارێك ئاڕاستەی ئەو زانایانە دەکەم، ئەگەر زانیان سوپاس بۆخوا ئەگەر نەشیانزانی داوا لە ئەمیری ئیماندارن دەکەم ڕزگارم بکات لە شەڕی ئەوان، هارون گوتی: فەرموو پرسیاریان لێ بکە.

پێشەوا شافیعی گوتی: پیاوێك مردووە شەش سەد درهەمی لەدوای خۆی جێهێشتووە، خوشکەکەی هیچی لەم میراتە بەرناکەوێ، تەنها یەك درهەم نەبێ، ئەم دابەش کردنە چۆنە؟

زاناکان سەیری یەکتریان کرد خۆیان هێناو برد نەیانتوانی وەڵام بدەنەوە، لەبەرامبەر خەلیفەدا ئارەقەیان کرد.

خەلیفەش گوتی بۆ بێدەنگ بوون وەڵام بدەنەوە؟

پاشان ڕووی کردە پێشەوا شافیعی گوتی: ئەی شافیعی خۆت وەڵام بدەوەو پێیان بڵێ کە چۆنە؟

پێشەوا شافیعی گوتی: ئەو پیاوە مردووە دوو کچی هەیە، لەگەڵ دایکێکو خێزانەکەی هەروەها دوانزە برای هەیە، لەگەڵ یەك خوشك، دوو کچەکە دوو لەسەر سێی میراتەکە دەبەن، دەکاتە ٤٠٠ درهەم، دایکەکەی یەك لەسەر شەش دەبا دەکاتە سەد درهەم، خێزانەکەی یەك لەسەر هەشت دەبا دەکاتە ٧٥ درهەم، دوانزە براکەشی ٢٤ درهەم دەبەن، تەنها یەك درهەم دەمێنێ ئەویشیان بەشی خوشکەکەیەتی، هارونە ڕەشید دەستی کرد بە پێکەنینو گوتی: یاخوە نموونەی تۆ هەر زۆر بێ، ٢٠٠ درهەمی بەخشییە شافیعی، پێشەوا شافیعیش هەمووی دابەش کردە سەر خزمەتکارەکانی کۆشكو هەژاران[1].

### ٢٦٣. نرخی مرۆڤـــ حەیاو شەرمەکەیەتی

لەسەردەمی عوسمانیەکان لەناو شاردا وەك بنکەی ئاسایشی ئێستا شەوانە جەندرمە کە وەك پۆلیسی ئێستا وابوون دەردەچوون، بۆ پاراستنی ئاسایشی ناو شار، شەوێکی زستانی ساڵی (١٩١٣) سەرۆکی جەندرمەکان لەگەڵ چەند جەندرمەیەك بەناو شاردا دەگەڕان، بەلای ماڵێکدا تێپەڕین گوێیان لە دەنگی ئافرەتێك بوو لای لایەی بۆ منداڵەکەی دەکرد، فەترەیەك گوێ بۆ ئافرەتەکە دەگرن دەنگەکەیان زۆر لەلا غەریب دەبێ، بۆیە سەرۆکی جەندرمەکان دەڵێ:

بەیانی ئەو ئافرەتەم بۆ بهێننە بنکە، بەیانی ئافرەتەکە دەهێنن لەبەردەم سەرۆکی جەندرمەکان ڕای دەگرن، ئەویش پرسیار لە ئافرەتەکە دەکاتو پێی دەڵێ: پیاوەکەت چ کارەیە؟

ئافرەتەکە دەڵێ: من پیاوم نەماوە.

سەرۆکی جەندرمەکان دەڵێ: چەند منداڵت هەیە؟

ئافرەتەکە: تەنها یەك منداڵ وە زۆریشم خۆش دەوێ.

---

[1]) مأة قصة وقصة ص ٤١.

سەرۆکی جەندرمەکان: ئیمشەو گوێمان لەدەنگت بوو لایە لایەیەکی زۆر خۆشت بۆ ئەو منداڵە دەکرد، ئافرەتەکە بە زەردەخەنەیەکەوە سەری داخستو بێدەنگ بوو.

سەرۆکی جەندرمەکان: دەزانی ئێمە بۆچیمان بانگ کردووی؟

ئافرەتەکە: نەخێر.

سەرۆکی جەندرمەکان: ئەمانەوێت جارێکی تر گوێمان لەو دەنگە خۆشەت بێ.

ئافرەتەکە: ناتوانم.

سەرۆك: ناتوانی بێفەرمانی من بکەی.

ئافرەت: ناتوانم بیلێم.

سەرۆك: لەبەرامبەردا دوو لیرەت پێ دەدەم.

ئافرەت: ناتوانم.

سەرۆك: بۆت دەکەمە سێ لیرە.

ئافرەت: ناتوانم.

سەرۆك: پێت دەڵێم کەللە ڕەقیم لەگەڵ مەکە، بۆت دەکەم بە شەش لیرە.

ئافرەت: ئاخر قوربان ڕووم نایەت حەیا دەکەم لەبەرامبەر ئێوە.

سەرۆك: قەیناکە بڕۆ ئەو دیوی ئەم پەردەیەوە لەوێ ئێمەت لێ دیار نییە بۆمان بڵێ.

ئافرەت: ئاخر لەوێش هەر شەرم دەکەم.

سەرۆك: ئادەی کوڕینە ئەو پەردەی بۆ هەڵدەنەوە با بچێتە ئەو دیو بۆمان بڵێ، ئافرەتەکەش چووە ئەو دیو پەردەکەوە بەشەرمێکەوە، پەردەکە تەواو نەگەیشتبووە زەوی پێیەکانی ئافرەتەکە دیار بوون، لەوێ بۆی گوتن، لەو کاتەی کە ئافرەتەکە لایە لایەکەی بۆ دەگوتن، سەرۆکی جەندرمەکان بە ئاماژەیەك بە هاوڕێکانی گوت: سەیری لای قاچەکانی بکەن، کە سەیریان کرد بینیان لە شەرمان زەنگوڵ زەنگوڵ ئارەق لەدەموچاویەوە دەتکایە

سەر زەوی ، ئافرەتەکە کاتێ لە گوتنی لایە لایەکەی تەواو بوو، هاتەوە ئەو دیو پەردەکە هەموو لاشەی دەلەرزیو ئارەقەی زۆری کردبوو، پاشان پارەکەی وەرگرتو گەڕایەوە ماڵەوە.

بۆ بەیانی لەهەمان کاتدا لەدەرگای بنکەکە درا، سەرۆکی جەندرمەکان گوتی: بیکەنەوە، کە دەرگاکەیان کردەوە بینییان هەمان ئەو ئافرەتەی دوێنێیە!!.

سەرۆك: ها بزانم بۆچی هاتووی؟

ئافرەتەکە: هاتووم وەك دوێنێ تۆزێ لایە لایەی ترتان بۆ بڵێم.

سەرۆك: فەرموو بیڵێ.

ئافرەت: چەندم بۆ حیساب دەکەی؟

سەرۆك: چەندت دەوێ؟

ئافرەت: شەش لیرە.

سەرۆك: زۆرە.

ئافرەت: سێ لیرە.

سەرۆك: زۆرە.

ئافرەت: دوو لیرە.

سەرۆك: زۆرە.

ئافرەت: بەخۆڕایی.

سەرۆك: نامانەوێ گوێمان لەدەنگت بێ.

ئافرەتەکە: بەسەرسوڕمانەوە بۆچی!!؟ خۆ دەنگم زۆر خۆشە.

سەرۆك: بە تووڕەییەوە وتم نامانەوێ.

ئافرەت: ئاخر هەر حەزدەکەم بۆتان بڵێم.

سەرۆك: فەرموو، ئافرەتەکە بە پێچەوانەی دوێنێ نە باسی پەردەی کرد، نە ئارەقەی هەڵڕێشت، نە حەیای لە پیاوەکان کرد، بەم شێوەیە چەند ڕۆژێك لەسەر یەك دەهاتو بەدەستی خاڵی دەگەڕایەوە، پاش چەند جارێك سەرۆك پێی گوت: ئیتر نەیەیتەوە بەم ناوە ئەگینا قاچەکانت دەشکێنم.

هاوڕێکانی ئەو ڕووداوەیان زۆر لا سەیر بوو پرسیان قوربان تۆ یەکەم جار پارەیەکی یەکجار زۆرت پێدا، کەچی ئێستا بەخۆڕایی دەیڵێ تۆ ناتەوێ، بەڵکو دەریشی دەکەی؟

سەرۆك: بە پێکەنینەوە من دەنگی ئەو ئافرەتەم لەلا خۆش نەبوو تەنها ویستم بزانم شەرمو شکۆی چەندە دڵنیابن حەیاو شەرمی نەماوە.

گوتیان: چۆن؟

سەرۆك: یەکەم ڕۆژ سەرنجتان دا چۆن ئارەقی حەیاو شەرم ئەتکایە سەر زەوی، بەڵام ڕۆژەکانی تر ئەمە نەما، گوتیان بەڵێ ڕاست دەکەی وابوو.

سەرۆك: بە پێکەنینەوە مرۆڤەکان ئەوەندەیان زەحمەتە تا حەیام شەرمو شکۆیان دەتکێت، چاوتان لێیەتی ئێستا چەند بە ئاسانی دێتە زووری، حەیا قەترەیەك ئاوە کە تکا ئیتر تەواو شەرم نامێنی[1].

### ٢٦٤. درۆو درۆزن لای مێرووله

لە گوندی (چەوتیانو دەرمانە) مامۆستای چەند قوتابییەك بووم، ئەو قوتابیانە دڵ پڕ ئومێدو ئاواتەخوازی زانست بوون، ڕۆژانە وانەم دەگوتەوە، شەوانەش لە یەکێ لە ماڵەکان کۆ دەبوینەوە، ئەوسا وەك ئێستا نەبوو خەڵکی بەدیار تەلەفزیۆنو ئینتەرنێتەوە خەو بیباتەوە، کارەباو مۆلیدە زۆر کەم بوو، خەڵکی لەبەر چرایەکی قەد دیوار کۆدەبوونەوە، خۆشیو ناخۆشییەکانی ڕۆژگاریان بۆ یەکتر باس دەکرد، بە ڕۆحێکی ئاسوودەوە پێدەکەنین، یەکێك لەوان یادگارییە تاڵەکانی تێکدانی گوندەکەیانی دەگێڕایەوە، یەکێکی تر باسی شینو شایی گونەدەکەیانی دەکرد بەر لەوەی تێکبدرێ، یەکێکی تر باسی

---

[1]) ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم- ل ٤٧- ٥٠.

جنۆکەی دەکرد، کاتێکمان دەبینی کاتژمێر (١٢)ەی شەوە، خاوەن ماڵ دووبارە دەستی دەکردەوە بە چا تێکردن، پاشان دەست دەکرا بەیارییە خۆشە کوردەوارییەکان.

شەوێکیان هەرکەسەو باسی کارو پیشەی ئەو ڕۆژەی دەکرد، کاك (ر) گوتی: مامۆستا گیان ڕۆژێکیان ڕووداوێکی زۆر سەیرم بینی، ئەگەر مۆڵەتم بدەی بۆت باس دەکەم، منیش گوتم: فەرموو باسی بکە، دانیشتووان چەند پیاوێك بوون بەدەم چا خواردنەوە گوێیان بۆ گرتبوو، کاك (ر) گوتی: ئەمرۆ کاتێ مەڕەکانم دەلەوەڕاند بەم کەژەوە، کاتی نیوەڕۆ لە شوێنێك دانیشتم، نانەبەرەکەی پشتم کردەوەو ئاگرێکم داگیرساند دەستم کرد بەنان خواردن، لەدوای نان خواردن یەك دوو چایم تێکردو خواردمەوە، کڵۆ شەکرێکم لێ کەوتە زەوی بەلآم گوێم پێنەدا، کڵۆ شەکرێکی ترم هەڵگرت چاییەکەم خواردەوە حەزم کرد پشوویەك بدەم شانم بەزەوی دادا چاوم بڕیە زەویەکە سەرنجم دا مێروولەیەك لە کڵوە شەکرەکە ئاڵاوەو دەیەوێ بیبا، بەلآم نەیدەتوانی بینیم ڕۆیشت مێروولەیەکی تری لەگەڵ خۆی هێنا، منیش کڵۆ شەکرەکەم لابرد، هاتنە شوێنەکە قەدەرێك گەڕان و سووڕان هیچ دیار نەبوو، مێروولەکەی یەکەمجار مایەوە ئەوەی تریان گەڕایەوە، مێروولەکەی یەکەم هەر لەو ناوە دەسووڕایەوە منیش کڵۆ شەکرەکەم بۆ دانایەوە، زۆر بەدەوری سووڕایەوە هەرچەندی کرد بۆ نەبرا، هێزی لێبڕا، ڕۆیشت کە زانیم دوورکەوتۆتەوە منیش کڵۆ شەکرەکەم هەڵگرت، بینیم دوو مێروولەی لەگەڵ خۆی هێنا گەیشتنە شوێنەکە، زۆر گەڕان و سووڕان هیچ نەبوو، هەستم کرد مێروولەکەی یەکەم وەك درۆزن ناسرا لای ئەوانی تر شتێکی زۆر عەجاییبم بینی، هەردوو مێروولەکەی تر بەرامبەری وەستان، ئەویش سەیری دەکردن، یەکێکیان سەری گرت ئەوەی تریان لای پشتەوەی گرت ڕایان کێشا مێروولەی داماویان کرد بەدوو لەتەوە، هەر دەجووڵایەوە تا گیانی دەرچوو، منیش ویستم کڵۆ شەکرەکە بخۆم بۆنی مێروولەی لێدەهات، گوتی: مامۆستا گیان تۆ بڵێی گوناهبار نەبم![1].

---

[1]) ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم- ل ١٨٣- ١٨٤.

### ٢٦٥. دایكێكی عاقڵ و خاوەن ویژدان

پیاوێك دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئافرەتەكەم سك پڕ بوو منیش زۆر نارەحەت بووم بەو سكپڕییە حەزم نەدەكرد لەو ئان و ساتەدا منداڵمان ببێ، بۆیە داوام لێكرد بچێ بۆ لای ئافرەتێك كە بەناوبانگ بوو بەكاری لەبار بردنی منداڵ، بۆ ئەوەی سكەكەی لەبار ببا، خێزانەكەشم ڕازی بوو بەم كارە، بڕێك پارەم پێیداو ڕۆیشت، منیش ڕۆشتم بۆ دەرەوە، نیوەڕۆ كە هاتمەوە بۆنی چێشتێكی خۆش دەهات، گوتم: ئافرەت ها چیت كرد؟

گوتی: وەڵلاهی پیاوەكە كە لەماڵ دەرچووم بۆ ئەم كارە، زۆر لەلام ئاسایی بوو سكەكەم لەبار ببەم، بەلاَم لەڕێگادا چاوم بە كۆمەڵێك منداڵ كەوت یاریان دەكرد لەبەر خۆمەوە گوتم: ئەو منداڵەی سكیشم ئەگەر لەباری نەچوێنم،كو ئەو منداڵانە یاری دەكات و هاوكاری ئێمەش دەبێ لە ژیاندا، خۆ بۆ قیامەتیش پاشی مردنمان دوعای خێرمان بۆ دەكات، بۆیە بڕیارمدا بگەڕێمەوە ئەو كارە نەكەم، بەپارەكەش مریشكێكم كڕی بۆ ئەم نیوەڕۆیە بەیەكەوە دەیخۆین، ڕزق و ڕۆزیش لەسەر خوای گەورەیە، تاسەری دابێ ڕزقیش دەدا، ئێستاكە ئەو منداڵەمان سوپاس بۆخوا لە قۆناغی سەرەتاییەو زۆر لە منداڵەكانی ترمان ژیرترو سەركەوتوترە[1].

### ٢٦٦. پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئاگاداری ئێمەن لەدونیادا

كابرایەك دەڵێ: چەند مانگێك لە بەندیخانەی حكومەتی بەعس بەند كرام بەبێ ئەوەی خۆشم بزانم چ تاوانێكم كردووە، لە بەندیخانەدا شەوان بەجۆرێك ئەشكەنجە دەدراین بەخەیاڵدا نایەت، ڕۆژێك نا ڕۆژێك هەندێ نەرمییان لەگەڵ دەنواندین بۆ ئەوەی وتووێژمان لەگەڵ بكەن و نهێنییەكانمان پێ بدركێنن، نەرمییەكە بەشێوەیەك بوو پیاو لەخۆی تەریق دەبوویەوە، هەر لەوە نەدەچوو ئەو پیاوكوژانەن، هەركاتێ بێ هیوا دەبوون و هیچیان چەنگ نەدەكەوت دەیانبردین بۆ تەعزیب، پاش لێدان و ئەشكەنجەیەكی زۆر فڕێ دەدراینە ژوورێك زۆر بەبێ ڕێزی، لەنێوان خۆماندا دڵخۆشی یەكترمان دەدایەوە، خەونمان بەوە دەبینی ڕۆژێك لە دەرەوەی زیندان ژیان بەسەر بەرین، دەمێكە خەڵكی گوتوویانە

---

[1]) ئەسرینەكانی سەدەی بیستەم، ل ٤٤٣.

هاوڕێیەتی(نەخۆشخانە، بەندیخانە، سەفەری غەریبی) زۆر خۆشەویستن، چونکە تۆ لەو شوێنانە غەمبارو دڵتەنگیت بۆیە ئەوەی دەبێتە هاوخەمو هاوسۆزت زۆر خۆشەویستە، ڕۆژێکیان زۆر زۆر ئازار درام نینۆکەکانم دەرهێنران، کارەبایان دا لەلاشەم، بەڵام بەردەوام بەو ئایەتە موبارەکە دڵی خۆم دەدایەوە کە خوای بەبەزەیی دەفەرمووێ: ﴿...لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ...﴾ الزمر، ئەو ڕۆژەی کە بەم شێوە ئەشکەنجە درامو زۆرم ئازار چەشت، شەوەکەی زۆر ناڕەحەت بووم لەتاو ئازاری لاشەم خۆشم نەمزانی چۆن خەوم لێکەوت، خەوم بینی، لەو خەوەدا پیاوێکی بالا بەرزی نووورانی جلو بەرگ سپیم بینی کۆمەڵێ نەهەنگ (حوت)ی بەدەورەوە بوو هاتە لام، فەرمووی: تۆ فلان کەسی؟

گوتم: بەڵێ قوربان ئەی تۆ کێیت؟ ئەو گیانلەبەرانە چین لەدەورەت؟

گوتی: من پێغەمبەر یونسم، خەمت نەبێ بەم نزیکانە ئازاد دەکرێی، بەڵام تا دەتوانی لەگەڵمدا ئەو زیکرە بڵێوە: {لا إلهَ إلاّ أنتَ سُبحانَك إنّي كُنتُ مِنَ الظّالِمين}، ئەو دەیگوتو منیش چەند جارێکم بەدوایدا گوتەوە، کاتێك بینیم لەبەرچاوم ون بو، منیش چەند جارێکی تر بەدەنگی بەرز دەمگوتەوە، کاتێك لەگەڵ دەنگی خۆم خەبەرم بوویەوە، بینیم برادەرەکانم لەژوور سەرمەوە سەریان سوڕماوە، منیش پێیانم گوت: ئەمە چییە چی روویداوە؟

گوتیان: تۆ لەخەودا ئاواو ئاوات دەگوت، منیش ئەوەی لەخەونەکەمدا بینیبووم هەموویم بۆ گێڕانەوە، یەکێ لەبەندیەکان گوتی: هیچ نییە ئەوەی ماوەیەك لە بەندیخانە بمێنێتەوە ئەو جۆرە خەونانە دەبینێ، یەکێکی تر لە هاوڕێکانم دیار بوو زۆر کاریگەر بوو بەو خەونەی من، پێی گوتم: فلان کەس تخوا ئەگەر بەربووی منت لەیاد نەچێ ماڵمان لە فلان گەڕەکە هەواڵ بدە بەماڵەوەمان کە خەمی منیان نەبێ، دیار بوو ئەو برادەرەم دڵی خەبەری دابوو کە ڕزگارم دەبێ، بۆ بەیانی یەك یەك بانگیان کردین بۆ ژووری لێدانو داپلۆسین، بەڵام منیان بەشێوەیەك بانگ کرد هەستم کرد جیاواز لە ڕۆژەکانی تر بە شێوەیەکی نەرمتر لەجاران بوو، منیان برد بۆ ژوورێکی خۆش پەرداخێك شەربەتو پەرداخێك ئاویان بۆ هێنام، گوتیان: بیخۆوە، پاشان داوای لێبوردنیان لێکردم گوتیان:

ئەوەی ئێمە تێیگەیشتبووین سەبارەت بەتۆ بەم شێوەیە نەبوو، ئازادیان كردم، ڕایانسپاردم كە بۆكەس باسی نەكەم، منیش لە خۆشیدا وام دەهاتە بەرچاو كە تازە لەدایك بوومە، ئاگام لە ئاوو شەربەتەكەی بەردەمم نەما، گوتیان: بیخۆوە، گوتم: موژدەیەكی ئەوەندە خۆشتان پێدام ئیشتیهای هیچ شتێكم نەماوە لە خۆشیاندا، پاشان منیان برد هەردوو چاوو دەستیان بەستم، سواری سەیارەیەكی تیژڕەویان كردم، پاش ماوەیەك هەستم كرد سەیارەكە وەستا، منیان داگرت، یەكێك لە چەكدارەكان گوتی: كاكە ئێستا تۆ ئازادی دەستەكانی كردمەوە گوتی: هەركاتێ گوێت لەدەنگی سەیارەكەی ئێمە بوو ڕۆشتین ئنجا چاوەكانت بكەوە، ترسێكم بۆ درووست بو بەوەی كە نەوەكو ئەمەی دەیكەن بەرامبەرم فێڵێك بێ، لەبەر خۆمەوە دەمگوت: ئێستا نا ئێستا گوللەیەك دەنێن بەسەرمەوە، بەلاَم خەونەكەم دەهێنا بەرچاوی خۆم دڵم ئارام دەبوویەوە، گوێم لە دەنگی سەیارەكەیان بوو، دونیا كپو مات بوو نەمدەزانی شەوە ڕۆژە، نەمدەزانی لەكوێدام، نەمدەوێرا چاوەكانم بكەمەوە، بەلاَم بە هێواشی لەشوێنی خۆم دانیشتم گوتم: ئەگەر لەوێ مابن هاوار دەكەن لەسەرم پێم دەڵێن بۆچی دانیشتی، بەلاَم هیچ دەنگ نەبوو، بۆیە هێواش هێواش دەستم برد بۆ ئەوەی چاوەكانم بكەمەوە، ئیتر چاوەكانم كردەوە شایەتمانێكم هێنا دەستەكانم بەرز كردنەوە بۆ ئاسمان زۆر زۆر سوپاسی خوام كرد بەوەی كە بەسەلامەتی لەدەستیان ڕزگاری كردم، بەلاَم هەر بەچواردەوری خۆمدا دەمڕوانی، بەهەرحاڵ گەڕامەوە بۆماڵەوە، پاشان چووم بۆ ئەو ماڵەی كە هاوڕێكەم ناوونیشانی پێدابووم، بەلاَم زۆر بەداخەوە حكومەتی بەعس خانووەكەی بەسەر ماڵو منداڵەكەیدا ڕووخاندبوو، باوكە بەستەزمانەكەی تا وەفاتی كرد هەر لە چاوەڕوانی دابوو، تا كاتی نووسینی ئەم كتێبەش هەواڵی هەر نەبوو، لەم دواییانەدا بۆم دەركەوت كە ئەو دووپەرداخەم گەر بخواردایە هەر هەفتەیەك دەژیام چونكە ژەهراویی بوو پێی دەمردم[1].

## ٢٦٧. هۆی نەترسانی دوژمنانی دینی ئیسلام لە مسوڵمانان؟

سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل (ئاریاڵ شارۆن) گەورە پیاوی جوولەكە لە چاوپێكەوتنێكدا دەڵێ: ئێمە لە عەرەب ناترسین، ئەی لە مسوڵمانان؟ لەوانیش ناترسین

---

[1]) ئەسرینەكانی سەدەی بیستەم ل ٨٧- ٩٠

تازە ئێمە ڕەگمان داکوتاوە، لەیەك كاتدا لە مسوڵمانان دەترسین ئەویش ئەو کاتەی کە ژمارەی نوێژخوێنانی بەیانیان بگا بە ژمارەی نوێژخوێنانی ڕۆژی هەینی، ئەوسا دەبن بە مەترسی بۆ جوولەکەو دۆستەکانی[١].

## ٢٦٨. ئەنجامی بەجێنەگەیاندنی نەزر کردن

کابرایەك دەگێڕێتەوە دەڵێ: دوای کارەساتە جەرگ بڕەکەی هەڵەبجە ئاوارە بووین، پاشان دوای ساڵی نەوەدو یەك کە ڕژێم گەڕایەوە دووبارە ئاوارەی ئێران بووین، بەلام ساڵی (١٩٩٤) لە ئێران گەڕاینەوە، گوتیان: فلانە ڕێکخراو سێ بزن دەدا بەهەر ماڵێکی ئاوارە کە لە ئێران گەڕابێتەوە، منیش چووم ناوی خۆم نووسی پسووڵەی هاتنەوەم تەسلیم کرد، پاش ماوەیەکی زۆر لە هێنانو بردنم، ئیتر لەو باوەڕە نەبووم کە پێم بدەن، تاوەکو سێ ساڵی پێچوو، پاشان هەواڵێك بلاو کرایەوە گوتیان وەرن بزنەکەتان وەرگرن، منیش گوتم: ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست بێ لەسەرم نەزر بێ یەکێکیان بکەم بەخێر، بەسەر دەرو دراوسێدا دابەشی بکەم، لەگەڵ چوار ماڵی دیکەدا چووین بۆ ڕێکخراوەکە، کە حەیوانەکانم بینی، زانیم هەواڵەکە ڕاستە، شەیتان وەسوەسەی بۆ درووست کردمو نیەتی خێرەکەی پێ گۆڕیم، لەدڵی خۆمدا گوتم: هەرسێکیان دەفرۆشم گیسکێکی بچووکی پێ دەکڕم، گیسکەکە دەکەم بەخێر، خێر هەر خێرە، بێ ئاگا لەوەی کە خوا بەنهێنی نێو دڵەکان شارەزایە، ئیدی لەگەڵ چوار ماڵەکەی تر بزنەکانمان وەرگرت، بەهەمووومان گەلابەیەکمان گرتو بارمان کردن، خۆشمان لە پێشەوە سوار بووین، لەنیوەی ڕێدا دابەزین، سەیرمان کرد یەکێ لە سێ بزنەکەی من کە بەساغی بارمان کردبوو، مردار بووەتەوە، یەکسەر لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەوە زللەی میهرەبانی خوابوو تا تەسلیمی نەفسی سەرکەشم نەبم، هەر لەوێدا بەخۆمدا چوومەوە[٢].

---

[١]) هەمان سەرچاوە ل ٢٠٩.

[٢]) ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم ل ٢١٥- ٢١٦.

### ٢٦٩. قەزاو قەدەری خوای گەورە خێری تێدایە

زۆر جار ئینسان هەوڵ بۆ كارێك دەدات نابێتە نەصیبی، بەم هۆیەوە دڵ تەنگ دەبێ، بەلاَم دوایی دەبینێ كە خێری تێدا بووە نەبۆتە قسمەتو نەصیبی، ئەم ڕووداوە زیاتر ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە، كاك كەریم خاوەنی سەیارەیەكی تاكسی بوو هاتووچۆی (بەغداد- سلێمانی) دەكرد سایەقێكی كارامەو لێهاتووبو، لەشاری بەغدا گیرا، بەهۆی هەڵەیەكی بچووكەوە، بەلاَم سزایەكەی زۆر قورس بوو، سەیارەكەی بۆ ماوەی هەفتەیەك گیرا، خۆیشی زیندانی كرا، بەو هۆیەوە زۆر نارەحەتو دڵتەنگ بوو، چونكە شایستەی ئەو سزایە نەبوو، كە زانیان كوردیشە پاش ئەوەی ئازادیان كرد غەرامەیەكی زۆر قورسیان كرد، لەكاتی گەڕانەوەیدا زۆری نەمابوو لە بەغدا دەربچێ دووبارە دەستگیریان كرد، پاش لێكۆڵینەوە لەگەڵی دووبارە خستیانەوە زیندانێكی تر، سەیارەكەشیان دەست بەسەرگرت، پاش دوو ڕۆژ لە زیندانی كردنی بۆی دەركەوت كە بە سەیارەكەی ئەو لەمندالێكیان داوەو كوشتوویانە، مندالەكەشیان جێهێشتووە، كەس‌و كاری مندالەكە ژمارەی تاكسیكەی ئەویان گرتووەو داویانە بە مەفرەزەكانی هاتووچۆی بەغدا، كاك كەریم زۆر نارەحەت دەبێ، بەلاَم دەچێتە عەقڵی كە ئەو مندالە چوار ڕۆژ لەمەو بەر بەو كارەساتە گیانی لەدەست داوە، ئەمیش نزیكەی (دە) ڕۆژ سەیارەكەی دەست بەسەر بووە لەو ماوەیە ئەو كارەساتە بەو سەیارەی ئەو كراوە، بۆیە داوای كرد كە بچێ بۆ لای بەڕێوەبەرو بە هێمنی بابەتەكە تێگەیاند، پێی گوت: سەیارەكەی ئەو لە فلاَن شوێنە گیرایەو هەرگیز ئەو كارەساتە ئەو ئەنجامی نەداوە، بەدواداچوونیان بۆ قسەكانی كاك كەریم كرد، پاش چەند سەعاتێك بەربوو لەزیندان، بۆیە كاك كەریم وتی: پیاو نازانی خێر لەچی دایە، ئەگەر وانەبا لە دادگا دەبووم بە قاتیل[1].

### ٢٧٠. ئەنجامی ناپاكی (خیانەت) كردن

پیاوێك دەڵێ: من لە شوفێری كردندا كارامەبووم، بەلاَم تا ئەو ساتانەش هەر سەیارەی خەڵكم لێدەخوڕی بەپارە، چونكە توانای كڕینی سەیارەم نەبوو، ڕۆژێكیان كاك (س)ی

---

[1]) ئەسرینەكانی سەدەی بیستەم ل ٢٣٩- ٢٤٠.

خزمـمـان کـە پـارەی قـەرەبووی وەرگرتـبـوو، هاتـە لامو گـوتی: کـاك (ن) تـۆ شـوفێری بـاش دەزانیت منیش پارەم هەیە حەز دەکەم سەیارەیەك بکـڕم تـۆ بیگێـڕی، چـەندەت ئیش کـرد وەك برا بەشی دەکەین، منیش گوتم: زۆر باشە هـەر ئـەمڕۆ پـارە بێنـە دەچـین سـەیارەیەکی کـرێ دەکـڕین، بـەڵێ تاکسییەکی تەکسی زۆر باشـم بـەدڵی خـۆم کـڕی ئـەویش پارەکـەی دا، مانگی یەکەمو دووەم زۆر باش بوو پارەیەکی زۆرم بـۆ دەمایـەوە، سـەیارەکەش مەسـرەفی زۆر کـەم بـوو، بـەلام ڕۆژێکیـان بەخـەیاڵم داهـات باشـە بۆچـی مـن هـەوڵی کـڕینی ئـەو سـەیارە نەدەم؟ بۆچی ئـەو هیلاکیـە تـەنها بۆخـۆم نـەبێ، مـانگی سێیەم پارەیـەکی کـەمم بـۆ بـردو ئەوەی ترم بەلاوەنا بۆخۆم، مانگی چارەم لەوە کەمتریشم بۆ برد، خـاوەن تاکسییەکە گوتی: ئەوە کاك (ن) بۆچی پارەکە کەمی کردووە؟

منیش گوتم: کاکە ئیش وەکو جاران نەماوە چیبکەین؟ ئەگەر بـاوەڕش ناکـەیت بـەیانی وەرە لەگـەڵم بزانـە کـەس دەسـت لەتەکسی ڕادەگـرێ؟ ئـەو دامـاوە بـڕوای بـە قسـەکانم کـرد (دیارە کابرا پیر بووەو نەیزانیوە) لە پێشی تاکسیکەوە دامنا لە تەنیشـتی خـۆم، ئـەو ڕۆژە تـا نزیکی عەسر بەو شێوەیە گەڕاینو سوڕاین، پاشان هاتینەوە بۆ ماڵ گوتی: کاکـە وەڵڵا ڕاسـت دەکەی هەر باشیشە ئەوەندە پارەیەت دەست دەکەوێ، ئەو دامـاوە زۆر ناشـارەزا بـوو لـە بـارو دۆخی ناو شار تازە هاتبوونە شار، نەیدەزانی کە نەفەری تر هـەبوو کـەس دەسـت لـە تەکسی ڕانـاگرێ، بـەم شـێوەیە مـاوەی چـەند مانگێـك کـارم کـرد هـەر پـارەی کـەمم بـۆی دەبـرد، ڕۆژێکیان چووم گوتم: کاك (س) من زۆر مـەمنوونی تـۆم ئەگـەر بـوار بـدەی سـەیارەکەت بـۆ دادەنێمو بۆخۆم دەچم بـەدوای کـارێکی تـر، یـانیش ئـەوەتا ئـەو پـارە کەمـەی کـە بەدەسـتی دەهێنین بەکەڵکی دوو کەس نایەت با سەیارەکە بۆ یەکێکمان بێ، من لێتی دەکڕمەوە.

ئەویش گوتی: باشە با زیاتر خەمی لێنـەخۆم خـۆت دەزانـی بەچـەندم کڕیـە پارەکـەیم بدەوە با بۆتۆ بێ، منیش گوتم: ئاخر ئێستا ئـەو پارەیـە ناکـات، ئـەوە چـەند مانگێکـە ئێمـە کـاری پێدەکـەین دەبـێ بـە کـەمتر بیفرۆشـی، ئـەویش گـوتی: باشـە خـۆت وەکیـل بـە نـەمن مەغـدور بکـە نـەخۆت، ئـەو زۆر بـە سـادەیی لەگـەڵم دەدوا، نەیـدەگوت: مـادەم کـارو کاسـبی نەماوە ئەی تۆ چۆن سوودی لێدەبینیو بۆچیتە؟ بە نیـوە قیمـەتو بەقـەرز سـەیارەکەم لـێ کڕیەوە، بڕێك لەو پارەیەی کە دەستم کەوتبوو پێمدا ئـەوەی ترمـان کـردە قـەرزی مانگانـە،

دڵم زۆر خۆش بوو وە پێکەنینم بە عەقڵی ئەو دەهات، وردە وردە قەرزم تەواو بوو، بوومە خاوەنی سەیارەی خۆم، بەڵام بەداخەوە زۆریش بەداخەوە هیچ بیرێکم لە خوا نەکردەوە کە من خیانەت لەو پیاوە بەستەزمانە دەکەم، تا ئەو ساڵانەی دوایی، ڕۆژێکیان بەیەکەوە بووین بابەتەکەم هەمووی بۆ باس کردو داوام لێکرد گەردنم ئازاد بکا، ئەویش گوتی: دەزانی منیش وەك تۆ بەساختە چێتی ئەو پارەیەم دەست کەوت بۆیە تۆش بە ساختەچێتیی لەبەردەستت دەرهێنام، گوتم چۆن؟

گوتی: من لەلای لێژنەی زەوی‌و زار زۆرم نووسی، بۆ ئەوەی تەعویزی زۆرم پێبدەن، ئەوانیش پارەی زۆریان پێدام، سەرەنجامەکەی ئەوەبوو تۆش خیانەتت لەمن کرد، من سوودم لێنەبینی، تۆش خۆت هەڵگرە بۆ سزای خوا چونکە دڵنیابە (ئەو کەرەی بەپارەی بەفر بکڕدرێت ئاو دەیبات) پێی گوتم گەردنت ئازاد بێ، منیش زۆر پەشیمان بوومەوە بەڵام دوای چی[1].

### ٢٧١. سەرەنجام‌و بەرهەمی کاسبی حەرام

پیاوێکی شەربەت فرۆش لە شاری سلێمانی دەچێتە لای کاك ئەحمەدی شێخ، پێی دەڵێ: قوربان شەربەتی مێوژ دروست دەکەم‌و دەیفرۆشم وە شەربەتەکەم زۆر پاك‌و چاکو بێ غەشە، ئاوی بە ئەندازەی پێویست تێدەکەم، بەڵام بازاڕم کەمترە لەچاو دراوسێکانم، کە ئەو بە پێچەوانەی منەوەیە ئاوی زۆری تێدەکا پاکە خاوێنی ناپارێزێ، کابرایەکی دەست بەدەستنوێژ نییە، بەڵام هەمیشە بازاڕی لەمن گەرمترە، قازانجی زۆریش دەکا، کاك ئەحمەدی شێخ دەڵێ: جا نیازت چییە؟

کابرای شەربەت فرۆش دەڵێ: قوربان منیش وەك ئەو بکەم تا بازاڕم گەرم بێت.

جەنابی شێخ گوتی: هەرگیز نەکەی کاری وا بکەی، بەم جۆرە بژی باشترە، بەڵام کابرا بەم قسەیەی کاك ئەحمەدی شێخ ڕازی نابێ، چەند جارێك دەچێتەوە لای شێخ بۆ ئەوەی ڕێی پێ بدا، سەرەنجام کاك ئەحمەد پێی دەڵێ: ئەگەر ئەو کارە بکەی ئاکامی باش نابێ، کەیفی خۆشتە چی ئەکەی بیکە بەڵام دڵنیابە پەشیمان دەبیتەوە.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤١- ٢٤٣.

کابرا دەڕواو دەست دەکاتە کار کردن، بەو شێوە خراپەی کە خۆی دەیویست، بازاڕی زۆری دەبێت‌و سەرفیاتی چاکی دەبێ، پاش مانگێك دەچێتەوە لای کاك ئەحمەدی شێخ. بەدڵێکی ئاسوودەوە لەلای دادەنیشێ، کاك ئەحمەدیش پرسیاری لێ دەکات بازاڕت، کارت چۆنە ئێستا؟ کابرا دەڵێ ئێستا سەرفیاتم زۆر باشە، پارەی باشم دەست دەکەوێ، من ئێستا لە کابرای دراوسێم بازاڕم زۆر باشترە، کاك ئەحمەدی شێخ دەڵێ: ئەی پارەکەی چۆنە لەچیدا خەرجی دەکەی؟

کابرا دەڵێ: وەڵڵا پارەی چاکم دەست دەکەوێ بەس نازانم چۆن‌و لەچیدا خەرجی دەکەم، پارەکە هەرچەندە زۆرە بەڵام هیچ بەرەکەتی نییەو جێ ناگرێ، بە پێچەوانەی جاران، ئەو کات پارەیەکی کەمم دەست دەکەوت بەڵام بەرەکەتی زۆر زیاتر بوو لە ئێستا.

کاك ئەحمەدی شێخ پێی دەڵێ: کاکە ئەوە ئەنجام‌و بەرهەمی پارەی حەرامە، هەمیشە کاری چاك‌و پاك بەرەکەتی تێدەکەوێ، ئەگەر پارەکە حەڵاڵ بوو، ئەوە هەرچەندە کەمیش بێ بەڵام خوا بەرەکەتی تێدەکات‌و لەبەرامبەردا دەردو بەڵاو موصیبەتت لەسەر هەڵدەگرێ، ئەگەر بەڵاشت تووش بێ ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانت[1].

## ٢٧٢. ڕێزی پێشەوا ئەبو بەکرو پێشەوا عەلی ﷺ لەلای یەکتر

ڕۆژێکیان پێشەوا ئەبو بەکر لەگەڵ پێشەوا عەلیدا ﷺ لەگەڵ یەکتر بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆن بۆ ئەوەی بیبینن، لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەوەستن، لەبەر ڕێزی یەکتری لەلایەن هەر یەکەیان، کەسیان پێش ناکەوێ بۆ چوونە ژوورەوە، پێشەوا ئەبو بەکر دەڵێ: ئەی عەلی فەرموو پێشکەوە، بەڵام پێشەوا عەلی بەمە ڕازی نابێ‌و دەڵێ: چۆن من پێش بکەوم، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تۆ فەرموویەتی: {لەوەتەی دونیا هەیەو ڕۆژ هەڵدێ‌و ئاوا دەبێ لەدوای پێغەمبەرانەوە هیچ کەسێ پلەو پایەی بەقەد ئەبو بەکر نییە}، پێشەوا ئەبو بەکر گوتی: جا ئەی عەلی من چۆن پێش تۆ دەکەوم لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تۆ دەفەرمووێ: {چاکترین ئافرەتی دونیام کە مەبەستی پێ فاتیمەیە لە چاکترین پیاوی دونیا مارە بڕیوە کە تۆی ئەی

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٣- ٢٧٤.

عەلی}، پێشەوا عەلی گوتی: ئەی ئەبو بەکر من هەرگیز پێش تۆ ناکەوم لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تۆ دەفەرمووێ: (ئەگەر ئیمانی هەموو خەڵکی سەر زەوی بکێشرێ، لەگەڵ ئیمانی ئەبو بەکر، ئنجا بەراوورد بکرێن هێشتا هی ئەبو بەکر قورس ترە)، پێشەوا ئەبو بەکر گوتی: ئەی عەلی با چیدیکە ڕانەوەستین من پێش ناکەوم چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تۆ فەرموویەتی: (لە ڕۆژی دواییدا لەو کاتەی کە هەموو خەڵکی نارەحەتن لەبەر ڕاوەستانی ئەو ڕۆژە، لەو کاتەدا عەلیو فاتیمەو حەسەنو حوسەین بە سواریی دێن ڕادەوەستن، خەڵکی لەو کاتەدا ئەی عەلی سەیری تۆ دەکەن دەڵێن ئەو پیاوە نوورانیە کێیە، کامە پێغەمبەرە؟ وەلامیان دەدرێتەوە کە ئەوە هیچ کام لە پێغەمبەرەکان نییە بەڵکو عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە) پێشەوا عەلی دەڵێ: ئەی ئەبو بەکر پێشکەوە من پێش ناکەوم، ئەی نەتبیستووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تۆ فەرموویەتی: (ئەگەر خەلیلێکم هەڵبژاردایە ئەوە ئەبو بەکرم هەڵدەبژارد بەلام پێغەمبەرەکەتان خەلیلی خوایە)، پێشەوا ئەبو بەکر دەڵێ: ئەی عەلی من چۆن پێشت دەکەوم بیستوومە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ عەلیدا دەبم، خوای گەورە پێم دەفەرمووێ: ئەی خۆشەویستی خۆم موحەممەد بزانە چۆن ئیبراهیمم بە باوکێکی دڵسۆز بۆ هەڵبژاردیو، عەلیشم کرد بەبرایەکی دڵسۆز)، پێشەوا عەلی گوتی: ئەی ئەبو بەکر چۆن دەتوانم پێشت کەوم کە خوای تەعالا دەربارەی تۆ دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾الزمر، پێشەوا ئەبو بەکریش پێی گوت من پێشت ناکەوم خوا دەربارەی تۆش دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾البقرة. بەڵێ بەم شێوەیە هەردووکیان لەو قسانە بوون جوبریل دابەزیە سەر زەوی هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدا کە ئەو دووانە لەبەر دەرگان، پێغەمبەری خواش ﷺ خێرا پێشوازی لێکردن کە سەیری کردن بینی وا کێشەیانە لەسەر پێشەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەوا ئەبو بەکری لەلای

ڕاست ڕاگرتو عەلییش لەلای چەپ خۆیشی پێش كەوتو فەرمووی با بچینە ژوورەوە و بەڕاستی لەڕۆژی دواییشدا بەو جۆرە كۆ ئەكرێینەوە[1].

## ٢٧٣. كڕینو فرۆشتن لای هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ

دەگێڕنەوە جەریری بەجەلی كە یەكێكە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەندەیەكی نارد بۆ ئەوەی وڵاخێكی بۆ بكڕێ، بەندەكەش ڕۆیی بۆ لای وڵاخ فرۆشێ، وڵاخێكی دەست نیشان كردو گوتی: ئەو وڵاخە بەچەند دەفرۆشی فرۆشیارەكەش گوتی: بەوەندە پارەیە، بەندەكە گوتی: ڕازیم بابچین بۆ لای گەورەكەم تا پارەكەت پێ بدا، بەندەكە وڵاخەكەی ڕاكێشاو ڕۆیشتن بۆ لای جەریر، جەریریش پرسیاری لە بەندەكە كرد بەچەند لێت كڕیوە؟ بەندەكە گوتی: بەچوار سەد درهەم ڕێك كەوتووین، جەریر ڕووی كردە كابرای فرۆشیارو پێی گوت: ئەو وڵاخە بە (٥٠٠) درهەم دەفرۆشیی؟ بە (٦٠٠) درهەم دەیفرۆشیی؟ كابرای فرۆشیار گوتی: من تاكو ئێستا شتی وام نەدیوە، كە كڕیار پارە زیاد بكات بۆ فرۆشیار، جەریر گوتی: پەیمانم بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە بەڕاستیی‌و پاكیی‌و ساغیی لەگەڵ هەموو مسوڵمانێك، بۆیە دەبینم ئەم وڵاخەی تۆ (٦٠٠) درهەم دەهێنێ، ئەگەر من بەكەمتر لێت بكڕم كەواتە خیانەتم لەو پەیمانو عەهدە كردووە كە بەخواو پێغەمبەری خوام ﷺ داوە[2].

## ٢٧٤. دوعات زوو قەبووڵ دەبێ

ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێ: یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ كە نازناوەكەی ئەبو مەعلەف بوو، ئەو پیاوە بازرگانێكی گەورە بوو، ئینسانێكی زۆر خۆپارێز بوو لە حەرام، ڕۆژێكیانماڵێكی زۆری لا دەبێ بە ڕێگایەكدا دەڕوات ڕێگاكە زۆر سەختو پڕ مەترسی دەبێ، لەناكاو تووشی ڕێگرێك دەبێ، خۆی پێچاوەتەوە، چەكیشی لایە، كابرای ڕێگر هاوار دەكاو دەڵێ: ئەوەی پێتە فڕێی بدە دەنا دەتكوژم، ئەو هاوەڵە بەڕێزەش دەڵێ: چیم پێیە پێت دەدەم تۆ دزی ماڵو سامانی نەك پیاوی كوشتن بی، كابرای دزیش دەڵێ:

---

[1]) دۆستی باوەڕداران – ل ٢٨ ٣٠.

[2]) دۆستی بڕواداران- ل ٨٢.

من ماڵو سامانم ناوێ تەنها خوێنی تۆم دەوێ، هاوەڵە بازرگانەکە چەندەی لەگەڵ هەوڵ دەدا سودی نابێ، ناچار دەڵێ باشە رێگەم بدە دوو ڕکعات نوێژ بکەم، ڕێگرەکە دەڵێ: باشە، ئەمیش خێرا دەست نوێژێکی هەڵگرتو نوێژی دابەستا، لەنوێژەکەدا دەستی کرد بە پاڕانەوە لەخواو گوتی: {یا ودود یا ذا العرش المجید یا فعال لما یرید، أسألك بعزتك التي لا ترام وبنور وجهك الذي ملأ أركان عرشك، أن تكفيني بشر هذا اليمن، یا مغیث أغثني}، سێ جار ئەو دوعایەی کرد، هەر لەناو دوعاکەدا بوو، سوارێکی چاپووك ڕمێکی لەدەستدا بوو بەپەلە هات، ڕمێکی لەنێو شانی کابرای دزداو کوشتی، بازرگانەکە گوتی: تۆ کێی خوا بەهۆی تۆوە منی لەدەست ئەو دزە ڕزگار کرد؟

سوار چاکەکە گوتی: من یەکێکم لە فریشتەکانی خوا لە ئاسمانی چوارەم ، کە یەکەم جار پاڕایتەوە گوێم لەدەرگای ئاسمانی یەکەم بوو دەلەرینەوە، دووەم جار کە پاڕایەوە گوێم لە ئەهلی ئاسمان بوو دوعایان بۆ دەکردی، کە جاری سێهەم پاڕایەوە پێیان گوتم: پاڕانەوەکەی وەرگیراوە، داوام لەخوا کرد ئەو ئیشە بەمن بسپێرێ، بۆیە من هاتم لەناوم برد، موژدە بدە بە هەموو خەڵکی هەر کەسێك دەست نوێژ بگرێو پاشان نوێژ بکات، ئنجا دوعا بکات بەو دوعایەی تۆ، خوای تەعالا دوعاکەی گیرا دەکات[1].

### ٢٧٥. ئەنجامی بوختان کردن

نورە عەبدوڵلا مامۆستایەکی زانکۆیە دووجار تەڵاق دراوە باسی خۆی دەکاتو دەڵێ: چیرۆکی من حەوت ساڵ لەمەو بەر ڕوویدا پاش تەڵاقی دووەمم بڕیارم دا شوو بکەم بە خزمێکم کە ژیانێکی هێمنی بەسەر دەبرد، لەگەڵ ژنەکەیو پێنج منداڵەکەی لەگەڵ کوڕە پورێکم دا ڕێك کەوتین لەسەر ئەوەی بوختانێك بە خێزانەکەی هەڵبەستین بەوەی گوایە خیانەتی لە مێردەکەی کردووە بۆ ئەوەی مێردەکەشی تەڵاقی بدات سەرەنجام کوڕە پورەکەم خێزانەکەی ئەو بهێنێ کە زۆری خۆش دەویست منیش شوو بکەم بە پیاوەکە، هەڵساین بە بڵاوکردنەوەی تۆمەتەکە لەناو خزمو کەسمان دا بە تێپەربوونی کات هەستم دەکرد سەرکەوتوو دەبین لە پیلانەکەمان بەشێوەیەك وای لێ هات ژیانی خێزانیان تێك چوو تا گەیشتە ئاستی تەڵاق.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨١- ٨٣.

دوای ساڵێك ژنەكە شووی كردەوە بە پیاوێكی خاوەن دەسەڵات، پیاوەكەشی كە من بە تەمای بووم شووی پێ بكەم ژنێكی تری هێنا.

سەرەنجامی ئەو ستەمە گەورەی ئێمە كردمان ئەوە بوو من تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی خوێن بووم كوڕە پورەكەشم بە تەزووی كارەبا سووتا[١].

### ٢٧٦. ئەنجامی ماڵ خواردنی خەڵك بە ستەم

توركی موحەممەد بۆمان باس دەكات‌و دەڵێت: جارێكیان دووسەد ڕیاڵم لە پیاوێك قەرز كرد بۆ تەواو كردنی یەكێك لە پڕۆژەكان، دوای كۆتایی هاتنی ماوەی قەرزەكەم خاوەنی پارە هاتە لام بۆ ئەوەی پارەكەی پێ بدەمەوە بەڵام من نكۆڵیم لێ كرد وە گوتم: تۆ هیچ پارەیەكت لای من نی یە ئەمیش هیچ بەڵگەیەكی بەدەستەوە نەبوو، چونكە بەڵێن نامەیەك نەبوو لە نێوانماندا، منیش بێ ئاگا لەوەی چ سەرەنجامێك چاوەڕێم دەكات لە پای ئەو زوڵمەی كە كردومە، دوای سێ مانگ لەو كەین‌و بەینە نیو ملیۆن ڕیالم زیان كرد ڕۆژ بە ڕۆژ هەستم دەكرد زیان یەخەی پێ گرتووم هاوسەرەكەم بەردەوام ئامۆژگاری دەكردم بە گەڕانەوەی ئەو بڕە پارەیە بۆ خاوەنەكەی، پێمی ئەگوت: پیاوەكە ئەوەی بەسەرت دێ سزای خوایە بەڵام من گوێم بۆی نەدەگرت بەردەوام بووم لە لووت بەرزی تا وای لێهات خۆشەویستانم لە دەست دەدا ، جارێكیان سێ منداڵم بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل لە كاتی گەڕانەوەیان لە شاری دەممام مردن، دوای ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە بڕیارم دا پارەكەی بۆ بگەڕێنمەوەو داوای لێبوردن لە خاوەنەكەی بكەم تا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی كە خێزانم‌و منداڵە حەوت ساڵیەكەم لە دەست بدەم[٢].

### ٢٧٧. پەیمان نەشكاندن لەگەڵ گیانداران

دەگێڕنەوە عوقبەی كوڕی نافع هەڵگری ئاڵای ئیسلام بوو لەكاتێكدا كەبەرەو باكوری ئەفریقیا دەڕۆیشتن بۆ جیهاد كردن، فەرمانی بەدەستەیەك لە سوپاكەی كرد شاری قەیرەوان دروست بكەن لە وڵاتی تونس، ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ شوێنەكە بۆ ئەوەی شارەكە

---

[١]) قوربانیەكانی شەیتان ل ١٩٠ - ١٩١.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل (١٩١).

دروست بکەن، بەڵام ئەو شوێنەی کە تەرخان کرابوو بۆ شارەکە بینیان شوێنێکی زۆر ناخۆشەو پڕە لە دڕندەو ئاژەڵی کێوی،وەکك شێرو گورگو مارو هیتر، ئەو کۆمەڵەی کە فەرمانیان پێ کرا بوو بەدروست کردنی ئەو شارە گەڕانەوە لای عوقبەو هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند، گوتیان: شوێنەکە ئیشی تێدا ناکری، عوقبە خۆی ئامادەکردوو لەگەڵیان چوو بۆ شوێنەکە لە بەرزاییەك وەستاو هاواری کرد: ئەی ئاژەڵەکان، شێرو گورگو مارەکان ئێمە هاوەڵی پێغەمبەری خواین ﷺ ئێرەمان بۆ چۆڵ کەن‌و لە شوێنەکانی خۆتان وەرنە دەرەوە، پەیمان بێ ئێمە هیچتان لێناکەین، ئەگینا بە پێچەوانەوە لۆمەمان مەکەن لەکارێك کە ببێتە هۆی لەناو بردنتان، سوپاکەی عوقبە سەریان سوڕما لەو کارە!، گوتیان: قسە لەگەڵ کێ دەکەی خۆ ئەوانە تێناگەن تۆ چییان پێ دەڵێی؟

سوپاکەی دەڵێن: زۆری پێنەچوو مارو شێرو گورگو دڕندەکانی ئەو ناوچەیە لە بێشکەو لانەکانی خۆیان دەرچوون، هەندێکیان فەرخەیان هەبوو فەرخەکانیان لەگەڵ خۆیان دەگواستەوە بۆ شوێنێکی تر، یەکێك لە سەربازەکان بە عوقبەی گوت: نەیانکوژین، عوقبە گوتی: نەخێر هەرگیز ئەزیەتیان نادەین چونکە ئێمە پەیمانمان پێیان داوەو خۆمان ڕێگەی ڕۆیشتنمان پێشان داون[1].

## ٢٧٨. دزی کردن

چەند کەسێك لە خەڵکی پرسیاریان لە یەکێ لە زانایانی ئیسلام کرد هۆی چییە ئیسلام فەرمانی کردووە بەوەی کە هەریەکێ دەستی کەسێکی بێتاوان ببڕێ دەبێ خوێنەکەی بدات بەکابرای دەست بڕاو کە (٥٠٠) دیناری زێڕە، لەهەمان کاتیشدا ئەگەر کەسێك شتێك بدزێ بای چوار یەکە دینارێکیش بێ دەبێ دەستی ببڕێ، ئەمەیان لەچی‌و ئەوەیان چی؟

زاناکە لە وەڵامدا گوتی: بێگومان بەرنامەی ئیسلام وایە هەر دەستێ پاك بێت دەستێکی پیرۆزو بەنرخە نابێ ببڕێ، کە بڕاش دەبێ خوێنەکەی بدرێ بەقەد پاکییەکەی خۆی، بەڵام ئەو دەستەی ناپاکە دەبێ ببڕێ‌و فڕێ بدرێ، ئنجا ئەو پارچە شیعرەی گوت:

---

[1]) دۆستی باوەڕداران ل ٧٢- ٧٣.

•ید بخمس مئین عسجد ودیت ** ما بالها قطعت في ربع دينار

تحكم مـا لنا إلا السكوت لـه ** وإن نعوذ بمـولانـا مـن النار

عز الأمانة أغلاها وأرخصها ** ذل الخيانة فافهم حكمة الباري.

واتە: دەستێك نرخەكی برینەكەی (٥٠٠) دیناری زێڕ بێت بۆچی لەپێناو چواریەكە دینارێكدا دەبڕێت، بێگومان دەستێك ڕاستو پاك بێت بەنرخە، ئەو دەستەی ناپاكیو خیانەتی پێ دەكرێ چرووكو بێنرخە[1].

[1]) دۆستی باوەڕداران ل ١٦٥.

### ٢٧٩. وەڵامدانەی پرسیار بەبەڵگەی عەقڵی

جارێك پیاوێك لەگەڵ خێزانەكە لە بەریتانیاوە دەچن بۆ وڵاتی یەمەن، لەوێ دەچن بۆ لای زانایەكی مسوڵمان، ژنەكە پرسیار لە كابرای زانا دەكاو دەڵێ: ئەگەر وەڵامم بدەیەوە باوەڕ بەخوا دێنم، زاناكە دەڵێ: فەرموو پرسیارەكەت بكە، ژنەكە دەڵێ: پێم بڵێ درێژیی و پانی ئەو خوایەی تۆ دەیپەرستی چەندە؟

زاناكە گوتی: باشە تۆ مێردەكەت خۆش دەوێ؟

ژنەكە: بەڵێ زۆرم خۆش دەوێ.

زاناكە: باشە ئەو خۆشەویستییەی تۆو مێردەكەت چەند كیلۆمەترە؟

ژنەكە: ئایا خۆشەویستی چۆن بە كیلۆمەتر دەپێورێ؟

زاناكە: باشە خۆشەویستی شتێكە لەو شتانەی كە خوا دروستی كردووە، كەچی نایەتە ژێر پێوانەی ئادەمیزاد، ئەی چۆن تۆ دەتەوێ ئەو خوایەی كە لەهەموو شتێ بەرزترو گەورەترە بێتە ژێر پێوانەی ئینسان، بەڕاستی ئەمە شتێكی نەگونجاوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿..لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى، واتە: خوا وەك هیچ شتێ نییە، یان هیچ شتێ وەك خوا نییە، بەم وەڵامەی زاناكە ئافرەتەكەو پیاوەكەی بەیەكەوە مسوڵمان بوون[1].

### ٢٨٠. یەكێ لە زوڵمەكانی حكومەتی بەعس لە كورد

كابرایەكی كوردی خۆمان بۆمان دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من لەمامۆستا مەلا دڵشادی گەلاڵیم گوێ لێبوو لە مزگەوتی شیناوە بۆی باس كردین، هەرچەندە لەوانەیە هەندێكم بیر چووبێ بەهەر حاڵ گوتی: لەساڵی (٢٠٠٣) من لەشاری موصل شۆفەڵێكم لە پیاوێكی عەرەب كری، كاتێك كە شۆفەڵەكەم بار كرد كابرای عەرەی گریا، منیش گوتم: كاكە بۆ دەگری؟ ئەگەر چاوت لە شۆفەڵەكەیە با بتدەمەوەو نامەوێ؟

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٦.

گوتی: بەخوا چاوم لێ نییە، خێری لێ ببینی، گوتم: منیش ناڕۆم تا پێم نەڵێی لەبەرچی دەگری؟ گوتی: با بۆت بگێڕمەوە، ئەو شۆفەڵە هی كوڕەكەم بوو، ئێستا مردووە ڕۆژێك هاتەوەماڵەوە هەر دەگریا منیش لێم پرسی بۆ دەگریت چی بووە؟

گوتی: بابە لە مەیدانی شۆفەلان بووم جێب قیادەك (ئۆتۆمبێلێكی سەربازی) هات چەند ئەفسەرێكی تێدا بوو ئێمەیان برد بۆ چۆڵەوانییەك، چەند قۆرتێكی زۆر گەورەیان بە ئێمە لێدا، ماوەیەكی پێچوو چەند زیلێكی عەسكەری هاتن پڕ بوون لە ژنو منداڵو كچو كوڕو پیاو هەموویان كورد بوون، بینیم هەموویانیان فڕێ دایە ناو قۆرتەكان، فەرمانیان بە ئێمە كرد كە خۆڵیان بەسەر دابكەین، یەكێك لە شوفێرەكانی كە لەگەڵمان بوو، گوتی: من خۆڵیان بەسەردا ناكەم، یەكسەر ئەویشیان كوشتو فڕێیان دایە نێو خەڵكەكە، ئێمەش لە ترسی ڕۆحی خۆمان بەقسەی وانمان كرد، دەستمان كرد بە خۆڵ بەسەر داكردنی ئەو بەستەزمانانە، كاتێ كە خۆڵمان بەسەردا دەكردن، ئافرەتێكم بینی خۆی بەسەر منداڵە ساواكەیدا دادابوو بۆ ئەوەی خۆڵەكە نەكەوێتە سەری، ئەو دیمەنەو ئەو ڕووداوە ئەوەندە كاریگەریی هەبوو بەسەر كوڕەكەم كە هاتەوە ماڵەوە تەنها سێ ڕۆژ ژیا ئەو سێ ڕۆژەش بەردەوام دەگریا تاوەكو وەفاتی كرد.

### ٢٨١. كاتێ نەمیمیت لەلا دەكەن و قسەی خەڵكییت بۆ دەهێنن

دەگێڕنەوە لە پێشەوا عومەری كوڕی عەبدولعەزیز كە پیاوێك دێتە لای دەڵێ ئەی پێشەوا فلانە كەس باسی كردووی، پێشەوا عومەریش دەڵێ: باشە ئەگەر دەتەوێ لە قسەكەت دەكۆڵمەوە، ئەگەر ڕاست نەكەی ئەوە ئەو ئایەتەت لەسەر دەچەسپێ كە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾ ﴾ الحجرات، ئەگەر قسەكەشت ڕاست بێ ئەو ئایەتەت لەسەر دەچەسپێ كە دەفەرمووێ: ﴿ هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ﴿١١﴾ ﴾ القلم، ئەگەرنا، حەز دەكەی

لەقسەکەت ناکۆڵینەوەو لێت دەبوورین، کابرا گوتی: ببوورە پێشەوای باوەڕداران من جارێکی تر ئەو کارە دووبارە ناکەمەوە[1].

## ٢٨٢. گفتو گۆیەك لەگەڵ شەیتان

خوای پەروەردگار لە ئایەتێکدا سەبارەت بە شەیتان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر، واتە: بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە کەواتە ئێوەش بەدوژمنی خۆتانی بزانن، بێگومان ئەو تاقم و کۆمەڵی خۆی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببن بە هاوەڵ و خاوەنی دۆزەخ.

شاعیر دەڵێ:

هب الشّبيبةَ تُبلي صاحبها ما غذرُ أشيب يستهويه شيطان

ئەگەر گەنجێتی و لاوێتی بیانوو بێ بۆ ئەنجامدانی تاوان، ئەی پیری چ بیانوویەکی هەیە جگە لە فێڵ و تەڵەکەی شەیتان، نەوەیەك لە نەوەکانی ئادەم دەڵێ: گفت و گۆم لەگەڵ شەیتانی نەفرین کراودا کرد لە شەوێکی دەیجوور(زۆر تاریك)دا، تا کاتێ گوێم لە بانگی بەیانی بوو ویستم هەستم بۆ مزگەوت بچم، پێی گوتم: شەوێکی دوورو درێژت لە پێشە بخەوە، منیش گوتم: دەترسم فەرزەکەم لەدەست بچێ، گوتی: کاتەکان زۆر زۆرن، گوتم: ئەترسم نوێژی بە کۆمەڵم لەدەست بچێ، گوتی: ئەوەندە تاعەت و عیبادەت لەسەر خۆت قورس مەکە، منیش هەڵنەستام تا خۆر هەڵات، بە هێواشی پێی گوتم: خەفەت لەوە مەخۆ لەدەستت چووە، ئەوڕۆ هەمووی کاتە بۆتۆ، منیش دانیشتم بۆ یادو زیکری خوا، ئەویش پەڕاوی یادەوەری تری بۆ کردمەوە، پێم گوت: خەریکت کردم نەمتوانی بپاڕێمەوە، گوتی: وازی لێبێنە بۆ ئێوارە، ویستم تەوبە بکەم، گوتی: چێژ لە گەنجێتیت وەرگرە، گوتم: ئاخر دەترسم لە مردن، گوتی: تەمەن زوو تەواو نابێ، ئەوجارە هەستام قورئان لەبەر بکەم، گوتی: نەکەی، دڵت ئاسوودە بکە بە گۆرانی، گوتم ئاخر حەرامە، گوتی: هەندێ زانا لەبارەیەوە قسەیان هەیە، گوتم فەرموودەکانی حەرام بوونی گۆرانی ئەوەتا نووسراوە،

---

[1]) تنبه الغافلين- ص ١٦٤- ١٦٥.

گوتی: فەرموودەکان هەمووی لاوازە، ئافرەتێکی قەشەنگ بەبەردەمما تێپەڕی، منیش چاوەکانم داخست، پێی گوتم: سەیر کردنی ئافرەت چی تیایە، گوتم: چۆن چی تیایە ئاخر ترسناکە، گوتی: بیر لەجوانیەکەی بکەوە خۆ بیرکردنەوە حەلاڵە، چووم بۆ کەعبەی ماڵی خوا، لەسەر ڕێگام ڕاوەستاو گوتی: ئەم سەفەرە چییە؟ گوتم: دەچم بۆ گەشتی عومرە، گوتی: ژیانی خۆت بۆ دەخەیتە مەترسییەوە بەهۆی ئەنجامدانی ئەو عەمرەیەوە، خۆ ڕێگاکانی خێرو چاکە زۆرە، گوتم هەر دەبێ خۆم پاك بکەمەوە لەگەردو ژەنگی گوناح، گوتی: ئێ خۆ بەکردەوەکانت ناچیتە بەهەشت، ویستم بچم بۆ ئەوەی ئامۆژگارییەك پێشکەش بکەم، پێی گوتم خۆت تووشی ئابڕوچوون مەکە، گوتم: ئامۆژگاری کردن خێری خەڵکی تیایە، گوتی: ئەترسم مەبەستت ئەوەبێ ناوبانگ پەیدا بکەی ئەمە زۆر ترسناکە سەری هەموو خراپەیەکە، گوتم بۆچوونت چییە لەبارەی هەندێ کەسەوە؟

گوتی: لەبارەی تاکو کۆمەڵەوە بۆت ئەدوێم، گوتم: ڕات بەرامبەر پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل چۆنە؟

گوتی: ئەحمەد کوشتمی ئەوەندەی بڵێ دەست بگرن بە قورئان‌و سوننەتەوە.

گوتم: ئەی پێشەوا ئیبن‌و تەیمیە سەبارەت بەو چی دەڵێی؟

گوتی: ئەو پیاوە هەموو ڕۆژێ بەسەرما دەکێشێ.

گوتم: ئەی پێشەوا بوخاری؟

گوتی: ئاگری بەرداوەتە ماڵەکە بەو کتێبەی خۆی کە صەحیحی بوخارییە.

گوتم: ئەی حەججاجی سەقەفی؟

گوتی: خۆزگە لەنێو خەڵکدا بەهەزاران حەججاجی دیکە هەبووایە، دڵم زۆر پێی ئاسوودەیە.

گوتم: ئەی فیرعەون؟

گوتی: لە ئێمەوەیە سەرخستن‌و یارمەتی دانی.

گوتم: ئەی قارەمانی ڕۆژی حتتین (صەلاحەددینی ئەییوبی)؟

گوتی: هەر لێیگەڕێ ئێمەی لە قوڕێکەوە وەردا.

گوتم: ئەی ئەبو جەهل؟

گوتی: لەگەڵ ئەودا براو کەسی یەکترین.

گوتم: ئەی ئەبو لەهەب؟

گوتی: ئەو پیاوە بۆ کوێ بڕوا ئێمە لەگەڵیین.

گوتم: ئەی لینیین؟

گوتی: لەگەڵ ئەوو ستالیندا ڕیزمان گرتووە لە ئاگر.

گوتم: ئەی گۆڤارە بێ ئابڕووەکانی ئەو سەردەمە؟

گوتی: ئەوانە شەریعەتی ئێمەی شەیتانن.

گوتم: ئەی سەتەلایت؟

گوتی: خەڵکی پێ دەکەین بە ئاژەڵ.

گوتم: ئەی چایخانەو کافتریاکان؟

گوتی: لە پێشەوازی داین بۆ هەموو ئەو بێئاگایانەی کە ڕووی تێدەکەن.

گوتم: ئەی زیکری ئێوە چییە؟

گوتی: گۆرانی.

گوتم: ئەی کردارتان؟

گوتی: بەهیوا کردنی خەڵکی.

گوتم: ئەی بۆ بازاڕ چی دەڵێی؟

گوتی: ئالآی ئێمە لەوێدا دەشەکێتەوە هاوڕێکانمانی لێ کۆدەبێتەوە.

گوتم: ئەی ئێوە چۆن چۆنی خەڵکی گومڕا دەکەن؟

گوتی: بەگومان خستنە دڵەکانو گۆرانیو بێئاگایی لە خواو، هیوای تەمەن درێژیو، ئاواتو ئارەزووە گڵاوەکان.

گوتم: ئەی کاربەدەستان چۆن گومڕا دەکەی؟

گوتی: بە تینووێتی بۆ ڕژاندنی خوێنی خەڵکیی، لەگەڵ ڕەت کردنەوەی ئامۆژگاریی زانایانو دانایان و بڕوا کردن بە قسەی کاڵفامان.

گوتم: ئەی چۆن ئافرەتان گومڕا دەکەی؟

گوتی: بەخۆڕازاندنەوەو نەپۆشینی پۆشاکی شەرعی، گوێنەدانە فەرمانی خواو ئەنجامدانی تاوان.

گوتم: ئەی زانایان چۆن گومڕا دەکەی؟

گوتی: بە خۆبەگەورە زانینو حەز کردن بە دەرکەوتنیان لەناو خەڵکیو هەروەها هێرەیی بردنیان بەیەکتری.

گوتم: ئەوە زانایان، ئەی خەڵکی ئاسایی؟

گوتی: بەغەیبەت کردنی یەکتریو قسە هێنانو بردنی نێو خۆیان.

گوتم: ئەی بازرگانەکان؟

گوتی: بە ڕیبا (سوو) لە کڕینو فرۆشتنو نەبەخشینی ماڵ، لەگەڵ زیادەڕۆیی کردن لە خەرج کردنی پارەو پووڵ بۆ ماڵو منداڵ.

گوتم: ئەی گەنجان چۆن گومڕا دەکەی؟

گوتی: بەڕابواردنو شەیدایيو گوێنەدانە یاساو ڕێساکانی خوا، هەروەها بەجێهێنانی کاری حەڕام و نەزەر کردن.

گوتم: ئەی سەبارەت بە ئیسرائیل چی دەڵێی؟

گوتی: تکایە غەیبەتیان مەکە چونکە غەیبەت کردن بەلایە، ئەو وڵاتە زۆر خۆشەویستە، لەدڵی ئێمەوە نزیکە.

گوتم: ئەی سەبارەت بە (جاحظ) چی دەڵێی؟

گوتی: پیاوێکە لەنێوان دایە، کاری زۆر ڕوون نییە.

گوتم: ئەی ئەبو نەوواس چی؟

گوتی: لەسەر سەرو سەرچاوم دایدەنێم.

گوتم: ئەی خەڵکانی تازەگەر؟

گوتی: زانستیان لە ئێمەوە بە میرات وەرگرتوە.

گوتم: سەبارەت بە عەلمانیەت ڕات چۆنە؟

گوتی: بیرو باوەڕی ئێمە عەلمانیەتە، ئەوان خەڵکانی فریو دەرو هەڵخەڵەتێنەرن، ئەوەی ناوی ئەوان بێنێ ناوی منی هێناوە ئەوەی ئازاریان بدا ئازاری منی داوە.

گوتم: ئەی چی دەڵێی سەبارەت بە واشنتۆن؟

گوتی: وتار بێژەکانم لەوێدان لەوێوە سوپاسگوزاری من بەڕێ دەکەوێ هەر ئەوێش خاكو نیشتمانی منە.

گوتم: بۆچوونت چۆنە بەرامبەر بانگخوازان؟

گوتی: ئازارم دەدەن و گەلێ ماندووم دەکەن، ئابروویان بردووم، پیریان کردووم، ئەوەی من بینای دەکەم ئەوان دەیڕوخێنن، من گۆرانی دەچرم ئەوان قورئان دەخوێنن، کە ئەچم بۆلایان پەنا بەخوا دەگرن لێم.

گوتم: چی دەڵێی سەبارەت بە ڕۆژنامەکان؟

گوتی: کاتی خەڵکی پێ بەفیڕۆ دەدەین، تەمەنی ئارەزووبازانی پێ بەڕێ دەکەین.

گوتم: چی دەڵێی دەربارەی (هيئة الإذاعة البريطانية)؟

گوتی: هەنگوین و ژەهری پێ تێکەڵ دەکەین، کوشتاری پێ دروست دەکەین لەنێوان عەرەب و عەجەمدا، بەشان و باڵی ستەمکاراندا هەڵدەڵێین.

گوتم: ئەی چیت کرد بە قەلە ڕەش؟

گوتی: کوڕە خراپەکەی ئادەممان زاڵ کرد بەسەر کوڕە باشەکەیدا کوشتی‌و لەخاکی نا تا دیار نەما.

گوتم: چیت کرد بە قاروون؟

گوتی: پێم گوت خەزێنەکەت بپارێزە ئەی کوڕی پیرەژن، تۆ یەکێکی لە هێماکانی ئێمە.

گوتم: ئەی چیت بە فیرعەون گوت؟

گوتی: پێم گوت: ئەی گەورەی کۆشك‌و تەلار بڵێ: ئەی مولکی میصر هی من نییە؟ بەم گوتەیە سەردەکەوی.

گوتم: چی دەڵێی بە مەی خۆرەکان؟

گوتی: پێیان دەڵێم بخۆنەوە شەراب خەم‌و خەفەتتان لادەبا، خەمتان هەر نەبێ، دەرگای تۆبە هەمیشە کراوەیە.

گوتم: چی دەتکوژێ؟

گوتی: ئایەت کورسی دڵم تەنگ دەکات‌و بەندم دەکا.

گوتم: کێ خۆشەویسترین کەستە؟

گوتی: گۆرانیبێژە سەرەڕۆیەکان‌و شاعیرە مولحیەدەکان‌و بێ ئابڕووەکان.

گوتم: زۆر ڕقت لە کێیە؟

گوتی: ڕقم لەو کەسانەیە کە بەردەوام هاتو چۆی مزگەوت دەکەن، هەموو بەیەکەوە کڕنوش‌و سوژدە بۆ خوا دەبەن بەڕێکی، خوا پەرستێ کە دونیا بەکەم دەگرێ، ئەو کەسانەی تێدەکۆشن لەڕێی خوا.

گوتم: پەنا بەخوا دەگرم لەتۆ، وون بو دیار نەما، چوو بەزەوییداو تێك شكا، ئەمەیە سزای درۆزن[١].

## ٢٨٣. پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ كابرایەكی نابینا

لە عوسمانی كوڕی حونەیف دەگێڕنەوە كە پیاوێكی نابینا هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێكرد كە بۆی لەخوا بپاڕێتەوە چاوەكانی چاك بكاتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر حەز دەكەی دوعات بۆ دەكەم چاوەكانت چاك ببنەوە، ئەگەر ئارامیش بگریت ئەوە بەهەشتت بۆ هەیە، پیاوەكە گوتی: دەمەوێ بۆم بپاڕێیتەوە چاوەكانم چاك ببێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێكرد دەست نوێژێك بگرێو ئەو دوعایە بكات {اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ يَا مُحَمَّدُ إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ فَتَقْضِي لِي اللَّهُمَّ شَفِّعْهُ فِيَّ} واتە: ئەی خوایە داوات لێدەكەم وە ڕووت تێ دەكەم بە پێغەمبەرەكەت ﷺ كە پێغەمبەری ڕەحمەتە، ئەی موحەممەد من ڕوو بەهۆی تۆوە ڕوو لەخوا دەكەم، بۆ جێبەجێ بوونی پێویستییەكانم، ئەی خوایە تكای پێغەمبەر (بۆ شیفای چاوەكانم) وەربگرە، كابرا ئەو دوعایەی كردو چاوەكانی چاك بوویەوە[٢].

عوسمانی كوڕی حونەیف دەڵێ: پیاوێك زۆر دەچووە لای عوسمانی كوڕی عەففان بۆ كارێك كە بۆی جێبەجێ بكات، ئەو كاتە عوسمانی كوڕی عەففان خەلیفەی مسوڵمانان بوو، بەڵام پێشەوا عوسمان كارەكەی بۆ ئەو پیاوە ئەنجام نەدەدا، ڕۆژێك ئەو پیاوە چاوی دەكەوێ بە عوسمانی كوڕی حونەیف حاڵی خۆی بۆ گێڕایەوە، عوسمانی كوڕی حونەیف پێی گوت: بڕۆ دەست نوێژێك بشۆ لەپاشان دووڕكعات نوێژ بكە لە مزگەوت، پاش نوێژەكە بڵێ: خوایە من داوات لێدەكەمو لێت دەپاڕێمەوە بە پێغەمبەرەكەمان كە پێغەمبەری ڕەحمەتە، ئەی موحەممەد من بەتۆ ڕوو لەخوا دەكەم تاكو خوا پێویستیەكەم جێ بەجێ بكا، پاشان پێویستیەكەت بڵێ، پیاوەكەش ئەوەی كە عوسمانی كوڕی حەنەیف گوتبووی

---

[١]) قوربانیەكانی شەیتان ل ١٢٤- ١٢٩.

[٢]) ئەو ڕووداوە هەریەك لە پێشەوایان ئەحمەدو ترمزیو نەسائیو ئیبن ماجە ڕیوایەتیان كردووە، وە شێخی ئەلبانیو شێخ شوعەیب بە صەحیحیان داناوە.

ئـاوای ئـەنجام دا، ئنجـا چـوو بـۆ لای عوسمـانی کـوڕی عـەففان، دەرگەوانـەکان دەسـتی پیاوەکەیان گرت بردیانە لای عوسمانی کوڕی عەففان، لەلای خەلیفە عوسمانیـان دانیشاند، لەسەر بەڕەکەی ئەو، عوسمان بە پیاوەکەی گوت: پێویستییەکەت بڵێ، پیاوەکەش ئەوەی دەیویست پێی گوت، پێشەوا عوسمانیش بۆی جێبەجێ کرد، بەپیاوەکەی گوت: تا ئەو کاتە پێویسـتییەکەتم لـەبیر نـەبوو، بەپیاوەکـە گـوت: هـەر پێویسـتییەکت هـەبوو وەرە بـۆت جێبەجێ دەکەم، ئنجا پیاوەکە لای عوسمانی کوڕی عەففان ڕۆیشتو گەیشت بـە عوسمانی کوڕی حونەیف پێی گوت: خوا پاداشتت بداتەوە هەتا تۆ باسی منت لـەلای خەلیفە نـەکرد مـنی بـەبیر نـەبوو، عوسمـانی کـوڕی حونـەیف گـوتی: سـوێند بـەخوا باسـی تـۆم لـەلای ئـەو نەکردووە، بەڵام جارێکیان بینیم کوێرێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بـۆ ئـەوەی دوعـای بۆ بکاتو چاوەکانی چاك ببنـەوە، پێغەمبـەری خـواش ﷺ پێـی فـەرموو: بـڕۆ دەسـت نوێـژ بگرەو دوو ڕکعات نوێژ بکە پاشان ئەو دوعایە بکە، کە من بەتۆم گوت، پیـاوە کـوێرە پیرەکـە دوعاکـەی کـرد، سـوێند بـەخوا زۆری پێنەچـوو هاتـەوە لامـان چـاوەکانی بەشـێوەیەك بـوو دەتگوت هەر کوێر نەبووە[1].

## ٢٨٤. وێنەی خۆشەویستی یەکێ لە هاوەڵان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

تەبەڕانی لە ئـەبو سـەعیدی خودریـەوە هێناویـەتی کـە مـالیکی کـوڕی سینان لـە ڕۆژی ئوحـوددا خوێنەکـەی ڕووی پێغەمبــەری خــوای ﷺ قووتـدا، پێیــان گــوت: خوێنەکـەت خــواردەوە؟ گــوتی: بــەڵێ خــوێنی پێغەمبــەری خوایــە ﷺ، بــۆ پێغەمبــەری خوایــان ﷺ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی (خوێنم تێکەڵی خوێنی یەکێ بێ ئاگری دۆزەخ نایسوتێنێ)[2].

---

[1]) ئەو بەسەرهاتە پێشەوایان تەبەڕانی لە (الكبير) بە ژمارە (٨٣١١٠) ئیبن سوننی لە (عمل اليوم والليلة) ڕیوایەتی کردووە، وە حاکم بە صەحیحی داناوە ١/ ٥٢٦، وە زەهەبیو هەیسەمی ڕیوایەتی کردووە لە (مجمع الزوائد) مونزیری لە تەرغیبو تەرهیب ڕیوایەتی کردووە وە ئیبن تەیمیە لە (التوسل والوسيلة).

[2]) حياة الصحابة ج٢ لا ٢٠، پێشەوا هەیسەمی دەڵێ: لە سەنەدەکەیدا کەسێکی وا نابینم یەك دەنگی هەبێ لەسەر لاواز بوونی.

### ٢٨٥. خوێنی حیجامەی پێغەمبەری خوا ﷺ لای یەکێ لە هاوەڵانی بەڕێز

تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە کە جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ کەلەشاخی گرتو بەیەکێ لە هاوەڵانی فەرموو: (ئەو خوێنە فڕێدە شوێنێك دوور بێ لە مرۆڤو ئاژەڵو باڵندە) هاوەڵەکە دەڵێ: منیش ڕۆیشتم تا دوورکەوتمەوە، دوایی خوێنەکەم هەموو خوارد، ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئەویش پێکەنی[١].

### ٢٨٦. خواردنی سوو (ڕیبا)و سەرەنجامەکەی

کەسێك باسی سەرەمەرگی مامیمان بۆ دەکاتو دەڵێ: مامم نوێژی دەکرد بەلاَم نوێژەکانی بێ بایەخ بوون، چونکە لای ئەو تەنها گرنگ ئەوەبوو ئەو نوێژانە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، لە مانگی ڕەمەزانیشدا نەبێ قورئانی نەدەخوێندنەوە، هەروەها لەگەڵ بانکە ڕیبا خۆرەکاندا مامەڵەی دەکرد، باوەڕی بەوە نەبوو کە ئەو زیادەیە ڕیبا بێ، بەڵکو بە بازرگانی کردنو قازانجی لەقەڵەم دەدا، ساڵێك بەر لە مردنی تاکە خەمی لەو دونیایەدا ئەوەبوو، بەژداری زیاتری بانکە ڕیبا خۆرەکان بکات، ئەو کەسە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە ئەو مامەی تووشی نەخۆشیەك بوو گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانە، کاتێك چووین بۆ دیدەنی کردنی، لەژوور سەریەوە دانیشتم، بۆ ئەوەی شایەتمانی بیر بخەمەوە، بەلاَم هەرگیز شایەتمانی بەسەر زاردا نەهات، بەڵکو ئەیگوت: واز لە بازرگانی سەهمەکان مەهێنن، لەدوای مردنی مندا واز لە بەشداری کردنتان لەو کارە مەهێنن، بەلاَم من لێی بێئومێد نەبووم، بەڵکو هەر ووشەی یەکتاپەرستیم بۆ دووبارە دەکردەوە، بەڵکو زمانی بێتە گۆو شایەتمان بێنێ، مامم هەر دەیگوت واز لە بازرگانی پشك مەهێنن لەدوای خۆم سەهمەکان مەفرۆشن، بەداخەوە هەر ئەوەندەی دووبارە کردەوەو لەسەر ئەو قسانەی گیانی کێشرا پەنا بەخوا، ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕا[٢].

---

[١]) الهیثمي دەڵێ کەسەکانی ناو سەنەدەکەی تەبەرانی جێی متمانەن.

[٢]) قوربانیەکانی شەیتان ل ٢٣١- ٢٣٢.

## ٢٨٧. چاکە کردن لەگەڵ دایك

لە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەگێڕنەوە پیاوێك پێی گوتووە من کەسێکم کوشتووە ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ پێشەوا عومەر دەڵێ ئایا دایکت زیندوووە؟ پیاوەکە گوتی: نەخێر، ئەوجارە پێی گوت: باوکت زیندوووە؟ گوتی: بەڵێ، پێشەوا عومەر گوتی: دەی لەگەڵ باوکتدا باش بەو چاکەی لەگەڵدا بکە، پێشەوا عومەر گوتی: ئەگەر دایکی زیندووو بوایەو چاکەی لەگەڵ دایکیدا بکردایە ئومێدم وابوو کە خوا بەو هۆیەوە گوناهی کوشتنەکەی بۆ بسڕێتەوەو عەزابی نەدا[1].

## ٢٨٨. ئەوەی چاڵ بۆ خەڵك هەڵکەنێ خۆی دەکەوێتە ناوی

کەسێك ئەوەی نووسیوەو دەڵێ: بەسەرهاتێك دەگێڕمەوە کە بەسەر هاوڕێیەکم روویداوە، ئەو هاوڕێیەم جارێکیان لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆیدا بەڵێنی بەژداری کردن لە ئاهەنگێکی شەوانە بەیەکتر دەدەن، بەردەوام خوویان بەمە گرتبوو، هاوڕێکەی پێی دەڵێ: ئەمشەو من ژنێکم لایە زۆر جوانە، خۆشی لەزەتێکی باشی لێ وەردەگرین، بەلام هاوڕێکەی نەیدەزانی ئەو ئافرەتە کێیە؟ نەیدەزانی ئەو ئافرەتەی وا خەریکە لەگەڵی ڕابوێرێ چی هاوڕێیەکەیەتی؟ چوونە شوقەیەك ئافرەتەکە لە چێشتخانە خەریك بوو چایان بۆ بێنێ‌و خۆی بۆیان ئامادە بکات، هاوڕێکەشی لە هۆڵ دانیشتبوو سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد، کاتێك ئافرەتەکە هاتە ژوورەوەو چاکەی هێنا، ئای لەو کارەساتە گەورەیە!! ئافرەتەکەی بینی شڵەژاو زمانی تێك ئالا ئای ئەمە چییە؟!! پێویستە ڕاستی دەرکەوێ خۆ ئەمە ژنەکەی خۆیەتی هیچی بۆ نەمایەوەو ئەوەنەبێ لەبەر دەرگاکە خێزانەکەی خۆی سێ بەسێ تەلاق بدا، هاوڕێکەی تێگەیشت ئەوە خێزانی هاوڕێکەیەتی، ژنەکە دەستی کردە گریان بەلام تازە گریان چ سوودێکی هەیە، ژنەکە هیچی بۆ نەمایەوە ئەوەنەبێ هەڵەیەکی گەورەتر ئەنجام بدات ئەویش بریتیی بوو لەوەی خۆی سوتاند[2].

---

[1]) صفحات المشرقة في حياة السابقين، ل ٢٣٢- ٢٣٣.

[2]) قوربانییەکانی شەیتان ل ١٧٧- ١٧٨.

### ٢٨٩. گرنگیی نزای بەیانیان و ئێواران

پیاوێك هاتە لای ئەبو دەردائو گوتی: ماڵەکەت سووتا، گوتی: نەسووتاوە خوای گەورە ئەوەم بەسەر ناهێنێ، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ فەرموویەتی هەندێ وشە هەن گەر مسوڵمان لەسەرەتای ڕۆژ بیانخوێنێ هیچ بەلایەکی تووش نابێ تا شەو دادێت، هەر کەسێك لەشەودا بیخوێنێ هیچ بەلایەکی تووش نابێ تا ڕۆژ هەڵدێ، وشەکانیش ئەمانەن (إِنَّ رَبِّيَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، مَا شَاءَ اللَّهُ كَانَ وَمَا لَمْ يَشَأْ لاَ يَكُونُ، لاَ حَوْلَ، وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ، أَشْهَدُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا ، أَعُوذُ بِالَّذِي يُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الأَرْضِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ مِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ رَبِّي آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا، إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ)[1]، لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پیاوەکە بەبەردەوام دەهاتەوە لای ئەبو دەردا دەیگوت: من دەزانم ماڵەکەت سووتاوە، ئەویش هەر دەیگوت: نەسووتاوە، لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە کە هەرکەسێ ئەو ووشانەی سەرەوە بڵێ بەیانیان و ئێواران تووشی هیچ بەلایەك نابێ، منیش ئەمڕۆ ئەو وشانەم گوتووە، دوایی گوتی: با بچین ئێمەش لەگەڵی چووین گەیشتین بە ماڵەکەی ئەبو دەردا بینیمان دەورو بەری ماڵەکەی هەموو سووتا بوو تەنها ماڵی ئەو نەبێ[2].

### ٢٩٠. خۆ تەداوی کردن بە قورئانی پیرۆز

عەوف کوڕی مالیك دەڵێ: باوکی عەوف نەسجەعی نەخۆش کەوت پێیان گوت: ئایا چارەسەرت نەکەین؟ گوتی: هەندێ ئاوم بۆ بێنن چونکە خوای تەعالا دەفەرمووێ: ﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا ...﴿٩﴾ ﴾ ق، دوایی گوتی: هەنگوینم بۆ بێنن چونکە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ ...يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ...﴿٦٩﴾ ﴾ النحل، دوایی گوتی: زەیتم بۆ بێنن چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ ...مِن شَجَرَةٍ

---

١) أخرجه أيضًا : الطبراني في الدعاء رقم: (٣٤٣)، وابن عساكر، وابن الجوزي في "العلل المتناهية" رقم: (١٤٠٠) ، وَقَالَ: لا يثبت وآفته من الأغلب قالَ يحيى بن معين: ليس بشيء . وَقَالَ البُخَارِيُّ: مُنْكَرُ الحَدِيث.

٢) صفحات مشرقة في حياة السابقين ص ٥١.

مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ ...﴿٣٥﴾ ﴾ النور، پاش ئەوەی هەموو ئەمانەیان بۆ هێنا هەمووی تێکەڵ بەیەکتر کردو خواردییەوە بەمەش خوای گەورە شیفای دا [١].

## ٢٩١. وەڵامی ئەو کەسەی جوێنت پێدەدا

کەسێکی دەشتەکەی جوێن بە کەسێکی تری دەشتەکی دەدا، ئەوەی جوێنەکەی پێدراوە هیچ وەڵامێك ناداتەوە، پێی دەڵێن: بۆ جوێنت پێی نەداوە؟

گوتی: هیچ زانیارییەکم لەسەری نییە چ کەمو کورییەکی هەیە یان چ شتێکی خراپی هەیە تا وەك جوێن پێی بڵێمەوە، ناشمەوێ ئەگەر شتێکی تێدا نەبێ پێی بڵێم چونکە ئەوەش دەبێتە بوختان کردن[٢].

## ٢٩٢. بەزەیی هاتنەوە بە مێروو مەگەز

لە یەعقوبی کوڕی کوڕاز دەگێڕنەوە دەڵێ: چوومە لای ئەحمەدی ڕیفاعی لە ڕۆژێکدا کە زۆر سەرما بوو، دەست نوێژی شووستبوو، بینیم دەستەکانی قەپات کردبوو ماوەیەکی دوورو درێژ دەستەکانی نەدەکردەوە، منیش چوومە پێش تا دەستەکانی ماچ بکەم، گوتی: یەعقوب لەو بێ دەستەلاتانەت تێکدا، منیش گوتم: ئەوە چییە؟ گوتی: پێشکەیە (میشوولە)، ئەو پێشکەیە ڕزقو ڕۆزییەکەی ئەوەبوو لەدەستی من وەدا، بەلام بەو تۆقە لەگەڵ یەکتر کردنەمان فڕی، (دەستی خۆی نەدەجوولاند بۆ ئەوەی پێشکەکە نەفڕێ)، ڕۆژێکی تر بینیم قسەی دەکردو دەیگوت: ئەی پیرۆز بەتۆم نەزانی لەشاری خۆتم دوورخستیەوە سەیرم کرد کللۆیەك بە کراسەکەی وەیە، ئەویش وا ئەو قسانەی لەگەڵ دەکاتو داوای لێبوردنی لێدەکات[٣].

## ٢٩٣. بەکارهێنانی حیکمەت لە بانگخوازیدا

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٤.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢١٧.

[٣]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩٣- ٢٩٤.

عـەمرِ خالیـد دەڵێ: ڕووداوێـك هەیـە لـە ژیـانی خۆمـدا زۆر سەرسـامی کـردووم، لـە سـەرەتای ژیـانی بـانگخوازی بـووم، پـاش تـەواو کردنـی خوێنـدن لـە نووسـینگەیەکی پێداچوونەوە کارم دەکـرد، بەڕێوەبەرەکەم پیـاوێکی زۆر چاك بـوو نـاوی مامۆسـتا صـەلاح بـوو، زۆر بـە هـەڵسو کەوتـەکانی سەرسـام بـووم، چـونکە کەسـێکی دینـدار بـوو وە لەگـەڵ دینداریەکەشیدا پیـاوێکی میـانڕەوو ڕەوشـت بـەرز بـوو، بـەلاّم هەرچـەندی سـەرنجیم دەدا دەمبینی حەڵقەیەکی زێڕ لـە دەستیەتی، دەشـزانم پێغەمبـەری خـوا ﷺ حـەرامی کـردووە، لەدەرفەتێك دەگەڕامْ منو ئەو بەتەنیا بین تا بتـوانم بـەهێمنیو لەسـەرخۆییو ناڕاستەوخۆ تێی بگەیەنم کە زێڕ حەرامە بـۆ پیـاوان، ڕۆژێکیـان دەرفەتەکە ڕەخسـا پـێم گـوت: مامۆسـتا صـەلاح مـن زۆر بـە هـەڵسو کـەوتو ڕەوشـت بـەرزییت سەرسـامم، بـەلاّم وا دەبیـنم حەڵقەیـەکی زێـڕ لـە پەنجـەت دایـە، ئەمـەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ قەدەغـەی کـردووە بـۆ پیاوانی ئۆممەتەکەی، کاتێ ئەو قسەیەم کرد، گـوتی: پێغەمبـەری خـوا وای فـەرمووە؟ گـوتم: بـەڵێ، دەسـت بـەجێ لەپەنجـەی دەریهێنـا، بەڕاسـتی بـەو وەلاّمدانـەوە بەپەلەیـەی ئـەو بـۆ پێغەمبـەری خـوا زۆر سەرسـام بـووم، بـۆ ڕۆژی دوایـی لەبـەردەم فەرمانبـەرەکان گـوتی: مـن حەڵقە زێڕەکەم لەپەنجەم کردەوە چونکە عـەمر پێـی گـوتم: کە پێغەمبـەری خـوا حـەرامی کردووە، منیش ئامادە نیم خـوای پـەروەردگار لـەخۆم تـووڕە بکـەم، لەڕاسـتیدا ئـەو قسانەی مامۆستا صەلاح لەناخەوە هەژاندمی بەوەی کـە مـرۆڤ هەسـت بـەگرنگی ڕازی بـوونو تـووڕە بوونی خوا بکات لەهەر کارێك لە ژیانی[1].

### ٢٩٤. بەرنامەی خێزانێك بۆ قورئان خوێندن

عـەمرِ خالیـد دەڵێ: لـە ولاّتـی ئینگلتـەرا بـووم، لـە بنکەیـەکی ئیسـلامی ئـەو ولاّتـە پیاوێکی میصری لەخواترسم ناسی، بەیەکەوە بووین پێی گوتم: دەمـەوێ دیاریـەك بکـرِم بـۆ خێزانەکـەم، گـەڕاین بـەدوای دیاریـەکی شـیاو، کاتێـك مـن مانـدوبووم، ئـەو پیاوە میصـرِییە تەمەنی (٦٠) سـاڵ بـوو، شـتێکی بینیبـا پێمـی دەگـوت: ئەمـەت پـێ چـۆنە دەبـێ خێزانـەکەم ئەمـەی بـەلاوە چـۆن بـێ؟ منـیش دەمگـوت: سـوێند بـەخوا نـازانم، نرخـی هەنـدێ کـالاّی دەپرسی پارەکەیان زۆر بوو، کەچی ئەو دەیگوت: گـرنگ نییـە بەلامـەوە، ئـەوەی گـرنگ بـێ

[1]) پەیڤێك لە دڵەوە ل ١٠٦.

ئەوەیە خێزانەکەم کامەران بێ، کاتێ گەڕاینەوە بۆ میصر، ڕۆژێکیان لەناکاو بەبێ مەوعیدێکی پێش وەختە سەردانم کرد، منی لە ژوورێك دانا پێی گوتم بۆ چەند دەقیقەیەك بەجێت دەهێڵم چونکە ئێستا مەوعیدی قورئان خوێندنی ڕۆژانەم هەیە لەگەڵ خێزانەکەم، ئەو مەوعیدەمان داناوە بۆ قورئان خوێندن نابێ بەهیچ شێوەیەك لەدەستمان بچێ[١].

٢٩٥. **خۆشەویستی ڕاستەقینەی کوڕو کچان ئاوایە**

عەمر خالید دەڵێ: هاوڕێیەکی تایبەتیم هەبوو کچێکی خۆش دەویست، تەواوی قوتابیانی ناو یانەی کۆلێژ دەیانزانی کە پەیوەندییەکەیان چەند بەهێزە، ئەو کچ و کوڕە وابەستە بوون بەیەکەوە زۆربەی قوتابیانیش ئەمەیان دەزانی، ئەو پەیوەندییەیان بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی خوای بەبەزەیی هیدایەتی خۆی خستە دڵی کوڕەکەوە، ئەو کوڕە بەرەو پابەندی بە دینی خوا چوو، بەڕاشکاوی بە کچەکەی گوت: من تۆم زۆر خۆش دەوێ ناتوانم وا وازت لێبێنم، بەڵام ئێستا هەست دەکەم لەخوا نزیك دەبمەوە، ناتوانم دوو خۆشەویستی پێکەوە بکەم، خۆشت دەزانی ئێستا دوو ساڵم ماوە خوێندن تەواو بکەم، ئەگەر خوا بیەوێ دوو ساڵی تر دێمە خوازبێنیت، بۆیە بڕیارم داوە ئەم دووساڵە ئەو پەیوەندییەی نێوانمان ڕاگرم، پاش دوو ساڵەکە هاوڕێکەم بەڵێنەکەی خۆی هێنایەجێ کچەکەی خوازبێنی کرد، ئێستا خاوەنی (٥) منداڵن، بەردەوام خۆشەویستیان پەرە دەستێنێ، کتێبێکی نووسیوە من زۆر پێی سەرسامم، لە کتێبەکەیدا دەڵێ: ئێمە ملکەچی پەروەردگارمان بووین، ئەویش بەکامەرانیو بەختەوەریو خۆشەویستی خەڵاتی کردووین[٢].

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٧.

[٢]) پەیڤێك لە دڵەوە ل ٨٦- ٨٧.

### ٢٩٦. پارمەتیی و دڵدانەوەی ئیماندارانی هەژار

ڕۆژێك هێندێ لە هاوڕێکانی بیشری حافی لە کەش و هەوایەکی زۆر سارددا هاتنە خزمەتی، کاتێك چوونە ژوورەوە دەبینن وا جلەکانی لەبەر کردۆتەوەو لەسەرمان دەلەرزێ، گوتیان: ئەمە چییە ئەی ئەبو نەصر؟

ئەویش گوتی: هەژاران و بێنەوایانم بیر کەوتەوە بەو کەشە سارده هیچم نەبوو تا یارمەتیان بدەم، گوتم با هەر لە سەرمابوونەکەیاندا بەژدار بم[1].

### ٢٩٧. جۆری قوتابخانەو کاریگەریی لەسەر قوتابیان

کچێك دەڵێ: دەمەوێ بڵێم ئەو بابەتە لە پەرەسەندنی پەروەردەی ئاینییەوە دەست پێ دەکات، هەرچەند مرۆڤ ڕووبەڕوی مەترسی و سەختییەکان بێتەوە پێویستە جارێکی دیکە سەر لەنوێ بگەڕێتەوە سەر کارە ڕاستەکان، من کچێکم سەرەتا لە قوتابخانەیەکی ئیسلامیدا لەکاتی نوێژەکاندا فەرشمان ڕادەخست و نوێژەکانمان دەکرد، زۆر هەستم بە ئیسلامەتیی و دینداریی دەکرد لە هەموو ساتێکدا، بەلام بەداخەوە گرفتێك لە قوتابخانەکەمان هاتە پێش و لەسەر خواستی باوکم گوێزرامەوە بۆ قوتابخانەیەکی دیکە، کاتێ گوازرامەوە بۆ قوتابخانەکەی دووەمم دووچاری گرفتی هاوەڵ گرتن بووم، زۆر ماندو بووم هەموجار دەچوومە لای دایکم و دەمگوت: کوا دین و ڕەوشت، دایکە من دەترسم، لەو کاتەدا من یەکەمی قۆناغی ئامادەیی بووم، دەمویست بالاپۆشی بکەم، بەلام هەمووان لەسەر من دەدوان، هیچ هاوڕێکم نەبوو وەك خۆم، ئارامم گرت و لە پەروەردگارم دەپاڕامەوە دەمگوت پەروەردگارم لەسەر بەندایەتی کردن بۆت دامەزراووم بکە، ئەو دوعاو پاڕانەوەو پشت بەستنەم بەخوا بووە هۆی ئەوەی سەرکەوتووبم لە بەدەست هێنانی هاوڕێیەك، ئێستا هاوڕێمەو هەریەکمان ئەوەی دیکەمان دامەزراوتر دەکات، ئەو هاوڕێیەم حیجابی دەپۆشی، منیش بوومە یەکێك لە کچە بالاپۆشەکان وە کاتێك چووینە کۆلێژ هەر بەردەوام بووین،

---

[1] ئاوێتەی دڵ ل ٣١٩.

لە نێوان دەرسەکاندا پێی دەگوتم: وەرە با زیکری خوا بکەین‌و (سبحان الله) و (أستغفر الله) بکەین[1].

## ٢٩٨. ترسان لە سوێند خواردن

پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) خەریکی دزی کردن بوو، ڕۆژێکیان لە شوێنێك دەیویست دزی بکات کە شوێنی هاتوو چۆی عیسا ( علیه السلام ) بوو پێغەمبەر عیسا پیاوەکەی بینی بە ئەسپایی نزیکی بوویەوەو پشتە ملی گرت‌و پێی فەرموو: ئەوە عەیب ناکەی دزی دەکەیت؟ پیاوەکەش گوتی: سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەکی تر نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لەو دزی ناکەم، سوێندەکە ئەوەندە گەورە بوو لەدڵ‌و دەروونی پێغەمبەری عیسا ( علیه السلام ) باوەڕی بە پیاوەکە کرد، پێی فەرموو: داوای لێبوردن دەکەم لەوەی گومانی خراپم پێ بردی، کە پێغەمبەر عیسا لە شوێنەکە ڕۆیشت پیاوەکە زۆر هەستی بە خەجاڵەتی کرد لەو سوێندە گەورەی کە خواردی، ڕایکرد بەدوای پێغەمبەر عیساو، گوتی: من خەجاڵەتم تۆ ڕاستت کرد ئەی عیسای پێغەمبەری خوا من خەریکی دزی کردن بووم، پەیمان بێ ئیتر دزی نەکەم چیدیکە سوێندی بەدرۆ نەخۆم[2].

## ٢٩٩. خێری پێدانی قەرزو لێخۆشبوونی کەسی قەرزار

ئەحمەد شاکر پیاوێکی بازرگانی زۆر دەوڵەمەند بوو ڕۆژ بەڕۆژ پارەو سامانەکەی زیاتر دەبوون، لەو سەردەمەی ئەویشدا زۆربەی کۆمەڵگا بەدەست هەژاریی‌و نەدارییەوە دەیانناڵاند گرانیی بوو لە وڵاتدا، ئەو پیاوە بەبازرگانییەوە سەرقاڵ بوو، زۆر نەدەپرژایە سەر خواپەرستیی، تەنها فەرزەکانی بەجێ دەهێنا، بەو هەموو سامانەیەوە خێری نەدەکرد، دوو پیاوی هەژارو نەدار باسی ئەو پیاوە بازرگانە دەوڵەمەندە دەکەن بەم شێوەیە:

پیاوی یەکەم: دەنگ‌و باس‌و گوزەرانت چۆنە؟

---

[1]) پەیڤێك لە دڵەوە ل ٦١- ٦٢.

[2]) چل چیرۆك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە- عمر تۆفیق- ل ٢٩٠.

پیاوی دووەم: گوزەرانم چۆن بێ بەخوا باوەڕ ناکەم کەسێ لەمن هەژارترو داماوتر بێ.

یەکەم: من پێویستم بە کۆڵێ پارە هەیە تا کچەکەم ببەم بۆ دەرەوەی وڵات بۆ نەخۆشیە ترسناکەکەی، کەسێك شك نابەم ئەو بڕە پارەیەم پێ بدا، خەریکە سوێم دەبێتەوە کە سەیری ئەو کچە نەخۆشەم دەکەم.

دووەم: وەڵلاّ ئێمە کەسمان نەخۆش نین شوکر بۆخوا، بەلاّم دینارێك لە گیرفانماندا نییە، هیچ کارو کاسبیەکم نییە، خەریکە شێت بم.

یەکەم: خۆتۆ جاران دەست ڕەنگین و وەستایەکی چاك بوویت بۆچی ئێستا بەم شێوەیە دەستەوستانیت؟

دووەم: پارەم نییە ئەو ئیشەی من بەپارەو دەستمایە دەکرێت، کەسیش شك نابەم متمانەی پێم بێو ئەو پارەیەم پێ بدا، ناهەقیشیان نییە بەچی بیاندەمەوە؟

یەکەم: من پیاوێکی دەوڵەمەندی خزممان هەیە لەوانەیە ئەو بڕە پارەیەت بداتێ، ئەو پیاوە قەرز دەدات بەخەڵکی دڵیشی زۆر باشە.

دووەم: ئەی خۆت بۆ داوای قەرزی لێ ناکەیت بۆ کچە نەخۆشەکەت؟

یەکەم: لەبەرنامەم هەبوو بچم بۆلای بەلاّم ئەوەی ڕاستی بێ نازانم ئایا دەتوانم بیدەمەوە یان نا؟هەر لەبەر ئەوەش نەچوومە بۆلای.

دووەم: دەی با بەیانی بچین بۆلای بەڵکو هەندێ قەرزمان پێ بداتو کێشەکانمان چارەسەر بکەین.

هەردووکیان دەچن بۆ ماڵی ئەحمەد شاکر یەکێ لە پیاوەکانی فەرموویان لێدەکاتو لەژوورەوە دایان دەنیشێنێو پێیان دەڵێ چاوەڕوان بن کەمێکی تر جەنابی کاك ئەحمەد دەگەڕێتەوەو دەتانبینێ، بەلاّم ئەگەر بۆ ئەوە هاتوون خێرتان پێ بکا ئەوە حەز دەکەم چاوەڕوانی نەکەنو بڕۆن، چونکە ئەوەی من بزانم لە ژیانیدا خێری نەکردووە.

یەکەم: نا نا بۆسوالٚ کردن نەهاتووین، بەلٚکو کاری تایبەتیمان پێیەتی، هەردووکیان لە دیوەخانەکەی کاك ئەحمەد دانیشتبوونو چاوەڕێیان دەکرد بەسەرسوڕمانەوە تەماشای دیوەخانەکەیان دەکرد شتی نایابو گرانبەهای تێدابوو.

لەو کاتەدا کاك ئەحمەد دەگەڕێتەوە دێتە لایانو تەوقەیان لەگەلٚ دەکاتو لەگەلٚیان دادەنیشی، ڕوو دەکاتە یەکەمەکەیان دەلٚێ: کاك سەعید بەخێربێی دەنگو باستان؟

سەعید: سوپاست دەکەم زۆر باشم، وا دەژین.

ئەحمەد: پێم بلٚێ کچەکەت چۆنە باشتر نەبووە؟

سەعید: نەبەخوا بگرە ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر دەبێ، لێرە هیچ چارەسەرییەکی نییە.

ئەحمەد: ئەی بۆ نایبەیتە دەرەوەی ولاٚت چۆنە تا ئێستا لێت نەپرسیتەوە.

سەعید: کاك ئەحمەد قسە لە گیرفانی گەرمەوە دەکرێت منیش ئەو پارەیەم نییە، کەسیش شك نابەم ئەو پارەیە زۆرەم بەقەرز پێ بدات.

ئەحمەد: خەم مەخۆ خوا دەبری دەکا ئینشائەللاٚ، ئنجا ڕوو لەپیاوی دووەم دەکاتو پێی دەلٚێ: ئێ تۆ لەگەلٚ پیشەکەت چۆنی؟

سەعید: کاك ئەحمەد نەتزانیوە ئەو برادەرەی من ئیفلاسی کردو زیانێکی گەورەی کردو ئێستا توانای پاچەیە.

ئەحمەد: ئای بەداخەوە هەواڵێکی ناخۆشە.

پاش کەمێك ئەحمەد بانگی خزمەتکارەکەی کرد پێی گوت: ئا وەرە سامان بزانم ئەمڕۆ چیت کردووە.

سامان: گەورەم ڕۆشتم قەرزەکانم کۆکردەوە، بەلاٚم بەڕاستی بێزاریان کردم.

ئەحمەد: بۆچی؟ هیچ بووە؟

سامان: یەکێکیان دەلٚێ: لەدەستم نییە لەسەرم بوەستە تا مانگێکی تر، یەکێکی تریان دەلٚێ: قەرزەکە زۆرە هەندێکم لێ خۆشبن، یەکێکی تریان دەلٚێ: ئێستا لەدەستم نییە تۆ

مەیێ ئەگەر هاتە دەستم خۆم دەیهێنمەوە، توخوا گەورەم ئەگەر قەرز بدەیت بەکەس بەڕاستی بێزاریان کردووەین.

ئەحمەد: وامەڵێ سامان گیان ئێمە هیچ خێرو چاکەیەك ناکەین ئەگەر پارەش بەقەرز نەدەین ئەوە تەواو کەسی خراپمان لێ دەردەچێو کەسی خۆپەرست دەبین.

دووەم: خوا سەد ئەوەندەت پێ بدا مادام دەستو دڵت ئەوەندە باشە.

یەکەم: گەورەم ئێمە دەمانەوێت بڕۆین.

ئەحمەد: پەلە مەکەن سامانی بانگ کرد.

سامان: بەڵێ قوربان لە خزمەتت دام.

ئەحمەد: سامان بزانە ئەو دوو پیاوە کارەکەیان بەچەند تەواو دەبێ قەرزیان پێبدەو ماوەیەکیان بۆ دیاریی بکە.

یەکەم: ئەوە بەڕاستتە کاك ئەحمەد (پەلاماری دەدات بۆ ئەوەی دەستەکانی ماچ بکات) بەڵام ئەحمەد ناهێڵێ دەستەکانی ماچ بکات.

یەکەم: گەورەم ئاخر ئێمە پارەیەکی زۆرمان پێویستە پێمان بدەیت.

ئەحمەد: سامان هەرچەندیان ویست پێیان بدە،.

سامان: بەسەرچاو گەورەم، پارەیان پێدەدەم، چی دیکە؟

ئەحمەد: سامان بڕیارم داوە لەمەولا هەر قەرزارێك لەدەستی نەبوو بمداتەوە لەسەری بوەستەو تەنگی پێ هەڵمەچنە، هەر کەسێ گوتی: جارێ نیمە بیدەمەوە ئەگەر زانیت ڕاست دەکا، وازی لێبێنەو بیبەخشە.

سامان: گەورەم بۆچی؟ بۆ ناچاریت ئەوە بکەیت؟

ئەحمەد: سامان لەمەجبووریدا ئەوە ناکەم.

سامان: دەی کەواتە بۆ دەیکەی؟

ئەحمەد: ئێمە لەمەولا ئاسانکاریی بۆ خەڵك دەکەین چاوپۆشییان لیٚ دەکەین، بەڵکو خوای گەورەش چاوپۆشیمان لێدەکات، لێمان دەبوورێت.

دووەم: گەورەم موژدەبێ لێت خوای گەورە چاوپۆشییت لیٚ دەکا.

ئەحمەد: تۆ ئەمە چووزانی خۆ لەو دونیا نەهاتییەوە؟

دووەم: گەورەم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەنێو گەلانی پێش ئێوەدا دەوڵەمەندێك هەبوو خێرو چاکەی نەدەکرد بەڵام قەرزی زۆری بەخەڵك دەدا، هەر کەسێ نەیبووایە بیداتەوە چاوپۆشی لێدەکردو دەیبەخشی، بە خزمەتکارەکانی دەگوت: خەڵکی ببورن چەندەیان هەبوو لێیان وەربگرنەوە ئەوەی تری لێخۆشبن، کاتێ وەفاتی کرد خوای پەروەردگار پێی فەرموو لە ژیانتدا چاکەت کردووە؟

کابرای دەوڵەمەند گوتی: نەخێر، ئەوەی پێ بزانم ئەوەندەم هەبوو قەرزم دەدا بەخەڵك، هەرکەسێ نەیبووبێ بمداتەوە چاوپۆشیم لێکردووە لێم وەرنەگرتۆتەوە.

خوای تەعالاش پێی فەرموو: دەی مادەم تۆ لەخەڵك خۆشبوویت موژدەت لێبێ ئێمەش لێت خۆشبووین.

ئەحمەد: ئەڵڵا کەفەرموودەیەکی دڵخۆشکەوە. خۆزگە هەموو دەوڵەمەندەکان ئەو فەرموودەیان دەبیستو کاریان پێ دەکرد، دەی پەیمان بێ لەنێو پاش نەك هەر قەرز بدەم بەخەڵك، سامان گیان لیستێکم بۆ بکەرەوە ئەوەی هەژارە یارمەتی بدەم[1].

### ٣٠٠. بەکەس نەڵێیت خوا لێت خۆش نابێ

ضمضمي کوڕی جرسی یەمامی دەڵێ: چوومە ناو مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یەکێ لە هاوڕێکانم دەگەڕام، لەناکاو چاوم کەوت بە پیاوێکی چاوڕەشی چاو گەورە، ددانەکانی زۆر سپیو جوان بوون، ڕووی تێکردمو گوتی: برای یەمامی هەرگیز بەکەس

[1]) چل چیرۆك پێغەمبەری خوا بۆمان دەگێڕێتەوە ل ٣١٩- ٣٢٣.

نەڵێیت خوا لێت خۆشنابێو ناتخاتە بەهەشت، منیش گوتم: تۆ كێیت ڕەحمەتی خوات لێبێ؟

گوتی: من ئەبو هورەیرەم.

منیش گوتم: تۆ پشتگیریی ئەو قسانەم لێدەكەی لەهەندێ كاتدا بەمنداڵەكانم دەڵێم.

پێی گوتم: ئیتر مەیڵێ، پاشان پێی گوتم: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: دووبرا هەبوون لەناو بەنی ئیسرائیل یەكێكیان خۆی بەگەورە دەزانی لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە گوناهی دەكردو خۆی لە حەرام نەدەپاراست، هی دووەمیان خواپەرست بوو، (دیارە بەخواناسیەكەی خۆی دەینازی)، بەبراكەی دەگوت: ئەرێ بەس نییە واز لەگوناه كردن ناهێنی، براكەشی دەیگوت: تۆ پەیوەندیت بەمنەوە نەبێ، ڕۆژێكیان برا خوا پەرستەكە بینی وا براكەی خەریكی ئەنجامدانی گوناهێكی گەورەیە، هاواری لەسەر كردو پێی گوت: وەڵڵاهی خوا لێت خۆش نابێو ناتخاتە بەهەشتەوە، خوای گەورەش فریشتەی گیان كێشانی ناردو گیانی هەردووكیانی كێشا، گەڕانەوە بەردەستی خوا، بە باوەڕدارە گوناهبارەكەی گوت: بچۆرە بەهەشتەوە، بەخواپەرستەكەی فەرموو: تۆ ڕەحمەتی من لەخەڵكی قەدەغە دەكەی، تۆ دەستەڵاتی شتێكت هەیە كە بەدەستی منە؟ دەی بیبەن بۆ ئاگری دۆزەخ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەو پیاوە بەناو خواپەرستە وشەیەكی وای لەدەم دەرچوو دنیاو ئاخیرەتی لەدەستدا[١].

## ٣٠١. كاركردن بە زانیاری

دایكی سوفیانی ثەوری بە سوفیان دەڵێ: ئەگەر (١٠) پیتت نووسی بزانە ئەو (١٠) پیتە هیچ شتێكی لەترسان لەخواو لەسەرەخۆییو شكۆداری لەدەروونتدا زیاد كردووە، ئەگەر ئەمەت بەدی نەكرد، ئەوە بزانە ئەو نووسنە زیانی پێ گەیاندووی نەك سوود[٢].

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٧- ١٥٨.

[٢]) صفحات نيرات من حياة السابقات- محمد متكبي- ص ٢٤٢.

### ٣٠٢. چارەسەری ترسان لەغەیری خوا

کابرایەك چووە خزمەت ئەبو بەکری وەڕاق، پێی گوت: قوربان زۆر لە فلان کەس دەترسم چارەم چییە؟

ئەبو بەکر گوتی: کوڕم قەت لێی مەترسە چونکە دڵی ئەوە کەسەی تۆ لێی دەترسی بەدەستی یەکێکە کە تۆ ئومێدت پێیەو ئاگادارە، کەواتە بۆچی لێی دەترسێی[1].

### ٣٠٣. نیشانەی سەعادەتو شەقاوەتی ئینسان

جارێك یەکێك عەرزی ئەبو عوسمانی حیری کرد گوتی: قوربان نیشانەی سەعادەتو شەقاوەتی ئینسان چییەو چۆن بزانین ئەو ئینسانە سەعادەت مەندە یان نا، خۆشبەختە یان بەدبەختە؟

ئەویش وەلامی دایەوەو گوتی: (علامـة السَّعادة أن تطيـع الله وتخـاف أن تكـون مـردوداً، وعلامـة الشـقاوة أن تعصـي الله وترجـوا أن تكـون مقبـولاً)، واتـە: نیشانەی سەعادەتو خۆشبەختی ئینسان ئەوەیە کەسەکە گوێڕایەڵی خوا بکات لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بترسێ لەوەی لای خوا لێی وەرنەگیرابێ، نیشانەی شەقاوەتو بەدبەختی ئەوەیە ئینسان گوێڕایەڵی خوا نەکا لەگەڵ ئەوەش ئومێدی وابێ لای خوا کەسێکی مەقبوولە[2].

### ٣٠٤. ڕێزی ئیمانداران لای خوا زۆرە

ڕۆژێك یەحیای ڕازی ڕووی کردە ئاسمانو گوتی: ئەی خوای گەورە تۆ پێغەمبەر موساو هارونت نارد بۆ ئەو کافر و ستەمکارە کە فیرعەون بوو، کەچی پێت فەرموون: ئەی موساو هاروون ئەگەر چوونە لای فیرعەون لەسەر خۆو بەنەرمی بیدوێنن، ئەی خوای گەورە ئەوە لوتفی تۆیە لەگەڵ کەسێکدا کە داوای خوایەتی دەکردو دەیگوت: من پەروەردگاری بەرزی ئێوەم، ئەی دەبێ لوتفو کەرەمت لەگەڵ ئەو کەسانەدا چۆن بێ کە ڕۆژی چەند جار دەڵێن: {سُبْحان رَبِّيَ الأَعْلى}، ئەی خوای گەورە سەروەتی من لەدونیادا

---

[1]) مەجلیسی ئەولیا بەرگی ٢ ل ٣٨٣٥.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ب٢ ل ٣٦٢.

تەنها بەرپەیەکی کۆنی شرە، ئەگەر یەکێ داوام لێبکا بێ دڵی ناکەمو پێی دەدەم، ئەی تۆ کە خاوەن خەزێنەی رەحمەتیو هیچ پێویستیشت پێی نییە چەندین هەزار داماو هەن چۆن بێ بەشیان دەکەی لە رەحمی خۆت[1].

۳۰۵. **خۆت لە (دە) جۆر کەس بپارێزە**

پیاوێـك عــەرزی ئــەبو حوســەینی نــوری دەکــاو دەڵــێ: قوربــان زۆرم پێخۆشــە ئامۆژگارییەکم بکەی، ئەویش گوتی: رۆڵە لەو (۱۰) جۆر کەسانە خۆت بپارێزە:

یەکەم: لەو کەسەی کە دەڵێ: من پیاو چاکم کەچی کردەوەکانی شەرعی نین.

دووەم: لەو کەسەی کەلەگەڵەکەی خۆی هەڵدەگەڕێتەوەو پەنا دەباتە بەر بێگانان.

سێیەم: لەو کەسەی کە زۆر ئارەزووی لە دەستەڵاتە.

چوارەم: لەو کەسەی کە هەژارە، کەچی ناسوپاسگوزارەو رووی کردۆتە دنیا پەرستی.

پێنجەم: لەو کەسەی بەعیلمەکەی خۆی دەنازێ، قەت نەکەی لە جەهلی ئەو کەسە ئەمین بیت.

شەشەم: لەو کەسەی داوای کەشفو کەرامەت دەکات، کەچی کەسەیری رواڵەتی دەکەی کەسێکی خراپە.

حەوتەم: لەو کەسەی کە لەخۆی رازییە.

هەشتەم: لەو سۆفیو دەروێشانەی دەچنە حەڵقەی زیکرو کەچی دونیا پەرستن.

نۆیەم: لەو کەسەی کە خۆی بە سۆفیو دەروێش دەزانێ کەچی ناچێتە حەڵقەی زیکرەوە.

دەیەم: لەو کەسەی کە بەڕاستو دروستی باوەڕ بەهەموو دۆستو برادەرێکی بێ[2].

---

[1]) مەجلیسی ئەولیا ب۲ ل ۳۱۰.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ب۲ ل ۳۵۲- ۳۵۳.

### ٣٠٦. هۆکارەکانی وەسوەسە

پیاوێك هاتە خزمەت ئەبو عەلی دەقاق گوتی: قوربان وەسوەسەم زۆرە، شەیتان لەکۆڵم نابێتەوە چیبکەم باشە؟

پێی گوت: کاکە تا درەختی خۆشەویستی دونیا لەحەوشەی دڵتا لەرەگو ریشاڵ هەڵنەکەنی تەیرو تاری شەیتانی هەر لەسەر هەڵدەنیشێتەوە، هەروەك چۆن تا درەختی ناو حەوشی کۆشكو سەراکەت مابێ پاساریو کۆتری هەر لەسەر دەنیشێتەوە، مانای وایە خەیاڵو وەسوەسەو خەتەرە بەزۆری لەو دلانەیە کە بەدونیاوە پەیوەستن شەیتان وازیان لێناهێنێ[1].

### ٣٠٧. زیانی بیرکردنەوە لە گوناح

دەڵێن جارێك گەنجێك هاتە خانەقاو چووە لای ئەبو عەلی دەققاق گوتی: ئەگەر یەکێ بیر لە گوناهـ بکاتەوە زیان بۆ پاکیو تەهارەت هەیە؟ شێخ دەستی کردە گریانو رووی لە دانیشتوانی مەجلیسەکە کردو گوتی: یەکێکتان وەلامی پرسیارەکەی بدەنەوە، یەکێك لە پیاوچاکان لە مەجلیسەکە دابوو ناوی (زین الإسلام) بوو گوتی: بەڵێ ئەگەر شەرمم لە شێخ نەکردبایە هەر زوو وەلامم دەدایەوە، بۆ پاکی رواڵەتی زیانی نییە، بەلام پاکی پەنهانی ئینسان تێك دەداتو دڵی ئینسانەکان ژەنگاوی دەکات[2].

### ٣٠٨. ئەگەر چاوت ژانی کرد

ئەبو عەلی دەقاق گوتی: جارێك تووشی چاو ئێشە بووم چەند رۆژێك ئارامم نەماو قەرارم لێ هەڵگیرا، خەوم لێ نەدەکەوت، پاش ماوەیەك لەناکاو خەوم لێکەوت لەخەومدا گوێم لەدەنگێك بوو گوتی: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ...﴿٣٦﴾ ﴾ الزمر، واتە: ئایا خوا لەهەموو کاتو ساتێکدا بۆ بەندەکانی بەس نییە؟، کە خەبەرم بوویەوە دەتگوت لەژیانم چاوم نەهێشاوە، جا بەراستی ئەو رووداوەو ئەو خەونە مانای ئەوەیە کە هەر مسوڵمانێك

---

[1]) مەجلیسی ئەولیا بـ٢ ل ٤٣٠.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو بـ٢ ل ٤٣١.

تووشی چاوئێشە بوو ئەگەر بە ئیمانو باوەڕەوە ئەو ئایەتەی بەسەردا بخوێنێ ئومێد وایە کە خواوەندی گەورە شیفای بدات[1].

## ٣٠٩. نیشانەکانی خوای باڵادەست

جارێك بە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیبیان گوت: نیشانەی خودامان بۆ بەیان بکە؟

پێشەوا عەلیش گوتی: پاکیو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە هەر پێنج هەستەکان هەتی پێ ناکەنبەپێوانەو لێکدانەوە لێك نادرێتەوە، هیچ شتێك وێنەی ناکات، خوا لەسەرووی هەموو شتێکدایە، خوا لەگەڵ هەموو شتێکدایە، هەرچی بیری لێدەکەیتەوەو ئەوەی بیریشت پێی ناشکێ وەکو شت نییە لەناو شتدا، واتە: وەك ئاوێنە لەنێو گۆزە، ﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى، واتە: خوا هیچ شتێك شێوەی ناکا، خوا بیسەری بینەرە[2].

## ٣١٠. پاداشتی ئەو کەسەی ڕێزی مانگی ڕەمەزان دەگرێ

کابرایەکی مەجوسی ئاگر پەرست بینی وا کوڕەکەی خواردن دەخوا لەمانگی ڕەمەزان لەبەر چاوی مسوڵمانان، ئەویش لە کوڕەکەیداو پێی گوت: بۆ ڕێزی مسوڵمانان ناگری، پاش چەند ڕۆژێکی کەم ئەو پیاوە مەجوسیە وەفاتی کرد، زانایەکی خەڵکی ئەو شارە ئەو پیاوە مەجوسییەی لەخەودا بینی وا لەبەهەشتە، بە پیاوە مەجوسیەکەی گوت: ئەی تۆ مەجوسی نەبووی؟

ئەویش گوتی: بەڵێ وایە، بەڵام بەماوەیەکی کەم بەر لەمردنم خوای بەبەزەیی ئیمانی بەقسمەت کردم، بووم بە مسوڵمان، منی بە مسوڵمان قەبوڵ کرد لەبەر ئەوەی ڕێزی مانگی ڕەمەزانم گرت[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ب٢ ل ٤٣١- ٤٣٢.

[2]) دۆستی باوەڕداران ل ١٨٤- ١٨٥.

[3]) مرشد الخطیب ص ٢٧٢.

### ٣١١. سێ سیفەتی زۆر بەنرخ

جارێك بە عەبدوڵڵای كوڕی موبارەكیان گوت: كام سیفەتو خەسڵەته بۆ ئینسان زۆر بەسوودە؟ گوتی: عەقڵی تەواو، زۆر سیفەتێكی بەنرخە، گوتیان: ئەی ئەگەر عەقڵی تەواو نەبوو؟ گوتی: دۆستی بەڕەحمو برادەری چاك، گوتیان: ئەی ئەگەر برادەی چاكی دەست نەكەوت؟ گوتی: بێدەنگی، گوتیان ئەگەر پیاو خۆی پێ نەگیراو قسەی زۆر كرد؟ گوتی: هەر كەسێك یەكێ لەو سێ خەسڵەتانەی تێدا نەبوو تا زووتره بمرێت بۆی باشترە[1].

### ٣١٢. خواناسین

پێغەمبەر موسا (علیه السلام ) برادەرێكی هەبوو زۆری خۆشدەویستو سێبوریان پێك دەهات، ڕۆژێك ئەو برادەرەی بە پێغەمبەر موسای (علیه السلام ) گوت: ئەی موسا داوا لەخوا بكە وام لێبكات بیناسم بەو شێوەیەی كە شایستەیە، پێغەمبەر موساش دوعای بۆ كرد دوعاكەی قەبووڵ بوو، پاش دوعاكە ویستی بچێ بۆ لای هاوڕێكەی لە چیاوچۆڵێك پێی گەیشت بینی وا لەگەڵ گیاندارانه، پاشان تا پێی گەیشت بزری كرد، پێغەمبەر موسا فەرمووی: پەروەردگار هاوڕێكەم لەدەست چوو، خوای گەورە بەموسای فەرموو: ئەی موسا هەركەسێ من بناسێ بەحەقی ناسین هاوڕێیەتی هیچ كام لە دروست كراوەكان ناكات[2].

### ٣١٣. هەواڵێكت بۆهات ڕاستەوخۆ بڕیار مەدە تا لێی نەكۆڵییەوە

لەسەردەمی پێشەوا عومەر ﷺ خاكی مسوڵمانان فراوان بوو، پێشەوا عومەر سەعدی كوڕی وەققاصی كرد بەوالی كوفە، خەڵكی شاری كوفە خەڵكێكی گێرەشێوێن بوون، هەربۆیە سكاڵایەكیان دژی والیەكەیان سەعدی كوڕی وەققاص نووسیو ناردیان بۆ خەلیفە عومەر، ئەو سكاڵایە پڕبو لە گلەییو گازانده، تا ئەو ڕاددەی گوتوبویان نازانی نوێژەكەشمان بەتەواوی بۆ بكات، كاتێ پێشەوا عومەر نامەكەی خوێندەوە لە بڕیاردانەدا پەلەی نەكرد، چونكە لەڕاستیو دروستی ئەو گلەییانە دڵنیا نەبوو، هەستا بەناردنی موحەممەدی كوڕی مەسلەمە بۆ كوفە، نامەیەكی پیادا نارد بۆ سەعد، داواشی كرد لەگەڵ

---

[1]) مەجلیسی ئەولیا بـ١ ل ٩١.

[2]) مكاشفة القلوب- للإمام الغزالي- ص ٤١.

سەعددا پرسیار لەخەڵکەکە بکاتو لە کێشەو گرفتەکانیان بکۆڵێتەوە، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە گەیشتە کوفەو سەعدی لەو باسو خواسە ئاگادار کردەوە، پاشان لەگەڵ سەعددا لە مزگەوتی کوفە نوێژی کرد، پاشی نوێژەکە پرسیاری لەخەڵکەکە کرد دەربارەی سەعد، خەڵکەکەش جگە لە چاکە هیچ شتێکی تریان دەربارەی سەعد نەگوت، پاشان موحەممەدی کوڕی مەسلەمە هەستا چوو بۆ مزگەوتی هۆزی عبس، لەوێش پرسیاری سەعدی لە خەڵکەکە کرد، خەڵکەکە هەموو بەباشە باسیان کردو گوتیان: هیچ عەیبو کەمو کوڕیەکمان لێی نەبینیوە، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە گوتی: ئایا جگە لە سوپاسو ستایش هیچ شتێکی تری لەبارەوە نازانن؟

ئەوانیش گوتیان: جگە لە چاکە هیچ شتێکی تری لەبارەوە نازانین، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بەردەوام خەڵکەکەی دەدواندو پرسیاری دەربارەی سەعد لێدەکردن، هەتا پیاوێك لە کۆتایی مزگەوتەکەوە کە ناوی ئوسامەی کوڕی قەتادە بوو گوتی: سەعد بەیەکسانی سەیری خەڵك ناکاتو کێشەکانیش بەدادگەری چارەسەر ناکات، سەعد سەری سوڕما لەو پیاوەو پرسیاری کرد من بەم شێوەیەم؟ پیاوەکە گوتی: بەڵێ تۆ بەم شێوەی.

سەعد گوتی: پەروەردگار ئەگەر ئەو بەندەیەت درۆ دەکات تەمەنی درێژ بکەیتو وای لێبکەیت بەهەژاری تەمەنە درێژەکەی بەسەر بەرێت، تووشی ناڕەحەتیو تاقیکردنەوەی بکەی.

پاشان سەعد گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە وە پاش چەند ساڵێك وەفاتی کرد، بەلاّم دوعاکەی قەبووڵ بو پیاوەکە مایەوە تەمەنی زۆر درێژ بوو، هەتا بەتەواوی پیر بوو ئێسقانەکانی لاواز بوو پشتی چەمابۆوە ئەوەندە هەژارو نەبوون بو لەناوەڕاستی ڕێگا ڕێی بەخەڵك دەگرتو سواڵی دەکرد، ئەوەندە پیر بووبو بۆکانی چاویان داپۆشی بوو، وای لێهاتبوو بەو تەمەنە زۆرەوە کە ئافرەتانی دەبینی دەستی بۆ درێژ دەکردن بەو کردارە قێزەونەشی خەڵکی هاواریان بەسەردا دەکرد جنێویان پێدەدا،لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا خۆی بەخۆی دەگوت: ئای چیبکەم پیرێکی وەك منی خەڵەفاوتووشی دوعای پیاوچاکێکی وەك سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص بووم ئەوە قەبوڵ بوونی دوعاکانی ئەوە وای لێکردووم[1].

---

[1]) بەختەوەر بژی- موحەممەد عورەیفی- ل ٢٠٠- ٢٠١.

## ٣١٤. كردنی قسەی بێ كەڵك

پیاوێك لەگەڵ هاوڕێكیەكیدا بەڕێگەیەكدا دەڕوات، هاوڕێیەكەی ئاور دەداتەوە دەڵێت: بە ڕاستی ئەمڕۆ زۆر زۆر ساردە پیاوكە دەڵێت: دەی بەم قسەیەی كردت گەرمت بۆوە؟

ئەویش دەڵێت: نەخێر، پیاوەكەش دەڵێت: دەی چ سودێكت لەم قسەیە بینی؟

ئەگەر لەباتی ئەم قسەیە (سبحان الله)یەكت بكردایە زۆر باشتر بوو[1].

## ٣١٥. پێش ئامۆژگاری دڵنیابە لە بوونی هەڵە

پیاوێكی شڕو سەرو قژ تێك ئالاو دێت بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ دیەوێ ئەم پیاوە ئامۆژگاری بكات، بۆ ئەوەی دەستێك بەخۆی دابنێت كەمێك شێوەو ڕووخساری ڕێك‌و پێك بكات، بەڵام دڵنیا نەبوو كە ئەم پیاوە پیاوێكی هەژارو نەدارە یان خاوەنی ماڵ‌و سەروەت‌و سامانە، هەر بۆیە پرسیاری لێكردو فەرمووی: ماڵ‌و سەروەت‌و سامانت هەیە؟ پیاوەكەش دەڵێت: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چ جۆرە ماڵ‌و سامانێك؟ پیاوەكە دەڵێت: لە هەموو جۆرێك وشتر، ئەسپ، ماین، مەڕو بزن. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەی ئەگەر خوای گەورە ماڵ‌و سەروەت‌و سامانێكی پێ بەخشی با شوێنەواری ئەو بەخشینەی خوا بەسەرتەوە دیار بێ[2].

## ٣١٦. تەنها ئافرەتانی بەهەشت بێ عەیبن

گەنجێك كە لە بەهاری تەمەنیدا بوو دێت بۆلای مامۆستایەكی ئاینی‌و داوای لێ دەكات تا یارمەتی بدات بۆ ئەوەی هاوسەری ژیانی هەڵبژێرێ مامۆستاكەش دەڵێت: پێت خۆشە هاوسەری ژیانت چۆن بێت؟

گەنجەكەش دەڵێت: دەمەوێ زۆر شۆخ‌و شەنگ بێت، قسەو گفتار شیرین بێت، سەرو قژی وەك ئاوریشم وابێت، بۆنی خۆش بێت، بالای بەرز بێت، زۆر كابان بێت، كاتێك سەیری دەكەم دەمەوێت دڵ خۆش‌و شادومانم كات، كاتێك لێی دوور بم پارێزگاری لە ماڵم

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل٢٣١.

[2]) هەمان سەرچاوە ل ١٩٩.

بکات، هەرگیز سەرپێچیم نەکات، لە خراپەو شەڕی نەترسم، دیندارو خاوەن زانست بێت، ماموستاکەش دەڵێت: کورم ئەوەی تۆ لە دوای دەگەڕێیت تەنها لە یەك شوێن هەن، گەنجەکەش دەڵێت لە کوێ؟

ماموستاکەش دەڵێت: لە بەهەشت، چونکە لە دونیادا هەرگیز ئەم هەموو تایبەت مەندییە لە یەك ئافرەتدا کۆ نابنەوە[١].

### ٣١٧. حوکمی ئەو کەسەی سوکایەتی بە ئافرەتی مسوڵمان دەکات

لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ڕۆژێکیان ئافرەتێکی مسوڵمانی داوێن پاك دەچێ بۆ بازاری جولەکەکان، لە دوکانی یەکێك لە زێرینگرە جولەکەکان دادەنیشێ، کابرای جولەکە بە بالا پۆشی ئەو ئافرەتە مسوڵمانە قەڵس دەبێت، دەیویست گاڵتەی پێ بکات جولەکەکە داوای لە ئافرەتەکە کرد ڕووخساری دەربخات هەروەها دەیویست بە هۆی پارەو سامانەوە لە خشتەی بەرێت، بەلام ئەم ئافرەتە باوەر دارە ڕازی نەبوو، بەلام کابرای جولەکە ئافرەتەکەی سەرقاڵ کرد دامێنی کراسەکەی لە پشتەوە بەست بەلای سەر پۆشەکەیەوە کە شۆڕ بووبویەوە بەسەر پشتیدا، کاتێك ئافرەتەکە هەڵسا کراسەکەی لە دواوە بەرز بویەوە لاشەی دەرکەوت جولەکەکانیش پێی پێکەنین، ئافرەتەکە هاواری کردو خۆزگەی بە مەرگ خواست نەك دەرکەوتنی لاشەی کاتێك پیاوێك لە مسوڵمانان ئەم دیمەنەی بینی شمشێرەکەی هەڵکێشاو پیاوە جولەکەکەی کوشت، جولەکەکانیش کۆبونەوەو مسوڵمانەکەیان شەهید کرد، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ زانی کە جولەکەکان پەیمانیان شکاندوە سوکایەتی بە ئافرەتی مسوڵمانان دەکەن بڕیاری گەمارۆی جولەکەکانیدا بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئەو ئافرەتەو پیاوە مسوڵمانەکە بەلام سەرۆکی دووڕوەکان عەبدوڵلای کوڕی سەلول هەڵساو گوتی: ئەی موحەممەد با هەڵس و کەوتت لەگەڵ جولەکەکاندا باش بێت، ئەم قسەشی لەبەر ئەوە کرد چونکە بەر لە هاتنی ئیسلام جولەکەکان پاڵپشتی ئەو پیاوە بوون پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسەکانی کوڕی سەلول ڕازی نەبوو بەلام جارێکی تر ئەو مونافیقە قسەکانی دوبارە کردنەوە هەم دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ بەرپەرچی دایەوە وە

---

١) هەمان سەرچاوە ل ٢٠٦.

رووی لێوەرگێرا، بەڵام کوڕی سەلول دەستی کرد بە پشتێنی زرێکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەم قسەیەی دوبارە دەکردەوەو دەیگوت: لەگەڵیان باش بە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: وازم لێ بێنە بەڵام ئەم هەر وازی لەم قسانەی نەهێنا بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باشە وازی لە کوشتنیان هێنا بەڵام لە شاری مەدینە وەدەری نان [1].

### ٣١٨. شووکردن لەسەر فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ

ڕۆژێک گەنجێکی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ناوی جولەیبیب بوو لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، ئەو گەنجە زۆر هەژارو نەدار بوو، شێوەی زۆر ناشیرین بوو، تەمەنی ئەو گەنجە کاتی ژن هێنانیەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی پرسی بۆ ژن ناهێنی؟ ئەو گەنجەش لەوەڵامدا گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ من گەنجێکی هەژارو دەست کورتم، کێ ژنم دەداتێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرفەتێک دەگەڕا بۆ ئەوەی ژنی بۆ بێنێ، تا ڕۆژێک پیاوێکی ئەنصاری هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە کچێکی گەنجی هەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو کچەکەتم پێ دەدەی؟ پیاوەکە گوتی: بەسەرچاو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ جولەیبیب، پیاوەکە گوتی: با ڕاوێژ بە دایکی بکەم ڕای ئەویش وەربگرم، پیاوەکە چووە لای خێزانەکەی‌و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کچەکەی کردووین، دایکی گوتی: دەی بەسەرچاو، پیاوەکە گوتی: بۆخۆی نا، خێزانەکەی گوتی: ئەی بۆ کێ؟ پیاوەکەی گوتی: بۆ جولەیبیب، ژنەکەی گوتی: سوێند بەخوا نایدەم بە جولەیبیب، پیاوەکە ویستی بچێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو پێی ڕابگەیەنێ کە کچەکەی خۆیان نادەن بە جولەیبیب، لەو کاتەدا کچەکەیان گوتی: کێ داخوازی منی کردووە؟

باوکی گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردووی بۆ جولەیبیب، کچەکە گوتی: فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەت دەکەنەوە؟ فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ مەشکێنن بەدڵنیاییەوە ئەو شتێکمان پێ ناڵێ نەشیاو بێ، من دڵنیام پێغەمبەری خوا ﷺ بەزایەم نادات، پیاوە ئەنصاریەکە چووەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەمی پێ دەدەم، ئافرەتەکەیان لە جولەیبیب مارە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ٣٨- ٤٠.

لەخوا پاڕایەوە کە خێریان بەسەردا ببارێنێ، ژیانیان دوورخات لە ناڕەحەتیو زەحمەت، چەند ڕۆژێکی کەم بەسەر هاوسەرگیرییان تێپەڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یەکێ لە غەزاکان لەگەڵ هاوەڵانیدا کەوتنە ڕێ، جولەیبیبی تازە زاواش لەگەڵیان دەرچوو بۆ ئەو غەزایە، کاتێ جەنگەکە کۆتایی هات، پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەواڵی شەهیدەکانی پرسی پێیان گوت: فلانو فلان شەهید بوون، ئەویش فەرمووی بگەڕێن بەدوای جولەیبیب، کاتێ بەدوایدا گەڕان بینیا لەلایەکی گۆڕەپانی جەنگەکە شەهید کراوە حەوت لاشەی بێباوەڕانیش لە دەورە بەریدا کەوتوون، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەر جەنازەکەی جولەیبیبو فەرمووی: حەوتی لێ کوشتوون پاشان شەهیدیان کردووە، جولەیبیب ئەو پیاوە بەڕێزە هەژارو بێ کەسو بێدەرەتان بوو بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ سەری جولەیبیبی لەسەر دەستی خۆی داناو فەرمووی: {جولەیبیب لەمنەو من لە جولەیبیبم، جولەیبیب خۆشەویستی منە} وە زۆر بۆی گریا، ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستە موبارەکەکانی خۆی جولەیبیبی ناشت، ئەنەس دەڵێ: سوێند بەخوا هیچ نافرەتێکم نەبینیوە بەقەد خێزانەکەی جولەیبیب داخوازی کرابێ لە مەدینە دوای شەهید بوونی جولەیبیب، خەڵکی پێشبڕکێیان دەکرد بۆ داخوازی کردنی[1].

## ٣١٩. سەخاوەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

ڕۆژێک پیاوێک دێت بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ماڵو سامانی لێدەکات پێغەمبەری خواش ﷺ ڕانە مەڕێکی زۆری پێ دەبەخشێ، پیاوەکە دەگەڕێتەوە بۆ لای قەومەکەیو پێیان دەڵێ: ئیمان بەو پیاوە بێنن کە موحەممەدە بەڕاستی ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ بەشێوەیەک ماڵو سامان دەبەخشێت هەرگیز لە هەژاری ناترسێت، یەکێ لەهاوەڵان دەڵێ: کاتێک ئەو پیاوە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها سەروەتو سامانی دەویست، بەلام ئەوەندەی پێنەچوو کە گەڕایەوە ئایینی خوای لەهەموو دنیا لا خۆشەویستتر بوو[2].

---

[1]) بەختەوەر بژی – د. موحەممەد عورەیفی- ل ٨٨- ٩٠.

[2]) بەختەوەر بژی- د. موحەممەد عورەیفی- ل ٩٦.

### ٣٢٠. نەفرین لە کەس مەکە

لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێك گیرۆدەی خواردنەوەی مەی بوو، ڕۆژێك هێنایانە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمانی کرد دارکاری بکرێ واتە: حەددی لێ دەربکرێ، چەند جاری تر ئەو پیاوەیان هێنابوو دارکاریان کردبوو لەسەر مەی خواردنەوە، یەکێك لە هاوەڵان دەڵێ: نەفرەتی خوات لێبێ چەند زوو زوو دەتهێنن بۆ دارکاری کردن، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو قسەیە دەبیستێ ڕەنگی دەگۆڕێو دەفەرمووێ: بەنەفرینی مەکە چونکە ئەو پیاوە خواو پێغەمبەری خۆش دەوێ[1].

### ٣٢١. لاملی لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ مەکە کە نەتبیستووە

هەندێ لە زانایانی بواری فەرموودە لای یەکێ لە خەلیفەکان دادەنیشن یەکێ لەو زانایانە باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، یەکێکی تر لەزاناکان لەبەر ئەوەی فەرموودەکەی نەبیسبوو گوتی: ئەوە کەی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ؟!، لەکوێت هێناوە؟ بۆ درۆ بەدەم پێغەمبەری خواوە ﷺ دەکەیت؟

زانای یەکەم دەڵێ: بەدڵنیاییەوە ئەوەی گوتم فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، زاناکەی تریش دەڵێ: نەخێر من فەرموودەی وام نەبیستووە،وەزیرێکی زۆر ژیری خەلیفە لەوێ ئامادە دەبێ، ڕوو دەکاتە ئەوەیان کە ئینکاری دەکات پێی دەڵێ: جەنابت هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوات ﷺ لەبەرە؟

زاناکەش دەڵێ: نیوەییم لەبەرە.

وەزیرەکەش دەڵێ: دەی وای دابنێ ئەو فەرمودەیە لەو نیوەی ترە کە لەبەرت نییە[2].

---

[1]) ئەو بەسەرهاتە هەر دوو پێشەوا بوخاریو موسلیم لە صەحیحەکانی خۆیاندا هێناویانە.

[2]) بەختەوەر بژی- ل ٢٤٦.

### ٣٢٢. گوێ بەقسەی خەڵکی مەدە

دەگێڕنـەوە پیاوێـك لەگـەڵ کـوڕێکی بەسـواری گوێدرێژەکـەی دەکەوێتـە ڕێ، لەڕێگـە بەهەندێ خەڵکی دەگەن خەڵکەکە کەچاویان بەو پیـاوە دەکـەوێت لـەنێوان خۆیـان دەڵـێن: سـەیری ئـەو پیـاوە دڵڕەقـەی خـۆی سـواری گوێدرێـژ بـووە کەچـی کوڕەکـەی بـەپێ دەڕوا، پیاوەکـە گـوێی لـە قسـەکانی خەڵکەکـە دەبـێ لەشـەرما خـۆی دادەبـەزێو، کوڕەکـەی سـواری گوێدرێژەکـە دەکـا، پـاش کـەمێکی تـر لـە ڕێ کـردن تووشـی کۆمەڵـە خـەڵکێکی تـر دەبـن، ئـەوانیش بـەنێوان خۆیانـدا دەڵـێن: تخـوا ئـەوە کـەی منـداڵ دەبـێ ئـاوابێ، خـۆی سـواری گوێدرێـژ بـووە کەچـی بـاوکی بـەپێ دەڕوا، کـە گوێیـان لـەو قسانە دەبـێ ناچـا هـەردووکیان سـواری پشـتی گوێدرێژەکـە دەبـن بـۆ ئـەوەی چیدیکە خـەڵکی تانـەو تەشـەریان لێنـەدەن، بـەردەوام دەبـن لـە ڕۆیشـتنەکەیان دیسـان دەگـەن بـە کۆمەڵـە خـەڵکێکی دیکـە ئـەوجارە خەڵکەکـە دەڵـێن: ئـای لـەو دوو پیـاوە دڵڕەقـە هـیچ بـەزەییان نایەتـەوە بـەم گوێدرێـژە بەسـتەزمانە، لـە بـاتی بـەنۆرە سـواری پشـتی بـن هـەردووکیان سـواری پشـتی بوونـەو هـیچ بەزەییەکیان لەدڵدا نییـە، دیسـان کـە گوێیـان لـەو قسـانە دەبێـت پیاوەکـە دەڵێ: ڕۆڵە وەرە دابەزە با هەردووکمان بەپێ بڕۆینو گوێدرێژەکەش بەگـەر خۆمانـدەین، دەگـەن بـە کۆمەڵـە کەسێك دیکە بەهەمان شێوە تووشی تانـەو تەشـەری ئـەو خەڵکـە دەبـن، خەڵکەکـە لـەنێوانی خۆیـان دەڵـێن: سـەیری ئـەو دوو پیـاوە گێـلو نەفامـە هـیچ کامێکیـان سـواری سـەر پشـتی گوێدرێژەکە نابێ، ئەی باشـە گوێدرێـژ بۆچـی دروسـت کـراوە؟ پیاوەکـە کـە گـوێی لـە قسـەی خەڵکەکـە بـوو خـۆی بـۆ نـەگیراو دەسـتی کوڕەکـەی ڕاکێشـا چـوونە ژێـر سـکی گوێدرێژەکـەو یەکی لایەکیان لەسەر پشتی خۆیان داناو گوێدرێژەکەیان لەکۆڵ خۆیان نا[1].

---

[1]) د. مەحەممەد عورەیفی دەڵێ ئەگەر من ئەو کات لەوێ بام بەپیاوەکەم دەگوت: چۆنت پێ خۆشە وابکە ڕازی کردنی هەموو خەڵکی شتێکی مەحاڵەو کارێکی بەدی نەهاتووە- بەختەوەر بژی- ل ٢٧٤- ٢٧٥.

### ٣٢٣. نیازپاکی بۆ خوا

دەگێڕنەوە پێشەوا ئەبو بەکری صدیق هەموو ڕۆژ پاشی نوێژی بەیانی دەچوو بۆ دەرەوەی شاری مەدینە ماوەیەك دەمایەوە پاشان دەگەڕایەوە، پێشەوا عومەر لەم کارەی پێشەوا ئەبو بەکر سەری سوڕ دەمێنێ هەر بۆیە ڕۆژێك بەدوایدا دەچێ دەبینێ پێشەوا ئەبو بەکر خۆی کرد بە ڕەشماڵێکی ڕزیو، پێشەوا عومەر لەشوێنێك مایەوە تا پێشەوا ئەبو بەکری بینی چووە دەرەوەو ڕۆیشت، پێشەوا عومەر خۆی کرد بە ڕەشماڵەکە بینی ئافرەتێکی لاوازی نابینا لە ڕەشماڵەکەدایە، لەگەڵ چەند منداڵێکی کچی بچووك، پێشەوا عومەر دەپرسێ: ئەو پیاوە کێ بوو هاتە لاتان؟

ئافرەتەکە گوتی: نایناسم بەلام دەزانم پیاوێکە لە مسوڵمانان ماوەیەکی زۆرە هەموو بەیانیان دێت سەرمان لێدەدا، پێشەوا عومەر دەڵێت: چیتان بۆ دەکات؟

ئافرەتەکە دەڵێ: هەموو بەیانیەك گسکمان بۆ لێدەدا، هەویرمان بۆ دەکاتو حەیوانێکمان هەیە بۆمان دەدۆشێ، هەر پێویستییەکی ترمان هەبێ بۆمان جێبەجێ دەکات، پێشەوا عومەر کە دێتە دەرەوە لەبەر خۆیەوە ئاخێك هەڵدەکێشێتو دەڵێ: ئەی ئەبو بەکر بەڕاستی بەو کارانەت جێنشینی دوای خۆت هیلاكو ماندوو کرد.

### ٣٢٤. سەرکردە دەبێ بەم شێوەیە خزمەتی خەڵکی خۆی بکات

شەوێك پێشەوا عومەر دەچێ بۆ دەرەوەی شاری مەدینە پیاوێکی ڕێبوار دەبینێ، لەنزیك ڕێگە ڕەشماڵێکی هەڵداوە زۆر بە شپرزەیی لەبەردەم ڕەشماڵەکە دانیشتووە، پێشەوا عومەر کاتێ پیاوەکە دەبینێ دەڵێ: تۆ کێیت؟

پیاوەکە دەڵێ: من کەسێکی ڕێبوارم هاتووم بۆ ئەوەی ئەمیری ئیمانداران یارمەتییەکم بدات، لەو کاتەدا پێشەوا عومەر گوێی لەناڵەو نرکەی ئافرەتێك دەبێ لەنێو ڕەشماڵەکە دەپرسێ ئەوە چییە؟

پیاوەکە دەڵێ: ڕەحمەتی خوات لێبێ وازمان لێبێنە بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە.

پێشەوا عومەر دەڵێ: پێم بڵێ بزانم ئەمە چییە.

پیاوەکە دەڵێ: ئەوە خێزانەمە خەریکە منداڵی دەبێ کەسێکی لانییە یارمەتی بدات، هیچ خواردنو خواردنەوەیەکمان لا نییە.

پێشەوا عومەر هەرچی زووە بە خێرایی دەگەڕێتەوە ناو شاری مەدینەو دەچێتەوە ماڵەوە، خێزانەکەی لەو ڕووداوە ئاگادار دەکاتەوە ئەوەی پێویست بێ لەگەڵ خۆیان هەڵی دەگرنو بەرەو ڕەشماڵی ئەو ژنو پیاوە ڕێبوارە دەکەونە ڕێ، کە دەگەن بە ڕەشماڵەکە خێزانەکەی بەپەلە دەچێتە ژوورەوە بۆ ئەوەی یارمەتی ئافرەتەکە بدات، پێشەوا عومەریش لەدەرەوە لەگەڵ پیاوە ڕێبوارەکە ئاگرێك دەکەنەوەو خەریکی ئامادەکردنی خواردن دەبن، پێشەوا عومەر هەرکاتێ فووی بە ئاگرەکە دەکرد تەپو تۆزو دووکەڵی ئاگرەکە تێکەڵی سەرو ڕیشی دەبوون، پیاوەکەش بێئاگا لەوەی کە ئەمە پێشەوای ئیماندارانە سەیری عومەری دەکردو واقی وڕمابوو لەو خەمخۆرییەی پێشەوا عومەر، لەو کاتەدا خێزانەکەی پێشەوا عومەر بەدەنگێکی بەرز دەڵێ: ئەی ئەمیری ئیمانداران مۆژدەی ئەوە بدە بەهاوەڵەکەت کە کوڕێکیان بوو، کاتێك پیاوەکە گوێی لە وشەی ئەمیری ئیمانداران دەبێ زیاتر واقی وڕ دەمێنێو بە ترسێکەوە دەڵێ: تۆ عومەری، ئەمیری ئیمانداران؟

پێشەوا عومەر گوتی: بەڵێ من عومەرم پیاوەکەی ئارام کردەوە، خواردنەکەی برد بۆ بەردەرکی ڕەشماڵەکەو بانگی خێزانەکەی خۆی کرد بۆ ئەوەی خواردنەکە بە ئافرەتەکە بدات، پاشان خواردنی دا بە پیاوەکەو پێی گوت: خواردنەکەت بخۆ پاشان بچۆ پشوویەك بدە چونکە ماندووی، بەیانیش وەرە بۆ لام تا یارمەتی زیاترت بدەین(١).

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٩- ٣٠٠.

### ٣٢٥. گرنگی دان بە پاکو خاوێنی مرۆڤ لە ئیسلامدا

جابری کوڕی عەبدوللا دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی سەرو قژ ناڕێکی بینی فەرمووی: ئایا شتێکی دەست ناکەوێت سەرو قژی پێ ڕێکخات؟

هەروەها پیاوێکی جلو بەرگ پیسو پۆخڵی بینی فەرمووی: ئایا ئاوی دەست ناکەوێ بۆ ئەوەی جلو بەرگەکانی بشوا؟[1].

### ٣٢٦. ترسان لەدرۆ

پیشەوا زوهری لەلای یەکێ لە کاربەدەستان شاهێدیەك دەدا، کابرای کاربەدەست دەڵێتە زوهری درۆ دەکەیت، پێشەوا زوهری دەڵێ: پەنا بەخوا دەگرم لەوەی من درۆ بکەم، سوێند بە خو ئەگەر بانگدەرێك لەئاسمانەوە بانگ بکات بڵێ: خوا درۆی حەلاڵ کردووە، هەر درۆ ناکەم، دەی چۆن درۆ دەکەم لەکاتێکدا خوای تەعالا حەرامی کردووە[2].

### ٣٢٧. درۆ نەکردن

عەبدوللای کوڕی عومەر دەڵێ: منداڵ بووم ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵمان دانیشتبوو، دایکم بانگی کردم، بۆ ئەوەی بچمە لای گوتی: وەرە شتێکت پێ بدەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی دەتەوێ چی پێ بدەیت؟

دایکم گوتی: خورما.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر پێت نەدایە ئەوە بەدڵنیاییەوە درۆیەکت لەسەر دەنووسرا[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٠٩.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣١١.

[3]) ئەو ڕووداوە پێشەوا ئەبو داود لە سونەنەکەی خۆیدا بۆی هێناوین.

**٣٢٨. مەدح کردنی مسوڵمان لەسەر بەندایەتی کردن بۆ خوا**

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو موسای ئەشعەری دەگاتو پێی دەفەرموێ: شەوی ڕابردوو گوێم بۆ قورئان خوێندنەکەت گرتبوو بەشێك لەدەنگ خۆشی پێغەمبەر داوودت پێ دراوە، ئەبو موسا بەم قسەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵخۆش دەبێو دەگەشێتەوە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بمزانیایە گوێت بۆ گرتووم زیاتر دەنگی خۆم خۆش دەکرد[1].

**٣٢٩. لە خۆشی بینینی خوای گەورە مسوڵمان بوو**

یەکێ لەخواناسان دەچێ بۆ سەردانی نەخۆشێکی نەصرانیی، لەو کاتەدا نەخۆشەکە کەوتۆتە حاڵەتی سەرەمەرگ، پیاوە خواناسەکە پێی دەڵێ: مسوڵمان بە بەهەشتت بۆ هەیە، پیاوە نەصرانییەکە دەڵێ: پێویستم بەبەهەشت نییە، خواناسەکە دەڵێ: مسوڵمان بە لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزرێی، پیاوە نەصرانییەکە دەڵێ: لەدۆزەخ ناترسم، خواناسەکە دەڵێ: مسوڵمان بە، ئەگەر مسوڵمان بیتو بگەڕێیەوە لای خوا، بەدیداری خوا دەگەیتو بەبینینی شاد دەبی، پیاوە نەصرانییەکە کە ئەمەی پێ دەگوترێ یەکسەر مسوڵمان دەبێ وە هەر ئەو ڕۆژەش وەفات دەکات، لەخەودا ئەو پیاوە نەصرانییەیان بینی پێیان گوت: خوای گەورە چی لێکردی؟

گوتی: لەبەر دەستی خۆی ڕایگرتم فەرمووی ئەی بەندەکەم لەخۆشی بینینی من مسوڵمان بوویت؟

گوتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەی بەندەکەم دەی ئەوە ڕازی بوونو لیقای خۆمم پێ بەخشیت[2].

---

[1]) بەختەوەر بژی- ل ٣٧٦.

[2]) حکايات وقصص من حياة السابقين- د. مصطفى مبارك- ص ٥٩.

### ٣٣٠. ئەنجامدانی نوێژ لە کاری خراپ دوورت دەخاتەوە

دەگێڕنـەوە کـە پیاوێـك داوای کـاری خـراپ لـە ئافرەتێـك دەکـا، ئافرەتەکـەش بەتونـدی وەڵامی دەداتەوە، کاتێ گەڕایەوە ماڵەوە بۆ پیاوەکەی خۆی گێڕایەوە، پیاوەکەشی پێـی گـوت: بـڕۆ بـەو پیـاوە بڵـێ: مـاوەی (٤٠) ڕۆژ نوێـژی جەماعـەت بکـە لەگـەڵ پیاوەکـەم بـڕۆ بـۆ مزگەوت، تا ئەوەی دەتەوێ بەگوێت بکەم، پیاوەکـەش بـۆ مـاوەی چـل ڕۆژ بـەردەوام نوێـژی جەماعەتی دەکرد، دوای چل ڕۆژەکە ئافرەتەکە چوو بۆ لای پیاوەکە پێی گوت: ئێستا زینـام لەگەڵ بکە، پیاوەکـە گـوتی: ئێستا تۆبـەم کـردووەو نـاتوانم بـێ فـەرمانی خـوا بکـەم، ژنەکـە ئەمەی بە پیاوەکەی خۆی ڕاگەیاند، پیاوەکەشی گـوتی: خـوای تـەعالا ڕاسـتی فـەرمووە ﴿... إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ ...﴿٤٥﴾﴾ العنكبوت[1].

### ٣٣١. گومانی باش بردن بە خوای پەروەردگار

لەسەردەمی پێغەمبـەری موسا (سـەلامی خـوای لەسـەر) پیاوێـك هـەبوو لەسـەر تەوبـە کـردن بـەردەوام نـەدەبوو، خـوای تـەعالا وەحـی بـۆ پێغەمبـەری موسـا کـرد بـەو پیـاوە بڵـێ تەوبەکـەی هەڵئەوەشـێنێتەوە، ئەگـەر ئـەمجارە بگەڕێتـەوە سـەر گوناهـەکانی تۆڵـەی لـێ دەکەمەوەو چیدیکە تەوبەی لێ قەبووڵ ناکەم، پێغەمبەری موساش پەیامەکەی موسـای بـەو پیـاوە گەیانـد، چـەند ڕۆژێـك ئـارامی گـرت لەسـەر تەوبەکـەی پاشـان دەسـتی کـرد بـە ئەنجامدانی گوناهو تەوبەکەی هەڵوەشاندەوە، خوای گەورە وەحـی بـۆ موسـا کـرد بـەو پیـاوە بڵێ لێی تووڕەمە، موساش بـە پیاوەکەی ڕاگەیانـد کـە خـوای تـەعالا لێـت تووڕەیـە، پیاوەکـە سەری خۆی هەڵدەگرێتو دەچێ بۆ دەشتێکی چۆڵ دەڵێ: ئەی خوای بەبـەزەیی ئـەو پەیامـە چـییە بۆمنـت نـاردووە بەموسـا؟ ئایـا گەنجینـەی لێخۆشـبوونت نـەماوە؟ ئایـا تاوانـەکانم دەتوانن زیان بەتۆ بگەیـەنن، یـان سـەخاوەتیت نـەماوە بەرامبـەر بەنـدەکانت، چ تاوانێـك لـە لێخۆشبوونی تۆ گەورەترە، تاوەکو بفـەرمووی: لەبەنـدەکانم خـۆش نابم؟چۆن لەبەنـدەکانت خۆش نابیت لە سەخاوەتی سیفەتی تۆیە، ئەگەر تـۆ بەنـدەکانت بـێ ئومێـد بکـەی ئـەی ڕوو لە کوێ بکەن؟ خوای تەعالا وەحی بۆ موسا کـردو پێـی فـەرموو بـەو بەندەیـەم بڵـێ: ئەگـەر

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ص ١١٥.

تاوانەكانی هێندەی ئاسمانەكانو زەوی بێ مـن لێی خۆشدەبم،كو چۆن منی ناسیوە كە بەخشندەو لێخۆشبووم[1].

## ٣٣٢. گەورەیی تەسبیحات

وەهب دەڵێ جارێكیان پێغەمبەر سولەیمان بەسەر (با)دا دەفڕێ، بەلای جوتیارێكدا تێدەپەڕێ، جوتیارەكە دەڵێ: بەڕاستی بنەماڵەی پێغەمبەر داوود موڵكو سامانێكی زۆریان پێدراوە، (با)یەكە بەفەرمانی خوا قسەی ئەو جوتیارەی گەیاندە گوێچكەی پێغەمبەر سولەیمان، هەر بۆیە لایدایە لای جوتیارەكە پێی فەرموو: ئەگەر تۆ یەك سبحان الله بڵێیو خوا لێت وەربگرێ باشترە لە هەموو موڵكو سامانی بنەماڵەی پێغەمبەر داوود جوتیارەكەش گوتی: خوای گەورە غەمەكانت لاببات هەروەكو چۆن غەمەكانی منت بەم قسەیە لابرد[2].

## ٣٣٣. تەمەنی ئۆممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەرقاڵیان بە دونیا

پێغەمبەر عیسا جارێكیان بەلای پیاوێكی ریش سپی تێپەری، ئەم پیاوە لە گەرماو سەرما بە بەردەوام خەریكی خوا پەرستی بوو پێغەمبەر عیسا پێی فەرموو: ئەگەر خانوویكەت هەبا بۆ ئەوەی لە سەرماو گەرما بتپارێزێ شتێكی باش بوو پیاوەكە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێغەمبەرانی پێش تۆ پێیان ڕاگەیاندووم كە من لە حەوت سەد ساڵ زیاتر ناژیم منیش عەقڵم قبولی نەكرد خۆم بە دروست كردنی خانوو سەرقاڵ بكەم بەڵكو پێم باش بوو ئەو تەمەنە كورتەم لەسەر قاڵ بوونم بە خوا پەرستی بەسەر ببەم، پێغەمبەر عیسا فەرمووی: با پێت بڵێم سەردەمێك دادێت لە پاشی ئێمە ئۆمەتێك دێن تەمەنیان لە حەوتا ساڵ تێپەر ناكات كەچی هەر خەریكی كۆشكو تەلاری بەرزن[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ص ٩٤.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٥٥.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧١.

### ٣٢٤. تەلقین دانی مردوو

لەو کاتەی صەفییەی کچی عەبدولموتەلیب وەفاتی کرد کە پوری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر قەبرەکەی ڕاوەستاو فەرمووی: صەفییە بڵێ: ئەو پێغەمبەرە برازای منە، گوتیان ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ ئەویش فەرمووی: (نەکیرو مونکەر) پرسیاریان لێکرد لەبارەی دینەکەی، ئەویش سەری سوڕما منیش بۆیە پێم گوت: بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕی برامە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئەوت تەلقین دا ئەی کێ ئێمە تەلقین بدا؟ خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند[١].

### ٣٢٥. زەکات نەدان

لە سەردەمی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس پیاوێکی دەوڵەمەند، کاتێك وەفاتی کرد مسوڵمانان چوون بۆ ئەوەی قەبری بۆ هەڵکەنن، بەڵام مارێکی گەورەیان لە قەبرەکەیدا بینی هەوڵیاندا بە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس کە قەبری ئەم پیاوە ماری تێدایە ئەویش گوتی: قەبرێکی دی بۆ هەڵکەنن بەڵام بەهەمان شێوە ئەمیش ماری تێدابوو، حەوت قەبری یەك لەدوای یەکیان بۆ لێدا هەر حەوتی ماری تێدابوو، عەبدوڵلای کوڕی عەباس بە ماڵو منداڵی ئەو پیاوەی ڕاگەیاند تا بزانێ کردەوەی چۆن بووە؟

ئەوانیش گوتیان: باوکمان هەرگیز زەکاتی نەدەدا، عەبدوڵلای کوڕی عەباسیش گوتی: دەی کەواتە لەگەڵ مارەکەدا بینێژن[٢].

### ٣٢٦. بێئاگایی لە ناو نوێژ

دەگێڕنەوە پیاوێك تورەگەیەکی بزر کرد نەیدەزانی لە کوێی داناوەو کێ لێی وەرگرتووە کاتێك دەستی بە نوێژ کرد، لە نوێژدا بە بیری هاتەوە تورەگەکەی داوە بە کێ، کە سەلامی دایەوە بانگی غولامەکەی خۆی کردوو پێی گوت: بڕۆ بۆلای فلان کەس تورەگەکەی لەلا بێنەوە، غولامەکەی گوتی: گەورەم ئەوە کەی بە بیرت هاتەوە؟

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٩.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٥.

پیاوەكە گوتی لەو كاتەی لەناو نوێژدا بووم.

غولامەكە گوتی: گەورەم تۆ داواكاری تورەگەی نەك داواكاری خوای گەورە پیاوەكە لەبەر ئەم قسەیە غولامەكەی ئازاد كرد[1].

### ٣٣٧. پشت بەستنی خالیدی كوڕی وەلید بە خوای گەورە

پێشەوا طبری بە سەنەدی خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو بوقەیلە خزمەت كارێكی لەگەڵ دابوو كیسەیەكی بە ملیدا هەڵواسیبوو، خالیدی كوڕی وەلید كیسەكەی لێوەرگرتو خستیە دەفرێكی خۆیەوە وە گوتی: ئەمە چییە ئەی عەمر؟

عەمر گوتی: توخوا هیچم لێ مەكە ئەوە ژەهرێكی كوشندەیە.

خالید گوتی: ئەی ژەهرت بۆ چییە؟

عەمر گوتی: دەترسم ئێوە ئەوە نەبن كە من دەیناسم، مردنم نزیك بۆتەوە، مردنیشم پێ خۆشترە لەوەی كە هۆزەكەم بخەمە سەر بیرو باوەڕێك كە زیانیان پێ بگەیەنێو ڕاست نەبێ، خالیدیش گوتی: ئەجەل بەدەستی خوایە ئەمە هیچ زیانی نییە گەر خوا نەیەوێ، ئنجا گوتی: (بسم الله خير الأسماء رب الأرض ورب السماء الذي ليس يضر مع أسمه داء، الرحمن الرحيم، فأهوو إليه يمتعونه منه)، ئەمەی خوێندو پاشان ژەهرەكەی قووتدا، عەمر كە ئەمەی لە خالید بینی، چاوەكانی ئەبڵەق بوون گوتی: ئەی كۆمەڵی عەرەب هەرچیتان بوێ دەستتان دەكەوێ مادەم ئەو جۆرە پیاوەتان تێدا بێ، پاشان گوتی: تا ئەمڕۆ نەمبینیوە بیرو باوەڕێك ئاوا ڕوونو ڕاست بێ[2].

### ٣٣٨. تفی پێغەمبەری خوا ﷺ بووەتە شیفا بۆ برینی جەستە

پێشەوا موسلیمو بوخاریو غەیری وانیش ڕیوایەتیان كردووە، لە سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدی بۆمان دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی خەیبەردا فەرمووی: بەیانی ئالاكە دەدەم بەیەكێكتان كە خواو پێغەمبەرەكەی خۆش دەوێو خواو پێغەمبەریش

---

[1]) مكاشفة القلوب- ل٢٧.

[2]) تأريخ الطبري ج٤ ص١٨٠.

ئەویان خۆش دەوێ، لەسەر دەستی ئەودا قەلاَی خەیبەر فەتح دەكرێ، سەهل دەڵێ: ئەو شەوە هاوەڵان هەریەكەیان حەزی دەكرد ئەو كەسەی ئالاَكە وەردەگرێ ئەوبێ، لەبەر ئەو مەدحە گەورەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە بەیانی بوویەوە هاوەڵان هەموو لەبەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وەستان هەریەكەیان حەزی دەكرد ئەو فەزڵ و پلەو پایە بەر ئەو بكەوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی گێڕا دوایی فەرمووی: كوا عەلی؟

هاوەڵان فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی دێشێ و لە نێو خێوەتە، فەرمووی: بڕۆن بیهێنن بۆم، ئەوانیش چوون هێنایان دوو لە هاوەڵان هەریەكەی پیلێكیان گرتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی دەمی موبارەكی خۆی خستە چاوەكانی پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو تالیب، هاوەڵان دەڵێن: دەم و دەست چاوەكانی چاك بوونەوەو هیچ ئازارێكیشیان نەما[1].

### ٣٣٩. شەكوای مامزێك لای پێغەمبەری خوا ﷺ

لە كتێبی (دلائل النبوة)دا هاتووە لە ئەبو نەعیفی ئەسفەهانی لە سابتی بەنانیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتە لای قەومێك قەومەكە ئاسكێكیان گرتبوو بەستبوویانەوە، ئاسكەكە سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ دەكات، پێغەمبەری خواش دەچێتە لای ئاسكەكە، ئاسكەكە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو قەومە منیان گرتووە، منیش دوو بەچكەی بچووكم هەن، شیرم پێیان نەداوە، پێیان بڵێ: با بەرم بدەن بچم دوو بەچكەكەم تێر بكەم و شیریان پێ بدەم پەیمانیشیان پێ دەدەم دوایی خۆم دێمەوە لایان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خاوەنی ئەم مامزە كێیە؟

قەومەكە گوتیان: ئێمەین، فەرمووی: ئەو مامزە ئازاد بكەن دەچێ شیر دەدا بە كۆرپەكانی دوایی خۆی دێتەوە لاتان، گوتیان: كێ دەبێ بەزامنی كە بێتەوە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من زامنی ئەوم دڵنیابن لەوەی دێتەوە، مامزەكە ڕۆیشت شیری دا بەكۆرپەكانی وەختێك بینیان هاتەوە لایان بۆ ئەوەی بیبەستنەوە، ئەو

---

[1]) پێشەوایان بوخاری و موسلیم ئەو بەسەرهاتەیان لە صەحیحەكانیان هێناوە.

پەیمانەی دابووی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێی گەیاند، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کوا خاوەنەکەی؟ ئەوانیش خاوەنەکەیان پیشاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مامزەکە دەفرۆشی بەمن؟

خاوەنەکەی گوتی: با بۆتۆبێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: دەی کەواتە ئازادی بکەن با بچێتەوە لای کۆرپەلەکانی[1].

### ٣٤٠. ئەهلی تەصەووف دەبێ وابن

ڕۆژێك پرسیاریان کرد لە ئەبو قاسم نەصرِ ئابادیی ئایا ئەهلی تەصەووف دەبێ چۆن بن؟ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێ: ئەهلی تەصەووف ئەوانەن کار بە قورئانو سوننەت دەکەن، ڕێزی پیاوچاکان دەگرن، عوزر لەخەڵك قەبووڵ دەکەن، هاوڕێیەتی کەسانی باش دەکەن، خووڕەوشتیان جوانە، بەردەوامن لەسەر زیکرو یادی خوا، بێ بەڵگە قسە لەشەرعی خوا ناکەن، ئەهلی تەصەووف ئاوان[2].

### ٣٤١. دونیا ویستان بەکەم ڕازین

ڕۆژێك بە شێخ داوودی تائیان گوت: دەبینین تۆ لەدونیادا زۆر بەکەم ڕازی دەبی، ئەویش گوتی: پێتان بڵێم کێ لەمن زیاتر بەکەم ڕازییە؟

گوتیان کێ؟

گوتی: ئەو کەسەی باوەشی بەدونیا کردۆتەوەو ئاگای لە قیامەت نەماوە، خۆشیو نەعیمی بەهەشتی بەخۆشی دونیا گۆڕیوەتەوە، بێگومان ئەو کەسە زۆر لەمن زیاتر بەکەم ڕازی یە[3].

---

[1]) هذا الحبیب- ص ٤٤٢.

[2]) مەجلیسی ئەولیا- ب٢ لا ٤٢٤.

[3]) هەمان سەرچاوە ل ٢٨٧.

### ٣٤٢. پەلە کردن بۆ ئەنجامدانی نوێژ

دەڵێن شێخ داودی تائی کاتێ دەچوو بۆ نوێژی بەکۆمەڵ بەتوندی بەڕێدەکەوت بۆ مزگەوت، لێیان پرسی قوربان بۆ بەم شێوە دەچی بۆ نوێژی بەکۆمەڵ؟

گوتی: لەدەرەوەی شار لەشکرێك چاوەڕوانی منن.

گوتیان: کامە لەشکر؟

گوتی: لەشکری مردووەکانی گۆڕستان نەبادا بەدوامدا بنێرن‌و فریای نوێژەکەم نەکەوم[1].

### ٣٤٣. هەڵس‌و کەوتی پیاوچاکان لەکاتی مردنی منداڵەکانیان

دەگێڕنەوە فوزەیلی کوڕی عیاز لەماوەی چەند ساڵێك بەدەگمەن نەبێ نەیانبینیوە پێبکەنێ، بەڵام کاتێ جگەر گۆشەکەی وەفاتی کرد، زەردەخەنەی کردو پێکەنی، گوتیان: تۆ ماوەی چەند ساڵە نەمانبینیوە پێبکەنی بۆچی لەوکاتە سەختەدا پێدەکەنی؟

گوتی: ئاخر زانیم خوای گەورە ویستی وایە کوڕەکەم بمرێ، منیش بەویستی خوا ڕازیم‌و لەخۆشیان پێدەکەنم[2].

### ٣٤٤. سیفاتی پیاوچاکان

ئەبو سەعید دەڵێ: پاشایەك لە وەزیرەکەی پرسی: پیاو چ سیفاتێکی تێدا بن دەبێ بەپیاو چاك؟

وەزیرەکە گوتی: ئەی پاشا هەرکەسێ هیممەتی وەك کەسانی ئازا، شەرمی وەك شەرمی کچان‌و تەوازوعی وەك تەوازوعی بەندەکان، سەخاوەتی وەك سەخاوەتی عاشقان،

---

[1] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[2] هەملن سەرچاوە ل ٢٥٦.

سیاسەتی وەك سیاسەتی پاشایان، عیلمو تەجرەبەی وەك عیلمو ئەزموونی پیران، عەقڵێكی وەك عاقڵانی هەبوو، بەو حەوت خەسڵەتە دەبێتە پیاوچاك[1].

### ٣٤٥. دەرمانی دڵ ڕقی

دەگێڕنەوە پیاوێك دەچێ بۆلای دایكمان عائیشە لێی دەپرسێ: من تووشی دەردی دڵ ڕەقی بووم دەرمانم چییە؟

پێی گوت: دەردەكەت زۆر خراپە، بۆ ئەوەی دڵت نەرم بێ سەردانی كەسانی نەخۆش بكە، بەشداری ناشتنی مردوو بكە، بەردەوام چاوەڕێی مردن بكە[2].

### ٣٤٦. گەورەیی صەڵەوات لێدان

یەكێ لە پیاوچاكان دەڵێ: لای ئەبو بەكری كوڕی موجاهید دانیشتبووم، شێخ شبلی هاتە لای ئەبو بەكر لەبەری هەڵساو دەستی لەملی كردو نێوچەوانی ماچ كرد، ئەو پیاوچاكەش دەڵێ: گوتم گەورەم بۆچی ئاوا هەڵسو كەوت لەگەڵ شیبلیدا دەكەی لەكاتێكدا خەڵكی بەغدا دەڵێن: شیبلی پیاوێكی شێتە؟

ئەبو بەكر گوتی: ئەوەی من لەگەڵ شیبلیدا كردم ئەوەبوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵی كرد، من پێغەمبەری خوام ﷺ لەخەودا بینی، شیبلی چوو بۆلای بەم شێوەیە لەبەری هەڵسایەوە دەستی لەملی كردو نێوچەوانی ماچ كرد منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه و سلم ) بۆچی وات كرد لەگەڵ شیبلی؟

ئەویش فەرمووی: چونكە لەپاش هەموو نوێژەكان ئەو ئایەتە دەخوێنێ ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة پاشان صەڵاواتم لەسەر لێدەدا[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ٢٥٦.

[2]) بستان الواعظين- ص ١٨٨.

[3]) هەمان سەرچاوە ل ٣٥٠- ٣٥١.

### ٣٤٧. ترسی منداڵێك لە ڕۆژی قیامەت

ئەبو بەكری وەڕاق منداڵێكی هەبوو دەینێرێ بۆ قوتابخانە ڕۆژێكیان منداڵەكەی بە گریانەوە لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، شێخ ئەبو بەكر كە منداڵەكەی بینی لێی پرسی ئەوە بۆ دەگری كوڕەكەم؟

منداڵەكەی گوتی: باوكە ئیمڕۆ مامۆستا ئەو ئایەتەی پێ گوتین كە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَانَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ﴾ المزمل واتە: ئەگەر ئێوە ئیمان بەخوا نەهێنن چۆن چۆن خۆتان دەپارێزن لەتۆڵەو سزای ڕۆژێك كە ڕۆژێكی ئەوەندە ترسناك‌و ناخۆشە منداڵی ساوا تێیدا پیر دەبێ، منداڵەكە گوتی: باوكە لەو كاتەوەی گوێم لەو ئایەتە بووە خۆم پێڕاناگیرێ‌و فرمێسك لە چاوەكانم ناوەستێ، ئەبو بەكری وەڕاق گوتی: ئەی خاك بەسەری باوكت چەند ساڵە قوڕئان خەتم دەكات‌و دەیخوێنێ ئەو ئایەتە كاری تێنەكردووە[1].

### ٣٤٨. گفتوگۆی پێشەوا ئەبو حەنیفە لەسەر وونی خوای پەروەردگار

لە كارە چاكەكانی پێشەوا ئەبو حەنیفەدا هاتووە كە ڕۆژێكیان كۆمەڵێك كەسی بێباوەڕ دێنە لای بۆ ئەوەی موناقەشەی بوونی خوای گەورە بكەن، پێشەوا ئەبو حەنیفەش پێی گوتن دەمەوێ ئەو موناقەشەیە لەبەرچاوی خەڵك بێ، تا گوێیان لە بەڵگەكانی هەردوو لا بێ، لەكۆتاییدا خەڵكەكە بڕیاری ئەوە بدەن كێ سەركەوتووەو كێ سەركەوتوو نییە، مەوعیدێكیان دانا بۆ دوو مانگی تر، بۆ ئەوەی خەڵكی بتوانن لە شوێنە دوورەكانەوە بێن، كاتێ ڕۆژی دیاری كراو هات خەڵكێكی زۆر كۆبوونەوە، بێباوەڕەكانیش ئامادە بوون، بەڵام ئەبو حەنیفە بەدیار نەكەوت خەڵكەكە هەموو چاوەڕێی ئەبو حەنیفەیان دەكرد، بێباوەڕەكان بەمە دڵخۆش بوون، بەدەرفەتیان زانی بۆ ئەوەی بەخەڵكەكە بڵێن كە ئەبو حەنیفە لە ڕووبەڕو بوونەوەكە ترساوە بەڵگەی لەبەر دەستدا نییە بۆیە ئامادە نابێ، خەڵكی لەدڵە ڕاوكێ بوون بە تاخیر بوونی پێشەوا ئەبو حەنیفە، لەو كەین‌و بەینەدا بوون ئەبو حەنیفە بەخێرایی هات، ئەوانیش لەسەر ئەو درەنگ هاتنەی گلەییان لێكردو

---

[1]) مەجلیسی ئەولیا ب٢ ل ٣٧٧- ٣٧٨.

ڕەخنەیان لێگرت، ئەویش گوتی: گوێم بۆ بگرن بزانن بۆچی تاخیر بوومە ئنجا سەرزەنشتم بکەن، ئەویش عوزرێکی وای بۆ هێنانەوە کە باوەڕ نەکرێ، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەریان، گوتی بمبوورن من لەشاری بەصرە بووم ئەو موناقەشەیەشمان لەشاری بەغدایە لەبەینی ئەو دووشارەش ڕوباری فورات هەیە، کە گەیشتمە سەر ڕوبارەکە هیچ بەلەمێك نەبوو بمپەڕێنێتەوە وە خۆشم مەلە نازانم تا بەمەلە بپەڕمەوە، لەنزیك ڕووبارەکە ڕاوەستام، لەناکاو چەند دارێکی گەورەم بینی لەدارستانەوە هاتن بۆ ناو ئاوەکە چوونە پاڵ یەکتر بەبزمار پێك وەنووسان بوو بە بەلەم‌و منیش سواری بووم‌و پێی پەڕیمەوە ئەوەبوو هۆکاری دواکەوتنەکەم، بێ باوەڕەکان دەستیان کرد بە پێکەنین گوتیان: عەقڵت بێ ئەوە چیت لێ قەوماوە؟ دەچێتە عەقڵی کێ کەشتیەك دروست بێ بۆخۆی بێئەوەی کەس دروستی بکا؟ گاڵتەمان پێ دەکەی؟

ئەویش گوتی: بۆچی عەقڵتان قەبووڵی ناکا کەشتییەك لەخۆوە دروست ببێ، بێ ئەوەی کەس دروستی بکا، بەڵام عەقڵتان قەبووڵ دەکا ئەو کەشتیە گەورە کە گەردوونە بەو هەموو وردەکاری‌و بەرنامە ڕێژییەی بێ خاوەن بێ‌و کەس دروستی نەکردبێ؟

بێباوەڕەکان‌و خەڵکەکەی لەوێ ئامادەبوون سەرسام بوون بەو عەقڵ‌و ژیری‌و بەڵگەیەی پێشەوا ئەبوحەنیفە، بێ باوەڕەکان یەکسەر ئیمانیان هێنا[1].

### ٣٤٩. فێڵێکی مارکسییەکان بۆ کافرکردنی منداڵی مسوڵمانان

دەگێڕنەوە مارکسییەکان لە وڵاتێکی داگیرکراوی مسوڵمانان، کۆمەڵێك منداڵی مسوڵمان لە شوێنێکی خۆشی گەورەدا کۆدەکەنەوە، دەیانەوێ ئیمان لەدڵیان دەربهێنن‌و گومانیان بۆ دروست بکەن، پێیان دەڵێن: ئایا خوا هەیە؟

منداڵەکانیش دەڵێن بەڵێ.

ئەوجارە دەڵێن: کێ خواردنتان پێ دەدا؟ منداڵەکان دەڵێن: خوا.

---

ئـەو کۆمەڵـە مارکسییەش منداڵـەکان لـەو شـوێنەدا دەهێڵنـەوە نایـەڵن بـڕۆن، هـیچ خواردنیـان پێنـادەن بـۆ ماوەیـەکی دوورو درێـژ، منداڵـەکان زۆر بـێ تاقـەتو برسـی دەبـن، مارکسییەکانیش دەڵێن: برسیتانە منداڵەکان دەڵێن بەڵێ.

ئەوانیش دەڵێن: دەی داوا لەخوا بکەن با خواردنتـان پـێ بـدا، ئـەوانیش بـە هـۆی ئـەو فیترە پاکەی خۆیـان هـاوار لـە خـوا دەکـەن دەپاڕێنـەوە خـوا خواردنیـان پـێ بـدا، هـەر هـاوار دەکـەن، بێگومـان خـوای تـەعالاش بـۆ هەرشتێك هۆکـارێکی دانـاوە، زۆر زۆر برسـیان دەبـێ شـەکوای برسـیەتی دەکـەن، ئـەو مارکسـیە مولحیدانـەش دەڵـێن: منداڵـەکان دەزانـین زۆرتـان برسـیە بڵـێن: سـتالین خواردنمـان بـدێ، منداڵـەکانیش لەبـەر ئـەوەی برسـیەتی زۆری بـۆ هێنـابوون گوتیـان: ئـەی ستالین خواردنمـان بدێ، ئـەوانیش پێشتر بەرنامەڕێـژیان بـۆ ئـەو کـارەی خۆیـان کردبـوو، بۆیە کۆمەڵـە خـواردنێکی زۆر خـۆش بـۆ منداڵـەکان دەهێـنن، دوای ئـەوەی کـە منداڵـەکان تێـر دەخـۆن، ئنجـا ئـەو بـێ باوەڕانـە دێنـە لای ئـەو منداڵـە پـاكو بێگوناهانـەو پێیـان دەڵـێن: ئەگـەر خـوا بـوونی هەبوایـەو ڕاسـت بووایـە خـواردنی پێـدەدان بەلأم ئەمە درۆیەو خوا بوونی نییە، بێگومان ستالین خوای ئێوەیە[1].

### ٣٥٠. دەمکوت کردنەوەی مامۆستایەکی مارکسی لەلایەن قوتابییەکی مسوڵمان

جارێکیان مامۆستایەکی بێ باوەڕ لە قوتابخانەیەکی ئامادەیی لە قوتابییـەکان دەپرسـێ، ئایا خوا دەبینن؟

قوتابییەکان دەڵێن: نەخێر.

مامۆستاکە دەڵێ: دەی لەبەر ئەوەی نایبینن کەواتە نییە.

یەکێ لە قوتابییە زیـرەكو عاقڵەکانی پۆلەکە هەڵدەسـتێتەوە دەڵـێ: مامۆسـتا مۆڵـەت دەدەی پرسیارێك لە هاوڕێکانم بکەم؟

مامۆستاکە دەڵێ: فەرموو پرسیاریان لێ بکە.

---

[1]) يسألونك في الدين والحياة – تأليف د. أحمد الشرباصي ج٧ ص٢١٧- ٢١٨.

قوتابییەکە بەهاورێکانی دەڵێ: ئایا ئێوە عەقڵی مامۆستا دەبینن؟

هەموو بەیەکەوە دەڵێن: نەخێر.

قوتابییەکە دەڵێ: دەی کەواتە مامۆستا عەقڵی نییە، قوتابییەکان یەك دەنگ دایان لەقاقای پێکەنین‌و مامۆستا دەبەنگەکەی بێدەنگ کرد[1].

٣٥١. هەست کردن بە نیعمەتە زۆرەکانی خوا

لە بیاباندا دەڕۆیشتم‌و ڕێگەم لێ ون بوو، لەلای ڕەشماڵێکی کۆن وەستام، سەیری ناو ڕەشماڵەکەم کرد پیاوێك لەسەر زەویەکە زۆر بە ئارامی دانیشتبوو، هەردوو دەستی بڕابۆوەو چاوەکانی لەدەست دابوو هیچ کەسی لا نەبوو لەبەر خۆیەوە ووڕتە ورتێکی دەکردو چەند وشەیەکی دووبارە دەکردەوە لێی نزیك بوومەوە گوێم لێبوو دەیگوت: (الحمد لله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا...)، واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە پلەو پایەی منی بەرز کردەوە بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکانی دا، سەرم سوڕما کە گوێم لەو دوعایەی ئەو پیاوە بوو، سەیری حاڵی ئەو پیاوەم کرد زۆر حاڵەتێکی خراپی هەیەو زۆربەی هەستەکانی لەدەست داوە، هەردوو دەست‌و هەردوو چاوەکانی لەدەست داوە، سەیری دەورو بەریم کرد بۆ ئەوەی بزانم کەسێك هەیە خزمەتی بکات، بەلام کەسم بەدی نەکرد، بەرەو لای چووم‌و هەنگاوم نا، هەستی پێم کرد گوتی: کێیە کێیە؟

منیش گوتم: السلام علیکم، من پیاوێکم ڕێگەم ون کردووە لای ڕەشماڵەکەی تۆم، ئەی تۆ کێی؟ بۆچی بەتەنها لێرەدا نیشتەجێی؟ منداڵ‌و کەس‌و کارت لە کوێن؟

گوتی: من پیاوێکی نەخۆشم زۆربەی خزمەکانم وازیان لێهێناووم، زۆریشیان مردووە.

منیش گوتم: گوێم لێت بوو هەر ئەو وشانەت دووبارە دەکردەوە (الحمد لله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا...) بۆ خاتری خوا کام نازو نیعمەتەیە تۆ باسی دەکەی؟ تۆ هەم نابینای هەم دەست بڕاوی هەم بێکەس‌و کاری هەم هەژارو نەداری؟

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ٢١٨.

گوتی: بۆت باس دەکەمو تێت دەگەیەنم، بەس داواکارییەکم هەیە بۆم جێبەجێ دەکەی؟

گوتم: وەلامم بدەرەوە بۆم باس بکە داواکاریەکەت بۆ جێبەجێ دەکەم.

ئەویش گوتی: دەمبینی خوای گەورە بەچەندان تاقی کردنەوە تاقی کردوومەتەوە تووشی چەندان بەلاو نارەحەتی کردووم بەلام (الحمد لله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا...)، ئەی خوا بیستنی پێ نەبەخشیوم؟ ئەی ئەوە نیعمەت نییە گوێم لەدەنگی بانگ دەبێ، لەقسەی خەلك تێدەگەم، دەزانم چ لەدەورە بەرم ڕوودەدا، گوتی: چەند کەس هەن هەم نابیستن هەم ناشبینن؟

گوتم: زۆر زۆر.

گوتی: دەی کەواتە (الحمد لله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا...)، دەی خوا زمانی پێ نەبەخشیوم زیکرو یادی ئەوی پێدەکەم؟ هەر شتێکی بمەوێ داوای دەکەم، ئایا چەند کەس هەن زمانیان نییەو لالن ناتوانن داواکاریەکانیان بگەیەنن؟

گوتم: زۆر زۆرن ئەو کەسانە.

گوتی: دەی کەواتە (الحمد لله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا...) ئایا خوای پەروەردگار ئیسلامەتی پێ نەبەخشیومو هیدایەتی داووم، منی بە مسولمان گێڕاوە، خوا دەپەرستمو پاداشتیشم لای ئەوە لەسەر بەلاو نارەحەتیش ئارامیم پێ دەبەخشێ.

گوتی: چەند کەس هەن لەجیاتی خوا شتی تر دەپەرستن؟

گوتم: زۆر زۆرن ئەو کەسانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن.

گوتی: دەی کەواتە: (الحمد لله الذي فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا...).

ئەو پیاوە بەو هەموو نارەحەتییەوە هەر نیعمەتەکانی خوای بۆ دەژماردم یەك لەدوای یەك، سەرم سوڕماو واقم وڕما لە باوەڕی بەهێزی ئەو پیاوە، زۆر زۆر ڕازی بوو بەو بەشەی خوا پێی داوە، چەندان کەس هەن چاریەکی ئەو پیاوە نەخۆشیەکەیان نارەحەت نییە لەچاو ئەو پیاوە پیرە بەلەش ساغ لەقەلەم دەدرێن لەگەل ئەوەشدا کە دەیاندوێنی

سکالای حاڵی خۆیان دەکەن بەبەردەوام، ئارامیان نییەو دەگرین لە وەرگرتنەوەی پاداشتی ئەوەی تاقیکراونەتەوە دڵنیا نیین، ئەگەر ناڕەحەتیەکانی ئەو پیاوەت بەسەر خەڵکانێکدا دابەش کردبایە بەشی دەکردن، بەردەوام بیرم لەو پیاوە پیرە دەکردەوە، لەناکاو پیاوە پیرەکە گوتی: ها داواکاریەکەمت لەبیرە بۆم جێبەجێ دەکەی؟؟

گوتم: پێویستیو داواریەکەت چییە بەڵێ بۆت جێبەجێ دەکەم؟

کەمێك سەری داخستو پاشان سەری بەرز کردەوەو گوتی: کەسم لەگەڵ نییە تەنها کوڕێکی چواردە ساڵانم نەبێ، ئەو کوڕەم نانو ئاوم پێدەداو خزمەتم دەکا، دەست نوێژم بۆ هەڵدەگرێ، لەبەیانیەوە ڕۆیشتووە تائێستا کە ئێوارەیە نەهاتۆتەوە نازانم چی بەسەر هاتووە ماوە یان خوانەخواستە مردووە؟ هەروەك حاڵی منیش دەبینی ناتوانم بە دوایدا بگەڕێم ئەگەر ئەوەندەم بۆ بکەی هەواڵیم بۆ بپرسیو ئاگادارم بکەیەوە.

منیش هاتمە دەرەوە لە ڕەشماڵەکە نەمدەزانی بۆ کام لا بڕۆمو لە کوێ بۆی بگەڕێم، دەمویست لەو دەورە بەرە کەسێك ببینمو پرسیاری لێبکەم لە نزیك ڕەشماڵەکە تەپۆڵکەیەك هەبوو لەسەر تەپۆڵکەکە کۆمەڵە قەڵە ڕەشێکم بینی وەك ئەوەی بەسەر شتێکدا کۆبووبنەوە، لەدڵی خۆم گوتم: بەخوا ئەو قەڵە ڕەشانە لەسەر لاشەیەك یان خواردنێك نەبێ ئاوا کۆنابنەوە، بەسەر تەپۆڵکەکە سەرکەوتم قەڵە ڕەشەکان هەڵفڕین کاتێك سەیرم کرد لاشەی کوڕێکی مردووی هەرزەکاری لێبوو ، جەستەی پارچە پارچە بووبو وەك ئەوەی گورگ وای لێکردبێ، پاشان بۆ باڵندەکانی جێهێشتبێ، ئەوەندەی بۆ پیاوە پیرەکە غەمبار بووم بۆ مردنی کوڕەکەی دڵتەنگ نەبووم، لە گردۆڵکەکە دابەزیم بەخەمباریو سەرسوڕماویی، ئایا بڕۆمو پیاوە پیرەکە ئاگادار کەمەوە و ئەو هەواڵە ناخۆشەی پێ ڕابگەیەنم؟

بەرەو ڕەشماڵەکەی چووم لەدەرەوەی ڕەشماڵەکە گوێم لێبوو دەیگوت (سبحان الله، الحمدلله) زیکری خوای گەورەی دەکرد، لەو کاتەدا کەسەیرم کرد پێغەمبەر ئەیووبم بیرهاتەوە، چوومەوە لای چۆنم جێهێشتبوو هەروا بوو سڵاوم لێکرد ئەو بەستەزمانە زۆر بەتاسەوە بوو بۆ هەواڵی جگەر گۆشەکەی، یەکسەر گوتی: کوا کوڕەکەم؟

منیش گوتم سەرەتا وەڵامی سەلامەكەم بدەوە، ئەویش وەڵامی سەلامەكەمی دایەوە، گوتم: تۆ لای خوا خۆشەویستتری یان پێغەمبەری ئەییوب؟

گوتی: پێغەمبەر ئەییوب.

گوتم: تاقیكردنەوەكەی تۆ قورسترە یان هی ئەو؟

گوتی: هی ئەو.

گوتم: دەی وای دابنێ كوڕەكەت لای خوایە، لەسەر تەپۆڵكەیەك لەو دەورو بەرە بە مردوویی بینیم، گورگ لاشەكەی خواردبوو.

ئەو بەستەزمانە بەئاهو حەسرەتەوە كە من ئەو قسانەم بۆی دەكرد هەر دەیگوت: (لا إلـه إلا الله)، منیش بەردەوام ئارامم دەكردەوە، پاشان هەر هاواری كردو دەنگی بەرز بوویەوە تا گیانی سپاردو لەبەردەمم وەفاتی كرد.

منیش بەڕاخەرەكەی ژێری داپۆشیو گەڕام بەدوای كەسێك بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات بۆ ئەوەی بتوانین بینێژین.

چاوم گێڕا سێ پیاوم بینی بەسەر ئاژەڵەكانیانەوە بە ڕێبوار دەچوون، منیش بانگم كردن هاتن بۆلام، پێم گوتن دەتانەوێ پاداشتی خواتان دەست كەوێ؟

لەو ڕەشماڵەدا مسوڵمانێك وەفاتی كردووە كەسی بەدەورو بەرەوە نییە، یارمەتیم بدەن بۆ ئەوەی بیشۆین‌و كفن‌و دفنی بكەین، چووینە ڕەشماڵەكەو بۆ ئەوەی لاشەكەی هەڵگرین ئەو سێ پیاوە كاتێ ڕوخساری ئەو پیرەمێردەیان بینی گوتیان ئەبو قەللابە ئەبو قەللابە، گوتیان ئەوە یەكێكە لە زانایانی لای ئێمە قەدەری خوا دووری خستۆتەوەو كەوتۆتە ئێرە، بەڵاو ناڕەحەتیەكان بۆ ئێرەیان هێناوە.

پاشان بەئەركی سەرشانی خۆمان هەستاین‌و ناشتمان منیش لەگەڵ ئەو سێ كەسەدا هاتمەوە بۆ شار، شەو نووستم لەخەونمدا ئەو پیاوە پیرە بەستەزمانەم بینی شێوەیەكی زۆر جوانی هەبوو، جل‌و بەرگێكی سپی جوانی لەبەردا بوو سەیری جەستەییم كرد بێ كەم‌و

کوڕی بوو بەزەوییەکی سەوزایی خۆشدا دەڕۆیشت، گوتم: ئەبو فەللابە چۆن وا بەم شێوەیەت دەبینم؟

گوتی: خوای بەبەزەیی بەهەشتی پێ بەخشیم لەوێدا پێیان گوتم: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الرعد[1].

**٣٥٢. قورئان بۆ ستەمکاران نابێتە شیفا**

هاوڕێیەکم هەیە بەناوبانگە لە خوێندنی دوعاو قورئان بەسەر ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی دەروونی بوون یان ئەو کەسانەی تووشی چاوو زارو جادوو بووینە، ئەو هاوڕێیەم بۆی گێڕامەوە ڕۆژێك بازرگانێکی بەناوبانگ هات بۆلام سکالای دەکرد لەدەست ژانی دەستی چەپی، شوێنەواری ئەو ئازارە بەهێزە بەڕوونی بەڕوخساریەوە دیار بوو، گوتی یا شێخ دوعاو قورئانم لەسەر بخوێنە سەردانی زۆر دکتۆرم کردووە چاك نەبوومەتەوە، منیش دوعام بەسەردا خوێند، بۆ ڕۆژی دووەمو سێیەمو چوارەم هەر دەهاتەوە ئازارەکەشی هەر درێژەی دەکێشا، نەك چاك نەدەبوویەوە بەڵکو ئازاری زیاتر دەبوو ڕۆژ بەڕۆژ، منیش ڕۆژێکیان کەهاتە لام هاوارم کرد بەسەریداو گوتم: ئەی فلان کەس لەوانەیە ئەو ئازارەت دوعای ستەم لێکراوێك بێ ستەمت لێی کردبێ،ماڵت خواردووە یان دەروونیت ئازار داوە، کە ئەو قسەیەم کرد کابرای بازرگان زۆر تووڕەبوو ڕەنگی خراپ گۆڕا گوتی: ستەم بۆچی ستەم من پیاوێکی چاکم، من..من، لە توڕەییەکەی ئارامم کردەوەو داوای لێبوردنم لێکرد، پاشان ڕۆیشت، دوای (١٠) ڕۆژ هاتەوە بۆ لام بینیم تەندروستی زۆر باش بووە، دەیویست دەستم ماچ بکات منیش نەمهێشت بەلاّم زۆر سووربو لەسەر ئەوەی سەرم ماچ بکات، گوتی: سوێند بەخوا دوای خوای گەورە تۆ هۆکاری شیفای من بووی، گوتم چۆن؟ خۆ دوعاکانی من هیچ لە ئازارەکانی کەم نەکردی؟

گوتی: یا شێخ لەدوای ئەوەی لای تۆ ڕۆشتم ئازارم هەر زیادی دەکرد، قسەکانی تۆش لەگوێمدا دەزرنگایەوە، لەبەر خۆمەوە دەمگوت: بەڵێ لەوانەیە ستەمم لەکەسێك کردبێ‌و

---

[1]) شەیدایی- د. موحەممەد عورەیفی ل ١٩- ٢٣.

ئازارم دابێ، بیرم کەوتەوە لەو کاتەی دەمویست کۆشکەکەم دروست بکەم زەویەك بەتەنیشت زەویەکەی منەوە بوو، منیش دەمویست بیکڕمو بیکەم بەباخچە بۆ کۆشکەکەم، ئەو زەوییەش هی ئافرەتێك بوو چەند منداڵێکی هەبوو پیاوەکەی نەمابوو، بەڵام ڕازی نەبوو زەویەکەم پێ بفرۆشێ، ئافرەتەکە پێی گوتم: ئەگەر بیفرۆشم پارەکەی چ لێبکەم؟ نایفرۆشم تا منداڵەکانم گەورە دەبن بۆخۆیان بیکەن بە خانوو، منیش دەمویست ڕازی بکەم پارەی زۆرم خستە بەردەستی بەڵام هەر ڕازی نەبوو، زەویەکە بۆمن بایەخی هەبوو، بۆیە جۆرە فێڵێکم دیتەوە مۆڵەتی بینام بۆی وەرگرت زەویەکەم لێسەند، بینام تیادا دروست کرد، منیش گوتم ئەی منداڵەکان دایکیان چییان دەکرد؟

گوتی: دایکیان هەر دەهاتو دەچوو قسەی بە کرێکارەکان دەگوتو دەگریا، کرێکارەکانیش وایان دەزانی ئەو ژنە شێتە، لەبیرمە ڕۆژێکیان هات لەوێ بەگریانەوە دەستی بەرز کردەوەو پاڕایەوە، هەر لەو کاتەوە ژانێك لەدەستم پەیدا بوو بەشەو خەوم لێنەدەکەوت، بەڕۆژ هیچ ئاسوودە نەبووم، یا شێخ پاش ئەوەی تۆ ئەو قسەیەت کرد: یەکسەر ئەو ئافرەتەکەم هاتەوە یاد.

منیش گوتم: دوای ئەوەی کە ڕۆشتی چیت کرد؟

گوتی: چووم بۆ لایو زۆر داوای لێبوردنم لێی کرد لە شوێنێکی زۆر باشتر لەهی خۆی زەوییەکم پێیدا، ئەویش سوپاس بۆخوا ڕازی بوو، گەردنی ئازاد کردمو دوعای لێخۆشبوونو چاك بوونەوەی بۆ کردم، منیش هەر لەو کاتەی لای ئافرەتەکە هاتمەوە هاناو هاوارم بۆخوا برد، ئازارەکەم بەرە بەرە کەم بووەوەو نەما[1].

### ٢٥٣. شەیدای قورئان خوێندن

کابرایەك دەڵێ چووم بۆ نەخۆشخانەیەك، بەلای ژووری نەخۆشێکدا تێپەڕیم ئەو نەخۆشە هەرکەسێ بەبەردەم ژوورەکەیدا تێپەڕیبایە بانگی دەکرد، منیش چوومە ژوورەوە، بینیم هەموو گیانی شەلەل لێیداوە ناتوانێ لەشوێنی خۆی بجووڵێ، تەختەیەك لەبەردەمیدا دانرابوو قورئانێکی بە کراوەیی لەسەر بوو، ئەو نەخۆشە بۆ ماوەی چەند

---

[1]) شەیدایی- ل ١٢- ٥

کازێرێك هەر ئەو دوو پەڕەی دەخوێندەوەو دووبارەی دەکردەوە لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی پەڕەکە هەڵداتەوە، کەسێکیشی لەلا نەبوو بۆ ئەوەی یارمەتی بدات، کاتێ لەبەردەمیدا ڕاوەستام پێی گوتم: بێزەحمەت لاپەڕەکەم بۆ هەڵدەوە، کە لاپەڕەکەم بۆ هەڵدایەوە ڕووخساری گەشایەوە، دەستی کرد بە خوێندنی قورئان، خۆم بۆ نەگیراو دەستم کرد بەگریان، سەرم سوڕما لە بێئاگایی خۆمان‌و پەرۆشی ئەو نەخۆشە بۆ خوێندنەوەی قورئان[1].

## ٣٥٤. شەیدای سوجدە بردنی نەخۆشێك بۆ خوا

کابرایەك دەگێڕێتەوە چووم بۆلای نەخۆشێك لە یەکێك لە نەخۆشخانەکان بەتەواوی تووشی شەلەل بوو، تەنها سەری دەجوولاً، زۆر زگم پێی سووتا، بەزەییم پێیدا هاتەوە، گوتم خۆزگەی چی دەخوازی؟ گومانم وابوو خۆزگە بخوازێ چاك ببێتەوە.

نەخۆشەکە گوتی: تەمەنم چل ساڵە پێنج منداڵم هەیە حەوت ساڵە تووشی ئەو نەخۆشییە بووم‌و لەسەر جێگام، سوێند بەخوا خۆزگەی ئەوە ناخوازم لەسەر پێیەکانی خۆم بوەستم‌و لەگەڵ منداڵەکانمدا بێم‌و بچم‌و هەنگاو بنێم.

بەسەرسوڕمانەوە گوتم: ئەی خۆزگە بەچی دەخوازی؟

گوتی: تەنها خۆزگەی ئەوە دەخوازم جارێکی تر نێوچەوانم لەسەر زەوی دابنێم‌و سوجدە بۆخوای میهرەبان ببەم[2].

## ٣٥٥. کاریگەری بانگ دان

پزیشکێك بۆی گێڕامەوە دەڵێ: ڕۆژێکیان چووم بۆ لای نەخۆشێك لە ژووری بووژانەوەی دڵ، نەخۆشەکە پیاوێکی پیر بوو، لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو، ئەو پیاوە پیرە دەم‌و چاوێکی نوورانی هەبوو، سەیری فایلەکەیم کرد زانیم نەشتەرگەری دڵی بۆ کراوەو تووشی خوێنبەربوون بووە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی خوێن لەچەند شوێنێکی مێشکیدا

---

[1]) شەیدایی- ل ٣٣.

[2]) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

بووەستیٚو تووشی بێئاگاییەكی تەواو بێت، لەسەردەمی ئەو پیاوە پیرە نەخۆشە ئامێرێكی هەناسەدانی دەستكرد دانرابوو ئەو ئامێرە لە خولەكێكدا نۆ جار پاڵی بە سیەكانیەوە دەناو هەناسەی پێدەدا، یەكێ لە كوڕەكانی لای بوو، منیش پرسیاری باوكیم لێكرد، گوتی: باوكم بۆ ماوەی چەند ساڵێك بانگ بێژی یەكێ لە مزگەوتەكان بووە.

سەیری باوكیم كرد دەستەكانیم جووڵاندو قسەم لەگەڵی كرد ئاگای لە هیچ نەبوو، كوڕەكەی سەری بردە بن گوێی باوكیو گوتی: بابەگیان دایكمو خوشكو براكانم هەموو باشن، خاڵیشم لە سەفەرەكەی گەڕاوەتەوە، كوڕەكەی بەردەوام قسەی لەگەڵ دەكرد باوكی ئاگای لە هیچ نەبوو، ئامێرەكەش هەر هەناسەی پێدەدا.

لەپڕ كوڕەكەی گوتی: باوكە گیان مزگەوتەكە تاسەی بینینت دەكات كەس نییە لەشوێنی تۆ بانگ بدا، تەنها فلاٚن كەس نەبێ ئەویش لە بانگدانـدا هەڵە دەكات، شوێنەكەت زۆر چۆڵە لە مزگەوت.

كاتێ باسی مزگەوتو بانگدان كرا، كابرا دەستی بەجووڵەو هەناسەدان كرد، سەیری ئامێرەكەم كرد ئاماژەی بەوە كرد لە خولەكێكدا (١٨) جار هەناسەی داوە، كوڕەكەش ئەمەی نەدەزانی، هەر بەردەوام بوو لەقسەكردن ئەوجارە گوتی: براكەم خوێندنی تەواو كرد ئامۆزاكەم ژنی مارەكرد، سەیری ئامێرەكەم كرد ژمارەی هەناسەكانی وەك پێشتر بوویەوە بە (٩) جار، كاتێك ئەوەم بینی دەستو چاویم جووڵاند، هیچ شتێكم لیٚ بەدی نەكرد، كە هۆشی هەبێ، ئەوجارە سەرم بردە بن گوێیو گوتم: (الله أكبر، حيَّ على الصَّلاة، حيَّ على الفلاح)، لەگەڵیدا سەیری ئامێرەكەم كرد بینیم (١٨) هەناسەی تۆمار كرد لەیەك خولەكدا، سوێند بەخوا ئێمە نەخۆشین نەك ئەو پیاوە، پیاوانێك هەن بەردەوامو لەهەموو حاڵێكدا دڵیان پەیوەستو وابەستەیە بە مزگەوت[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوە- ل ٣٣- ٣٤.

**٣٥٦. وەسفی بەرەو ڕوو**

پیاوێك بە عەبدولەلیکی کوڕی مەڕوانی گوت: دەمەوێ بەنهێنی قسەت لەگەڵ بکەم، عەبدولەلیك داوای مۆڵەتی لە دانیشتووان کرد، چوونە دەرەوە، کابرا ویستی قسە بکا، عەبدولەلیك پێی گوت: بوەستە وەسفم نەکەی من لەتۆ چاکتر خۆم دەناسم، درۆش نەکەی چاوم درۆزن نابینێ، لە پاشملەش باسی کەسم بۆ نەکەی، پیاوەکە چی بۆ نەمایەوە گوتی: قوربان مۆڵەتم دەدەی بڕۆم؟ ئەویش گوتی: ئەگەر دەتەوێ بڕۆ[1].

**٣٥٧. تۆش خەمی بانگەوازی کردنی دینی خوات بێ**

پیاوێك دەڵێ: لە وڵاتی ئەڵمانیا بووم ڕۆژێك لە دەرگاکەمیاندا چووم دەرگا بکەمەوە ئافرەتێکی گەنج لەودیو دەرگا بانگی کردم، پێم گوت: چیت دەوێ؟

گوتی: دەرگاکە بکەوە.

گوتم: من پیاوێکی مسوڵمانم کەسم لا نییە بۆیە لەدینی ئێمە دروست نییە بێیتە ژوورەوە بۆلام چونکە کەسی ترمان لەگەڵ نییە.

ئافرەتەکە گوتی: من لەکۆمەڵێکی ئاینیم دەرگاکەم لێبکەوە هەندێ بڵاوکراوەم پێیە لێمی وەرگرە.

گوتم: سوپاس من هیچم ناوێ، پشتم کردە دەرگاکەو بەرەو ژوورەکەم چووم، ئافرەتەکە کەزانی دەرگای لێناکەمەوە دەمی هێنایە لای کونی دەرگاکەو باسی ئایینەکەی خۆی کردو بۆ ماوەی (١٠) خولەك باسی ئایینەکەی خۆی بۆ کردم، کاتێ لە قسەکانی بوویەوە چوومە لای دەرگاکەو پێم گوت: بۆچی بەم شێوەیە خۆت ماندوو دەکەی؟

گوتی: ئەوە گرنگ نییە، من ئێستا زۆر هەست بە حەوانەوە دەکەم چونکە هەرچی لە توانامدایە بۆ ئایینەکەم کردم[2].

---

[1]) وتەی دانایانو زانایان- ل ١٠٩٢.

[2]) شەیدا- د. موحەممەد عورەیفی- ل ١٩٤.

### ٣٥٨. بالاّ پۆشی

دەڵێن فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام داپۆشراو بووە، کاتێك هەست دەکات مردنی نزیك بووە بیر لەوە دەکاتەوە کاتێ دەمرێ لەسەر دارە مەیتێك بە پەڕۆیەك دایدەپۆشن، سەیری ئەسمائی کچی عەمیسی کردو گوتی: ئەی ئەسما دەزانی من ئەوەم زۆر لەلا ناشیرینە کاتێ ئافرەتێك دەمرێ لەسەر دارە مەیت دایدەنێن ، بۆ ئەو کەسانەی سەیری دەکەن شێوەی جەستەی دیار دەبێت.

ئەسما گوتی: من لەحەبەشە شتێکم بینی.

فاتیمە گوتی: چیت بینی؟

ئەسما لقە دارخورمایەکی تەڕی هێناو چەماندیەوە وەك و کەوانەیەك یاخود گومەزێکی لێکرد ئنجا پەڕۆیەکی هێنا بەسەری دادا، گوتی: ئەمە باشتر نییە ئەی فاتیمە جەنازەکەی لەژێردا دادەنرێ.

کاتێك فاتیمە گیانی سپارد، بەم شێوەیەیان لێکرد.

فاتیمەی خۆشەویستو جگەرگۆشەی پێغەمبەری خوا بەمردووییش خەمی داپۆشینی جەستەو لاشەی بوو، دەبێ بەزیندوویی چۆن بووبێ، پاکیو بێگەردی بۆ خوا!![1].

### ٣٥٩. خزمەت کردنی مزگەوت

ئافرەتێکی ڕەش پێست هەبوو بەناوی (أم محجن)، بەردەوام خەریکی خاوێن کردنەوەی مزگەوتی پێغەمبەری خوابوو ﷺ، ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی گۆڕستانی کرد قەبرێکی تازەی کەوتە بەرچاو، پرسیاری کرد خاوەنی ئەم قەبرە کێیە؟

گوتیان: ئەوە قەبری دایکی مەحجەنە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەگریان کردو بەهاوەڵانی فەرموو بۆچی هەواڵتان پێ نەدام؟

---

[1]) الإستيعاب- إبن عبدالبر. د. موحەممەد عوردیفی لێی خواستۆتەوە.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو كاتەی وەفاتی كرد ئەو ڕۆژە دونیا زۆر گەرم بوو گوتمان با پشوو بداتو ئەو گەرمایە لێی نەدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مردووی لەسەر كرد، بەهاوەڵانی فەرموو: هەریەكێكتان لێ مرد هەواڵم پێ بدەن بۆ ئەوەی نوێژی مردووی لەسەر بكەم، چونكە ئەو نوێژ كردنەم لە ڕۆژی دواییدا بۆی دەبێتە شەفاعەت، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی دایكی مەحجەنی كرد لە قەبرەكەیدا پێی فەرموو: السلام علیك ئەی دایكی مەحجەن، چ كردەوەیەكت لە كردەوەكانت چاكترینیان بوو؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەترەیەك بێدەنگ بوو، پاشان بەهاوەڵانی فەرموو: دایكی مەحجەن دەڵێ: لەلای خوادا هیچ كردەوەیەكم لەوە باشتر نەدی كە مزگەوتم پاك دەكردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار ماڵێكی پێ بەخشیوە لەبەهەشتدا، ئێستا لە نێوی دانیشتووە(١).

### ٣٦٠. بەخشندەیی

عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر پیاوێك بوو هیچ كاتێك داوای شتێكی لێكرابێ ڕەتی نەكردۆتەوە، زۆر بەخشندە بوو، جاری وا بووە دەورو بەرەكەی زۆر گلەییان لێكردووە لەسەر ئەو هەموو بەخشینەی، ئەویش دەیگوت: خوای گەورە بەردەوام پێم دەبەخشێ منیش تا هەمبێ و خوا پێم ببەخشێ دەیبەخشم بەبەندەكانی خوا، لەوە دەترسم گەر من بیگرمەوە ئەویش لەگەڵمدا بیگرێتەوە.

لە لەیسی كوڕی سەعیدەوە دەگێڕنەوە كە عەبدوڵڵای كوڕ جەعفەر هەموو ڕۆژ هەزار دیناری دەست دەكەوت، لەگەڵ ئەوەشدا زەكاتی لەسەر واجب نەدەبوو، چونكە نەیدەهێشت بگاتە حەددی نیصاب، لە پێناوی خوادا هەمووی دەبەخشی، ئەو پیاوە بەیانیان قسەی نەدەكرد تاوەكو خێری نەدابا سێسەدو شەست كەس، ڕۆژێك ئافرەتێك داوای كەمێك هەنگوینی لێكرد، بەڵام ئەو هیزەیەكی پڕی هەنگوینی پێدا، پێیان گوت: خۆ ئەو ژنە بە

---

(١) وتەی دانایانو زانایان ل ١٥٤.

كەمێك ڕازی دەبوو، ئەویش لەوەڵامدا گوتی: ئەو بەپێی پێویستی خۆی داوای كرد ئێمەش بەپێی ئەو بڕە دامان پێی كە خوا پێی داوم[1].

### ٣٦١. یارمەتی دانی خەڵك

دەگێڕنەوە شێخ شەقیقی بەڵخی ڕۆژێك بۆ كاری بازرگانی كەسابەت دەرچوو، لەپێش ڕۆیشتنی خوا حافیزی كرد لە شێخ ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم، وا گومان دەكرا سەفەرەكەی شێخ شەقیق ماوەیەكی زۆری پێ بچێت، بەلأم چەند ڕۆژێكی نەخایاند كە شێخ شەقیق گەڕایەوە، شێخ ئیبراهیم لە مزگەوت چاوی پێكەوت بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: چی وای لێكردی زوو بگەڕێیتەوە؟

شێخ شەقیق گوتی: لەسەفەرەكەمدا شتێكی سەیرم بینیو وازم لەسەفەرەكەم هێنا، شێخ ئیبراهیم گوتی: خوا بەخێری بگێڕێ چیت بینی؟

شێخ شەقیق گوتی: لەڕێگادا بۆ پشوودان لامدایە شوێنێكی وێرانە، لەو شوێنەدا باڵدارێكی پەڕو باڵ شكاوم بینی نەیدەتوانی قاچەكانی هەڵدێرێو بڕوا، لەپەلو پۆ كەوتبوو، بەو دیمەنە زۆر سەرسام بووم، لەدڵی خۆمدا گوتم: ئایا ئەو باڵدارە چۆن دەژی لێرەدا، زۆری پێنەچوو باڵدارێكی تر لەولاوە هات خواردنی هەلگرتبوو هات دای بە باڵدارە لەپەلو پۆ كەوتووەكە، چەند جارێك وای كرد تاوەكو باڵدارەكە تێر بوو، لەبەر خۆمەوە گوتم: ئەو خوایەی كە ڕزقی ئەو باڵندەیە دەدات، هەر ئەو خوایە ڕزقی منیش دەدات، ئیتر دەست بەجێ گەڕامەوە، شێخ ئیبراهیم گوتی: ئەو كارەت سەیرە بەلامەوە چۆن گەڕایتەوە؟ ئەی شەقیق چۆن ڕازی دەبی كە وەك ئەو باڵندەیە پەك كەوتەیە بی لەسەر یارمەتیدان دەژیو ڕازی نابیت كە وەكو ئەو باڵدارەیە بیت كە خۆشی دەژیێنێو یارمەتی باڵندە نابیناو پەككەوتووەكانیش دەدات؟ ئایا ئەوە نازانی كە ئەو دەستەی دەبەخشێ بەرزترە لەوەی كە وەردەگرێ؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٠١.

شێخ شەقیق هەستاو دەستی شێخ ئیبراهیمی ماچ کردو گوتی: تۆ مامۆستای منی ئەی باوکی ئیسحاق، ئامۆژگارییەکەی شێخ ئیبراهیمی وەرگرت، گەڕایەوە بۆ کاری بازرگانییەکەی[1].

## ٣٦٢. ئادابی کڕین و فرۆشتن و ویژدان

یونسی کوڕی عەبد لە دوکانەکەیدا جۆرەها ملوانکەی تێدابوو، نرخەکانیان جۆراو جۆر بوو، هەیان بوو بایی (٢٠٠) درهەم بوو، هەیان بوو بایی (٤٠٠) درهەم بوو، ڕۆژێك یونسی خاوەن دوکان دەچێ بۆنوێژ برازاکەی لەسەر دوکان دادەنێ، عەرەبێکی دەشتەکیش لەو کاتەدا دێتە دوکانەکەو داوای ملوانکەیەکی (٤٠٠) درهەمی دەکات، برازاکەشی ملوانکەیەکی (٢٠٠) درهەمی پێشانداو لەگەڵی ڕێککەوت و پێی دا، یونس لەو کاتەی لەمزگەوت هاتە دەر ئەو کابرا دەشتەکیەی بینی ملوانکەیەکی لەدەستە، یەکسەر ناسییەوە زانی کە لەدوکانەکەی ئەو کڕیویەتی، بۆیە لێی پرسی بەچەند کڕیوتە؟

پیاوەکە گوتی: بە (٤٠٠) درهەم کڕیومە، یونس گوتی: ئەو ملوانکەیە هەر (٢٠٠) درهەم دەهێنێ بڕۆ پێی بدەوە با (٢٠٠) درهەمەکەی ترت پێ بداتەوە. کابرا گوتی: ئەو ملوانکەیە لای ئێمە بای (٥٠٠) درهەم دەبێ، یونس گوتی: بیگەڕێنەوە بۆ دوکانەکە، ئامۆژگاریەکەم وەربگرە، ئنجا کابرا گەڕاندیەوەو (٢٠٠) درهەمی پێدرایەوە، یونسیش بە برازاکەی گوت: تۆ شەرم ناکەی لەخوا ناترسی قازانجی دوو قات وەردەگری؟

برازاکەی گوتی: من بەڕەزامەندی خۆی پێم فرۆشتووە، یونس گوتی: ئایا خۆت ڕازی دەبی بەوەی کە ئەوت پێ ڕازی کردووە؟[2].

---

[1]) وتەی دانایان و زانایان- ل ١١٠٥.

[2]) هەمان سەرچاوە – ل ١١٨.

### ٣٦٣. زێدەڕۆیی نەکردن

پیاوێك پرسیاری لە دادوەر یەحیا کرد گوتی: ئەی دادوەر چەند بخۆم؟

گوتی: لەسەرووی برسێتی نەگاتە تێر بوون.

گوتی: چەند پێبکەنم؟

دادوەر گوتی: بای ئەوەندەی ڕوخسارت گەشبێتەوە، دەنگت بەرز نەبێتەوە.

گوتی: چەند بگریم؟

دادوەر گوتی: ئەوەندە بگری لە ترسی خوا دوورت نەخاتەوە.

گوتی: کردارەکانم چەند بشارمەوە؟

دادوەر گوتی: تا دەتوانی بیشارەوە.

گوتی: چەندەی ئاشکرا بکەم؟

گوتی: بای ئەوەندەی کە خەڵکی چاوت لێبکەن[1].

### ٣٦٤. دەستنوێژ شوشتن خاوێنیە

لە یەکێك لەوڵاتە ڕۆژئاواییەکان کاتی نوێـژ دەبـێ، مسوڵمانێکیش دەچـێ بـۆ حـەمامی بنکەیەك بۆ ئەوەی دەستنوێژ هەڵبگرێ، پیاوێکی بێ بڕوای خەڵکی ئـەو وڵاتـەش ئاگای لـەو مسـوڵمانە بـوو زۆر بـە چـاکی دیقـەتی دەدا، کاتێـك کـابرای مسـوڵمان گەیشـتە شـۆردنی قاچەکانی، بەرزی کردنەوە بۆ سەر مەغسەلەکە، پیاوە بێبڕواکەش هاواری لـێ بـەرز بوویـەوە گوتی: ئەوە چی دەکەی؟

مسـوڵمانەکە بـە لەسـەرخۆیی وەڵامـی دایـەوەو گـوتی: دەسـتنوێژ هەڵـدەگرم، پیـاوە بـێ بڕواکە گوتی: ئێوەی مسوڵمان بـە هـیچ شـێوەیەك پـاکو خـاوێنی ناپـارێزنو شـوێنی خـەڵکی پیس دەکەن، ئەو مەغسەلە بۆ شۆردنی دەستو دەمو چاوە نەك قاچ.

---

[1]) وتەی دانایانو زنایان — ل ١١٣١.

مسوڵمانەکە گوتی: پرسیارێکت لێبکەم بەڕاشکاوی وەڵامم دەدەیتەوە؟

گوتی: فەرموو.

مسوڵمانەکە گوتی: تۆ لە ڕۆژێکدا چەندجار دەم و چاوت دەشۆی؟

پیاوە بێبڕواکە گوتی: ڕۆژی یەکجار لەو کاتەی لەخەو هەڵدەستم، یان ئەگەر کارێك بکەم و ماندووبم دەم و چاوەکانم دەشۆم بۆ ئەوەی بحەسێمەوە.

مسوڵمانەکە گوتی: من لە ڕۆژێکدا پێنج جار پێیەکانم دەشۆم، لەو کاتەی تۆ لە ڕۆژێکدا یەکجار دەم و چاوت دەشۆی، ئێستا پێم بڵێ پێیەکانی من خاوێنترن یان دەم و چاوی تۆ![1].

### ٣٦٥. گەورەیی نوێژ کردن

ئەبو عوسمان دەڵێ: لەگەڵ سەلمانی فارسی لە ژێر سێبەری دارێك بووین، سەلمان دارێکی وشکی هێنا دای لەو درەختەی لە ژێری بووین تاکو گەڵای لێکەوتنە خوارێ، پاشان گوتی: ئەی ئەبو عوسمان بۆ لێم ناپرسی ئەو کارەم بۆچی کرد؟

ئەبو عوسمان گوتی: بۆچی واتکرد؟

سەلمان گوتی: جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوها لەبن درەختێك دانیشتبووین، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای کرد، پاشان فەرمووی: سەلمان بۆ لێم ناپرسی بۆچی وامکرد، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی واتکرد؟

ئەویش فەرمووی: مسوڵمان هەرکاتێ دەستنوێژێکی ڕێك و پێکی شوشت نوێژەکانی بەڕێك و پێکی ئەنجامدا خوای پەروەردگار وەك و گەڵاکانی ئەو دارە گوناهی لێ هەڵدەوەرێنێ، پاشان ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمەوە: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود[2].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ل ٣٩- ٤٠.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب٢ ل ٤٥.

### ٣٦٦. گەورەیی مزگەوت دروست کردن

عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو ڕەوواد دەڵێ: پیاوێك هەبوو لەو دەشتو کێوە مزگەوتێکی کردبوو، حەوت دانە بەردی دانابوو لەلای قیبلەکەی هەرکاتێ نوێژەکەی تەواو دەکرد ڕووی دەکردە بەردەکانو دەیگوت: ئەی بەردەکان بەشاهێد بن کەوا هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە خوا، قەدەری خوا ئەو پیاوە نەخۆش کەوت هەر بەو نەخۆشیەشەوە مرد، عەبدولعەزیز دەڵێ: لەخەونمدا بینیم فەرمان کرا بیبەن بۆ دۆزەخ، منیش یەکێ لە بەردەکانم بینی کە لەمزگەوتەکە دانابو ناسیمەوە، بەردەکە زۆر زەبەلاح بوو یەکێ لە دەرگاکانی دۆزەخی لەسەر داخست، پاشان چوو بۆ دەرگاکەی تر بەردێکی تر لەبەردەکان دەرگایەکی تری دۆزەخی لێداخست، بەم شێوەیە هەر حەوت دەرگای دۆزەخی لەسەر داخرا[1].

### ٣٦٧. گوناهی غەیبەت

ئەبو حەسەنی قورتوبی دەڵێ: مامێکم هەبوو لە ساڵی (٥٥٥)ك وەفاتی کردبوو، لە خەونمدا بینیم کە هاتە لام لە ماڵەکەمدا، منیش چووم پێشوازیم لێکرد لەبەر دەرگاکە، هاتە ژوورەوە منیش بەدوایدا هاتمە ژوورەوە، هاتە نێوەڕاستی خانووەکە پاڵی بەدیوارەکەدا، منیش بەرامبەری دانیشتم سەیری ڕوخساریم کرد بینیم ڕەنگی خراپ گۆڕاوە، گوتم: ئەی مامە چیت بەسەرهات کە گەڕایەوە لای خوا؟

گوتی: کوڕم چیم بەسەربێ لای خوایەك کە خاوەنی کەرەمو لوتفو بەزەییە، لەهەموو گوناهەکانم خۆشبوو تەنها غەیبەت نەبێ، لەوەتەی دونیام جێهێشتووە تا ئێستا ڕاگیراوم بەس لەسەر غەیبەت کردن، بۆیە ئامۆژگارییت دەکەم غەیبەت نەکەی، چونکە لێرە هیچ شتێك وەکو غەیبەت لەسەری ئازار نادرێ[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوە ب٢ ل ٥١.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٥٥.

### ٣٦٨. سزای نوێژ نەکەر

دەگێڕنـەوە ئافرەتێك لـە بـەنی ئیسـرائیل هاتـە لای پێغەمبـەر موسـا(علیە السلام) و گوتی: ئەی موسا من گوناهێکی زۆر گـەورەم کـردووەو تۆبـەم لێکـردووە، بۆیـە هاتوومـە لات بـۆ ئـەوەی تـۆش لـە خزمـەت خـوا داوای لێبـوردنم بـۆ لێبکـەی، پێغەمبـەر موسا فـەرمووی: گوناهو تاوانەکەت چییە؟

ئافرەتەکە گوتی: من زینام کردووەو منداڵەکەشم کوشتووە.

پێغەمبەر موسا فەرمووی: بڕۆ دەرەوە تا خوا لەبەر پیسی تـۆ سـزای نـەداوین‌و ئـاگری نەباراندووە بەسەرماندا، ژنەکە بەدڵ شکاوی چووە دەرەوە.

جوبریـل دابـەزی بـۆ لای موسـاو پێـی فـەرموو: ئـەی موسـا بۆچـی دڵـی ئـەو ئافرەتـەت شکاند، بەهۆی هاتنی ئەو ئافرەتە بۆلات تووشی هیچ شتێك بوویت؟

موسا فەرمووی: تاوان لەمە خراپتر هەیە؟

جوبریل فەرمووی: بەڵێ لەوەش خراپتر هەیە.

موسا فەرمووی: چ تاوانێکە لەمە گەورەترە؟

جوبریل فەرمووی: کەسێك بە ئەنقەسـت واز لەنوێـژ کـردن دێنێ تـاوانی لـەو ئافرەتـە گەورەترە[1].

### ٣٦٩. سزای نێربازی

پێغەمبەر عیسا (علیە السلام) جارێکیان لە گەشتێکیدا دەبـیێ چاوی بـە ئاگرێـك کـەوت بـەرەو لای چـوو بـینی پیاوێکـە وا دەسـووتێ، پێغەمبـەر عیسـا پـڕ دەداتـە ئـاو بـۆ ئـەوەی بیکوژێنێتـەوە، ئـاگرەدە دەبـێ بـە منـداڵێك‌و پیاوەکـەش دەبـێ بـە ئـاگر، پێغەمبـەر عیسـا سەرسام دەبێ بەو دیمەنـە، فـەرمووی خوایـە داوات لێدەکـەم ئەمانـە زینـدووو بکەیتـەوە بـۆ

---

[1] هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٦٠.

ئـەوەی پرسـیاریان لێبکـەم، خـوای گـەورە فـەرمانی کـرد هـەردووکیان زینـدوو بوونـەوە پیاوێكو منداڵێك بوون، پێغەمبەری عیسا فەرمووی: پێم بڵێن بۆچی واتان بەسەرهاتووە؟

پیاوەکە هاتـە قسـەو گـوتی: مـن لـەدونیادا گـیرۆدەی خۆشەویسـتی ئـەو منداڵـە بـووم، هێزی شەهوەت پاڵی پێوەنم کاری خراپم لەگەڵیدا کرد، لەو کاتەی من مـردمو ئـەویش مـرد ئەو دەبێتە ئاگرو دەمسوتێنێ، ئنجا من دەبم بە ئاگرو دەیسووتێنم هەتا ڕۆژی قیامەت[1].

### ٣٧٠. ڕازی بوون بە قەزاو قەدەر

ئەبو حاتەمی ڕازی دەڵێ: بـۆ مـاوەی (٣٠) ساڵ هاوڕێیـەتی فـوزەیلی کوڕی عیـازم کـرد نەمبینی پێبکەنێو دڵی خۆشبێ، تەنها ئەو ڕۆژە نـەبێ کوڕەکەی کـە نـاوی عـەلی بـوو مـرد، منیش گوتم لەو کاتەدا بۆچی پێدەکەنی؟

گوتی: خوای گەورە شتێکی ویستو پێی خـۆش بـوو کـە وەفـاتی کوڕەکـەم بـوو، منـیش دڵم خۆشەو پێدەکەنم بە شتێك کە ئەو پێی خۆشە[2].

هەر سەبارەت بە مەسەلەی ڕازی بوون بە قەزاو قەدەر جارێك جوبریل سـەلامی خـوای لـێبێ دێتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی دەفـەرمووێ: ئـەی موحەممـەد خـوای گـەورە سـەلامت لێدەکا و پێـت دەفـەرمووێ: بـە ئـەبو بـەکر بفـەرمووی ئایـا چـاك بوویتـەوە لـە ئازارەکەت؟

پێغەمبەری خوا ﷺ سەرسام بوو بەو پەیامـەی خـوای گـەورە، چـووە لای ئـەبو بـەکرو فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر ئەوە چ نەخۆشیەکت بوو من نەمزانیوە؟

ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی (٧) ساڵە ددانم دێشێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی چۆنە من نەمزانیوەو لای من باست نەکردووە؟

ئـەبو بـەکر گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ چـۆن شـکایەت لـە خۆشەویسـتەکەم دەکەم![1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٦٥.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب٢- ل ٦٨.

**٣٧١. وەسوەسە لە شەیتانەوەیە**

دەگێڕنەوە جارێك پیاوێك هاتە لای ئیبن عەقیلو پێی گوت: من هەر چەند جارەی یەکێك لە ئەندامەکانی لەشم دەشۆم دەڵێم نەمشووشتوە، بۆیە دووبارە دەیشۆمەوە، بەهەمان شێوە بۆنوێژ کردن دەڵێم: الله أکبر، پاشان بەخەیاڵم دادێ کە تەکبیری ئیحرامم نەکردووە، چیبکەم باشە؟

ئیبن عەقیل دەڵێ: واز لەنوێژ کردن بێنە چونکە تۆ نوێژت لەسەر نییە، خەڵکەکەی لەوێن دەڵێن: چۆن قسەی وا دەکەی ئەی ئیبن عەقیل؟

ئیبن عەقیل گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (رفع القلم عن المجنون حتی یفیق)، واتە: قەڵەمی تەکلیف هەڵگیراوە لەسەر شێت تاوەکو چاك دەبێتەوە، کەسێ تەکبیری ئیحرامی کردبێ‌و پاشان بڵێ نەمکردووە ئەوە بەڕاستی شێتە، شێتیش نوێژی لەسەر نییە[٢].

**٣٧٢. گەورەیی دەست نوێژ هەبوون بەبەردەوامی**

لەسەردەمی پێغەمبەر عیسا ئافرەتێکی دیندار هەبوو، ڕۆژێکیان دەیویست نان بکات، هەویرەکەی ئامادەکردو بەتەندورەکەی وەنا، پاشان دەستی کرد بەنوێژ کردن بۆ ئەوەی تا نوێژەکەی دەکا نانەکە ببرژێ، شەیتان هاتە لای لەسەر شێوەی ئافرەتێك پێی گوت خێراکە نانەکەت سووتا، ئەویش هیچ ئاوڕێکی لێ نەدایەوە لەخەیاڵی خۆی گوتی تا نوێژەکەم تەواو نەکەم ناچم بەلایەوە.

ئەوجارە شەیتان منداڵێکی ئافرەتەکەی گرتو خستیە نێو تەندوورەوە، ئافرەتەکە هەر گوێی پێنەدا، لەناکاو پیاوەکەی هاتەوە ماڵەوە بینی وا منداڵەکەی لەنێو تەندورەکە یاری بە پشکۆی ئاگر دەکات، پیاوەکە ئەو بەسەرهاتەی بۆ پێغەمبەری عیسا گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: بڕۆ بانگی خێزانەکەت بکە، ئافرەتەکە هاتە لای پێغەمبەر عیسا،

---

[١]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٧٤.

[٢]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٨١.

ئەویش بە ئافرەتەکەی فەرموو: تۆ چ کردەوەیەکی چاکت دەکەیت خوای تەعالا ئاوای بۆ کردووی؟

ئافرەتەکە گوتی: ئەی عیسا من هەرکاتێك بێ دەستنوێژ بم یەکسەر دەچم دەستنوێژ هەڵدەگرم، هەرکاتێکیش دەستنوێژ هەلگرم دوو ڕکعات نوێـژیش دەکەم، هەر مسوڵمانێك کاری پێم بێ، کارەکەی تاوانو گوناح نەبێ من بۆی جێبەجێ دەکەم، هەروەها سەبرو ئارامیش دەگرم لەسەر ئەشکەنجەو ئازاری خەڵك[1].

**سەردانی کردنی گۆڕستان.**

عوسمانی کوڕی سوددی دایکێکی زۆر خواپەرستی هەبوو پێیان دەگوت: ڕاهیبە، کاتێ مردنی نزیك بوویەوە سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمانو گوتی: ئەی ئەو خوایەی لەهەموو ساتەکانی ژیانمدا جێگای پشت پێبەستنی من بووی، ئەی خوایە لەکاتی مردندا خەجاڵەتم نەکەیتو بەتەنیا جێم نەهێڵی، عوسمان دەڵێ: کاتێ دایکم مرد هەموو ڕۆژانی هەینی دەچوومە سەر گۆڕەکەی دوعام بۆ ئەوو هەموو مردووەکانی تری گۆڕستان دەکرد، شەوێکیان خەوم بە دایکم بینی، پێی گوتم: ڕۆڵەکەم بەڕاستی مردن ئازارێکی زۆری هەیە، بەلاَم سوپاس بۆخوا من ئێستا لەژیانێکی خۆش دام، منیش گوتم: دایکە هیچ پێویستییەکت بە من نییە؟

گوتی: ڕۆڵە بەردەوام بە لەسەر سەردانی کردنم لە گۆڕستان، چونکە هەموو جارێ موژدەم دەدەنێ کە تۆ دێی ڕۆژانی جومعە، مردووەکانی دەورو بەرم هەموو دڵیان خۆش دەبێ، کە تۆ دێیو دوعایان بۆ دەکەی[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٨٨- ٨٩.

[2]) قصص الصالحين- مصطفى مراد- ص ٢٤٦.

### ٣٧٤. ڕۆژی عەرەفەی پیرۆز

ئیبن جارود دەڵێ: منو هاوڕێیەکەم دەچووین بۆ بە دەست هێنانی زانستو زانیاری کاتەکە ئێوارەی عەرەفە بوو، بە شوێنێکدا تێپەڕین شوێنەواری شارەکەی قەومی لووت بوو، منیش بە هاوڕێکەم گوت: با لێرەدا دوعا بکەینو سوپاسی خوا بکەین لەوەی کە ئێمەی پاراستووە لەو بەلایە، دەگەڕاین بەنێو شارەکەدا لەناکاو پیاوێکمان بینی دەمو چاوی تۆزاوی بوو، کەسێکی کەم موو بو، پێمان گوت: تۆ کێی؟

ئەویش وەك ئەوەی گوێی لە قسەکەمان نەبووبێ خۆی لێ گێل کردین، ئێمەش گوتمان لەوانەیە شەیتان بیت؟

گوتی: بەڵێ، من شەیتانم.

ئێمەش پێمان گوت: لە کوێ هاتووی دەمو چاوت بەو شێوەیە تۆزاوی بووە.

گوتی: لە کێوی عەرەفەوە هاتووم، قەومێکم بینی پەنجا ساڵە خەریکی گوناح کردنن کەچی ئەو ئێوارەیە لە کێوی عەرەفە خوای گەورە هەموویانی عەفو کرد، منیش لە غەمی ئەوە خۆڵو تۆزم بەسەری خۆم داکرد، بۆ ئەوەی کەمێك ئەو خەمەم کەم بێتەوە هاتم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی گوێبیستی دەنگی ئازارو ئەشکەنجەی مردووە لەناوچووەکانی ئێرە بەو کەمێك دڵم خۆش بێ[1].

### ٣٧٥. لە دەرگای خەڵك بدەی لە دەرگات دەدرێتەوە

دەگێڕنەوە ئافرەتێکی داوێن پاكو دیندار هەبوو، پیاوەکەی زێڕینگر دەبێ، پیاوێکی خزمەتکار هەبوو هەموو ڕۆژێك ئاوی بۆ ئەو ئافرەتە دەهێنا، ئەو پیاوە ماوەی سی ساڵ بوو ئەو کارەی بۆ ئەو ئافرەتە دەکرد، ڕۆژێك لە ڕۆژان بە چاوێکی خراپ سەیری ئەو ئافرەتەی نەکرد، کەچی ڕۆژێکیان هاتو دەستی ئەو ئافرەتە دیندارەی توند گوشی، کاتێك پیاوەکەی گەڕایەوە ماڵ خێزانەکەی لێی پرسی پیاوەکە ئەوڕۆ تووشی هیچ گوناهێك نەبووی؟

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ب٢- ل ١٠٤.

گوتی: ئافرەت ئیمڕۆ ئافرەتێك هاتە دوکانەکەم هەندێ بازنی لێ کڕیم، کە سەیری دەستەکانیم کرد زۆر نەرمو جوان بوو سەرنجی ڕاکێشام، منیش دەستم گەیاندە دەستە کانیو دەستم کوشی، خێزانەکەی گوتی: بەڕاستی پیاوەکە تۆڵەی گوناهەکەت وەرگرت، بۆ بەیانی پیاوە ئاودەرەکە هاتەوە لای ئافرەتەکەو داوای لێبوردنی لێکرد، ئافرەتەکە گوتی: ئەوە خراپەو تاوانی مێردەکەمە ئەو دەرگایەی لەسەرم کردەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: {عفوا عن نساء الناس تعف نساؤكم}واتە: داوێن پاکی بنوێنن بەرامبەر ئافرەتانی خەڵك، خەڵکیش داوێن پاك دەبێ لە ئاست ئافرەتانی ئێوە[1].

### ٣٧٦. هەڵوێستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بەرامبەر مردنی کوڕەکەی

دەگێڕنەوە عەبدوڵڵای کوڕی عومەڕ خوا لێیان ڕازی بێ لەتەمەنی پیریدا منداڵێکی هەبوو زۆری خۆشدەویست منداڵەکەی نەخۆش کەوت، عەبدوڵڵا زۆر بۆی پەرۆش بوو، زۆر نارەحەت بوو، خەڵکی دەیانگوت: ئەو منداڵە بمرێ ئەو پیاوە پیرە پەکی دەکەوێ وە لەوانەیە تووشی خەفەتێکی زۆرو بێو کاری تێبکات، ماوەیەکی پێچوو منداڵەکە مرد، بەلام بەپێچەوانەوە عەبدوڵڵا لەگەڵ خەڵکەکە بەرەو گۆڕستان بەڕێکەوتو زۆر لای ئاسایی بوو، بگرە دڵیشی زۆر خۆش بوو، لێیان پرسی: بۆچی لەکاتی نەخۆشیدا ئەوها پەرۆش بووی، ئێستا کە مردووە دڵت خۆشە بەو بەلایە؟

گوتی: ئەو کاتەی کە نەخۆش بوو سکم پێی دەسووتا بەزەییم پێیدا دەهاتەوە، کاتێکیش فەرمانی خوا هاتو وەفاتی کرد ئەوە ڕازیین بە فەرمانی خوا[2]

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ب٢ ل ١١٠- ١١١.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ل ١١٥.

## ٢٧٧. ئەگەر نەخۆش نەکەوتی بترسێ لە ئیمانەکەت

هیلالی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: لە خزمەت عەمماری کوڕی یاسر بووین، باسی نەخۆشیو بەڵاو موصیبەت کرا، پیاوێکی دەشتەکی گوتی: من تا ئێستا نەخۆش نەکەوتووم؟

عەممار گوتی: تۆ لە ئێمە نی، چونکە مسوڵمان کاتێ تووشی نەخۆشیو نارەحەتی دەبێ گوناهەکانی هەڵدەوەرێن وەك چۆن گەڵای دار هەڵدەوەرێ، بەڵام پیاوی دڵ ڕەق کاتێ تووشی بەڵاو ناخۆشی دێت وەکو وشتر وایە ئەگەر بەرەڵڵا کرا نازانێ بۆچی بەرەڵڵا کراوە، ئەگەر بەسترایەوە نازانێ بۆچی بەستراوەتەوە[1].

## ٢٧٨. سوپاسگوزاری کاتەکانی لەش ساغی

پیاوچاکێك سەردانی یەکێ لە قوتابییەکانی دەکات بەبۆنەی نەخۆشیەوە، قوتابییەکە دەڵێ: مامۆستا حاڵم زۆر خراپە، ئەوە (١٢٠) ڕۆژە من لەجێگەدا کەوتووم، پیاوچاکەکە گوتی: باشە بەم شێوەیە ڕۆژەکانی ناخۆشیت ژماردووە، بەهەمان شێوەش کاتەکانی لەش ساغیت ژماردووە چەندە؟[2].

## ٢٧٩. چاکەکردن لەگەڵ منداڵی بێباوك

حەممادی کوڕی ئەبو حەنیفە دەڵێ: ڕۆژێك خزمەتکارێکی داوودی تائی بە داوودی تائی گوت: دەمەوێ خواردنێکی چەورت بۆ ئامادە بکەم، داوود گوتی: زۆر باشە منیش پێم خۆشە، خزمەتکارەکە خواردنەکەی ئامادەکردو بۆی برد، داوود گوتی: ئەرێ منداڵە یەتیمەکانی فلاّن کەس چییان بەسەرهات ئێستا چۆنن؟

خزمەتکارەکەی گوتی: وەك خۆیانن.

داوود گوتی: بڕۆ ئەو خواردنە بدە بەوان با ئەوان تێر بن نەك من.

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب٢- ل ١٤٢.

[2]) سۆمای دیدە- ب٢- ل ٣٧١.

خزمەتکارەکە گوتی: تۆ چەند ڕۆژە هیچت نەخواردووە چۆن شتی وا دەبێ؟

داوود گوتی: ئەگەر ئەو خواردنە بدەی بەوان‌و بیخۆن دەچێتە ژێر عەرشی خوا، بەڵام ئەگەر بیدەی بە من تەنها دەچێتە نێو زگ‌و وەرگم[1].

**٣٨٠. وازهێنان لە ڕق‌و کینە لە مسوڵمانان**

زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: چەند پیاوێك چوونە لای ئەبو دوجانە لەو کاتەی کە نەخۆش بوو، بینیان روخساری زۆر جوان‌و نوورانی بوو، ڕوخساری لەدوورەوە دەدرەوشایەوە، گوتیان ئەبو دوجانە ڕوخسارت دەدرەوشێتەوە ئەمە هۆکاری چییە؟

گوتی: هەر کردارێکم ئەنجام دابێ ئەوەندە متمانەم نەبوو وەك ئەوەی متمانەم بەدوو شت بووە:

یەکەمیان: هەرگیز قسەم نەکردووە دەربارەی شتێك پەیوەندی بەمنەوە نەبێ.

دووەمیان: بەردەوام دڵم بەرامبەر مسوڵمانان بێگەرد بووە، ڕق‌و کینەم بەرامبەر کەس هەڵنەگرتووە[2].

**٣٨١. شیفا تەنها لای خوایە**

دەگێڕنەوە پێغەمبەر موسا جارێکیان ددانی زۆر دێشێ، شەکوای بۆ لای خوا بەرز دەکاتەوە، خوای گەورە پێی دەفەرمووێ: بڕۆ فلان شوێن جۆرە گیایەکی لێیە بیهێنە بیخەرە سەر ددانت، ئەویش وای کرد دەست بەجێ ئێشەکەی نەما، پاشی ماوەیەك دیسان ددانی دەستی بەژان کرد چووەوە هەمان شوێن هەمان گیای هێناو لەسەر ددانەکەی دانا، بەڵام ئەمجارەیان چاك نەبوویەوە، بەڵکو ئازارەکەی زۆر زیاتر بوو، بۆیە فەرمووی: خوای پەروەردگار تۆ پێت فەرمووم: ئەو گیایە بەکار بێنە؟

خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسا منم شیفا دەدەم، منم سوودو قازانج دەگەیەنم، منم ژیان دەبەخشم، جاری یەکەم تۆ داوات لەمن کرد، منیش ئازارەکەم لەسەر لابردی،

[1] بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن- ب٢- ل ١٨٣- ١٨٤.

[2] هەمان سەرچاوە ل ١٩٤- ١٩٥.

بەلاّم جاری دووەم هاتات بۆ من نەهێنا یەکسەر چووی گیایەکەت بەکارهێنا بێ ئەوەی داوام لێبکەی[1].

## ٣٨٢. خشوع لەنوێژدا

پرسیاریان کرد لە خەلەفی کوری ئەییوب ئایا ئەو مێش و مێشوولانە لەنوێژدا ئازارت نادەن واباشتر نییە دەریان بکەی؟

گوتی: چۆن خۆم بەشتێك سەرقاڵ بکەم کە نوێژم تێك بدات؟

گوتیان: چۆن ئارام دەگریت؟

گوتی: پێم گەیشتووە کە بێ دینەکان ئارام دەگرن لەژێر قامچی و لێدانی دەستەلاّتداران بۆ ئەوەی پێیان بگوترێ فلاّن کەس زۆر خۆڕاگرە، فەخرو شانازی بەو خۆڕاگرییەیان دەکەن، منیش لەبەردەم خوادا ڕادەوەستم ئامادە نەبم لەبەر مێش و مێشوولەیەك خۆم ڕابگرم و خۆم بجوولێنم، شانازی بەوە نەکەم کە لەبەردەم خوادا ڕادەوەستم بێ جووڵە[2].

## ٣٨٣. کەسی داوێن پاك ترسی خوای لەدڵدایە

وەهبی کوری مونەبیە دەڵێ: بەنی ئیسرائیل پرسیاریان لە یەکێ لە پێغەمبەرانیان کرد خوای گەورە لەکوێیەو لەچ ماڵێکە، ئایا ماڵێکی بۆ دروست بکەین و لەو ماڵەدا بیپەرستین؟

خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: پرسیاریان لێکردی سەبارەت بەمن کە لەکوێم و ماڵم لەکوێیە بۆ ئەوەی بمپەرستن، پێیان بڵێ: ئایا چ ماڵێك بەشی من دەکات، تەنانەت ئاسمانەکان و زەوی بەو هەموو فراوانییەیان بەشی من ناکات، هەرکاتێ لێیان پرسی من لەکوێمە، ئەوە پێیان بڵێ: من لەدڵی کەسانی ئیماندارو داوێن پاك و خۆپارێزم[3].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ب٢ ل ٢١٤.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٢١٦.

[3]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٢٣٠.

### ٣٨٤. یادی خوای بالادەست

ئەبولعەبباسی کوڕی مەسروق دەڵێ: ماوەیەك لەیەمەن بووم، ڕاوچیەکی ماسیم بینی لەکەنار دەریا دانیشتبوو ماسی دەگرت، کچێکی بچکۆلانی لەتەنیشت خۆیەوە دانابوو تەمەنی لەنێوان پێنج بۆ حەوت ساڵان دەبوو، هەرکاتێ ماسی دەگرت دەیخستە نێو زەنبیلەیەکەوە کچەکە یەکسەر فڕێی دەدایە نێو ئاوەکەوە، پیاوەکە ئاوڕی دایەوە هیچ ماسی لەنێو زەنبیلەکە نەبینی بە کچەکەی گوت: چیت لە ماسیەکان کرد، کچەکە گوتی: باوکە ئەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوات ﷺ نەبیستووە کە دەفەرموێ (هیچ ماسییەك بەتۆڕی ڕاوچی ماسی وەنابێ مەگەر لەو کاتەدا لە یادی خوا بێئاگابووە) منیش نەمویست شتێك بخۆین لەزیکری خوا بێئاگا بێ، کاتێ پیاوەکە ئەمەی لە کچەکەی بیست دەستی کردە گریانو تۆڕەکەی فڕێدایە نێو ئاوەکە[1].

### ٣٨٥. کەسانێك هەن خوا یادیان دەکا

پیاوێك لە مەجلیسێکدا دانیشتبوو گوتی: من دەزانم کەی خوای گەورە یادم دەکات؟

مەجلیسەکە گوتیان: چۆن دەبێ قسەی وا بگوتری؟ تۆ چی دەڵێی؟

پیاوەکە گوتی: بۆ نا ئەی خوای بەرزو بڵند نافەرمووێ: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ ...﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئێوە یادم بکەن منیش یادتان دەکەم، هەموویان دامرکانەوەو سەرسوڕمانەکەیان نەما[2].

### ٣٨٦. کاروانی پیاوچاکان

سوفیانی ثەوری دەڵێ: ڕۆژێکیان لەکۆڕێکدا ئامۆژگارییم پێشکەش دەکرد، سەعیدی کوڕی سائیب لەوێ بوو، بەردەوام دەگریا تا قسەکانم تەواو کرد، دوایی لێم پرسی ئەی سەعید بۆچی ئەوەندە دەگری خۆ من قسەکانم تەنها باسی پیاوچاکان بوو، بەسەرهاتی ئەوانم دەگێڕایەوە؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٢٣٩.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن ب٢- لا ٢٦٥.

گوتی: ئەی سوفیان چۆن نەگریم، تۆ باسی پلەو پایەی پیاوچاکان دەکەی کەچی من کاتێ سەیری خۆم دەکەم لەوان نیمو دابڕاوم لێیان، سوفیان گوتی: بەڕاستی قسەکانت لەجێی خۆیەتی[1].

### ٢٨٧.گەورەیی سەلام کردن و ناردن

ڕۆژێك دوو پیاو لە شامەوە هاتن بۆ مەدینە، پرسیاریان دەربارەی سەلمانی فارسی کرد، کاتێ پێی گەیشتن گوتیان: لەلای براکەتەوە هاتووین لە شام.

ئەویش گوتی: ئەی کوا ئەو دیارییەی کە بە ئێوەی ناردووە بۆ من؟

گوتیان: هیچ دیارییەکی بە ئێمە نەناردووە بۆ تۆ.

سەلمان گوتی: لە خوا بترسن ئەمانەت بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی.

گوتیان: هیچی نەناردووە بە ئێمە تەنها ئەوە نەبێ گوتویەتی: ئەگەر چوونە لای سەلامی منی پێ ڕابگەیەنن.

سەلمان گوتی: ئەوە دیارییەکەیە چ دیارییەك لەوە گەورەترە سڵاوێکی پاك و پیرۆز لەلایەن خوای گەورە[2].

### ٢٨٨.ترسان لە خوای بەرزو بڵند

یەزیدی ڕوقاشی دەڵێ: چوومە لای خواپەرستێك لەشاری بەصرە، بینیم خانەوادەکەی لەدەوری کۆبوونەتەوە وا لەحاڵەتی سەرەمەرگە، باوك و دایکێکی پیری هەبوو بۆی دەگریان، ئەویش بەباوکی گوت: ئەی باوکە بۆچی دەگری؟

باوکی گوتی: ڕۆڵە بۆ لەدەستدانی تۆ دەگریم.

ئەوجارە ڕووی لەدایکی کردو پێی گوت: دایکە بۆچی دەگری؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل٢٧٤.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٢٨٠.

دایکەکە گوتی: کورم بۆ لەدەستدانی تۆ دەگریم.

ئنجا سەیری منداڵەکانی کردو گوتی: ئەی ئێوە کە پاش کەمێکی تر هەتیو دەبن بۆچی دەگرین؟

گوتیان: باوکە ئێمەش بۆ دابڕان لەتۆو هەتیو بوونمان دەگرین.

گوتی: هەڵمسێننەوە با دابنیشم، کاتێ دانیشت گوتی: ئاگاداربن دەزانن ئێوە هەمووتان بۆ لەدەستدانی دونیام دەگرین، کێتان تێدایە بۆ قیامەتم بگری؟

کێتان بۆ نێو گۆڕم دەگری، ئێوە بۆ ئەوە دەگرین کە تەنیا دەمێننەوە، بۆمن ناگرین کە تەنها دەمێنمەوە لە گۆڕەکەمدا، بۆ ئەوە ناگرین فریشتەکان لە گۆڕەکەمدا پرسیارم لێدەکەن، بۆ ئەوە ناگرین خوای گەورە لەبەردەم خۆیدا ڕام دەگرێ[1].

## ٣٨٩. کڕین و فرۆشتنی کەسی لە خواترس

دەگێڕنەوە یەکێ لە پیاو چاکە بازرگانەکان هەندێ هەنگوینی بە (٣٠٠٠٠) درهەم کڕی، بۆ بەیانی نرخەکەی بوو بە دوو قات، فرۆشیار زۆر دڵتەنگ بوو بەمە، هەندێ لە هاوڕێکانی گوتیان: بچۆ لێی وەرگرەوە یا ئەو قازانجەت لەدەست نەچێ، ئەویش گوتی: ئەگەر پێم بداتەوە دەمەوێتەوە.

گوتیان بەیانی بڕۆ بۆ نوێژی جەماعەت، کاتێ لە نوێژەکەی بوویەوە بچۆ پێی بڵێ: من لە فرۆشتنی هەنگوینەکەی دوێنیم پەشیمان بوومەتەوە، هەر ئەوەندەی پێ بڵێ، هیچی دیکەی پێ مەڵێ، بەیانی فرۆشیارەکە چوو بۆ مزگەوت کڕیارەکەی بینی پاشی نوێژ پێی گوت: من لە مامەڵەکەی دوێنێ پەشیمان بوومەتەوە، پیاوە بازرگانە لەخواترسەکە بە خزمەتکارەکەی گوت: بڕۆ هەنگوینەکەی بۆ بهێنەوە، هەندێ کەسی دەورە بەریان بە بازرگانەکەیان گوت: چۆن کاری وا دەکەی ئێستا هەنگوێن نرخەکەی بووە بەدووقات، ئەویش گوتی: بەڵێ ئاگادارم، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەسێ فرۆشراوەکە بگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیار کە پەشیمان بۆتەوە لەو مامەڵەیە، خوای گەورە

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٢٨٠- ٢٨١.

ناخۆشیو نەهامەتی ڕۆژی دوایی لەسەر لادەبا)، ئایا لابردنی ئەو نەهامەتیو ناخۆشییەی ڕۆژی دوایی نەكڕم بە (٣٠٠٠٠) درهەم؟ پارەكەی وەرگرتەوەو هەنگوینەكەی پێ دایەوە[1].

### ٣٩٠. گریان لەكاتی قوڕئان خوێندن

صالحی مرڕی یەكێكە لە پیاوچاكان دەڵێ: شەوێكیان قوڕئانم دەخوێند، ئەو شەوە كە خەوتم پێغەمبەری خوام ﷺ لەخەونمدا بینی، پێی فەرمووم: ئەی صالح ئەمە قوڕئان خوێندنەكەتە ئەی كوا گریانەكەت؟

### ٣٩١. ئێمە بەندەینو ئازاد نین

دەگێڕنەوە بیشری حاڤ بەر لەوەی ببێتە ئەو پیاوە خواپەرستەی كە پێی ناسراوە، هەر سەرقاڵی ڕابواردنو ئەنجامدانی تاوان بوو، شەوێكیان هەندێ لەهاوڕێو دۆستەكانی لەماڵەكەی بوون شەڕابیان دەخواردەوەو خەریكی كەیفو بەزمی خۆیان بوون، یەكێ لە پیاو چاكان بەلای ماڵەكەیدا تێپەڕی گوێی لەدەنگە دەنگو ڕابواردنیان بوو، یەكسەر لەدەرگای ماڵەكەیانی دا، ئافرەتێكی خزمەتكاری دەرگاكەی كردەوە، پیاوچاكەكە گوتی: خاوەنی ئەو ماڵە بەندەیە یان ئازادە؟

ئافرەتەكە گوتی: ئازادە.

پیاوچاكەكە گوتی: ڕاست دەكەی ئەگەر بەندە بوایە بەندایەتی بۆخوا دەردەخست، وازی لەو گۆرانیو كەیفو ڕابواردنە دەهێنا، بیشری حاڤ ئاگای لەوە هەبوو كەسێ لەدەرگای داوە، كە ئافرەتەكە هاتە ژوورەوە بیشر پێی گوت: ئەمە كێ بوو لەدەرگای داو چی دەویست؟ ئافرەتە خزمەتكارەكە قسەكانی ئەو پیاوچاكەی بۆ بیشر گێڕایەوە، بیشر بەپەلە چوو بۆ بەردەگا بینی پیاوەكە لەوێ نەماوە، بیشر دوای كەوت تاكو ئەو پیاو چاكەی دۆزیەوە، پێی گوت: تۆبووی قسەت لەگەڵ ئەو ئافرەتەی ماڵەكەم كرد؟

پیاو چاكەكە گوتی: بەڵێ من بووم.

بیشر گوتی: دەمەوێ ئەو قسانەی لای ئەو كردت بۆم دووبارە كەیتەوە.

---

[1]) إرشاد العباد إلى سبيل الرشاد- ص٢٨٠.

پیاوچاکەکەش قسەکانی بۆ دووبارە کردەوە، بیشر ڕوومەتی خستە سەر زەوی گوتی: بەڵێ بەندەم بەندە، پاشان بەبێ پێڵاو بەزەویدا ڕۆیشت تا پێیان گوت (حافی) پێخواس، پێیان دەگوت: بۆچی نەعلێك لەپێت ناكەی؟

دەیگوت: لەوكاتەی گەورەم پاكی كردمەوە پێیەكانم پێخواس بوو، بۆیە دەمەوێ تاكو مردن لەو حاڵەتە لانەدەم، هەمیشە شوێنەواری ئەو گۆڕانكاریەم پێوە دیاربێ[1].

### ٣٩٢. ترسان لە درۆ

ڕۆژێكیان تاووسی یەمانی چووە لای خەلیفە هیشامی كوڕی عەبدولمەلیك پێی گوت: ئەی هیشام حاڵت چۆنە؟

خەلیفە تووڕە بوو لەو قسەیەی تاووس گوتی: بۆ بە خەلیفە ناوم نابەی؟

تاووس گوتی: چونكە هەموو مسوڵمانان یەكدەنگ نین لەسەر خەلیفایەتی تۆ، منیش ترسام لەوەی پێت بڵێم خەلیفە تووشی درۆ بم[2].

### ٣٩٣. گەنج و خوا پەرستی

ئەبو عەییاش دەڵێ: ئافرەتێكی خوا پەرست هەبوو لە شاری بەصرە ناوی مونیبە بوو، كچێكی هەبوو لەخۆی زیاتر خواپەرست بوو، كچەكە تەمەنی زۆر بچووك بوو، حەسەنی بەصری هەركاتێ گوێبیستی عیبادەتەكانی ئەو كچە بچووكە دەبوو زۆر پێی سەرسام بوو، ڕۆژێك پیاوێك هات بۆ لای شێخ حەسەنی بەصری پێی گوت: ئایا نەتزانیوە ئەو ئافرەتە لە حاڵەتی سەرەمەرگ دایە؟

دەست بەجێ شێخ حەسەن چووە لای، ئەو ئافرەتەش كە شێخ حەسەنی بینی دەستی كرد بە گریان، شێخ لێی پرسی بۆچی دەگری؟

گوتی: ئەی شێخ خۆڵ دەخەنە سەر لاشەم، لەكاتێكدا من لەتەمەنێكم هێشتا لەخوا پەرستی تێر نەبوومە[1].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب٢- ل ٢٨٥-٢٨٦.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ب٢ ل- ٢٨٨.

### ٣٩٤. لێپرسینەوەی ماڵ لە ڕۆژی دوایی

قوشەیری لەیەكێك لەهاوەڵانی دەگێڕێتەوە دەڵێ: شەوێكیان لەخەومدا بینیم قیامەت هەڵساوە دەیانگوت: مالیكی كوڕی دینارو موحەممەدی كوڕی واسیع ببەن بۆ بەهەشت، منیش سەیرم كرد گوتم بزانم كامیان پێش كامیان دەچێتە بەهەشت، بینیم سەرەتا موحەممەدی كوڕی واسیع پێش مالیكی كوڕی دینار چوو بۆ بەهەشت، پرسیارم كرد بۆچی موحەممەد پێش مالیك كەوت؟ گوتیان لەبەر ئەوەی موحەممەدی كوڕی واسیع یەك كراسی هەبوو بەڵام مالیكی كوڕی دینار دوو كراسی هەبوو[٢].

### ٣٩٥. گرینگی كات

لەسەردەمی پێشەوا حەسەنی بەصری پیاوێك هەبوو زۆر دەچوو بۆ مزگەوت خۆی لەخەڵكیش بەدوور دەگرت، ڕۆژێك ئەو هەواڵەیان بە شێخ حەسەن ڕاگەیاند ئەویش گوتی: ئەگەر ئەوجارە هاتە مزگەوت هەواڵم پێ بدەن دەچمە لای.

كابرا دێتە مزگەوتو بە حەسەنی بەصری پێشان دەدەن، ئەویش دەچێتە لای پێی دەڵێ: ئەی بەندەی خوا دەبینم دوورە پەرێزی دەكەی لەخەڵك، چ شتێك وای لێكردووی نەچیتە نێو خەڵك، چ شتێك وات لێدەكات نەچیتە مەجلیسی ئەو پیاوەی كە پێی دەڵێن حەسەنی بەصری.

پیاوەكە گوتی: چەند ئیشو كارێك سەرقاڵی كردووم.

شێخ گوتی: بەچی سەرقاڵی؟

پیاوەكە گوتی: من هەر كاتێ بەیانیو ئێوارە دەكەمەوە لەنێوان نیعمەتێكو تاوانێكم خۆم بە سوپاسگوزاری لەسەر ئەو نیعمەتەو تەوبەكرن لەسەر تاوانەكانم سەرقاڵ دەكەم بەهەمیشەیی بۆیە كاتم نییە.

---

[١]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ب٢- ل ٢٩١- ٢٩٢.

[٢]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٢٩٦.

حەسەنی بەصری گوتی: ئەی بەندەی خوا تۆ لە شێخ حەسەنیش شەرعزانتری پێویستت بە مەجلیسی ئەو نییە، کەواتە: بەردەوام بە لەسەر ئەمە[1].

### ٣٩٦.دوعاکردن بۆ ئیمانداران

ئیبن‌و ضحاك دەڵێ: لەخەودا شورەیحی کوڕی یونسم بینی پێم گوت: خوای گەورە چی بەسەرهێنای ئەی ئەبو حارث، گوتی: لێم خۆشبوو، کۆشکێکی پێدام لەتەنیشت کۆشکی موحەممەدی کوڕی بەشیری کوڕی عەتای کیندی، گوتم: ئەی ئەبو حارس تۆ لای ئێمە لە موحەممەدی کوڕی بەشیر گەورەتری، ئەویش گوتی: ئەو قسەیە مەکە، ئەو پلەو پایەی تایبەتی بۆ دانراوە لای خوا، بەهۆی ئەوەی لەدوعاکانیدا بەردەوام دەیگوت: خوایە لە مسوڵمانان‌و ئیماندارانی پیاوو ئافرەت خۆشبە، بەو هۆیەوە ئەو پلەو پایەی وەرگرت[2].

### ٣٩٧.بەندایەتی‌و خواپەرستی ئافرەتێك

موحەممەدی کوڕی قودامە دەڵێ: هەواڵیان پێدام ئافرەتێك هەیە هەموو خۆشییەکانی دنیای وەلاناوە ڕووی کردووەتە خواپەرستی، لەڕۆژدا بەڕۆژووە لەشەویشدا سەرقاڵی زیکرو یادی خوای گەورەیە، هیچ شتێکی لەماڵەکەیدا نییە، هەرکاتێ تینووی دەبێ دەڕوا لەڕووبار بەدەستەکانی ئاو دەخواتەوە، ڕۆژێکیان ئافرەتێکی تر پێی دەڵێ: بۆچی شوو ناکەی؟

ئەویش گوتی: پیاوێکی زاهیدو خواناسم بۆ بدۆزەوە، کە داوای هیچ شتێکی دونیام لێنەکا، ئەگەر پیاوێکت دۆزییەوە خوا پەرست بێ بمگرێنێ‌و بیگریەنم و بەڕۆژووبێ‌و خێرو چاکە بکات، ئەوە باشە ئەگەرنا سڵاو لە پیاوان[3].

### ٣٩٨.نەزەر کردن

---

[1]) بەسەرهات‌و پەند وەرگرتن- ب٢ لا٢٩٤- ٢٩٥.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٣٨٥.

[3]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ل ٤٠٢.

پێشەوا شافیعی زۆر بە خێرایی زانست فێر دەبوو، ئەو شتەی فێری دەبوو لە بیری نەدەکرد، ئەگەر کتێبێکی بخوێندایەوە دەستی دەخستە سەر لایەکەی تری بۆ ئەوەی ئەویش لەبەر نەکاتو لێی تێکەڵ نەبێ.

ڕۆژێکیان چووە لای مامۆستاکەی کە ناوی وەکیع بوو پێی گوت: وەك جاران شتم بۆ لەبەر ناکرێو بیرتیژیم نەماوە.

مامۆستاکەی لێی پرسی کە تووشی هیچ گوناهێك بووی؟

پێشەوا شافیعی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە لەو دێڕ شیعرەکە کە چۆن شەکوای لای مامۆستاکەی کردووەو ئەویش چی پێ گوتووەو چۆن ئامۆژگاری کردووە:

شَكَوْتُ إلى وَكِيع سُوءَ حِفْظِي ** فأرْشَدَنِي إلى تَرْكِ المعَاصي

وَأخْبَرَنِي بأنَّ العِلمَ نُورٌ ** ونورُ الله لا يهدى لعاصي

واتە: شەکوای خۆم بردە لای مامۆستاکەم کە وەکیعە لەوەی کە وەك جاران لەبەر کردنم نەماوەو بیرتیژیم خراپ بووە، ڕێنمویی کردم کە واز لە گوناهان بێنم، هەواڵی پێدام کە زانست ڕووناکیە، ڕووناکی خواش ناچێتە دڵی گوناهبار.

دەگێڕنەوە کە گوناهەکەی ئەوەبووە تەنها پاژنەی پێی ئافرەتێکی بینیوە، بەو هۆیەوە چەند ڕۆژێك ناتوانێ شت لەبەر بکات[1].

**٣٩٩. تەوبەکردن**

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کرد ئەگەر گوناهێك بکەم ئایا لەسەرم دەنووسرێ؟

ئەویش فەرمووی: بەڵێ دەنووسرێ.

پیاوەکە گوتی: ئەگەر تەوبە بکەم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەسڕێتەوە.

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٢٩٧- ٢٩٨.

پیاوەکە گوتی: ئەگەر گەڕامەوە سەر گوناهەکەم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەسەرت دەنووسرێ.

پیاوەکە گوتی: ئەی ئەگەر تەوبەم کردەوە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دووبارە دەسڕێتەوە.

کابراکە گوتی: هەتاکەی هەر دەسڕێتەوە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە وەڕس نابێ لە لێبوردنتان تا ئێوە وەڕس نەبن لە داوای لێبوردن[1].

## ٤٠٠. بێ ئاگایی خەڵك لە زانست

زانایەك دەڵێ: جارێکیان لە مەجلیسێك دانیشتبووم کە زیاتر لە (٤٠) کەسی لێبوو، دەنگە دەنگ زۆر بوو، تا وای لێهات دەنگیان بەرز بوویەوە سەعاتێك تێپەڕی بەسەر ئەو دەنگە دەنگە هەوڵم دا بێدەنگیان بکەم بەلاَم نەمتوانی، پیاوێکی بەتەمەن لەتەکمەوە بوو، پێم گوت: بێدەنگیان بکات، ئەویش هاوارێکی لێکردنو بێدەنگی کردن، منیش گوتم ئەوە ئێمە دەمێکە دانیشتووین ئێوە هەر گفتوگۆ دەکەن لە شتانێك نازانم لە دەفتەری کردەوە چاکەکانتان دەنووسرێ، یان دەفتەری کردەوە خراپەکانتان.

بەهەرحاڵ من پرسیارێکتان لێدەکەم ئێوە هەمووتان سوڕەتی ئیخلاَصتان لەبەرە؟

بەدەنگێکی بەرز گوتیان: بەڵێ، بەڵێ.

پێم گوتن: {اللە الصمد} یەعنی چی؟ هەموویان بێدەنگ بوونو نەیانزانی.

ئەوجارە گوتم: سووڕەتی (الفلق)تان لەبەرە؟

هەموو گوتیان: بەڵێ، بەڵێ.

---

[1]) بەیڤێك لە دڵەوە- لا ٢١.

گوتم: مانای (مِن شَرِّ غاسِقٍ إذا وَقَب) یەعنی چیی؟ دووبارە هەموویان بێدەنگ بوونو نەیانزانی.

گوتم: ئەگەر ئێوە لە دانیشتنەكەتان باسی شیكردنەوەی ئایەتێك یان فەرموودەیەك یان حوكمێكی شەرعیتان بكردایە باشتر نەبوو؟ لەو كاتەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {أیما قوم جلسوا فأطالوا الجلوس ثم تفرقوا قبل أن یذكروا الله و یصلوا على نبیه صلى الله علیه و سلم إلا كانت علیهم من الله ترة إن شاء الله عذبهم و إن شاء غفر لهم}[1] واتە: هەر كۆمەڵێك دانیشتن دانیشتنەكەیان ماوەیەكی زۆری خایاند دواتر هەستانو یەكتریان جێهێشت، بێ ئەوەی یادی خوا بكەنو صەڵەوات لەسەر من بدەن، ئەوە ئەو دانیشتنەیان لێ دەبێتە تۆڵەو سزا، ئەگەر خوای گەورە بیەوێ عەزابیان دەدات وە ئەگەر بیەوێ لێیان خۆش دەبێ[2].

### ٤٠١. دەرمانی غەمو پەژارە ناسینی ئیسلامە

زانایەك دەڵێ: بۆ چارەسەری نەخۆشی چوومە گەورەترین نەخۆشخانەی بەریتانیا، نەخۆشخانەیەك بوو كە تەنها گەورە پیاوانو وەزیرەكان دەچوون بۆ ئەو نەخۆشخانەیە.

كاتێك دكتۆر هاتە لام تەماشای سەرو سیمای كردم گوتی: تۆ مسوڵمانی؟

منیش گوتم: بەڵێ.

گوتی: منماڵی زۆرم هەیە وە پیشەیەكی بەناوبانگم هەیە ، بڕوانامەیەكی بەرزیشم هەیە هەموو خۆشییەكم تام كردوە، جۆرەها ئارەقم خواردۆتەوە وەزیناشم كردوە، گەشتیشم كردوە بۆ زۆر وڵاتان لەگەڵ ئەوەشدا هەردەم هەست بەدڵتەنگیو خەمو پەژارە دەكەم ئەو خۆشیانەی لێ تێكداوم چوویمە لای زۆر دكتۆری دەروونی وە زۆر جار بیرم لە خۆكوشتن كردۆتەوە تا ژیانێكی ترم بەدەست بكەوێ، كە خەمو پەژارەو بێزاری لێ نەبێ، ئایا تۆش هەست بەو بێزارییە ناكەی وەكو من؟

---

[1]) رواه الحاكم.

[2]) جامع الرسائل- محمد العریفي- ج١- ص ١٩٤- ١٩٥.

منیش گوتم: نەخێر، بەڵکو من لە خۆشییەکی بەردەوام دام، من چارەسەری ئەو کێشەیەت بۆ دەکەم، هەندێ پرسیارت لێ دەکەم:

ئەگەر بتەوێ خۆشی بە چاوەکانت بگەیەنی چی دەکەی؟

گوتی: تەماشای ئافرەتێکی جوان دەکەم، یا سەیری دیمەنێکی جوان دەکەم.

گوتم: ئەی ئەگەر بتەوێ خۆشی بە گوێیەکانت بدەی چی دەکەی؟

گوتی: گوێ لە مۆسیقایەکی هێمن ڕادەگرم.

گوتم: ئەگەر بتەوێ خۆشییەك بە کەپوت بدەی چی دەکەی؟

گوتی: بۆنێکی خۆش بۆن دەکەم یان دەچمە نێو باخچەیەك.

گوتم: بۆچی کاتێ دەتەوێ خۆشییەك بە چاوەکانت بگەیەنی گوێ لە مۆسیقایەك ناگری؟

سەری سوڕماو گوتی: ئاخر نابێ چونکە گوێ پێویستی بە مۆسیقایە نەك چاو.

گوتم: بۆ کاتێ دەتەوێ خۆشییەك بە کەپووت بگەیەنی تەماشای دیمەنێکی جوان ناکەی؟

کابرا زیاتر سەری سوڕماو گوتی: ئاخر چۆن دەبێ دیمەنی جوان چاو لەززەتی لێدەکا نەك کەپوو.

گوتم: باشە ئێستا من گەیشتمە ئەو شتەی دەمویست پێتی بڵێم، ئایا تۆ بێزاریو دڵ توندی لە چاوەکانت هەست پێ دەکەی؟

گوتی: نەخێر.

گوتم: لە گوێیەکانت هەستی پێدەکەی؟

گوتی: نەخێر.

گوتم: ئەو دڵ توندیە لە لووتت، لە عەورەتت، لەدەمت، لەهیچ کام لەمانە هەستی پێ دەکەی؟

گوتی: نەخێر، بەڵکو ئەو بێزارییە تەنها لەدڵمدا هەستی پێ دەکەم.

منیش گوتم: تۆ تەنها لەدڵت هەست بەو خەمو بێزارییە دەکەی، دڵ پێویستی بە شتێکە خۆشی پێبدەی، تۆ بەشتێکی تر ئەو خۆشییەی پێدەدەی، پێویستە بەدوای شتێکدا بگەڕێی خۆشیی بەدڵت بدا، تۆ بەئارەق خواردنەوەو بەگوێدانە مۆسیقاو سەیر کردنی ئافرەت دڵت خۆش ناکەی بەڵکو ئەو ئەندامانە خۆش دەکەی.

دکتۆرەکە گوتی: ڕاست دەکەی ئەی چ شتێك دڵم خۆش دەکات؟

منیش گوتم: تاکە شتێك کە دڵت پێی خۆش بێ گوتنی شایەتمانەو بڵێی: {أَشْـهَدُ أن لا إلهَ إلا الله، وَأَشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله}، بەدڵ کڕنوش بەریت بۆ خوا، سکاڵای حاڵی خۆت لای دروستکەری دروستکراوەکان بکەی‌و تەنها پشتو پەنا بەو ببەستی، بەمە دڵت خۆش دەبێ‌و ژیانێکی خۆش دەگوزەرێنی، دکتۆرەکە گوتی: ڕاست دەکەی کتێبێکم بدەیە سەبارەت بە ئیسلام، دوعام بکە، دواتر چارەسەرییەکەم تەواو بوو، ڕۆیشتم ئومێدم وایە دوای ئەوە مسوڵمان بووبێ[1].

### ٤٠٢. شەیدای فێربوونی زانست لەسەرە مەرگ

زانای بەناوبانگ (الوالجی) دەڵێ: چوومە لای أبی الریحان لە کاتی سەرەمەرگ، باسی حاڵەتێك لە حاڵەتەکانی میراتی دەکرد، کە پێشتر من پرسیارێکم لێی کردبوو، پرسیارەکەش ئەوەبوو بەشی داپیر لە لایەنی دایکەوە چەندە لە میرات، لەسەرە مەرگ بوو کەچی پێمی گوت: تۆ جارێك ئەو پرسیارەت لێ کردم،لأمەکەییت زانی؟

منیش گوتم بەڵێ، گوتی دەی کەواتە بەمنیش بڵێ با بزانم، منیش بەزەییم پێدا هاتەوە گوتم ئێستا لەو کاتەدا؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ١٨١- ١٨٣.

ئەویش گوتی: چییە من دونیا جێدەهێڵم بۆیە دەڵێی ئێستا کاتی نییە، ئایا باشتر نییە ئەو مەسەلەیە بزانم ئنجا بمرم، لەوەی کە نەیزانم‌و بمرم؟

منیش وەلامەکەم پێی گوت: چەند جارێك بۆیم دووبارە کردەوە تا لەبەری کرد، دوایی من لای ڕۆیشتم‌و جێمهێشت زۆر دوور نەکەوتبوومەوە گوێم لە هاواری گریان بوو زانیم کە وەفاتی کرد[1].

### ٤٠٣. زانست فێربوون

ڕۆژێك گەنجێك چوو بۆلای فەیلەسوفی بەناوبانگ سوقرات پێی گوت: دەمەوێ فێری زانیاری بم، سوقراتیش دەستی گرت‌و بردی بۆ کەناری ئاوێك، سەری گەنجەکەی گرت‌و هاوێشتییە ناو ئاوەکە دەستی لەسەر دانا نەیهێشت سەری بەرز بکاتەوە، تا ماوەیەك پاشان سەری لەئاوەکە دەرهێناو پێی گوت: ئەو ماوەیە سەرت لەناو ئاوەکە بوو تاکە ئاواتت چی بوو؟

گەنجەکە گوتی: تاکە ئاواتم ئەوەبوو یەك تۆز هەوام دەست بکەوێ‌و هەناسەیەکی پێ بدەم، سوقرات گوتی هەر کات ئاواتت بۆ فێر بوونی زانست وەك ئەو ئاواتە بوو کە بۆ تۆزێك هەوا دەتخواست ئەو کاتە فێری زانست دەبی[2].

### ٤٠٤. پێشەوا ئەحمەد و خۆشەویستی بۆ خوای گەورە

ئەحمەدی کوڕی تاووس دەڵێ: پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەرکاتێ کەسێکی گاوری بدیبا، چاوەکانی دەنووقاندو سەیری نەدەکرد، پرسیاریان لێ کرد بۆچی وا دەکەی؟

دەیگوت: حەزناکەم سەیری کەسێك بکەم کە بوختان هەڵدەبەستێ بۆخواو دەڵێ: خوا کوڕی هەیە، دەڵێ عیسا سەلامی خوای لێبێ، بەرز نەبۆتەوەو لەسێدارە دراوە.

---

[1]) جامع الرسائل- محمد العریفي- ج ٢- ص ١٩٦- ١٩٧.

[2]) سۆمای دیدە- ب ٢- ل ٤٣٥.

**٤٠٥. فەتوادان بە هەڵە**

دەڵێن پیاوێك هەبوو بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە پیاوێكی زانایە بە ئایینی ئیسلام، هەر پرسیارێكی لێبكرایە وەڵامی دەدایەوە، لەهیچ پرسیارێك سڵی نەدەكردەوە، بەڵگەیەكیشی بۆ وەڵامەكەی دەهێنایەوە، ڕۆژێك كۆمەڵێك كەسی ژیر كۆبونەوە بچنە لای و كۆمەڵێك پرسیاری لێكەن بۆ ئەوەی بزانن ئایە ئەو پیاوە بەڕاستی كەسێكی ژیرە یاخود كەڵكی لەنەزانی خەڵكەكە وەرگرتووە، چوون ئەو پیاوە تاقی بكەنەوە، وشەیەكی شەش پیتیان ڕێك خست، هاتنە لای و سەریان ماچ كرد گوتیان ئەی شێخ هاتووین پرسیارمان هەیە لە شتێك كە گومانی بۆ دروست كردووین، ئێمە ڕای جیاوازمان لەنێوان دروست بووە لەسەر وەڵامی ئەو پرسیارە.

ئەویش گوتی: پرسیارەكەتان بكەن چۆن دەبێ ئێوە ڕای جیاوازتان بۆ دروست بێ لەسەر شتێك تا من مابم.

گوتیان: ئایا (الخنفشار) چییە؟

گوتی (الخنفشار) دارێكە لە جنوبی یەمەن شین دەبێ ماددەیەكی زەردی لەناودایە، ئەگەر وشتر بیخوا شیر لەگوانەكانی دەگیرێ، خاوەنی وشترەكان بەكاری دەهێنن بۆ ئەوەی فێڵ لەخەڵك بكەن، لەكاتی فرۆشتنی وشترەكانیان خەڵكی وابزانن كە ئەوە شیری تێدایە، پاشان زیاتر لەسەر ڕۆیی و گوتی: (الخنفشار) لای عەرەبە دەشتەكیەكان شتێكی ناسراوەو شاعیرەكانیش لە شیعرەكانیان باسیان كردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە سوننەتدا باسی كردووە.

شاعیرێكیش زۆر عەشقی خۆشەویستەكەی بووە دەڵێ:

لقد عقدت محبتكم فؤادي – كما عقد الحليب الخنفشار.

دوایی كۆخی و گوتی: بەڵگەی (الخنفشار)یش لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە كە... خەڵكەكە گوتیان بەسسە بەسسە، قسەكەیان پێ بڕی، گوتیان بەسسە هەی

درۆزن، درۆت لەسەر زاری عەرەبان کرد، درۆت بەزمانی شاعیران کرد، دەتەوێ درۆ بەسەر زمانی پێغەمبەریشەوە ﷺ بکەی، ئیتر بەو شێوەیە پیاوەکەیان لەو شوێنە دەرکرد[1].

## ٤٠٦. نوێژی جەماعەت لەلای پیاوچاکان

عامری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر خوا لێیان ڕازی بێ لەسەرە مەرگ بوو خەڵکی لەسەری دەگریان، لەو کاتەدا گوێی لەبانگی مەغریب بوو، بە خەڵکی چواردەوری گوت: دەستم بگرن، گوتیان بۆ کوێ؟

گوتی: بۆ مزگەوت.

گوتیان: لەسەر ئەو حاڵە.

گوتی: (سبحان الله)، گوێم لەبانگە دەتانەوێ وەڵامیش نەدەمەوە، دەستەکانیان گرتو بردیان بۆ مزگەوت لەگەڵ ئیمام ڕکعاتێکی کردو دواتر لە سوجدە وەفاتی کرد[2].

## ٤٠٧. شەڕاب خۆر لەسەرە مەرگ

ئیبن و لقەییم دەڵێ: پیاوێکی ئارەق خۆر لەسەرە مەرگ بوو ئەوانەی کە لەلای بوون داوایان لێکرد: بڵێ (لا إلـه إلا الله)، کابرای شەڕاب خۆر ڕەنگی دەمو چاوی گۆڕا، سەیرێکی ئەم لاو ئەو لای خۆی کرد، هاواری کرد گوتی: نەخێر تۆ بیخۆرەوە ئنجا بیدە بەمن، هەر ئەو قسەیەی لەبەر خۆی دووبارە دەکردەوە تا گیانی دەرچوو[3].

## ٤٠٨. ئەجەلت لەکوێ هاتبێ لەوێ دەمری

دەگێڕنەوە وەزیرێکی خواناسی پێغەمبەر داوود هەبوو سەلامی خوای لێبێ، پاش وەفاتی پێغەمبەر داوود، بووە وەزیری پێغەمبەر سولەیمان سەلامی خوایان لێبێ، ڕۆژێکیان لەکاتی چێشتەنگاو پێغەمبەر سولەیمان و ئەو وەزیرەی بەیەکەوە دانیشتبوون، پیاوێك هات سەلامی کرد، پیاوەکە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر سولەیمان دەکردو سەیری وەزیرەکەشی

---

[1]) جامع الرسائل- محمد العريفي- ص- ٢٠٤- ٢٠٥.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٢١٩.

[3]) هەمان سەرچاوەو بەرگ ج٢- ص ٢٣٤.

دەکرد،ژیرەکە ترسا لەو پیاوە، کاتێ پیاوەکە ڕۆیی،ژیرەکە پرسیاری لە پێغەمبەر سولەیمان کردو گوتی: ئەو پیاوە کێ بوو؟ سوێند بە خوا شێوەو دیمەنی ئەو پیاوە زۆر منی ترساند؟

سولەیمان فەرمووی: ئەوە فریشتەی گیان کێشان بوو هاتبوە لام لەسەر شێوەی پیاوێك،وەزیرەکە زۆر ترساو دەستی کرد بە گریان، گوتی: ئەی پێغەمبەر سولەیمان داوات لێدەکەم فەرمان بکەی بە (با) هەڵمبگرێ بۆ شوێنێکی زۆر دوور، پێغەمبەر سولەیمان فەرمانی بە با کرد بردی بۆ هیند، بۆ بەیانی فریشتەی گیان کێشان هاتەوە لای پێغەمبەر سولەیمان، پێغەمبەر سولەیمان فەرمووی: دوێنێ وەزیرەکەی من زۆر لێت ترسا، بۆچی بەردەوام تەماشای ئەوت دەکرد؟

فریشتەی گیان کێشان فەرمووی: بەر لەوەی بێمە لای تۆ خوای پەروەردگار پێمی فەرموو: پاشی نیوەڕۆ ڕۆحی ئەو پیاوە بکێشم لە هیندستان، کاتێ هاتمە لات چێشتەنگاو بوو، سەیری ئەو پیاوەم کرد پێم سەیر بوو لای تۆیە، خوای پەروەردگاریش پێی فەرمووم لە هیندستان گیانی بکێشە.

پێغەمبەری سولەیمان فەرمووی: ئەی چیت لێکرد؟

فریشتەی گیان کێشان فەرمووی: پاشی نیوەڕۆ چووم لە هیندستان پیاوەکە لەوێبوو چاوەڕوانی منی دەکردو گیانم کێشا[1].

## ٤٠٩. تێگەیشتنی منداڵێك لە پێویست بوونی مانگی ڕەمەزان و نیازپاکی بۆخوای گەورە

چەند ڕۆژێك پێش هاتنی مانگی ڕەمەزان بەیانییەك ژینۆی بچکۆلانە چووە لای باوکی و هەندێ پارەی لێ وەرگرت بۆ ئەوەی لە نانەواخانەکەدا هەندێ نان کڕێ بۆ نانخواردنی بەیانی، ژینۆ لەسەر سفرەکە دانیشت لەتە نانێکی زۆر بچووکی لەپێش خۆی داناو چایان بۆ هێنا چایەکەی تێکدا لەو کاتەدا باوکی گوتی: ژینۆ خان ئەو لەتە نانە کەمە بەشت دەکا؟

ژینۆ گوتی: بەڵێ بابە گیان ئەمە بەشی خۆمەو نامەوێ بەشی کەسی تر بخۆم.

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٢٣٥- ٢٣٦.

باوکی گوتی: لەوە دەچێ ئەمڕۆ زۆرت برسیبێ لەتە نانەکەی ترت بەدەم ڕێگاوە خواردبێ.

ژینۆ بزەیەکی کردو گوتی: نەخێر بابەگیان من بەدەم ڕێگاوە شت ناخۆم.

باوکی گوتی: ئەی بۆچی نانەکەت تەنها لەتێکی ماوە؟

ژینۆ گوتی: باوکە گیان کاتێ لە ڕێگا دەهاتمەوە هەژارێکم بینی، سەیری نانەکانی دەستمی دەکرد، منیش نانەکەم دەرهێنا کردم بە چوار لەت سێ لەتم بەو دا لەتێکیشم بۆخۆم هێناوە نەمدەویست باسی بکەم بەڵام تۆ پرسیارت کرد.

باوکی بزەیەکی پڕ سۆزی بۆ کردو نانەکەی خۆی کرد بەدوو لەت لەتێکی دا بە ژینۆ، ژینۆش گوتی: باوکە من هەر ئەوەندەی خۆم بەسمە.

باوکی گوتی: نا ژینۆ خان من دەزانم بەوەندە تێر ناخۆی لە قوتابخانە برسیت دەبێ.

ژینۆ گوتی: باوکە من نامەوێ تێر بم‌و خەڵکی هەژاریش برسی بن، با هەردووکمان نیوە تێر بین، ئەی لە مانگی ڕەمەزاندا بۆ ئەو مەبەستە بەڕۆژوو نابین، کە لەسەر برسێتی ئارام بگرین‌و یارمەتی هەژارانیش بدەین؟ ئەگەر نەشتوانین یارمەتیان بدەین کەمێك وەك ئەوان برسیمان بێ، باوکی ئافەرینی بۆ کردو گوتی: بەڵام منیش حەزدەکەم پشك‌و بەشم لەو خێرە هەبێ، هەر کەسێ بەزەیی بەخەڵکدا بێتەوە خوای گەورەش بەزەیی پێدا دێتەوە، خانەوادەکە بەدەم چیرۆك‌و بەسەرهاتی ژینۆوە دەستیان کرد بەنان‌و چایی خواردن[١].

## ٤١٠. تێگەیشتن لە هەقیقەتی ژیانی دونیا

ڕابیعەی عەدەوییە ڕەحمەتی خوای لێبێ، هەموو جار لەگەڵ نەفسی خۆی دەکەوتە گفتو گۆ کردن، با ئێمەش گوێ بۆ وتە بەنرخەکانی ئەو ئافرەتە خوا پەرستە بگرین، خۆی بەخۆی دەگوت:

- لەکوێوە هاتووی؟

---

[١]) سۆمای دیدە- ب٢ ل ٥٤٨- ٥٤٩.

- لەو دونیاوە.

- ئەی بۆ کوێ دەچی؟

- هەر بۆ ئەو دونیا.

- ئەی لەم دونیایەی ئێستا لێی دەژی هەر بەجێی دێڵی ئەی ئێستا چی دەکەی؟

- گاڵتەی پێ ئەکەم.

- چۆن گاڵتەی پێدەکەی؟

- نانەکەی ئەو دەخۆم، بەڵام بۆ ئەو ناژیمو بۆ دونیاکەی تر دەژیم[1].

**٤١١. باوەڕی بەهێزو توندو تۆڵ بەخوای گەورە**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود خوا لێیان ڕازی بێ نەخۆش کەوت، پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففان دەچێتە لای پێی دەڵێ: چ شوێنێکت ئازارت دەدا؟

دەڵێ: گوناهەکانم.

عوسمان گوتی: ئارەزووت لە چ شتێکە فەرمان بکەم بۆت بێنن.

گوتی: ئارەزووی بەزەیی‌و لێخۆشبوونی خوای گەورە دەکەم ئەی عوسمان.

عوسمان گوتی: فەرمان بکەم دکتۆرت بۆ بێنن؟

گوتی: دکتۆر خۆی منی نەخۆش خستووە[2].

**٤١٢. خۆشەویستی خوای گەورە**

شێخ سری سەقەتی دەڵێ: گوێم لە فوزەیلی کوڕی عیاز بوو دەیگوت: کچێکم هەبوو قۆڵی دەهێشا، منیش چوومە لای پێم گوت: کچی شیرینم قۆڵت چۆنە؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ. ل ٥٥٨- ٥٥٩.

[2]) جامع الرسائل- محمد العريفي- ج١- ص ٢٣٦- ٢٣٧.

گوتی: باوکە گیان خوای گەورە لەبەرانبەریدا ئەوەندە پاداشتی بۆ داناوم لەژمار نایەت، منیش هەرگیز لەژێر شوکرو سوپاسی ئەو دەرنایەم.

فوزەیڵ دەڵێ سەرسامی کردم بەو ئیمانو یەقینە پتەوەی، لەو کاتەدا لای دانیشتبووم کوڕێکم هات تەمەنی (٣) ساڵان بوو منیش ماچم کردو بەسینگی خۆمەوە کوشیم، لەو کاتەدا کچەکەم گوتی: باوکە گیان ئەو منداڵەت خۆش دەوێ؟

گوتم: بەڵێ کچی خۆم هیچ گومان لەوەدا نییە کە خۆشم دەوێ.

کچەکەم گوتی: چەند خراپی بەرامبەر خوادا، وام دەزانی لەگەڵ خوادا کەست خۆش ناوێ بەو شێوە ڕەهایە.

فوزەیڵ دەڵێ: گوتم ئەی کچی خۆم ئەی ئێوە منداڵی خۆتان خۆش ناوێ؟

کچەکەم گوتی: خۆشەویستی شایستەی خوای پەروەردگارە، ڕوحمو سۆزیش بۆ ماڵو منداڵە.

فوزەیڵ بەهەردوو دەستی دای بەسەری خۆیداو گوتی: پەروەردگارم کچەکەم ڕەخنەم لێدەگرێ لەسەر خۆشەویستی خۆیو براکەی، دەی سوێند بەگەورەییو عیززەتی تۆ تا مردن لەگەڵ خۆشەویستی تۆدا هیچ شتێکی ترم خۆشناوێ[1].

### ٤١٣. ئامۆژگاری کردن

ئەبو حەسەنی بەغدادی دەڵێ: مەنصوڕی کوڕی عەممارم لەخەو بینی پێم گوت: پەروەردگار چی لێکردی؟

مەنصوڕ گوتی: منیان لەبەردەم خوای پەروەردگار ڕاگرت، پێی فەرمووم: تۆ مەنصوڕی کوڕی عەمماری!!؟

گوتم: بەڵێ پەروەردگارم.

فەرمووی: تۆ ئەو کەسەی خەڵکیت هان دەدا واز لە خۆشییەکانی دونیا بێنن؟

---

[1]) بگە بە کاروانی صاڵحان لا ٢٨١ لە الجامع لشعب الإيمان- ج٢ — ص ٢١٦ خواستۆتەوە.

گوتم: بەڵێ پەروەردگارم، من لەهەر کۆڕو مەجلیسێك دانیشتبام، سەرەتا سوپاس‌و ستایشی تۆم دەکرد و مەدح‌و سەنای تۆم دەکرد، پاشان صەڵەواتم دەدا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئنجا ئامۆژگاری بەندەکانی تۆم دەکرد، خوای گەورە پێی فەرمووم راست دەکەی، فەرمانی بە فریشتەکان کرد کورسیەکی بۆ دابنێن لە ئاسمان با لەسەری دانیشێ‌و مەدح‌و سەنای من بکات بۆ فریشتەکانی ئاسمان،ك چۆن لە دونیادا مەدح‌و سەنای منی دەکرد لەنێو بەندەکانم لە زەویدا، دەڵێ کە خوای پەروەدگار ئاوای پێ فەرمووم، منیش گوتم: (سبحان الملك المجید، فعال لما یرد، لا إله سواه، ولا نعبد إلاّ إیّاه، وصلّی الله وسلّم علی محمد و علی آل محمد)[1].

### ٤١٤. گەورەیی کاری پزیشك

پسپۆڕێکی نەشتەرگەری دڵ، ئۆتۆمبێلەکەی تێکچوبو لای فیتەرێك چاکی دەکردەوە، فیتەرەکە خەریکی کردنەوەی مەکینەی ئۆتۆمبێلەکە بوو، شتێکی دەردەهێناو شتێکی لەشوێنی دادەنا، فیتەرەکە بە پزیشکەکەی گوت: دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم؟

دکتۆرەکەش گوتی: فەرموو بپرسە.

فیتەرەکە گوتی: ئێوە نەشتەرگەری دڵی ئینسان دەکەن ئێمەش نەشتەرگەری دڵی ئۆتۆمبێلەکان کەچی ئێوە پارەیەکی یەکجار زۆر وەردەگرن کەچی ئێمە قازانجی زۆر کەم دەکەین لەچاو ئێوە؟

دکتۆرەکە گوتی: ئەگەر دەتوانی مەکینەکە چاك بکەوە بێ ئەوەی بیکوژێنیتەوە، چونکە ئێمە نەشتەرگەری دڵ دەکەین بێ ئەوەی لەکارکردن بوەستێ[2].

---

[1]) حدائق الأولیاء- ج١ – ص ٢٧.

[2]) ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم- ب ١ ل ٥٤.

## ٤١٥. چۆن وا لەمنداڵەکانت دەکەی نوێژ بکەن

خوشکێك چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کچەکەم پۆلی پێنجی سەرەتایی بوو، نوێژ کردن بەلایەوە زۆر قورس بوو، بەراددەیەك ڕۆژێکیان پێم گوت: هەستە نوێژ بکە، سەیرم کرد بەرماڵەکەی لەزەوی ڕاخستو هاتەوە، لێم پرسی نوێژت کرد؟ گوتی: بەڵێ!!.

باوەڕ بکەن بێ ئەوەی خەیاڵم لای خۆم بێ بێ ویستی خۆم زللەیەکم لێدا، دەشزانم هەڵە بووم بەلاّم هەلۆێستەکە تەنگی پێهەڵچنیم، دەستی کرد بەگریان زۆر لۆمەم کرد لەسەر درۆ کردنەکەی، ترساندم بەسزای سەختی خوا، کەچی ئەو قسانەم هیچ سوودێکی نەبوو، ڕۆژێکیان یەکێ لە هاوڕێکانم بەسەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە لەلای یەکێ لە ناسیاوەکانی ڕوویدابو، ئەو هاوڕێیەم گوتی: ڕۆژێکیان سەردانی ئافرەتێکی ناسیاوی خۆمانم کرد، ئافرەتێکی سادە بوو لە دینداریی دا، بەلاّم هەرکاتێ کاتی نوێژ دەهات هەموو منداڵەکانی نوێژیان کردن، منیش پێم گوت: ئەمە چۆن بێ پێگوتنو خۆ تووڕە کردن لێیان نوێژ دەکەن؟

ئەویش گوتی: شتێکی وا نییە بۆتی باس بکەم پێت بڵێم ئەمە هۆکارەکەیەتی، تەنها ئەوە نەبێ بەر لەوەی شوو بکەمو تا ئێستاش دوعایەك هەیە زۆر ئەو دوعایە دەکەم، دوعاکەی پێ گوتم، منیش دوعاکەم لە زاری هاوڕێکەمەوە لەبەر کرد، بڕوا بکەن هەر لەو کاتەی دەستم بەم دوعایە کرد لە سوژدە بردنو لەنوێژە ویترەکان ئیتر کچەکەم دەستی بەنوێژ کردن کرد تا ئەمڕۆ کە لەقۆناغی ئامادەییە، بەردەوام نوێژەکانی دەکات بەڵكو بەیانیان هەر ئەو بێدارمان دەکاتەوە بۆ نوێژی بەیانی وە سوپاس بۆ خوا براو خوشکەکانیشی بەهەمان شێوەی ئەون، ئێستا لەوانەیە زۆر تامەزرۆ بن ئەو دوعایە بزانن، با پێتان بڵێم ئەو دوعایە دوعایەکە لە دوعاکانی پێغەمبەر ئیبراهیم، لە سورەتی ئیبراهیم خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئەو پێمان دەفەرمووێ: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن

ﮋ ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ ﮊ واتە: پەروەردگارا وا لەخۆمو نەوەکانم بکە دامەزراو بین لەسەر نوێژ کردن، پەروەردگارە ئەو دوعایەم لێوەربگرە[1].

### ٤١٦. نەمانی خشوع لەنوێژ هۆکارەکەی شەیتانە

دەگێڕنەوە پیاوێك هاتە لای پێشەوا ئەبو حەنیفە گوتی: ئەی ئەبو حەنیفە ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا هەندێ پارەم لە شوێنێك شاردەوە، ئێستا چەند بیر دەکەمەوە شوێنەکەم بیر نادۆزرێتەوە، دەمەوێ یارمەتیم بدەی لە دۆزینەوەی شوێنەکەی، ئەبو حەنیفە گوتی: شت دۆزینەوە کاری فیقهناس نییە، بەلاّم بەیانی هەستە دەست نوێژ بکەو نوێژی بەیانی ئەنجام بدە پشت بە خوا بیرت دەکەوێتەوەو دەیدۆزیەوە.

پیاوەکە دەستی کرد بەنوێژ کردن، لەناو نوێژەکەیدا بیری کەوتەوە پارەکەی لە کوێ شاردۆتەوە، خێرا نوێژەکەی تەواو کرد چوو بۆ شوێنی مەبەست کە شوێنەکەی پشکنی بینی پارەکە والەو شوێنەیە، پیاوەکە بەخێرایی چوو بۆ لای ئەبو حەنیفە سوپاسی کرد لەسەر ڕێنمویی کردنی بۆ دۆزینەوەی پارەکەی، لێی پرسی ئەی ئەبو حەنیفە چۆنت زانی لەنوێژدا بیرم دەکەوێتەوە پارەکەم لەکوێیە؟

ئەبو حەنیفە گوتی: لەبەر ئەوەی دەمزانی شەیتان ناهێلێ نوێژەکەت بەڕێکیو بە خشوعەوە بکەی، سەرقالت دەکا بەبیر کردنەوە لەشوێنی پارەکەت[2].

### ٤١٧. مافی ئافرەت لە ئیسلام

ڕۆژێکیان عومەری کوڕی خەتتاب دەچێتە سەر مینبەرو وتارێك پێشکەش دەکات، داوای لەخەڵکەکە کرد زێدە ڕەۆیی نەکەن لەداواکردنی مارەیی بۆ کچەکانیان، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە (٤٠٠) درهەم زیاتری بەشیاو دانەناوە، فەرمانی کرد مارەیی ئافرەت لە (٤٠٠) درهەم زیاتر نەبێ، لە مینبەرەکەی هاتە خوارەوە ئافرەتێکی قوڕەیشی

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ. ل ٦٣.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ. ل ٧٣.

گوتی: ئەی پێشەوای مسولمانان تۆ مافێکت لە ئافرەتان قەدەغە کرد کە خواو پێغەمبەرەکەی پێیان بەخشیون، پێشەوا عومەر گوتی: چ مافێك؟

ئافرەتەکە گوتی: ئەی سەبارەت بە مارەیی نەتبیستووە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ ﴾ النساء. کەواتە بەپێی ئەو ئایەتە مارەیی ئافرەت یەك قینتاریش بێ ئاساییە.

پێشەوا عومەر گوتی: پەروەردگار، هەموو خەڵك لە عومەر شارەزاترە لە دینی خوا، خێرا چۆوە سەر مینبەرو گوتی: ئەی خەڵکینە تازە من گوتم: زێدەڕۆیی مەکەن لە مارەیی دان بە ئافرەت، بەڵام من پەشیمان بوومەوە ئێستا هەر کەسێك چەندی پێخۆشە با بیدات ئازادە لە پێدانی مارەیی[1].

### ٤١٨. شارەزایی لە کاری بانگخوازی

پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیزلەنێو خەڵکدا بەکەسێکی داناو نەرمو نیان ناوی دەرکردبوو، ڕۆژێکیان یەکێ لە منداڵەکانی گوتی: باوکە گیان بۆچی لەهەندێ مەسەلەدا نەرمی دەنوێنی؟ سوێند بەخوا ئەگەر من لەشوێنی تۆبم ناترسم لەوەی بڕیارێك بدەم ئەگەر بەگوێرەی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوابێ ﷺ.

باوکی وەلامی دایەوەو گوتی: کوڕم نابێ پەلە بکەی، خوای پەروەردگار لە قورئاندا بۆ حەرام کردنی هەندێ شت، چەند جارێك زەمی مسولمانانی کردوە پاشان حەرامی کردووە، من دەترسم ئەگەر هەرچی قەدەغە کراوەکانی خوایە بەیەکجار لەخەڵکی قەدەغە بکەم بەرگە نەگرنو تووشی فیتنە بن، پاشان بەرامبەر بڕیارەکانم بوەستنو جێبەجێی نەکەن، بەمەش ئاشووبێکی گەورە ڕوودەدات، کاتێ منداڵەکەی ئەمەی لێبیست زانی کە نەرمی

---

[1]) هەمان سەرچاوە — ل ٧٤.

نوانـدنی بـاوكی لەهەنـدێ مەسـەلەدا لەبـەر بێدەسـەلاتیو بێتوانـایی نییـە بـەڵكو لەبـەر زیرەكیو داناییو تێگەیشتنیەتی لەدین[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل - ٧٥.

### ٤١٩. تێگەیشتن لەمەسەلەی قەزاو قەدەر

پێشەوای مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب بەگەشتێك دەرچوو بۆ وڵاتی شام هەندێ هاوەڵانی لەگەڵدا بوو، لەڕێگەدا بیستی نەخۆشی تاعوون لەو وڵاتەدا بڵاو بۆتەوەو خەڵکێکی زۆری کوشتووە، بڕیاریدا خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدان بگەڕێنەوەو نەچنە نێو ئەو شارە، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح پێی گوت: ئەی پێشەوای ئیمانداران لە قەدەری خوا رابکەین؟

پێشەوا عومەر گوتی: خۆزگە یەکێکی تر لەجیاتی تۆ ئەو قسەیەی بکردایە ئەبو عونبەیدە!!، بەڵێ لە قەدەری خوا ڕادەکەین بۆ قەدەری خوا، ئەی ئەبو عوبەیدە ئەگەر کۆمەڵە وشترێکت هەبێ دۆڵێکی فراوانت کەوتە بەرچاو لایەکی دۆڵەکە بەپیتو لاکەی تری وشك بێ، ئەگەر وشترەکانت لە شوێنە بەپیتەکە بلەوەڕێنی بەقەدەری خوا نییە؟ وە ئەگەر بیانبەی بۆ ئەو لایەی کە وشکەو گژوگیای نییە، هەر بەقەدەری خوا نییە؟[1].

### ٤٢٠. گۆرانی حەڕامە

یەکێ پرسیاری لە ئیبنو عەبباس کرد ڕات چییە دەربارەی گۆرانی حەلالە یان حەڕامە؟

ئیبنو عەبباس گوتی: من بە شتێك دەڵێم حەڕام لە قورئاندا حەڕام کرابێ.

پیاوەکە گوتی: ئەی حەلاڵە؟

ئیبنو عەبباس گوتی: من بەشتێك دەڵێم حەلاڵ لە قورئاندا حەلاڵ کرابێ، پاشان سەیری پیاوەکەی کرد پیاوەکە داما بوو، بۆیە پێی گوت: ئەگەر شتە هەقو باتیڵەکانیان هێنا لەڕۆژی دوایی گۆرانی لەلای کامیانە؟

پیاوەکە گوتی: لەلای شتە بەتاڵەکانە.

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٠.

ئیبن‌و عەبباس گوتی: دەی تەواو ئەوە خۆت فەتوات بۆخۆت دا[1].

## ٤٢١. بەڵگەی ڕاست‌و دروستی کۆدەنگی زانایان

پیاوێکی بەساڵا چوو هاتە مەجلیسی پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێ، پرسیاری کرد ئایا لە ئایینی خوادا چ شتێك دەبێتە بەڵگە؟

شافیعی گوتی: کتێبی خوا.

پیاوەکو گوتی چی تریش؟

شافیعی گوتی: سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پیاوەکە گوتی: چی تریش؟

شافیعی گوتی: ڕێکەوتنی ئۆممەت.

پیاوە پیرەکە گوتی: بەچ بەڵگەیەك دەڵێی ڕێککەوتنی ئوممەت؟

پێشەوا شافیعی بێدەنگ بوو نەیتوانی وەڵام بداتەوە، کابراکە گوتی: سێ ڕۆژت مۆڵەت دەدەم بۆ ئەوەی ئەو وەڵامەم بدەیتەوە، پێشەوا شافیعی چووەماڵەوە بەردەوام بوو لە گەڕان‌و سووڕان لەنێو کتێبەکاندا، دوای سێ ڕۆژ پیاوە بەساڵا چوەکە هاتەوە، پێشەوا شافیعی گوتی: لەوەتەی تۆ ڕۆیشتی سێ جار هەموو قورئانم خوێندۆتەوە تا خوای گەورە ڕێنموویی کردم بۆ ئەو ئایەتە کە دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾ النساء، واتە: هەر کەسێك دژایەتی سوننەتی پێغەمبەر خوا بکات دوای ئەوەی ڕێبازی دینداریی بۆ ڕوون بوویەوە، شوێنی ڕێچکەو ڕێبازی تر بکەوێت، نەك ڕێبازی ئیمانداران ئەوە وێڵی دەکەین بۆ ئەو ڕێچکەو ڕێبازەی کە خۆی هەڵیبژاردووە، پاشان دەیخەینە دۆزەخ‌و، بێگومان ئەوە سەرەنجامێکی زۆر ناخۆش‌و سامناکە[2].

---

[1] هەمان سەرچاوە – ل ٨٥.

[2] هەمان سەرچاوە- ل ٨٦.

## ٤٢٢. خوای ڕۆژیدەر ڕۆزی دەدا

پیرە ژنێك هاتە لای پێغەمبەر داوود (سەلامی خوای لێبێ) پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا پەروەردگاری تۆ ستەمكارە، یان دادپەروەرە؟

پێغەمبەر داوود فەرمووی: هاوار بە ماڵت ئەو پەروەردگارە خوایەكە هەرگیز ستەم ناكات، بزانم بۆ ئەو پرسیارە دەكەی؟

پیرەژنەكە گوتی: من بێوەژنێكم سێ كچم هەیە سەرپەرشتییان دەكەم، دوێنێ دوای ئەوەی برێكی باشم لە خوری ڕست لەناو چارۆگەیەكی گەورەم توند گرێدا، تا بیبەم بۆ بازاڕ بیفرۆشم وە بەپارەكەی خواردن بۆ كچەكانم دابین بكەم، لەناكاو باڵندەیەك هاتو چارۆگەكەی لێ بردم، منیش بەدەستی بەتاڵ گەڕامەوە بێ ئەوەی بتوانم بڕێك خواردنم بۆ ئەو كچە بێباوكانە ببەمەوە، لەو كاتەی ئەو پیرەژنە چیرۆكی خۆی بۆ پێغەمبەر داوود باس دەكرد لە دەرگای ماڵی پێغەمبەر داوود درا، كە دەرگاكەیان كردەوە میوانەكان (١٠) بازرگانی گەورە بوون هاتنە ژوورەوە هەریەكەیان كیسەیەكی بەدەستەوە بوو كیسەكان هەریەكەی (١٠٠) دیناری تێدابوو، دوای سەلام كردن گوتیان: ئەی پێغەمبەر داوود هاتووین ئەو پارانە دابەش بكەیت بەسەر ئەو كەسانەی كە شایستەن، پێغەمبەر داوود فەرمووی: چی وای لێكردوون بێن ئەو پارەیە ببەخشن؟

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هەمووومان لەنێو كەشتیەك بووین لەناكاو درزێكی گەورە لە كەشتییەكە پەیدا بوو هیچ شتێكمان پێ نەبوو ئەو درزە بگرین هێندەی نەمابوو هەمووومان نقوم بین، لەناكاو باڵندەیەك هات چارۆكەیەكی فڕێدایە نێومان كە كردمانەوە خوریەكی زۆری تێدابوو، ئێمەش درزەكەمان بە خوریەكە گرتو ڕزگارمان بوو، بۆیە لەنێو خۆماندا بڕیارماندا هەریەكەمان سەد دینار ببەخشێ لە پێناوی خوادا،ك شوكرانە بژێرییەك بەرامبەر ڕزگار بوونمان، پارەكەیان لەبەردەستی پێغەمبەر داوود دانا، پێغەمبەر داوودیش سەلامی خوای لێبێ سەیرێكی پیرەژنەكەی كردو فەرمووی: خوایەك لەنێو دەریاو

لە وشكانیدا بازرگانیت بۆ دەكات كەچی تۆش بە ستەمكاری دەزانیت !! پارەكەی دا بە پیرەژنەكەو فەرمووی برۆ بۆ كچەكانتی خەرج بكە [1].

## ٤٢٣. بێ ئاگایی لە فەرمانەكان و واتاكانی قورئانی بەرزو بەپێز

باوكێك بەهۆی كەمدەرامەتییەوە هاوسەرەكەیی و سێ منداڵەكەی جێ دەهێڵێ دەچێ بۆ وڵاتێكی تربۆ كار كردن، ئەو خانەوادەیە باوكەكەیان زۆر خۆشدەویست و ڕێزیان لێدەنا چونكە باوكێكی دڵسۆزو خەمخۆر بوو، دوای ماوەیەك لە ڕۆیشتنی نامەیەكی بۆ خانەوادەكەی نارد منداڵەكان لەبەر خۆشەویستی زۆریان بۆ باوكیان بەر لە خوێندنەوەو كردنەوەی نامەكە، نامەكەیان بۆن دەكردو دەیانگوت: ئەمە هی باوكمانە، ئەوا سەیری دەرەوەی نامەكەیان دەكردو لەنێو قوتوویەكی جوان پاراستیان، ناوە ناوە تۆزیان لەسەر قوتویەكە لادەداو لەشوێنی خۆی دایان دەناوە، هەر نامەیەكی باوكیان بۆ دەهات بەو شێوەیە هەڵیاندەگرت و نەیان دەخوێندەوە، بەم شێوەیە یەك نامەی باوكیان نەخوێندەوە، پاش چەند ساڵێك پیاوەكە گەڕایەوە ماڵ بەو هیوایەی خۆشی لە ماڵەكەیدا ببینێ كەچی بینی تەنها یەكێ لە كوڕەكانی لەماڵ مابوویەوە، بە كوڕەكەی گوت: ئەی كوا دایكت؟

گوتی: باوكە دایكم تووشی نەخۆشییەكی توند بوو، پارەمان نەبوو چارەسەری بكەین كۆچی دوایی كرد.

باوكەكە گوتی: بۆ ئەی نامەكانمتان نەكردەوە؟

من لەنامەكاندا برێكی زۆر پارەم بۆتان ناردبوو.

كوڕەكە گوتی: نەخێر نەمانكردەوە.

باوكی گوتی: ئەی كوا براكەت؟

كوڕەكەی گوتی: باوكە دوای مردنی دایكم كەس نەبوو ئامۆژگاری بكات تووشی برادەری خراپ بوو، ڕۆیی.

---

[1]) هەمان سەرچاوە ل ١٠٥.

باوکەکە گوتی: ئـێ خـۆ مـن لەنامەکـەدا ئامۆژگـارییم کردبـو، گوتبـووم بێتـە لام بەیەکەوە کار دەکەین.

کوڕەکەی گوتی: نامەکەمان نەکردەوە باوکە گیان.

باوکی گوتی: (لا حول ولا قوّة إلاّ بالله) ئەی کەوا خوشکەکەت؟

کوڕەکە گوتی: زەماوەندی لەگەڵ کوڕێك کرد و نامەشی بۆ ناردی بـۆ ئـەوەی بزانـێ تـۆ چی دەڵێی، بەلاّم ئێستا ژیانی زۆر سەختو ناخۆشە.

باوکەکە گوتی: ئێ خۆمن وەلاّمی نامەکەم دایەوە گوتم: شووی پێ مەکە چونکە ئەمـە کوڕێکی نەشیاوە.

کوڕەکە گوتی: باوکە گیان هیچ نامەیەکی تۆمان نەخوێندۆتـەوە، هـەموومان پاراستووە هەر ماچمان دەکردو لەشوێنی خۆی دامان دەنا.

بەڕاستی زۆر بیرم لە حاڵی ئەو خێزانە کردەوە کە بۆچی بـەو شـێوەیە هـەژار کـەوتنو پەرتـەوازە بـوون، هۆیەکـەی تـەنها ئـەوەبوو کـە نامـەکانی باوکیـان نەخوێنـدەوە، تـەنها بـە پیرۆزیان گرتو ماچیان دەرکردو خاوێنیان دەکردەوە، بـێ ئـەوەی کـار بـە قسەکانی باوکیـان بکەنو نامەکان بخوێننەوە بزانن چ فەرمانێکیان پێ دەکا.

پاشان تەماشای قورئـانی پـیرۆزم کـرد کـە چـۆن لـەنێو قوتـووی جوانو پـەڕۆکی سـەوز هـەڵگیراوەو لەسـەر ڕەففـەکانی مزگـەوتو ماڵـەکانمان دانـراوە، ئـای مـاڵی وێـرانم، مامەڵـەی ئێمە لەگەڵ پەیامی خوادا کە قورئانە، هـەمان ئـەو مامەڵەیەیـە کـە ئـەو منداڵانـەو دایکیـان بەرامبـەر پەیامەکـەی باوکیـان کردیـان، بۆیـە تـا کـار لـەکار نـەترازاوە بـا قورئانـەکانمان بکەینـەوە بـزانین خـوای بەبـەزەیی چـی بـۆ نـاردووین چ ئامۆژگاریـەکمان دەکـات، بـا بگەڕێینەوە لای خواو فەرمانەکانی بەهەند وەربگرین[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوە- ل ١١٥.

### ٤٢٤. ژیری لە کارەکاندا

ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: جارێکیان کەوتمە بیابانەوە زۆر تینووم بوو ئاویشم لا نەبوو، پیاوێك لە نزیکمەوە تێپەڕی مەشکەیەك ئاوی پێبوو، منیش داوای تۆزێك ئاوم لێکرد، بەڵام ئەو گوتی من بەپارە پێتی دەفرۆشم، سووربو لەسەر ئەوەی بە پێنج درهەم پێم بفرۆشێ، منیش تەنها پێنج درهەمم پێبوو ترسام لەوەی پارەم لێ ببڕێ، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر تینووم بو مەشکە ئاوەکەم لێی کڕی بە پێنج درهەم، ئاوم خواردەوە تا تینوێتیم شکا، پاش کەمێك پشوو نان و شتم دەرهێنا بۆ ئەوەی نان بخۆم، هەندێ ئاردم پێبوو، بەکابرام گوت: براله هەندێ ئاردت ناوێ، ئەویش گوتی: بۆنا بێنە با بیخۆین، کابرا هێندەی ئارد خوارد تینووی بوو، ئەمجارە ئەو بەمنی گوت: ئەرێ براله قومێك ئاوم پێنادەی؟

منیش گوتم: بۆ نا پەرداخی بە پێنج درهەم، کابرا لەبەر ئەوەی زۆری تینوو بوو، ناچار بوو پەرداخێك ئاوی لێکڕیم بە پێنج درهەم، منیش بوومە خاوەن ئاوەکەو پێنج درهەمەکەی خۆیشم بەو جۆرە وەرگرتەوە، ڕەگەزی ژیری لێرە شاردنەوەی نییەتو دروست کردنی دۆخی سەرکەوتنە[1].

### ٤٢٥. سکاڵا کردن لەلای خوا، شاردنەوەی نەخۆشی کاتێك نەخۆش بووی

ئەحنەفی کوڕی قەیس دەڵێ: ڕۆژێکیان ژانە سکێکی توندم گرت، چوومە خزمەت مامم و سکاڵای ژانە سکەکەم لای کرد، ئەویش لێم تووڕە بوو گوتی: ئەوەی تووشت دەبێت لەلایەن خواوە هەرگیز باسی مەکە، چونکە خەڵکی بەگشتی دوو چینن بەرامبەر بەو نەخۆشییەی تۆ تووشت بووە:

چینێکیان تۆیان خۆش دەوێ پێی دڵ تەنگ دەبن، چینەکەی تریان ڕقی لێتە پێی دڵ خۆش دەبێ، ئەی برازاکەم سکاڵا لای بەندەیەکی وەك خۆت مەکە لەکاتێکدا ئەگەر ئەو دەردەی تۆی تووش بێ هەمان ئازار دەیگرێ، بەڵکو ڕووی سکاڵات لەو کەسە بکە کە تووشی کردوویت چونکە هەر ئەو دەتوانێ چارەت بکات، ئەی برازاکەم سوێند بەخوا چل دانە ساڵە

---

[1]) هەمان سەرچاوە- ل ١٢٧.

یەکێك لە چاوەکانم کوێر بووە، هیچ شتێکی پێنابینم، کەچی تا ئێستا هاوسەرەکەشم نازانێ‌و لای کەس باسم نەکردوە[1].

### ٤٢٦. سەرسامییەکانی مرۆڤ خۆیەتی

ماوەیەك بوو شتێك دوو دڵی کردبووم بڕیارم دا بچمە لای کەسێکی دانا بۆ ئەوەی وەڵامم بداتەوە، چووم بۆ لای دانایەك لەلای دانیشتبووم چاوەڕوانی دەرفەتێك بووم بۆ ئەوەی پرسیارەکەی خۆمی لێبکەم، ماوەیەك دانیشتم، ئەو خۆی پێی گوتم: پرسیارەکەت بکە ڕۆڵە، منیش گوتم: چ شتێك لە مرۆڤدا لە هەموو شتێك سەرسام ترە؟

دانایەکە گوتی: مرۆڤەکان خۆیان.

گوتم: چۆن؟

گوتی: کاتێك کە منالّن لەو قۆناغەیان بێزار دەبن حەز دەکەن زوو گەورە بن، هەر کە گەورەش دەبن ئومێد دەکەن بگەڕێنەوە دۆخی منالّی، مرۆڤەکان لە پێناوی پارەدا تەندروستی خۆیان لەدەست دەدەن، دوایی هەمان پارەی کە بەدەستیان هێناوە بەڵکو زیاتریش لەخۆیان دەدەن بۆ ئەوەی چاك ببنەوە، ئەوەندە بیر لە داهاتوویان دەکەنەوە خۆیان تووشی دڵە ڕاوکێ دەکەن، کەچی ئێستای خۆیان لەبیر دەکەن، نە لە ئێستادا دەژین نە لەداهاتوویان دەژین، بەشێوەیەك ژیان بەسەر دەبەن وەك ئەوەی کە هەرگیز نامرن، کەچی هێندە سەیر دەمرن وەك ئەوەی هەرگیز نەژیابن[2].

### ٤٢٧. گۆڕستان ئەو شوێنەیە کە هەموو خەڵکی ڕووی تێدەکەن

کەسێك جاری یەکەمی بوو بڕیاری دا کە چێژ لەحەرام وەربگرێ، بۆ ئەو مەبەستە بڕیاریدا بە فڕۆکە سەفەر بکات بۆ یەکێ لەو شارانەی کە بەناوبانگە بەوەی حەرامی جۆراو جۆری لێدەکرێ، لە فڕۆکە دابەزی سواری تەکسیەك بوو چاوی لە شوفێری تەکسیەکە نووقاندو گوتی: بمبە بۆ ئەو شوێنەی کە هەموو خەڵك ڕووی تێدەکا، سەری بە

---

1) هەمان سەرچاوە- ل ١٤٣.

2) هەمان سەرچاوە- ل ١٤٠.

کوشنی تەکسیەکە کرد بۆ ئەوەی کەمێك بحەسێتەوە، بیری لە شەراب خواردنو شەوە سوورەکان دەکردەوە، بیری لەو ئافرەتانە دەکردەوە کە لە تەلەفزیۆنو لاپەڕەی ڕۆژنامەو سایتەکان بینی بووی، خەیاڵی لای ئەوەبوو چۆن کاتەکان لەو شتانەدا بەڕێ بکات، لەناکاو تەکسییەکە لەشوێنێك وەستا، ئەویش سەیرێکی دەورە بەری شوێنەکەی کرد بینی شوێنەکە زۆر سەیرو نامۆیە، ئەمە هەرگیز لەگەڵ مەبەستو داخوازییەکانی یەك ناگرێتەوە، ئەو بەخەیاڵی ئوتێلی چوار ئەستێرەو ئافرەتی شۆخو شەنگە، کەچی ئێستا لە شوێنێکی زۆر سەیر وەستاوە، بە شوفێرەکەی گوت: ئێمە لەکوێین؟

شوفێرەکە بە ساردیەکەوە وەڵامی دایەوە گوتی: لە گۆڕستانی شار.

بەتووڕەییەوە هاواری لەسەر کابرای شوفێر کردو پێی گوت: من دەمەوێ بمبەی بۆ شوێنی ڕابواردنو یانەکانی شەوانە، نەك گۆڕستان.

شوفێرەکەش گوتی: بەلاّم یانەی شەوانەو شوێنی ڕابواردن هەموو کەس رووی تێناکا، بەلاّم ئەو شوێنەی کە هەموو خەڵکی ڕووی تێدەکا بەبێ جیاوازی ئەوە گۆڕستانە، خۆت نەتگوت: بمبە ئەو شوێنەی کە خەڵکی هەموو ڕووی تێدەکەن[1].

### ٤٢٨. هەژارێکی بەختەوەرو شوکر

دەگێڕنەوە پاشایەکی ستەمکار تووشی نەخۆشیەکی کوشندە دەبێت، پزیشکەکان بۆیان چارسەر ناکرێ، یەکێ لە حەکیمەکان دەڵێ: کراسی کەسێکی بەختەوەر بێنن لەسەر شوێنی ئازارەکە دایبنێن، چاك دەبێتەوە، پاش گەڕانێکی زۆر لە کەسێك کە لەو پەڕی بەختەوەری دابێ، یەکێ لەوەزیرەکانی پاشا دەڕوات بەلای کوخێکدا، گوێی لە پیاوێك دەبێ لەبەر خۆیەوە دەیگوت: (الحمدلله)، ئەو پارچە نانەی ئەمڕۆ پەیدام کرد بەڕەنجی شانی خۆم ئەوا تێرم لێی خوارد، لەسەر پارچە حەسیرە شڕەکەشم پاڵ کەوتم، کێ هەیە لەو شارە لەمن بەختەوەرتر بێ،وەزیرەکە خۆشی کەوتە دڵیەوە فەرمانی کرد بە پاسەوانەکانی بچن

---

[1]) هەمان سەرچاوە- ل ١٥٣.

کراسی ئەو پیاوە وەربگرن، بەڵام کاتێ پاسەوانەکان خۆیان کرد بە کوخەکەوە بینیان پیاوە هەژارەکە پاڵ کەوتووەو کراسی لەبەردا نییە[1].

## ٤٢٩. منداڵێك عەشقی قورئان خوێندنە

کاکە (زانیار) لە پۆلی یەکی ناوەندییە، کوڕێکی زۆر عاقڵو ژیرەو زۆر هێمنو لەسەرخۆیە، لە مزگەوتیش یەکێك بوو لە قوتابیانی قورئان، شەوانە کە لە سەعی کردن دەبوویەوە دەستی دەکردە قورئانەکەیو بەدەنگێکی خۆش دەیخوێند، بەڵام باوكو دایکیو برا گەورەکەی ئەو قورئان خوێندنو نوێژ کردنەی زانیاریان پێ ناخۆش بوو، گلەییان لێ دەکرد پێیان دەگوت: زانیار ئێمە حەزناکەین خۆت بەو شتانەوە سەرقاڵ بکەی، زانیار قسەی بۆیان دەکرد بەڵام ئەوان گوێیان بە قسەکانی ئەو نەدەدا، زانیاریش بەبێ قورئان خوێندنو نوێژ کردن نەدەحەسایەوە، نوێژەکانی هەموو لە مزگەوت دەکرد، لایتێکی قەڵەمی کڕیبوو بۆ ئەوەی هەرکاتێ شەوانە کەلەگەڵ برا گەورەکەی لە ژوورێك دەنووستن براکەی پاش سعی کردن گڵۆپەکانی لێ دەکوژاندەوە بۆ ئەوەی قورئان نەخوێنێ، بەڵام کاکە زانیار لە ژێر بەتانیەکەیدا بەو لایتە قەڵەمە قورئانەکەی خۆی دەخوێند، بەردەوام دوعای خێرو هیدایەتی بۆ دایكو باوكو براکانی دەکرد[2].

## ٤٣٠. کەسی کاسب چاکترین کەسە لای خوای گەورە

دەڵێن پێغەمبەر عیسا سەلامی خوای لێبێ، لەگەڵ هاوڕێکانی دانیشتبوو، هاوڕێکانی لێیان پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ لە ئێمە چاکترە؟

فەرمووی: چاکترین کەس ئەوەیە کە لەڕەنجی شانی خۆی بخواو کاسبیی بکا[3].

---

[1]) کورتە چیرۆك بۆ منداڵان- ل١٥ .

[2]) کورتە چیرۆك بۆ منداڵان- ل ١٧.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣١.

### ٤٣١. خۆبەکەم زانین

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەر عیسا سەلامی خوای لێبێ بە کۆمەڵێك لە حەوارییەکانی فەرمووی: کارێکم پێتانە، گوتیان: هەرچی کارێکت هەبێ جێبەجێی دەکەین، پێغەمبەر عیسا هەستاو قاچی ئەوانی شۆری، حەوارییەکان بەم کارەی پێغەمبەر عیسا زۆر سەرسام بوون، هۆیەکەیان پرسی: ئەویش گوتی: من بەم شێوەیە تەوازوعو لەخۆبوردنم نواند بەرامبەر ئێوە، تاکو ئێوەش لەدوای من بەم شێوەیە بن لەگەڵ خەڵکی، چونکە بەلەخۆبوردن دانایی بڵاو دەبێتەوە، نەك بە لووت بەرزی، هەروەك چۆن لە دەشتاییدا کشتو کاڵ دەکرێ نەك لە شاخ[1].

### ٤٣٢. گاڵتە بە ئەهلی زانست مەکەن

دەگێڕنەوە لە مزگەوتێکدا چەند فەقێیەك خەریکی دەرس خوێندن دەبن، ڕۆژانە بە خوێندنی قورئانو سوننەتو دەرسی شەرعی خەریك دەبوون، لەگەڕەکەکەشدا کۆمەڵێك گەنجی بێشەرمو نەفامو دوور لەخوا دەبن، هەر خەریکی شتی بێ کەلكو گاڵتە کردنن، شەوێکیان لە ماڵی یەکێکیان دادەنیشن خەریکی بەزمو ڕەزمی خۆیانن، یەکێکیان تێدا دەبێ زۆر لارو لەوێرو جوێن فرۆشو دەم پیسە، دەڵێ: کوڕینە بۆ ئەم شەو هەندێ گاڵتە بەو فەقێیانە نەکەین، ئەوانیش دەڵێن: چۆن؟

دەڵێ: من خۆم نەخۆش دێخەمو بەتانیەکم پێدا بدەن، یەکێکتان بچێ پێیان بڵێ: بێن یاسینم لەسەر بخوێنن، کە یاسینەکەی تەواو کرد منیش لە بەتانیەکە هەڵدەستمەوەو گاڵتەی پێ دەکەین، ئەوانیش دەڵێن باشە، یەکێکیان دەچێ لە مزگەوتەکە فەقێیەك دەهێنێ، فەقێیەکە دێتە لایان ئەوانیش بەدرۆ نەخۆشەکەی پێشان دەدەن، ئەویش قورئانێکی لەگەڵ خۆی هێناوەو دەست دەکات بە خوێندنی سورەتی یاسین، ئەوانیش لە ژێرەوە سەیری یەکتری دەکەنو پێدەکەنن، کاتێ لە قورئان خوێندنەکەی دەبێتەوە دەڵێ: خوا شیفای بدا، کاتێ هاوڕێکانی لێفەکەی لەسەر لادەبەن بۆ ئەوەی هەستێ گاڵتە بە فەقێیەکە بکەن دەبینن گیانی تێدا نەماوەو مردووە، هەموویان چاویان ئەبڵەق دەبێو

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٣.

ترس‌و بیمێکی زۆر دایان دەگرێ دەست دەکەن بەگریان، ئیتر لەو ڕۆژەوە تەوبە دەکەن‌و واز لەگاڵتەو گەمە دەهێنن بە دینی خوا[1].

٤٣٣. خوێندنەوە

(کاربین) لە ژووری کتێبخانەکەیدا لەسەر قەنەفەیەك خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوو، ژوورەکەی زۆر بێدەنگ بوو، تەنانەت سەعاتی قەد دیوارەکەش چرکە چرکی هێواش کردبوویەوە، تا خوێندنەوەکە لە کاربین تێك نەچێ، ئەویش جار جار بە هێمنی پەڕی کتێبەکەی هەڵدەدایەوە، لەو کاتەدا کاوەی برای لە دەرگای ژوورەکەی داو داوای مۆڵەتی کرد، بە ئەدەبەوە هاتە ژوورەوە گوتی: کاکە گیان سیروانی هاوڕێت هاتووە بۆ لات لە دەرەوە چاوەڕێت دەکا، کاربین لەسەرخۆ کتێبەکەی دانا چووە دەرەوە چاك‌و چۆنی لەگەڵ سیروان کرد، سیروان گوتی: نایەی بچین بۆ لای مەریوان، بۆخۆمان دەمەتەقێ بکەین، کاربین گوتی: ئەی دوێنێ لەلای نەبووین؟

سیروان گوتی: ئەی بێئیش چی بکەین؟

کاربین گوتی: نەخێر کاکە سیروان بێ ئیش نین، لە کتێبخانەکەتدا کتێب بخوێنەوە با بێئیش نەبی[2].

٤٣٤. کاربەدەستێکی لە خوا ترس

حوزەیفەی کوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێ کرا بە والی لەشاری مەدائین، حەزەیفە بەرەو مەدائین کەوتە ڕێ سواری گوێدرێژەکەی بوو هەندێ خواردنی لە چارۆکەیەکدا هەڵگرت، ئەو ڕێگایە دوورو درێژەی بڕی خەڵکی مەدائین چوون بۆ پێشوازی، کە بەم شێوەیان بینی زۆر بەزەییان پیادا هاتەوە، بە حوزەیفەیان گوت: چۆن مووچەت بدەینێ؟

ئەویش گوتی: تەنها خواردن بەخۆم‌و ئالیك بە گوێدرێژەکەم بدەن، حوزەیفە بۆ ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیەی کرد، کاتێ گەڕایەوە بۆ مەدینە بەهەمان شێوە

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٧.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٨.

سواری گوێدرێژەکەی بووبو لەگەڵ هەندێ خواردن بە چارۆکەکەیەوە گرێی دابوو، هاوەڵان کاتێ حوزەیفەیان بینی بەم شێوەیە، زیاتر گەورەیی حوزەیفەیان بۆ دەرکەوت[1].

### ٤٣٥. خۆشەویستی هاوەڵان بۆ بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەخاوەتی فاطمە خوا لێی رازی بێ

لە کاتێکدا عەمماری کوڕی یاسرو هەندێ لە هاوەڵانی تر خوا لێیان رازی بێ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوون، کابرایەکی پیری داماو هاتە لایان‌و سواڵی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی لا نەبوو پێی بدا، لەبەر ئەوە بە هەژارەکەی گوت: لە دەرگای ماڵی فاتیمەی کچی بدات، کابرای هەژار لە دەرگای ماڵی فاتیمەی دا گوتی: ئەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێکی پیری هەژارم هاتووم تاوەکو یارمەتیم بدەی، ئەویش هیچی نەبوو لە ماڵەکەیدا پێی بدا، لەبەر ئەوە ملوانکەکەی ملی خۆی پێدا، هەژارەکە ملوانکەکەی وەرگرت‌و دوعای خێری بۆ کرد، کاتێ عەمماری کوڕی یاسر پیاوە هەژارەکەی بینییەوە بینی ملوانکەیەکی لەدەستە، یەکسەر زانی فاتیمە ئەو ملوانکەیەی پێداوە لەبەر ئەوەی هیچی نەبووە لەماڵەکەیدا پێی ببەخشێ، بەمەش زۆر نارەحەت بوو، دڵی ئازاری پێگەیشت، بۆیە چووە لای پیاوە پیرەکەو پێی گوت: ئەو ملوانکەیە دەفرۆشی؟

کابرای هەژار: بەڵێ.

عەممار: نرخەکەی چەندە؟

کابرای هەژار: بای ئەوەندەی بەشی خواردن‌و هەندێ کەل‌و پەلم بکات.

عەممار دوو قاتی ئەو پارەیەی پێدا گوتی: برۆ ئەو ملوانکەیەی بۆ ببەوە، ئەویش چوو ملوانکەکەی بۆ فاتیمە بردەوە، لەخۆشی ئەو پارەیەی وەرگرتبوو لەبەرامبەر ملوانکەکە لەبەر خۆیەوە دەیگوت: سەیرکە بەرەکەتی ئەو ملوانکەیە چەند زۆر بوو، بووە هۆی تێر بوون‌و بەرگ‌و پۆشاک کردنم[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٩.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٧٩- ٨٠.

### ٤٣٦. لەخۆ بوردەیی خەلیفەی مسوڵمانان

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب ڕۆژێك لەگەڵ خزمەتکارەکەی کە ناوی قەنبەر بوو دەچن بۆ بازاڕ، بۆ ئەوەی دوو پارچە جلك بکڕن بۆ هەردووکیان، دەچن بۆ دوکانێك بە دوکاندارەکە دەڵێن: جلکت هەیە؟

دوکاندارەکە دەڵێ: ئەی ئەمیری ئیمانداران هەرچی تۆ بتەوێ هەمانە، پێشەوا عەلی زانی کە دوکاندارەکە دەیناسێ بۆیە هیچی لێنەکڕیو ڕۆیی، لە ترسی ئەوەی نەوەك قازانجی لێ وەرنەگرێ، چوونە دوکانێکی تر منداڵێکی لەسەر بوو، دوو دەستە جلیان لێ کڕی یەکێکیان بە دوو درهەم ئەوی تریان بەسێ درهەم، ئەو منداڵە کوڕی دوکاندارەکەی یەکەم بوو، پاش ئەوەی باوکی زانی کوڕەکەی دوو دەستە جلی داوەتە خەلیفەو پارەی لێوەرگرتووە، باوکی بەپەلە خۆی گەیاندە خەلیفەو گوتی: کوڕەکەی من دوو درهەمی زیاتری لێ وەرگرتووی، دەبێ بۆت بگێڕمەوە، خەلیفە گوتی: من بە ئارەزووی خۆم لێم کڕیوەو پێم باش بووە، دوو درهەمەکە هی خۆیەتی بۆ خۆی، پاشان خەلیفە جلە گرانبەهاکەی دایە قەنبەرو ئەوەی تریانی بۆخۆی گێڕایەوە، قەنبەر گوتی: با گرانبەهاکە بۆ تۆبێ ئەی پێشەوای ئیمانداران چونکە تۆ دەچییە ناو خەڵكو بۆ ووتاری هەینی دەوەستی، خەلیفە وەڵامی دایەوەو گوتی: بەڵام تۆ گەنجی گەنج حەز لە شتی تازەو چاك دەکات، من شەرم لەخوا دەکەم فەزڵی خۆم بدەم بەسەرتا، گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ( لەوەی خۆتان دەیپۆشن بۆ ئەوانیش بکەن، لەوەی کە خۆتان دەیخۆن با ئەوانیش لەوە بخۆن)[1].

### ٤٣٧. تووڕە نەبوون سوودت پێ دەگەیەنێ

پیاوێك لە سەفەر گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی گوێی لە دەنگە دەنگێك بوو پرسیاری کرد ئەمە چییە؟

گوتیان هەندێ لە منداڵانی هۆزەکەمان پارەیان لە هۆزێکی تر دزیوە ئەوانیش تووڕە بوون، ئەویش کە گوێی لەو قسانە بوو یەکسەر دەستی دایە شمشێرەکەیو لەگەڵ کۆمەڵێك

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٨.

لە پیاوەکانی هۆزەکەی، ویستیان بچنە سەر هۆزەکەی ترو شەڕیان لەگەڵ بکەن، بەڵام ئەو پیاوە بیری لەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوە کە دەفەرمووێ: (تووڕە مەبە!)، بۆیە شمشێرەکەی داناو ڕووی کردە پیاوەکانی هۆزەکەی‌و گوتی: دەچم بۆ لای سەرۆك هۆزەکەی ترو لەگەڵیان ڕێك دەکەوم، بۆیە چووە لای‌و زۆر بە ژیرانە پێی گوت: براکەی خۆم چەندە زیانتان پێ گەییوە ئێمە بۆتان دەبژێرین، من هاتووم لە جیاتی هەموو هۆزەکەم داوای لێبوردنتان لێ دەکەم پێویست بە شەڕو کوشتار ناکا، کاتێ سەرۆك هۆزەکەی تر ئەو قسانەی بیست زۆر هێمن بوویەوە پیاوەتی‌و غیرەت گرتی‌و گوتی: مادام وایە ئێمەش لە هەقی خۆمان خۆش بووین.

هەردوو خۆزەکە ئاشت بوونەوەو هیچ شتێك لە نێوانیان نەما بە جێبەجێ کردنی یەك فەرموودەی سەروەرمان ﷺ کە دەفەرمووێ: {لا تَغْضَبْ}[1].

### ٤٣٨. دڵسۆزی بۆ مسوڵمانان

مسوڵمانێك لەگەڵ خێزانەکەیدا لەماڵەوە دانیشتبوون، لەناکاو لەدەرگا درا، دەرگایان کردەوە هاوڕێیەکی پیاوەکە بوو، هاتبوو بۆ داوای (٤٠٠) درهەم بەقەرز، ئەویش پارەکەی پێدا، پاشان خاوەن ماڵەکە دەستی کرد بە گریان، ژنەکەی پێی گوت: کە پێت ناخۆشە بۆچی پارەکەت دایە، مێردەکەی گوتی: من لەبەر ئەوە ناگریم کە پارەم پێی داوە، لەبەر ئەوە دەگریم لەحاڵیم نەپرسیوە نەمزانیوە پێویستی بەپارەیە، بۆ ئەوە دەگریم موحتاجی وای لێکردووە لەدەرگای من بداتو داوای پارە بکات، دەبوایە من بزانم حاڵی چۆنە بەر لەوەی ئەو داوام لێبکا[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٨.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٠١.

### ٤٣٩. هۆکاری زیرەکی قوتابی

قوتابییەك چووە لای پیاوچاکێك‌و پێی گوت: دوعام بۆ بکە بەڵکو خوای گەورە یارمەتیم بدا لە وانەکانم دەربچم، پیاو چاکەکە گوتی: ڕۆڵە گیان خوای گەورە توانای هەوڵ دانی پێداوین دەبێ خۆمان وانەکانمان بخوێنینەوەو لەبەریان بکەین، ئەمجا داوا لەخوا بکەین بەرەکەتی بخاتێ، پێویستە بزانین چۆن داوا لەخوای گەورە دەکەین دەبێ سەرەتا ئەو توانایەی خوای پەروەردگار پێ داوین بەکاری بهێنین‌و هەوڵ بدەین، پاشان داوای یارمەتی‌و سەرکەوتن لە خوا بکەین[1].

### ٤٤٠. ئیسراف نەکردن

جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە شوێنێکدا دەڕۆیی یەکێ لە هاوەڵانی بینی خەریکی دەست نوێژ گرتن بوو، ئاوێکی زۆری سەرف دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: سەعد بۆ ئەوەندە ئاو سەرف دەکەی؟

سەعدیش گوتی: ئایا بۆ دەستنوێژیش هەر ئیسرافە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ دەبێ دەستی پێوە بگریت تەنانەت ئەگەر لەسەر ڕووبارێکیش بوویت[2].

### ٤٤١. ترسانی ئیماندار لە خواردنی حەرام

خەلیفەی مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ لە ڕۆژی پێش جەژندا ملوانکەیەکی لە ملی کچەکەی خۆی دەبینێ لێی دەپرسێ ئەو ملوانکەیەت لەکوێ بوو ئەی کچی خۆم؟

کچەکەی گوتی: لە خەزێنەی مسوڵمانان وەرمگرتووە تا جەژنی پێ بەسەر بەرم، دوایی بۆیان دەگێڕمەوە، پێشەوا عومەر ئەو کارەی پێ ناخۆش بوو ناردی بەشوێن

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١١١.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١٣٢.

خەزنەداری مسوڵمانان بۆ ئەوەی لێی بپرسێ ئایا ئەو ملوانکەیەی ناردووە بۆ منداڵەکەی خەلیفە؟

ئەویش گوتی: بەڵێ من ناردوومە بۆی.

پێشەوا عومەر گوتی: ئایا پرست بە هەموو مسوڵمانان کردووە؟

گوتی: نەخێر.

پێشەوا عومەر پێی گوت: تۆ ماڵت نەدۆزیوەتەوە حەرامی تێبکەی ماڵی من نەبێ، ئنجا رووی کردە کچەکەی‌و پێی گوت: ئەی جگەر گۆشەکەم نیازت وایە بەماڵی مسوڵمانان شانازی بکەیت بەسەر کچی مسوڵمانانەوە؟

بۆیە ملوانکەکەی لێ سەندەوەو ناردیەوە خەزێنەی دەوڵەت[1].

## ٤٤٢. یەکەم کەس دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشکرا قورئانی خوێند

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود خوا لێی ڕازی بێ یەکەمین مسوڵمانە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بە ئاشکرا خوێندووە، ڕۆژێکیان لە کاتی چێشتەنگاو دەچێ بۆ کەعبەو لە نزیک مەقامی ئیبراهیم زۆر بەبوێرانە دەست دەکات بە قورئان خوێندن‌و سوورەتی (الرحمن)ی خوێند، کافرانی ناو کەعبەش دەستیان کرد بە لێدانی‌و زۆر ئەزیەتیان دا، بەڵام عەبدوڵلا بەهیچ شێوەیەك وازی نەهێنا لە قورئان خوێندنەکەی تا لەهۆش خۆی چوو[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١٣٧.

[2]) زنجیرە چیرۆکی هاوەڵان- ل ٩٠.

### ٤٤٣. قورئان دەستكاری ناكرێ

پیاوێكی گاوری بلیمەتو زیرەك دەچێتە كۆشكەكەی خەلیفە مەئموون، خەلیفە مەئموون زۆر پێی سەرسام بوو، بەو پیاوە گاورەی گوت: بۆچی مسوڵمان نابی؟

پیاوە گاورەكە هیچ وەڵامێكی خەلیفەی نەدایەوە، دوای ساڵێك هاتەوە لای خەلیفەو دەستی هێنا بۆ نێو دەستی خەلیفەو گوتی: (أشهد أن لا إلـه إلاّ الله وأشهد أن محمدا رسول الله)، مەئموون پرسی ساڵی پار داوام لێكردی مسوڵمان نەبوویت هیچ وەڵامت نەدامەوە، ئێستا بۆچی هاتیی بێ ئەوەی پێت بڵێم مسوڵمان دەبیت؟

كابرای گاور گوتی: ئەی خەلیفەی مسوڵمانان قسەكەت زۆر كاری تێكردم، لای تۆ چوومە دەر بڕیارم دا بەدوای دینی ڕاستەقینە بگەڕێم نوسخەیەكم لە تەورات هێنا، چەند نوسخەیەكی ترم لەسەر نووسیەوە بە ئارەزووی خۆم شتم بۆ كەمو زیاد كرد، شەممەیەك چووم بۆ بەردەرگای مەعبەدێكی جوولەكە، كاتێ لە نوێژەكەیان بوونەوە، نوسخەكانیان لێ كڕیم بە نرخێكی زۆر گران، پاشان چووم چەند نوسخەیەكم لە ئینجیل نووسیەوە بە ئارەزووی خۆم دەستكاریم كرد، یەك شەممەیەك دوای نوێژی قوداس لەبەر دەرگای كڵێسایەك فرۆشتم بە نرخێكی زۆر گران، پاشان هەستام چوار تا پێنج نوسخەم لە قورئان نووسیەوە هیچ شتێكی خۆم نەخستە سەری بەڵام چەند ئایەتێكم لێی لابرد، ڕۆژێكی هەینی چوومە بەر دەركی مزگەوتێك، گوتم ئەم قورئانانە دەست نووسەو زۆر كۆنە، چەند كەسێك لە مسوڵمانان بەدەورم كۆبوونەوە سەیریان كردو پەڕەكانیان هەڵدایەوە، یەكسەر قۆڵیان گرتم بردمیانە پەنایەكەوە تێرو پڕیان لێدام نوسخەكانیان بەبەرچاومەوە سووتاند، گوتیان: جارێكی تر كاری وا بكەیت دەتدەین بە دادگا، منیش گوتم میللەتێك خەڵكە ڕەشۆكیەكەی بەم جۆرە قورئانی لەبەر بێ و بەرگریی لێبكا، بەڕاستی ئەوە دینی خوایە[1].

### ٤٤٤. مردن لەگەڵ بیستنی قورئان

---

[1]) میحراب- ل ٣٥٦.

ئیسماعیلی کوڕی نەصری عەبدی بۆمان دەگێڕێتەوە لە مەجلیسی صالحی مەڕڕی کەسێك بانگی کرد ئەی صالح قورئانمان بۆ بخوێنە، ئەویش ئەو ئایەتەی خوێند کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الفرقان. ئەبو جەهەت لە مەجلیسەکەدا بوو گوتی: دووبارە بیخوێنەوە، صالحیش دووبارە ئایەتەکەی خوێندەوە، کە لە خوێندنەوەکەی ئایەتەکە بوویەوە ئەبو جەهەت وەفاتی کرد[1].

## ڕێزگرتن لە ڕیش سپی

جارێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەچێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بینی وا دەگری، ئەویش لە گریانەکەی پرسی؟ ئەویش فەرمووی: کەمێك پێش ئێستا جوبریل هاتە لامو پێی فەرمووم: خوای پەروەردگار سەلامت لێ دەکا، دەفەرمووێ: پێی ڕابگەیەنە من شەرم دەکەم لەوەی ڕیشی سپی ئازار بدەم، جا ئەی عومەر نازانم چۆن کەسێك ڕیشی سپی دەبێ شەرم لەخوای گەورە ناکا[2].

## ٤٤٦. گەورەیی کارکردن و کرێکار

دەگێڕنەوە جارێك کۆمەڵە کەسێك هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکیان عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فلانە کەس بەردەوام خەریکی نوێژو ڕۆژوو زیکرو عیبادەتی خوایە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی کێ نان و ئاوێکی بۆ پەیدا دەکا؟

خەڵکەکە گوتیان هەموومان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەمووتان لەو باشترن[3].

---

[1]) روائع حكايات أهل القرآن- ص١٠١.

[2]) ئامۆژگاری لە (١٠٠٠) چیرۆکی ڕاستەقینە- ل ٥٦.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٧.

### ٤٤٧. قەرزدان بە خەڵك و لێخۆشبوون لەوەرگرتنەوەی

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو لەپێش ئێوەدا پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو قەرزی دەدا بەخەڵکی مۆڵەتی بۆ دادەنا بۆ وەرگرتنەوەی، بەڵام هەر کاتێك مۆڵەتەکە تەواو بووایە کابرای قەرزار نەیبوایە بیداتەوە ئەویش دەیبووری و چاو پۆشی لێدەکرد، کاتێ ئەو پیاوە دەوڵەمەندە وەفاتی کرد، خوای پەروەردگار پێی فەرموو: فلان کەس تۆ لە دونیادا لە بەندەکانی من خۆش دەبووی ئەوە منیش لێت خۆش بووم و عەفووم کردی[1].

### ٤٤٨. نیشانەو سیفاتەکانی بڕوادار

عطاء لە ئیبن عەبباسەوە بۆمان دەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆمەڵێك لە هاوەڵان تێپەڕی خوا لێیان ڕازی بێ، پێشەوا عومەریشیان تێدا بوو، پێی فەرموون ئایا ئێوە بەڕاستی خاوەن باوەڕن؟

هیچ کەسێکیان وەڵامی نەدایەوە پێشەوا عومەر گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی نیشانەی بڕواتان چییە؟

پێشەوا عومەر گوتی: لەکاتی خۆشیدا سوپاسی خوا دەکەین و لەکاتی ناخۆشیشدا ئارام دەگرین، ڕازین بە قەزاو قەدەری خوا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی بڕوادارن[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٦.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦.

### ٤٤٩. داواکاریەکانی نەخۆش با جێبەجێ بکرێ

جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لای نەخۆشێك چوو لێی پرسی: ئارەزووی چی دەکەی؟

نەخۆشەکە گوتی: حەز بە نانی گەنم دەکەم.

ئەویش فەرمووی: هەرکەسێ نانی گەنمی هەیە بابۆی بێنێ، پاشان فەرمووی: هەر کاتێك نەخۆشەکانتان ئارەزووی خواردنێکی کرد بۆی پەیدا بکەن[1].

### ٤٥٠. شەراب نابێتە دەرمان

دەگێڕنەوە جارێك پزیشکێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: دەمەوێ ئارەق بکەمە نێو دەرمانی نەخۆشان بۆ چارەسەری کردنیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئارەق دەرمان نییە بەڵکو دەردە[2].

### ٤٥١. شەوان چرایماڵەکانتان بکوژێننەوە

دەگێڕنەوە شەوێکیان ماڵێك لە شاری مەدینە ئاگری گرت، کاتێ هەواڵەکە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت فەرموی: بەڕاستی ئاگر دوژمنە جا هەرکاتێ ویستتان بخەون بیکوژێننەوە[3].

### ٤٥٢. چوونە بەهەشت ئاسان نییە

جارێکیان شێخ بایەزیدی بەستامی بۆ گەرماوێك دەچێ بەبێ ئەوەی نۆرە بگرێ، کابرای گەرماوچی دەڵێ: کاکە چوونە ژوورەوە بەنۆرەیە، بایەزید دەڵێ: ئەی هاوار گەرماو بەنۆرە بێ ئەی چۆن بەهەشت بەبێ نۆرە دەبێ[4].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٨.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٩.

[4]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٠.

### ٤٥٣. خاکی بوونی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

دەگێڕنەوە جارێك لە مەجلیسەکەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز چراکەیان لێ کز دەبێ ئەویش خۆی هەڵدەستێ زیادی دەکاتو دێتەوە شوێنی خۆی دادەنیشێ، دەڵێن: قوربان لەبەر چی خۆت هەستای بە ئێمەت نەگوت؟

ئەویش دەڵێ: تیشکی چرا کەم بکەم یان زیادی بکەم هەر عومەرەکەی جارانم.

### ٤٥٤. سواڵکەری درۆزن

جارێکیان سواڵکەرێك هاتە لای پێشەوا عومەرو کۆمەڵێ لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، گوتی: ئیمشەو کامەتان لای خۆی دەمحەوێنێتەوە؟

پێشەوا عومەر گوتی: من، بەڵام پێم بڵێ: ئەو تورەگەیەکەت چی تێدایە؟

سواڵکەرەکە گوتی: خۆراکی تێدایە.

پێشەوا عومەر لێی وەرگرتو هەمووی لە پێش ووڵاخی زەکات ڕووکرد گوتی: تۆ بازرگانی نەك هەژار!![1].

### ٤٥٥. بێباوەڕی پیسترین نەخۆشییە

جارێکیان پێغەمبەر عیسا سەلامی خوای لێبێ بەلای پیاوێك تێپەڕی پیاوەکە کوێرو بەڵەك و پەککەوتە بوو، لەبەر خۆیەوە هەر دەیگوت: ئەی پەروەردگار زۆر سوپاس کە منت لە نەخۆشیەك ڕزگار کردووە زۆر کەس پێی گیرۆدە بووە، پێغەمبەر عیسا پێی فەرموو: بۆچی لەتۆ نەخۆشتر هەیە؟

کابرا گوتی: بەڵێ، کەسی بێ باوەڕ بێ باوەڕییەکەی پیسترین نەخۆشییە.

پێغەمبەر عیسا فەرموی: ڕاست دەکەی[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٢٢.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨.

### ٤٥٦. ئەدەب

جارێك لای شێخ بایەزید باسی پیاوێكیان كرد كە چەندە خوا پەرستە، بایەزیدیش چوو بۆ لای، بایەزید بەر نزیك پیاوەكە بوویەوە بەر لەوەی بچێتە لای گەڕایەوە، گوتیان بۆچی گەڕایەوە؟

گوتی: بینیم تفی بەرەو ڕووی قیبلە كرد، ئەگەر پیاوێكی باش بووایە ئەدەبی بەرامبەر قیبلە دەبوو[1].

### ٤٥٧. ئیماندارانی ڕاستەقینە خوای گەورە خۆی بەرگرییان لێ دەكا

دەگێڕنەوە جارێك زەیدی كوڕی حاریسە لەگەڵ پیاوێكی مونافیق دەردەچێت، دەگەنە چۆڵییەك مونافیقەكە دەستو پێی زەید دەبەستێو پێی دەڵێ: دەتكوژم، دەنگێك دێ دەڵێ: مەیكوژە، پاشی دەنگەكە مونافیقەكە دیسان دەڵێ: دەتكوژم، دووبارە دەنگێك دێ دەڵێ: مەیكوژە، سێبارە مونافیقەكە دەیەوێ بیكوژێ، بەلام یەكێك حەربەیەكی لێدەداو دەیكوژێ، دەستو پێی زەید دەكاتەوە، پێی دەڵێ: من جوبریلم، لە جاری یەكەم لە سیدرە بووم، لەجاری دووەم، لە ئاسمانی دونیا بووم، لەجاری سێهەم گەیشتمە لات[2].

### ٤٥٨. ڕێزی پیاوچاكان لای گیانداران

سەلمانی فارسی خوا لێی ڕازی بێ جارێكیان میوانی هات، سەلمان میوانەكەی لەگەڵ خۆی بردە دەشت، ڕووی لە باڵندەو ئاسكەكانی ناوچەكە كرد، ئەوانیش هاتن بۆلایو لەبەر دەستی وەستان، بۆ ئەوەی سەری یەكێكیان ببڕێ بۆ میوانەكەی، كابرای میوان گوتی: (سبحان الله)!. سەلمان گوتی: بۆچی پێت سەیرە، دیوتە یەكێك خواناس بێو خوا لەگەڵی نەبێ[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٠.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٣٠.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو – ل٣١.

٤٥٩. گەورەیی (الله أکبر)ی نوێژ دابەستان

جارێك دز (٤٠٠) حوشتری پێشەوا ئەبو بەکریان دزی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی ئەبو بەکر بۆچی وا خەمباری وامزانی (الله أکبر)ی نوێژت لەدەست چووە، پێشەوا ئەبو بەکر گوتی: بۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە سەختە تەکبیری نوێژت لە کیش بچێ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ پڕ بەزەوییت لەکیس بچێ ئەوەندە سەخت نییە[1].

٤٦٠. گەورەیی (دە) ڕۆژی حاجیان

لەکاتی (١٠) ڕۆژە پیرۆزەکە ڕێبوارێ لەنێو گۆڕستان دەبێ، لەنێو گۆڕێك ڕووناکی دەردەچێ، دەنگێك دەبیستێ ئەگەر دەتەوێ گۆڕەکەت ئاوا ڕووناك بێ،ك ئەو پیاوە لەو (١٠) ڕۆژە بە ڕۆژووبە[2].

٤٦١. گەورەیی ڕۆژی عەرەفە

دەگێڕنەوە جارێك پیاو چاکێك دۆستێکی خۆی لەخەو بینی، (١٠) ڕووناکی لەپێش بوو، بەڵام خۆی دوو ڕووناکی لەپێش بوو، پرسیاری کرد بۆچی ئەو (١٠) ڕووناکی لەپێشەو کەچی من (٢) ڕووناکیم لە پێشە؟، گوتیان: لەبەر ئەوەی ئەو دە ساڵە لە ڕۆژی عەرەفەدا بەڕۆژووە، بەڵام تۆ تەنها دووساڵە لەم ڕۆژەدا بەڕۆژووی[3].

٤٦٢. گەورەیی تۆزو غوباری جیهاد کردن

یەکێ لە جەنگاوەرە مسوڵمانەکان هەرچەند جارەی لە جیهاد کردن دەگەڕایەوە، خۆڵو تۆزی جلو بەرگەکەی دادەوەشاندو هەڵیدەگرت تا لەکۆتاییدا خشتێکی بچووکی پێ دروست کردسیەتی کرد هەرکاتی وەفاتی کرد ئەو خشتە بخەنە ژێر سەری، پاش وەفات

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٢.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٣٣.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٣٣.

کردنەکەی وەسیەتەکەیان بۆ جێبەجێ کرد، لە خەودا بینیان گوتی: بەبەرەکەتی ئەو خشتە بچووکە خوای گەورە لێم خۆش بوو[1].

### ٤٦٣. زیندووان وەکو مردووان نازانن خێری نوێژ کردن چەندە

جارێك پیاوێك بەلای گۆڕستانێك تێپەڕی دوو ڕکعات نوێژی کردو پاڵی دایەوە، یەکێك لە مردووەکانی گۆڕستانەکە لە خەودا پێی گوت: تۆ دەتوانی زۆر نوێژان بکەی بەلاّم وەك ئێمە لە خێرەکەی ناگەی، لەگەڵ ئەوەی ئێمە لە خێرەکەی دەگەین بەلاّم ناتوانین ئەنجامی بدەین[2].

### ٤٦٤. گەورەیی تاوانی جوێندان بەدایك

جارێك پیاوێك بەلای گۆڕێکدا تێپەڕی گۆڕەکە شەق بوو بو، پیاوێکی لێهاتە دەر سەری پیاوەکە سەری کەر بوو، (٣) جار زەڕڕی، ئەو پیاوەش کە بەوێدا تێپەڕی بوو پرسیاری لە خەڵکی ناوچەکە کرد ئەو پیاوە بۆچی وای لێهاتووە؟

گوتیان: ئەو پیاوە پیاوێکی ئارەق خۆر بوو، دایکی هەموو ڕۆژ پێی دەگوت: ئارەق مەخۆ، ئەویش دەیگوت: بزەڕە[3].

### ٤٦٥. صیلەی ڕەحم تەمەن درێژ دەکات

دەگێڕنەوە دوو پیاو لای پێغەمبەر داوود سەلامی خوای لێبێ دانیشتبوون، فریشتەی گیان کێشان لەوێ بوو بە یەکێك لە پیاوەکانی گوت: ئەو پیاوە تەمەنی (٧) ڕۆژ ماوە، لەپاش حەوت ڕۆژەکە کابرا نەمرد، پێغەمبەر داوود لە هۆکارەکەی پرسی، فریشتەی گیان کێشانیش گوتی: لەبەر ئەوەی سەردانی خزمێکی کرد تەمەنی (١٠)ساڵ زیاتر کرد[4].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٣٤.

[2]) هەمان سەرچاەی پێشوو- ل٣٤.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٥.

[4]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٣٥.

### ٤٦٦.سۆزی کوڕو باوك بۆ یەکتر

لەسەردەمی پێغەمبەر سولەیمان سەلامی خوای لێبێ، کوڕێك ئارەقی دەخواردەوە باوکەکە خۆی لێ تووڕە کرد، ئەویش چاوی باوکی دەرهێنا، کە لە سەرخۆشییەکەی بەئاگا هاتەوە، لە خەمان دەستی خۆی لێکردەوە، پاشان هەردووکیان چوونە لای سولەیمان، پێغەمبەر سولەیمانیش سەلامی خوای لێبێ دوعای بۆکردن‌و فەرمووی خوایە لەبەر سۆزی ئەو باوکە بۆ کوڕەکەی کە دەڵێ: ئەگەر هەزار چاوم هەبوایە هەمووی دەرهێنابا، بەس دەستی خۆی لێنەکردبایە،لەبەر خۆشەویستی ئەو کوڕە بۆ باوکی کە دەستی خۆی قوت کرد لەبەر باوکی، چاکیان بکەوە، یەکسەر چاك بوونەوە[1].

### ٤٦٧. پاداشتی سەلام کردن

دەگێڕنەوە هەموو جارێك پێشەوا ئەبو بەکرو عەلی بەیەك دەگەیشتن پێشەوا عەلی سەلامی لە پێشەوا ئەبو بەکر دەکرد، جارێك پێشەوا عەلی سەلامی لێنەکرد، ئەبو بەکر ئەمەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگەیاند، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێشەوا عەلی فەرموو: بۆ سەلامت لێی نەکروە؟

پێشەوا عەلی گوتی: شەوێکیان لە خەونمدا قەسرێکیان پێشان دام گوتم ئەو قەسرە هی کێیە؟ گوتیان: ئەمە بۆ یەکێکە سەلام لە برای مسوڵمانی خۆی بکات، منیش پێم خۆش بوو ئەو قەسرە بۆ ئەبو بەکر بێ[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٣٤.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ٣٦.

### ٤٦٨. پاشەکەوتی ماڵ

جارێکیان پێغەمبەر سولەیمان سەلامی خوای لێبێ مێروولەیەکی لە نێو شوشەیەك کرد، لێی پرسی ساڵانە خۆراکت چەند پێویستە؟

گوتی: دەنکە گەنمێك، کەچی کە ساڵ سوڕایەوە نیو دەنکە گەنمی خواردبوو، پێغەمبەر سولەیمان پێی فەرموو بۆچی گوتت: دەنکە گەنمێك کەچی نیو دەنکە گەنمت تا ئێستا خواردووە؟

مێرووڵەکە گوتی: بۆیە گوتم دەنکێك چونکە ئەگەر بەرم نەدەی دەمرم، منیش گوتم با نیو دەنکەکەی دەمێنێتەوە پاشەکەوت بێ لە ترسی ئەوەی بەرم نەدەی[1].

### ٤٦٩. دونیاو سرووشتی ژیان

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەر سولەیمان سەلامی خوای لێبێ بەلای جوتیارێك تێپەڕی، جوتیارەکە لەبەر خۆیەوە گوتی: خۆزگە سێ قسەم لەگەڵ پێغەمبەر سولەیمان دەکرد، (با) بە مۆڵەتی خوای گەورە قسەی ئەو جوتیارەکەی گەیاندە گوێی پێغەمبەر سولەیمان، پێغەمبەر سولەیمانیش چووە لای‌و پێی فەرموو: قسەکانت چین؟

جوتیارەکە گوتی: خۆشی دوێنێی تۆو ناخۆشی دوێنێی من تێپەڕین‌و نەمان، هەردووکمان دەمرین، هەردووکیشمان بەئەندازەی ئەو ماڵەی خوای گەورە پێی داوین لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێ، پێغەمبەری سولەیمان سەلامی خوای لێبێ بە جوتیارەکەی فەرموو: ئەگەر بێت‌و خوای گەورە لە بەخششی خۆی پەشیمان بووبایەوە ماڵم نەدەویست[2].

### ٤٧٠. پارێزکاری ( تەقوا )

دەڵێن شەوێکیان یەکێ لە پیاوچاکان گەنجێکی جوان لە خەویدا دەبینێ پێی دەڵێ: تۆ کێی؟ ئەویش دەڵێ: من تەقوام.

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٣٦- ٣٧.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٩- ٤٠.

گوتم شوێنت لە کێیە؟

گوتی: لەنێو دڵێکی بەخەم‌و چاوێکی بە فرمێسك[1].

٤٧١. **زیرەکی پێشەوا عەلی خوا لێی ڕازی بێ**

دەگێڕنەوە جولەکەیەك بە پێشەوا عەلی گوت: خوا لە کوێیە؟

پێشەوا عەلی گوتی: خوا پرسیاری کوێی لێ ناکرێ چونکە خۆی کوێی دروست کردووە، ئەوجارە گوتی: خوا چۆنە؟

پێشەوا عەلی گوتی: خۆی چۆنی دروست کردووە چۆن پرسیاری چۆنی لێدەکرێ؟ جوولەکەکە گوتی: لە کەیەوە هەبووە؟

پێشەوا عەلی گوتی: هاوار بۆ تۆ جا لە کەیەوە نەبووە؟[2].

٤٧٢. **نیازو نیەت پاکی**

دەگێڕنەوە یەکێك لە بەندە چاکەکانی نەوەی ئیسرائیل ڕۆژێ بەلای قومێك (لم)ێك تێدەپەڕی، لە دڵی خۆیدا دەڵێ: ئێستا ئەوە ئارد بووایە هەموویم دەکردە خێر، خوای گەورە پەیام بۆ پێغەمبەری ئەو سەردەمە دەنێرێ‌و پێی دەفەرمووێ: سەلام لە فلاّن کەس بکەو پێی بفەرموو: بەڕاستی خێرەکەم بۆ نووسیوە[3].

٤٧٣. **گەورەیی (بسم الله الرحمن الرحيم)**

دەگێڕنەوە پیاوێك هەبوو لە مەککە، ساڵ دوازدەی مانگ بەڕۆژوو دەبوو، کەس نەیدەبینی بەر بانگ بکاتەوە، کاتێ وەفاتی کرد مردوو شۆرەکە دەستی لە گیرفانی نا وەرەقەیەکی تێدا بوو لەسەری نووسرا بوو (بسم الله الرحمن الرحيم)، مردوو شۆرەکە

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٢.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٨.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٤٨.

ئەمەی پێ سەیر بوو، دەنگێك هات گوتی: بە هۆی (بسم الله) پەروەردەمان کرد، بە هۆی وشەی (الرحمن) لێی خۆش بووین، بە هۆی وشەی (الرحیم) بەردەوامیمان کرد[1].

### ٤٧٤. سەروەت و سامانی حەرام نامێنێ

دەگێڕنەوە پیاوێك شیری دەفرۆشت بەلام فێڵی لێدەکرد، شیرەکەی لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەکردو دەیفرۆشت، جارێك لە نێو کەشتی بوو مەیموونێکی لەگەڵدا بوو، پارەکەشی دانابوو، ئاگاداری مەیموونەکە نەبو، مەیموونەکە چووە لای پارەکە دینارێکی فڕێ دەدایە نێو ئاوەکەو دینارێکی دەهێلایەوە، تا پارەکەی نیوە بەنیوە بوو[2]

### ٤٧٥. برادەری دڵسۆز

دەگێڕنەوە یەکێ لە تابیعیەکان میوانی هات، هیچ خواردنێکیان نەبوو لە ماڵەکەیدا پێی بدەن، چوو بۆ ماڵی جیرانێکی بینی مەنجەڵی شیویان لەسەر ئاگرە مەنجەڵەکەی بردو لە پێش میوانەکەی خۆی دانا، کاتێ برادەرەکەی گەڕایەوە ماڵەوە گوتیان برادەرەکەت هات مەنجەڵە شیوەکەی لەسەر ئاگر هەڵگرت و بردی، ئەویش بێ ئەوەی تووڕە بێ گوتی: کارێکی چاکی کردووە زۆر پێی دڵ خۆش بوو[3].

### ٤٧٦. گەورەیی ژن هێنان

دەگێڕنەوە پیاوێکی زۆ چاك هەبوو خوا بە پێغەمبەرەکەی ئەو سەردەمی گوت: فلان کەس زۆر چاکە بەلام ژنی نییە، پێغەمبەرەکە بە کابرای گوت: بۆچی ژن ناهێنی ئەویش گوتی: پارەم نییە، پێغەمبەرەکە کچی خۆی لێ مارە کرد[4].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٩.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٠.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٩٧.

[4]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١٠٩.

### ٤٧٧. خشوع لە نوێژدا

دەگێڕنەوە هەرکاتێ کاتی نوێژ بهاتایە، پێشەوا عەلی خوا لێی ڕازی بێ ڕەنگی دەگۆڕا، پرسیاریان لێکرد بۆچی وات لێدێ؟

دەیگوت: چۆن وام لێنایە، لەکاتێکدا دەبێ ئەمانەتێك ئەدا بکەم، بە ئاسمان و زەمین سپێردرا نەیانتوانی هەڵیگرن(١).

### ٤٧٨. جومعە نەکردن

دەگێڕنەوە پیاوێك هاتە لای ئیبن عەبباس و گوتی: پیاوێك مردووە نەنوێژی بەکۆمەڵ و نەنوێژی هەینی نەکردوە، ئەویش گوتی: ئەو پیاوە لە دۆزەخە بەهۆی ئەمەوە، پاش مانگێك ئەو پرسیارەیان لێکرد، هەر دەیگوت: لە دۆزەخە(٢).

### ٤٧٩. بێخەمی خەڵك لە پرسیار کردن لە ئایینەکەیان

عطاء کە یەکێکە لەزانایانی تابعین دەڵێ: جارێکیان چوومە لای سەعیدی کوڕی موسەییب دەگریا، منیش گوتم: بۆچی دەگری؟

گوتی: ماوەی سێ ڕۆژە کەسێك پرسیارێکی لە ئایینەکەی نەکردووە، حەسەنی بەصری گوتوویەتی ئەگەر لەبەر زانایان نەبوایە خەڵکی وەکو گیانلەبەر دەبوون(٣).

### ٤٨٠. کارکردن بە زانست

دەگێڕنەوە لە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێ: جارێ چوومە مەککە بەردێکم بینی لەسەری نووسرابوو سەیری ژێرەوەم بکە ئامۆژگاری وەردەگری، کە سەیرم کرد نووسرابو: تۆ ئەوەی دەیزانی کاری پێ ناکەی جا چۆن داوای زانستێ دەکەی کە هێشتا نایزانی(٤).

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١١٠.

٢) هەمان سەرچاوەی پێێشوو ل ١١٢.

٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١١٦.

٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٠.

٤٨١. ترسان لە فتوادان

دەگێڕنەوە کاتێ پرسیاریان لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەکرد، دەیگوت: نازانم، جارێکیان (١٠) پرسیاریان لێکرد (١) پرسیاری وەڵام دایەوە، دەیگوت: دەتانەوێ بۆتان ببمە پردی دۆزەخ[1].

٤٨٢. ئارام گرتن لەسەرەتای گرفتە

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ژنێك تێپەڕی لەسەر گۆڕی کوڕەکەی دەگریا، ئەویش پێی فەرموو: ئارام بە، ژنەکە نەیزانی ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ گوتی: ئەوەی بەسەر من هاتووە بەسەر تۆ نەهاتووە، ئەویش ڕۆیشت، لەپاشان بە ژنەکەیان گوت: ئەوە پێغەمبەری خوابوو ﷺ، ژنەکە یەکسەر چوو بەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: نەمزانی تۆی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی: ئارام گرتن لەکاتی سەرەتای موصیبەتە[2].

٤٨٣. ترسان لە فتوادان

دەگێڕنەوە لە ئیبن لەیلا دەڵێ: جارێك (١٢٠) یاوەری ئەنسارییم دی پرسیارێکیان ئاڕاستە کردن ئەو دەیگوت: بڕۆ لای ئەو، ئەو دەیگوت: بڕۆ لای ئەو، تا گەیشتەوە بە کەسی یەکەم، هەمووشیان شارەزاییان هەبوو بەلام دەترسان لە فەتوادان[3].

٤٨٤. زانست هەمووی قوڕسە

دەگێڕنەوە جارێك پرسیاریان لە پێشەوا مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێ کرد، ئەویش گوتی: نازانم. گوتیان: ئەو پرسیارە ئاسانە نازانی؟

گوتی: ئەی خوای پەروەردگار نافەرموێ: ﴿ إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ ﴾ المزمل، کەواتە: زانستی شەرعی ئاسان نییەو قوڕسە[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١٣١.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١٥٥.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٥- ١٥٦.

### ٤٨٥. ئامادەبوون بۆ قیامەت

دەگێڕنەوە ڕۆژێكیان پاشی نوێژی مەغریب شێخ ڕەبیع چووە لای شێخ داوودی تائی، بینی هەندێ نان‌و ئاوی گەرمی لە پێشە، شێخ ڕەبیع گوتی: بۆ كوندەیەك دانانێیت؟

ئەویش گوتی: ئەگەر نانی ڕەق نەخۆی‌و ئاوی گەرم نەخۆی‌و جلی دڕ لەبەر نەكەی، ئەی چیت بۆ قیامەت داناوە[٢].

### ٤٨٦. ڕاستگۆیی لە كڕین‌و فرۆشتن

دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوێك لە پێش ئێوە زەویەكی فرۆشت، كابرای كڕیار كوپە زێڕێكی لەژێر زەویەكە دۆزیەوە، بە كابرای فرۆشیاری گوت: من زێڕم لەتۆ نەكڕیوە با بۆتۆبێ، ئەوی تر دەیگوت: من زەویەكەم فرۆشتۆتە تۆ كە زەویەكە هی تۆبێ زێڕەكەش هی تۆیە، چوونە لای دادوەرێك بۆ ئەوەی پێكیان بێنێ، دادوەرەكە گوتی: منداڵتان هەیە؟

یەكێكیان گوتی: كوڕێكم هەیە، ئەوی تریان گوتی: كچێكم هەیە.

دادوەرەكە گوتی: كچەكە لە كوڕەكە مارە بكەن زێڕەكەش بدەن بەوان[٣].

### ٤٨٧. دوعاكردن لە دوای بەجێ گەیاندنی نوێژەكان

جارێكیان پیاوێك لەتەنیشت عەبدوڵلای كوڕی موبارەك نوێژی بەكۆمەڵی دەكرد، كە پێش نوێژ سەلامی دایەوە، كابرا یەكسەر هەستا ڕۆیشت، عەبدوڵڵا كراسەكەی ڕاكێشاو پێی گوت: باشە تۆ كارت بەخوا نییە؟ بۆچی پاڕانەوە ناكەی لەپاشی نوێژەكان[٤].

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٨.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١٦٢.

[٣]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٦٤.

[٤]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٧٣.

### ٤٨٨. مردنی ئیمانداران خۆشییە بۆیان چونکە دەگەڕێنەوە لای خوای بێوێنە

دەگێڕنەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی حەمماد دەڵێ: چوومەلای بوشری مەنصورِ زۆر شادو دڵخۆش بوو، منیش گوتم: چۆنە وا دڵت خۆشە لەوکاتەدا؟

ئەویش گوتی: (سبحان الله)! وا خەریکم لە نێو دزو پیاوکوژو ستەمکاران دەڕۆم بەرەو خوای میهرەبان چۆن دڵخۆش نەبم[1].

### ٤٨٩. متمانە بوون بە هاوڕێ

دەڵێن لە جەنگێکدا سەربازێك بە سەرۆکەکەی گوت: گەورەم هاوڕێکەم لە گۆڕەپانی جەنگدا نەگەڕاوەتەوە مۆڵەتم بدە بچم بەدوایدا بگەڕێم، سەرۆك گوتی: مۆڵەت نییە چونکە نامەوێت خۆت بخەیتە مەترسییەوە، لە پێناو پیاوێکدا ئەگەری مردنی زیاترە لە ژیانی، سەربازەکە گرنگی بە قسەی سەرۆکەکەی نەداو چوو بەدوای هاوڕێکەیدا، دوای سەعاتێك گەڕایەوە بەڵام برینێکی سەختی لەلاشەی پەیدا بووبو وە لاشەی هاوڕێکەشی بەکۆڵیەوە بوو، سەرۆکەکە بەلەخۆباییەوە بە سەربازەکەی گوت: نەمگوت: مردووە مەچوو بەدوایدا، ئەو کارەت ئەوەندەی دەهێنا خۆت بخەیتە مەترسییەوە تەنها بۆ هێنانەوەی لاشەکەی؟

سەربازەکە گوتی: بەدڵنیاییەوە ئەوەندەی دەهێنا لەبەر ئەوەی کە دۆزیمەوە هێشتا زیندووو بو، پێمی گوت: دڵنیابووم کە دێیتە دووم[2].

### ٤٩٠. کەرامەت و ئەخلاقی شێخ عوسمانی بیارە

وەفدێك لە زانایان هاتن بۆ لای شێخ عەلائەددین، سەفەرێکی چەند ڕۆژەیان هەبوو، دەیانویست شێخ عوسمانیان لەگەڵ بێ، شیخ عەلائەددینیش شێخ عوسمانی لەگەڵیان نارد، لە لەسەفەرەکەدا ئەو زانایانە زۆر بە ووردی چاودێری شێخ عوسمانیان دەکرد، دەیانویست شتێکی لێبگرن پێچەوانەی شەرع بێ، بۆیە ڕۆژێك سەرنجیاندا دا دەستنوێژی دەشووشت

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل١٧٦.

[2]) ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم- لا ٦٩.

لەجیاتی (٣) جار (٤) جار ئاوی بەدەمو چاوی خۆیدا کرد، یەکێکیان یەکسەر ویستی پێی بڵێ ئەمە ئیسرافەو ناشەرعییە، بەڵام شێخ عوسمان بەر لەوەی پێی بڵێن خۆی گوتی: بۆیە چوار جار ئاوم کرد بە دەمو چاومدا، چونکە جاری یەکەم نیەتم خۆڤێنك کردنەوە بوو نەك دەست نوێژ، ئەمەش نابێتە گوناح، بەمەش بێدەنگی کردن ئەوان ئەو شتەی دەیانویست وەڵامی دانەوە، پاشان ڕۆژێکی تر ڕێیان کەوتە نێو وەردێك، ولاخەکەی شێخ دەمی برد بۆ هەندێ گژو گیای وەردەکە، دیسان یەکێ لە زانایانی وەفدەکە ویستی بڵێ: ئەمە دروست نییە، بەڵام بەر لەوەی قسەکە بکات شێخ عوسمان گوتی: باوەڕ ناکەم خوا تەکلیفی کرداری گیاندار بکات، لە ئینسان، لەکاتێکدا گیاندارەکە دەمی بۆ وەردێك بردبێ، خاوەنەکەی بەرەڵای کردووە، یان گژو گیاکە لەملاو لای ڕێگەوە بێ[1].

### ٤٩١. خواردنی ماڵی یەتیم

یەکێك لە زاناکان دەڵێ: من شەست قورئانم بەدەستی خۆم نووسیوەتەوە، لاپەڕەکانم دادەنا مێش لە هەموو لاپەڕەکان دەنیشت، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو لای من ئەوەبوو لە هەموو پەڕەکان تەنها لەسەر ئەو ئایەتە نەدەنیشت کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ ﴿١٥٢﴾﴾ الأنعام، ئەوەش گەورەیی خواردنی ماڵی یەتیم دەگەیەنێ[2].

### ٤٩٢. خەم مەخۆ

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم پیاوێکی بینی، ئەو پیاوە زۆر خەمبارو نارەحەت بوو، ئەویش لێی پرسی ئەگەر پرسیاری سێ شتت لێبکەم وەڵامم دەدەیتەوە؟

پیاوەکە: بەڵێ.

شێخ ئیبراهیم: ئایا شتێك هەیە لەم گەردوونە بێ فەرمانو مۆڵەتی خوا بەڕێوە بچێ؟

پیاوەکە: نەخێر.

---

[1]) گەورەهەری هەقیقەت- ل ٢٣٢.

[2]) نزهة المجالس- ص ١٣٦.

شێخ ئیبراهیم: ئایا هیچ کام لەو ڕۆزییەی خوا بۆی دیاری کردووی کەم دەبێتەوە؟

پیاوەکە: نەخێر.

شێخ ئیبراهیم: ئایا یەك چرکە لەو ژیانەی خوای گەورە بۆی داناوی کەمو زیاد دەکات؟

پیاوەکە: نەخێر.

شێخ ئیبراهیم: دەی کەواتە بۆچی‌و لەچی غەمبار بووی؟[1].

### ٤٩٣. بەزەیی پیاوچاکان

دەگێڕنەوە دزێك دەچێتە ماڵی مالیکی کوڕی دینار بەلام هیچ شتێکی چنگ ناکەوێ بۆ ئەوەی بیدزێ، مالیك لەو کاتەدا نوێژ دەکات، دەزانێ دزێك وا لەژوورەوەیە، نوێژەکەی کورت دەکاتەوە، دزەکە دەگرێ، پێی دەڵێ: برام خوا هیدایەتت بدا، وابزانم لە ماڵەکەمدا هیچت نەدۆزیەوە بەلام ناهێڵم بێسوود بچیتە دەرەوە، هەستا چوو هەندێك ئاوی بۆ هێنا پێی گوت: دەستنوێژێك بشۆ دوو ڕکعات نوێژ بکە، ئەگەر ئەوە بکەی لەماڵەکەم دەچیە دەرەوە بە بەشێکی باشتر لەوەی بۆی هاتبووی، دزەکە ئەوەی مالیك پێی گوتبوو ئەنجامی دا، پاشان گوتی: دەتوانم دوو ڕکعەت نوێژی تر بکەم؟

مالیك گوتی: ئەوەندەی حەزدەکەی نوێژ بکە.

دزەکە مایەوە لای مالیك تا پێش بەیانی نوێژی کرد، مالیك گوتی: ئەگەر بتەوێ بڕۆ بڕۆ. دزەکە گوتی: دەمەوێ بەیانی بەڕۆژوو بم حەزدەکەم چەند ڕۆژێك لای تۆ بمێنمەوە، چەند ڕۆژێك مایەوە تەوبەیەکی چاکی کرد، گەڕایەوە ماڵەوە، یەکێ لە دزەکانی هاوڕێی پێی گوت: وابزانم گەنجینەیەکی چاکت دزیوە بۆیە ئێستا ناچیت بۆ دزی کردن؟

ئەویش گوتی: چووم بۆ ئەوەی لەماڵی مالیکی کوڕی دینار دزی بکەم، من ویستم دزی لێبکەم، بەلام ئەو منی دزی‌و بەهۆی ئەوەوە گەڕامەوە لای خوا، تازە منیش دەرگای

---

[1]) ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم.

گەنجینەی تەوبە جێناهێڵم تا ئەوە بەدەست نەهێنم کە خۆشەویستانی خوا بەدەستیان هێناوە[١].

## ٤٩٤. زیرەکی ئیمامی شافعی

پرسیاریان لە پێشەوا شافیعی کرد کە پیاوێك دەنکە قەسپێکی لەدەمی دایەو دەڵێ: ئەگەر خواردم یان فڕێمدا تەلاقم بکەوێ لە خێزانم چی بکات باشە بۆ ئەوەی تەلاقی نەکەوێ؟

پێشەوا شافیعی گوتی: با نیوەی بخواو نیوەکەی تریش فڕێدا[٢].

## ٤٩٥. لەدوعای دایك بترسێ

گەنجێکی تەمەن بیستساڵی بەخۆیو شاحینەکەی لە سەفەرێکدا وەرگەڕا، پۆلیس گەیشتنە سەری لەناو شاحینەکە هێنایانە دەرەوە، سەری لەلاشەی جیا بووبویەوە، ئەفسەری هاتووچۆ مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا سەیری کرد ناوی ماڵەوەی لەسەرە، ئەویش پەیوەندی بە ژمارەکەی ماڵەوەیان کرد ئافرەتێك وەڵامی دایەوە، ئەفسەرەکە گوتی: تۆ چی خاوەنی ئەو مۆبایلەی؟

ئافرەتەکە گوتی: من دایکیم.

ئەفسەرەکە لەسەرخۆ گوتی: کوڕەکەت تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بووە بەلاَم سەلامەتە.

دایکەکە گوتی: یاڕەبی خوا سەلامەتی نەکاو سەری لەلاشەی جیا بکاتەوە.

ئەفسەرەکە گوتی: وەڵلا دەنا بەڕاستی سەری لەلاشەی جیاواز بۆتەوە، ئەمە بۆ ئەو نزایەت لێکرد؟

---

[١]) ساعة وساعة- ص ٤١- ٤٢.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٢٦٥.

دایکەکە گوتی: بەیانی زوو لەماڵەوە هەموو گیانی شکاندم ئەوجا ڕۆیشت، منیش لەبەرامبەر ئەوە لەبەیانیەوە دەپاڕێمەوە دەڵێم: خوایە بەهیلاکی ببەی و سەری لەلاشەی جیابکەیتەوە[1].

## ٤٩٦. گوێڕایەڵی کردنی قسەی دانایان

دەڵێن پیاوێکی هەژار ژنی هێناو منداڵێکی لەو ژنەیە بوو، لەبەر هەژاری بڕیاریدا ژن و منداڵەکەی جێبهێڵێ بۆ ئەوەی بژێوی ژیانیان بۆ دابین بکات، لەگەڵ خێزانەکەی ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی خێزانەکەی بۆ ماوەی بیست دانە ساڵ چاوەڕێی بکات، ئەگەر لەو بیست ساڵە تێپەڕی نەگەڕایەوە خێزانەکەی دەتوانێ بۆخۆی شوویەکی تر بکاتەوە، ئەگەر پێش ئەو بیست ساڵە گەڕایەوە ئەوە باشتر، بەم شێوەیە پیاوەکە هاوسەرو منداڵەکەی جێهێشت بەرەو شارێکی تر بۆ کاسبی کردن، ئەو پیاوە بوو بە شاگردی پیاوێکی ئاشەوان لەو شارەدا کە بۆی چووبو کاسبی دەکرد.

بۆ ماوەی بیست ساڵ لەوێ مایەوە، تا کاتی ئەوە هات بگەڕێتەوە نێو ماڵ و منداڵەکەی خۆی، ڕۆژێکیان ببە خاوەن ئاشەکەی گوت: مامە گیان من بڕیارم داوە بگەڕێمەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆم، ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە دەزنم لە چاوەڕوانیم دانە، خاوەن ئاشەکە زۆر تەکلیفی کرد کە بۆ ماوەی ساڵێکی تریش لای بمێنێتەوە پێی گوت: حەز دەکەم ساڵێکی تر لای من کار بکەی تۆ ئێستا وەکو کوڕی منی.

پیاوەکە گوتی: مامە گیان ناتوانم چونکە کاتی گەڕانەوەم هاتووە، من بیست ساڵە لە خانەوادەکەم دوورم، ئەگەر ئەمساڵ نەگەڕێمەوە خێزانەکەم ماڵەکەم بەجێ دەهێڵێ.

خاوەن ئاشەکە گوتی: باشە مادەم وایە بڕۆ، بەڵام خۆت دەزانی من پیاوێکی دەوڵەمەند نیم تەنها ئەو سێ پارچە زێڕە شك دەبەم، ئەویش دەدەم بەتۆ، هەرچەندە تۆ شایەنی زیاتری، پیاوەکە سوپاسی خاوەن ئاشەکەی کرد سێ پارچە زێڕەکەی لە گیرفانی داناو بەڕێکەوت بۆ ماڵەوە، لەڕێگادا تووشی سێ کەس هات دووانیان گەنج بوون، یەکێکیان پیر بوو، پیاوە پیرەکە هیچ قسەی نەدەکرد، تەنها پێدەکەنی بە لەسەرخۆیی و سەیری

[1]) ساعة وساعة- ص ١٦٠.

باڵندەکانی ئاسمانی دەکرد، دوای ئەوەی بەوان گەیشت، سلاّوی لێکردن بڕیاریاندا بەیەکەوە سەفەرەکە تەواو بکەن، پیاوەکە لە دوو گەنجەکەی پرسی ئەو پیاوە پیرە کێیە؟

گوتیان: باوکمانە.

گوتی: ئەی بۆچی بەم شێوەیە پێدەکەنێ؟

گوتیان: ئەو لە زمانی باڵندەکان دەزانێ، بۆیە گوێ بۆ قسە نەستەقەکانیان دەگرێت و پێدەکەنێ.

گوتی: ئەی بۆ هیچ قسە ناکات؟

گوتیان: باوکمان قسە ناکات، تەنها بەپارە نەبێ، هەر قسەیەك دەیکات نرخی خۆی هەیە.

پیاوەکە گوتی: نرخی قسەکانی چەندە؟

گوتیان: نرخی هەر بەشێك لە قسەکانی پارچەیەك زێڕە.

پیاوەکە لەدڵی خۆیدا گوتی: من پیاوێکی هەژارم بە پێدانی پارچە زێڕێك بەرامبەر حیکمەتێك بەو پیاوە ڕیش سپییە خۆ هەژارتر نابم، بۆیە دەستی لە گیرفانی خۆیناو پارچەیەك زێڕی دەرهێنا دای بە پیاوە پیرەکە، لە بەرامبەر بەو پارچە زێڕە پیاوە پیرەکە گوتی: لەکاتی هەستانی ئاوو ڕوودانی لافاو نەکەی لە ڕوبار بپەڕیتەوە.

پیاوەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: پیرەمێردێکی سەیرە زمانی باڵندان دەزانێ و لەبەرامبەر هەر قسەیەکدا پارەی دەوێ باشە ئەگەر پارچە زێڕێکی تری پێ بدەم دەبێ ئەوجارە چیم پێ بڵێ؟ بۆیە جارێکی تر دەستی نا بەگیرفانیداو پارچە زێڕێکی تری دەرهێنا دای بەو پیاوە پیرە، پیاوە پیرەکە گوتی: ئەگەر بینیت وا باز لە شوێنێکدا نزم بۆتەوەو دەسووڕێتەوە بڕۆ بۆ ئەو شوێنە بزانە چی هەیە؟

پیاوەکە لەدڵی خۆیدا گوتی: بزانە ئەو چی دەڵێ، خۆ من چەند جار بینیومە باز لە شوێنێکدا دەسووڕێتەوە بەلاّم قەت نەچووم بزانم چی ڕوودەدات.

با پارچەکەی تریشی پێ بدەم بزانم ئەوجارە چیم پێ دەڵێ، پارچە زێڕەکەی تریشی پێدا، کابرای پیرەمێرد ئەوجارەیان گوتی: بەر لەوەی بڕیار لەسەر کارێك بدەی لەدڵی خۆتدا لە ژمارە (۱ - ۲۵) بژمێرە ئنجا بڕیار بدە، دوای ماوەیەك ڕۆیشتن بەیەکەوە لەشوێنێك ناچار بوون لەیەك جیاببنەوە، چونکە ڕێگاکەیان وای دەخواست، ئیتر یەکتریان جێهێشت لەگەڵ دوو گەنجەکەو پیاوە پیرەکە سوپاسی یەکتریان لەسەر ئەوەی ئەو ماوەیە کاتێکی خۆشیان بەیەکەوە بردۆتە سەر، پیاوەکە بەتەنها ملی ڕێی گرت، لەو کاتەی لە گوندەکەی نزیك دەبوویەوە تووشی ڕوبارێك بوو، ویستی لە ڕوبارەکە بپەڕێتەوە بەڵام قسەی پیرە پیاوەکەی بیر هاتەوە، بۆیە لە لێواری ڕوبارەکە دانیشتو پارچە نانێکی دەرهێناو دەستی بەنان خواردن کرد، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد لافاوەکە بوەستێ، ئنجا بپەڕێتەوە، لەناکاو سوارچاکێکی لێ وەدەرکەوت سوار چاکەکە سەلامی لێکردو پرسی بۆ لێرە دانیشتووی؟

پیاوەکەش گوتی: ئاو هەڵساوە چاوەڕوانی دامرکاندنەوەی ئاوەکە دەکەم، ئنجا دەپەڕمەوە.

سوارچاکەکە پێی پێکەنیو گوتی: سەیری من بکە بزانە چۆن دەپەڕمەوە، سوارچاکەکە خۆی بەئاوەکە دادا زۆر بەبێ نرخی سەیری ئاوەکەی کرد، کەچی بەرگەی شەپۆڵەکانی ئاوەکەی نەگرت، بۆیە لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوەو خنکا، ئەسپەکە لە ئاوەکە هاتە دەرەوە ئەویش لە لێواری ئاوەکە وەستا بوو جڵەوی ئەسپەکەی گرتو سواری پشتی بوو بەدوای پردێك دەگەڕا، دوای گەڕانێکی زۆر پردێکی دۆزیەوە، بە ئاسانی لە ئاوەکە پەڕیەوە، بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن بەرەو دێیەکەی خۆی، ڕێی کەوتە دارستانێکی چڕی زۆر ترسناك، گوێی لە دەنگێکی سەیر بوو سەیری کرد کۆمەڵە بازێك لەو شوێنەدا دەخولێنەوە، قسەی پیرە مێردە داناکەی کەوتەوە بیر گوتی با نزیك ببمەوە بزانم چی لەوێدا دەگوزەرێ، بەهێمنی لە شوێنی کۆبوونەوەی بازەکان نزیك بوویەوە سێ پیاوی بە کوژراوی بینی، لە نزیك یەکێکیان کیسەیەك کەوتبوو، هاتە سەر کوژراوەکان سەیری کیسەکەی کرد پڕی بوو لەپارە، بۆی دەرکەوت هەر سێك کەسەکە لەسەر دابەش کردنی پارەکە ڕێك نەکەوتوون، بۆیە یەکتریان کوشتووە، ئەویش جانتاکەی هەڵگرت، دەستی کرد

بە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، شەو داهات گەیشتەوە لادێکەی خۆی، ویستی لەدەرگا بداو بچێتە ژوورەوە، بەڵام خەتەرەیەك بەدڵی داهات گوتی: بەر لەوەی لەدەرگا بدەم با لە پەنجەرەکەوە سەیری بکەم، لەپەنجەرەکەوە بینی هاوسەرەکەی لە ژوورەوە لەگەڵ پیاوێکی بێگانە قسە دەکات، لەدڵی خۆیدا گوتی: هوسەرەکەم خیانەتی لێ کردووم، خۆ هێشتا ئەو کاتە ماوە کە لەنێوانی خۆماندا لەسەری ڕێککەوتووین، بۆیە بڕیاری دا تۆڵەی خۆی بکاتەوەو هەردووکیان بکوژێت، دەستی بۆ خەنجەرەکەی برد، لەناکاو قسەی پیرەمێردە داناکەی بیر کەوتەوە، بۆیە بڕیاری دا لەدڵی خۆی تاکو ژمارە (٢٥) بژمێرێ ئنجا بیانکوژێ، کاتێ دەستی بە ژماردن کرد، لەناکاو گوێی لێبوو پیاوەکە گوتی: دایە گیان بەیانی بەهەموو شوێنێکی ئەو دونیایە دەگەڕێم تا باوکم بدۆزمەوە، گوتی: دایکە گیان چەند ساڵە باوکم جێی هێشتووین، دایکەکەش گوتی: کوڕم (٢٠) ساڵی تەواوە، کە پیاوەکە ئەو قسانەی بیست زانی ئەوە کوڕەکەی خۆیەتی، سوپاسی خوای گەورەی کرد کە هەردووکیانی نەکوشت بەڵكو ئارامی گرت، لەدڵی خۆیدا گوتی: بەخوا ئەگەر تا (٢٥)م نەژماردبا بەدەستی خۆم ماڵی خۆم وێران دەکرد، بۆیە لەخۆشیا هەر لەدەرەوە هاواری کرد هاوسەرە خۆشەویستەکەم کوڕە شیرینەکەم ئەوەی چاوەڕوانی بوون هاتۆتەوە وەرن پێشوازی لێ بکەن[1].

### ٤٩٧. کەسێکی بە تەماع مەبە

لە یەکێك لە چیرۆکەکانی چینیدا هاتووە، کە پادشایەك ویستی یەکێ لە هاوڵاتیانی خۆی خەلات بکات، پێی گوت: بەپێ بڕۆ چەندت لە زەوی بڕی ئەوە هەمووی دەبێتە موڵکی تۆ، پیاوەکەش زۆر دڵی خۆش بوو بەو دیاریە دەستی کرد بە ڕۆیشتن، بە ڕۆیشتن دڵی ئاوی نەدەخواردەوە بەڵكو بە ڕاکردن دەڕۆیی، بۆ ئەوەی ڕووبەرێکی زۆرتری بەرکەوێ، ماوەیەکی زۆر ڕای کرد تا ماندوو بو، دووبارە دەستی کردەوە بەڕاکردن، تا وای لێهات توانای ڕۆیشتنی نەما، زۆر زۆر دوورکەوتەوە، بڕیاریدا بگەڕێتەوە لای پاشا بۆ ئەوەی زەویەکەی پێ بدا، بەڵام پەشیمان بوویەوە گوتی با هێشتا ڕابکەمو ڕووبەرێکی زۆرتری لێ وەرگرم، دیسان ماوەیەکی زۆری بڕی ئەوەندە ڕۆیشت تاوای لێهات ڕێگاکەی خۆی وون کرد،

[1] ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم- ل- ١٦٣- ١٦٨.

هەندێکی تر دەڵێن بەهۆی ماندووبونی زۆرەوە گیانی لەدەستدا، بۆیە لەبەر تەماعەکەی نەبوو بەخاوەنی هیچ شتێك[1].

٤٩٨. بەردەوام بوون

ژیانێکی پڕ لە شکست، زنجیرەیەك وێستگە لە نشوستی یەك لەدوای یەك لەژیانی ئەو پیاوە بەدی دەکەی، بەلاّم ملی دانەنواند، بۆ ئەو شکستانە، با گەشتێك بە نێو شکستەکانی ئەو پیاوە بکەین، تا دەگاتە سەرکەوتنی ڕاستەقینە، ئەو پیاوە لەتەمەنی (٢٤)ساڵی دەستی بەبازرگانی کردن کرد، بەلاّم سەرنەکەت، جارێکی تر دەستی کرد بەبازرگانی بەلاّم دیسان سەرنەکەوت، لەتەمەنی (٣١) ساڵی هەموو سامانەکانی بە زیان کردن لە بازرگانی کردن لەدەستدا، ئەو هەموو زیانو شکستە چۆکی پێدا نەدا، لەتەمەنی (٣٤) ساڵی جارێکی تر هاتەوە نێو جیهانی بازرگانی کردن، بەلاّم جارێکی تر لە تەمەنی (٣٦) ساڵی زیانێکی گەورەی کرد، تووشی داڕووخانی دەروونی بوو، ئەمجارەیان ڕووی لە سیاسەت کرد، وازی لە بازرگانی کردن هێنا، ئەمجارەیان ڕووی لە سیاسەت کرد، لە تەمەنی (٣٨) ساڵیدا خۆی هەڵبژارد بۆ ئەندامی کۆنگرێس، بەلاّم دیسان سەرکەوتوو نەبوو لە هەڵبژاردنەکە دەرنەچوو، لەتەمەنی (٤٢) ساڵیو هەروەها (٤٦) ساڵی دیسان لە هەڵبژارنەکان دەرنەچوو، ئەو پیاوە وازی نەهێنا لەتەمەنی (٤٨) ساڵی دیسان خۆی هەڵبژاردەوە بۆ جاری پێنجەم، بەلاّم دیسان سەرکەوتوو نەبو، کەچی لە کۆتاییدا لەتەمەنی (٥٢) ساڵی وەك سەرۆکی ئەمریکا هەڵبژێررا، پاش کۆمەڵێك شکستی یەك لەدوای یەك بەلاّم هەر کۆڵی نەدا، لە کۆتاییدا توانی ببێ بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا[2].

٤٩٩. گوێڕایەڵی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر ﷺ

ئیبن عەساکیر لە عەبدەڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلاوە تەخریجی کردووە، کە ڕۆژێکیان عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەی کە وتاری دەدا، گوێی لێبوو کە دەیفەرموو: (أجلسوا)، ئەویش لە شوێنی خۆی هێشتا نەگەیشتبووە ناو مزگەوت

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٨.

بەلأم کە گوێی لەو قسەیەی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ یەکسەر دانیشت، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە قسەکەی بوویەوە، ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش پێی فەرموو: {زادك الله حرصا على طواعية الله وطواعية رسوله}، فەرمووی: خوای گەورە زیاتر سوورت کا لەسەر گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی[1].

هەر لەسەر گوێڕایەڵی هاوەڵانی بەڕێز بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو نەعیم لە کینانیەوە تەخریجی کردووە، کە نێرراوی خەلیفە عومەر بووە خوا لێی ڕازی بێ، بۆ لای هیرەقل، وتوویەتی: دانیشتم نەمزانی چ شتێك لە ژێرمدایە، کورسیەکەی ژێرم لە ئاڵتوون، کە زانیم کورسیەکەی ژێرم ئاڵتوونە یەکسەر دابەزیم، ئەوانیش پێم پێکەنین گوتیان ئەوە بۆ دابەزی، گوتم چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی دوورە پەرێزی بکەن لەمە[2].

### ٥٠٠. چەند موعجیزەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ

موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەنە هەزار موعجیزە وەك لەلای زانایان جێگیر بووە، جا لێرەدا پێمان خۆشە چەند دانەیەکیان بخەینە بەر چاوی ئازیزان، لێرەدا چەند موعجیزەیەکیان لێ باس دەکەین:

#### موعجیزەی یەکەم: مسوڵمان بوونی تەمیمی داریی:

ئەبو نەعیم لە تەمیمی داریەوە تەخریجی کردووە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەحی بۆ هات، من لەشام بووم بۆ ئیش‌و کارێکی خۆم چوبووم، لە شیوو دۆڵێکدا شەوم بەسەر داهات، لەدڵی خۆمدا گوتم ئیمشەو لێرەدا پەنا ئەگرم بە گەورەی ئەو دۆڵ‌و شیوەوە، دەڵێ: کاتێ ڕاکشام بۆ ئەوەی بخەوم دەنگێك بانگی ئەکردم، بەلأم نەمدەزانی کێیە، دەنگەکە دەیگوت پەنا بەخوا بگرە، چونکە جین لە حزوری خوای گەورە ئەو بێشەرمیە ناکەن وە ناتوانن پەنای هیچ کەسێ بدەن، گوتم: سوێند بە خوا ئەڵێیت... گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوتووە وە چووین لەدوایەوە نوێژمان بەجێهێناو مسوڵمان

[1] ژیانی ئازیزمان- ب١ — ل ٦٩١.

[2] هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٦٩١- ٦٩٢.

بووین، شوێنی کەوتین، فرو فێڵی جن تیاچوو، ئەستێرەی کشاویان تێگیرا، دەنگەکە بەردەوام بوو لە قفسە کردن گوتی: برۆ بۆلای پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانو مسوڵمان ببە، تەمیمی داری دەڵێ: کە رۆژم لێبوویەوە چووم بۆ گوندی (ذیر أیوب) گوندێکە لە حەلولن لەدەورو بەری دیمەشق، لەوێ پرسیارم لە راهیبێك کردو هەواڵم پێدا، راهیبەکە گوتی: راستیان پێ گوتووی ئەو پێغەمبەرە لە حەرەمدا دەردەکەوێ وە لە حەرەمیشدا کۆچ دەکات، لە چاکترینی پێغەمبەرانە برۆ بۆلای نەکەی هیچ کەسێ پێشت بکەوێ بۆ چوونە لای، تەمیم دەڵێ: رۆیشتم تا گەیشتکم بە پێغەمبەری خواو مسوڵمان بووم[1].

## موعجیزەی دووەم: دوعای گرانی:

قورەیش زۆر لە حاڵێکی نالەبار بوون، چونکە بە چاوی خۆیان بەردەوام هەڵوێستی جوانی پێغەمبەرو هاوەڵانی بەرزیان دەدی، رێكو پێکی قورئانی پیرۆ سەرنجی هەموو خەڵکی راکێشا بوو، لەو لاو ئەولاوە خەڵکانی ژیر دەهاتن لەچەند ساتێکی کەم لە راستگۆیی پێغەمبەری خوا ﷺو پاکی دینەکە دەگەیشتن، بۆیە بروایان دەهێنا، کەچی قورەیش هەر ملە جرەییان دەکردو ئازاری ئیماندارانیان دەدا، تا ئەوەبو جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێکردنو فەرمووی: {اللَّهُمَّ أعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ}، واتە فەرمووی خوایە یارمەتیم بدەی تا بەسەریاندا زاڵ ببم، گرانییەکیان تووش بکەی بەوێنە حەوت ساڵ گرانیەکەی پێغەمبەر یوسف سەلامی خوای لێبێ، ئەوە بوو بەهۆی ئەو دوعایە خوای گەورە ساڵێك گرانی هێنا بەسەریان، شتی پیسو مردارەوە بوو ئێسقانیان دەخوارد، هەتا کەسی وایان هەبوو وای لێهاتبوو لە برساندا شتێکی وەك دووکەڵی لە نێوان خۆیو ئاسماندا دەبینی، پاشان ئەبو سوفیان لەگەڵ چەند پیاوێکی خزمی هاتنە لای گوتیان: ئەی موحەممەد تۆ وامان تێدەگەیەنی کە بەرەحمەت هاتووی کەچی واخزمەکانت تیا چوون لەم برسیەتیە، لەخوا بپارێوە بۆیان ئەوەبوو پێغەمبەری دڵ پر لە رەحمو سۆز بۆیان پارایەوەو خوای گەورەش گرانیەکەی لەسەر لابردنو بارانیان بۆ باری بۆ ماوەی حەوت رۆژ لەسەر یەك بەرادەیەك خەڵکی بەدەست بارانی زۆرەوە هاوریان لێهەڵسا پێغەمبەریش ﷺ

[1]) ژیانی ئازیزمان- بـ١- ل ٣٢٥- ٣٢٦.

فەرمووی: {اللهمَّ حَوَالَيْنَا، وَلاَ عَلَيْنَا فَجَعَلَ السَّحَابُ يَنْقَطِعَ يَمِينًا وَشِمَالاً} واتە: خوایە لەدەورو بەرمان بیبارێنە نەك لەسەرمان، هەورەکە بپچڕێنەو بیبە بۆ لای ڕاستو چەپ، ئەوەبوو هەورەکە لەسەریان ڕەویەوەو باران بەدەوریانا بۆ خەڵکی تر باری، خوای گەورەش لەقورئاندا ئاماژەی بەمە کردووە دەفەرمووێ: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ١٠ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ١١ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ١٢ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ١٣ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ١٤ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ١٥ ﴾ الدخان، کەچی لەگەڵ ئەمەش بت پەرستان گەڕانەوە سەر گومرایی خۆیانو ئیمانیان هەر نەهێنا، بەم هۆیەوە خوای گەورە هەڕەشەی گەورەتری لێکردن،ك دەفەرمووێ: ﴿ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ١٦ ﴾ الدخان، ئەمەشیان ئاماژەیە بۆ تێك شکاندنیان لە شەڕی بەدر، یاخود هەڕەشەی سزای قیامەتە[1].

## موعجیزەی سێیەم: جەنگی ڕۆمو فارس:

پێش کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە جەنگێك لەنێوان فارسو ڕۆمدا ڕوویدا ئەوەبوو لەو جەنگەدا فارسەکان بەسەر ڕۆمەکان زاڵ بوون بت پەرستەکانی مەککەش بەم سەرکەوتنەی فارسەکان دڵخۆش بوون لەبەر ئەوەی فارسەکان وەك خۆیان هاوبەشدانەر بوون، لەهەمان کاتدا مسوڵمانەکان ئەو شکستەی ڕۆمەکانیان پێ ناخۆش بوو، حەزیان دەکرد ڕۆمەکان سەرکەون لەبەر ئەوەی ڕۆمەکان ئەهلی کیتاب بوونو باوەڕیان بەخوا هەبوو، بت پەرستەکان کەوتنە گفتو گۆ لەگەڵ مسوڵمانەکاندا خۆشی خۆیان دەردەبڕیو دەیانگوت: ئێوە خاوەنی کتێبنو نەصاراش خاوەنی کتێبن ئێمەش نەخوێندەوارین برا هاودینەکانی ئێمە لە فارس بەسەر برا هاودینەکانی ئێوە سەرکەوتن، جا ئەگەر ئێوەش بێن بۆمان بێگومان بەسەرتاندا سەردەکەوین بەو بۆنەیەوە خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرمووێ: ﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٢٧.

ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ ﴾ الروم، کە ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوە پێشەوا ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ لە واتاکەیان دەگەیشت، بۆی ڕوون بویەوە کە خوا موژدەی سەرکەوتنی ڕۆمەکانی داوە، بە کافرەکانی گوت: ئایا بەسەرکەوتنی براکانتان بەسەر براکانمان دڵتان خۆش بووە؟ با دڵتان خۆش نەبێو خوای گەورە چاوتان ڕوون نەکاتەوە بەسەرکەوتنی براکانتان سوێند بەخوا خوای گەورە ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ دەکات، ئەمەش هەواڵێکە خوای گەورە بە پێغەمبەرمانی ڕاگەیاندووە، ئومەییەی کوڕی خەلەف لێی هەڵسایەوەو گوتی: درۆت کرد، پێشەوا ئەبو بەکر گوتی: تۆ خۆت درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا، گرەوت لەگەڵ دەکەم لەسەر دە وشتری بەهێزی کەم تەمەن ئەگەر تا ماوەی سێ ساڵ ڕۆم بەسەر فارسدا سەرکەوت ئەو من دەدۆڕێم، ئەگەر فارسیش بەسەر ڕۆمدا سەرکەوت تۆ دەدۆڕێی، ئەمە لەکاتێکدا بوو هێشتا گرەو لە ئیسلامدا حەرام نەکرابوو.

پێشەوا ئەبو بەکر گەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی پێدا ئەویش فەرمووی: {ما هكذا ذكرت إنما البضع ما بين الثلاث إلى التسع...} فەرمووی: وام باس نەکردووە بەڵکو وشەی (بضع) سێ هەتا نۆ دەگرێتەوە، بڕۆ گرەوەکەی بۆ زیاد بکەو ماوەکەی درێژ بکەرەوە، ئەبو بەکر چووە دەرەوەو تووشی ئوبەی هات، پێی گوت: لەوە ئەچی پەشیمان بیت پێشەوا ئەبو بەکر فەرمووی نەخێر وەرە با گرەوەکەت بۆ زیاد بکەمو ماوەکەشت بۆ درێژ بکەمەوە، گرەوەکە بکەین بە (١٠٠) وشترو ماوەکەش بکەین بە (٩) ساڵ، گوتی: باشە، بۆیە بەر لەوەی (٩) ساڵەکە تەواو بێ ڕۆمەکان بەسەر فارسەکان زاڵ بوون بەمەش مسوڵمانان دڵخۆش بوون، ئەوەی کە خوای گەورە پەیمانی دابوو هاتە دی، هەواڵ دانەکەی پێغەمبەریش ﷺ بەڕاست دەرچوو، بەوەی کە ڕۆمە خاوەن کتێبەکان بەسەر فارسەکاندا سەرکەوتن[1].

---

[1]) ژیانی ئازیزمان ب١ – ل ٣٢٨- ٣٣٠.

**موعجیزەی چوارەم:**

منداڵێکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵەکە گەورە بووبو بەڵام زمانی نەبووبویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە منداڵەکەی فەرموو: {مَنْ أنا؟}، واتە: من کێم؟ منداڵەکە گوتی: پێغەمبەری خوایت، خوای گەورە زمانی بەردا[1].

**موعجیزەی پێنجەم:**

پێشەوا ئەحمەد لە ئەبو سەعیدی خودریەوە فەرموودەیەکی صەحیحمان بۆ تەخریج دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوێکی باراناویدا لقە دار خورمایەکی دایە دەست قەتادەی کوڕی نوعمان دوای ئەوەی کە بەیەکەوە نوێژی عیشایان بەجێهێنابوو پێی فەرموو: بڕۆ بۆ ماڵەوە ئەو لقە دار خورمایە دە گەز لە پشتەوە وە دە گەز لە پێشتەوە بۆت ڕووناك دەکاتەوە، کە گەیشتیە ماڵەوە شتێکی ڕەش دەبینی بزانە ئەوە شەیتانە بەو لقە دارە لێی بدە، تا دەرواتە دەرەوە، قەتادە ڕۆیشتو لقە دارخورماکە ڕێی بۆ ڕووناك کردەوە، هەتا گەیشتە ماڵەوە شتە ڕەشەکەی بینیو دەستی بە لێدانی کرد هەتا لە ماڵ چووە دەرەوە[2].

**موعجیزەی شەشەم:**

پێغەمبەر ﷺ چەند تاڵە موویەکی سەری خۆی دا بە خالیدی کوڕی وەلید، دوعای سەرکەوتنیشی بۆ کرد، خالیدیش تاڵە مووەکانی خستنە نێو کڵاوەکەی لە هەر جەنگێکدا بەژداری پێ بکردایە سەردەکەوت لەو جەنگەدا[3].

---

[1]) موعجیزاتی ئەحمەدی- ل ١٠٤.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٧.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٤.

**موعجیزەی حەوتەم:**

جارێکیان شوانێك مەڕەکانی دەلەوەڕاند گورگێك پڕی دایە مەڕەکانی، مەڕێکیانی دابڕی، شوانەکەش ئاگاداری ئەمەبوو توانی مەڕەکەی لێ بستێنێ، گورگەکەش هاتە قسە کردنو گوتی: لە خوا ناترسی منت بێ بەش کرد لەو ڕزقە؟

شوانەکەش گوتی: بەڕاستی سەیرە گورگ قسە دەکات وەك ئادەمیزاد!!

گورگەکەش گوتی: ئایا لەوە سەیر ترت پێ بڵێم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەدا دەرکەوتووە باسی میللەتانی پێش خۆی هێناوە بۆ خەڵکی، دەرگاکانی بەهەشتی بۆ کراونەتە سەر پشت، خەڵکی بۆ بانگ دەکات، کەچی تۆ هەتا ئێستا ئیمانت پێی نەهێناوە.

هەرچەندە ڕیوایەتەکان لەسەر قسەکردنی گورگەکە یەك دەنگن، بەلام بەهێزترینیان ئەو ڕیوایەتەی ئەبو هورەیرەیە کە بەم شێوەیە هاتووە: شوانەکە دەڵێ جا کێ چاودێری مەڕەکانم بکات؟

گورگەکە گوتی: من چاودێریی مەڕەکانت بۆ دەکەم، کابرا گورگوکانی بە مەڕەکە سپاردو ڕۆیشت، کە دەگەڕێتەوە پاش مسوڵمان بوونی دەبینێ وا گورگەکە چاودێری مەڕەکانی دەکات، مەڕەکانی هەر وەکو خۆیتیو هیچ کەمی نەکردووە، بۆیە ئەویش مەڕێك سەردەبڕێ بۆ گورگەکە[1].

**موعجیزەی هەشتەم:**

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە دەڵێ: مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی چەند دارخورمایەکەوە سەقفەکەی وەستابوو، هەر کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ووتاری بۆمان بدایا پاڵی بە یەکێکیانەوە دەدا، تا ئەو کاتەی مینبەرێکیان بۆ دروست کرد، ئیدی چیتر پاڵی نەدا بەو دار خورمایە، ئەو ڕۆژەی کە مینبەرەکەی بۆ دروست کراو چووە سەری دەنگێکمان لەو دار خورمایە بیست کە پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی پێدەدا، دەنگەکە وەك دەنگی حوشتری ئاووس وابو، هەتا پێغەمبەری خوا هات دەستی موبارەکی لەسەر دانا

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٥-١٢٦.

ئنجا ئەو دار خورمایە بێدەنگ بوو، گریانەکەی لەبەر ئەوەبو بەرگەر جیابوونەوەی لە پێغەمبەری خوا نەگرت[1].

**موعجیزەی نۆیەم:**

لە ڕۆژی بەدردا ئەبو جەهل دەستی موعەووەزی کوڕی عەفرائی بڕی کە یەکێك بوو لەو چواردە کەسەی کە لەبەدردا شەهید بوون، موعەووەز بەدەستی بڕاوەوە هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بە تفی موبارەکی خۆی دەستی لکاندەوە بەیەکتر، پاشان موعەووەز گەڕایەوە بۆ مەیدانی جەنگ کوشتاری بێ باوەڕانی کرد تا شەهید بوو[2].

**٥٠١. ڕەحمو بەزەیی خوای بەبەزەیی**

لە شێخ ئەبو یەزیدەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: شەوێکیان خوای گەورەم لە خەودا بینی، گوتم ئەی خوای پەروەردگار تۆم لەکوێ بەدەست دەکەوێ؟

پێی فەرمووم: موخالەفەی نەفسی خۆت بکەو وەرە لام.

گوتم: خوای پەروەردگار بە چ ڕێگایەك دەتوانم بتناسم؟

خوای گەورە فەرمووی: نەفسی خۆت بناسەن، دەمناسی.

گوتم: پەروەردگارم من دەمەوێ تۆ لەمن ڕازی بی.

پەروەردگار فەرمووی: سوێند بە گەورەییو جەلالی خۆم ئەگەر خەڵکی بزانن چیت لە هەناو دایە ئەوا ڕەجمت دەکەن.

منیش گوتم: سوێند بە گەورەییو جەلالەتت ئەگەر خەڵکی بزانن تۆش چەند بەبەزەییت ئەوا کەسیان ناتپەرستن.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٨٤.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٠١.

خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئەبا یەزید لەتۆ ڕازی بووم، نە تۆ قسەبکە دەربارەی ڕەحمی من، نەمن باسی تۆ دەکەم کەچی لەهەناوت دایە، ئەتۆ لای ئێمە وەرگیراوی[1].

### ٥٠٢. منداڵی ژیر

موحەممەدی کوڕی زەفەر دەڵێ: شێخ ئەبو یەزیدی بەستامی هەر لەو کاتەی بچووك بوو ئەو ئایەتە فێر بوو......... بە باوکی گوت: ئەی باوکە بۆ ئەوە ناکەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکرد، باوکی گوتی: کوڕەکەم ئەوە تایبەت بوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئۆممەتەکەی واجب نییە، شێخ ئەبو یەزید خۆی لێبێدەنگ کرد، لەو کاتەی کە ئەو ئایەتەی لەبەر کرد.........، گوتی بابە من گوێم لێبووە کۆمەڵێك هەردەستنەوە لەشەودا شەنوێژ دەکەن، کێن ئەو کۆمەڵە؟

باوکی گوتی: ئەوانە هاوەڵانن خوا لێیان ڕازی بێ، ئەی کوڕەکەم.

ئەویش گوتی: باوکە ئەی بۆ ئەوە ناکەی کە هاوەڵان کردوویانە؟

گوتی: ڕاست دەکەی کوڕەکەم ئینشائەڵڵا لەو شەوەوە هەڵدەستمەوە، شەو نوێژ دەکەم، شەوێکیان شێخ ئەبو یەزید هەستاو سەیری باوکی کرد وا شەونوێژ دەکات، گوتی: باوکە چۆن دەستنوێژ بشۆم‌و شەونوێژ بکەم وەك تۆ.

باوکی گوتی: کوڕەکەم هێشتا تۆ بچووکی.

گوتی: ئەی باوکی خۆم ئەگەر ئەو ڕۆژە داهات خەڵکی پۆل پۆل لەبەردەم خوادا ڕائەوەستن بۆ ئەوەی کردەوەکانیان ببینن من لەو ڕۆژەدا بە خوای گەورە دەڵێم: بەباوکم گوت چۆن دەست نوێژبشۆم‌و نوێژت لەگەڵ بکەم باوکم گوتی: کوڕم هێشتا تۆ بچووکی بڕۆ پاڵدەوە، باوکی گوتی: نا کوڕەکەم لەو ڕۆژەدا کەس بەرگەی ئەمە ناگرێ، فێری دەستنوێژی کردو لەگەڵ باوکیدا نوێژی کرد[2].

### ٥٠٣. کەرامەتی هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ

---

[1]) حكايات الصوفية- ص١١٨.

[2]) روائع حكايات أهل القرآن- ص ٨٤- ٨٥.

لە شەعبیەوە دەگێڕنەوە کە خەڵکانێك لە کۆچکەران لە بۆ جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورە چوونە دەرەوە، یەکێکیان گوێدرێژێکی پێبوو لە ڕێگادا گوێدرێژەکەی گیانی دەرچوو، ئەوانەی لەگەڵی بوون گوتیان: لەگەڵ ئێمە وەرە، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو لەگەڵیان بچێ، هاوڕێکانی بەجێیان هێشت ڕۆشتن، ئەو پیاوە هەستا دەست نوێژێکی شووشت و دوو ڕکعات نوێژی کردو دەستەکانی بەرز کردەوەو گوتی: خوای پەروەردگار من لە (دەفینە) دەرچووم بۆ جیهاد کردن لە پێناوی تۆ، شاهێدی دەدەم تۆ مردوو زیندوو دەکەیتەوە خوای پەروەردگار، گوێدرێژەکەم بۆ زیندووو بکەیتەوە، پاشی دوعاکەی چووە لای گوێدرێژەکەی و بە هێمنی پیای کێشا گوێدرێژەکەی زیندووو بوویەوە، ئەویش لغاوی کردو دەستی کرد بە ڕۆیشتن تا گەیشتەوە هاوڕێکانی[1].

### ٥٠٤. گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ

لە موحەممەدی کوڕی قەرەزیەوە دەڵێ: پیاوێکی خەڵکی کوفە بەحوزەیفەی کوڕی یەمانی گوت: ئەی باوکی عەبدوڵڵای تۆ پێغەمبەری خوات بینیوەو هاوڕێیەتیت کردووە ئێوە چیتان دەکرد لەگەڵیدا؟

فەرمووی: ئێمە لە پاڵ پێغەمبەری خوادا جیهادمان دەکرد، ئەگەر بکرابا نەماندەهێلا بەسەر زەویدا بڕوا، بەشانی خۆمان هەڵمان دەگرت، جارێکیان لە جەنگی خەندەقدا پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی دەکرد، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆلامان و فەرمووی: کێ هەڵدەستێ بڕوات بۆ ناو دوژمن و هەواڵی دوژمنمان بۆ بێنێ، دوایی بگەڕێتەوە لامان، پێغەمبەری خوا گەرەنتی گەڕانەوەشی دا وە گوتی: ئەو کەسەی بچێ ئومێدم وایە خوای گەورە بیکات بە هاوەڵی من لەبەهەشت؟

هیچ کەسێك لە هاوەڵان هەڵنەستا لەبەر سەختی ئەو ڕۆژە کە ڕۆژێکی زۆر ترسناك و شەوێکی زۆر ساردو سەرما بوو وە ئێمە زۆر برسیی بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ بینی کە کەس هەڵنەستا بانگی منی کرد بچم فەرمووی: ئەی حوزەیفە بڕۆ هەواڵمان بۆ بێنە لەناو دوژمن وە قسە لەگەڵ کەس مەکە تا دەگەڕێیتەوە لامان.

---

[1]) کرامات الصحابة والصالحين وآل البيت- ص ٧٩.

حوزەیفە دەڵێ: چووم بۆ ناو سەربازەکانی دوژمن بینیم نە خێمەیان ماوە نە قاپو قاچاغیان ماوە هەمووی تێك شێلراوە بەهۆی ئەو بایە توندەی کە خوای گەورە بەسەری هێنان، شەوێکی زۆر تاریك بوو سەربازەکانی وان دانیشتبوون چاویان یەکتری نەدەبینی، منیش چووم لە نێویان دانیشتم، ئەبو سوفیان لەناو خەڵکەکە دانیشتبوو وەك بڵێی: هەستی پێ کرد یەکێ هاتووە بۆ مەجلیسەکە، بۆیە گوتی: هەریەکێ سەیری تەنیش خۆی بکاتو لێی بپرسێ بزانێ کێ لە تەنیشتیەوەیە، حوزەیفە دەڵێ: منیش یەکسەر دەستی ئەوەی تەنیشتی خۆم گرت گوتم تۆ کێی؟

گوتی: فلانی کوڕی فلان.

پاشان ئەبو سوفیان گوتی: ئەی قوڕەیش سوێند بەخوا ئێوە تا بەیانی بەم شێوەی خۆتان ڕاناگرن، تەواوی حوشترەکانمان لەناو چوون، بەنی قورەیزەش درۆی لەگەڵ کردین چی ناخۆشە لەوانەوە پێمان گەیشتووە، ئەو بایە توندەش مەنجەڵی سەر ئاگرەکانی پێ نەهێشتین خێوەتەکانمان بەسەرمانەوە ڕاناوەستن.

ئەبو سوفیان هەستا سواری حوشترەکەی بوو بۆ ئەوەی بڕوا بە سەربازەکانی خۆی گوت: با بارکەین بڕۆین ئێرە جێ بێڵین، سێ جار سواری حوشترەکەی بوو دابەزی حوشترەکەی نەدەڕۆیی لەبەر ئەوەی بەسترابوویەوە، نەیزانی بەستراوەتەوە سوێند بەخوا لەو کاتەدا دەمتوانی بە تیرێك بیکوژم، بەڵام لەبەر ئەو پەیمانەی بە پێغەمبەری خوام ﷺ دابوو ئەمەم نەکرد، دوایی گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خواو هەواڵەکەم هەمووی پێدا[1].

### ٥٠٥. غیرەتو هەڵوێستی مسوڵمانان

جولەکەو مونافیقەکانی شاری مەدینە ڕۆڵی ئاشوبگێڕانەیان دەبینیو هانی قورەیشیان دەدا بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە، قورەیشیش بە پاڵپشتی ئەو جوولەکەو مونافیقانەی ناو مەدینە خۆیان کۆکردەوە بۆ هێرشکردنە سەر مسوڵمانان لەشاری مەدینە، هەرچی خێڵو هۆزی عەرەب هەیە کۆیان کردەوەو بانگیان کردن بۆ ئەو شەڕە، لەو هۆزانەی کە بانگ کران هەردوو هۆزی غەتەفانو فەرازە بوو کە دوو خێڵی گەورەی عەرەب

---

[1]) هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ب١- ل٤٩٥- ٤٩٧.

بوون پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر دەم ئەو هەموو ژمارە زۆرەدا کە لەهەندێ ڕیوایەتدا دەڵێ: ژمارەیان (١٠٠٠٠) دە هەزار چەکدار دەبوو، پاش پرس و ڕاوێژی زۆر بە مسوڵمانان بڕیاریدا خەندەقێك بەدەوری مەدینەدا هەڵکەنێ، بۆ ئەوەی شارەکە لەو شالاوە بپارێزێ، موحەممەدی کوڕی موسلیم دەڵێ: کاتێ ئەو هەموو خەڵکە کۆبوونەوە بۆ هێرش کردنە سەر مەدینە ئومێدی سەرکەوتن تا دەهات کەم دەبوویەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لەوە کردەوە گفتو گۆ لەگەڵ هەندێکیان بکاتو لەگەڵیان پێك بێت، بۆ ئەوەی پاشەکشە بکەن لە هێرش کردنە سەر شاری مەدینە، بۆ ئەو مەبەستە ناردی بەشوێن عویەینەی کوڕی حەصەن و حارسی کوڕی عەوفی موڕڕی کە هەردووکیان دوو سەرکردەی هۆزی غەتەفان بوون، کەوتە قسە کردن لەگەڵیان لەسەر ئەوەی کە ئەوان لە سوپاکەی قوڕەیش پاشە کشە بکەن لەبەرامبەردا سێیەکی بەروبوومی مەدینەیان پێ بدات، بەشێوەیەکی زارەکی ڕێککەوتنەکە کرا لەسەر ئەوە مایەوە شاهێدەکان ئامادە بن و واژوو بکرێ، پێش ئەوەی پێك بێن و واژووی بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی کرد بە هەردوو سەرکردەی خێڵی ئەوس و خەزرەج سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادە، ئەو مەسەلەی بۆ باس کردن، ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پێك هاتنە خوای گەورە فەرمانی پێکردووی بەم شێوەیە یان بۆچوونی خۆتە، ئایا دەتوانین قسە لەسەر قسەی جەنابت بکەین؟

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ئەو مەسەلەیە وەکو ڕایەکی خۆم دەیڵێم، ئێوەش بۆتا هەیە تاوو توێی ئەو پێکهاتنە بکەن، چونکە دەبینم عەرەب لەهەموو لایەکەوە دەورەی داوین، خەمی ئەوەم لێ نیشتووە شارەکەمان داگیر بکەن، بەم کارەم دەمەوێ ڕیزەکانیان تێك بدەم.

ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتەی ئێمە هەردوولامان لەسەر بیرو باوەڕی بت پەرستی بووین خوامان نەدەناسی ئەوان هیچ کامیان نەیانتوانیوە دەنکە خورمایەکی ئێمە بخۆن، مەگەر بەڕەزامەندی خۆمان یاخود بە کڕین و فرۆشتن، ئێستا پاش ئەوەی خوای گەورە بەهۆی جەنابتەوە ڕێزداری کردووین، چۆن ڕازی بین موڵکی خۆمانیان پێ بدەین؟ سوێند بەخوا لەجیاتی خواردن شمشێریان پێدەدەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منیش لەگەڵتانم، پاشان سەعدی کوڕی موعاز مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواست بەڵێن نامەکەی لێوەرگرت و هەمووی سڕیەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئامادەی بەرگرین هەر کاتێ بیانەوێ بێنە سەرمان، لە کۆتاییدا خوای گەورە ڕیزەکانی کافرانی تێکدا تەفرو تونای کردن، مسوڵمانانیش بەری ڕەنجیان لە جەنگی ئەحزابدا چنییەوە[1].

**٥٠٦. ترسانی هاوەڵان لە بێ ئەدەبی کردن بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ**

سابتی کوڕی قەیسی ئەنصاری خوا لێی ڕازی بێ مسوڵمانێکی ڕاستەقینە بوو، سرووشتی خۆی وابو لەکاتی قسە کردندا دەنگی زۆر گڕو گەورە بوو، کاتێك ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢ ﴾الحجرات.

سابت دەستی کرد بە گریان لەماڵەوە نەهاتە دەر، نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پرسی؟

گوتیان: نەخۆشە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردو پێی فەرموو: ئەوە چیتە ئەی سابت؟

ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی ئەو ئایەتە دابەزی من لەرزم لێ نیشتووە ئەترسم، چونکە من دەنگم بەرزە، کەواتە هەموو کردەوەکانم بەتاڵ بوویتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی دایەوەو دوعای خێری بۆکرد[2].

**٥٠٧. درۆ نەکردن**

[1]) پێغەمبەر ﷺ لە دڵی هاوەڵاندا- ل ٦٣.

[2]) پێغەمبەری خوا ﷺ لەدڵی هاوەڵاندا- ل ١١١.

جولاسی کوڕی سوید کابرایەکی دووڕو بوو ئیبن ئیسحاق دەڵێ: جولاس یەکێ بوو لەوانەی بەژداری نەکردبوو لە غەزای تەبووکدا، لە شوێنێکدا گوتبووی: (سوێند بێت ئەگەر ئەم پیاوە ڕاست بکات مەبەستی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ ئەوە ئێمە لە گوێدرێژ خراپترین، کاتێك ئەو قسەیەی کرد کوڕی ژنەکەی لە مێردێکی تر کە ناوی عومەری کوڕی سەعید بوو، گوێی لەو قسەیەی جولاس بوو، بە جولاسی گوت: بەڕاستی تۆم خۆش دەوێ‌و چاکەی زۆرت بەسەرمەوە هەیە، نامەوێ تووشی هیچ زیانێك بیت، بەڵام وتەیەکت لەدەم دەرچوو ئەگەر بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ بگێڕمەوە ئابڕووت دەچێ، ئەگەر بۆشی نەگێڕمەوە دینەکەم دەفەوتێ، گومانیشی تێدا نییە یەکەمیان ئاسانترە لەهی دووەمیان، عومەر هەستا قسەکەی جولاسی دەقاو دەق بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، جولاس حاڵی پەرێشان بوو جێی بەخۆی هەڵنەدەگرت، چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە سوێند خواردن‌و پاکانە کردن کە ئەم شتی وای نەگوتووە، بەڵکو عومەر درۆی بەدەمەوە کردووە، خوای گەورە ئەو ئایەتەی دەربارەی ناردە خوارەوە دەفەرمووێ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ﴾ التوبة، واتە: ئەو دوو ڕوانە سوێندت بۆ دەڕۆن کە شتی وایان نەگوتووە، بەڵام بێگومان وشەی کوفریان بەدەمدا هات پاش ئەوەی کە ئیسلامەتی خۆیان ڕاگەیاندبوو، بە نیاز بوون ئەوە بکەن کە بۆیان ئەنجام نەدرا، ئەو تۆڵەو ڕق‌و کینەیەیان لە بەرامبەر ئەو فەزڵ‌و بەخشە بوو کە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی بەخشی، ئەگەر ئەوانە تەوبە بکەن باشترە بۆیان، خۆ ئەگەر پشت هەڵ بکەن ئەوە خوای گەورە سزایەکی ئازار دەری بۆ ئامادە کردووە لە دونیاو قیامەتدا، لەزەویشدا هیچ پشتیوان‌و سەرخەرێکیان نییە، کاتێك جولاس گوێی لەو ئایەتە بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو گوتی: وابزانم خوای گەورە مۆڵەتێکی تری تەوبەی پێ بەخشیوم، ئایا دەکرێت تەوبە بکەم‌و بگەڕێمەوە لای خوا؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەڵێ.

جولاس گوتی: ئێستا دان بەوەدا دەنێم من ئەو قسەیەم کردووە، عومەیریش بەڕاستی قسەکەی گێڕاوەتەوە، پاشان جولاس تەوبەیەکی زۆر چاکی کردوە ئیسلامەتی ژیاو بە ئیسلامەتیش وەفاتی کرد[1].

## ٥٠٨. گەورەیی ئەنصارەکان

بەر لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینە نیشتەجێ بێ ماوەیەك لە (قُبَاء) مایەوە، هاوەڵانی کۆچ کردووانیشی لەگەڵدا بوو، ئەنصارەکان ڕێزێکی بێ وێنەیان لێگرتن لە نێوان خۆیاندا پێشبڕکێیان دەکرد لەسەر ڕێز لێگرتنی کۆچ کەرەکان، تا ئەو ڕاددەیەی تیرو پشکیان لەسەر دەکردن، ئەوانیان دەبردەوە سەر ماڵو حاڵی خۆیان، ئەمەش بەشێك بوو لەو وەفا دارییەیان بەرامبەر بەو پەیمانەی لە عەقەبە بە پێغەمبەری خوایان ﷺ دابوو، ئەنەس دەڵێ کۆچ کردووەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان: هەرگیز خەڵکی وا بەڕێزو سەخاوەت مەندمان نەبینیوە، لە هەموو شتێکدا بەژدارییان کردووین، تا گەیشتە ئەو ڕاددەیەی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەترسین ئەوان هەموو پاداشتە خواییەکان بۆخۆیان ببەن.

ئەویش فەرمووی: بریا زیاتریش بەوەتان بزانیبا نزای خێریشتان بۆ کردبایان، پاشان بە ئەنصارییەکانی فەرموو: برایانی بەڕێزم، برا کۆچەریەکانتان کۆچییان کردووە ماڵو سامانو خاكو وڵاتی خۆیان جێهێشتووە، هاتوون بۆلاتان، ئەنصارییەکان گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ماڵەکانمان لەگەڵیاندا بەش دەکەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەتوانن چی تر بکەن؟

ئەنصارییەکان گوتیان: وەکو چی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟

ئەویش فەرمووی: کۆچەریەکان کۆمەڵێکن ناتوانن کار بکەن لە کشتوکاڵدا داوا دەکەم لە بەرو بومەکانی خۆتانیان بدەنێ، گوتیان بەسەرچاو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٥.

لەشەڕی بەنو (نضیر)دا هەندێ دەست کەوتی جەنگی دەست کەوت بۆ ئەوەی هەندێ باری سەر شانی ئەنصارییەکان سووك بکات، بانگی کردن هاتنو دانیشتنی لەگەڵدا کرد، پاش حەمدو سەنای خوای گەورە وەصفێکی مەزنی گیانی لەخۆبوردەیی ئەنصارەکانی کرد، سوپاسی زۆری کردن لەسەر ئەو ڕێزو تەقدیرەی کە ئەوان لە براو خوشکە کۆچەریەکانیان ناوە، پاشان پێی فەرموون: خۆتان دەزانن ئەو دەستکەوتی شەڕە بریتییە لەماڵو سامان ئەگەر پێتان خۆشە لەنێوانی ئێوەو برا کۆچکردووەکانتان دابەشی دەکەم، با کۆچەریەکان لە شوێنەکانتاندا بمێننەوە، یان هەموو دەستکەوتەکان، یان هەموو دەستکەوتەکان دەدەن بە ئەوان با لە شوێنەکانی ئێوە بڕۆنە دەرەوە ئەمەش بار سووکیە بۆ ئێوە، ئێوەش خەریکی کاری خۆتان بن، جا نازانم ڕای ئێوە بەرامبەر ئەو پێشنیارە چییە؟

بۆ وەڵامی ئەو پێشنیارەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکردەی هەردوو خێڵی ئەوسو خەزرەج کە گەورەترین دوو خێڵی شاری مەدینە بوون، سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادە هەردووکیان گوتیان:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە تکامان وایەو داوا دەکەین هەموو دەستکەوتەکان لەنێو برا موهاجیرەکانمان دابەش بکەیت، ناهێڵین لەنێو شوێنەکانی ئێمە بڕۆنە دەرەوە، باوەکو خۆیان بمێننەوە تۆ گەورەی ئێمەیتو ئەوانیش خوشكو برامانن، هەموو ئەنصاریەکانی تریش بەدەنگی بەرز هاواریان کرد کە ئێمە قبوولمانە ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، پێغەمبەری خۆشەویست بەو هەڵوێستەیان یەکجار دڵخۆش بوو بۆیە دوعایەکی بۆ کردن کە ئەو دوای ئەوە بۆیان بێتە خوارەوە فەرمووی: {اللَّهُمَّ ارْحَمِ الأَنْصَارَ، وَأَبْنَاءَ الأَنْصَارِ، وَأَبْنَاءَ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ} واتە: خوایە ڕەحم بە ئەنصارو ئەوەی ئەنصارو نەوەی نەوەی ئەنصار بکەی، دوای ئەوە سامانەکەی لەنێوان موهاجیریندا دابەش کردو، دوو هەژاری ئەنصارییەکانیشی بێ بەش نەکرد لەو سامانە، بەڕاستی ئەو هەڵوێستە جوامێرانەیان وای لێکردن شایەنی ئەو پاڕانەوەیە بن کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

بۆی کردن، کاتێ ئینسان سەیری ئەو هەڵوێستانە دەکات ئنجا بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئەو ئیسلامە لەسەر دەستی چ جۆرە پیاوێك هاتۆتە دی[1].

## ٥٠٩. خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای سەواد

ئیبن ئیسحاق دەگێڕێتەوە لەو کاتەی کە هەردوو سوپای مسوڵمانانو موشریکان لەنزیك ئاوی بەدردا بەرامبەر یەکتر وەستان، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرگەرمی ڕیکخستنی ڕیزی سوپای مسوڵمانان بوو، تیریکی بەدەستەوە بوو بەو تیرە ڕیزەکانی ڕێك دەخست، لە یەکێ لە ڕیزەکان یەکێ لە هاوەڵانی بەڕێز کە ناوی (سەواد) بوو هەندێ لە ڕیزەکە هاتبووە دەرەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە کلکی تیرەکە لە ورگیدا بۆ ئەوەی بکشێتەوەو ڕیزەکە ڕێك بێت، سەواد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئازارم پێگەیشت، پێغەمبەری خوا فەرمووی: تۆڵەی خۆت بستێنە ئەی سەواد، تیرەکەی دایە دەستی، سەواد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ کاتێ دەسکی تیرەکەت لە زگمدا زگم ڕووت بوو، دەمەوێ تۆش کراسەکەت هەڵدەیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سکی موبارەکی خۆی بۆ دەرخست بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی بکاتەوە، سەوادیش یەکسەر پری دایە سکی موبارەکی پێغەمبەری خواو ماچی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی سەوادی پێ سەیر بوو بۆیە پێی فەرموو ئەوە چییە سەواد بۆ وات کرد؟

سەواد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خۆت دەزانی ئەوڕۆ ڕۆژی ڕوو بەڕوو بونەوەیە، هەست دەکەم لەم شەڕەدا شەهید دەبم، بۆیە حەزم کرد لەدوا ساتەکانی ژیانم پێستم بەر پێستی موبارەکی تۆ بکەوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای خێری بۆ کرد، ئەوەبوو لەشەڕەکەدا سەواد شەهید کرا خوا لێی ڕازی بێ[2].

## ٥١٠. ترسان لە سزای نەزەر کردن

ثەعلەبەی کوڕی عەبدوڕەحمان یەکێك بوو لەو هاوەڵە بەڕێزانەی خزمەتی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کارێك ڕەوانەی شوێنێکی

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣-٢٥.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٣- ٣٤.

کرد، لە ڕێگادا بەبەردەم دەرگای ماڵێکی ئەنصارییەکان تێپەڕی دەرگاکەیان کرابۆوە، ژنێك لە حەوشەکە خۆی دەشۆری، ثەعلەبە خۆی بۆ نەگیراو سەیری ژنەکەی کرد، هێندەی پێنەچوو ترسێك دایگرت، ترسا لەوەی وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزێ باس لەو کردەوەیەی ئەو بکات، بۆیە ثەعلەبە نەگەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا سەری خۆی هەڵگرت چوو بۆ نێو چیاکانی نێوان مەککەو مەدینە، ماوەی (٤٠) ڕۆژ لەوێدا بوو، جوبریل هاتە لای پێغەمبەری خواو پێی فەرموو ئەی موحەممەد خوای گەورە سەلامت لێدەکا، پێت دەفەرمووێ پیاوێك لە ئوممەتەکەت لە نێو چیایەکدا پەنای بەمن گرتووە، پێغەمبەری خوا بە پێشەوا عومەرو سەلمانی فەرموو: بڕۆن بەشوین ثەعلەبە جگە لەو باوەڕ ناکەم کەسێکی تر بێ چونکە ئەو ماوەیەکی زۆرە دیار نییە، چوون بەدوایدا گەڕان شوانێکیان بینی پرسیاریان لێکرد دەربارەی ثەعلەبە، شوانەکە گوتی: مەبەستتان ئەو کەسەیە لە دەست جەهەننەم ڕای کردووە؟

ئەوانیش بە شوانەکەیان گوت: بۆچی دەڵێی لەدەست جەهەننەم ڕای کردووە؟

شوانەکە گوتی: چونکە هەرکاتێ شەو دادێت ئەو گەنجە دەستەکانی لەسەر سەری خۆی دادەنێت و دەگریت، هاوار دەکات دەڵێ: خۆزگە گیانمت بکێشابا ئەی پەروەردگارم، خۆزگە زیندووت نەکردباما بۆ ڕۆژی حەق و حیساب.

پێشەوا عومەر فەرمووی: بەڵێ ئەو پیاوەمان گەرەکە، شوانەکە هەردووکیانی بۆلای ثەعلەبە برد، پێشەوا عومەر کە ثەعلەبەی بینی بۆ لای ڕۆیشت، لەباوەشی گرت، ثەعلەبە گوتی: ئایا پێغەمبەری خوا بە گوناهەکەمی زانی؟

پێشەوا عومەر گوتی: نازانم بەڵام دوێنێ باسی تۆی کردو ئێمەی بەشوێن تۆدا نارد، ثەعلەبە گوتی توخوا یەکسەر مەمبەنە لای با لەو کاتە بچین کە ئەو خەریکی نوێژ کردنە، بەم شێوەیە هەرسێکیان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا لەکاتی نوێژ کردن، پێشەوا عومەرو سەلمانی فارسی چونە ڕیزی نوێژو ثەعلەبەش لە پشتیانەوە، کاتێ پێغەمبەری خوا سەلامی دایەوە پرسیاری کرد ئەی کوا ثەعلەبە؟

عومەر ئاماژەی بۆ کرد بینیان ثەعلەبە لەشەرمی پێغەمبەری خوا لە هۆش خۆی چووە، پێغەمبەری خوا چووە لایو ثەعلەبە بەهۆش خۆی هاتەوە، پێغەمبەری خوا پرسی: چی وای لەتۆ کرد لێمان دوور بکەویتەوە ئەی ثەعلەبە؟

ثەعلەبە گوتی: گوناح کردنم ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئایەتێکت پێ بڵێم هەموو گوناهەکان ڕەش بکاتەوە ئەی ثەعلەبە؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: گوتنی ئەو ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿...رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ﴿٢٠١﴾﴾ البقرة، ثەعلەبە گوتی: بەڵام گوناهەکەم گەورەترە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا فەرمووی بەڵکو وتەی خوا گەورەترە، پاشان فەرمانی بە ثەعلەبە کرد بچێتەوە نێو ماڵی خۆی، هەشت ڕۆژ بەسەر گەڕانەوەی ثەعلەبە تێپەڕی، بەڵام ثەعلەبە ئەو کوڕەی جاران نەمابوو، پاش ئەو هەشت ڕۆژە ڕۆژێکیان سەلمان بە پێغەمبەری خوا گوت: ئەگەر سەردانی ثەعلەبە بکەیت لەحاڵەتی سەرەمەرگ دایە بەهۆی داخو حەسرەتی ئەو گوناهەوە کە ئەنجامی داوە.

چووە لای ثەعلەبە سەری ثەعلەبەی لەسەر کۆشی موبارەکی خۆی دانا، بەڵام ثەعلەبە خێرا سەری خۆی لەسەر کۆشی پێغەمبەری خوا لابرد، پێغەمبەری خوا فەرمووی: بۆچی سەرت لادا ئەی ثەعلەبە؟

ثەعلەبە گوتی: لەبەر ئەوەی پڕە لە گوناح.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: بەدەست چییەوە دەناڵێنی ئەی ثەعلەبە؟

ثەعلەبە گوتی: بەدەست شتێك دەناڵێنم وەك دەنگی مێروو وایە لەنێو گۆشتو ئێسقانو پێستمەوە.

پێغەمبەری خوا پێی فەرموو حەزت لە چییە؟

ثەعلەبە گوتی: لێخۆشبوونی پەروەردگارم.

لەو کاتەدا جوبرل دابەزی بۆلای پێغەمبەری خواو پێی فەرموو ئەی موحەممەد خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەگەر ئەو بەندەیەم بەقەد کەفی دەریا گوناهی ئەنجام دابێ لەو کاتەی کە وەفات دەکاو دەگەڕێتەوە لام من لێیخۆش دەبم.

یەکسەر پێغەمبەری خوا ئەو موژدەیەی بە ثەعلەبە گەیاند، ئیتر ثەعلەبە هاوارێکی لێ هەڵساو گیانی کێشرا، پێغەمبەری خوا فەرمانی کرد بە شوشتن و کفن و دفن کردنی پاشان نوێژی لەسەر کرد، کاتێ بردیان بەرەو گۆڕستان بینیان پێغەمبەری خوا بە نووکی پەنجەکانی بەسەر زەویدا دەڕوا، بۆ ئەمە لێیان پرسی کە بۆچی بەم شێوەیە دەڕوا؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە نەمتوانی پێیەکانم بەتەواوی لەسەر زەوی دابنێم لەبەر زۆری ئەو فریشتانەی کە دابەزیبوون ئامادەی ناشتنی ثەعلەبە بوون[1].

### ٥١١. زانستی میرات

دەگێڕنەوە ژنیک هاتە لای یەکێك لە زاناکان و پێی گوت: براکەم مردوو لەدوای خۆی (٦٠٠) درهەمی جێهێشت،ماڵەکەیان دابەش کرد کەچی تەنها درهەمێکیان بەمندا، زاناکە تۆزێك بیری کردەوەو پاشان گوتی: لەوە دەچێ براکەت هاوسەرێك و دایکی و دوو کچ و دوانزە برای هەبێ، ئافرەتەکە سەری سوڕما گوتی: وەڵلا ڕاست دەکەی.

زاناکە گوتی: دەی کەواتە ئەو درهەمە مافی خۆتەو هیچ ستەمێکیان لێنەکردووی، دابەش کردنەکەش بەم شێوەیەیە، ئافرەتەکەی هەشت یەکی بەردەکەوێ دەکاتە (٧٥) درهەم، دوو کچەکەشی دوو لەسەر سێیان بەردەکەوێ دەکاتە (٤٠٠) درهەم، دایکەکەشی شەش یەکی بەردەکەوێ دەکاتە (١٠٠) درهەم، لەو پارەیە (٢٥) درهەم دەمێنێتەوە بەسەر هەر دوانزە براو خوشکەکەیان دابەش دەکرێت هەر برایەك دوو ئەوەندەی خوشکەکەی بەر

---

[1]) ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم- ل ١٠٠.

دەکەوێ واتە (٢) درهەم، بە هەموویان هەمووی دەکاتە (٢٤) درهەم ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها (١) درهەمە ئەویش ماڤی تۆیە[١].

## ٥١٢. گرنگی سەرکردە

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی پیاوێك لە هۆزی حیمیر پیاوێکی لە دوژمن کوشت، ویستی چەك و شمەکەکەی ببات، خالیدی کوڕی وەلید کە سەرکردەیان بوو قەدەغەی کرد، عەوفی کوڕی مالیك چوو ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە خالیدی فەرموو چ شتێك وای لێکردی ئەو چەکو شمەکەی نەدەیتێ، خالیدیش گوتی: بە زۆرم زانی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە خالیدی فەرموو: بیدەرێ، ئەویش پێیدا دوای ئەوە خالید بەلای عەفدا تێپەڕی عەوف عەباکەی خالیدی ڕاکێشاو گوتی: ئایا بەڵێنەکەی خۆم بردە سەر کە گوتم سکاڵات لەسەر تۆمار دەکەم لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لەو قسەیەی عەوف بوو بە خالیدی فەرموو: مەیدەرێ، ئایا ئێوە واز لە سەرکردەکانم دەهێنن بۆ من؟

نمونەی ئێوەو ئەوان هاوشێوەی پیاوێکە شوانی کۆمەڵێك وشتر یا مەڕە، دەیانلەوەڕێنێ پاشان چاوەڕوانی ئاودانیان دەبێت، دەیانباتە سەر گۆمێك ئەوانیش دەست پێ دەکەن ئاوە ڕۆن و پاکەکەی دەخۆنەوە لێڵاوەکەی بەجێ دێڵن، ئاوە ڕوون و پاکەکەی بۆ ئێوەیە لێڵەکەشی بۆ سەرکردەکانە[٢].

## ٥١٣. لەکاتی پێش نوێژی کردنت بۆ خەڵك نوێژەکانت زۆر درێژ مەکەوە

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا ناچم بۆ نوێژی بەیانی تەنها لەبەر ئەوەی فلاَن کەس نوێژەکەمان زۆر بۆ درێژ دەکاتەوە، ئیبن و مەسعود دەفەرمووێ: بەو هۆیەوە ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی بۆدابن

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٧٢.

[٢]) کاتێك پێغەمەبەری خوا ﷺ تووڕە بو- ل ١٥٠- ١٥١.

هەرگیز نەمبینیوە پێغەمبەری خوا لە وتاردانـدا ئەوەنـدە تـووڕە بـێ وەك ئـەو ڕۆژە، پاشـان فـەرمووی: {إنَّ مِنكم منفرين} واتـە: كەسـانێكتان تێدایـە خـەڵكی لـەدین دووردەخەنـەوە، بۆیە هەركەسێكتان نوێژی بە خـەڵك كـرد بـا كورتی بكاتـەوە، چـونكە كەسـانی بـە تەمـەنو لاوازو خاوەن پێداویستیتان تێدایە[1].

### ٥١٤. ڕێزی هاوەڵانی بەڕێز لای پێغەمبەر ﷺ و بەزەیی پێغەمبەر ﷺ

كاتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ شـاری تـائیفی ئـازاد كـرد، وشـترەكەی بـەرەو ناوچـەی (جەعرانـە) گەڕایـەوە، ئـەبو هـەرەمی غیفـاری شـان بەشـانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەمیش بەسواری وشترەوە دەڕۆیشت، بەشێوەیەك ڕۆیشت ئـازاری قاچـە موبارەكـەكانی پێغەمبـەری خوای داو ئێشی گەیانـدێ، پێغەمبـەری خـوا ڕووی تێكـردو پێـی فـەرموو: بەڕاسـتی ئـازارت گەیاندمێ، بۆیە بە نووكی قامچیەكەی دەستی كابرای دوورخستەوە، ئـەبو هـەرەمی غیفـاری دەڵێ ئەوەی لەنێوانی مـنو پێغەمبـەری خوادا ڕوویـدا زۆر پەرێشـانی كـردم، لـە حەزمـەتان جێگـەم بـەخۆم نـەدەگرتو نەدەحەوامـەوە، زۆر دەترسـام لـەوەی ئایـەتێك دەربـارەی مـن دابـەزێ، چـونكە ئـازاری پێیـە موبارەكـەكانی پێغەمبـەری خـوام دابـوو، بـۆ ڕۆژی دوایـی لـە جەعرانە وشترەكانم بردە دەرەوە بۆ لەوەڕانـدن، ئـەو ڕۆژە خـەریك بـوو لـە خـەمو خەفەتـدا دڵم بوەستێت، ئاواتم دەخواست بنێرێـت بـە شوێنمدا بـۆ ئـەوەی ڕازو نیـازی خـۆمی لەگـەڵ بكەم، سەر لە ئێوارە گەڕامەوە پێیان گوتم پێغەمبەری خـوا داوای كردوویـت، لـەدڵی خۆمـدا گوتم خوا یارێ ئاواتەكەم دێتە دی، كاتێ چوومە لای پێـی فـەرمووم: ئـەی هـەرەم دوێنـێ بـە پاژنەی پێیەكانت زۆر ئازارت دام، منیش بە كلكی قامچیەكەم دوورم خستیەوە، ئێسـتاش بـۆ ئەوە بانگم كردوویت لەبەرامبەر ئەوەی من بەنووكی قامچیـەكەم لێمـدایت بـۆ ئـەوەی دوور كەویتەوە، دەمەوێ ئەو مەڕو ماڵانە ببەیت وە گەردنم ئازاد بكەیت.

ئـەبو هـەرەم لـە خۆشـیا خـەریك بـوو بفڕێـت، لەبـەر خۆیـەوە دەیگـوت: ڕەزامەنـدی پێغەمبەری خوا بۆ من لەهەموو موڵكو ماڵی دونیا لەپێشترە[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٠.

[2]) پێغەمبەری خوا ﷺ لەدڵی هاوەڵاندا.

٥١٥. **ڕێزی ئافرەت لەلای پێشەوا ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ**

پێشەوا ئەبو بەکر لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا شەوان بۆ ئەوەی ئاگای لە حاڵی خەڵکی بێ بەناو کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا دەسووڕایەوە، شەوێکیان گوێی لە دەنگی ئافرەتێك دەبێ گۆرانی دەگوت: بۆ ئازاری دووری خۆشەویستەکەی، ئەویش لە دەرگای ماڵی ئەو ئافرەتەی دا، بە ئافرەتەکەی گوت: کێیە ئەوەی خۆشت دەوێ‌و لێت دوور کەوتۆتەوە وا هەڵبەست‌و گۆرانی پێدا دەڵێی؟

ئەویش پێی گوت کە فلان کەسە بەڵام ئەم لەبەر ئەوەی عەبدە ناتوانێ بگات بەو خۆشەویستەی، پێشەوا ئەبو بەکر لە خاوەنەکەی کڕی‌و ئازادی کرد بۆ ئەوەی بچێتەوە لای خۆشەویستەکەی[1].

٥١٦. **ڕێزی ئافرەت لای پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب**

لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا بە هەمان شێوەی پێشەوا ئەبو بەکر خوا لێیان ڕازی بێ عومەری کوڕی خەتتاب شەوانە بە ناو کۆڵانەکانی شاری مەدینە دەسووڕایەوە بۆ ئەوەی ئاگاداری وەزعی خەڵکی بێ، شەوێکیان گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو بەسەر خۆشەویستەکەی دا دەگوت: پێشەوا عومەر خوا لێی ڕازی بێ لەهەواڵی ئەو ئافرەتەی پرسی گوتیان ئەی خەلیفەی مسوڵمانان پیاوەکەی چۆتە جیهاد کردن‌و ماوەیەکی زۆرە نەگەڕاوەتەوە، پێشەوا عومەر هەر زوو کەسێکی بەدوایدا نارد بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لای خێزانەکەی وە بڕیاری دا کە نابێ کەس بۆ ماوەیەکی زۆر لە جیهاد کردن نەیەتەوە لای خێانەکەی[2].

٥١٧. **چارەسەری خۆشەویستی نێوان کوڕو کچ**

زبید دەڵێ لە ڕێگای مەککە لەسەر دیوارێك ئەم شیعرە نووسرابوو:

أما في عباد الله أو في أمائه كريم *** يجلي الهم من ذاهب العقل.

---

[1]) خۆشەویستی خوێندنەوەیەکی شەرعیانەو سەردەمیانە- ل ٤٠.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤١.

منیش پەیمانم دا ئەگەر بزانم کێ ئەم شیعرەی نوسیوە بە خۆشەویستەکەی بگەیەنم، جا کاتێك چووم بۆ موزدەلیفە گوێم لە گەنجێك بوو ئەو شیعرەی دەگوت، منیش چووم داوام لێکرد بزانم ئەو کەسەی خۆشی دەوێت کێیە؟

ئەویش پێی گوتم ئەو کەسەی خۆشی دەوێ کچە مامیەتی،ماڵی مامی لێیان بۆتە ڕکەو نایدەنێ، زبید دەڵێ: چوومە لای باوکیو هەوڵی زۆرم دا تا توانیم ڕازی بکەم کچەکەی خۆی پێبدا، لە کۆتاییدا کێشەکە بە زمواج کۆتایی هات[1].

---

[1]) خۆشەویستی خوێندنەوەیەکی شەرعیانەو سەردەمیانە- ل ٤١- ٤٢.

### ٥١٨. خۆشەویستی نێوان کوڕو کچێكو چارەسەریەك

عەبدوڵڵای کوڕی موعەممەری ئەلقەیسی دەڵێ: ساڵێکیان فەریزەی حەجم بەجێ دەگەیاند، شەوێکیان چوومە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی دانیشتبووم لە نێوانی مینبەرو گۆڕی موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لە دەنگی گەنجێك بوو دەگریاو لەبەر خۆیەوە ئەو چەند دێرە شیعرەی دەگوت:

شجاك نوح حمائم السدر ... فأهجن منك بلابل الصدر

أم عز نومك ذكر غانية ... أهدت إليك وساوس الذكر

فِي ليلة نــام الخــلي بــها ... وخلوت بالأحـــزان والفـــكر

يا ليلة طـالـت على دنــف ... يشكو الفراق وقلة الصبر

أسلمت من يهوى لحر جوى ... متوقد كتوقد الجمر

فالبدر بشهد أنني كلف ... مغرى بحب شبيهة البدر

ما كنت أحسبني بها شجناً ... حتى بليت وكنت لا أدري

منیش چووم بینیم گەنجێکە فرمێسك بە ڕوومەتیدا دێتە خوار سەلامم لێکرد، ئەویش پێی گوتم، جەنابت کێی؟

گوتم: عەبدوڵڵای کوڕی موعەممەری قەیس.

گوتی: فەرموو هیچ ئیشت هەبوو؟

گوتم: بەڵێ من لە ڕەوزە دانیشتبوم گوێم لە گریانی تۆ بوو، ئەم شیعرانەت دەگوت.

گوتی: من عوتبەی کوڕی حەببابی ئەنصاریم، ڕۆژێکیان چوومە مزگەوتی ئەحزاب، نوێژم کرد، پاشان لەلایەك دانیشتم بینیم کۆمەڵێك ئافرەت هاتن، لە نێو ئەو ئافرەتانە ئافرەتێکی زۆر جوانی تیابوو، هاتە پێشو پێی گوتم: عوتبە چی دەڵێی ئەگەر ئافرەتێك داوات لێبکات بیخوازی؟ پاشان بەجێی هێشتمو ڕۆیشت، لەو کاتەوە نە بینیمەوەو نە هەواڵی هەبو، نەمدەزانی چی بکەم؟ لە هەر شوێنێکی دەچووم بۆی ئەمدەدۆزیەوە.

منیش پێم گوت: براکەی خۆم تەوبە بکەو داوای لێبوردن لەخوای گەورە بکە، هەر لە مزگەوت پێکەوە بووین تاکو بەیانی داهات، بەیانی گوتی: هەڵسە براکەم با بچینە مزگەوتی ئەحزاب بەڵکو خوای گەورە دەرگای خێرت لێدەکاتەوە، ڕۆیشتین چووینە ئەو مزگەوتەو نوێژی نیوەڕۆمان لەوێ کرد، پاشان بینیمان کۆمەڵە ئافرەتێك هاتن بەلام ئەو ئافرەتەیان تیا نەبو کە عوتبە خۆشی دەویست، ئافرەتەکان هاتن گوتیان عوتبە چی دەڵێی دەربارەی ئەو ئافرەتەی کە داوای لێکردی بیخوازی؟

عوتبە گوتی: چی بەسەر هاتووە؟

ئەوانیش گوتیان: ماڵی لێرە نەماوەو باریان کردووە بۆ (السماوة).

عوتبە گوتی: ئەو ئافرەتە کێ بوو؟

گوتیان: ناوی ڕەییای کچی غەترپفی سەلەمییە.

منیش گوتم: عوتبە ئارام بگرە من ئەو کارەت بۆ پێك دێنم.

برۆ با بڕۆین بۆ مزگەوتی ئەنصار، هەڵساین‌و تا گەیشتینە کۆمەڵە کەسێك سەلاممان لێکردن ئەوانیش وەڵامیان داینەوە.

گوتم: خەڵکینە ئێوە چی دەڵێن دەربارەی عوتبەو باوکی؟

گوتیان: لە پیاوە بەڕێزەکانی نێو عەرەبن.

منیش گوتم: عوتبە ئافرەتێکی خۆش دەوێ لە سەماوە با یارمەتی بدەین‌و بچینە سەماوە بۆ داواکردنی ئەو ئافرەتە.

ئەوانیش گوتیان: باشە بەسەرچاو.

بەڕێکەوتین تاکو گەیشتینە ماڵەکانی بەنی سەلیم، جا کاتێك عەترپفی باوکی زانی ئێمە دەچین بۆ لای هات بەپیلمانەوە گوتی: یاخوا بەخێر بێن، ئێمەش پێمان گوت: هاتووین بۆ لای تۆ، چووین بۆ ماڵی ئەو پیاوەو حەیوانی بۆ سەربڕین، ئێمەش گوتمان نان ناخۆین تاکو داوایەکمان هەیە بۆمان جێبەجێ نەکەیت.

گوتی: داواکەتان چییە بۆتان جێبەجێ بکەم؟

گوتمان: هاتووین بۆ داوای کچەکەت بۆ عوتبەی کوڕی حەبابی کوڕی مونزیر.

باوکی گوتی: ئەوە لەدەستی من نییە، بەڵکو لەدەستی کچەکە خۆیەتی، دەچم پێی دەڵێم بزانم چی دەڵێ؟

باوکی بە تووڕەییەوە چووە لای کچەکەی و پێی گوت: عوتبە هاتووە بۆ داوات، کچەکە گوتی: باوکە لەبەرچی ئاوا تورەی، ئەوانە لەنێو عەرەبدا زۆر بەڕێزن، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوون.

باوکی گوتی: ئاخر پێم گەیشتووە عوتبە تۆی خۆش دەوێ بۆیە سوێندم خواردووە کە تۆی نەدەمێ.

کچەکە گوتی: بابە ئەنصارِ سوێندی لەو جۆرە بەهەڵە دادەنێن و قبووڵی ناکەن، واتە: وا باشترە بیانوویەکیان بۆ بهێنیتەوە نەك بڵێی سوێندم خواردووە.

باوکەکە گوتی: باشە ئەی چی بڵێم؟

کچەکە گوتی: مارەییەکی زۆر داوا کە چونکە ئەوان حەز بە مارەیی زۆر ناکەن، دەگەڕێنەوەو واز دەهێنن.

باوکی گوتی: زۆر چاکە، بەپەلە گەڕایەوە بۆ لایان و گوتی: باشە کێ هەڵدەستێ بەم کارە؟

عەبدوڵلای کوڕی موعەممەڕ گوتی: من.

باوکی کچەکە گوتی: مارەیی کچانی ئێمە زۆرە.

عەبدوڵلا گوتی: بڵێ بزانم چەندت دەوێ؟

باوکی گوتی: ١٠٠٠ مسقال زێڕو ١٠٠ قات جل و بەرگی نایاب و ٥ قوتی عەنبەر.

عەبدوللا گوتی: ئێمە قەبوولمانە، کەسێکی نارد بۆ شاری مەدینەو هەموو ئەو شتانەی هێنا کە باوکی کچەکە داوای کردبوو، چەند ڕۆژێك لەوێدا مانەوە، پاشان باوکی کچەکە گوتی: ئەوە کچەکە فەرموو بیبەن.

عەبدوللا دەڵێ: ئێمەش بە ٢٠ باری پڕ لە کەلو پەل ئەوێمان جێهێشتو بەڕێکەوتین تاکو نزیکی مەدینە بووین، بینیمان وا چەند سوارچاکێك بۆ لامن دێنو مەبەستیان شەڕکردنە، عوتبەش بۆیان چوو دانەیەکی لێیان کوشت، کە گەڕایەوە بەزەویدا کەوت، سەرمان کرد وا برینداره‌و خوێنی لێ دەتکێ، ئیتر بەو شێوەیە گیانی دەرچوو، ئێمەش هاوارمان کرد عوتبە عوتبە!!، ئافرەتەکە گوێی لەدەنگی ئێمە بوو خۆی لەسەر پشتی حوشترەکەی فڕێدایە خوارەوە، ئەویش گیانی دەرچوو، ئێمەش یەك گۆڕمان بۆ هەردووکیان لێدا هەردووکیانمان لە گۆڕەکە نا، دواتر گەڕامەوە، دوای حەوت ساڵ ڕۆژێکیان بڕیارمدا بچم سەردانی گۆڕەکەی عوتبە بکەم، هاتمە سەر گۆڕەکەی عوتبە بینیم دارێك لەسەر گۆڕەکەی چێنراوە، بە خەڵکەکەم گوت: ئەو دارە چییە؟

گوتیان: ئەوە داری بووكو زاوایە[١].

## ٥١٩. لێك حاڵی بوون

نادیە ئافرەتێك بوو پێی وابوو مێردەکەی گوێ بەبۆچوونو بیرۆکەکانی نادات، چونکە هەمیشە ئەو کاتانەی ئەو قسەی بۆ پیاوەکەی دەکرد پیاوەکەی سەیری لایەکی دیکەی دەکرد، ڕۆژێك نادیە بڕیاریدا ڕووبەڕوی پیاوەکەی ببێتەوە، بۆیە چاوەڕێی دەکرد تا پیاوەکەی بگەڕێتەوە، بۆیە کاتێ کە پیاوەکە هاتەوە نادیە گوتی: من دەزانم کە تۆ گوێ بە قسەکانی من نادەی، بەلاتەوە گرنگ نین.

مێردەکەی گوتی: بۆچی وا دەزانیت؟

نادیە گوتی: چونکە بەردەوام من کاتێ قسەت بۆ دەکەم تۆ سەیری لایەکی دیکە دەکەی.

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٤-٤٥.

پیاوەکەی گوتی: بە پێچەوانەوە من زۆر گوێ بەبیرۆکەکانی تۆ دەدەم، ئەوەتا هەمیشە بۆ هەموو شتێك پرسیارت لێدەکەمو بۆچوونەکانت وەردەگرم، لەبەر ئەوەش جار جار سەیری لایەکی دیکە دەکەم، چونکە ئەگەر بەردەوام سەیری چاوەکانت بکەم تەرکیزم نامێنێ، من خۆم لەسەر ڕێزگرتن لەکەسانی دیکە پەروەردە کراوم، باوکم فێری کردووم کە سەیر کردنی نێوچەوانی خەڵکانی دیکە واتای تەحەددا دەگەیەنێ، بۆیە دەمەوێ تۆ ئەوە بزانی کە لای من گرنگترین مرۆڤی، ئیتر چۆن بایەخ بە بیرۆکەکانت نادەم؟

بۆیە نادیە هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت داوای لێبوردن لە پیاوەکەی بکات، لەو ساش بەدواوە هەرگیز لە پیاوەکەی تووڕە نەدەبوو[1].

### ٥٢٠. بانگەوازیو زانینی لێی

ئیسحاقی کەندی یەکێ بوو لە زانایانی عێراق، خەڵکی بە فیلەسووفێکی گەورەیان ناوزەد دەکرد، ئایینی ئیسلامی قەبوڵ نەبو کابرایەکی کافر بوو، وابیری دەکردەوە کە هەندێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز تێکگیران لەنێوانیاندا هەیە، لەبەر ئەو عەقیدەیەی بڕیاری دا کتێبێك لەبارەی ئەو ئایەتانە بنووسێ کە بەبۆچوونی ئەو تێکگیران لەنێوانیاندا هەیە، لەماڵەوە دانیشتو دەستی کرد بە نووسینی ئەو کتێبە، ڕۆژێکیان یەکێك لە قوتابییەکانی خۆی بەیەکێ لەزانا خواناسەکان گەیشتو ئەو هەواڵەی پێدا، ئەویش گوتی: ئایا لەنێوان خۆتان پیاوێك نییە بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو پیاوە لەنووسینی ئەو کتێبە پەشیمان بکاتەوە؟

قوتابییەکە گوتی: ئێمە هەموومان قوتابی ئەوین کەی توانای کارێکی وامان هەیە، تا بتوانین لەو بیرو باوەڕەی هەیەتی پەشیمانی بکەینەوە، زانا خواناسەکە بە قوتابی ئەو پیاوە بێ باوەڕەی گوت: تۆ ئامادەیی ئەوەت تێدایە من فێری ئەوەت بکەم کە چۆن وەڵامی مامۆستاکەت بدەیتەوەو پەشیمانی بکەیتەوە؟

قوتابییەکە گوتی: بەڵێ.

---

[1]) پلان بۆ (٥٠٠) ساڵ دواتر- ل ٤٦.

زانا خواناسەکە گوتی: بڕۆ بۆ لای مامۆستاکەت ماوەیەك بەبەردەوام لەگەڵی بەو یارمەتی بدە لە کارەکانی تا وات لێدێ دەبی بەجێی باوەڕو متمانەی ئەو، خۆتی زۆر لەگەڵدا بگونجێنە، پاشان پێی بڵێ: مامۆستا من پرسیارێکم لە مێشکیدا دروست بووە، جگە لەتۆ پێم وانییە کەس بتوانێ ئەو پرسیارەم وەڵام بداتەوە، ڕوخسەت هەیە پرسیارەکەم بکەم؟ بێگومان ئەو کاتە ئەویش دەڵێ فەرموو بپرسە، تۆش پێی بڵێ: مامۆستا ئایا دەگونجێ خوای گەورە هەندێ ئایەتی ناردبێ تۆ تێیان نەگەی، یاخود بەجۆرێکی تر تێیانبگەی؟

بێگومان ئەویش دەڵێ: بەڵێ، پاشان پێی بڵێ: مامۆستا تۆ چوزانی مەبەستی خوا لەو ئایەتانە ئەوەیە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە؟ ئەو کاتە مامۆستاکەت بەجوانی تێدەگا لێت مەبەستی تۆ چییە؟

قوتابییەکە چووە لای ئەو فەیلەسووفەی مامۆستای کە ناوی ئیسحاق بوو، بەو دەستوورەی زانا خواناسەکە پێی گوتبوو بەم شێوەیە ئەنجامی دا، پرسیارەکەشی لێ پرسی، مامۆستاکەی گوێی بۆ گرت زۆر بە ڕێکی گوتی: پرسیارەکەت دووبارە بکەوە، قوتابییەکە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، فەیلەسوفەکە کەمێك بێدەنگ بوو پاشان گوتی: بەڵێ ڕاست دەکەی لەوانەیە خوای گەورە مەبەستێکی تری هەبێ جیا لەوەی لەڕواڵەتی ئایەتەکە بەدی دەکرێ، چونکە زاراوەکان لە ڕوانگەی زمانەکانەوە مانای جۆراو جۆریان هەیە، بە قەتابیەکەی گوت: ئەگەر بەڕاستی لە پرسیارەکەت ورد بیتەوە جێی باوەڕە، بە قوتابییەکەی گوت: سوێندت دەدەم پێم بڵێی کێ ئەو پرسیارەی پێ گوتی؟ لەکوێوە فێری بووی؟

قوتابییەکە لە سەرەتا نکوڵی لەوە کرد کەسێك ئەمەی پێ گوتبێ، گوتی هەروا بەمێشکم داهات، بەڵام کابرای فەیلەسوف هەر وازی لێنەهێنا، قوتابییەکە گوتی: ڕاستت ئەوێ لە زانایەکی خواناسەوە فێری بووم، لەسەر ئەمە ئیسحاقی فەیلەسوف بڕیاریدا

ئاگرێك بكرێتەوەو هەموو نوسراوەكانی كە لەبارەی ئایەتە دژ یەكەكان نووسیویەتی بیسوتێنێ[1].

## ٥٢١. تێگەیشتن لە وشەی یەكخوا پەرستی ( لا إله إلاّ الله )و كارپێكردنی

مامۆستایەكی بەڕێز چەند قوتابییەكی هەبوو وانەی عەقیدەی فێر دەكردن، مانای (لا إله إلاّ الله)ی فێر دەكردن، بەشێوەیەك فێری دەكردن كە خواو پێغەمبەرەكەی دەیانەوێ، مامۆستاكە زۆر ئارەزووی بەخێو كردنی باڵندەو پشیلەی هەبوو، ڕۆژێك یەكێك لە خوێندكارەكانی باڵندەیەكی تووتی بۆهێنا، مامۆستاكە تووتیەكەی زۆر خۆش دەویست لەكاتی گوتنەوەی دەرسەكان لەگەڵ خۆی دەیبرد، هەتا وای لێهاتبوو توتیەكە فێری (لا إله إلاّ الله) ببوو، شەوو ڕۆژ دەیگوتەوە، ڕۆژێك خوێندكارەكانی مامۆستاكەیان بینی، بەكوڵ دەگریا وە زۆر دڵتەنگ بوو، كاتێك لێیان پرسی بۆچی بەو شێوەیە دەگری؟

گوتی: پشیلەكەم تووتیەكەی خواردووە، بەسەرسوڕمانەوە گوتیان بۆ ئەوە دەگری؟ ئەگەر دەتەوێ لەوە باشتر بۆ دەهێنین؟

مامۆستاكە گوتی: بۆ ئەوە ناگریم، كە پشیلەكە تووتیەكەی خوارد، بەڵكو بۆ ئەوە دەگریم ئەو تووتیە ماوەیەكی زۆرە فێری وشەی یەكخواپەرستی بووە، بەردەوام لەپێش خۆیەوە دەیڵێتەوە، بەڵام ئەو كاتەی پشیلەكە پەلاماری دا ئەو بەس دەیقیژاند هەرگیز (لا إله إلاّ الله)ی نەدەگوت: تاكو گیانی دەرچوو، ئەكەش ئەوە دەگەیەنێ كە تووتیەكە لەبەر ئەوەی بەس بەزمان (لا إله إلاّ الله)ی دەزانی بەڵام بەدڵو بەكردەوە تێی نەگەیشتبوو بۆیە هیچ سوودی لێنەبینی تاكو لەسەرە مەرگ بیڵێ، بەڵكو لەسەرە مەرگ ئەوەی لەبیری نەمابوو (لا إله إلاّ الله)كە بوو، منیش لەبەر ئەوە دەگریم دەترسم خوا نەخواستە ئێمەش كۆتایی ژیانمان وەك ئەو تووتیە بێ، بەردەوام (لا إله إلاّ الله) بڵێینەوە بەڵام لەكۆتاییدا نەتوانین بیڵێین، قوتابییەكان كە گوێیان لەو قسانەی مامۆستاكەیان بوو دەستیان كرد بە گریان لەترى ئەوەی ئەوەك ڕاستگۆ نەبن لە فێربوونو گوتنەوەی وشەی (لا إله إلاّ الله)، ئایا

---

[1] پلان بۆ (٥٠٠) ساڵی دواتر- ل ٣٣٣-٣٣٤.

ئێمەش ماناو مەبەستەکانی (لا إلە إلا الله) فێر بووینەو کارمان پێ کردووە بەو شێوەی خوای گەورە دەیەوێت[1].

## ٥٢٢. پیاوی بە حیکمەت لەگەڵ ئافرەتەکەی

پیاوێك لەخەو هەڵدەستێ لەگەڵ هاوسەرەکە دەست دەکەن بە خواردنی نانی بەیانی، پاشان دەچێتە ژوورەکەی تر بۆ ئەوەی کلیلەکانی بێنێ لەسەر مێزی تەلەفزیۆنەکە، سەیر دەکات هەم مێزەکەو هەم تەلەفزیۆنەکە تۆزێکی زۆریان لەسەر نیشتووە، لە ژوورەکە چووە دەرەوە بێ ئەوەی کلیلەکانی هەڵگرێ، کە هاتە دەرەوە پاش کەمێك بە خێزانەکەی گوت: گیانەکەم کلیلەکانم بۆ بێنە لەسەر مێزەکە، ئەویش چوو کلیلەکان بێنێ. بەڵام کە سەیری کرد بینی مێزەکە سەری پڕە لەتۆز، بە پەنجە لەسەر تۆزەکە نووسراوە هاوسەرە خۆشەویستەکەم خۆشم دەوێی!!، سەیری تەلەفزیۆنەکەی کرد بەهەمان شێوە نووسراوە خۆشم دەوێی ئەی هاوبەشی ژیان، هاوسەرەکەشی کلیلەکانی بۆ بردو زەردەخەنەیەکی گرت بەمانای ئەوەی پیاوەکەم ڕاست دەکەی پێویستە گرنگی بە پاکو خاوێنی ماڵەکەم بدەم[2].

## ٥٢٣. ئافرەتی بە حیکمەت لەگەڵ پیاوەکەی

ئافرەتێك ئێوارە کاتێك هاوسەرەکەی لەکار گەڕایەوە بینی ماڵەکەی زۆر شپرزەیە قاپو قاچاغ نەشۆراوە، جێگەکە هەمووی پەرش و بڵاو بوو زەویەکە هەمووی تۆزو خۆڵ بوو، هەروەها نانی ئێوارە ئامادە نەبوو، کاتێك پیاوەکەی ئەو حاڵەتەی بینی زۆر تووڕە بو، گەڕا بەدوای خێزانەکەی بینی وا لەسەر باڵکۆنەکە دانیشتووە لەسەر کورسیەك وا کتێب دەخوێنێتەوە، پیاوەکەی بە توڕەییەوە هاواری کرد ئافرەت ئیڕۆ تۆ چیت بەسەر هاتووە؟

ئافرەتەکە بەدەنگێکی خۆش وەڵامی دایەوە هیچم بەسەر نەهاتووە گیانەکەم، مەگەر تۆ هەموو ڕۆژ پێم نالێی تۆ هیچ کارت نییە لەماڵەوە، منیش ئیمڕۆ هیچ کارێکم نەکرد

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٤٢١- ٤٢٢.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٢٤.

هەر دانیشتم بۆ ئەوەی بزانی کە ئەگەر ڕۆژێك کاری ماڵەوە نەکەم بزانی ئەو ماڵە چی لێدێ[1].

## ٥٢٤. بەزەیی خوای بەبەزەیی

لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە بۆمان گێڕراوەتەوە دەڵێ: {جاء رجل إلى رسول الله صلى الله عليه و سلم فقال : واذنوباه واذنوباه فقال هذا القول مرتين أو ثلاثا فقال له رسول الله صلى الله عليه و سلم : قل اللهم مغفرتك أوسع من ذنوبي و رحمتك أرجى عندي من عملي فقالها ثم قال : عد فعاد ثم قال : عد فعاد فقال : قم فقد غفر الله لك} جارێکیان پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دوو یان سێ جاران گوتی: وای لە گوناهەکانم چەند زۆرن وای لە گوناهەکانم، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بڵێ: پەروەردگارم لێخۆشبوونی تۆ زۆر فراوانترو زۆرترە لە گوناهەکانی من، بەزەیی تۆ لای من زۆر زیاتر جێگەی ئومێدە لە کردەوەکانم، پیاوەکەش ئەوەی پێغەمبەری خوا پێی فەرموو پیاوەکە گوتی، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جاران ئەمەی پێ دووبارە کردەوە، ئنجا فەرمووی: هەستە ئیتر خوای بەبەزەیی لێت خۆشبوو[2].

## ٥٢٥. داپۆشینی عەیبو عاری خەڵك

کێشەیەك کەوتە نێوان پیاوچاکێكو خێزانەکەی هەربۆیە خێزانەکەی زیز بوو چۆوە بۆ ماڵی باوکی، خەڵکی چوونە لای پیاوچاکەکەو گوتیان خێزانەکەت بۆچی زیز بووە عەیبی چییە؟

پیاوچاکەکە گوتی: پیاو چۆن باسی عەیبو عاری خاوو خێزانی خۆی باس دەکات؟

کێشەی نێوان خۆیو خێزانەکەی قووڵ بویەوە تاگەیشتە ڕاددەی تەڵاق، لێك جیا بوونەوە، لەپاش بەسەر چوونی عیددەو شووکردنەوەی ئافرەتەکە بە پیاوێکی تر، خەڵکی

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٢٨.

[2]) ئەم بەسەرهاتە پێشەوا حاکم لە موستەدرەکی خۆی ڕیوایەتی کردووە.

هتن بۆ لای پیاو چاکەکەو ئیچستا خۆ خێزانی تۆ نەماوە پێمان بڵێ بزانین عەیبو کەمو کورپیەکانی ئەو ئافرەتە چی بوو؟

پیاوچاکەکە گوتی: ئنجا مسوڵمان بەچ حەقێك ئەو مافە بەخۆی دەدا باسی ناموسی خەڵکی بکا[1].

٥٢٦. سوود هەبوون بۆ کۆمەڵگا

ڕۆژێکیان جوتیارێکی چینی دەچێ بۆلای سەرتاشێك تا قژی بۆ بتاشێ، کاتێ تەواو بوو جوتیارەکە بە سەرتاشەکەی گوت: حەقەکەی چەند دەکات؟

سەرتاشەکە گوتی: هیچ ناکا!!.

جوتیارەکە گوتی: بۆ؟

سەرتاشەکە گوتی: دەمەوێ بەهۆی قژ تاشینی خەڵکی سوود بگەیەنم بە کۆمەڵگا.

جوتیارەکە گوتی: زۆر سوپاست دەکەم بەڕاستی شەرمەزارت کردم، بۆ بەیانی کاتێ سەرتاشەکە چووەوە بۆ دوکانەکەی بینی لەبەردەم دوکانەکەیدا سێ ئینجانەی پڕ لەگوڵو نامەیەك دانراوە، لەسەر نامەکە نووسرابو زۆر سووپاس، سەرتاشەکە زانی کە ئەمە کابرای جوتیار بۆ ناردووە[2].

٥٢٧. دەوڵەمەندترین کەس لە جیهاندا لەبرسان مرد

یەك لە ملیار دێرەکانی بەریتانیا ڕۆژێکیان چوو بۆناو ئەو ژووۆەی کە پڕی بوو لەپارەو پووڵو زێڕو گەوهەر، کاتێ چووە ئەو دیوی ژوورەکەی کە قاسەیەك بوو دەرگاکە قەپات دەبێو کلیلەکەشی لە دیوەکەی تر جێ دەمێنێ، ناتوانێ بەهیچ شێوەیەك بێتە دەرەوە ماڵو منداڵەکەشی زۆر بۆی دەگەڕێن نایدۆزنەوە، پاش چەند ڕۆژێك ئەومیان بەخەیالدا دێت لەناو قاسە گەورەکەیدا بۆ بگەڕێن، کە دەژنە نێوی دەبینن کابرا لەوێ

---

[1]) پلان بۆ (٥٠٠) ساڵی دواتر- ل ٤٦٢.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٦٣.

مردووە، دەستی خۆی بریندار كردووەو بە خوێنەكەی نووسیویەتی: دەوڵەمەندترین كەسی جیهان لەبرسان مرد[1].

**٥٢٨. گوێ بە قسەی خەڵكی مەدە**

لە شێخ حەسەنی بەصریيان پرسی: بۆچی گوێ بەقسەی خەڵكی نادەیت؟ ئەویش لەوەڵامدا گوتی: كە لەدایك بووم بەتەنیا بووم، كاتێكیش دەمرم بەتەنیا دەمرم، هەر بەتەنیاش دەچمەوە ناو گۆڕ، كاتێكیش لەبەردەم خوای گەورەدا لێپرسینەوەم لەگەڵ دەكرێ هەر بەتەنیام، كاتێ فەرمان دەكرێ بیبەن بۆ ئاگر هەر بەتەنیا خۆمم، ئەگەر بۆ بەهەشتیش بێ ئەو كاتیش هەر خۆمم، ئیتر چ باكێكم بە قسەی خەڵك بێ[2].

**٥٢٩. گەنجی تەقواكار**

گەنجێكی مسوڵمانی یەمەنی بەناوی عیصام لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەیخوێند لەویلایەتی ئەریزۆنا، ڕۆژێكیان لەماڵە تایبەتیەكەی خۆی لە نزیك ئەو زانكۆیەیە تێیدا دەیخوێند دەستدرێژی كرایە سەر لەلایەن پێنج كچە قوتابی ئەمریكی، كە لەهەمان كۆلێژ دەیانخوێند، دەچنە شوقەكەی عیصامو دەرگاكە كلیل دەدەن بۆ ئەوەی نەتوانێت هەڵێ، عیصام ناچار دەبێ لە پەنجەرەی ژوورەكەی خۆی هەڵبداو لەدەستیان ڕزگاری بێ، عیصام دەستبەجێ سكاڵا تۆمار دەكا لای پۆلیس لەسەر ئەو پێنج كچە، ئەوانیش پێنج كچەكە دەستگیر دەكەن، یەكێ لە كچەكان دانی بەوەدا كە وایان زانیوە ئەو گەنجە لە حاڵەتێكی دەروونی خراپدا دەژی لەبەر ئەوەی چەندین جار مەوعیدیان لەگەڵ داناوە بۆ ئەوەی كاری خراپیان لەگەڵدا بكات بەڵام ئەو ئامادە نەبووە، هەموو جارێ ئەمەی ڕەت كردۆتەوە، بە بیانووی ئەوەی كە ئەو كوڕێكە پابەندە بە دینەكەیەوە لە غەیری هاوسەرەكەی خۆی ئامادە نییە پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ هیچ كچێك ببەستێ[3].

**٥٣٠. بەندایەتی كردن بۆ خوای پەروەردگار بە ڕێكو پێكی**

---

1) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل- ٤٧٣.

2) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٧٢.

3) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٧٧- ٤٧٨.

پیاوێك دەچێتە لای بەرگدروو بۆ ئەوەی عەزیەیەك بۆ منداڵەکەی بدووریّ، پاش چەند ڕۆژێك پیاوەکە چۆوە لای بەرگ دروەکە بۆ ئەوەی عەزیەکە بهێنێتەوە، کاتێك عەزیەکەی بردەوە ماڵەوە بینی کەمو کوڕی زۆری تێدایە، بەپەلە بردیەوە بۆ لایو پێی گوت: ئەو عەزیەیەی کە تۆ دووریوتە کەمو کوڕی زۆری تێدایە، کابرای بەرگ دروو دەستی کرد بە گریان، کابرا باوکی منداڵەکە گوتی: کاکە ببورە نەمویست دڵگرانت بکەم.

کابرای بەرگ دروو گوتی: من لەبەر قسەکانی تۆ ناگریم، بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم من زۆر خۆم ماندوو کرد تا ئەوەی بتوانم عەزیەیەکی جوان بدوورم بۆ منداڵەکەت، سەرەڕای ئەو ماندوو بونە بەلام ئەوەتا کەمو کوڕی زۆری تێدایە، بیر لەوە دەکەمەوە خۆم زۆر ماندوو دەکەم بە عیبادەتی خوای گەورە داخۆ ئەویان چەند کەمو کوڕی تیایە!![1].

### ٥٣١. ئافرەتی ژیر

دەڵێن جارێکیان پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەیدا دەبێتە کێشەیان خێزانەکەی دەست دەکات بە گریان، لەو کاتەدا لە دەرگای ماڵەوەیان دەدریّ کە دەرگاکە دەکەنەوە هەندێ میوانی ژنەکەن هاتوون بۆ سەردانی کردنی، میوانەکان سەیر دەکەن ژنەکە فرمێسك بە چاوەکانی هاتوونەتە خوارەوە، ئەوانیش لێی دەپرسن: بۆچی گریاوی؟

ئافرەتەکە لە وەڵامدا دەڵیّ: بڕوا بکەن کەمێك پێش بەر لەوەی ئێوە بێن غەریبی ئێوەم دەکردو دەستم کرد بە گریان، خۆزگەم دەخواست ئێوە لێرە بوونایە[2].

### ٥٣٢. غەم مەخۆ بۆ ڕابردوو

پیاوێکی زیرەك لەناو کۆمەڵێك کەس دانیشتبوو، نوکتەیەکی گێڕایەوە هەمووان پێکەنین، دوای چەند ساتێك هەمان نوکتەی دووبارە کردەوە، بەلام ئەمجارە چەند کەسێك پێکەنین، دواتر پاش کەمێکی تر بۆ جاری سێیەم هەمان نوکتەی دووبارە کردەوە، جاری سێیەم کەس پێنەکەنی، خەندەیەکی کردو گوتی: ئەگەر نەتوانی بۆ نوکتەیەك چەند

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٧٨- ٤٧٩.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ٤٨١.

جارێك پێبكەنی، كەواتە بەهەمان شێوە بۆ نیگەرانییەك پێویست ناكات چەندان جار خەمبار بیت، پێویست دەكات ڕابردوو لەبیر بكەی[1].

### ٥٢٣. مسوڵمانێكی ژیر

دوو كەسی بێ باوەڕ لەناو فڕۆكەدا بوون، لەوڵاتێكەوە دەچوون بۆ وڵاتێكی تر، مسوڵمانێكیش لە پێشیانەوە دانیشتبوو، دوو كەسە بێ باوەڕەكە دەیانویست گاڵتە بە مسوڵمانەكە بكەن، یەكێكیان بەوی تری گوت: ئەمساڵ لەكاتی پشوودا دەمویست سەفەر بكەم بۆ ئەفریقیا، بەڵام كە زانیم نیوەی وڵاتانی ئەفریقیا مسوڵمانن نەچووم، ویستم بۆ كاركردن لە كۆمپانیایەك بچم بۆ وڵاتی سعودیە، بەڵام زانیم كە هەموویان مسوڵمانن نەچووم، برادەرەكەی گوتی: ئەی بۆ ناچی بۆ وڵاتێكی ئەوروپی؟

لەوەڵامدا گوتی: ئەوروپاش پڕ بووە لەو مسوڵمانانە پیاو نازانێ بۆ كێ بچێ مسوڵمانی لێ نەبێ؟

پیاوە مسوڵمانەكە لەو كاتەدا ڕووی كردە دواوەو گوتی: شوێنێكت پێ بڵێم مسوڵمانی لێ نەبێ؟

كابرا بێ باوەڕەكەش گوتی: زۆر سوپاست دەكەم ئەگەر پێم بڵێی.

پیاوە مسوڵمانەكە گوتی: دۆزەخ مسوڵمانی لێ نییە بۆخۆت ئەوێ بكە بەماڵی خۆت[2]

### ٥٢٤. دەوڵەمەندی كامەیە

ڕۆژێك پیاوێكی دەوڵەمەند كچەكەی برد بۆ گەشتێك، ویستی پێشانی بدات كە هەژاران چۆن ژیان بەسەر دەبەن، ماوەیەك كاتی خۆیان لە كێڵگەی خێزانێكی هەژار بەسەر برد، كاتێ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە پیاوەكە دەوڵەمەندەكە لە كچەكەی پرسی كچەكەم بینیت هەژاران چۆنن؟ پێم بڵێ: بزانم چیان لێوە فێر بوویت؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٨٥

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٠٠.

کچەکەی گوتی: باوکە ئێمە لەماڵەوە حەوزمان هەیە، بەلاَم ئەوان ڕووباریان هەیە، ئێمە شەوان چرامان هەیە بەلاَم ئەوان ئەستێرەیان هەیە، ئێمە خواردن دەکڕین بەلاَم ئەوان بەرهەمی دەهێنن، ئێمە دیواری ماڵەکانمان دەمانپارێزن بەلاَم ئەوان هاوڕێیان هەیە. ئێمە ئینسکلۆبیدیامان هەیە بەلاَ ئەوان قورئانیان هەیە، پاشان گوتی: باوکە زۆر سوپاست دەکەم پێت پیشاندام کە ئێمە چەندە هەژارین، کەواتە دەوڵەمەندی بریتی نییە لە هەبوونی ماڵ و سامان، بەڵکو بریتیە لە ژیانێکی سادەو، لەپێناو خوادا ژیان[1].

### ٥٣٥. چاکە کردن لەگەڵ دایک

گەنجێك بەر لەوەی ببێتە مامۆستا دایکی وەفاتی کرد، بەر لەوەی دایکی بمرێت کاری بەرگ دروویی دەکرد، نەیدەهێشت ئەو کوڕەی کار بکات حەزی دەکرد تەنها بخوێنێ، ئەو گەنجە لە بیری خۆیدا دابنابوو ئەگەر ببێتە مامۆستا هەموو مانگێك بڕێك لە مەعاشەکەی بدات بە دایکی، بەلاَم کاتێك دایکی وەفاتی کرد زۆر دڵتەنگ بوو، بەلاَم بڕیاریدا هەموو مانگێك لە بەرامبەر ئەوەدا بەشێك لە مەعاشەکەی بدات بە هەژاران، هەموو نوێژێکیش نزا بکات بۆ دایکی، بڕیاری دا یەکێ لەو خێرانەی دەیکات ئەوەبێ ئامێری ساردکەرەوە (برّاد) بکڕێ بۆ چەند مزگەوتێك بەخێری دایکی، ڕۆژێکیان لەماڵەوە هاتە دەرەوە بینی پیاوانی گەڕەکەکەی بەرادیەکیان پێیە دەیبەن بۆ مزگەوتی گەڕەکەکەیان، کە ئەو دیمەنەی بینی زۆر بێتاقەت بوو لەبیری خۆیدا گوتی: ئەو هەموو بەرادیەم کڕی بۆ مزگەوتان، کەچی مزگەوتی گەڕەکەکەی خۆمانم لەبیر کرد، کاتێ لەو بیرکردنەوەیەدا بوو مامۆستای مزگەوتەکە بانگی کردو گوتی: مامۆستا زۆر سوپاست دەکەم بۆ کڕینی ئەو بەرڕادیە، بەڕاستی کارێکی چاکت کرد، مامۆستاکەش زۆر سەری سوڕماو گوتی: بەلاَم بووره من ئەو بەرڕادیەم نەکڕیوە، ئیمامی مزگەوتەکە گوتی: نا نا مامۆستا ئەمڕۆ موحەممەدی کوڕت ئەو بەرادەی هێنای گوتی: ئەو بەرادە باوکم کڕیویەتی، موحەممەد هاتە لای باوکی و گوتی: باوکە گیان ئەو بەرادیە من کڕیم بەخشیم بە مزگەوت بۆ ئەوەی

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٠٠.

خەیرو پاداشتەکەی بۆتۆ بێ، چونکە دەبینم تۆ بەردەوام خەیرو چاکە بۆ داپیرم دەکەی منیش گوتم با ئەمە بۆ باوکم بکەم[1].

## ٥٣٦. ڕەوشتی مسوڵمانان

سێ گەنج گەنجێکی تریان بەند کردبوو هاتنە خزمەتی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب، پێیان گوت: ئەی پێشەوای مسوڵمانان ئەو گەنجە باوکی ئێمەی کوشتووە، دەمانەوێ حوکمی بەسەر بدەیت، پێشەوا عومەر بە گەنجە قاتیلەکەی گوت: بۆچی باوکی ئەو گەنجانەت کوشتووە؟

گەنجەکە گوتی: من حوشتر بەخێو دەکەم یەکێك لە حوشترەکانم چووە ناو باخی باوکی ئەو گەنجانە، باوکیانیش بەردێکی کێشا بە حوشترەکەی منو حوسترەکەمی کوشت، منیش هەمان ئەو بەردەم هەڵگرتەوەو کێشام بەباوکیان لە ئەنجامدا باوکیان مرد، پێشەوای مسوڵمانان گوتی: کەواتە دەبێ (حەددت) لەسەر جێبەجێ بکەم، گەنجەکە گوتی: داوا دەکەم ماوەی سێ ڕۆژ مۆڵەتم بدەی چونکە باوکم مردووە تەنها من برا بچووکەکەم لە ژیاندا ماوین باوکم هەندێ ئاڵتونی بۆ جێهێشتووین گەر من بکوژی ئاڵتونەکانم دەفەوتێنو برا بچووکەکەم سەرگەردان دەبێ، پێشەوا عومەر گوتی: کێ دەبێتە کەفیلت پاش ئەو سێ ڕۆژە بگەڕێیتەوە، گەنجەکە سەیرێکی خەڵکەکەی دەورو بەری خۆی کرد ئاماژەی بۆ پیاوێك کرد گوتی: ئەو پیاوە دەبێتە کەفیلم، پیاوەکەش ئەبو زەڕی غیفاری بوو خوا لێی ڕازی بێ.

پێشەوا عومەر گوتی: ئەی ئەبو زەڕ دەبیتە کەفیلی ئەو پیاوە؟

ئەبو زەڕ گوتی: بەڵێ ئەی پێشەوای مسوڵمانان.

پێشەوا عومەر گوتی: بزانە ئەگەر ئەو پیاوە ڕابکات من (حەددەکە) لەسەر تۆ جێبەجێ دەکەم.

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٢١.

کوڕە گەنجەکە ڕۆیشت، ڕۆژی یەکەم نەهاتەوە دووەم نەهاتەوە خەڵکەکە زۆر ناڕەحەت بوون کە نەگەڕێتەوەو حەددەکە لەسەر ئەبو زەڕ جێبەجێ بکرێ، ڕۆژی سێیەم کاتی نوێژی ئێوارە بوو بینیان گونجەکە پەیدا بوو، هەناسە بڕکێ بووبو زۆر ماندوو کفت بوو، بەپەلە لەبەردەم پێشەوای مسوڵمانان ڕاوەستا، گوتی: ئەی پێشەوای ئیماندارن ئاڵتونەکانم دایە برا بچووکەکەمو براکەشم سپاردە کەسو کارم، ئێستا لەبەردەمتام تا حەددم لەسەر جێ بەجێ بکەی.

پێشەوا عومەر گوتی: چی وای لێکردی بگەڕێیتەوە؟ لەکاتێکدا دەتتوانی هەڵێی؟

گەنجەکە گوتی: لەترسی ئەوەی نەوەك بڵێن کەسانێك نەماون خاوەن وەعدو پەیمان بن.

پێشەوا عومەر سەیری ئەبو زەڕی کرد گوتی: چی وای لێکردی ببیتە کەفیلی ئەو گەنجە کە نەتدەناسی، لەکاتێکدا کە ئەگەر نەگەڕابایەوە حەددەکەم لەسەر تۆ جێبەجێ دەکرد؟

ئەبو زەڕ گوتی: ئەی پێشەوای مسوڵمانان نەمویست خەڵکانێك بڵێن: لە نێو مسوڵماناندا کەس متمانەی بەکەس نییەو نابێتە کەفیلی برا مسوڵمانەکەی.

سێ گەنجەکەی کە باوکیان کوژرابوو زۆ بەو دیمەنە سەرسامو کاریگەر بوون، گوتیان: ئێمەش ئەو گەنجە دەبەخشینو داوای تۆڵەی باوکمان ناکەین.

پێشەوا عومەڕ گوتی: چی واتان لێدەکات لێی خۆش بنو تۆڵەی لێ نەسێنن؟

گوتیان: ئەی پێشەوای مسوڵمانان با خەڵکی نەڵێن لەنێو مسوڵماناندا یەکتری عەفو کردن نەماوەو کەس کەسی دیکە نابەخشێ"(1).

## ٥٣٧. هۆکاری سەرکەوتنی مسوڵمانان

قاسیدێك هات بۆ لای پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: سوپاس بۆ خوا لەجەنگ سەرکەوتین.

---

(1) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٢٣.

پێشەوا عومەر گوتی: كەی جەنگەكە دەستی پێكرد؟

پیاوەكە گوتی: پێش چێشتەنگاو.

پێشەوا عومەر گوتی: كەی سەركەوتن؟

پیاوەكە گوتی: دوای نوێژی مەغریب.

پێشەوا عومەر دەستی كرد بە گریان، گوتیان: ئەی پێشەوای مسوڵمانان ئێمە موژدەی سەركەوتنت پێ دەدەین كەچی تۆ دەگریت؟

پێشەوا عومەر گوتی: وەڵڵاهی ناهەق ئەو ماوەیە زۆرە لەبەردەم حەقدا خۆی ناگرێ، مەگەی ئێوە گوناهتان كردبێ یان من گوناهم ئەنجام دابێ، ئێمە ئوممەتێكین بەزۆری ژمارەی چەكو تفاقمان سەرناكەوین، بەڵام ئەگەر گوناهبار بووین وەكو ئەوان، ئەو كاتە ئەوان بەهۆی زۆری چەكو تفاقیان بەسەر ئێمەدا سەردەكەون[1].

### ٥٣٨. منداڵی ژیر

پاشایەك نەخۆش دەكەوێ نەخۆشیەكەی زۆر ترسناك دەبێ هەموو دكتۆرەكان لەسەری كۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی چارەسەری بكەن، گەیشتنە ئەو ئەنجامە ئیللا دەبێ جگەری كەسێكی تری بۆ دابنرێ بە كۆمەڵێك سیفەتەوە، پاشاش فەرمانی كرد بە دارو دەستەكەی گەنجێكی بۆ بدۆزنەوە ئەو سیفاتانەی تێدا بێ كە دكتۆرەكان باسیان كردووە.

پاسەوانەكانیشی مێرد منداڵێكیان دەست كەوت بەو مەرجانەوە كە ناوی (إبن دهقان) بوو، پاشا ناردی بەشوێن باوكو دایكی ئەو منداڵەو بڕێكی زۆر پارەی خستنە بەردەمی بۆ ئەوەی ڕازی بن منداڵەكەیان بخەنە قوربانی پاشا، پاشا فەتوایەكی بە دادوەرشدا كە گوایە پاشا دەتوانێ كەسێكی تر بكاتە قوربانی خۆی بۆ مانەوە.

گەنجەكەیان ئامادە كرد بۆ قوربانی كردن بۆ پاشا، ئەو مێرد منداڵە لەبەر دەم جەللادەكە وەستا بوو سەیرێكی جەللادەكەی كرد پاشان سەیرێكی ئاسمانی كردو دەستی

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ٥٢٥.

کرد بە پێکەنین، پاشا کە ئەمەی بینی بەپەلە نزیك بوویەوە لە مێرد منداڵەکە، بەسەر سوڕمانەوە پرسیاری لێکرد ئەمە بۆچی پێدەکەنی؟

مێرد منداڵەکە گوتی: پێویست بوو لەسەر دایكو باوکم بەزەییان پێمدا بهاتایەوە، یاخود دادوەر پێویست بوو لە فەتواداندا دادگەر بووایە، یاخود تۆ وەکو پاشایەك پێویست بوو کەسێکی بەخشندە بووایت، بەڵام دایكو باوکم ماڵی دنیا مەستو سەرکەشی کردن، ڕۆحی منیان بەتۆ فرۆشت، دادوەرش لەتۆ ترساو لەخوا نەترسا خوێنی منی بۆتۆ حەڵاڵ کرد، تۆش گەورەم چارەسەری نەخۆشی خۆت لە خوێنی کەسێکی منداڵی وەك مندا دەبینیتەوە! لە بینینی ئەو هەموو ستەمە زۆرە هیچ پەنایەکم شك نەبرد غەیری پەنای خوا نەبێت، ڕازی بووم بەو بەشەی ئەو بۆی بڕیار داوم، پاشا سەری سوڕما لە قسەکانی ئەو گەنجە بەزەیی پێدا هاتەوەو دەستی کرد بە گریان، گوتی: ئەگەر بەو نەخۆشیەوە بمرم زۆر باشترە بۆم حوێنی مێرد منداڵێك بڕێژم، مێرد منداڵەکەی لە باوەش کردو ماچی کردو پارەیەکی زۆری پێدا، پاش چەند لەم ڕووداوە خوای تەعالا شیفای پاشای داو ئەویش چاك بوویەوە[1].

### ٥٣٩. یەکێ لە موعجیزەکانی قورئان

لە یەکێك لە کۆلێژەکان دکتۆرێك باسی گەورەیی قورئانی دەکرد بۆ قوتابییەکانی، لە وتارەکەیدا ئاماژەی بەوە کرد کە خوای گەورە هەر پیتێکی لەو قورئانەدا لە شوێنی خۆی داناوە، کەمترین دەستکاری کردنی ئەبێتە هۆی گۆڕینی واتایەکەی، لەو کاتەدا قوتابییەك هەڵساو گوتی: مامۆستا من تێبینیم لەسەر یەکێ لە ئایەتەکانی قورئان هەیە.

مامۆستاکەش گوتی: کامە ئایەت؟

قوتابییەکە گوتی: ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۝٤ ﴾الأحزاب، واتە: خوا بۆ هیچ پیاوێك لەجەستەیدا دوو دڵی

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٣٠- ٥٣١.

دانەناوە، تێبینیەكەم ئەوەیە بۆچی تەنها باسی پیاوی كردووە، ئەی ئافرەتیش یەك دڵی نییە؟

قوتابیانی هۆڵەكە هەمووی بێدەنگ بوون‌و سەیری ڕوخساری مامۆستاكەیان كرد بزانن چی دەڵێ؟

دكتۆرەكە سەری خۆی داخست دەیزانی ئەگەر وەڵامێكی یەكلاكەرەوەی نەداتەوە قوتابییەكان هەموویان تووشی گومان دەبن بەو پرسیارە، كەمێك بیری كردەوە پاشان وەڵامێكی زۆر دڵنیاكەرەوەی دایەوەو گوتی: بەڵێ تەنها پیاو خاوەنی یەك دڵەو یەك دڵی لە جەستەدا بۆ دانراوە، ئافرەت هەموو كات یەك دڵی لە جەستەدا نییە، ئەوەتا لەكاتی دوو گیانیدا ئافرەت لە جەستەیدا دوو دڵ هەن دڵی خۆی‌و دڵی كۆرپەكەی، قوتابییەكان كە گوێیان لەو وەڵامەی مامۆستاكەیان بوو، زۆر دڵخۆش بوون، زیاتر لەو قسەیەی سەرەتا گەیشتن كە بەڵێ قورئان هەموو وشەیەكی لە شوێنی خۆیدایەو هیچ كەم‌و كورییەكی نییە[1].

٥٤٠. وەفـــــــا

دەگێڕنەوە پادشایەك فەرمان بە دەست‌و پێوەندەكانی دەدا (١٠) سەگی درندە ڕابگرن، بۆ ئەوەی هەر وەزیرێك هەڵە بكات بیخاتە بەردەم سەگەكان‌و لەت‌و پەتی بكەن، ڕۆژێكیان یەكێ لە وەزیرەكان بۆچوونی خۆی دەربارەی مەسەلەیەك بە پادشا دەڵێ، بەڵام پادشا بۆچوونەكەی بەهەڵە دەزانێت‌و پەسەندی ناكات، فەرمانی كرد ئەو وەزیرە بخەنە بەردەم سەگەكان،وەزیرەكە گوتی: ئەی پادشا لەبەر چی فەرمان دەكەی بكوژرێم لەكاتێكدا دە ساڵە خزمەتت دەكەم؟

بەڵام پادشا ئەو قسانەی نەچووە دڵی‌و سوور بو لەسەر جێبەجێ كردنی ئەو فەرمانەی دە دایبوو،وەزیرەكەی داوای لە پادشا كرد ماوەی (١٠) ڕۆژ مۆڵەتی بدات، پادشاش مۆڵەتی پێدا،وەزیرەكە یەكسەر چووە لای پاسەوانی سەگەكان‌و پێی گوت: مۆڵەتم بدە ماوەی (١٠) ڕۆژ من خزمەتی ئەو سەگانە بكەم.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٣٢.

پاسەوانەكە گوتی: ئنجا سوودی بۆتۆ چییەو چیت دەست دەكەوێ؟

وەزیرەكە گوتی: دوایی بۆت دەردەكەوێ چیم دەست دەكەوێ.زیرەكە دەستی كرد بە خزمەتی سەگەكانو خواردنی پێدەدانو شوێنی حەوانەوەی بۆ ساز دەكردن، پاش تێپەڕ بوونی (١٠) رۆژەكە پادشا فەرمانی كرد وەزیرەكە بخەنە ژووری سەگەكان، خۆیشی ئامادە بوو تاكو ببینێ چۆن لەتو پەتی دەكەن، كاتێ وەزیریان خستە بەردەم سەگەكان پادشا سەری سوڕما لەوەی سەگەكان لەبەردەم وەزیرەكە دەكرِوزێنەوەو بەدەوریدا دەخولێنەوە، پادشا بە وەزیرەكەی گوت: ئەوە چیت لەو سەگانە كردووە بەم شێوەیە رەفتارت لەگەڵ دەكەنو پرت نادەنێ؟

وەزیرەكە گوتی: گەورەم من تەنها دە رۆژە خزمەتی ئەو سەگانە دەكەم وەفایان هەیە بۆمو بۆم نایەن، لە كاتێكدا ماوەی دە ساڵە من خزمەتی تۆ دەكەم كەچی تۆ وەفات نییەو دەتەوێ بمكوژی، هەموو ئەو دە ساڵەت بیر چووە كە شەوو رۆژ خزمەتم كردوویت.

پادشا كە ئەو قسانەی وەزیری بیست دانی بە قسەكانی داهێناو ئازادی كردو پەشیمان بوویەوە[1].

٥٤١. **ئامۆژگاری**

كورێك كەوتە نێو روبارێكەوەو خەریك بوو بخنكێت، پیاوێكیش كە گوێی لە هاتو هاواری مناڵەكە بوو یەكسەر خۆی هاوێشتە نێو روبارەكە، كورەكەی هێنایە رۆخی روبارەكە، كورەكە گوتی: بەڕاستی نازانم چۆن سوپاست بكەم، پیاوەكە گوتی: كورەكەم بەوە دەتوانی سوپاسم بكەیت كە گەورە بوویت كارێك نەكەیت من پەشیمان ببمەوە لەوەی تۆم رزگار كردووە[2].

٥٤٢. **وەڵامی جوانی پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو تالیب خوا لێی رازی بێ بۆ پرسیارەكان**

پیاوێك لە پێشەوا عەلی دەپرسێ: واجب چییەو واجبتر چییە؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٣٥.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٦٦.

پێشەوا عەلی: واجب ئەوەیە خوای گەورە بپەرستی واجبتریش ئەوەیە واز لە سەرپێچی کردنی بهێنی.

پیاوەکە گوتی: نزیك چییەو نزیکتر کامەیە؟

پێشەوا عەلی: نزیك قیامەتە، نزیکتریش مردنە.

پیاوەکە: سەیر چییەو سەیرتر چییە؟

پێشەوا عەلی: ئەوەی سەیرە دنیایە، سەیرتر لە دونیا سەرقاڵ بوونە بە خۆشیەکانی.

پیاوەکە: قورس چییەو قورستر چییە؟

پێشەوا عەلی: قورس چوونە ناو گۆڕە، لە چوونە ناوگۆڕیش قورستر ڕۆیشتنە بۆی بەبێ تێشوو[1].

## ٥٤٣. گومان بردن

ئەگەر تۆ وەرەقەیەك و پێنووسێکت بەدەستەوە بێ لەشوێنێکی قەرەباڵەغ دابنیشی، خەڵکی بەم شێوەیە گومانت پێ دەبەن، پیرە پیاوێك وا دەزانێ نامە بۆ دایکت دەنووسی، گەنجێك وا دەزانێ نامە بۆ خۆشەویستەکەت دەنووسی، منداڵێك وا دەزانێ وێنە دەکێشیت، بازرگانێك وا دەزانێ پەیمانێك دەنووسی، فەرمانبەرێك وا دەزانێ قەرزەکانت دەژمێری، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێ هەرکەس هەڵس و کەوتی لەگەڵ بەرامبەرەکەی لەخۆیەوە دەبینێ، بۆیە نابێ بەبێ بەڵگە کوێرانە خەڵك هەڵبسەنگێنین[2].

## ٥٤٤. پیاوی بە حیکمەت لەگەڵ خێزانەکەی

ژنێك بە پیاوەکەی دەڵێ: خۆشترین سات بەلاتەوە کامەیە پیاوەکە؟

پیاوەکەی گوتی: هێشتا ئەو کاتە نەهاتووە؟

ژنەکە بەم وەڵامەی پیاوەکەی زۆر دڵتەنگ بوو، گوتی: ئەوە چ ساتێکە کە نەهاتووە؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٩٠.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٢١.

پیاوەکەی گوتی: ئەو ساتەیە کە دەرگام بۆ دەکەیتەوە لە بەهەشتو پێم دەڵێی بەخێر بێی بۆ بەهەشت هاوسەرە خۆشەویستەکەم[1].

٥٤٥. باوکی کەم تەرخەم

گەنجێك دەگێڕێتەوە دەڵێ: منو باوکم بەدیار تەلەفزیۆنەوە دانیشتبووین، لەو کاتەدا چاو پێکەوتنیان لەگەڵ گەنجێك کرد هەموو قورئانی لەبەر بوو، باوکم گوتی: داوەشێی کورم ئەم گەنجە لەتەمەنی تۆیە هەموو قورئانی لەبەرە، پاش کەمێك باوکی گەنجەکەی پێشاندا رێك لەتەمەنی باوکم بوو ئەویش هەموو قورئانی لەبەربوو، یەکسەر باوکم دەستی دایە کۆنترۆڵەکەو کەناڵەکەی گۆڕی[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٢٢.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٢٩.

٥٤٦. گـــــــــــــۆڕ

دکتۆر سەلمان عۆدە دەڵێ: لەگەڵ هاوڕێیەکم بەدوای جەنازەی ناسیاوێکم دەڕۆیشتین، بە هاوڕێکەم گوت: ناشتنی مردوو عیبرەتە بۆ زیندووو، هاوڕێکەم گوتی: گۆڕی بەتاڵ عیبرەتێکی گەورەترە بۆ کەسێ ئامادە کراوە کە ئێستا لەنێوانمان دایە ڕەنگە ئەوکەسە خۆشمان بین[1].

٥٤٧. مافی پیاوو ئافرەت لەسەر یەکتر

کوڕێك داوای لە کچێك کرد شووی پێ بکا کچەکە گوتی: مەرجت چییەو چیت لەمن دەوێ وەك هاوسەرێك، کوڕەکە گوتی: دەمەوێ هاوسەرێکی ڕاست گۆ بیت، قسە خۆش و ڕوو خۆش بیت لەگەڵم، جنێو فرۆش نەبیت، داوێن پاك و ڕەوشت بەرز بیت، کە لەلات دەبم دڵم ڕابگریت، کە لات نابم خیانەتم لێ نەکەیت.

پاشان کوڕەکە گوتی: ئەی تۆ چ مەرجێکت هەیە؟

کچەکە بە هێمنی گوتی: من تەنها یەك مەرجم هەیە.

کوڕەکە بەسەرسوڕمانەوە گوتی: تەنها یەك مەرج! زۆر ئاسانە بڵێ بزانم چییە؟

کچەکە گوتی: هەموو ئەو شتانەی بەمنت گوت: لەخۆتدا هەبێ[2].

٥٤٨. پشت بەستن بەخوا

دەگێڕنەوە حاتەمی ئەصەم بە منداڵەکانی خۆی گوت: دەمەوێ بچم بۆ سەفەری حەج، منداڵەکانی دەستیان کرد بە گریانو گوتیان: ئەی بەکێمان دەسپێری؟

کچێکی بەڕێزو دینداری هەبوو خوا نیعمەتی پشت بەستنی پێ بەخشیبوو، بە منداڵەکانی تری گوت: لێیگەڕێن با بڕوا خۆ ڕۆزی دەری ئێمە نییە، حاتەم سەفەرەکەی ئەنجامدا منداڵەکان برسیەتی تینی بۆ هێنان، زۆر سەرزەنشتی خوشکەکەیان کرد، کچەکەی

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٣٠.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٣١.

گوتی: خوایە خەجاڵەتم نەکەی لەنێو خوشكو براکانم، پاشی کەمێك گەورەی شارەکە بەلای ماڵی حاتەمدا تێپەڕی گوتی: بڕۆن لەو ماڵەدا هەندێ ئاوم بۆ بێنن، منداڵەکانی حاتەم لە گۆزەیەکی تازەدا ئاوی سازگارو ساردیان بۆ هێنا، پادشا گوتی: ئەوە ماڵی کێیە؟

گوتیان: ماڵی حاتەمی ئەصەممە.

پادشا کیسەیەکی زێڕی هەڵدایە حەوشەکەیان، گوتی: هەرکەسێ منی خۆش دەوێ با وەك من بکات، سەربازەکانیش هەریەکەو چەند پارەیەکیان خستە ئەو ئەو گۆزەوە کە ئاوەکەیان تێدا هێنابوو، کچەکە دەستی کرد بە گریانو گوتی: ئەوە دروست کراوەکانی خوا بوون چاویان بە ئێمە کەوت بەهۆی ئەو ڕەحمەی خوا خستوویتە دڵیان یارمەتیان داین، ئەی ئەگەر خوای دروست کەر خودی خۆی ڕەحممان پێ بکات دەبێ ڕەحمی چۆن بێ[1].

٥٤٩. **ئامۆژگاری کردنی سەرکردەکان**

ڕۆژێك شەبیب کە یەکێکە لە پیاو چاکان چووە لای خەلیفە مەهدیو پێی گوت: ئەی پێشەوای ئیمانداران خوای گەورە دنیای بەتۆ بەخشیوە، تۆش خۆشیو ئەمنو ئەمان ببەخشە بە گەلەکەت، هەندێ لەخۆشی ژیانی خۆت ببەخشە بە گەلەکەت.

خەلیفە گوتی: چ شتێك پێویستە بدرێ بەم خەڵکە؟

شەبیب گوتی: دادپەروەری، چونکە ئەگەر ئەو خەڵکە لە خۆشیو دڵنیاییدا نووستن تۆش بە خۆشیو دڵنیایی دەنوویت لە گۆڕەکەتدا، ئنجا گوتی: ئەی پێشەوا ئاگات لە شەوێك بێ کە ڕۆژی بەدوادا نایەت، ئاگاشت لە ڕۆژێك بێت کە شەوی بەدوادا نایەت، ئەوەندەی دەتوانی دادپەروەر بە، چونکە پاداشتی دادپەروەریت بە دادپەروەری دەدرێتەوە، پاداشتی ستەم بە ستەم، خۆت جوان بکە بەلەخوا ترسان، چونکە لە قیامەت کەس ناتوانێ پیاوی جوان ناشیرین بکات[2].

---

[1]) أصحاب الرسول ج١ ص ٣٨٦.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ل ١٩٨.

## ٥٥٠. گەورەیی خزمەت کردنی دایك

ڕۆژێك پێغەمبەر موسا سەلامی خوای لێبێ لەکاتی موناجات کردنیدا لەگەڵ خوادا داوای کرد کە خوای گەورە هاو مەجلیسی خۆی لە بەهەشتدا پێشان بدا، جوبریل سەلامی خوای لێبێ بە پێغەمبەر موسای ڕاگەیاند کە هاو مەجلیسی تۆ لە بەهەشتدا فلان کەسی قەصابە، لە فلانە گەڕەك، پێغەمبەر موسا چوو بۆ دوکانی کابرای قەصابو بینی گەنجێکە بە نۆبەنگری شەوان دەچێتو خەریکی گۆشت فرۆشتنە، پێغەمبەر موسا بەردەوام چاودێری ئەو گەنجەی دەکرد تا بزانێ چی وای لێکردووە ببێتە هاوشانو هاو مەجلیسی ئەو لە بەهەشتدا، بەلام هیچ شتێکی وای لێنەبینی سەرنجی ڕابکێشێ، کە شەو داهات قەصابەکە برێك گۆشتی لەگەڵ خۆی بردو بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوت، پێغەمبەر موسا شوێنی کەوتو چووە لای داوای لێکرد ئیمشەو داڵدەی بداتو لای خۆی بیهێڵێتەوە بێ ئەوەی خۆی پێ بناسێنێ، ئەویش بە دڵێکی فراوانەوە داواکەی قەبووڵ کردو پێشوازیەکی گەرمیشی لێکرد، پێغەمبەر موسا بینی گەنجەکە خواردن ئامادە دەکات، پاشان زەمبیلێك کە لە بنمیچی ژوورەکە هەڵواسرابوو هێنایە خوارەوە، پیرەژنێکی لەناو زەمبیلەکە هێنایە دەرەوە پیرەژنەکەی زۆر بەجوانی پاکژ کردەوەو جلو بەرگەکانی گۆڕی، بەدەستەکانی خۆی خواردنی پێدا، دوای تێرکردنی پیرەژنەکە بردیەوە شوێنی خۆی، پێغەمبەر موسا بینی پیرەژنەکە هەندێ قسەی نامۆی لەدەمدا دێتەدەر، پاشان پیاوەکە دەستی کرد بە خواردن ئامادە کردن بۆ پێغەمبەر موسا، دەستیان کرد بەنان خواردن پێغەمبەر موسا پرسی ئەو پیرەژنە کێیە؟

گەنجەکە گوتی: ئەمە دایکمە خزمەتی دەکەم.

پێغەمبەر موسا گوتی: دایکت شتێکی گوت: نەمزانی چییە دەکرێ بزانم چی گوتووە؟

گەنجەکە گوتی: هەرکاتێك خزمەتی دەکەمو خاوێنی دەکەمەوە، دەڵێ: کوڕم یاخوا خوا لێت خۆش بێتو بتکاتە هاو مەجلیسی پێغەمبەر موسا لە بەهەشتدا.

پێغەمبەر موسا گوتی: مزگێنیت پێ بدەم ئەی گەنج خوای گەورە دوعای دایکتی قەبووڵ کردوە.

گەنجەکە گوتی: چۆن دەزانیت؟

پێغەمبەر موسا خۆی پێناساندو ئەوەی بۆ گێڕایەوە کە جوبریل هەواڵی پێدابوو[1].

### ٥٥١. لەخوا ترسانی عەبدوڵڵای کوڕی پێشەوا عومەر خوا لێیان ڕازی بێ

دەڵێن ڕۆژێکیان عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر ئاوی ساری خواردەوە پاشان زۆر گریا، پێیان گوت بۆچی دەگری؟

گوتی: ئەو ئایەتەم بیر هاتەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ سبأ، واتە پەردە دەکەوێتە نێوان ئەهلی دۆزەخ لەگەڵ ئەو شتانەی کە حەزی لێدەکەن، عەبدوڵڵا گوتی: دەزانم ئەهلی دۆزەخ لە هەموو شتێك زیاتر کە حەزی لێدەکەن ئاوی ساردە،ك چۆن لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا۟ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾ الأعراف، ئەهلی دۆزەخ داوای ئاوو ڕۆزی لە ئەهلی بەهەشت دەکەن، بەلأم ئەهلی بەهەشت بە ئەهلی دۆزەخ دەڵێن: خوا گەورە ئەوانەی لە ئێوە حەرام کردووە[2].

### ٥٥٢. کەرامەتی پیاوچاکان

سیلەی کوڕی ئەشیەم کە یەکێکە لە خواناسانی جیلی تابیعی جارێکیان بۆ غەزا کردن لە پێناو خوادا دەچێتە دەرەوە، شەوی بەسەر دێتو بەتەنیا دەبێت لە دارستانێکدا، دەست نوێژ دەگرێتو دەست دەکات بە ئەنجامدانی شەو نوێژ، لەناکاو شێرێکی گەورەی دڕندەی لێ پەیدا دەبێ ئەمیش جارێ هەر لەناو نوێژدایە، شێرەکە لەدەوری دەسوڕێتەوە، ئەو پیاو چاکەش نوێژەکەی تەواو دەکات، بە شێرەکە دەڵێ: ئەگەر فەرمانت پێ کراوە بە خواردنم وەرە بمخۆ ئەگەر فەرمانیشت پێ نەکراوە بمخۆی بڕۆ وازم لێبێنە لێمگەڕێ با خوا پەرستی

---

[1]) ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم- ل ٩٨.

[2]) هاوەڵانی پێغەمبەر ب٢- ل ٣٧١.

خۆم بکەم، شێرەکە کلکی خۆی شۆڕ کردەوەو ڕۆیشت ئەویش دەستی کردەوە بەنوێژ کردنی خۆی[1].

### ٥٥٣. جیرانی چاك

عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دراوسێیەکی جوولەکەی هەبوو پێش منداڵەکانی خۆی خواردنی بە منداڵی ئەو پیاوە جوولەکەیە دەدا، جل‌و بەرگی بۆ دەکڕی‌و لەبەری دەکرد لەگەڵ منداڵەکانی خۆی، کاتێ جوولەکەکە ویستی خانووەکەی خۆی بفرۆشێ، داوای (٢٠٠٠) دیناری دەکرد گوتیان: خانووەکەت تەنها (١٠٠٠) دینار دێنێ، گوتی: دەزانم خانووەکەم هەر (١٠٠٠) دینار دێنێ، بەڵام بۆیە داوای (٢٠٠٠) دینار دەکەم، هەزارەکەی تر لەبەر ئەوەیە ئەو کەسەی خانووەکە بکڕێ دەبێتە جیرانی عەبدوڵلای کوری موبارەك، کاتێ عەبدوڵلا ئەمەی گوێ لێبوو دوعای هیدایەتی بۆ کرد، خوای گەورەش هیدایەتی داو مسوڵمان بوو[2].

### ٥٥٤. ئامەزرۆی فێربوونی زانست لەسەرە مەرگ

ئیبراهیمی کوڕی جەڕاح دەڵێ: باوکی یوسف تووشی نەخۆشی بوو، هاتم بۆ لای‌و سەردانم کرد، بێ هۆش بووبو، کاتێك بەهۆش خۆی هاتەوە پێی گوتم: ئەرێ تۆ چی ئەڵێی بۆ ئەمە پرسیارێکی شەرعی لێکردم؟

گوتم: ئاخر لەو کاتەدا کە تۆ زۆر نەخۆشی؟

گوتی: قەیناکە با قسەی لەسەر بکەین، بەڵك‌و یەکێکمان بەهۆیەوە ڕزگارمان دەبێ لە دۆزەخ، پاشان گوتی: ئەی ئیبراهیم ئینسان بە پێوە بەردی جەمەرات باوێ باشترە یان لەسەر پشتی وولاخ؟

منیش گوتم: بەسواری وولاخ. ، ئەویش گوتی: نەتپێکا.

گوتم: بە پێوەو بە سواری وولاخ.

گوتی: نەتپێکا ، گوتم: ئەی کامیان باشترە؟

---

[1]) دڵ تەنگ مەبە- عائض القرني- ل ٢٩٦.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٥.

گوتی: هەر کەس وەستا لای جیمار ئەوە واباشە بە ڕۆیشتنەوە بەردەکانی فڕێ بدا، بەڵام ئەگەر کەسێك نەوەستێ بەلای جیمار باشتر وایە ئەو کاتەی بەردەکانی فڕێ دەدا بەسواری بێ، پاشان ئیبراهیم دەڵێ لەلای هەستام، دوورنەکەوتبوومەوە گوێم لەدەنگی گریان بوو زانیم کە وەفاتی کرد، خوای گەورە لە ئەوو لە ئێمەش خۆش بێ[1].

٥٥٥. غەم مەخۆ دڵتەنگ مەبە

نەخۆشێك پرسیاری دڵە ڕاوكێو دوودڵیو لەرزۆكی لە دكتۆرێكی مسوڵمان كرد، دكتۆرەكە گوتی: هیچ غەم مەخۆ چونكە خوای گەورە كۆتایی هێناوە بە شتەكانو فەرمانی بۆ دەر كردووە، بێ فەرمانی ئەو هیچ شتێك ناكرێ، كەواتە: هیچ شتێك پێویست بەغەم خواردن ناكا، خوای پەروەردگار بەر لە دروستكردنی دروست كراوەكانی شتەكانی نووسیوە[2].

٥٥٦. حەوانەوە

قوتابییەكی نێجیری دەڵێ: هەموو بەیانیەك دایكم بێداری دەكردمەوە بۆ نوێژی بەیانی، منیش دەمگوت: دایە گیان لێمگەڕێ با ئیسراحەت بكەمو بحەوێمەوە، دایكیشم دەیگوت: كوڕەكەم من بۆ ئەوە بانگت دەكەم بحەوێیەوەو ئیسراحەت بكەی[3].

٥٥٧. ئیصراف كردن

دەگێڕنەوە جارێك پیاوێك سكی خۆی گرتبوو دەینالاند گوتیان: ئەوە چیتە؟ گوتی: زۆر زیاترم لەخۆم خواردووە تووشی ژانە سك بوویمە، بەلای كەسێكی تردا تێپەڕین سكی خۆی گرتبوو دەینالاند گوتیان: ئەوە چیتە: گوتی لە برسان سكم دێشێ، گوتیان: ئەگەر ئەو پیاوەی یەكەم ئەوەندەی نەخواردباو زیادەكەی بدابا بە ئەوەی دووەم، ئەو كاتە هیچ كامێكیان سكی نەدەهێشا.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣٩.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٢١٨.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٥٩.

### ٥٥٨. خێر کردن

ئەیوبی کوڕی وائیلی ڕاسبی دەڵێ: ڕۆژێکیان عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ (٤٠٠٠) درهەمو قەدیفەیەکی بۆ هات، بۆ ڕۆژی دواتر لەبازاڕ بینیم ئالیك بۆ وولاخەکەی دەکڕێ بەقەرز، دەڵێ: منیش لە کەسو کارەکەییم پرسی بۆچی ئالیك بەقەرز دەکڕێ بۆ وولاخەکەی خۆ دوێنێ (٤٠٠) درهەمو قەدیفەیەکی بەدیاری بۆ هات؟

گوتیان: دوێنێ کە پارەکەی بۆ هات نەخەوت هەتا هەموو پارەکەی نەبەخشیەوە، قەدیفەکەشی بەشانی دادا چووە دەرەوە کە هاتەوە ئەویشی پێ نەمابوو، پرسیارمان لێکرد چیت لێکرد؟

گوتی: دام بە هەژارێك.

ئەیوب دەڵێ: کە گوێم لەو قسانە بوو چوومە بازاڕو لە شوێنێکی بەرز ڕاوەستام گوتم: ئەی بازرگانەکان چی لەدونیا دەکەن؟ ئەوە ئیبن عومەرە (٤٠٠٠) درهەم بەشەوو ڕۆژێك دەبەخشێو بۆ بەیانیەکەی ئالیك بۆ وولاخەکەی بەقەرز دەکڕێ[١].

### ٥٥٩. بەڵگە لەسەر بوونی خوا

ڕۆژێکیان هەندێ کەس هاتنە لای پێشەوا شافیعی داوای بەڵگەیان لێکرد لەسەر بوونی خوا، ئەویش کەمێك بێدەنگ بوو پاشان گوتی: بەڵگەم گەڵای داری تووە، ئەوانیش بەسەر سوڕمانەوە گوتیان: چۆن گەڵای توو دەکەی بەبەڵگە؟!

پێشەوا شافیعی گوتی: گەڵای توو یەك جۆر تامی هەیە، کەچی ئەگەر کرمی ئاوریشم خواردی ئەوا ئاوریشمی لێ بەرهەم دێنێ، ئەگەر مێش خواردی هەنگوینی لێ بەرهەم دێنێ، ئەگەر ئاسکیش خواردی بۆنی میسکی لێ بەرهەم دێنێ، دەی باشە من پرسیار لە ئێوە دەکەم ئەگەر خوایەك نەبێ کێ بنەچەکەی یەك خستووەو بەرهەمەکانیش جیا خستووە؟[٢].

---

[١]) پیاوانی دەوری پێغەمبەر- ل ١١٨.

[٢]) ئەو چیرۆکانەی فێری ژیانیان کردم.

٥٦٠. خۆشەویستی ڕاستەقینە

دەگێڕنـەوە لەشـاری کوفـە گـەنجێکی خوانـاس‌و دینـدار، ڕۆژێکیـان چـاوی بـە کچـێك دەکەوێت خۆشەویستی کچەکە دەچێتە دڵی، بۆیـە دەچێتە خـوازبێنی، بـەڵام بـاوکی کچـەکە ئامادە نابێ کچەکەی خۆی بەو کـوڕە دینـداره بـدات، دەڵێ دەیـدەم بـە کـوڕە برایـەکی خـۆم، گەنجەکە بـەدڵ شـکاوی دەگەڕێتـەوە ماڵەوە، پـاش ماوەیـەك کچـەکە نامەیـەك دەنووسـێ بـۆ کوڕەکەو پێی دەڵێ: دەزانم تۆ منت زۆر خۆش دەوێ ئەگەر دەتەوێ ڕێـت بـۆ خۆشـدەکەم بـە نهێنی بێیتـە لام. کوڕەکـە لەوەڵامـدا بـۆ کچـەکە دەنووسـێ: ئەگەرچـی مـن تـۆم خـۆش دەوێ بەڵام هەرگیز کارێکی لـەم جـۆرە ناکـەم‌و نامـەوێ بـێ فـەرمانی خـوای گـەورە بکـەم، کارێـك ناکـەم تووشـی سـزاو جەزرەبـەی خـوای بێوێنـە بم، کچـەکە کـە ئەمـە دەخوێنێتـەوە لەبـەر خۆیـەوە دەڵـێ: بەڕاسـتی ئـەم کـوڕە کـوڕێکی ڕەوشـت بـەرزو دینـداره، بۆیـە تەوبەیـەکی ڕاستگۆیانە دەکات‌و دەست دەکات بـەخوا پەرسـتی تـاوەکو ڕۆژێکیـان وەفـات دەکـات، کوڕەکـە هەواڵی پێ دەگات کچەکە وەفاتی کردووە، ناوە ناوە دەچێتە سـەر گۆڕەکـەی‌و دوعـای خێـری بـۆ دەکـات، ڕۆژێکیـان لەسـەر گۆڕەکـەی خـەوێ لێدەکـەوێ لەخـەودا کچـەکە دەبـینێ، لێـی دەپرسێ حاڵت چۆنە؟

کچەکە دەڵێ خوای گەورە بەهۆی ڕەوشـتە جوانـەکانی تـۆوە تەوبـەی بەقسـمەت کـردم، خوای گەورەش نیعمەتی خۆی پێ بەخشیم‌و لەنازو نیعمەتدا دەژیم.

کوڕەکە پێی دەڵێ: من تۆم لەبیر نەکردووە ئەی تۆ؟

کچەکە دەڵێ: منیش تـۆم لـەبیر نـەکردووە داوام لـەخوا کـردووە بەیـەکترمان بگەیـەنێ، تۆش دوعا بکە.

کوڕەکە لێی دەپرسێ: من کەی دێمە لات؟

کچەکە دەڵێ: بـەم نزیکانـە بەیـەکتر شـاد دەبـین، ئیـدی کوڕەکـە هەفتەیـەك دوای ئـەم خەوە وەفات دەکات[1].

---

[1]) روضة المحبين- ص ٢٤٠.

### ٥٦١. گەورەیی خێرو بێری ناشتنی مردوو

دەگێڕنە جارێك پیاوێك پاش ئەوەی دەمرێ لەخەودا دەیبینن پێی دەڵێن: خوای گەورە چی لەگەڵ کردی؟

گوتی: بردمیانە لای تەرازووی چاکەو خراپە کردەوەکانمیان پێوا، خراپەکانم کەمێ زیاتر بوو لە چاکەکان، زۆر دڵ تەنگ بووم، پاشان کیسەیەك کەوتە سەر کردەوە چاکەکانم کردەوە چاکەکانمی قورس کرد. منیش گوتم: ئەو کیسەیە چ بوو؟

گوتیان: ئەو کیسەیە چەنگێك خۆڵی تێدایە.

گوتم: ئەو خۆڵە چییە.

گوتیان: جارێك ئامادەی ناشتنی مردوویەك بووی چەنگێك خۆڵت بەسەر گۆڕەکەی دادا، ئەمە پاداشتی ئەو کردەوەیەتە[1].

### ٥٦٢. (خشوع) ملکەچی لەنوێژ

جارێك سەعیدی کوڕی موسەییب خوا لێی ڕازی بێ پیاوێکی بینی لەناو نوێژدا ڕیشی دەخوراند، سەعید گوتی: ئەگەر ئەو پیاوە لەدڵەوە لەخوا بترسابوایە لەنوێژەکەیدا ئەوا جەستەشی دەترسا[2].

### ٥٦٣. خۆپاراستن لە پیاوی خراپ

شێخ ذنونی مصری لە بەندیخانە دەبێ، خوشکێکی خواردنی بۆ ڕەوانە دەکات، دەرگەوانەکە خواردنەکەی پێدەدا بەلام شێخ نایخوات، دەڵێ: بەدەستی دەرگەوانی بەندیخانە بۆم هاتووە ئەوانە پیاوی خراپن[3].

---

[1]) ئامۆژگاری لە (١٠٠٠) چیرۆکی ڕاستەقینە ل- ٦٢- ٦٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٨.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٨- ٩٩.

## ٥٦٤. چاکە کردن لەگەڵ باوك

یەحیای بەرمەکی پیاوێکی پیری بەساڵا چوو بو، تەمەنی (٨٠) ساڵی تێ پەڕاندبوو، کەتبووە بەندیخانە لەگەڵ یەکێ لە کوڕەکانی خۆی بەناوی خالید، کوڕەکەی زۆر باش بوو لەگەڵیدا، پاسەوانەکە بۆ ئەوەی سزایان قورس بکات ڕێگری دەکرد لەوەی دار ببەنە ژوورەوەو ئاگر بکەنەوە بۆ خۆ گەرم کردنەوە، یەحیای بەرمەکی لەبەر ئەوەی پیاوێکی پیر بوو بەیانیان کە دەستنوێژی دەشووشت لەبەر ئەوەی کەش و هەواکە زۆر سارد بوو ئاگریشیان لا نەبوو بۆیە تووشی نارەحەتی زۆر دەبوو، بەندیخانەکانی ئەو کاتەش هیچ خزمەتگوزاریەکیان نەبوو، خالید کە باوکی بەو نارەحەتیەوە بینی، ئیدی شەوانە قاپێك ئاوی دەگرت بەدەستەوە لەسەر ئەو چرایەی کە هەڵواسرابوو لە بەندیخانەکەدا، بۆ ئەوەی هیچ نەبێ کەمێ ساردی ئاوەکە بشکێ، ئەم کارەش کاتێکی یەکجار زۆری دەویست دەبوایە شەوانە زوو هەڵسێ ئاوەکە بگرێ بەدەستیەوە تا نوێژی بەیانی، بۆ ئەوەی باوکی ئەزیەت نەبینێ بەدەست نوێژ شووشتن، پاسەوانەکە کە بەمەی زانی چراکەی دەبردە دەرەوە پاش خەوتن، خالید کە ئەمەشی بەدەستەوە نەما ئیدی شەوانە سکی خۆی ڕووت دەکردو قاپە ئاوەکەی لەسەر دادەنا لە باوەشی خۆی تا نوێژی بەیانی بۆ ئەوەی بەیانی باوکی دەست نوێژی پێ بشوا[1].

## ٥٦٥. کارکردن

دەگێڕنەوە بازرگانێکی گەورە دەیەوێت کوڕەکەی لەسەر بازرگانی ڕابهێنێ، بۆ ئەوەی تەنها نەخوات و نەخواتەوەو بخەوێت، بەڵکو دەیەوێ وەکو خەڵکی تر کاربکات و فێر بێت، پێی دەڵێ: کوڕە شیرینەکەم بگرە ئەم (١٠٠٠) درهەمە ببە بۆ فلان شار کەل و پەل بکڕەو بیهێنەوە بە قازانج بیفرۆشە، دەیویست کوڕەکەی فێری کڕین و فرۆشتن بێت، لەگەڵ نارەحەتیەکانی ژیان ڕابێت و فێری ئیش کردن بێ، کوڕەکە پارەکەی لە باوکی وەرگرت دەستی کرد بە گەشتەکەی بۆ بازرگانی کردن لە ڕێگادا لایدا بەر سێبەری دارێك بۆ ئەوەی کەمێك پشوو بدات، ڕێویەکی لاوازی بینی لە برسانا خەریك بوو بەم لاو ئەولادا دەکەوت،

---

[1]) گەشتی ژیان- ل ١٧٩- ١٨٠.

ڕێویەکە نزیك بوویەوە لەژێر سێبەری دارێکی تەنیشت ئەو دارەی کوڕەکە لەژێر سێبەری دانیشتبوو پاڵ کەوت، پاش کەمێك کوڕەکە ئاسکێکی بینی وا شێرێك بەدوایەوە ڕا دەکات، ئاسکەکە هەر ڕایدەکرد بەڵام شێرەکە سوور بو لەسەر ڕاو کردنی، شێرەکە ئاسکەکەی گرتو کەمێکی لێخواردو ڕۆیی، پاشان ڕێویە لاوازەکە چووە سەر کەلەشی ئاسکەکەو بێ ماندوو بوون بێ ئەوەی تەپو تۆزی ڕاوکردنی بەرکەوێ ئەو بەشەی مابوو خواردیو گەڕایەوە ژێر سێبەری دارەکە.

کوڕەکە کە ئەمەی بینی لەدڵی خۆیدا گوتی شێرەکە ئەوەندە خۆی هێناو بردو خۆی ماندوو کرد، کەچی ڕێویەکە هاتە سەر حازری، تێرو پڕی لێخوارد، ئیتر من بۆچی خۆم هیلاك بکەم، بەرەو شارەکەی خۆی گەڕایەوە، چووەوەلای باوکی.

باوکی گوتی: کوڕم تۆ بەیانی ڕۆشتی ئێوارە گەڕایتەوە ئەمە بۆ؟ بەلای کەمەوە دەبێ هەفتەیەك دوان بمێنیتەوە، ئەی کوا کەلو پەلەکان؟

کوڕەکەش گوتی: باوکە گیان بۆچی خۆم ماندوو هیلاك بکەم، خۆ لەبرسانا نامرم، پاشان بەووردی ڕووادەکەی کە بینی بووی بۆ باوکی گێڕایەوە.

باوکی گوتی: کوڕی خۆم دەزانم لەبرسانا نامری، بەڵام من دەمەوێ تۆ وەکو شێرەکە بژی نەك وەکو ڕێوی[1].

### ٥٦٦. ئەنجامی ڕاستگۆیی

گەنجێکی مسوڵمان لە وڵاتی بەریتانیا ڕۆژێکیان ڕیکلامی کۆمپانیایەك دەبینێ کە پێویستیان بەچەند کارمەندێکە بۆ ئیشکگرتن، گەنجەکە دەچێ بۆ چاو پێکەوتن کۆمەڵە خەڵکێکی تریش لەوێ دەبینێ کە هاتوون بۆ هەمان مەبەست، خەڵکەکە یەك یەك دەچوونە ژوورەوە بۆ مەبەستی چاوپێکەوتن، هەر کەسێك لە چاو پێکەوتنەکە تەواو دەبوو دەهاتە دەرەوە خەڵکەکەی دەرەوە لێیان دەپرسی: چیان لێپرسیتو چیت وەڵام دانەوە؟ گرنگترین پرسیار کە لێژنەکە دەیکرد بریتی بوو لەم پرسیارە: ڕۆژانە چەند پەرداخ

---

[1]) گەشتی ژیان- ل ٩٠- ٩١.

عەرەق دەخۆیتەوە؟ سرە هاتە سەر گەنجە مسوڵمانەکە چووە ژوورەوەو پرسیارەکانی یەك یەك وەلاّم دانەوە، هەتا گەیشتە ئەو پرسیارە ڕۆژانە چەند پەرداخ عەرەق دەخۆیتەوە؟

گەنجەکە دوودڵ دەبێت‌و ناتوانێ درۆ بکات‌و بڵێ ڕۆژانە ئەوەندە پەرداخ عەرەقە دەخۆم بۆ ئەوەی پێی نەڵێن مسوڵمانێکی توند ڕەویت، دوو دڵ دەبێ لەوەی ئەمە بڵێ یاخود بڵێ من مسوڵمانم‌و عەرەق لە دینی ئێمە قەدەغە کراوەو بەهیچ شێوەیەك عەرەق ناخۆمەوە، دوای بیر کردنەوەیەکی خێرا بڕیار دەدا بەڕاستی وەلاّم بداتەوە، دەڵێ: من عەرەق ناخۆمەوە ئەوانیش دەڵێن بۆچی نەخۆشیت؟

گەنجەکە دەڵێ نەخێر بەڵکو من مسوڵمانم‌و غەرەق لای ئێمە حەرامە.

ئەوانیش دەڵێن: تەنانەت لە کاتی پشووشدا ناخۆیتەوە؟

گەنجەکەش دەڵێ: نەخێر بەهیچ شێوەیەك ناخۆمەوە، ئەوانیش بەسەرسامییەوە سەیری یەکتر دەکەن‌و زۆر لایان سەیر دەبێ، کاتێ ئەنجامی چاو پێکەوتنەکە دەردەچێ ناوی گەنجەکە لە پێشەوەی وەرگیراوان دەبێ، گەنجەکە لە کۆمپانیاکە دادەمەزرێ، دوای چەند مانگێك یەکێ لە بەرپرسانی کۆمپانیاکە دەبینێ‌و پێی دەڵێ: بۆچی پرسیاری عەرەقتان لە هەمووان کردو زۆر دووپاتتان دەکردەوە؟

بەرپرسەکە دەڵێ: لەبەر ئەوەی کارەکەی ئێمە سەبارەت بە ئێشکگرتن بوو هەر گەنجێکمان دادەمەزراند عەرەق خۆر بوو دوای ئەوەی سەرخۆش دەبوو شوێنەکەی جێدەهێشت، بۆیە دزیمان لێدەکراو زیانمان پێدەکەوت، کاتێك تۆمان بینی دامان مەزراندی ئەو کەسەمان دەست کەوت کە بەدوایدا دەگەڕاین[١].

### ٥٦٧. نەزەر نەکردن

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر وشترەکەی لە نزیك فەزڵی کوڕی عەبباسی ئامۆزایەوە دەڕۆیشت، ئافرەتێك دێتە لای‌و پرسیاری لێدەکات دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ حەج بۆ باوکم بکەم چونکە باوکم پیاوێکی پیرەو ناتوانێ خۆی لەسەر ئاژەڵ بگرێ، ئافرەتەکە ئافرەتێکی جووان بوو، فەزڵیش گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بو، سەیری

---

[١]) گەشتی ژیان- ل ١٥٨- ١٥٩.

ئافرەتەکەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی موبارەکی ڕووی فەزڵی وەرگێڕا بۆ ئەوەی سەیری نەکات، پاشان فەرمووی: کوڕو کچێکی لاوم بینی شەیتان لە بۆسە دابوو بۆیان[1].

### ٥٦٨. گومانی خراپ بردن

ڕۆژێکیان لە ڕەشماڵێکی عەرەبدا لە بیابان، ئافرەتێك منداڵی دەبێت، کە سەیری دەکەن منداڵەکە ڕەش پێست دەبێ، مێردی ئافرەتەکە سەیری خۆیو ئافرەتەکەی کرد هەردووکیان سپی پێستن، سەری سوڕما لەوەی منداڵەکە ڕەش پێستە، شەیتان گومانی خستە دڵیەوە بەرامبەر ئافرەتەکەی، بەدڵ داهێنا لەوانەیە ئەو منداڵە لەتۆ نەبێ، گومانی ئەوەی بۆ دروست کرد کە خێزانەکەی لەگەڵ پیاوێکی ڕەش پێستدا خیانەتی لێ کردبێ، منداڵەکەش لە ئەنجامی ئەو خیانەتە پەیدا بووبێ، کابرا حاڵی تەواو تێکچوو، بۆیە سەفەری کرد بۆ شاری مەدینە، چووە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەو کاتەدا هەندێ لە هاوەڵانیش لە خزمەتی دابوون، کابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەکەم لەژێر نیکاحی مندا منداڵێکی ڕەش پێستی بووە، ئێمەش لەڕەگەزو تیرەی خۆماندا هەرگیز ڕەش پێستمان تیا نەبووە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری پیاوەکە کردو زانی کە پیاوەکە گومانی هەیە لە خێزانەکەی، پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی چارسەری ئەو گومانە بکاتو قەناعەتی پێ بهێنێو حاڵی بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ بە کابرای فەرموو ئایا حوشترت هەیە؟

کابرا گوتی: بەڵێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ڕەگەزەکانیان چۆنە؟

کابرا گوتی: سوورن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەمووی: ئایا ڕەشیان تێدایە؟

کابرا گوتی: نەخێر.

---

[1]) ئەم بەسەرهاتە پێشەوا بوخاری هێناویەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا لە نێویاندا نییە ڕەنگی ڕەش و سپی تێکەڵ بووبێ؟

کابرا گوتی: با.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بۆچی ئەمە هەیە؟ (وەك ئەوەی پێی بفەرمووی: مادەم هەموو وشترەکان بە نێرو مێیانەوە سوورن ئەی بۆچی بەچکەی ڕەش بە سوورو سوور بە ڕەشیان تێدایە ڕەنگەکانیان جیاوازە لە نێرو مێیەکان).

کابرا هەندێ بیری کردەوەو تێڕاما لەپاشان گوتی: لەوانەیە لەباب و باپیرانمانەوە ئەو جرە ڕەنگانەمان هەبووبێ من یاخود خێزانەکەم، هەر بۆیە ئەو منداڵە ڕەش پێستە چۆتە سەر باپ و باپیرانی یەکێکمان.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ لەوانەی منداڵەکەی تۆش لە باب و باپیرانی تۆ یان خێزانەکەت ڕەش پێستی تێدا بووبێ، کابرا بە وەڵامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەناعەتی تەواوی بۆ دروست بوو گەڕایەوە لای خێزانەکەی[1].

### ٥٦٩. گەورەیی لا إله إلاّ الله

ئوسامەی کوڕی زەید خوا لێیان ڕازی بێ لەو کاتەی شەڕ بەرپا بوو لە بەرەبەیانێکی زۆر زوو دا مسوڵمانان سەرکەوتن یەکێ لە جەنگاوەرەکانی بێ باوەڕان چەکەکەی خۆی فڕێداو ڕای کرد، ئوسامەو کابرایەکی تری ئەنصاری شوێنی کەوتن، کابرا یەکسەر شایەتمانی هێنا، ئوسامە نەیزانی چی لێبکا ئایا ئەمە لەدڵەوە شایەتمانی هێناوە یاخود فێڵێکە دەیکات بۆ خۆدەرباز کردن، کابرای ئەنصاری وازی لێهێنا بەڵام ئوسامە وای گومان برد کە ئەوە فێڵێکە کابرا دەیکات بۆیە شمشێرێکی لێداو کوشتی، کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە ئوسامە ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی ڕوخساری گۆڕاو فەرمووی: {لەگەڵ ئەوەی کابرا شایەتمانی هێنا تۆ هەر کوشتت؟} ئوسامە گوتی: ئاخر ئەو لە دڵەوە نەیگوت بەڵکو لەترسان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ تۆ دڵت

[1]) چێژ لە ژیانت وەربگرە- موحەممەد عورەیفی- ل١٠٨- ١٠٩.

شەق کردبوو تا بزانی لەترسان بوو، پێغەمبەری خوا بەردەوام دەیفەرموو: پاش ئەوەی شایەتمانی هێنا تۆ هەر کوشتت؟ وە بە ئوسامەی فەرموو: ئەی تۆ لە قیامەت چی دەکەی لە (لا إله إلا الله) ئەگەر بیکاتە بەڵگە لەسەرت؟

ئوسامە دەڵێ ئەوەندەم پێناخۆشبوو کە پێغەمبەری خوا بەردەوام دەیفەرموو پاش ئەوەی شایەتمانی هێنا هەر کوشتت، تا ئەو رادەی خۆزگەم دەخواست تا ئەو ڕۆژە مسوڵمان نەبوومایە[1].

### ٥٧٠. شارەزایی و کارامەیی لە ئامۆژگاری کردندا

کابرایەك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کابراکە سەرو قژی تێك ئالا بوو جل و بەرگێکی زۆر شڕو وڕی لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بە شێوەیەك ئامۆژگاری بکات بۆ ئەوەی دەستێك بەخۆیدا بێنێ و خۆی ڕێك و پێك بکات، بەڵام پێش وەخت پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بزانێ ئایا ئەو پیاوە هەژارو دەست کورتە یاخود نا، بۆیە پرسیاری کرد ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟

کابرا گوتی: بەڵێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی لە چ جۆرە ماڵ و سامانێك؟

کابرا گوتی: لە هەموو جۆرێك، ئەسپ، حوشتر، مەڕو ماڵات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر خوا ماڵ و سامانێکی بەخشی بەبەندەکەی حەز دەکات ئاسەواری ئەو نیعمەتانە بەسەریەوە ببینێ[2].

### ٥٧١. ئامۆژگاری کردن

کاتێك پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب لەسەرەمەرگ بوو، گەنجێك هاتە لای و سەردانی کرد، پاشان کە ڕۆیشت دامێنی جلەکەی شۆڕو درێژ بوو بەزەویدا دەخشا، لەژێر پێیەکانی دەخشا، پێشەوا عومەر ویستی ئامۆژگاری گەنجەکە بکات، (لەو کاتەی بریندار بوو لەسەرە

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٥-١١٦.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٩.

مـەرگ بـوو)، داوای کـرد بـانگی ئـەو گەنجـەی بـۆ بکەنـەوە، گەنجەکـەیان بـانگ کـردەوە پێـی گوت: ئەی کوڕی برام دامێنی کراسەکەت بـەرز بکـەوە، چونکە هـەم خـاوێن تـر دەبـێو هـەم باشتریشە بۆ لەخوا ترسانت[1].

### ٥٧٢. خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوەڵان

زەیدی کوڕی حاریسە خوا لێی ڕازی بێ پاش مسوڵمان بوونی وازی لە دایكو باوكو کەسو کاری خۆی هێنا، پێیان گوت: کەس هەیە وا بکات واز لە دایكو باوکی خۆی بێنێ؟

گـوتی: بـەڵێ مـن ئـەوەی لـەو پیـاوەم بینیـوە (مەبەسـتی پێغەمبـەری خـوا بـوو ﷺ) نایگۆڕمەوە بەهیچ شتێك.

کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بە سەرکردەی سوپایەکی (٣٠٠٠) کەسی بـۆ یـەکێ لـە غـەزامانی ڕۆم، شـەهید بـوو، پێغەمبـەری ﷺ داوای لێخۆشـبوونی بـۆ بکـەن، زەیـد چـووە بەهەشتەوە بە خێرایی.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ماڵیانی کرد کچەکەی زەیدی بینی، زۆر گریـا، سـەعدی کوڕی موعاز گوتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەوەندە دەگری؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {هذا شوق الحبيب إلى حبيبه}، واتـە: ئـەوە شـەقو بیر کردنی خۆشەویستە بۆ خۆشەویستەکەی[2].

### ٥٧٣. بەردەوانی نەبوون لەسەر ئیسلامەتی

ئیبن جەوزی دەڵێ: عەبدوڕەحیم یەکێك بوو لە موجاهیدانو تێکۆشـەرانی ئیسلام، لـە زۆربەی شەڕەکانی دژ بـە ڕۆمـەکان بـەژداری کـردووە، کابرایـەکی زۆر ئـازاو پـاڵەوان بـوو، لـە یـەکێ لە شـەڕەکان دژی ڕۆم، چاوی دەکـەوێ بەیـەکێ لـە ئافرەتـە ڕۆمیـەکان، شـەیدای ئـەو ئافرەتـە دەبـێ، لـە دەرفەتێکدا بـە کەسـێ پـەیامێکی بـۆ دەنێـرێ، دڵـی خـۆی بـۆ دەکاتـەوە، ئافرەتەکەش دەڵێ ئەگەر منی دەوێ دەبێ ببێتە گاور، بێتە نێو ئەو قەڵایەی ئێمـەو شـەڕ لـە

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٤٠.

[2]) بەهاری دڵان- ل ١٣٩.

دژی مسوڵمانان بکات، عەبدوڕەحمان کافر دەبیٚو دەبێتە گاور وە خۆی دەگەیەنێتە نێو قەڵای ڕۆمەکان، مسوڵمانان بۆی دەگەرێن، پاشان بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە کافر بووە، زۆر غەمبار دەبن، پاش ماوەیەك چاویان پێدەکەویٚ وا لەگەڵ ئافرەتەکە لەو دیو قەڵاکەیە، مسوڵمانەکان بانگی لێدەکەن‌و دەڵێن: فلاّن کەس کوا قورئانەکەت، نوێژو ڕۆژووەکەت، جیهادو تێکۆشانەکەت تەنها لە پێناو ئافرەتێکدا دەستبەرداریان بووی تۆ هەموو قورئانت لەبەر بوو کوا هیچت بیر ماوە؟

ئەویش وەلاّمیان دەداتەوەو دەڵێ: لەو کاتەی وازم لە ئیسلامەتی هێنا هەموو قورئانم بیر چوویەوە تەنها ئەو ئایەتە نەبیٚ کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرْهُمْ يَأْكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الحجر، ئەو پیاوە لە کۆتاییدا بەگاووری مرد[1].

### ٥٧٤. ئارام گرتن

ڕۆژێك سوفیانی ثوری لەو پەڕی بێتاقەتی‌و بێزاری دەبیٚ لە بارو وەزعی دونیایی، هاوەڵێکی پێی گوت: ئەی سوفیان بزانە کاتێك خوای گەورە شتێك مەنع دەکات لە ڕاستیدا ئەمە بەخشینە، چونکە لە بەخیلی نییە کە نابەخشیٚ، بەڵکو لەبەر تاقیکردنەوەو قەدەرێکی خێرە[2].

### ٥٧٥. دزی کردن

جارێکیان پێغەمبەر ﷺ بە جێگایەکدا ڕۆیی بینی پیاوێك کوژراوە، فەرمووی کیٚ ئەو پیاوەی کوشتووە؟

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوە ویستی هەندیٚ مەڕو مالاّت بدزیٚ، سەگێکیش کە پاسەوانی مەڕەکان بوو پڕی دایەو کوشتی، پێغەمبەری خوا ﷺسیٚ جاران

---

[1]) ئاسودەەی ئیسلام- م. فاتیح شەهرستێنی.

[2]) ژیانەوە- ل ١٧٣.

فەرمووی (ئەو پیاوە نەفسی خۆی کوشت وە دینی خۆی لەناو برد، ئەو سەگەش لەو باشترە، ئەو مرۆڤە مرۆڤێکی گورگانیە ویستویەتی ماڵی بەندەکان دەست بەسەردا بگرێ)[1].

## ٥٧٦. خۆشەویستی خوای پەروەردگار

موحەممەدی کوڕی موعاز دەڵێ: ژنێکی خوا پەرست پێمی گوت: من لەخەودا بینیم دەچوومە بەهەشت، ئەهلی بەهەشت هەموو لەسەر دەرگای بەهەشت وەستابوون، گوتم: ئەوە ئەهلی بەهەشت چییانە؟

یەکێك گوتی: چوینەتە دەرەوە تەماشای ئەو ژنە دەکەین کە چۆن بەهەشت خۆی بۆ هاتنی ڕازاندۆتەوە!

دەڵێ: منیش گوتم: ئەو ژنە کێیە؟

گوتیان: أم سوداء.

دەڵێ: لەو کاتەدا بووین بینیم ژنێکی زۆر خاەدان بەهەڵەداوان دەڕۆیی، منیش بانگم کرد گوتم: داوا لە خوا بکە من بەتۆ بگەیەنێ.

ئافرەتەکە گوتی: هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە، تۆ بێی بۆ لام بەلآم لەمنەوە دوو شت فێربەو لەبەریان بکە:

١- بەردەوام لە خەمی دڵی خۆت دابە.

٢- وە بزانە خۆشەویستی خوا بەستەو ئارەزووەکانت پشت گوێ بخە، بەمەش هیچ کات زیانت پێ ناگا[2].

---

[1]) الخطب المنبرية- عبدالحميد كشك- ج٤- ص ١٠٩.

[2]) روائع حكايات أهل الجنة- ل ١٣٩.

٥٧٧. **بەردەوامی لەسەر دینداریی**

لە ئەبو ڕامعەوە دەڵێ: پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب سوپایەکی بەڕێ کرد بۆ لای ڕۆمەکان لە شەڕەکەدا عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە بەدیل گیرا لەلایەن ڕۆمەکانەوە، بردیان بۆ لای پادشاکەیان، گوتیان: ئەو لە هاوەڵانی موحەممەدە ﷺ.

پادشاکە بە عەبدوڵڵای گوت: ئەگەر ببی بە گاور نیوەی موڵکی خۆمت دەدەمێ.

عەبدوڵڵا گوتی: ئەگەر هەموو موڵکی عەرەبو عەجەمم پێ بدەی تا بۆ چاوتروکانێك لە دینەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەشیمان ببمەوە، پەشیمان نابمەوە.

پادشا گوتی: کەوابێ دەتکوژم، فەرمانی کرد بە دارێکەوە هاڵیواسنو چەند تیرهاوێژێك لە نزیکەوە بەتیر لێی بدەن بەلاّم نەیکوژن، لە کاتی لێدانەکە بەردەوام پێی دەگوت: ببە بەگاور ئەگینا دەتکوژین، بەلاّم ئەو بەهیچ شێوەیەك بەیسەلماند.

ئەوجارە لە دارەکەیان کردەوە پادشا فەرمانی کرد مەنجەڵێك ئاو بکوڵێنن، دیلێکی مسوڵمانانیان هێنا بەبەرچاوی عەبدوڵڵا خستیانە نێو ئاوەکە، ئنجا گوتیان: ببە بەگاور ئەگینا وەك ئەمە فڕێت دەدەینە نێو مەنجەڵەکە.

بردیان بۆ ئەوەی فڕێی بدەنە نێو مەنجەڵەکە، دەستی کرد بە گریان، گوتی: بیهێننەوە، پێی گوت: ئەمە بۆ دەگری؟ لە ترسی مردن؟

عەبدوڵڵا گوتی: نەخێر لە ترسی مردن نییە بەڵکو خەمی ئەوە دەخۆم یەکجار دەتوانم گیانی خۆم ببەخشم بەخوا، ئارەزووی ئەوەم دەکرد بەقەد مووەکانی لاشەم ڕۆحم هەبووایە پێشکەشی خوام بکردایە.

پادشاکە کۆتا شت کە ویستی لەگەڵی بەکار بێنێ گوتی: ئەگەر سەرم ماچ بکەی ئازادت دەکەم، عەبدوڵڵا گوتی: بەمەرجێك سەرت ماچ دەکەم.

پادشا گوتی: مەرجەکەت چییە؟

عەبدوڵڵا گوتی: ئەگەر هەموو دیلی مسوڵمانان لەلاتە ئازاد بکەی ئامادەم سەرت ماچ بکەم. پادشا بەمە ڕازی بوو، عەبدوڵڵاش سەری ماچ کرد، بەڵێ بەم شێوەیە بەخۆو بە

کۆمەڵێك دیل گەڕانەوە لای پێشەوا عومەر، هەواڵەکەیان بۆ پێشەوا عومەر گێڕایەوە، ئەویش هەڵسایەوەو سەری حەزەیفەی ماچ کرد، گوتی: پێویستە هەموو مسوڵمانێك سەری حوزەیفە ماچ بکات[1].

### ٥٧٨. نوێژ نەکەرو سزای گۆڕ

دەگێڕنەوە پیاوێکی باش کوڕێکی هەبوو کوڕەکەی وەفاتی کرد، پاش چەند ڕۆژێك لە وەفات کردنی شەوێك لە خەودا کوڕەکەی خۆی بینی، هەموو مووی سەری منداڵەکەی سپی بووبو، باوکەکە پرسیاری کرد ڕۆڵە خۆ تۆ هێشتا بچووك بووی بۆچی مووی سەرت گشت سپی بوون، منداڵەکە گوتی: باوکە منو چەند منداڵێکی تریش لەو گۆڕستانە گشتمان بەم شێوەیەمان لێ هاتووە، بەهۆی ئەوەی ئێمەتان لە نزیك گۆڕی چەند کەسێکی نوێژ نەکەر شاردۆتەوە، بەهۆی هاوارو گریانی عەزابی وانەوە ئێمە وامان بەسەر هاتووە، ئەو چەند نوێژنەکەرە بەهۆی هاوارو ناڵەی سزاو عەزابیان، هێمنیی‌و ئارامی هەموو مردووەکانی گۆڕستانەکەیان تێك داوە[2].

### ٥٧٩. پێگەی داواکردنی زانست‌و زانیاریی

دەڵێن جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتە مزگەوت سەیری کرد لە مزگەوتدا دوو ئەڵقەی بەستراوە، لەلایەن هاوەڵانی بەڕێز، یەکێکیان زیکرو یادی خوا دەکەن، ئەوەی تریان باسی زانست‌و زانیارییە شەرعیەکان دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دوو حەڵقە هەردووك خاوەنی فەزڵن، بەڵام حەڵقە زانستییە شەرعییەکە گەورەترەو لەگەڵ وانا دانیشت[3].

### ٥٨٠. سەرپێچی کردنی نەفس

پیاوێك لە وڵاتێکی دوورەوە هات بۆ لای زانایەکی شاری بەغدا کە ناوی ئەبو عەلی دەقاقە، لەبەر ئەوەی لە شوێنێکی دوورەوە هاتبوو حەزی دەکرد ڕێزی زۆری لێ بگیرێ‌و لە

---

[1]) ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ب٢- ل ٢٩٤- ٢٩٥.

[2]) مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ- ب١- ل٢٢١.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب٢- ل ٢٩٥.

پێشەوە دابنیشێ، بۆیە بە ئەبو عەلی گوت: لە دوورەوە هاتووم، ئەبو عەلی گوتی: ئەوە مەسەلەیەك نییە لە دوورەوە یان لە نزیکەوە هاتویت، تەنها یەك هەنگاو لە نەفست دوور بکەوەو بەجێی بهێڵە ئەگەیە ئەوەی دەتەوێ[1].

٥٨١. داواکردنی زانست تا کاتی مردن

پیاوێکی بەتەمەن کە ناوی ئیبراهیمی کوڕی مەهدی بوو ئەچێتە کۆڕی خەلیفە مەئموون، کە کۆڕێکی زانستی بوو.

مەئموون پێی گوت: لەو شتانەی وا باس دەکرێت هیچ شتێکی لێ دەزانی؟

ئیبراهیم گوتی: نەخێر، بەمندالی گەورەکان کاریان پێ کردووین، کە گەورەش بووین بۆخۆمان کارمان کردووە.

مەئموون گوتی: دەی کەواتە: لە ئەمرۆ بەدواوە بۆ هەوڵ نادەی.

ئیبراهیم گوتی: جا ئێستا بەو تەمەنەوە دەگونجێو جوانە بۆ من هەوڵ بدەم.

مەئموون گوتی: بەڵێ، ئەگەر بمریت لەرێی فێربوونی زانست چاکترە لەوەی بژیت بە نەزانیو نەفامی[2].

٥٨٢. گەورەیی سورەتی الإخلاص

دەڵێن لەکاتی وەفاتی موعاویەی کوڕی موعاویەی مەزنی جوبریل سەلامی خوای لێبێ بەشێوەو هەیبەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەشتو کێوی داگرتبوو، فەرمو: ئەی موحەممەد ﷺ دەتەوێ ئامادەی نوێژی جەنازەی موعاویە بی؟

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: منیش ئامادەی نوێژ لەسەر کردنەکە بووم، بینیم دوو ڕیز لە فریشتەش وا لەگەڵمان نوێژی لەسەر دەکەن، دەفەرموێ: منیش پرسیم ئەی جوبریل موعاویە بەهۆی کام کردەوە پێگەی وا بەرز بۆتەوە؟

---

[1]) هەزارو یەك- ب٢- ل ٩٥.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب٢- ل ١٢٤.

جوبریل فەرموی: لەبەر ئەوەی سورمتی ئیخلاصی خۆش دەویست لە هەستان‌و دانیشتن‌و ڕۆیشتندا لە پێش خۆی دەیخوێندەوە[١].

### ٥٨٣. مرۆڤی زاناو لێزان

پادشایەکی فارس سزای لە سێدارەدانی دا بەسەر دوو کەسدا، یەکێکیان بیری لەوە کردەوە چۆن دەرفەتێك وەرگرێ، بە پاسەوانەکان هەواڵی نارد بۆ پادشاکە کە من دەتوانم لە ماوەی ساڵێکدا وا لە ئەسپەکەی بکەم قسە بکات، کاتێ هەواڵەکەیان بە پادشا گەیاند ڕازی بوو ساڵێك حوکمەکەی دوا بخرێت، ئەگەر لە ماوەی ئەو ساڵەش دا نەیتوانی ئەمە بکات ئەوە ڕاستەوخۆ لە سێدارە بدرێ، هاوڕێکەی کە وەکو ئەو فەرمانی لە سێدارەدانی دەرچووبو، بە سەرسامیە ڕوانیە برادەرەکەی‌و گوتی: چۆن ئەسپ فێری قسە دەبێ؟ چۆن ئەم کارە دەکەیت بەخوا دوایی لەدەست پادشا ڕزگارت نابێ، کابرا گوتی هەی نەفام لە ماوەی ئەم ساڵەدا یەکێ لە مانە هەر ڕوودەدات: یان پادشا دەمرێ، یان من دەمرم، یان ئەسپەکە دەمرێ، یان فێری قسە دەبێ[٢].

### ٥٨٤. تواناکانی خۆت بناسە

بەرنارد هالدین لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (كيف نجعل من النجاح عادة؟)، دەڵێ: پیاوێکی تەمەن (٤٣) ساڵ هات بۆ لام‌و گوتی: من کۆلێژی یاسام تەواو کردووەو (١٥) ساڵە مافناسم، بەڵام تا ئێستا خۆم بە کەسێکی سەرکەوتوو نازانم، دەڵێ: منیش بە پیاوەکەم گوت: بیر بکەوە بزانە لە سەردەمی لاوێتیەوە تا ئێستا هیچ کارێك هەبووە کردبێت‌و شانازی پێوە بکەی؟

پیاوەکە ماوەیەك بیری کردەوەو پاشان گوتی: بەڵێ، کاتی خۆی باوکم تاپڕێکی هەبوو زۆر حەزی لە ڕاوکردن بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی تاپڕەکەی ژەنگ لێیدابوو بۆیە نەیتوانی لەگەڵ هاوڕێکانیدا بچێ بۆ ڕاو، منیش ئەو کات تەمەنم نزیکەی (١٢) ساڵ بوو، باوکم زۆر خۆش دەویست حەزم کرد خزمەتێکی بکەم، چووم لە ژوورەکەی خۆمدا تاپڕەکەم لێك‌و

---

[١]) مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ- ب٢- ل ٣٧.

[٢]) هەزارو یەك- ب٢- ل ١٣٧.

پێك كردەوەو جوان جوان خاوێنم كردەوە، كاتێ هێنامەوە لای باوكم باوەشی پیاكردمو زۆر كەیف خۆش بوو گوتی: ئافەرین كورم تەمەن درێژ بی، هەر ئەو كات جونەیهێكی وەك پاداشت پێدام، هەروەها جارێكی تر مەكینەیەكی بەرگ درووی ماڵەوەمان تێك چووبو توانیم چاكی بكەمەوە، جارێكی تریش توانیم كابەبای ماڵەكەمان پاش ئەوەی تێك چووبو چاكی بكەمەوە، ئەم دوو كارەش زۆر خۆم تێیدا بەسەر كەوتوو دەزانم، منیش گوتم: هەق وایە تۆ لە كارگەیەك كار بكەی نەك كاری مافناسی، ئەویش گوتی: بەڵام تازە پاش چی خۆ من تەمەنم زیاتر لە چل ساڵە، بەڵام هەر چۆنێبێ توانیم قەناعەتی پێ بێنم بچێتە كۆلێژی ئەندازیاری، ئەوەبوو لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بوو بە ئەندازیارێكی ناوداری بەریتانیا(1).

### ٥٨٥. تەوبە كردن هۆكاری باران بارینە

دەگێرنەوە لە سەردەمی موسا سەلامی خوای لێبێ، ماوەیەك بێ بارانی ڕوو لە بەنی ئیسرائیل دەكات، خەڵكەكە هاتنە لای پێغەمبەر موسا گوتیان: بۆمان داوا لە پەروەردگار بكە بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەر موسا لەگەڵیان بەرەو دەرەوەی شار چوو بۆ ئەوەی دوعا بكەن خوای پەروەردگار باران ببارێنێ، موسا فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنەو ڕەحمی خۆتمان بەسەردا بڵاو بكەوە، ئەی خوایە! لەبەر منداڵە شیرە خۆرەكانو پیاوە بەتەمەنەكانو ئاژەڵەكان بارانمان بۆ ببارێنە، سەرەڕای ئەو دوعایانە باران هەر نەباریی، پێغەمبەر موسا پرسیاری دوعا قبوڵ نەبوونەكەی لە خوای پەروەردگار كرد، خوای پەروەردگار بە موسای فەرموو: لەناو ئەو خەڵكەدا كەسێك هەیە ماوەی (٤٠) ساڵە سەرپێچیم دەكاتو دژایەتیم دەكات بەگوناح كردن، بەهۆی ئەو پیاوەوە بارانتان بەسەدا نابارێنم، پێغەمبەر موسا بەناو خەڵكەكەدا بانگی كرد ئەی ئەو كەسەی ماوەی (٤٠) ساڵە سەرپێچی خوای گەورە دەكەی‌ بڕە دەرەوە لەناومان چونكە بەهۆی گوناهەكانی تۆیە باران نابارێ، كابرای یاخی سەیرێكی لای ڕاستو لای چەپی خۆی كرد كەسێكی نەدیت بێتە دەرەوە زانی كە ئەوە لەگەڵ ئەویەتی، لە دڵی خۆیدا گوتی: خوای! ماوەی (٤٠) ساڵە من لە تۆ یاخیم هەر دەرفەتم دەدەیتو دامدەپۆشیو شەرمەزارم ناكەی، خوایە! بەڵێن دەدەم چی

(1) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤١.

دیکە سەرپێچی تۆ نەکەم، لەدڵی خۆیدا ئەو قسانەی کرد، هێندەی نەبرد هەور بەری ئاسمانی گرتو باران باری، موسا فەرمووی: خوایە چۆن بارانت باران لە کاتێکدا هێشتا کەس لەناوماندا نەچۆتە دەرەوە، خوای پەروەردگار فەرمووی: بەهۆی ئەو کەسەی بارانم لێتان قەدەغە کردبو هەر بەهۆی ئەوەوە بارانم بۆ باراندن، چونکە تەوبەی کردو گەڕایەوە لام، موسا فەرمووی: ئەی خوایە! ئەو بەندە چاکەیەم پێشان بدە، خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسا ئەو بەندەیە لەوکاتەی سەرپێچی منی دەکرد ڕیسوام نەکرد، ئێستاکە تەوبەی کردووە چۆن ڕیسوای دەکەم[1]؟!

## ٥٨٦. بەهۆی بەزەیی هاتنە بەسەگێك ئافرەتێکی داوێن پیس دەچێتە بەهەشت

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: ئافرەتێکی داوێن پیس لەبەنی ئیسرائیل جارێکیان لە بیابانێك دەڕۆیی، لەو بیابانەدا سەگێکی بینی بەدەوری بیرەکەدا دەخولێتەوە، ڕۆژەکەش ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو، سەگەکە لە تینووان زمانی دەرهێنابوو خەریك بوو تینوویتی بیکوژێ، ئافرەتەکە کاتێك ئەو دیمەنەی بینی، پێڵاوەکانی لەبەر کردەوەو لە بیرەکەدا پڕی کرد لە ئاو لەبەردەم سەگەکەی دانا، ئەویش تێری لێخواردەوە تا تینوویتی شکا[2].

## ٥٨٧. داوێن پاکی شێخ ڕەبیعو تەوبە کردنی ئافرەتێکی خراپ

دەڵێن: کۆمەڵە پیاو خراپێك بڕیاریان دا ڕەبیعی کوڕی خیثم تووشی فیتنە بکەن لە ڕێگەی ئافرتێکی خراپو داوێن پیسەوە، بەڵێنیان بە ئافرەتەکە دا ئەگەر ئەو کارە بکات هەزار درهەمی پێ بدەن، بۆیە هەڵسا بە لەبەر کردنی جلو بەرگێکی زۆر جوانو بۆنی خۆشی لە خۆیدا، چووە سەر ڕێگای ڕەبیع کاتێك لەگەڵ شێخ ڕەبیع کەوتنە بەرامبەری یەکتر ئافرەتەکە لاشەی خۆی بۆ دیار خست بۆ ئەوەی سەرنجی ڕابکێشێ، شێخ ڕەبیع بە ئافرەتەکەی گوت، چی دەکەی ئەگەر ئێستا تایەکی تەند بتگرێو ڕەنگی ڕوخسارت بگۆڕێ،

---

[1]) مئة قصة وقصة- ص ١٥٠- ١٥١.

[2]) بەڕاستی شاژنە- د. موحەممەد عورەیفی- ل ٨٤.

ئایا بیرت لەوە كردۆتەوە كە ئەگەر ئێستا فرشتەی گیان كێشان بێتە لاتو گیانت بكێشێ لەسەر ئەو حاڵە، بیرت لەوە كردۆتەوە دەبێ حاڵت چۆن بێ؟

ئافرەتەكە ئەو وتانەی رەبیعی كوری خیثم بیست یەكسەر تەوبەی كردو گەڕایەوە لای خوای پەروەردگار دەستی كرد بە خوا پەرستی تا ئەو كاتەی وەفاتی كرد[1].

٥٨٨. ئوم سولەیم ئیسلامەتی كردە مارەیی خۆی

دایكی ئەنەسی كوری مالیك خوا لێیان رازی بێ، كە بە (خمیصاء) ناسراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فەرمویەتی: {دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْفَةً فَقُلْتُ مَنْ هَذَا قَالُوا هَذِهِ الْغُمَيْصَاءُ بِنْتُ مِلْحَانَ أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ}[2]. واتە: چوومە ناو بەهەشتەوە گوێم لە خشپەیەك بوو گوتم: ئەوە چییە؟ گوتیان: ئەوە خومەیصائی كچی مەلحانە، ئەو ئافرەتە بەرێزە كە دایكی ئەنەسی كوری مالیكە لە سەردەمی نەفامیدا شووی كرد بە (مالیكی كوری نەزر)، دایكی سولەیم لەگەڵ ئەو وەفدانەدا كە دەهاتنە مەككەو مسوڵمان دەبوون بووە مسوڵمان، پاشان داوای لە پیاوەكەی كرد ببێتە مسوڵمان بەڵام پیاوەكەی بەمە رازی نەبوو، پیاوەكەی سەفەری كرد بۆ وڵاتی شام لەوێ مرد، خەڵكێكی زۆر دەهاتنە داوای ئەو سولەیم، یەكێك لەوانە ئەبو تەڵحە بوو كە هێشتا مسوڵمان نەبووبو داوای لەو ئافرەتە بەرێزە كرد شووی پێبكا، ئوم سولەیم گوتی: من داواكاریەكەت رەت ناكەمەوە بەڵام تۆ پیاوێكی كافرتو من ئافرەتێكی مسوڵمانم، ئەگەر ببیتە مسوڵمان ئەوە ئیسلامەتیەكەت دەبێتە مارەییمو داوای هیچ شتێكی ترت لێ ناكەم، ئەبو تەڵحە گوتی: نەخێر من لەسەر دینی خۆم دەبم، ئوم سولەیم لەبەر ئەوەی مەبەستی ئەوەبوو ئەبو تەڵحە ببێتە مسوڵمان بۆیە پێی گوت: ئە ئەبو تەڵحە ئایا نازانیت ئەو خوایەی تۆ دەیپەرستی لە دارێك دروست كراوە كە لە زەویدا دەڕوێو پاشان حەبەشیەكانی بەنی فلان بۆمان دەهێنن، ئێوەش ئەو دارە دەپەرستن؟

---

[1]) التوابین- إبن قدامة المقدسي.

[2]) رواه مسلم.

ئەبو تەڵحە گوتی: بەڵێ دەزانم ئەو بتانەی ئێمە دەیپەرستین لەو جۆرە شتانە دروستمان کردوون.

ئوم سولەیم گوتی: جێی شەرمو نەزانی نییە ئیسان دارێك بپەرستێ کە لەزەویدا دەڕوێو واز لە خوای پەروەردگار بهێنێ؟

ئەبو تعەڵحە گوتی: رشوخسەتم بدە با بیری لێبکەمەوە، رۆیشتو پاش چەند رۆژێك گەڕایەوەو گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّـهِ وَرَسُولُهُ) ئوم سولەیم زۆر خۆشحاڵ بوو بە مسوڵمان بوونی ئەبو تەڵحە گوتی: ئەی ئەنەس مارەم بکە لە ئەبو تەڵحە، بەڕاستی تا ئێستا هیچ مارەییەك رێزدارتر نەبووە لە مارەییەکەی دایکی سولەیم کەبریتی بووە لە ئیسلام[1].

### ٥٨٩. دوعا کردن بۆ برا مسوڵمانەکەت

جارێکیان پیاوێکی شارەزووری کە ناوی (مام قادر) بوو لەکاتی گەرمادا خەریکی بێلکاری دەبێ، بەهۆی ماندو بوونی زۆرو تینوێتی لە رادده بەدەر هەردوو چاوەکانی کوێر دەبێ، ئەو مام قادرە ناسیاوی کاك ئەحمەدی شێخ دەبێ، هەر خێرا لەگەڵ کوڕەکەیدا کە ناوی مەعروف دەبێ بە سواری وولاخ دێن بۆ شاری سولەیمانی، مەعروف کوڕی دەچێتە خزمەتی شێخو پێی دەڵێ: قوربان باوکم چاوەکانی کوێر بوونەو زۆر نارەحەتە، هاتووین بۆ خزمەتی جەنابت، دوعایەکی بۆ بکەی، باوکمم لە ماڵی خزمێك داناوە، کاك ئەحمەدی شێخ خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ: زۆر زگم پێ سووتا لە نیوە شەودا دوعام زۆر بۆی کردو لە خوای بەبەزەیی پاڕامەوە شیفای چاوەکانی بدا، کاك ئەحمەدی شێخ دەڵێ بەیانی بۆ مزگەوت دەچووم بۆ نوێژی بەیانی بینیم وا مام قادر لەبەردەرگای مزگەوت وەستاوە، منیش گوتم: مام قادر نیشانەللا کەفارەتی گوناهانە، خەم مەخۆ من تا ماووم نەفەقەی ماڵو منداڵت دەکێشم، مام قادر گوتی: یا شێخ موژدە بێ ئیمشەو چاوەکانم چاك بوونەوە ئێستا لە سەردەمی گەنجێتی باشتر دەبینێ، کاك ئەحمەدی شێخ دەڵێ: منیش بە بیستنی

---

[1]) بەڕاستی شاژنە- ل ٤٥- ٤٦.

ئەو هەواڵە زۆر حەمدو سوپاسی خوام كرد و صەڵاواتم دا لە دیداری پێغەمبەری خوا ﷺ[1].

## ٥٩٠. ئەنجامی نادادگەری لە نێوان منداڵان

نوعمانی كوڕی بەشیر دەڵێ: من منداڵ بووم باوكم دەستی گرتمو بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پێ گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە شاهێدی تۆ من بەندەیەكم هەیە وا پێشكەشم كرد بەم كوڕەكەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {أكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ هَذَا؟} واتە: ئایا هەموو منداڵەكانت بەم شێوەیەت پێ بەخشیون؟

باوكیشم گوتی: نەخێر.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە باوكمی فەرموو: {لاَ تُشْهِدْنِي عَلَى جَوْرٍ}••واتە: من مەكە بە شاهێد لەسەر زوڵمێك (كە لەمنداڵەكانی تری دەكەی).

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە باوكمی فەرموو: {أيَسُرُّكَ أنْ يَكُونُوا إلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً•}، واتە: ئایا دڵ خۆش نابیو حەز ناكەی كە هەموویان وەك یەك لەگەڵت باش بن؟

باوكم گوتی: با ئەی پێغەمبەری خوا جا چی لەمە خۆشتر هەیە هەموویان وەك یەك لەگەڵم چاك بن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {فَلاَ إذًا} واتە: كەواتە ئەو كارە مەكە، چونكە بێ گومان جیاوازی خستنە نێوان منداڵەكانو نادادگەری لە گەڵیان دەبێتە هۆی ئەوەی كە هەندێكیان لەگەڵت باش بنو هەندێكی تریان لەگەڵت خراپ بن، دووبەرەكیو ناخۆشی دەكەویتە نێوان خۆشیان لە نێوان خۆشیان هەندێكیان ڕقیان بۆ دروست دەبێ بەرامبەر بە هەندێكیان[2].

---

[1]) دینو زین- ل ٣٢.

[2]) هەردوو پێشەوایان بوخاریو موسلیم ئەو بەسەرهاتەیان لە صەحیحەكانیان هێناوە.

## ٥٩١. چاکسازی خۆ چاککردن

دەگێڕنەوە لە یەکێ لە لادێکان دوو گەنج هەندێ مەڕو ماڵات دەدزن، خەڵکی لادێکە بۆسەیان بۆ دادەنێنەوەو دەیانگرن، پاش ئەوەی دەیانگرن بڕیار دەدەن نێوچەوانیان داغ بکەن بە دوو وشە (س- خ) واتە: (سارق الخراف)، دزی مەڕ، پاش ئەوەی نێوچەوانیان داغ دەکەن بەم شێوەیە، یەکێك لە دزەکان لە شەرمان سەری خۆی هەڵدەگرێو دەنگو باسی نامێنێ، یەکێکی تریان بڕیار دەدات واز لەکاری خراپ بێنێو بەردەوام خزمەتی خەڵکی بکات بێ بەرامبەر، هاوکاری نەخۆشو کەم دەرامەتانی دەکرد، سەرەتا خەڵکی تخونی نەدەکەوتن، پاشان خەڵکی وایان لێهات ڕێزی زۆریان دەگرت بەهۆی ئەو کردەوە باشانەی دەیکرد، پاش چەند ساڵێك ڕێبوارێك لە یەکێ لە چایخانەکانی لادێکە لادەدات بۆ ئەوەی چایەیەك بخوات، دەبینێت پیاوێکی بەتەمەن لە نێوچەوانی نووسراوە (س، خ) بە گەورەو بچووك ڕێزی لێدەگرن، کابرای ڕێبوار لە یەکێ لە پیاوەکانی لادێکە دەپرسێ ئەری ئەو دوو پیتە چییە لەنێوچەوانی ئەو پیاوە نووسراوە، ئەویش منگە منگێك دەکاو دەڵێ: ئەوە مەسەلەیەکی کۆنە نازانم چۆنە؟ ڕێبوارەکە دەڵێ: وابزانم ماناکەی بەم شێوەیە واتە: (ساعی الخیر) ئەو کەسەی بەردەوام لە هەوڵی کاری خێر دایە[١].

## ٥٩٢. نەخۆشی دەروونیو چارەسەرییەکەی

آرثر گۆردن، باسی ئەزموونێکی خۆی دەکات دەڵێ: تەواو لە ژیان بێزار بووم هەندێ شتی بچووك تووشی دڵەڕاوکێیان کردبووم سەری دونیام لێ هاتبووەوە یەك، چووم بۆلای پزیشکێکی دەروونی پاش پشکنینێکی زۆر کە زانی نەخۆشیەکەم تەنها دەروونیە گوتی: چوار نامەت بۆ دەنووسم لە چوار زەرفدا بەیانی بڕۆ قەراغ دەریا نامەی یەکەمیان کاتژمێر (٩) بکەرەوە، نامەی دووەمیان کاتژمێر (١٢)ی نیوەڕۆ بکەرەوە، نامەی سێیەمیان کاتژمێر (٣)ی دوای نیوەڕۆ بکەوە، هی چوارەمیشیان کاتژمێر (٦)ی ئێوارە بکەرەوە، منیش بە دکتۆرم گوت: بەڕاستتە یان گاڵتەم لەگەڵ دەکەی؟

---

[١]) هەزارو یەك- ب٢- ل٢.

دکتۆرەکە گوتی: بەڕاستمە، ئەگەر گاڵتەت لەگەڵ بکەم ئەوە پارەی عیادەت لێ وەرناگرم، بەڵام ئەوەتا پارەشت لێ وەردەگرم.

ئارسەر دەڵێ: بەیانی چووم بۆ قەراغ دەریاو کاتژمێر (۹) نامەی یەکەمم کردەوە تەنها نووسرابوو (باش گوێ بگرە)، لام سەیر بوو تا سێ کاتژمێری تر نابێ نامەی دووەم بکەمەوە ئاخر گوێ لەچی بگرم؟ ناچار گوێم گرت لە دەنگی هاژەی ڕووبارو جریوە جریوی باڵندەکان‌و دەنگەکانی دەوروبەرم، لەگەڵ ئەو دەنگانەدا هەستم بە هێمنییەکی زۆر کرد ئەو سێ کاتژمێرە، کاتژمێر (۱۲) بە تامەزرۆییەوە نامەی دووەمم کردەوەو لێ نووسرابوو (بیر لە ڕابردووت بکەوە)، ناچار دەستم کرد بە بیر کردنەوە لە ڕابردوی خۆم هەر لە سەردەمی منداڵیەوە کۆمەڵێك یادەوەری خۆش‌و ناخۆش هاتە خەیاڵم‌و بیرم لێیان کردەوە، ئەو ساتانەی کە بیرم لێدەکردنەوەو تێپەڕی بوون زەمەنێك بوو لەگەڵیان ژیابووم، دیارە ڕابردووش ئاوێنەیەکە بۆ ئینسان‌و ئینسان کە بیریان لێدەکاتەوە خۆی تیادا دەبینێتەوە، بەو هۆیەوە پەندو عیبرەتی لێ وەردەگرێ، دوای سێ سەعات بیر کردنەوە لە ژیانی ڕابردوو بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە نامەی سێیەمم کردەوە لێی نووسرابو (پاڵنەرەکانی خۆت بپشکنە) بەڕاستی ئەمەش وانەیەکی گرنگ بوو بیری هێنامەوە کە من بۆچی دەژیم چ شتێك پاڵنەرمە لە ژیانم، پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر بۆم دەرکەوت کە ئەگەر پاڵنەرەکانی مرۆڤ لە ژیانیدا هەڵە بوون ئەوە بێگومان ئەنجامەکانیشی هەڵە دەبن، ئیدی ئەو کەسە هەر پۆست‌و پلەو پایەیەکی هەبێ لە ژیاندا، کاتێ سەعات شەش داهات نامەی چوارەمم کردەوە لێی نووسرابوو ئەوەی کە تووشی دڵەڕاوکێ‌و نیگەرانیت دەکا لەسەر لمی قەراغ دەریاکە بینووسە، ناچار منیش داهاتمەوەو هەندێ لەو شتانەی کە نیگەرانیان کردبووم لەسەر لمەکە نووسیم پاشان بەرز بوومەوەو کەمێك چوومە دواوە سەیری بکەم، شەپۆلێك هات ئەو شتانەی کە نیگەرانی کردبووم هەمووی سڕیەوەو لایبرد[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب۲- ل ۱٤۲.

### ٥٩٣. مردن سەردانی هەمووماڵێك دەكات

ژنێك كۆرپەیەكی دەمرێ زۆر خەم دایدەگرێو پەرۆش دەبێ، بەهەركەسێ دەگات لێی دەپرسێ رێگایەكم پێ بلێ بۆ ئەوەی بتوانم منداڵەكەم بگەرێنمەوە ژیان، پیاوێكی دانا دەڵێ: من دەتوانم ژیان بۆ منداڵەكەت بگەرێنمەوە بەمەرجێك نانێكم بۆ بێنی لە ماڵێك كە مردن نەیگەیشتبێ، ژنەكە بەهەڵە داوان ئەو ماڵو ئەو ماڵ دەكات بۆ ئەوەی ماڵێكی لەم شێوەیە ببینێتەوە ناچار ماندوو دەبێ لەو كارەی چونكە هیچ ماڵێك نییە كەسێكی لێ نەمردبێ دایكی، باوكی، منداڵێكی، خوشكێكی، برایەكی، كەسێكی هەر مردووە، ژنەكە هاتەوە هۆش خۆی تێگەیشت لەوەی كە مردن سوننەتی ژیانەو كەس ناتوانێ ژیان بۆ كەسێكی تر بگێرێتەوە كە خوای گەورە لێی وەرگرتۆتەوە[1].

### ٥٩٤. وەفاتی ئیبراهیمی رۆڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ

ئەنەسی كوری مالیك چۆنیەتی وەفات كردنی ئیبراهیمی رۆڵەی پێغەمبەری خوامان بۆ دەگێرێتەوەو دەڵێ:•{دخلنا مع رسول الله صلى الله عليه و سلم على أبي سيف القين وكان ظئرا لإبراهيم عليه السلام فأخذ رسول الله صلى الله عليه و سلم إبراهيم فقبله وشمه ثم دخلنا عليه بعد ذلك وإبراهيم يجود بنفسه فجعلت عينا رسول الله صلى الله عليه و سلم تذرفان فقال له عبد الرحمن بن عوف رضي الله عنه وأنت يا رسول الله ؟ فقال (يا ابن عوف إنها رحمة) . ثم أتبعها بأخرى فقال صلى الله عليه و سلم (إن العين تدمع والقلب يحزن ولا نقول إلا ما يرضي ربنا وإنا بفراقك يا إبراهيم لمحزونون)}••

كاتێ ئیبراهیم لەسەرەمەرگ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نامێزی گرتو بۆنی كرد، بەخۆیەوە دەیكوشیو ماچی دەكرد ئەوەبوو لە باوەشی پێغەمبەری خوادا ﷺ وەفاتی كرد، پیغەمبەری خوا ﷺ چاوەكانی پر بوون لە فرمێسكو بە دەمو چاوی موبارەكیدا هاتنە خوارەوە، عەبدورەحمانی كوری عەوف گوتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا تۆش دەگری؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی كوری عەوف ئەو فرمێسكانە بەزەییو رەحمن لە دڵی ئینساندا، پاشان فەرموی: بەراستی لەكاتی ئەوهادا (كە كۆرپەلە بەبەر

٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ١٤٥- ١٤٦.

چاوی دایکو باوکیەوە وەفات دەکات) مرۆڤ خۆی بۆ ناگیرێو چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دێو دڵی غەمبار دەبێ، بەڵام شتێ ناڵێین خوای گەورە پێی ڕازی نەبێ، فەرموی: ئەی ئیبراهیم بەڕاستی ئێمە بەجیا بوونەوەی تۆ غەمبار بووین قەدەری خوای گەورە لەو کاتەدا ڕۆژیش گیرا، خەڵکی وایان زانی ئەو خۆرگیرانە لەبەر خاتری وەفاتی ئیبراهیمە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ یەکسەر چووە سەر مینبەرو فەرموی: {إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَإِنَّهُمَا لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَكَبِّرُوا وَادْعُوا اللَّهَ وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا}، واتە: بەڕاستی ڕۆژو مانگ دوو نیشانەو بەڵگەن لە نیشانەو بەڵگەکانی خوا، لەبەر مردنو لەدایك بوونی هیچ کەسێك ناگیرێن، هەرکاتێ ئەوانە گیران لە خوا بپاڕێنەوەو یادی خوا بکەن، نوێژ بکەنو خێرو خێرات زۆر بکەن[1].

### ٥٩٥. نوێژ کردن مایەی تەندروستییە

شێخ موحەممەد ڕاتب نابلوسی دەڵێ: ئافرەتێکی مسوڵمانی خەڵکی دیمەشق تووشی ژانەسەرێکی زۆر توند بوو، لەسوریا زۆر بەدوای چارەسەریدا گەڕا بەڵام چارەی نەبوو، ناچار ڕووی لە یەکێ لە وڵاتانی خۆرئاوا کرد، دەچێتە لای دکتۆرێك دکتۆرەکە لەگەڵ ئەوەی مسوڵمان نییە بەلام لێی دەپرسێ لە چ وڵاتێکەوە هاتووی؟

ئافرەتەکە دەڵێ: لە وڵاتی سوریا.

دکتۆرەکە دەڵێ: نوێژ دەکەی؟

ئافرەتەکە دەڵێ: نەخێر.

دکتۆرەکە دەڵێ: برۆ نوێژەکانت بە ڕێكو پێکی بکە سەر ئێشەت نامێنێ!!،

ئافرەتەکە دەڵێ: باشە جەنابی دکتۆر سەر ئێشە چ پەیوەندییەکی بە نوێژ کردنی مسوڵمانانەوە هەیە؟

دکتۆرەکە دەڵێ: یەکێ لە هۆکارەکانی (شقیقە) واتە نەخۆشی شەقە سەر هۆکارەکەی ئەوەیە دەماری شاخوێنبەر کە خوێن دەبا بۆ دەماغ ئەو دەمارە لاواز دەبێ، جا کاتێ مرۆڤ

---

[1] ) ئاسودەیی ئیسلام- ب٢- ل٢٢

سوجدە دەباتو سەری لەسەر زەوی دادەنێو هاوسەنگی پێیەکانی دەبێ، ئەو دەمارە فراوان دەبێو دەبێتەوە خوێنەکە بەباشی پێیدا تێپەڕ دەبێ بەمەش مرۆڤ لە سەرئێشەی توند ڕزگاری دەبێ[1].

**بانگەوازیو هەست کردن بەبەرپرسیارێتی.**

یەکێ لە زانا خەمخۆرەکانی ئەم ئیسلامە ناچێ بۆ سەفەری حەج لەگەڵ ئەوەی کە تواناى دارایی باشیشی دەبێ، بەسەرسوڕمانەوە هەندێ لە هاوڕێکانی لێی دەپرسن چۆنە ناچیت بۆ سەفەری ماڵی خوا!؟

دەڵێ: تەنها لەبەر ئەوەی ڕووم نییە بچمە بەرامبەر گۆڕەکەی پێغەمبەری خواو سەلامی لێبکەم، چۆن پێی بڵێم هیچم نەکردووە بۆ ئاینەکەت؟

حەز دەکەم کارێك بکەم بۆ ئەو دینە دڵم پێی خۆش بێو ڕووم بێ بچمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ[2].

**٥٩٧. بەزەیی هاتنەوە بە سەگێك بووە مایەی ڕزگار بوونو گەیشتن بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ**

مامۆستا ئەحمەدی موفتی زادە دەڵێ: لەشاری سنە پیاوێکی لاسارو چەقاوەسوو هەبوو ناوی (شوکر) بوو، هەرچی بیویستبایە دەیکرد وە هەرچی بیبردبایە ئەیبرد کەس بۆی نەبوو قسە بکات، خەڵکی خۆیان لەشەڕی ئەو پیاوە لائەدا، ڕۆژێك بەفرێکی زۆر باری بوو، بینی لە گردێکی نزیك ماڵیان چەند بێچوە سەگێك لە برسان فروسکەیان دێ، هەرچەندی گوانی دایکەکەیان دەمژن شیری تیا نییە، زۆر دڵی پێیان دەسووتێو دەچێتە لای قەسابخانەیەك هەندی گۆشتیان بۆ دێنێ، هەروەها قەمصەڵەیەکی عەسکەری سەوزی نەستوریشی لەبەردا ئەبێ دایدەکەنێو ئەیدات بەسەر کولانەکەیاندا، تاوەکو هەموو

---

[1] ئاسودەیی ئیسلام- ب٢- ل ٢٩- ٣٠.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب٢- ل ١٣٩.

بێچووەكانو دایكیان تێر دەبن، شەو دەخەوێ خەون بە پێغەمبەری خواوە دەبینێ ﷺ پێی دەفەرمووێ: برۆ بۆ لای شێخ عوسمانی نەقشبەندی با فێری ئیسلامەتیت بكات[1].

**٥٩٨. دڵ ئارامی**

پزیشكێكی ئەمریكی دەڵێ: رۆژێك لەگەڵ هاورێكەمدا خشتەیەكمان دروست كرد لەو شتانەی كە مایەی بەختەوەرین بۆ ئینسان،ك: تەندروستی باش، خۆشەویستی، بەهرەمەندی، دەوڵەمەندی، ناوداری، ...هتد، خشتەكەمان برد بۆ لای زانایەك گوتی: راستە شتێكی جوانتان نووسیوە لەگەڵ ئەوەشدا قەڵەمێكی بەسەر هەمووی داهێناو گوتی: لەهەموو ئەو شتانە گرنگتر (دڵ ئارامییە)، چونكە ئەو شتانەی نووسیوتانن خوای گەورە بەزۆر كەسی دەبەخشێ بەڵام مەرج نییە دڵی پێ ئارام بێ، بەڵام دڵ ئارامی تەنها بە دۆستانی خۆی دەبەخشێ، لەسەرتا زۆر دڵم بەو قسانە ئاوی نەدەخواردەوە بەڵام پاش ئەزموونێكی زۆر بۆم روون بوویەوە كە بەڵێ ئەمە شتێكی زۆر راستە وەك خوای پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد[2].

**٥٩٩. قسەی راست وەربگرە با ئەو قسەیە منداڵەكیش بیڵێ**

دەڵێن جارێكیان سەیارەیەكی بار هەڵگر لە ژێر پردێك گیر بوو قەرەباڵەغیەكی زۆری دروست كرد، پیاوانی هاتو چۆ هاتن بۆ ئەوەی بە راكێشان بیهێننە دەرەوە، بەڵام بیریان بۆ هیچ نەدەچوو، منداڵێك لەوێ بوو گوتی: هەوای تایەكانی دابەزێنن بەئاسانی رادەكێشرێو دێتە دەرەوە ![3].

---

[1]) كێ لەسەر هەقە؟ - ل ٦-٧.

[2]) هەزارو یەك- ب٢- ل ١٤٦.

[3]) هەزارو یەك- ب٢- ل ١٤٨.

## ٦٠٠. ئەو ماڵەی دوای خۆت جێی دەهێڵی سوودی بۆت نابێ

لە وڵاتی تورکیا کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند هەبوو ناوی ئیسماعیل بوو ئەو پیاوە بەهۆی نەخۆشییەوە چوو بۆ وڵاتی ئەمریکا هەر لەوێ وەفاتی کرد، ئەو پیاوە دەوڵەمەندییەکەی بە شێوەیەك بوو قەرزی دەدا بە وڵاتی تورکیا ئەو پیاوە لەسەرە مەرگ دوو وەسیەتی کرد نووسیو خستیە نێو دوو زەرفەوە، گوتی: هەرکاتێ مردم زەرفی یەکەم بکەنەوە، پاشان کە چوونە سەر قەبرانو گەڕانەوە زەرفی دووەمیش بکەنەوە، بەڵێ بەم شێوەیە کاتێ مرد هێنایانەوە تورکیا بردیانە سەر تاتە شۆر نامەکەی یەکەمیان کردەوە لێی نووسرابوو توخوا لەگەڵ کفن کردنمدا جووتێ گۆرەویم لەپێ بکەن، کاتێ بە مامۆستای ئایینیان گوت: مامۆستا گوتی: نابێ ئەو وەسیەتە جێبەجێ بکرێ چونکە ناشەرعییە لە کفن کردندا نابێ کەس جاوازی لەگەڵ کەسدا هەبێ، لەبەر ئەو هۆیە گۆرەویەکەیان لەپێ نەکردو وەسیەتەکەیان جێبەجێ نەکرد بردیانە گۆڕستانو بەخاکیان سپارد، کاتێ لە ناشتنی بوونەوە زەرفی دووەمیان کردەوە بۆ ئەوەی بزانن وەسیەتی دووەم چییە، کە زەرفی دووەمیان کردەوە نووسرابوو دەمزانی وەسیەتەکەم جێبەجێ ناکرێو ناشەرعییە، بەڵام بۆ ئەوەم بوو بزانن سەروەتو سامانێك بەم شێوەیە بێ نەتوانرێ جووتێ گۆرەوی لەگەڵ خۆت ببەیتە ناو گۆڕ تخوا هی ئەوەیە ئینسان دڵی خۆی پێ خۆشبکا(١).

## ٦٠١. خێر کردنی دەوڵەمەند

جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوین، پیاوێك هاتە خزمەتیو بە ئەندازەی هێلکەیەك ئاڵتونی پێ بوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئاڵتونەم لە پاشماوەی شوێنەوارێك دۆزیوەتەوە بڕیارم داوە هەمووی بکەم بەخێر لە پێناوی خوا، خۆشم غەیری ئەوە هیچی دیکەم نییە، پێغەمبەری خوا ڕووی خۆی وەرگێڕاو هیچ قسەیەکی نەفەرموو، پیاوەکە هەر قسەکانی دووبارە دەکردەوە پێغەمبەری خوای ناچار کرد ئاڵتونەکەی لێ وەربگرێ، فەرموی: یەکێ لە ئێوە دێتو هەرچی ماڵو سامانی هەیە لە دەستیایەتی لەگەڵ خۆی هێناویەتی دەڵێ: ئەوە هەموویم کرد بە خێر پاشان سەیری خۆی دەکات هیچی نەماوە ئنجا دەست لە خەڵك پان

دەکاتـەوە، باشـترین خێـرو صـەدەقە ئەوەیـە لەسـەر تێـری‌و دەوڵەمەنـدی بـێ، نـەك خـۆت موحتاجی دەستی خەڵك بی خێریش بکەی هەموو ماڵەکەت ببەخشی[1].»

٦٠٢. **ئەگەر خراپەت لەگەڵ کەسێکدا کرد باسی نەکەی**

دەگێڕنەوە پیاوێك بەسەر ئەسپێکەوە دەبێت لـە ڕێگەیـەکی دوورو چۆڵدا پیـاوێکی زۆر مانـدوو شـەکەتی بـینی، بـۆی وەسـتاو لـەدوای خۆیـەوە سـواری کـرد، دوای ماوەیـەك کـابرا حەسایەوە، کابرای شەکەت‌و ماندوو لـە پشتەوە خەنجەرەکـەی دەرهێنـاو بـە کـابرای خـاوەن ئەسپی گوت: دابەزە هەتا نەمکوشتووی، کابرای خاوەن ئەسپ زۆر دەپاڕێتـەوە بـەڵام سوودی نابێ، ئەسپەکەی پێدا، بەر لـەوەی کـابرای چـەتە بـڕوات کـابرای خـاوەن ئەسـپ گـوتی: یـەك تکات لێدەکەم، تخوا ئـەو بەسـەرهاتە لای کـەس بـاس مەکـە بـا خـەڵکی لـە پیـاوەتی‌و چاکەو یارمەتی دانی یەکتر سارد نەبنەوە ![2].

٦٠٣. **هۆکاری نەمانی بەرەکەت لە ماڵ‌و سامان**

ڕۆژێك کەسێك هات بۆ خزمەتی پێشەوا ئەبو حەنیفە گوتی مـن کرێکاری بـۆ کەسـێك دەکەم لە کارەکەمدا (٥) درهـەم وەردەگـرم، بـەڵام هەرچـەندی دەکـەم پارەکـە بەشـم ناکـات‌و لەسەری قەرزار دەبمەوە، چی بکەم باشە؟

ئەبو حەنیفە گوتی: هەر لەسەر کارەکەی خۆت بەردەوام بە بەڵام بـە خـاوەن کارەکـەت بڵـێ بـا بـۆت بکاتـە (٤) درهـەم، کـابرا زۆر متمانـەی بـە قسـەکەی ئـەبو حەنیفـە هـەبوو نەیپرسی بۆچی پارەکە کەم بکەمـەوە، چوو بـۆ لای خـاوەن کـارو گـوتی: پرسـێکی نـاوام بـە پێشەوا ئەبو حەنیفە کردووە ئەویش گوتوویەتی بە خاوەن کارەکەت بڵێ بـۆت بکـات بـە (٤) درهەم، خاوەن کارەکە گـوتی: کـەیفی خۆتـە بـۆمن قازانجـە، پـاش ماوەیـەك دووبـارە هاتـەوە لای پێشـەوا ئـەبو حەنیفـەو گـوتی: قـەربان بـەخوا هـەر بەشـم ناکـات‌و لەسـەری قـەرزار دەبمەوە.

ئەبو حەنیفە گوتی: بڕۆ بەخاوەن کارەکەت بڵێ بۆت بکات بە ٣ درهەم.

---

[1]) ئەڤینی ئیمان- ل ٣٨٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٠٨.

لەسەر داواکاری خۆی کابرای خاوەن کارەکە ئەوجارە بۆی کردە (٣) درهەم، پاش ماوەیەك هاتەوە لای پێشەوا ئەبو حەنیفە، ئەویش لێی پرسی ئێستا وەزع و گوزەرانت چۆنە؟

کابرا گوتی: سوپاس بۆ خوا ئێستا گوزەرانم زۆر باشەو زۆر بە ئاسودەیی دەژیم و پارەکەم بە چاکی بەشم دەکات، بەلام ئەی پێشەوا من سەرم سوڕماوە جاران (٥) درهەمم وەردەگرت بەشی نەدەکردم، ئێستا (٣) درهەم وەردەگرم زۆر بە ئاسودەیی دەژیم، دەبێ نهێنی ئەمەم پێ بڵێیت، بزانم هۆکارەکەی چییە؟!

ئەبو حەنیفە گوتی: ئەو ئیشەی تۆ بۆ خاوەن کارەکەت دەکرد بایی (٣) درهەم بوو بەلام تۆ (٥) درهەمت وەردەگرت (٢) درهەمی لە هەقی خۆی زیاد بوو ئەو (٢) درهەمە بەرەکەتی (٣) درهەمەکەی تریشی نەهێشتبوو[١].

## ٦٠٤. نەخواردنی ماڵی حەرام

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ڕەحمەتی خوای لێبێ جارێکیان ولاخێکی بەکرێ گرتبو بۆ ئەوەی بچێتە شارێکی دی، لە ڕێگا گۆچانەکەی لێ کەوتە خوارەوە لە ولاخەکەی دابەزی ولاخەکەی بەستەوە گەڕایەوە گۆچانەکەی هەڵگرتەوە، هاوڕێکانی لێیان پرسی باشە بۆچ هەر بەسواری ولاخەکە نەگەڕایتەوە؟

ئەویش گوتی: لەبەر ئەوەی من لەگەڵ خاوەنەکەی ڕێك کەوتوم لەسەر ئەوەی پێی بڕۆم بۆ فلان شار باسی ئەوەمان نەکردوە ئەگەر شتێکم لێ بەربێتەوە بگەڕێمەوەو هەڵی بگرمەوە بە ولاخەکەی ئەو[٢].

## ٦٠٥. زیانی دیمەنی ترسناك بۆ منداڵان

هونەرمەندی شانۆکار عەلیەفەندی (عەلی مەکی) دەڵێ: کاتێ فیلمی کوردی (نێرگز بوکی کوردستان)م برد بۆ دەرەوەی وڵات بەمەبەستی ئەوەی لە سینەما گشتیەکانی ئەوێ

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٣٥- ٤٣٦.

[٢]) ئاسودەیی ئیسلام- ب٢ ل ١٤٨.

پەخش بکرێ، بەڵام ڕێگەیان نەدا لەهیچ سینەمایەك پەخش بکرێ، منیش لە هۆکارەکەیم پرسی، گوتیان: لەبەر ئەوەی دیمەنی سەربڕینی مەڕێکی تێدایە ئەو دیمەنە ترسناکە بۆ منداڵانو تووشی نەخۆشی دەروونیان دەکات ![1].

٦٠٦. **قەرز دانەوە دەبێ وابێ**

لە خەولەی کچی قەیس خێزانی حەمزەی کوڕی عەبولوتەلیب ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ: {كان على رسول الله صلى الله عليه وسلم وسق من تمر لرجل من بني ساعدة فأتاه يقتضيه فأمر رسول الله صلى الله عليه وسلم رجلا من الأنصار أن يقضيه فقضاه تمرا دون تمره فأبى أن يقبله فقال أترد على رسول الله صلى الله عليه وسلم قال نعم ومن أحق بالعدل من رسول الله صلى الله عليه وسلم، فاكتحلت عينا رسول الله صلى الله عليه وسلم بدموعه ثم قال: صدق ومن أحق بالعدل مني، ثم قال: يا خولة عديه واقضيه فإنه ليس من غريم يخرج من عند غريمه راضيا إلا صلت عليه دواب الأرض ونون البحار وليس من عبد يلوي غريمه وهو يجد إلا كتب الله عليه في كل يوم وليلة إثما}

دەڵێ: کابرایەك لە بەنی ساعیدە هەندێ خورمای بەقەرز دابوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای تەواو بوونی ماوەی قەرزەکە هات داوای کردەوە، پێغەمبەری خواش بە یەکێکی خەڵکی مەدینەی فەرموو: بچێ خورماکە بداتەوە بە خاوەنی، کابرا لەگەڵ خاوەن قەرزەکە ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنەی کە خورماکەی لێبوو، خورماکەی بۆ کێشاو دایەوە، بەڵام کابرای خاوەن قەرز سەیری کرد خورماکەی وەکو هی خۆی باش نییە، بۆیە گوتی: من ئەو خورما خراپە لە جیاتی خورما چاکەکەی خۆم وەرناگرمەوە کە دابووم بە قەرز، کابرای مەدینەیی لێی تووڕە بوو گوتی: ئەوە شت بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺدا دەدەیتەوە؟

کابرا گوتی: بەڵێ، شتی خراپ لەجیاتی شتی باش وەرناگرمەوە، چ کەسێ شایستە ترە بە دادگەری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەق بداتەوە بە خاوەنەکەی؟

---

[1]) دینو زین- ل ٣١٢.

هاتنەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوە موبارەکەکانی پڕ بوون لە فرمێسكو فەرموی: ڕاست دەکا کێ شایستەترە لەمن بەوەی کە دادگەر بێ؟

پاشان فەرموی: خوای گەورە ئەو گەلە بەرز ناکاتەوە کە خاوەن هەقەکان نەتوانن داوای هەقەکانیان لە دەستەڵاتداران بکەن، ئنجا فەرموی: ئەی خەولەی کچی قەیس بڕۆ خورمایەکی زۆر چاکی بدەوە خورمایەك بێ دڵی ڕازی بکا، چونکە هەرکاتێ خاوەن قەرز لە کاتی دیاری کراوی خۆی هاتو داوای قەرزەکەی بکاتەوە، کەسی قەرزاریش وەك چۆن یەکەمجار قەرزەکەی وەرگرتبو بە ڕووی خۆشەوە قەرزەکەی بداتەوە دڵی خاوەن قەرزەکەی ڕازی کرد، ئەوە هەموو گیاندارانی سەرزەوی‌و ماسی ناو دەریاکان دوعای خێری بۆ دەکەن، هەر کەسێ لەکاتی دانەوەی قەرزەکە پارەی هەبوو بیداتەوە بەڵام نەیدایەوە تا ئەو کاتەی خاوەن قەرزەکە بێ ئومێد دەبێ لە وەرگرتنەوەی ئەوە هەموو شەوێکی کە بەسەردا تێدەپەڕێ خوای گەورە تاوانێکی لەسەر دەنووسرێ[1].

### ٦٠٧. بەڵگەیەك لەسەر بوونی خوای گەورە

دەگێڕنەوە پیاوێك هەبوو نیشو کاری ڕاگرتن‌و پەروەردگە کردنی مریشك‌و پەلەوەر بوو، لێیان پرسی بەچی خوات ناسیوە؟

ئەویش گوتی: بەبیر کردنەوە لە هێلکە خوام ناسی!.

گوتیان: چۆن؟

گوتی: تەماشای هێلکە دەکەم وەکو قەڵایەکی قاییم‌و داخراو دێتە بەرچاو، کە ناوەکەی پڕە لە زێڕی تەواوەو زیو، لەناو ئەو قەڵایەکە زیوەکە تێکەڵی ئاڵتونەکە نابێ، لەپاش چەند ڕۆژێك لەنێو ئەو قەڵایە بێ پەنجەرەو بێ دەروازەیە پەلەوەرێك دێتە دەرەوە

---

[1]) هەمان سەرچاوە- ل ٥٧٠- ٥٧١.

بە پەرو باڵی ڕەنگاو ڕەنگەوە کە مرۆڤ لە سەیر کردن‌و تەماشا کردنی تێر نابێت، لەمەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو هێلکەیە پەروەردگارێکی هەیە دروستی دەکات[1].

### ٦٠٨. ئارام گرتن

خێزانی ئەبو تەڵحە کە ناوی ئوم سولەیمە منداڵێککیان هەبوو، منداڵەکەیان نەخۆش کەوت لەکاتی نەخۆشییەکەیدا ئەبو تەڵحە سەفەرێکی کەوتە پێش، ئەبو تەڵحە لە سەفەرەکەیدا چەند ڕۆژێك مایەوە، بەر لەوەی بگەڕێتەوە منداڵەکەی وەفاتی کرد، ئوم سولەیم بە کەس‌و کارەکەی گوت: هەر کاتێ ئەبو تەڵحە گەڕایەوە هیچ یەکێکتان پێی نەڵێ کە کوڕەکەی وەفاتی کردووە، خواردنێکی خۆشی بۆ ئامادە کردو دەیزانی کەی دەگەڕێتەوە، ئەبو تەڵحە گەڕایەوە پرسیاری کرد منداڵەکەمان چۆنە؟

خێزانەکەی گوتی: ئێستا لە هەموو کاتێك زیاتر ئارامەو هێور بۆتەوە، خەوی لێکەوتووەو پێویست ناکات بچیت بۆ لای، هەر ئەو شەوە ئەبو تەڵحە چووە لای خێزانەکەی، بۆ بەرە بەیان ئوم سولەیمی خێزانی گوتی: پیاوەکە ئەگەر یەکێ ئەمانەتێك بدات بە یەکێکی تر پاشان داوای ئەمانەتەکەی خۆی بکاتەوەن ئایا ئەو کەسەی ئەمانەتەکەی لایە پێویست دەکات تووڕە بێ‌و خۆی غەمبار بکات؟

ئەبو تەڵحە گوتی: پێم بڵێ بزانم چی بووە؟

هاوسەرەکەی گوتی: منداڵەکەمان ئێستا لای خوای گەورەیەو ئەو ئەمانەتەی کە پێی دابووین لێی وەرگرتینەوە.

ئەبو تەڵحە ڕاچڵەکی بەم هەواڵەو پێی سەیر بوو بۆچی خێزانەکەی زووتر ئەو هەواڵەی پێ نەداوە، بەیانی چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا دوعای بەرەکەتی ئەو شەوەی بۆ کردن، گێڕەوەی ئەم

---

[1]) مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ- ب١- ل٦٦.

بەسەرهاتە دەڵێ: پاشان حەوت کوڕی ئەو ئافەرتەم بینی کە هەموویان قورئانیان لەبەر بوو لە مزگەوتدا وانەیان بە خەڵکی دەگوت[1].

### ٦٠٩. هەوڵدانی بەردەوام ئامانجی دەبێ

دەڵێن کوڕێك ماوەی (١٣) ساڵ کرێکار بوو، لە کارگەیەکی ڕستن‌و چنین، لەلای خۆی کتێبێکی دادەنا هەر کاتێ دەرفەتێکی وەرگرتبا سەیرێکی دەکردو شتێکی لێ لەبەر دەکرد، ئێوارانیش بۆ ماوەی دوو سەعات لە قوتابخانەی شەو دەیخوێند، پاشان کە دەگەڕایەوە پشوویەکی دەداو دەکەوتەوە سەر سەعی کردن تاکو بە زۆری دایکی چراکەی لێ دەکوژاندەوە، ئنجا دەنووست، ئەو کوڕە تاوەکو تەمەنی (٢٣) ساڵی بەم شێوەیە ژیانی بەڕێ کرد، کە گەیشتە تەمەنی (٢٥) ساڵی شارەزایی تەواوی لە زمانی ئینگلیزی پەیدا کرد، بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاوەکو توانی دوو بڕوانامە لە بوارەکانی پزیشکی‌و جیۆلۆجیا بەدەست بێنێ، ئەو پیاوە بوو بە زانایەکی ناوداری گەورە کە ناوی (دافید لیفینگستۆن)ە پزیشکێکی گەڕۆکە، لە زۆر بواردا جێ پەنجەی دیارە وە هەر ئەو زانایە توانی سەرچاوەی ڕوباری نیل بدۆزێتەوە[2].

### ٦١٠. نووسینەوەی ئەزموونەکان

دەڵێن ئەصمەعی ڕەحمەتی خوای لێبێ یەکێ لە قوتابییەکانی قسەکانی دەنووسیەوە، ڕۆژێك ئەصمەعی گوتی: چیە دەڵێی مەلائیکەتەکانی هاوڕێی ئینسانی هەموو شتێك کە دەیڵێم دەینووسی (أنت كالحفظة تكتب كل لفظة)؟

قوتابییەکە گوتی: ئەو قسەیەش دەنووسم، حیکمەت لەهەر کوێیەك بێ لای هەر کەسێکەوە بێ وەردەگیرێ[3].

[1]) بەڕاستی شاژنە- ل ٤٨- ٥٠.

[2]) هەزارو یەك- ب٢- ل ١٥١٢.

[3]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ١٥٣.

### ٦١١. ستەمکار بە ستەمکار لەناو دەچێ

کاتێك هۆلاکۆ شاری بەغدای داگیر کرد خەلیفە موعتەصەمی لەژوورێکی کۆشکەکەیدا بەند کرد، خەلیفە برسی دەبێو داوای نان دەکات لە پاسەوانی ژوورەکەی، کاتێك ئەمەیان بە هۆلاکۆ گوت، هۆلاکۆ قاپێکی پڕ کرد لە زێڕو ئاڵتونو بەدەستی خۆی بۆی بردو گوتی: بیخۆ، خەلیفە گوتی: ئاڵتون چۆن دەخورێ؟

هۆلاکۆ گوتی: دەی ئەگەر ناخورێ لەبەر چی کۆت دەکردەوەو نەتدەدا بە گەلەکەت، تا بیکەن بە شمشێرو ڕمو بەرەنگاری من ببنەوە نەهێڵن بەغدا داگیر بکەم، قاپە ئاڵتونەکەی لەبەر دەم داناو ڕۆیشت سەرەنجام خەلیفە بەم شێوەیە مایەوە تاوەکو لە برسان مرد[1].

### ٦١٢. خێرکردنو ماڵ بەخشین لای هاوەڵان

مالیکی کوڕی دینار دەڵێ: پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لیی ڕازی بێ ڕۆژێکیان (٤٠٠) لیرەی هەڵگرتو خستیە نێو کیسەیەك دای بەگەنجێك گوتی: بڕۆ بیبە بۆ لای ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، دوای ئەوەی کە پارەکەت دا لای بمێنەوەو بزانە ئەو پارەیە چی لێ دەکا؟

کابرای گەنجەکە پارەکەی دا بە ئەبو عوبەیدەو گوتی: پێشەوای مسوڵمانان گوتویەتی ئەو پارەیەی پێبدە با لەخۆی سەرف بکا..

ئەبو عوبەیدە گوتی: خوا بەزەیی بە پێشەوای مسوڵمانان دا بێتەوە، بانگی یەکێ لە کچەکانی کرد پێنج لیرەی پێداو گوتی: بیدە بە فلان ماڵە کە هەژارن، بانگی یەکێکی تری لە منداڵەکانی کردو چوار لیرەی پێداو گوتی: بیبە بۆ فلان هەژار، بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا هەموو پارەکەی بەخشیو هیچی بۆخۆی نەگێڕایەوە، گەنجەکە گەڕایەوە هەواڵەکەی دا بە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب، بینی بەهەمان شێوە هەندێ پارەی بۆ موعازی کوڕی جەبەل ئامادە کردوە پێی گوت: ئەو پارەیەی بۆ ببەو بەهەمان شێوە کەمێك لەلای بمێنەوە بزانە چی لە پارەکە دەکات؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ١٧٧.

موعازی کوڕی جەبەل هەمان شێوەی ئەبو عوبەیدەی دووبارە کردەوە، خێزانەکەی پێی گوت: بەخوا ئێمە خۆشمان زۆر نەدارین هەندێکی بهێڵەوە بۆ خۆمان، موعازیش سەیری تورەگەکەی کرد دوو لیرەی تێدا مابوو ئەویشی دا بە خێزانەکەی.

گەنجەکە گەڕایەوە بۆلای پێشەوا عومەرو بۆی گێڕایەوە، پێشەوا عومەر بەمە زۆر خۆشحاڵ بوو گوتی: بەڕاستی ئەوانە هەموو بران[1].

### ٦١٣. شەهید لاشەی نارزێ

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: موعاویە ویستی ئەو کانیاوەی لە ئوحودەوە هەڵدەقوڵێ بە شێوەی جۆگە ڕایبکێشێ بۆ پێداویستی مسوڵمانان، ئەوانیش بۆیان نووسی ناتوانین جۆگەکە ڕابکێشین لەبەر گۆڕی شەهیدان، دەبێ بەسەر گۆڕەکاندا بیهێنین شوێنەکەی ئاوابوو، ڕاوی دەڵێ: هەندێ لەو گۆڕانەیان گواستەوە، لاشەکان وەکو نوستوو وابون، یەکێ لەو گۆڕانە لاشەی حەمزە بوو خوا لێی ڕازی بێ، تیرێك بە قاچی پیرۆزی کەوتبوو خوێنی گەشی لێدەهات، دەتگوت ئێستا شەهید بووە[2].

### ٦١٤. بەزەیی هاتنەوەو خۆشویستنی مسوڵمانان

مەسوری کوڕی موخرەمە گەنمو جۆو دانەوێڵەی زۆری کڕیبو عەمبارەکانی لێ پڕ کردبوون، خەڵکی وایان گومان دەبرد کە ساڵێکی وشك دەبێ، بەڵێ پایزێکی درەنگ بوو باران لە وەختی پەلە زۆر دواکەوتبو، دەغڵو دان نرخی زۆر بەرز بوویەوە، ڕۆژێکیان هەور بەری ئاسمانی گرت، خەڵکی زۆر دڵخۆش بوون داوایان لە خوای گەورە دەکرد بارانیان بۆ ببارێنێ، لەو وشکە ساڵیو قاتو قڕیە ڕزگاریان بێ، لەو کاتەدا خەڵکی دڵخۆش بوون بەهەورەکەمەسوری کوڕی مەخرەمە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەو کاتەی کە خەڵك بەم شێوەیە دڵی خۆش بوو من دڵم تەنگ بوو حەزم نەدەکرد باران ببارێ، یبۆئەوەی نرخی دانەوێڵە دلنەبەزێ دەڵێ: بەڵام دەست بەجێ بەئاگا هاتمەوەو بە نەفسی خۆم گوت: ئەی نەفسی بەد خوو ئەوە چیە؟ دەبینم ڕقت لە شتێکە کە خێرو بەرەکەتی بۆ مسوڵمانان

---

[1]) ئەصحابەکانی پێغەمبەر - ب١- ل ٣٢٣.

[2]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٤٧٩.

تێدایە، بۆیە وەکو تۆڵەیەك لەو شتەی کە دڵی پێی ناخۆش بوو بڕیاریدا دانەوێڵەکەی بفرۆشێ بەو نرخەی کە پێشتر پێی کڕیبو نەك نرخە نوێیەکەی کە زۆر گران بوو، بڕیاریدا بەم شێوەیە بیفرۆشێ بە موسڵمانانو هیچ قازانجێکی لێ نەکا، بەڵێ بەم شێوەیە دانەوێڵەکانی فرۆشت بە نرخێك کە هەرگیز کەس چاوەڕێی ئەمەی نەدەکرد، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب پێی گوت: ئەمە چۆنە بەو نرخە دەیفرۆشیو هیچ قازانجی ناخەیە سەر؟

ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، پێشەوا عومەریش زۆر پێی خۆشحاڵ بوو پێی گوت: خوا پاداشتت بداتەوە وە ئەو دڵە پاکەت هەروا بە پاکی بمێنێتەوە[1].

### ٦١٥. قەرز دانەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ حوشترێکی کەم تەمەنی لە کەسێك قەرز کرد، بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان، پاشان کۆمەڵێك حوشتریان بۆ هێنا، پێغەمبەری خواش ﷺ بەیەکێ لە هاوەڵانی فەرموو: بڕۆ حوشترێکی یەك ساڵانە لە ناو ئەو حوشترانە بدۆزەوە بیدەوە بە فلان کەس، لەجیاتی قەرزەکەی، ئەو هاوەڵە گەڕایەوە لای پێغەمبەری خواو پێی گوت: حوشتری یەك ساڵانەی تێدا نییە هەموو حوشترەکان تەمەنیان زیاترە لە یەك ساڵو باشترن لە حوشترەکەی خۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {أَعْطِهِ إِيَّاهُ إِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً}، واتە: بڕۆن یەکێکی باشتری لە هی خۆی بدەنەوە چونکە باشترینی خەڵکی ئەوانەن کە بەجوانترین شێوە قەرز دەدەنەوە[2].

### ٦١٦. خیانەتو غەش کردن

ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ ڕۆژێکیان بەلای کەسێکدا ڕۆیشت کە ئاوی دەکردە شیرەوە ئەبو هورەیرە پێی گوت: {كيف بك إذ قيل لك يوم القيامة خلص الماء من

---

[1]) ئاسودەیی ئیسلام- ب٢- ل ١٨٦.

[2]) ئاسودەیی ئیسلام- ب٢- ل١٩٥- ١٩٦.

اللبن؟} واتە: چی دەکەی و حاڵت چۆن دەبێ ئەگەر لە ڕۆژی دوایی پێت بگوترێ: ئاوەکە لە شیرەکە جیا بکەوە؟[1].

## ٦١٧. تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا

دەگێڕنەوە لە بەنی ئیسرائیل گەنجێکی خواپەرست هەبوو تەمەنی (٢٠)ساڵان بوو، پاشان وازی لە خوا پەرستی هێنا بەدوای گوناح کەوت (٢٠) ساڵی دیکە، ڕۆژێک بەدیار ئاوێنەوە دەوەستێ دەبینێ مووی سپی لەسەرو ڕیشی پەیدا بووە، زۆری پێ ناخۆش دەبێ کە ئاسەواری پیری بەسەرو ڕیشیەوە دیارە، دەڵێ: خوایە پاش (٢٠) ساڵ عیبادەت و خوا پەرستی دەست کرد بە گوناهو تاوان ئەوە (٢٠) ساڵە من خەریکی سەرپێچی تۆم، ئەگەر ئێستا بێمەوە وەرمدەگریەوە؟

وەختێك دەنگێکی ئاسمانی هات و گوتی: وەختێ ئاگات لە خوا پەرستی بوو، ئێمەش ئاگامان لێت بوو، کە وازت لێهێنانین ئێمەش وازمان لێ هێنای دەستت بەخراپە کرد مەجالمان دای، ئێستاش بگەڕێرەوە دەرگات لێ دەکەینەوە[2].••

## ٦١٨. لەخوا ترسان

یەحیای کوڕی ئەییوب دەڵێ: گەنجێکی دیندارو لەخوا ترس هەبوو لە شاری مەدینە، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب زۆر خۆشی دەویست لەبەر دینداریەکەی، تا ئەوەی شەوێکیان ئەو گەنجە لە نوێژی عیشا دەگەڕایەوە ماڵەوە لە ڕێگا ئافرەتێك خۆی پێشان داو ویستی تووشی کاری خراپی بکات، بەدوای ئافرەتەکە کەوت تا گەیشتە بەر دەرگاری ماڵیان، لەناکاو ئەو ئایەتەی بیرهاتەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾ الأعراف، لەترسان لەرز دایگرت و کەوتە سەر زەوی وەکو مردوویێك، پاشان ئافرەتەکەو خزمەتکارەکەی هەوڵیاندا بەهۆش خۆی بێننەوە بەڵام نەیانتوانی، ناچار بەهەردووکیان ڕایانکێشا بۆ نزیك

[1] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ل ٢٠١.

[2] تاریکستانی گوناح و ئاوەدانی ئیمان ل ٥٣-٥٤.

ماڵی خۆی، باوکی هاتە دەرەوە کوڕەکەی بینی بەو حاڵە هێنایە ژوورەوە لەسەری وەستان تا بەهۆش خۆی هاتەوە، هەر لێیان دەپرسی ئەمە چیت بەسەر هاتووە؟

ئەویش تەنها ئەو ئایەتەی دووبارە دەکردەوە تا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گیانی دەرچوو، هەواڵی ئەو گەنجە گەیشتە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب، ئەویش گوتی: بۆچی هەواڵتان پێنەدام تا ئامادەی شاردنەوەکەی بم، چووە سەر گۆڕی گەنجەکەو بەدەنگێکی بەرز ئەو ئایەتەی خوێند: ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ ﴾ الرحمن، لەناو گۆڕەکە دەنگێك هاتو گوتی: خودا پێی دام ئەی ئەمیری ئیمانداران[١].

٦١٩. **ترسان لە مافی خەڵك**

دەگێڕنەوە کابرایەکی مەجوسی قەرزاری ئەبو حەنیفە دەبێ، ئەبو حەنیفە دەچێ قەرزەکەی وەرگرێتەوە لەنزیك ماڵی مەجوسیەکە پیسیەك لەژێر پێی ئەبو حەنیفە دەردەچێ بە دیواری ماڵی ئەو مەجوسیە دەنووسێ، ئەبو حەنیفەش بیر دەکاتەوە ئەگەر پیسیەکە لێ بکاتەوە، ئەوە بەقەد پەنجەیەك لە دیوارەکە خۆڵ لێدەبێتەوە، ئەگەر وازیشی لێ بێنێ ئەوە پیس بووە، لەبەر بیرکردنەوە لەوەی چۆن گەردنی خۆی بەو پیاوە مەجوسیە ئازاد بکات قەرزەکەی هەر لەبیر نامێنێ، بەهەر حاڵ لە دەرگا دەدات خزمەتکاری پیاوە مەجوسیەکە دەرگا دەکاتەوە، ئەویش پێی دەڵێ: برۆ بە گەورەکەت بڵێ ئەبو حەنیفە چاوەڕێت دەکا لەبەر دەرگا، کە پیاوە مەجوسیەکە هاتە دەرەوە وایزانی باسی قەرزەکەی لەگەڵ دەکا، کەچی یەکسەر ئەبو حەنیفە باسی پیس بوونی دیوارەکەی لەگەڵ کردو پۆزشی بۆ هێنایەوە، باسی چۆنیەتی خاوێن کردنەوەی دیوارەکەی لەگەڵ کرد، کابرای مەجوسی کە گوێی لەو قسانەی ئەبو حەنیفە بوو، گوتی: جارێ بوەستە بامن خۆم پاك بکەمەوە شەهادەی هێناو مسوڵمان بوو، بە ڕەوشتێکی جوانی ئەبو حەنیفە کابرای مەجوسی لە ئاگری دۆزەخی هەتا هەتایی ڕزگاری بوو[٢].

٦٢٠. **نوێژ کردنی بە پەلە دروست نییە**

---

١) تاریکستانی گوناهو ئاوەدانی ئیمان- ل ٩٤.

٢) هەمان سەررچاوەی پێشوو- ل ١٥٣- ١٥٤.

دەڵێن جارێك پیاوێك دێتە مزگەوتو دوو ڕكعات نوێژ دەكات پاشان سەلام دەداتەوەو دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو سەلام دەكات، پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامەكەی جواب دەداتەوەو پێی دەفەرمووێ نوێژەكەت دووبارە بكەوە نوێژت نەكردووە، پیاوەكە دەچێ نوێژەكەی دووبارە دەكاتەوەو دێتەوە دیسان پێی دەفەرمووێ: بچۆ نوێژەكەت بكە نوێژت نەكردوە، سێ جار نوێژەكەی پێ دووبارە كردەوە هەر پێی فەرموو: بچۆ نوێژەكەت بكە نوێژت نەكردوە، جاری سێیەم كابرا گوتی: سوێند بەو كەسەی تۆی ناردووە بە پێغەمبەر لەوە زیاتر نازانم، فێرم بكە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: هەركاتێ نوێژت دابەستا (الله أكبر)ت كرد، سورەتی فاتیحە بخوێنە لەگەڵ سورەتێكی تر كە دەیزانی، پاشان كە چوویە ڕكوع هەڵمەستەوە تا لەشت لە جووڵە دەكەوێ، كە هەڵسایەوە لە ڕكوع بەهەمان شێوە پەلە مەكە تا بەتەواوی هەڵدەستیەوە، پاشان كە چووی بۆ سوژدە دیسان پەلە مەكە تا بەتەواوی سوژدە دەبەیتو لەشت لە جووڵە دەكەوێ بەم شێوەیە درێژە بە نوێژەكەت بدە تا سەلام دەدەیتەوە[1].

### ٦٢١. ڕەوشتی بانگخواز

چەند ساڵێك لەمەوبەر مسوڵمانێكی دانیشتووی بەریتانی دەبێتە پێش نوێژو وتار خوێن لە یەكێ لە مزگەوتەكانی ئەو وڵاتە، ڕۆژێكیان لە شوێنێك بە سواری پاص دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە، كە سواری پاصەكە دەبێ پارە دەدا باقییەكە وەردەگرێتەوە بڕێكی زیاتری پێ دەدرێتەوە لەلایەن شوفێری پاصەكە، ئەو زیادیە زۆر كەمە قیمەتێكی ئەتۆی نییە، بەدڵی دادێ كە ئەو برە نەگەڕێنێتەوە بۆ شوفێرەكە، چونكە شتێكی ئەوها نییە، تا دەگاتە ئەو شوێنەی دەیەێ دابەزێ، كاتێ هەڵدەستێتەوە لەبەر دەرگای پاصەكە بەر لەوەی بێتە خوارەوە شەیتان بەنەفرەت دەكاو دەست لە گیرفانی دەنێو پارەكە دەداتەوە بە شوفێرەكە، شوفێرەكە گوتی: تۆ مەلای نوێی ئەو شوێنەی؟

ئەویش گوتی: بەڵێ.

---

[1]) ئەم بەسەرهاتە پێشەوایان بوخاریو موسلیم هێناویانە لە صەحیحەكانیان.

شوفێرەكە گوتی: ماوەیەكە من دەمەوێ بێم بۆ مزگەوتەكەتانو مسوڵمان بم، بۆ ئەوەی لە ئیسلام شارەزا بم، ئیمڕۆ بە ئەنقەست تۆم تاقی كردەوە، بۆ ئەوەی بزانم پێشەوای مسوڵمانان چۆنن، ئایا ئەو دینە ڕێگەیان پێ دەدا ماڵی خەڵك بخۆن؟ ئێستا بۆم دەركەوت بیرو باوەڕەكەتان هەقەو مافی خەڵك هەر چەند كەمیش بێ ئێوە ئامادە نین بیخۆن، بەم نزیكانەش سەردانتان دەكەم بۆ ئەوەی مسوڵمان بم، مامۆستا دەڵێ كە دابەزیم لاقەكانم زەویان نەدەگرت، دەستم گرت بە عامودێكەوە لەسەر شەقامەكە سەرم بەرز كردەوە بۆ ئاسمانو چاوەكانم پڕ بوون لە فرمێسكو دەستم كرد بە گریان، گوتم: خوایە گیان خەریك بوو ئیسلام بفرۆشم بە (٢٠) سەنت، ئەگەر پارەكەم نەدابایەوە ئەو پیاوە هەتا ماوە ئیسلامی لەبەر چاوی دەكەوت بەهۆی منەوە، مسوڵمان نەبوونی ئەو بەهۆی (٢٠) سەنتەوە دەخرایە سەر ئەستۆی من[1].

### ٦٢٢. مافی خەڵك

یەكێ لە زانایان كە ناوی سەهلی كوڕی عەبدوڵلایە چوو بۆ عێراق بۆ فێربوونی زانستی شەرعی، لە شاری بەغدا مایەوە ژوورێكی بەكرێ گرت، كە دیوارەكانی بە قوڕ سواق درابوو، ڕۆژێكیان یەكێ لە خزمانی دێ بۆ شاری بەغداو سەرێك لەو زانا بەڕێزە دەدا، پاش ئەوەی دەیەوێ بگەڕێتەوە، بە سەهل دەڵێ: چ پەیامێكت هەیە بیبەم بۆ خزمو كەسەكانت، سەهل دەڵێ: زۆر سەلام بگەیەنە بە دایكم زۆر غەریبی دەكەم ماوەیەكی زۆرە نەمبینیوە بەهۆی ئەوەی لای ئەو زانا بەڕێزانە دەخوێنم ناتوانم بەجێیان بێڵمو واز لەو زانستانە بێنم، شوێنەكەم بگیرێ، دەمەوێ نامەیەكی بۆ بنووسم تۆش بۆم بگەیەنی، خزمەكەی گوتی: زۆر باشە خێرا نامەكە بنووسە تا كاروانچیەكان نەڕۆشتوون سەهل دەستی كرد بە نامە نووسین مەرەكەبی ئەو كاتەش كاتێكی زۆری دەویست تا وشك دەبوویەوە، ئەگەر زوو بپێچرابا وشەكانی تێك دەچوون، بەلام لەبەر ئەوەی خزمەكەی پەلەی بوو سەهل هەڵسا هەندێ گڵی لە دیواری ژوورەكەی هەڵكراند بۆ ئەوەی بە نووسینەكە دابكاو زوو وشك بێ، شەو كە دەخەوێ لە خەودا پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینێ، پەرداخێك شیر دەدا بە سەهل پێی دەفەرمووێ: ئەم شیرە بخۆرەوە بەلام بەر لەوەی بیخۆیتەوە هەندێ گڵی

---

[1]) ئەڤینی ئیمان- ل ٤٥٥- ٤٥٦.

لەگەڵ تێکەڵ بکە، سەهل لە خەوەکەدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دایكو باوکەوە بەقوربانت بم، بۆچی دەبێ ئەو شیرە خاوێنە ئەو گڵەی تێکەڵ بکرێ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو ئەی چۆن تۆش چاکەکانت تێکەڵ بە خراپە دەکەی؟ چۆن ڕێگەت بەخۆتدا گڵی ئەو دیوارە لێبکەیتەوە بەبێ پرسی خاوەنەکەی لە قیامەتدا چۆن وەڵامی خاوەن زوورەکەت دەدەیتەوە؟[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٠١- ٥٠٢.

## ٦٢٣. پاداشتی دەست پاکیو پاراستنی ئەمانەت

پیاوێکی هەژار لەگەڵ ژنو منداڵەکەی لە شاری مەککە دەژیا، ڕۆژێکیان برسێتی زۆری بۆ هێنابوون، ژنەکە بە پیاوەکەی گوت: ئەگەر بڕۆی کەمێك خواردنمان بۆ پەیدا بکەی بەڵکو لە برسانا نەمرین، پیاوەکەش چووە دەرەوە هاوڕێیەکی هەبوو بچێتە لای قەرزی لێبکا بەڵام زۆر بەدوای گەڕا نەیدۆزیەوە، بۆیە چووە ناو کەعبەو دەستی بەدیواری کەعبە هەڵواسیو گوتی: (اللهم اكفني بحلالك عن حرامك واغنني بفضلك عمن سواك)، واتە: خوایە گیان بە ڕۆزی حەلاڵی خۆت تێرم بکە دوور لە حەرام، بە فەزڵو منەتی خۆت تێرم بکە، بێ نیازم بکە لە غەیری خۆت، هەر کە دوعاکەی تەواو کرد ڕۆیشت بۆ دەرەوەی حەرەم کیسەیەکی بینی هەڵیگرتەوە بینی هەزار دیناری تێدایە، زۆر پێی دڵخۆش بوو، بردیەوە لای خاوو خێزانەکەی، بە خێزانەکەی گوت: چ خواردنێکتان حەز لێیە بۆتان بێنم، خێزانەکەی گوتی: بڕۆ بگەڕێرەوە بۆ حەرەم بزانە ئەو پارەیە هی کێیە بیدەرەوە ئێمە خواردنی ماڵی حەرام ناخۆین، کە گەڕایەوە بینی پیاوێك هاوار دەکات کێ کیسەیەکی بینیوەتەوە؟ ئەویش گوتی: ئایا کیسەکەت چەند پارەی تێدا بوو؟

پیاوەکە گوتی: هەزار دیناری تێدابوو.

پیاوە هەژارەکە گوتی: بەڵێ من پارەکەم دۆزیوەتەوە فەرموو ئەوە پارەکەت خوای گەورە بەرەکەت دار بکات بۆت.

پیاوەکە کە چاوی بە کیسەکەی خۆی کەوت گوتی: بەڵێ ئەمە خۆیەتی، کیسەیەکی تری دەرهێنا گوتی: ئەو کیسەیەش (٩٠٠٠) دیناری تێدایە ئەمەی لای تۆش (١٠٠٠) دیناری تێدایە هەردووکی دەکاتە (١٠٠٠٠) دینار ئەمە هەمووی دیارییە بۆ تۆ.

پیاوە هەژارەکە واقی وڕماو گوتی: ئەوە گاڵتەم پێ دەکەیت؟

پیاوەکە گوتی: نەخێر گاڵتەت پێ ناکەم من لەلای پیاوێکی دەوڵەمەند کار دەکەم بڕیاریدا خێرێکی گەورە بکات، پێمی گوت: بڕۆ هەزار دینار لە نێو حەرەم دابنێ تاوەکو یەکێ هەڵیدەگرێتەوە، پاشان هاوار بکە بزانە کێ هەڵیگرتۆتەوە، ئەگەر ئەو کەسەی هەڵیگرتۆتەوە هێنایەوە کەواتە: ئەوە نیشانەی ئەوەیە پیاوێکی دەست پاکەو شایەنی

ئەوەیە ئەو نۆ هەزارەکەی تریشی پێ بدەی چونکە کەسی دەست پاك خەڵکیش سوودی لێدەبینن و شایستەی ئەوەیە پارەتی بدرێ، بۆیە ئەو (١٠٠٠٠) دینارە قسمەتی تۆ بوو هەڵیگرەو بۆخۆت بیبە، پیاوە هەزارەکەش خواردنی کری بۆ ماڵو منداڵەکەیو بەشێکی پارەکەشی بۆ خێزانەکەی هەلگرت، بەشەکەی تریشی کرد بە خێرو بەسەر هەژاران دابەشی کرد[1].

### ٦٢٤. ببەخشە خوای بەخشەر پێت دەبەخشێ

دەگێڕنەوە ڕاوچیەك هەبوو ناوی بیلال بوو لەگەڵ خێزانەکەی لە خانووێکی بچوکی نزیك ڕوباری نیل دەژیا، ئەو پیاوە ڕاوچیە کەسێکی هەژار بوو، ڕۆژانە ماسی ڕاو دەکردو دەیبرد بۆ بازاڕ لەوێ دەیفرۆشتو بە پارەکەی خواردنی بۆ ماڵو منداڵی دەهێنایەوە، چەند ڕۆژێك بیلال هیچ پارەیەکی ئیش نەکردبوو، بەهۆی ئەوەی ماسی بە تۆڕەکەی وەنەدەبوو، بەیانیەك هەڵسا بینی منداڵەکانی لە برسانا دەگرین، ئەویش ناوی خوای هێناو چوو بۆ سەر ڕوبار تا لوقمە نانێك بۆ منداڵەکانی بکڕێ،ختێکی زانی ماسیەکی زۆر گەورە بە تۆڕەکەی وەبوو، زۆر دڵی خۆش بوو خێرا چوو بۆ بازاڕ ماسیەکەی فرۆشتو بە پارەکەی هەندێ خواردنی بۆ منداڵەکانی کڕیو دەستی کرد بە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، لە ڕێگادا ئافرەتێکی بەتەمەنی بینی بەکوڵ دەگریا، بیلال لە هۆکاری گریانەکەی پرسی پیرەژنەکە گوتی: ماوەی دوو ڕۆژە خۆمو منداڵەکانم هیچ شتێکمان نەخواردووە، هیچ پارەیەکیش شك نابەین، بیلال هەموو ئەو خواردنەی کڕیبوی دای بەو ئافرەتە بەتەمەنە، ئافرەتەکە گەشایەوەو زۆر دڵخۆش بوو دوعای خێری زۆری بۆ بیلال کرد، بیلال گەڕایەوە ماڵەوە لە ڕێگادا زۆر بیری لەوە دەکردەوە چ بە ماڵو منداڵو خێزانەکەی بڵێ لە کاتێکدا ئەوان چاوەڕێی باوکیانن بۆ ئەوەی پارووێك نانیان بۆ بهێنێتەوە، لەناو ئەو بیرکردنەوەیە بوو گوێی لە دەنگێك بوو لە پشتیەوە بانگی دەکرد بیلال، بیلال، ئاوڕی دایەوە بۆ پشتەوە بینی پیاوێك بانگی دەکات، بە پیاوەکەی گوت: چیت دەوێ براکەم؟

---

[1]) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب١- ل٣٢-٣٣.

کابرا گوتی: من کاتی خۆی (١٠) ساڵ بەر لە ئێستا (٥٠٠٠) درهەمم لە باوکت قەرز دەستم کرد بە بازرگانی کردن ڕۆیشتم کە هاتمەوە باوکت وەفاتی کردبوو، دەمێکە بەدوای تۆدا دەگەڕێم تا تۆم دۆزیەوە، ئەو بڕە پارەیە دەدەمەوە بەتۆو داوای لێبوردنیشتان لێ دەکەم، بیلال زۆر دڵخۆش بوو بەمەو گەڕایەوە ماڵەوە بە کۆمەڵێك خواردنو خواردنەوە بۆ خێزانەکەی، بەپارەکە دەستی کرد بە بازرگانی کردنو خانوویکی خۆشی کڕیو دەوڵەمەند بوو، بەڵام هەرگیز هەژارانی لەبیر نەکرد[1].

### ٦٢٥. تۆ نازانی خێر لەچیدایە

شێخ موحەممەد ڕاتب نابلسی دەڵێ برادەرێکم لە کۆلێژی پزیشکی دەیخوێند کەسێکی وورد بوو قەدو باڵای بچووك بوو، بۆی گێڕامەوە کە ڕۆژێکیان لە شارێکەوە دەچووم بۆ شارێکی تر، دووکەس لە پاصەکە سەرکەوتن شوێنی دانیشتن نەمابوو، تاویان دایە منو دەریانکردم خۆیان لە شوێنەکەم دانیشتن، منیش زۆر دڵتەنگ بووم زۆرم پێناخۆش بوو، ناچار سواری سەیارەکی دیکە بووم، لە ڕێگا زۆر دڵتەنگ بووم، لە ڕێگادا دەڕۆیشین، بینیم ئەو پاصەی من لێی دەرکرام لەلایەن ئەو دوو پیاوە شەڕفرۆشەبرگەڕاومو زۆر بەخراپی سەرنشینەکانی بریندارو کوژراون بەهۆی ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە، ئەو کاتە یەکسەر ئەو ئابەتە موبارەکەم بیر هاتەوە کە خوا (سبحانە و تعالی) دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ ﴾ البقرة[2].

### ٦٢٦. ئەگەر زۆر پێویست نیت قەرز مەکە

زاناو پیاوباش ئەبو حازم بەلای گۆشت فرۆشێك تێپەڕی، گۆشت فرۆشەکە گوتی: مامۆستا گۆشتێکی زۆر جوانو ناسکم لایە، حەزت لێی نییە؟

زاناکە گوتی: حەزم لێیەتی بەڵام پارەم پێ نییە.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب١- ل ٤٨.

[2]) هەزارو یەك- ب٢- ل ٢١١-٢١٢.

گۆشت فرۆشەکە گوتی: من لەسەرت دەوەستم کەی ھەتبوو ئەو کاتە پارەکەم پێ بدە.

ئەبو حازم گوتی: نەفسی خۆم لەسەرم بوەستێ باشترە لە تۆ!![1].

### ٦٢٧. ھەوڵدان بۆ بەدەست ھێنانی نیعمەتە خواییەکان

پێغەمبەر ﷺ باسی پێغەمبەر ئەییوبمان بۆ دەکات سەلامی خوای لێبێ، دوای ئەوەی خوای گەورە شیفای بۆ ناردوو چاك بوویەوە، ڕۆژێکیان جلو بەرگی لەبەر کردبۆوەو خۆی دەشوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {أمْطِرَ عَلَى أَيُوبَ جَرَادٌ مِنْ ذَهَبٍ وَقَالَ عَبْدُ الصَّمَدِ فَرَاشٌ فَجَعَلَ يَلْتَقِطُهُ فَقَالَ يَا أَيُوبُ أَلَمْ أُوَسِّعْ عَلَيْكَ قَالَ يَا رَبِّ وَمَنْ يَشْبَعُ مِنْ رَحْمَتِكَ أَوْ قَالَ مِنْ فَضْلِكَ قَالَ عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لَا غِنًى بِي عَنْ فَضْلِكَ}، لەو کاتەی کە خۆی ڕووت کردبۆوەو خۆی دەشووشت، کوللەی ئالتونی بەسەردا دەباری، یەکێ لەو کوللە ئالتونیانەی کە کەوتبوونە بەردەم پێغەمبەر ئەییوب فڕی، ئەویش شوێنی کەوت بۆ ئەوەی بیگرێتەوەو لەدەستی نەچێ، خوای گەورە پێی فەرموو: ئەی ئەییوب ئایا بای ئەوەندە کوللەی ئالتونیمان بەسەردا نەباراندووی تا بێنیاز بیو شوێن ئەو کوللەیە نەکەوی بۆ ئەوەی بیگریەوە؟

پێغەمبەری ئەییوب فەرموی: با، بەڵا من ھەرگیز بێ نیاز نییم لە فەزڵو بەرەکەتی تۆ، (بڵێم پێویستم پێی نییەو شوێنی ناکەوم)[2].

### ٦٢٨. گەڕانەوە بۆ لای خوا دەرمانی ھەموو دەردێکە

پیاوێکی نەزۆك زۆر سەردانی دکتۆری دەکرد، پاش چارەسەرییەکی زۆر دکتۆەکان بێ ئومێدیان کرد لەوەی منداڵیان ببێ، ڕۆژێکیان دەگات بە زانایەکی خواپەرستو حاڵی خۆی بۆ باس دەکات، زاناکە پێی دەڵێ: خۆتو خێزانەکەت بەیانیانو ئێواران زۆر (أستغفر الله) بکەن، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ ﴾ نوح،

---

[1]) ئاسودەیی ئیسلام- ب٢- ل ٢٧٩.

[2]) ئەم بەسەرھاتە پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا ھێناویەتی.

پیاوەکە خۆیو خێزانی دەستیان کرد بە گەڕانەوە بۆ لای خوا هەموو بەیانیانو ئێواران، تا ئەوەی خوای بەخشەر منداڵی پێ بەخشین[1].

### ٦٢٩. ئەگەر جنێویشیان پێدای جنێو مەدەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان لە نێو هاوەڵاندا دانیشتبوو، پێشەوا ئەبو بەکریش لەوێ دانیشتبوو، لەناکاو پیاوێکی غەریبە هات جنێوی زۆری بە پێشەوا ئەبو بەکردا خوا لێی ڕازی بێ، ئەبو بەکریش وەڵامی نەدەکایەوە، پیاوەکە هەر بەردەوام بوو لە قسە گوتن بە پێشەوا ئەبو بەکر، ئەویش هەندێ لە قسەکانی وەڵام دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆڕەکەی جێهێشتو ڕۆیشت، پێشەوا ئەبو بەکر خێرا دوای کەوت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوە هەر قسەی ناشیرینی بەمن دەگوت: بەڵا تۆ مەجلیسەکەت جێ نەهێشت، بەڵام کە من وەڵامم دایەوە تۆ یەکسەر تووڕە بوویو مەجلیسەکەت جێهێشت، لەبەرچی؟

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی ئەبو بەکر لەو کاتەی ئەو جوێنی بەتۆ دەداو تۆش وەڵامت نەدەدایەوە فریشتەیەك لە شوێنی تۆ وەڵامی دەدایەوە، بەڵام ئەو کاتەی تۆ وەڵامت دایەوە شەیتان هاتە مەجلیسەکەوە منیش لە شوێنێك دانانیشم کە شەیتانی لێبێ[2].

### ٦٣٠. ئێمە بەدینی ئیسلام گەورەین

لە سەردەمی پێغەمبەر موسا سەلامی خوای لێبێ دوو پیاو وەستابوون هەریەکەیان باسی نەژادی خۆی دەکرد، شانازی بەسەر ئەوی دیکەدا دەکرد، یەکێکیان گوتی: من فلانی کوڕی فلانم، دەستی کرد بە ژماردنی باوو باپیرانی خۆی تا (۹) پشتی ژمارد، تەماشای هاوڕێکەی کردو گوتی: ئەی تۆ کێیو لە کوێوە هاتووی؟

گوتی: من فلانی کوڕی فلانی کوڕی ئیسلامم.

---

[1]) تاریکستانی گوناهو ئاوەدانی ئیمان- ل ٤٧- ٤٨.

[2]) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب٢- ل٧٢.

خـوای گـەورە وەحـی نـارد بـۆ پێغەمبـەر موسـا سـەلامی خـوای لـێبێ، پێـی ڕاگەیانـد ئەومیانی کە نۆ پشتی ژمارد هەموو پشتەکانی لە ئاگردان خۆیشی کە دەیەمینیانـە، ئـەوەی کـە تـەنها دوو پشـتی خـۆی ژمـارد هـەردوو پشـتەکەی‌و خۆیشـی کـە سـێهەمینە لـە بەهەشتدان(١).

٦٣١. فریشتەی گیان کێشان بەچی بەزەیی پێماندا دێتەوە؟

ئەگێڕنـەوە پیـاوێکی چـاك لـە خـەودا چـاوی بـە فریشـتەی گیـان کێشـان کـەوت داوای لێکرد ئەو کاتەی کە گیانی دەکێشێ بەزەیی لەگەڵدا بنوێنێ، لای خوا بـۆی بپاڕێتـەوە کـە لـە ڕۆژی دواییدا لێی خۆش بێ، فریشـتەی گیـان کێشـان پێـی گـوت: زۆر داوای لێخۆشـبوون بکە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییـدا لێـت خـۆش دەبێ‌زۆر صـەڵەوات لێبـدە گـەر دەتـەوێ لەسـەرە مەرگدا بەزەیی بم لەگەڵتدا(٢).

٦٣٢. وەفای دایکی ئیمانداران ئوم حەبیبە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

ئوم حەبیبە کچی ئەبو سوفیانەو دایکی ئیماندارانـە خێزانی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، بەر لەوەی باوکی کە ئەبو سوفیانە ببێتە مسوڵمان ڕۆژێکیان دێ بۆ سەردانی ئـوم حەبیبـەی کچی، ئەبو سوفیان دێتە ژوورەوەو لەسەر ئـەو ڕایەخـە دادەنیشـێ کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەماڵەوە لەسەری دادەنیشێ، ئـوم حەبیبـە ڕاسـتەوخۆ ڕایەخەکـە لـەژێر بـاوکی دەردەهێنێ‌و ناهێڵێ باوکی لەسەری دانیشێ، ئـەبو سـوفیانیش دەڵـێ: چییە کچـم دەڵـێ مـن بـە شایسـتەی ئەوە نازانی لەسەر ئەو ڕایەخە دابنیشم؟

ئوم حەبیبە گوتی: بەڵێ بێگومان چونکە ئەوە ڕایـەخی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ تـۆش پیاوێکی موشریکی نامەوێ لەسەری دابنیشی(٣).

---

(١) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان. ب٢. ل٧٧.

(٢) مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ- ب٤- لا ١١٤.

(٣) ئەهلی بەهەشت- یوسف الحاج- ل ٣٨٠.

### ٦٣٣. بەهۆی ئازاردانی پشیلەیەك ئافرەتێك چووە دۆزەخ

لەنێو بەنی ئیسرائیلدا ئافرەتێكی دڵ ڕەق هەبوو بەزەیی بەكەسدا نەدەهاتەوە، ڕۆژێكیان ئەو ئافرەتە لە ماڵەوە دەچێتە دەرەوە بۆ جێبەجێ كرنی هەندێ پێویستی خۆی، چاوی بە پشیلەیەك كەوت هەڵیگرتەوەو بردیەوە بۆ ماڵەوە هەر بۆ ئارەزووی خۆی لە ژوورێكی كردو دەرگای لەسەر داخست، پشیلەكە شەوو ڕۆژ دەمیماواند لە برسان بەڵام ئافرەتەكە هیچ بەزەیی پێدا نەدەهاتەوە، نە خواردنو خواردنەوەی پێ دەدا، نە ئازادی دەكرد بۆخۆی بچێ شتێ بۆخۆی بخوات، پشیلەكە لە برساندا پاش ماوەیەك دەنگی نەماو مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ئافرەتەكە بەهۆی زوڵم كردنی لەو پشیلە بەستەزمانە چووە دۆزەخەوە، دەفەرموێ ئەو پشیلەیەم بینی لە ڕۆژی دواییدا بەردەوام پەلاماری ئەو ئافرەتەی دەداو تۆڵەی خۆی لێ دەكردەوە[1].

### ٦٣٤. پرسیاری نێو گۆڕ

دەگێڕنەوە یەكێ لە هاوەڵە ئەنصارییەكان، پاش وەفاتی پێشەوا عومەری كوڕی خەتتاب زۆر دوعای دەكرد لە خەودا پێشەوا ببینێ، ئەوەبوو دەساڵ پاش وەفاتی پێشەوا عومەر لەخەودا دەیبینێ، دەڵێ پێشەوا عومەرم بینی لەو خەوەدا ئارەقە بەنێوچەوانیەوە دەتكاو ئارەقەكە وشك دەكردەوە، دەڵێ: منیش پرسیارم لێكرد حاڵت چۆنە ئەی پێشەوای مسوڵمانان؟

ئەویش گوتی: ئێستا ڕزگارم بوو ئەگەر ڕەحمی خوا نەبووایە بەهیلاك دەچووم[2].

### ٦٣٥. مسوڵمان بوونی پیرەژنێكی فەڕەنسی

پیرەژنێكی فەڕەنسی كە تەمەنی لە پەنجا ساڵ زیاتر بوو، هەموو شەوێك دەچوو بۆ یەكێ لە یانەكانی شەوانە بۆ كات بەسەر بردن، لەوێ لەگەڵ گەنجێكی عەرەبی مسوڵمانی بێئاگا ببوو بە هاوڕێ، گەنجەكە هەركاتێ تەواو سەرخۆش دەبوو دەنكە بەو پیرەژنەی دەگوت: تۆ مسوڵمانی؟

---

[1]) چرۆكی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب١- ل ٥٧- ٥٨.

[2]) مەكتوباتی كاك ئەحمەدی شێخ- ب٤- ل١٢٤.

پیرەژنەکە دەیگوت: نەخێر.

ئەویش دەنکە شقارتەیەکی دادەگیرساندو بۆ پەنجەی پیرەژنەکەی دەبرد، پیرەژنەکە دەستی خۆی لادەبرد، ئەویش بەسەرخۆشیی‌و بەدەم پێکەنینەوە دەیگوت: بەرگەی ئاگری شقارتەیەك ناگری ئەی چۆن بەرگەی ئاگری دۆزەخ دەگری؟

هەموو شەوێك ئەو گەنجە عەرەبە بێئاگایە ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە، تا وای لێهات پیرەژنەکە بڕیاریدا بەدوای ئیسلامدا بگەڕێ، چوو بۆ یەکێ لە بنکە ئیسلامییەکانی ئەو وڵاتە، کۆمەڵێ نامیلکەو کتێبیان پێدا ئەویش هەڵسا بۆ ماوەی مانگێك دیراسەی دینی ئیسلامی کرد، پاش مانگێك تەواو قەناعەتی هات‌و بڕیاریدا مسوڵمان بێت، ئیدی هەر بەوەندە نەوەستا دەستی کرد بەبانگەوازی کردن بۆ دینی خوا، لە ڕۆژی جیهانی ئافرەتان لە وڵاتی فەڕەنسا وتارێکی پێشکەش کرد نزیکەی (١٠٠٠٠) کەس ئامادەی ووتارەکە بوون، دوای تەواو بوونی وتارەکەشی (١٢٠) ئافرەت بڕیاریاندا مسوڵمان بن[1].

### ٦٣٦. خوای گەورە بەندەکانی خۆی دەپارێزێ

یوسفی کوڕی حوسەین دەڵێ: لەگەڵ ذنونی مصری لە قەراغی ڕووبارێك وەستابووین، دووپشکێکی گەورەم بینی لەناکاو بۆقێك لە ئاوەکە دێتە دەرەوە چووە لای دوو پشکەکە چووە سەر پشتی بۆقەکە، بۆقەکەش دووپشکەکەی پەڕاندەوە بۆ ئەوبەری ئاوەکە، ذنون ئەمە شتێکی سەیرە ئەوانە کارێکیان هەیە بچین بزانین چی دەکەن؟ بەدوایان کەوتین وردە وردە تا گەیشتن بە پیاوێکی سەرخۆش لەبن دارێك خەوتبوو، مارێکیش لەسەر لاقی ئەو پیاوە بوو بۆلای سەری دەچوو بۆ ئەوەی پێی وەبدا، دووپشکەکە خۆی گەیاندە مارەکەو پێی وەداو کوشتی، پاشان گەڕایەوە سەر ئاوەکە بەهەمان شێوە بۆقەکە هات‌و لەسەر پشتی خۆی داناو بردیەوە ئەو بەر ئاوەکە، ئێمە تووشی سەرسوڕمان بووین‌و هیچمان بۆ نەگوترا چووین بۆ لای پیاوە خەوتووەکە، ژنون پیاوەکەی بەخەبەر هێناو پێی گوت: پیاو هەستە بزانە خوا لەچی ڕزگاری کردی، چیرۆکەکەمان بۆ گێڕایەوەو، پاشان ذنون پێی گوت:

---

[1]) هەزارو یەك- ب١- ل ١١٢- ١١٣.

هۆ بێ خەبەر پاشای گەورە پەناتە — لە هەر خراپەیەك لە تاریکی هاتە.

کابرا گوتی: خوایە گیان ئەوە ڕەحمو بەزەییتە لەگەڵ کەسێکی گوناهبار، دەبێ لەگەڵ کەسێ چۆن بێ کە گێڕایەڵیت دەکا ئیدی کابرا تەبەی کرد[1].

٦٣٧. **بەدوای عەیبو عاری خەڵکی مەگەڕێن**

لەیەکێ لە کۆلێژەکان بەر لە چوونە ژوورەوەی قوتابیان بۆ هۆڵی تاقیکردنەوە بڕیار درا جانتای قوتابیان بپشکنرێ، ئیتر یەك بەیەك هۆڵەکانی تاقیکردنەوە لەلایەن لێژنەی گەڕانەکە دەپشکنرا، هەموو کچەکان زۆر بە ئاسانی جانتاو مۆبایلو کەلو پەلەکانی خۆیان دەدا بە لێژنەکە، لێژنەکە هەموویان ئافرەت بوون، تا گەیشتنە ئەو هۆڵەی کە کارەساتەکەی تێدا ڕوودەدا، بەرامبەر بەیەکێ لە کچە دیندارەکان، کە ئۆرە دەگاتە ئەو کچە جانتاکەی توندتر دەگرتو دڵی خێراتر لێی دەدا،کو ئەوەی بڵێ هەرکاتێ گەیشتنە لای جانتاکە نەدات بە لێژنەکە، پێیان گوت: خاتوون جانتاکەتمان بدێ، ئەویش نەیدا، دەنگە دەنگو هاتو هاوار دروست بوو، هەموو کچەکان سەیریان دەکرد، کچەکەیان بردە ئیدارەی قوتابخانەو پاش موناقەشەیەکی زۆر جانتاکەی پێیان دا، کە بەڕێوەبەرەکە جانتاکەی کردەوە سەیری کرد واقی وڕما ئەوە چییە بۆ خاتری خوا!! پڕی ناوی پاشماوەی خواردنی قوتابییەکانی دیکەیە، کچە دیندارەکەش گوتی: ئەمە پاش ماوەی قوتابییەکانی ترە ئێمە خێزانێکی هەژارین ئەو خواردنە بۆ ماڵەوە دەبەمەوە، بۆ ئەوەی بیخۆن، ئیدی ئەوانەی لەوێ ئامادەبوون دایان لە پرمەی گریانو داوای لێبوردنیان لێکرد[2].

٦٣٨. **دیاری ڕەت مەکەوە**

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ ماڵو سامانی دا بە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (أعطه من هو أفقر مني)، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیدە بە کەسێکی هەژارتر لەمن، ئەویش فەرمووی: ئەی عومەر بیبە بۆ خۆت ئەگەر شتێکت بۆ هات لە ماڵو سامان لەلای کەسێکەوە بەبێ

[1]) التوابین- إبن قدامة- ص ٢٢٦.

[2]) تاریکستانی گوناهو ئاوەدانی ئیمان- ل ١٦٩- ١٧١.

ئەوەی تۆ داوات كردبێ یان چاوت لێی بێبڕیبگرە، ئەگەر حەزت كرد بۆخۆت بیخۆ، ئەگەر حەزیشت كرد بیكەی بە خێر بیكە بەخێرو صەدەقە[1].

٦٣٩. ببەخشە پێت دەبەخشرێ

دەڵێن پیاوچاكێكی میهرەبانی هەژار هەبوو هەرگیز دەستی بەڕووی هەژاراندا نەدەنا، لە ڕۆژێكی مانگی ڕەمەزاندا ئەو پیاوە هەژارە خۆیو ژنو منداڵەكانی بۆ بەربانگ لەسەر سفرە دانیشتبوون، لە پڕ پیاوێكی هەژار لە دەرگای داو گوتی: بەخوا یەك پاروە نان شك نابەم بۆ منداڵەكانم هەر خواردنێك هەیە پێمی بدەن بۆ منداڵەكانم تا بەربانگی پێ بكەینەوە، پیاو چاكە هەژارەكە هەموو ئەو خواردنەی هەیانبوو دایە هەژارەكە، ئەمەش بووە هۆی تووڕە بوونی خێزانەكەی، گوتی: بەخوا من لەو ماڵە دانانیشمو دەچمەوە ماڵی باوكم، پیاوەكە بێدەنگ بوو هیچی نەگوت، خێزانەكەشی خەریكی خۆ كۆكردنەوە بوو تا بچێتەوە ماڵی باوكی، لەو كاتەدا لە دەرگای ماڵەكەیان درا پیاوچاكە هەژارەكە دەرگای كردەوە سەیری كرد چەند قاپلەمەیەكیان پێیەو چەندەها خواردنو خواردنەوەو شیرینی لەسەرە، ئەویش پرسی ئەمە چییە؟ گوتیان فلان كەسەی دەوڵەمەند میوانێكی زۆری دەعوت كردبوو دوای دروست كردنی خواردنو خواردنەومیەكی زۆر میوانەكانی داوای لێبوردنیان كردو گوتیان ناتوانین ئامادە بین لەبەر چەند هۆكارێك، ئەو پیاوە دەوڵەمەندەش بڕیاری دا كەس نابێ ئەو خواردنە بخوات گوتی دەبێ بیبەن بۆ ئەو پیاو چاكە دەوڵەمەندە هەژارە بۆ ئەوەی بەربانگی پێ بكاتەوە، خێزانەكەشی زەردەخەنە گرتیو دانیشت، من دڵنیام لەو ئایەتەی كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥۚ وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَهُوَ يُخۡلِفُهُۥۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ٣٩ ﴾ سبأ، ئێوە هەر شتێك ببەخشن خوای گەورە جێگەی پڕ دەكاتەوە، خوای گەورە چاكترینی ڕۆزی دەرە[2].

---

[1] ئەم بەسەرهاتە پێشەوا عومەر لە موسنەدەكەیدا هێناویەتی.

[2] چیرۆكی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب١- ل ٢١٨- ٢١٩.

## ٦٤٠. ئاواتی شەهید بوون لە پێناوی خوا

شەدادی کوڕی ئیلهاد دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ باوەڕی پێهێناو مسوڵمان بوو، پاش ماوەیەك لە یەکێ لە جەنگەکان پێغەمبەری خوا هەندێ غەنیمەتی دەست کەوت چەندی دا بە هاوەڵان ئەوەندەشی بەخشی بەو پیاوە دەشتەکیە، کاتێ هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بینی بەشە غەنیمەتەکەیان بۆ داناوە گوتی: ئەوە چییە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە بەشی تۆیە لە دەستکەوتی جەنگی.

کابرای دەشتەکی گوتی: مـن بۆ ئەوە شوێنت نەکەوتووم، بە پەنجەی ئامـاژەی بۆ گەردنی خۆی کردو گوتی بۆ ئەوە شوێنت کەوتووم تیرێك بێرەم بکەوێو شەهید بەو بچمە بەهەشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات لەگەڵ خوا خوای گەورە پێی دەبەخشێ، پاشان هەڵسانەوە بۆ جەنگ کردن، پاش جەنگەکە کابرا دەشتەکیەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ شەهید بووبو تیرێك بە هەمان ئەو شوێنە کەوتبوو کە پێش جەنگەکە ئاماژەی بۆ کردبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاستی کرد لەگەڵ خوا خوای گەورەش پێی بەخشی، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە جوببەکەی سەرشانی خۆی کفنی کرد، پاشان نوێژی لەسەر کردو فەرمووی: خوایە! ئەمە بەندەی تۆیە لەبەر خاتری تۆ کۆچی کرد، بەشەهیدیش کوژرا، من شاهێدم لەسەر ئەوە[1].

## ٦٤١. داواکردنی زانست لە سەرە مەرگ

فەرقەد کە یەکێکە لە زانایانی بەصرە دەڵێ: هەواڵمان بۆ هات کە سوفیانی سەوری کەوتۆتە حاڵی گیانەڵڵا، چووین بۆ لای، پیاوێك لەوێ بوو فەرموودەیەکی گێڕایەوە، فەرموودەکە سەرنجی سوفیانی ڕاکێشا، دەستی درێژ کردە ژێر ڕایەخەکەیو کاغەزێکی دەرهێنا فەرموودەکەی نووسیەوە، پێیان گوت: بەو حاڵەوە بۆچی خۆت ئەزیەت دەدەی؟

---

[1] ئەم بەسەرهاتە نەسائی لە سونەنەکەی خۆیدا هێناویەتی.

ئەویش گوتی: ئەگەر مام ئەوە شتێکی باش فێر بووم، ئەگەر مردیشم ئەوە شتێکی باشم نووسیوەتەوە، لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر شتێکی چاکە[1].

## ٦٤٢. ئەوەی دەیبەخشی ماڵی خۆتە، ئەوەشی نایبەخشی ماڵی دوژمنە

دەگێڕنەوە یەکێ لە پیاوچاکان ئامۆژگاری پادشایەکی دەکرد پێی گوت: تۆ ماڵی خۆتت خۆش دەوێ یان هی دوژمنەکانت؟

پادشا گوتی: بێگومان ماڵی خۆمم خۆش دەوێ.

پیاوچاکەکە گوتی: پادشا ماڵی خۆت ئەوەیە کە لە پێناوی خوادا دەیبەخشی، ئەو ماڵە لە ڕۆژی قیامەتدا سوودی بۆت هەیە، بەڵام ئەو ماڵەی لای خۆت دەیهێڵیەوە بەشی زۆری دەستی دوژمنەکانت دەکەوێو دژایەتی تۆی پێ دەکەنو بە تاڵانی دەبەن، یاخود پاشی مردنت ئەکەوێتە دەستی میراتگرەکانت ئەوانیش بێ وەفایانە دەیخۆنو خێرێکت بۆ ناکەن[2].

## ٦٤٣. هەست نەکردن بە نیعمەتەکانی خوا

د. موحەممەد ڕاتب نابلسی دەڵێ: پیاوێکم دەناسی ملیۆنێر بوو لەگەڵ ئەوەش هەر گلەیی دەکردو دەیگوت: ژیان لێرە نەماوەو ئەوە کەی ژیانە هیچ کارو کاسبیەك نییە، چاوی بە هیچ تێر نەدەبوو هەستی بەهیچ یەکێك لەو نیعمەتە زۆرانە نەدەکرد کە خوای گەورە لەگەڵی کردبوو، تووشی نەخۆشیەکی قورس بوو، چوومە لای گوتم حاڵت چۆنە؟

گوتی: دکتۆر بەخوامرۆڤ نانی شەوی نەبێ بەس لەشی ساغ بێ، پیاو بەس ئەوەندەی هەبێ موحتاجی دەستی خەڵك نەبێ، منیش گوتم: (سبحان الله) تازە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە دەگات[3].

---

[1]) صور من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين- ج- ص٣٤٤.

[2]) مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ- ب٣- ل ١٠٣.

[3]) هەزارو یەك- ب١- ل ٢٣٧.

### ٦٤٤. هەر چۆنێك دەتوانی بانگەوازی بۆ دینی خوا بکەیت بیکە

پیاوێك زۆر حەزی بە کاری بانگخوازی دەکرد بەڵام تواناو لێهاتویی نەبو قسە بۆ خەڵك بکات، بەڵام هەڵسا بە کڕینی (١٠٠) کاسێتی جۆراو جۆری ئیسلامیی دەیدا بە نزیكو خزمەکانی تا گوێی لێ بگرن، پاشی نزیك لە (٣) مانگ سێ کەس لە خزمانی روویان لە مزگەوت کردو تەوبەیان کردو گەڕانەوە کە هۆکارەکەی ئەو پیاوە بەڕێزە بوو[١].

### ٦٤٥. دیمەنی ڕاوەستانی نوێژی جەماعەت بووە هۆی مسوڵمان بوونی ئەمریکییەك

د. یەحیا یەکێکە لە زانا سعودیەکان، لە بەرنامەی تەلەفزیۆنی (الأسرة الواحدة) لە کەناڵی (المجد) دەڵێ: یەکێ لە بانگخوازەکان لە کەناڵێکی ئاسمانییەوە دیمەنی حەرەمی مەککە لەکاتی نوێژ کردندا پێشانی پیاوێکی ئەمریکی دەدات، بە پیاوە ئەمریکیەکە دەڵێ: پێت وایە وەستانی ئەو هەموو کەسە لە کاتێکدا چەند کاتی پێویستە بەو ڕێکو پێکیە؟

پیاوە ئەمریکیەکە گوتی: (٣) کاتژمێر.

گوتیان: ئاخر حەرەمی مەککە (٤) قاتە.

ئەویش گوتی: کەواتە پێویستی بە (١٢) کاتژمێر هەیە.

لەو قسانەدا بوون پێشەوای حەرەمی مەککە تەنها گوتی: (إستوَ) هەر هەموو خەڵکەکە بە ڕێكو پێکیو بە ماوەیەکی زۆر کەم بەیەکەوە وەستان بۆ نوێژی بە کۆمەڵ.

کابرای ئەمریکی بە دیتنی ئەم دیمەنە زۆر کاریگەر بوو بە مسوڵمان[٢].

### ٦٤٦. پێدانی مافی دایك بەتەواوی بەکەس ناکرێ

ئەبو بوردە کە کوڕی هاوەڵی بەڕێز ئەبو موسای ئەشعەرییە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، لە نێو کەعبەدا پیاوێکی بینی دایکە پیرەکەی لە پشتی خۆی کردبوو تەواف پێ دەکرد، پیاوەکە کاتێ چاوی بە عەبدوڵلا کرد ئەو شیعرەی خوێندەوە:

---

[١]) هەزارو یەك- ب١- ل ١٢٨.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب١- ل ٤٥.

إنّي لها بعيرها المذلل    إن أذعرت ركابها لم أذعر
الله ربّي ذو الجلال الأكبر
حملتُها أكثر مما حمّلتْ    فهل ترى جازَيتُها يا إبن عمر؟!

ئەو كابرایە باسی خۆی بۆ عەبدوڵلا دەكات كە چۆن لە خزمەتی دایكی دایەو دەڵێ:

من بۆ دایكم وەك حوشترێكی زەلیلو لەسەرخۆم، هەركات بێتە سەر پشتم بە ئارەزووی ئەو دەجووڵێمەوە، ئەمەش كە دەیكەم بۆ ڕەزامەندی خوایەو دەشزانم خوای گەورە چەند باڵا دەستەو بە دەسەڵاتە، پاشان دەڵێ: ئەی عەبدوڵلا بەخوا ئەوەندەی دایكم منی لەكۆڵ گرتووە من زۆر لەو زیاترم لەكۆڵ خۆم كردووەو گێڕاومە، تۆ كە شارەزای لە دینی خوا ئایا پاداشتی دایكمم داوەتەوە؟

عەبدوڵلا گوتی: سوێند بەخوا هەموو ئەو خزمەتەی كە كردووتە بۆ دایكت ناكاتە یەك ژانی منداڵ بوون، بەڵام تۆ ڕۆڵەیەكی باشی بۆ دایكت، خوای گەورە پاداشتی كردەوەی كەمیش هەر بەزۆر دەداتەوە[1].

### ٦٤٧. مەترسی یارمەتی دانی ستەمكار

جارێكیان بەرگ درووێك بە زانایەكی گوت: ئەگەر جلو بەرگ بۆ ستەمكاران بدوورم بە یارمەتی دەری ستەمكاران لەقەڵەم دەدرێم؟

پیاوچاكەكە گوتی: تۆ هەر خۆت بە ستەمكار لە قەڵەم دەدرێیت بەڵام ئەوانەی دەرزیت پێ دەفرۆشن بە یارمەتی دەری ستەمكار لەقەڵەم دەدرێن[2].

### ٦٤٨. گەورەیی شایەتمان {أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله}

ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵەكانی دانیشتبوو باسی بەسەرهاتی پیاوێكی بۆ دەكردن هەر لە ئوممەتەكەی خۆی كە چۆن خوای گەورە لە نارەحەتیەكانی ڕۆژی دوایی ڕزگاری دەكات، فەرمووی: ئەو پیاوە لە ڕۆژی دواییدا دێتو لەبەر دەم خوای پەروەردگار دەوەستێنرێ، فریشتەكان (٩٩) سجلی پێشان دەدەن كە هەموو ئەو سجلانە

---

[1]) دینو ژین- ل ١٠٢- ١٠٣.

[2]) مەكتوباتی كاك ئەحمەدی شێخ- ب٣- لا ١٦٣.

بریتین لە گوناهەکانی، خوای گەورە پێی دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم ئەمەیە کردەوەکانت، پیاوەکەش ناتوانێ نکۆڵی لە گوناهەکانی بکاتو دەڵێ: بەڵێ پەروەردگارم ئەمە گوناهەکانمە، پاشان خوای پەروەردگار لێی دەپرسێ: ئایا فریشتەکانم هیچ شتێکیان لەسەر نووسیویت ئەنجامت نەدابێ؟

بەندەکەش دەڵێ: نەخێر ئەی پەروەردگارم، ئەمە هەموو ئەو گوناهانەیە کە ئەنجامم داون، خوای گەورە فەرمان دەکا بەبەندەکانی یەکێ لە سجلەکانی بەندەکەم ماوە دەریبهێنن بۆی دابنێنە سەر تەرازووی کردەوەکانی، نەوەدو نۆ سجلی گوناهەکانی لە تای تەرازوویەك دادەنێنو یەك سجل لە تای تەرازووەکەی دی دادەنێن، بەندەکە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئایا ئەو سجلە بەتەنیا بەرامبەر نەوەدو نۆ سجل دەبێ، کە دادەنرێ ئەو تاکە سجلە لە هەر نەوەدو نۆ سجلەکە قورس تر دەبێ، ئەو سجلەش وشەی شایەتمانی لەسەر نووسراوە، لە ئەنجامدا ئەو بەندە ڕزگاری دەبێتو دەچێتە بەهەشتی پانو بەرینی خوای گەورە[1].

### ٦٤٩. چاکە لەگەڵ باوك ئەگەر خراپیش بێ

گەنجێکی چاکی خواناس هەبوو هاوڕێیەتی کەسانی چاکی دەکرد، بەردەوا خەریکی زانستە شەرعیەکان بوو، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو باوکێکی هەبوو ڕقی لە پیاوی باش دەبوویەوە، هەر کاتێك هاوڕێ چاکەکانی کوڕەکەی خۆی لەماڵەوە بینیبایە دەری دەکردن، بەڵام ئەو گەنجە هەر دوعای خێر بۆ باوکی دەکات، لە یەکێ لە شەوەکان لە سێیەکی شەودا کوڕە گەنجەکە لە دواهەمین ڕکاعەتدا دەستەکانی بەرز کردنەوە بۆ ئاسمانو بە چاوی پڕ فرمێسکەوە دوعای بۆ باوکی دەکرد، لەوکاتە پڕ خێرو بەرەکەتەدا باوکی لە یەکێك لە یانەکانی شەوانە دەگەڕایەوە ماڵەوە خۆی کرد بە ژوورەوە گوێی لە دەنگی گریانێك بوو، بەرەو دەنگەکە چوو گوێی خۆی ڕاگرت بینی کوڕەکەیەتی دوعای خێری بۆ دەکات، باوکی کە گوێی لەو دوعایانەی کوڕەکەی بوو کەوتە سەر چۆكو لەبەردەم دەرگاکە دەستی کرد بە گریان لە دڵی خۆیەوە گوتی: من کوڕەکەی خۆمم نارەحەت کردووەو کەچی ئەویش دوعای خێرم بۆ دەکات، کاتێك کوڕەکە لە نوێژەکەی بوویەوە دەرگاکەی کردەوە تەماشای کرد

---

[1]) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب٢- ل ٧٤- ٧٥.

باوکی چۆکی داداوە، کوڕەکەی خۆی گرتو بەسینگی خۆیەوە نا، گوتی: لەمڕۆ بەدواوە چی دیکە ئازارت نادەم، نارەحەتت ناکەم، خوای پەروەردگار هیدایەتی باوکی داو لەوە بەدوا شەوان بەیەکەوە هەڵدەستان شەو نوێژیان دەکرد[1].

٦٥٠. **خوا رزق و رۆزی دروستکراوەکانی دەدا**

دەگێڕنەوە لە شاری سولەیمانی لە گوندی هەڵەدن پیاوێك هەبوو بەناوی حاجی ڕەزا رۆژێکیان لەسەر جۆخین (خەرمان) خەریکی شەن کردن دەبێ، لەکاتێکدا پشوو دەدات دەبینێ زەردەواڵەیەك بەردەوام دێتو دەچێت دەنکە گەنم دەبات، لەبەر ئەوەی زەردەواڵە گەنم ناخوات بۆیە حاجی ڕەزا تووشی سەرسوڕمان دەبێ، سەیری کرد زەردەواڵەکە بە چەند دارو دەوەنێکی ناوچەکە دەنیشێتەوە، بەدوای دەچێ بۆ ئەوەی بزانێ ئەو دەنکە گەنمانە بۆ کێندەر دەبا؟

دەبینێ چوار بەچکە چۆلەکەی تازە لە دایك بوو دەمیان دەکەنەوە زەردەواڵەکەش هەر جارەی دەنکە گەنمێك لە دەمی یەکێکیان دەکا، هەتا تێریان بکا، دیارە دایکیان بەهەر هۆکارێك بێ نەماوە ئەو زەردەواڵەیە دەوری دایکیان بۆ دەبینێو خوای پەروەردگار بۆ بێچووەکانی دەستەمۆ کردووەو ئەو لە جیاتی دایکیان تێریان دەکا، حاجی ڕەزا دەڵێ: من چەند رۆژ ئەو دیمەنەم بینی وە بانگی حاجی عەزیزی ناسیاوی خۆمانم کرد گوتم: وەرە تۆش سەیریان بکە ئەوەك من باسی بکەم باوەڕم پێ نەکەن[2].

٦٥١. **متمانەت هەبێ کە خوا رۆزی دەرە**

د. مەحەممەد ڕاتب نابلسی بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: دوو برا دەبن یەکێکیان دەمرێو پێنج منداڵ لەدوای خۆی بەجێ دەهێڵێ، منداڵەکان هەر پێنجیان بچووك دەبن، بەخێو کردنیان دەکەوێتە ئەستۆی مامیان، ئەوەی کە جێی نارەحەتی دەبێ ئەوەیە کە باوکیان شتێکی وای لەدوای خۆی جێناهێڵێ بۆ منداڵەکانی بەهۆی هەژاریو دەست کورتی، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر مامیشیان پیاوێکی زۆر هەژارو دەست کورت دەبێ بژێوی ژیانی

---

[1]) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب٢- ل ٩.

[2]) ئاسودەیی ئیسلام- ب٢- ل ٣١٨- ٣١٩.

رۆژانەی بریتییە لە کرێکاری کردن، بۆیە کە سەیری ئەو پێنج منالە بێ نازە دەکاو سەیری حالی خۆی دەکات دەست دەکات بەگریان، لەبەر خۆیەوە دەڵێ: باشە من ئەو پێنج منالە بەچی بەخێو بکەم؟!، رۆژێکیان مامۆستای مزگەوتەکەیان دەیبینێ بەردەوام غەمبارو دڵ تەنگە لێی دەپرسێ کاکە گیان بۆچی حالت وا پەشێوە؟

ئەویش بەسەرهاتی هەژاری خۆیو برازا بێ باوکەکانی دەکات، مامۆستاکە دەڵێ: باشە باوکیان هەر هیچی بۆ جێنەهێشتوون؟

مامی منالەکان دەڵێ: مامۆستا ئەوەی راستی بێ شتێکی کەمی جێهێشتوو کە رەنگە بای سالێك زیاتریان نەبێ.

مامۆستاکەش گوتی: زۆر باشە جارێ روو خۆشو دەم بە پێکەنین بە لەگەڵ مندالەکان با زیاتر هەست بە بێ باوکی نەکەن، دوای ئەو سالە دەتوانی غەمبارو دڵتەنگ بی، تۆ لە ماوەی ئەو سالە دڵیان خۆش کە، دڵنیابەو متمانەت هەبێ نە پێشترو نە ئێستاو نە لە داهاتوو خوای گەورە پەکیان ناخات، بۆ لە ئێستاوە بە غەمباریو ماتو مەلوولی ژیان دەبەیتە سەر، مامەکەیان ئامۆژگارییەکەی مامۆستای بە هەند وەرگرت هێشتا سێ مانگی مابوو بۆ ئەوەی سالەکە تەواو بێ خۆیشی وەفاتی کرد[1].

### ٦٥٢. هەڵوێستی مسوڵمانانو کەرامەتێك

کاتێ ئەسوەدی عەنسی لە ولاتی یەمەن سەری هەڵداو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، داوای لە خەڵکی کرد بێن ئیمانی پێ بێنن، بەلام خەڵکێکی زۆر کەم بروایان پێ هێنا، لەبەر ئەو هۆکارە خەڵکەکەی دەوری پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە ئەبو موسلیمی خەولانی پیاوێکی زۆر بەرێزو دیندارو زانایەکی زۆر گەورەیە لە نێو خەڵکی ئەگەر ئەو دان بنێ بە پێغەمبەرایەتی تۆ، ئەوە خەڵکێکی زۆر بەو دان پێدا هێنانەی ئەو دەبنە شوێنکەوتەی تۆو ئیمانت پێ دەهێنن، بۆیە بۆ ئەو مەبەستە ناردی بە شوێن ئەبو موسلیمو گوتی: شاهێدی دەدەی کە من پێغەمبەرو نێرراوی خوام؟

ئەبو موسلیم گوتی: نابیستم چی دەڵێی گوێم لێ نییە.

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٣٢٥- ٣٢٦.

ئەسوەدی عنسی چەند جارێك ئەو پرسیارەی بۆ دووبار کردەوە بەڵام ئەبو موسلیم هەر دەیگوت: گوێم لێ نییە.

ئەسوەدی عنسی زۆر بێ تاقەت بوو لەو قسانەی ئەبو موسلیم، بە دارو دەستەکەی خۆی گوت: تۆ بڵێی گوێی لێ نەبێو کەر بێ؟!!

بۆیە پرسیارەکەی خۆی گۆڕیو گوتی: ئایا شاهێدی دەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە؟

ئەبو موسلیم دەست بەجێ گوتی: بەڵێ.

ئەسوەدی عنسی گوتی: دیارە تۆ هیچ ڕێزێك بۆ منو پێغەمبەرایەتییەکەم دانانێی، دان بە پێغەمبەرایەتی من نانێی، لەبەر ئەوە دەبێ بتکەم بە پەند بۆ هەموو خەڵکی، فەرمانی دا بەوەی کە ئاگرێکی زۆر گەورە بکەنەوە، ئەبو موسلیمی خەولانیان هێنا دەستو قاچەکانیان بەستایەوەو فڕێیان دایە ناو ئاگرەکە، بەڵام پاکیو بێگەردی بۆ خوا ئاگرەکە تەنها ئەو حەبلەی سوتاند کە دەستو قاچەکانی پێ بەسترابۆوە، کە ئاگرەکە خامۆش بوویەوە ئەبو موسلیم هاتە دەرەوە، کاتێ ئەسوەدی عنسی ئەو دیمەنەی بینی چاوەکانی ئەبلەق بوون واقی وڕما هیچی بۆ نەگوترا، ناچار بە دەستو پێوەندەکانی گوت: چی لێ بکەین باشە؟

ئەوانیش گوتیان دووری بێخەوە لە یەمەن باشترە ئەگینا هەموو ئەوانەی بڕوایان پێ کردووی وازت لێ دەهێنن بەهۆی قسەکانی ئەبو موسلیم، ئەوەبوو ئەسوەد خۆیو ماڵو خێزانەکەی لە یەمەن وەدەر نانو تا سەر سنوریان بردنو لەوێ وازیان لێهێنان، ئەبو موسلیم ڕووی کردە شاری مەدینە ئەو کات پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردبوو، چاوی بە پێشەوا عومەر کەوت، پێشەوا عومەر نێوچەوانی ئەبو موسلیمی ماچ کردو بردی بۆ مەجلیسی پێشەوا ئەبو بەکری صددیق لە نێوان خۆیێ ئەبو بەکری دانا، عومەر گوتی: سوپاس بۆ خوا نەمردم تا ئەو کاتەی پیاوێکم بینی لە ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ ئاگر نەیسووتاند بە فەرمانی خوای پاکو بێگەرد[1].

---

[1]) ئاسودەیی ئیسلام- ب٢- ل ٣٢٩- ٣٣٢.

### ٦٥٣. مردن ئامۆژگارییە

پیاوێك هاتە لای فوزەیلی کوڕی عیازو گوتی: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش پێی گوت: دایكو باوکت مردوون؟ پیاوەکە گوتی: بەڵێ.

فوزەیل گوتی: ئەوەندە بەسە ئامۆژگاری لە مردنی ئەوان وەربگری ئەگەر پەند لەمە وەرنەگری لە هیچ شتێکی تری وەرناگری[1].

### ٦٥٤. ستەم لێکراو جوولەکەش بێ خوای دادگەر بەرگری لێدەکا

یەکێ لە هاوەڵان کە ناوی ڕیفاعەیە زرێیەکی دەبێو لێی دەدزرێ، لەلایەن مسوڵمانێکی دڵ نەخۆش کە ناوی طوعمەی کوڕی ئوبەیریق بوو، قەتادە کە مامی ڕیفاعەیە دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەڵێ: ئێمە زۆر گومانمان لە طوعمەیە زرێکەی دزی بێ، طوعمەش کە بەمە دەزانێ زرێکە فڕێ دەداتە ماڵی پیاوێکی جوولەکە کە ناوی زەید بوو (لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە بە ئەمانەت لەلای دادەنێ)، دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا قەتادەو برازاکەی منیان تۆمەتبار کردووە بەبێ بەڵگەو بەدزیان دەرهێناوم، کەچی من نەمدزیوە، کە ماڵی ئەو پیاوە جوولەکەیە گەڕان زرێکەیان لێ دۆزیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لۆمەی قەتادەی کرد لەسەر ئەوەی کە طوعمەی تۆمەتبار کردووە بێ بەڵگە، کابرای جوولەکە لەم نێوەندەدا بەدز دەرهات، بەڵام خوای دادگەر هەرگیز ستەملێکراو زەلیل ناکات بۆیە وەحی نارد بۆ پێغەمبەری خواو ئایەتی بۆ دابەزاند کە ئەو پیاوە جوولەکە دزییەکەی نەکردووە[2].

### ٦٥٥. کردەوە چاکەکان ئینسان بەڕێزو گەورە دەکەن

لەسەردەمی خەلافەتی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، ڕۆژێکیان بیلالو صوهەیبو سەلمان خوا لێیان ڕازی بێ ئیزن دەخوازن بچنە لای، لەهەمان کاتدا ئەبو سوفیانو سوهەیلو عیکریمە دەیانەوێ بچنە لای پێشەوا عومەر، بەڵام خەلیفەی مسوڵمانان لە سەرەتادا ئیزن دەدات کە بیلالو صوهەیبو سەلمان بێنە لای چونکە ئەوان

---

[1]) هەزارو یەك- ب١- ل١١.

[2]) هەزارو یەك- ب١- ل ٢٧٧- ٢٧٨.

زووتـر مسـولّمان بوونـەو خزمـەتی ئیسـلامیان زیـاتر کـردووە، لـەو کاتـەدا ئـەبو سـوفیان نارەحەت دەبیّ بەمەو دەلیّ: بەخوا هەرگیز خۆم وا بـەزەلیلی نـەبینیوە چۆن ئـەو کۆیلانـە پێشمان کەونو ئێمە دوای ئەوان بچینە ژوورەوە؟

سوهەیلیش بە ئەبو سوفیان دەلیّ: ئێمە تاوانی خۆمانـە چونکە ئـەوان لـە ئێمـە باشـتر بوونو زووتر بوون بە مسولّمان، بۆیە پـێش ئێمـە کـەوتن، لە قیامەتیشدا هـەر پـێش ئێمـە بانگ دەکرێن بۆ بەهەشت، مەگەر ئێمە بچین بـۆ جیهاد کـردن لـەرێی خـواداو شـەهید بـین، بەم شەهیدیە پلەمان بەرز بێتەوە.

ئەوەبوو لە جەنگی یەرمووك لە ولاّتی شام هەردوو هاوەلّی بـەرێز سـوهەیلو عیکریمـە شەهید بوونو بەرز بوونەوە، ئـەبو سـوفیانیش لـە یـەکیّ لە جەنگەکان چاوێکی کوێر بـوو خوای بەبەزەیی لە هەموویان رازی بیّ[1].

### ٦٥٦. لە پێناو خوا هەر شتێك واز لێبێنی خوای بەخشەر بە چاکتر پێت دەبەخشێتەوە

یەکیّ لە قوتابییانی زانکۆی ئەزهەر کە ناوی عەبدوللاّیە لە شـوێنێکی دوورەوە دیّ بـۆ ئەو زانکۆیە، ئـەو قوتابییە زۆر دەسـت کـورتو هـەژار دەبیّ، جارێکیـان بـۆ مـاوەی سیّ رۆژ هیچ نابیّ بیخوا وە هـیچ شـتێکیش شـك نابـا لـە گیرفـانی بـۆ ئـەوەی خـواردنێکی پـیّ بکـریّ، عەبـدوللاّ دوای سیّ رۆژ لـەو برسـیەتیە، رۆژێکیـان موحـازەرە جیّ دەهێلـیّو دێتـە دەرەوەی زانکـۆ بـۆ ئـەوەی پـاروەە نـانێکی دەسـت کـەویّ، بەبـەردەم مالێکـدا دەچیّ لـە نزیـك دەرگـای حەوشەکە کراوەتەوە لە نزیك دەرگاکـە هەنـدیّ خـواردنی مەحشـی دەبـینیّ دانـراوە ئـەویش لە برسان دەستی بۆ درێژ دەکات دانەیەك دەهێنیّ کاتیّ بۆ دەمی خۆی دەبا بـەبیری دادیّ کە من بۆ فێربوونی زانستی شەرعی هاتووم بـۆ ئـەو شارە چۆن دەبیّ شتێك بخۆم لـە مالێکـدا بەبیّ مۆلّەتی خاوەنەکـەی بۆیـە دایدەنێتـەوەو بـە برسـیەتی دەگەرێتـەوە بـۆ موحـازەرە، لـە کۆتـایی موحـازەرەکـە نافرەتێـك دێتـە لای شـێخەکەو هەنـدیّ قسـەی لەگـەلّ دەکـات، قوتابییەکان لە قسەکانیان ناگەن، پـاش ئـەوەی نافرەتەکە دەروا مامۆستـا راسـتەوخۆ دەلیّ: عەبدوللاّ دەتەویّ ژن بهێنی؟

---

[1]) هەزارو یەك- ب١- ل ٣٨٤.

عەبدوڵلا دەڵێ: مامۆستا گاڵتـەم پـێ دەكـەی؟ مـن بـۆ مـاوەی سـێ ڕۆژە شـتێكم دەست نەكەوتووە بیخۆم بەچی ژن بهێنم؟

مامۆستا گـوتی: ئـەو ئافرەتـە دەڵێ: مـن پیاوەكـەم ماوەیەكـە وەفـاتی كـردووە كچێكی گەنجیشم هەیە، پیاوەكەم سەروەت‌و سامانێكی زۆری دوای خۆی جێهێشتووە، بۆیـە دەمـەوێ كوڕێكی دیندارو دەست پاك بكەم بە هاوسەری كچەكەم‌و لەگەڵ ئێمـەدا بـژی، خاوەنـدارێتی ئـەو سـەروەت‌و سـامانە بكـات كـە بـۆ مـن‌و كچەكەم بـەجێماوە، منـیش تـۆ بـە شـیاوی ئەمـە دەزانم ئەی عەبدوڵلا، ئێستا چی دەڵێ؟

عەبدوڵلا ڕووی گەش دەبێ‌و زۆری لا پەسەند دەبێ.

بۆیـە مامۆسـتاو دایكـی كچـەكەو عەبـدوڵلا دەچـن بـۆ مـاڵی ئـەو ئافرەتـە بـۆ ئـەوەی خوازبێنییەكە جێبەجێ بكەن، كە دەگەنە مـاڵی ئافرەتەكـە، عەبـدوڵلا سـەیر دەكات هـەمان ئەو ماڵەیە كە كەمێك پێشتر ویستی خواردنـەی لـێ بخوات بـەڵام لـە ترسـی خـوادا نـەیكرد، بۆیە چاوەكانی پڕ دەبن لە فرمێسك‌و دەست دەكات بە گریـان، ئـەوانیش بـە سەرسـوڕمانەوە لێی دەپرسن كە بۆچی دەگریت؟

عەبدوڵلا دەڵێ: وەڵلاهـی كـەمێك بـەر لـە ئێسـتا بەبـەردەم ئـەو ماڵـە داهـاتم برسـیەتی زۆری بۆ هێنام دەستم بۆ ئەو خواردنە درێژ كرد كە ئێستا لەبـەردەممان دانـراوە بـەڵام ئـەو كاتەی بۆ دەمـی خـۆمم بـرد یەكسـەر خـوای گـەورەم بیركەوتـەوەو وازم لێـی هێنـا لـە ترسـی خوا، خوای گەورەش لە بەرامبەر وازهێنانم لەو حەرامە نەك هەر ئەو خواردنـە بـەڵكو مـنی كردوە خاوەنی ماڵەكە هەر هەمووی[1].

## ٦٥٧. بە پێی كردەوەكانی خۆت پاداشتت دەدرێتەوە

پیاوێكی كۆیلەی خواپەرست‌و قورئان خـوێن هـەبوو لـە كێڵگـەی پیـاوێكی دەوڵەمەنـدی بـێ دیـن كـاری دەكـرد، ئـەو پیـاوە خـاوەن كێڵگەیـە نوێـژی نـەدەكردو هـەر سـەرقاڵی كۆكردنەوەی پارەو سەروەت‌و سامان بـوو، ڕۆژێكیـان سـەفەرێكی دوورو درێـژی كەوتـە پـێش، بەبەندەكـەی گـوت: تـا لـە سـەفەرەكەم دەگەڕێمـەوە دەمـەوێ زەویەكـە هـەمووی بكێڵـی‌و

[1]) چیرۆكی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب١- ل ١٢٥- ١٢٦.

بیکەیت بە گەنم، سەفەرەکەی دەست پێ کرد نەگەڕایەوە تا کاتی دروێنە، کە گەڕایەوە تووشی شۆک بوو، کاتێ بینی لەجیاتی گەنم جۆ دەدورێتەوە، بۆیە لێی بەدەنگ هاتو گوتی: من فەرمانم پێ کردی بیکەی بە گەنم کەچی تۆ کردووتە بە جۆ!!

بەندەکەش گوتی: من جۆم چاند بە هیوای ئەوەی گەنم بێتە بەرهەمو گەنم بدوورمەوە بەڵام ئەمە ڕووینەدا!!

خاوەنەکەی گوتی: هەی گەمژە چۆن جۆ دەبێتە گەنم؟

بەندەکەش گوتی: گەورەم تۆش نوێژەکانت ناکەیتو قەدەغە کراوەکانی خوا ئەنجام دەدەیت بەتەمای خوای گەورە ڕەحمت پێ بکا؟

خاوەنەکەی گوتی: بەڕاستی وانەیەکت فێر کردم هەرگیز بیرم نەچێتەوە، لەمڕۆ بەدواوە نوێژەکانم ئەنجام دەدەمو هەرگیز سەرپێچی خوای خۆم ناکەم، لە ئێستاوەش تۆ کەسێکی ئازادی [1].

### ٦٥٨. هۆکاری زیاد بوونی ڕزقو ڕۆزی

ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ بەسەرهاتێکمان بۆ ڕیوایەت دەکاو دەڵێ: {كَانَ أَخَوَانِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ أَحَدُهُمَا يَأْتِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْآخَرُ يَحْتَرِفُ فَشَكَا الْمُحْتَرِفُ أَخَاهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَعَلَّكَ تُرْزَقُ بِهِ} واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دوو برا هەبوون لەشاری مەدینە، یەکێکیان زۆربەی کاتەکان لە خزمەتی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، خەریکی کۆکردنەوەی زانستی شەرعی بوو، ئەوەی تریان کوڕێکی صەنعەتکار بوو خەریکی کاسبی کردن بوو، ڕۆژێکیان ئەوەیان کە خەریکی کارو کاسبیو نان پەیدا کردن بوو شکاتی لە براکەی تری کردو هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو گوتی: ئەو برایەم لە کارو کاسبی هیچ یارمەتیەکم

---

[1]) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ موسڵمانان- ب١- ل ١٧٣- ١٧٤.

نادات ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەوانەیە تۆش بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە رزق‌و رۆزی زیاترت پێ بدات‌و بەرەکەت بهاوێتە کاسبیەکەتەوە[١].

٦٥٩. پیرۆزی مزگەوت‌و سزای ئەو کەسەی بێرێزی بەرامبەری دەکات

بەرێز ئەندازیار عوسمان بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لە ٢/٥/ ٢٠١٢دا لە گەشتێکی عومرە بووم، رۆژێکیان لە گەشتەکەمدا، لەلای (باب السلام) عومرەکارانی خۆمان کۆبووبونەوە منیش باسی خۆشەویستی پێغەمبەری خوام بۆ دەکردن دوای وتارەکەم یەکێ لە ئامادەبووان هاتە لام‌و گوتی: من خەڵکی فلانە گوندم لە نزیک سەید سادق لە کاتی شەڕی نێوان یەکێتی نیشتیمانی‌و بزووتنەی ئیسلامی، یەکێتی بازگەیەکیان لەلای گوندەکەی ئێمە دانابوو، رۆژێکیان لە مزگەوتەکەماندا کۆیان کردینەوە، لەو کاتەدا گەنجێکی دوور لەخوا بە پێڵاوەکانیەوە هاتە سەر فەرشی مزگەوت، یەکێ لە خەڵکی گوندەکە گوتی: فلان کەس هەر هیچ نەبێ پێڵاوەکانت داکەنە ئینجا وەرە نێو حەرەمی مزگەوت، ئەویش بەو پەڕی لەخۆبایی بوون‌و لووت بەرزییەوە گوتی: پێڵاوەکانی من پاکترە لە مزگەوتەکە، پاکی‌و بێگەردی بۆ خوای گەورە دوای سێ رۆژ لەمە ئەو پیاوە لووت بەرزە لوغمێکی چێنراو بە قاچەکانیدا تەقینەوەو قاچێکی پەڕی‌و قاچەکەی تریشی لەکار کەوت، ماوەی چەند مانگێکی زۆریش لە نەخۆشخانەی ئیمێرجێنسی سلێمانی مایەوە، ئەمە تۆڵەی خوایە بۆ کەسانێك کە لووت بەرزن بەرامبەر بەخواو بە مزگەوت[٢].

٦٦٠. شارەزایی‌و زانیاری پێشەوا بوخاری لە فەرموودەدا

پێشەوا بوخاری هەر لە منداڵییەوە تواناو لێهاتوویەکی زۆری تێدا بووە، تەمەنی دە ساڵان بووە کە لەکۆڕی زانایاندا دانیشتووە، تەنانەت لە تەمەنی (١١) ساڵیدا هەندێ جار هەندێ شتی بۆ مامۆستاکانی راست دەکردەوە، لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا هاتۆتە شاری بەصرە بۆ فێربوونی فەرموودە، ئەو کاتەی هاتە شاری بەغدا، هەندێ لە زاناکان هەستان تاقیان

---

[١]) ئەم بەسەرهاتە پێشەوا ترمزی لە سونەنەکەی خۆیدا بۆی ریوایەت کردووین بە ژمارە فەرموودەی ٢٣٤٦.

[٢]) هەزارو یەك- ب٢- ل ٢١٤.

کردەوە بەوەی (١٠٠) فەرموودەیان هێناو سەنەدی فەرموودەکانیان تێکەڵو پێکەڵ کرد بۆ ئەوەی بزانن زیرەکی بوخاری لە چ ئاستێکدایە، (١٠) کەس لەو زانایانە هاتن هەریەکەی (١٠) فەرموودەیان بۆ بوخاری گوت سەنەدەکانیان شێواند، ئەویش دەیگوت: شتی وام نەبیستووە، پاشان کە هەموویان تەواو بوون یەك یەك فەرموودەکانی دووبارە کردنەوەو سەنەدەکانی بۆ ڕاست کردنەوە، ئەم کارەی بوخاریش هەموویانی تووشی سەر سوڕمان کرد، پێشەوا بوخاری کتێبە فەرموودەکەی کە ناوی (جامع الصحيح)ە ڕاستترین کتێبە لە دوای قورئان، بوخاری بەوە ناسرابوو زۆر وردەکارییو تەحقیقی دەکرد لە وەرگرتنی فەرموودەدا، ئەو زانا گەورەیە زۆر کەسێکی بە تەقوا بوو، تەنانەت لە زانستی (جرح تعديل)دا کاتێ قسەی لەسەر ڕاویەکان دەکرد، زۆر حەزەری دەکردو نەیدەهێشت بکەوێتە نێو غەیبەت کردنیان، زۆر بەکەمی گوتوویەتی فلان کەس درۆزنە، بە قوتابییەکانی دەگوت: ئەگەر گوتم: فلان کەس (فيه حيثيه نظر) ئەوە فەرموودەکانی وەرمەگرن، ئەو زانا بەڕێزە لە تەمەنی (٦٢)ساڵیدا وەفاتی کردووە.

ئەحمەدی کوڕی حەفص دەڵێ: لەسەرەمەرگدا لای بوخاری بووم دەیگوت: سوپاس بۆ خوای گەورە لە سامانەکەمدا نەك هەر حەرام بەڵکو دەتوانم بڵێم هیچ شتێکی گوماناویشی تێکەڵ نەبووە، ئیبن خوزەیمە دەڵێ: کەسم نەدیوە بەقەد بوخاری زاناو زیرەك بێ[1].

## ٦٦١. ترسان لە پێشێل کردنی مافی خەڵکی

دەگێڕنەوە پیاوێکی چاك هەبوو، ئەو پیاوە هەژارو بێ دەرمتان بوو، ڕۆژێکیان زۆر برسی دەبێ بەڵام پارەی پێ نابێ، دەچێتە باخێکەوە سێوێك لە دارەکەی دەکاتەوەو نیوەی سێوەکە دەخوات، لە تەنیشت کێڵگەکە جۆگەلە ڕووبارێك دەبێ لەو ئاوەش دەخواتەوە، پاشان بەهۆش خۆی دێتەوە کە ئەو لە برسان ئەوەی لەیاد نەبووە کە ئەمە باخی خەڵکەو نابێ بێ پرسی خاوەنەکەی هیچ شتێك بخوات، بۆیە سوێند دەخوات کە نابێ واز بێنێ تا خاوەنی باخەکە نەبینێتو داوای گەردن ئازادی لێ نەکا، دەگەڕێ بەدوایدا تا ماڵی کابرا

---

[1]) هەزارو یەك- ب٢- ل ٢٣١.

دەدۆزێتەوە دەدا لە دەرگای ماڵەکە، خاوەنی باخەکەش دەرگاکەی لێدەکاتەوە پێی دەڵێ چیت دەوێ؟

ئەویش ئەوەی بەسەری هاتووە بۆی دەگێڕێتەوەو داوای گەردن ئازادی لێدەکات، بەڵام خاوەنی باخەکە دەڵێ: من بەهیچ شێوەیەك گەردنت ئازاد ناکەم، گەنجەکە زۆر تکای لێ دەکا، بەڵام بێ سوود دەبێ، کاتی نوێژی نیوەڕۆ دەبێ پیاوە خاوەن باخەکە دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژ کردن، دوای ئەنجامدانی نوێژەکە هەمدیسان گەنجەکە دەچێتەوە لای و داوای لێدەکات گەردنی ئازاد بکات، بەڵام خاوەن باخەکە لێی خۆش نابێت و دەگەڕێتەوە ماڵەوە، کاتێ بۆ نوێژی عەسر دێتە دەرەوە لە ماڵ دەبینێ گەنجە داماوەکە هەر لەبەر دەرگا ماوەو دووبارە داوای ئەوەی لێدەکات لێی خۆش بێ و گەردنی ئازاد بکات.

کابرای خاوەن باخ دەڵێ: باشە گەردنت ئازاد دەکەم بەڵام بە مەرجێك.

لاوەکە: باشە مەرجەکەت چییە؟

خاوەن باخەکە: من کچێکم هەیە دەبێ بیخوازی بەڵام کچەکەم کەم ئەندامە، چاوەکانی کوێرن وە کەڕو لاڵیشە، دەست و پێیەکانی ئیفلیجەو ناتوانێ بجووڵێ.

گەنجەکە دەڵێ: تەنیا لەبەر خواردنی یەك لەتە سێو تووشی ئەو ناڕەحەتییەم دەکەیت.

خاوەن باخەکە دەڵێ: ئارەزووی خۆتە ئەگەر ڕازی دەبی، گەردنت ئازاد دەکەم ئەگەر ڕازیش نابی، بڕۆ خوات لەگەڵ گەردنت ئازاد ناکەم.

گەنجەکە بیر دەکاتەوە لە خەیاڵی خۆی دەڵێ: بەخوا لە وانەیە ئەوە تاقیکردنەوەیەك بێ لە لایەن خوای گەورەوە، ژیانی کەمی دونیاش چەند ڕۆژێکە هەر چۆن بێ هەر دەگوزەرێ گرنگ ئەوەیە من قیامەتەکەم نەدۆڕێنم، بۆیە ڕازی دەبێ و بڕیار دەدا ئەو کچە کەم ئەندامە بخوازێ.

ئافرەتەکەی گواستەوە بۆیان هێنایە ماڵەوە، ئەویش بەدڵێکی پڕ لە ڕازی بوون بە قەدەری خوای گەورە بڕیاری دا بەرگەی ئەو بارو دۆخە ناڕەحەتە بگرێ، کە هاتەوە ماڵەوە

یەکسەر ئافرەتەکە لەبەری هەڵسایەوەو گوتی: (السلام علیك ورحمة الله وبركاته)، گەنجەکەش سەری بەرز کردەوە سەیری خێزانەکەی کرد شێوەی هەر لە حۆرییەکانی بەهەشت دەکا، تووشی شۆك بوو کە ئەو ئافرەتە جوانەی بینی، پاش کەمێك بێدەنگی گوتی: تۆ نە کوێری‌و نە کەڕو لاڵی وە نەئیفلیجیشی ئەی لەبەرچی باوکت وای بەمن گوت؟

ئافرەتەکەش گوتی: باوکم لە قسەکانیدا ڕاستی کردووە.

گەنجەکە گوتی: بۆم ڕوون بکەوە تێناگەم؟

ڕاست دەکا من لاڵم چونکە سوپاس بۆ خوا قسەی خراپ بە زمانمدا نەهاتووە، من کەڕم چونکە نەمهێشتووە قسەی خراپ بەسەر زمانمدا بێ‌بۆیە گوتوویەتی چاوەکانی کوێرن چونکە سوپاس بۆ خوا نەمهێشتووە تەماشای حەرامی پێ بکرێ، لەبەر ئەوەش گوتوویەتی ئیفلیجە چونکە نە دەستم نە هەنگاوەکانی قاچم بۆ حەرام نەچووە، ئەو ژن‌و مێردە خوای بەخشەر کوڕێکی پێ بەخشین تا قیامەت باسی دەکرێ‌و خێرو چاکە بۆ دەچێ ئەویش پێشەوا ئەبو حەنیفەیە ڕەحمەتی خوای لێبێ[1].

**٦٦٢. ڕاستگۆیی لە کڕین‌و فرۆشتندا**

پێشەوا ئەبو حەنیفە لەگەڵ ئەوەی خەریکی زانست‌و زانیاری بوو بەڵام بەرەنجی شانی خۆی دەژیاو نەیدەهێشت پێویستی بەخەڵك بێ، هەر بۆ ئەم مەبەستە کاری بازرگانی دەکردو ببو بە شەریك لەگەڵ پیاوێك کە ناوی بەشیر بوو، ئەو بەشیرە سەفەری وڵاتی میصری کرد، ئەبو حەنیفەش لە بەغدادەوە (٤٠) پارچە جل‌و بەرگی بۆ نارد بەمەبەستی ئەوەی لەوێ بیانفرۆشێ، نامەیەکی بۆ نووسی‌و لەگەڵیدا ناردی، لە نامەکەدا نووسیبوی: ئەوە چل پارچە جل‌و بەرگم بۆ ناردی تا لە میصر بیانفرۆشی، بەڵام ئاگاداربە یەکێکیان هەندێ شوێنی کەمی دڕاوە بەجوانی بە کڕیارەکەی پێشان بدە وە بەنرخێکی کەمتر لەوانی تر بیفرۆشە، ماوەیەکی پێچوو بەشیر گەڕایەوە بۆ بەغداو چوو بۆ لای ئەبو حەنیفە، پێی ڕاگەیاند کە بازرگانیەکەیان زۆر سەرکەوتوو بووە لە فرۆشتنی ئەو جل‌و بەرگانەی کە بۆی ناردووە لە بەغداوە، پێی گوت: کە (١٠٠٠) درهەم لە قازانجەکە بەر تۆ دەکەوێ.

---

[1]) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب١- ل ١٩٦.

ئەبو حەنیفە گوتی: باشە ئەوەیان کە هەندێ شوێنی درابوو، بە کڕیارەکەت گوتو پێت پیشاندا کە عەیبدارە؟

بەشیر گوتی: سوێند بەخوا تا کابرا پارەکەی نەدامێو لەبەرچاوم ون نەبوو ئەو قسەیەی تۆم لەبیر نەبوو، پاشان زۆرم ئەولاو ئەولا کرد بەشوێنیدا بەڵام نەمدۆزییەوە، بۆیە نرخی ئەو پارچە خراپەشیانم وەك ئەوانی تر وەرگرتووە، بەڵام سوێند بەخوا نییەتم فێڵ کردن نەبووە لەو پیاوە تەنها ئەوە نەبێ شەیتان بیری بردمەوە کە پێی بڵێم.

ئەبو حەنیفە گوتی: خوایە گیان شاهێد بە کە من بەرییم لەو کارە، هەرگیز پێی ڕازی نیم، ئەی خوایە گیان پێغەمبەرەکەت فەرموویەتی هەر کەسێ بە لەبیر چوونەوەو کارێك بکات خوای گەورە لەسەری نانووسێ، بەڵام شاهێد بە کە من ئەو (١٠٠٠) درهەمەو ئەو دەستمایەیەش کە قازانجەکەی پێ دەست خستوومە هەمووی دەکەم بە خێر بەسەر هەژاراندا چونکە هەر ماڵێك گومانی کەوتە ناو ئەوە من پێویستیم پێی نییە، نابێ لە کیسەو گیرفانی مندا جێی ببێتەوە[1].

### ٦٦٣. غەش کردنو ئەنجامەکەی لە دنیا

پێشەوا غەزالی بۆمان دەگێڕێتەوە کابرایەك هەبوو دوو مانگای هەبوو هەموو ڕۆژێك دەیدۆشین، ئەو دەفرەی کە شیرەکەی تێ دەکرد نیوەی پڕ دەکرد لە ئاو نیوەکەی تریش شیر، ئنجا دەچوو لە شار دەیفرۆشتەوە، ڕۆژێکیان وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی چوو بۆ شار، تا گەڕایەوە بارانو تۆفانێك ڕووی دابوو هەردوو مانگاکە ئاو بردبوونیو خنکابوون، کابرا دەستی کرد بە هاوار کردنو دەیگوت: خوایە بۆچی زیاد لە هەموو خەڵك مانگاکانی مرد ئاو بردنیو خنکان؟

یەکێ لە کوڕەکانی ئەو کابرایە زۆر ژیرو عاقڵ بوو بە باوکی گوت: بابە ئەوە هەموو ئەو ئاوە بوو کە ڕۆژانە تۆ لە شیرەکانت دەکرد ، خوای گەورە هەر مۆڵەتی دەدای تا

[1]) دینو ژین- ل ٥٠٥.

بگەڕێیەوە، بەڵام تۆ گوێت پێ نەدەدا، ئیتر خوای گەورە هەموو ئاوەکەی بۆ کۆ کردیەوەو ماڵەکەمان هەموو بەو ئاوە لە ناو چوو[1].

### ٦٦٤. کێشانو پێوانە

ڕۆژێکیان فوزەیلی کوڕی عیاز تەماشای کوڕەکەی کرد وا دینارێکی بەدەستەوەیەو خەریکی پاك کردنەوەیەتی، بۆ ئەوەی ئەو تۆزو پیسیەی پێیوەیە نەبێتە هۆی ئەوەی قورس تر بێ لە کێشی خۆی، بۆیە فوزەیل کە ئەمەی بینی زۆر پێی دڵ خۆش بوو، پێی گوت: {یا بني فعلك هذا أفضل من حجتين وعشرين عمرة}، واتە: کوڕی خۆشەویستم ئەو ئیشە جوانەتم بەلاوە گەورەترو خۆشەویستترە ە بەجێ هێنانی دوو حەجی سوننەتو بیست عومرە کردن[2].

### ٦٦٥. باوەڕ بەرزیی هاوەڵان

بەر لە قەدەغە کردنی شەراب، ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە لە مەجلیسێکی هاوەڵان شەرابیان دەگێڕا، لەو کاتو ساتەدا پیاوێك هات بۆ مەجلیسەکەو گوتی: خوای گەورە شەرابی قەدەغە کردووە، بێ دوو دڵی گوتیان دەی کەواتە با بیڕێژین، ئەنەس دەڵێ: سوێند بەخوا نە پرسیاریان کردو نە دوو دڵ بوون یەکسەر جێبەجێیان کرد[3].

هەر سەبارەت بە ئیمان بەرزی هاوەڵان دەگێڕنەوە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ثقیف گەڕایەوە بەر لەوەی بگاتەوە مەدینە عوروەی کوڕی مەسعود پێی گەیشتو مسوڵمان بوو، داوای لە پێغەمبەری خوا کرد ڕێگەی بدات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە نێو قەومەکەی‌و ئیسلامیان پێ بناسێنێ، ئەویش پێی فەرموو بەڵام دەتکوژن، عوروە گوتی: ئەوان منیان خۆش دەوێ.

---

[1]) إحياء علوم الدين- غزالي.

[2]) دینو ژین- ل ٥١٣.

[3]) هەزارو یەك- ب٢- ٢٨٩.

کە گەڕایەوە نێو گەلەکەی لەسەر بەرزاییەك وەستاو بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش لە هەموو لایەکەوە کەوتنە تیر باران کردنیو خەڵتانی خوێنیان کرد.

لێیان پرسی: خۆت چۆن دەبینی؟

ئەویش گوتی: ئەو شەهیدییە ڕێزێکە خوا لێیناوم، پاشان بەو شێوەیە شەهیدیان کرد خوا لێی ڕازی بێ[1].

### ٦٦٦. سزا دەبێ بە پێی تاوان بێ

دایکی ئیمانداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: یەکێ هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەردەمی دانیشتو گوتی: من دوو کۆیلەم هەن درۆم لەگەڵدا دەکەنو لە قسەم دەردەچن، منیش لێیان دەدەمو جوێنیان پێ دەدەم ئایا تاوانبارم بەرامبەریان؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەو کاتەی ڕۆژی دوایی دێ لەسەر ئەوەی ناپاك بوون بەرامبەرت لە قسەت لایانداو درۆیان لەگەڵ کردووی لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێ سزای تۆش بۆیان بەپێی تاوانیان، ئەگەر سزای تۆش بۆیان لە تاوانەکانیان زیاتر بێ ئەوە لە چاکەکانی تۆ دەستێنن بۆ ئەوان، بەوە تۆڵەیان بۆ دەکرێتەوە) کابرا دەستی کرد بە گریان، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئایەتی خوای گەورەت نەبیستووە کە دەفەرمووێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الأنبياء، کابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ شاهێد بە من هەردووکیان ئازاد دەکەم[2].

### ٦٦٧. بێ ڕێزی کردن بەرامبەر هاوەڵان لای پێشەوا عومەر خوا لێی ڕازی بێ

لە نێوان عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو میقدادا خوا لێیان ڕازی بێ کێشەیەك ڕوویدا، عەبدوڵڵا قسەی بە میقداد گوت، ئەویش لای پێشەوا عومەر سکاڵا لێکرد، پێشەوا عومەریش نەزری کرد زمانی ببڕێ، عەبوڵڵای کوڕی کە ئەمەی بیست زۆر ترسا، کۆمەڵێك

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب۲- ل ۲۹.

[2]) حياة الصحابة- ب۲- ل ۳۰٦.

پیاوی بردە لای باوکی، پێشەوا عومەریش گوتی: لێیگەڕێن با زمانی ببڕم تا ببێتە پەند بۆ ئەوانەی قسە بە هاوەڵان دەڵێن[1].

## ٦٦٨. داپۆشینی عەیبو عاری موسڵمانان

کەسێك هات بۆ لای پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: لەسەردەمی نەفامیدا کچێکم هەبوو زیندە بەچاڵم کرد، بەڵام بەر لەوەی بمرێت دەرمان هێنا، دوای ماوەیەك لە مسوڵمان بوون، حەددێکی خوای کەوتە سەر، بەڵام ئەو چەقۆیێکی هێنا بۆ ئەوەی خۆی سەر ببڕێ، تا پێی گەیشتین بەشێکی لە ملی خۆی بڕیبوو، بەڵام نەمانهێشت خۆی بکوژێ تیمارمان کرد ، ئێستاش خەڵکی دێن بۆ ئەوەی بیخوازن، بەڵام من ئەو شتانەی کە لێی ڕوویداوە باسی دەکەم.

پێشەوا عومەر گوتی: بە ئەنقەست دەتەوێ ئەوەی خوا دایپۆشتووە ئاشکرای بکەی؟ نەخێر مادەم تەوبەر کردووە قسەی ئاوا لای خەڵك مەکە، لەمڕۆوە ئەگەر داخوازی هات من وەك ئافرەتێکی پاك مارەی دەکەم[2].

## ٦٦٩. ڕاستگۆیی لە کڕینو فرۆشتندا

دەگێڕنەوە جارێکیان واسیلەی کوڕی ئەسقەع حوشترێکی نێری هەبوو دەیویست بیفرۆشێت، بۆ ئەو مەبەستە بە هاوڕێیەکی خۆی گوت: تۆ لە بازاڕ شارەزاییت دەمەوێ ئەو حوشترەم بۆ بفرۆشی.

کابرا گوتی: باشە، بەیەکەوە حوشترەکەیان برد بۆ مەیدان، واسیلە وەختێك سەرقاڵ دەبێ، برادەرەکەی حوشترەکە دەفرۆشێ بە (٣٠٠) درهەم، کابرای کڕیار وشترەکەی پێش خۆیداو دوور کەوتەوە، واسیلە دێتەوە لای برادەرەکەی دەبینێ وشترەکەی فرۆشتووە، واسیلە یەکسەر شوێن کابرای کڕیار کەوت، هاواری لێکرد کاکە گیان تۆ ئەو وشترەت کڕیوە تا سەری بڕیو سوود لە گۆشتەکەی ببینی، یان بۆکارو باری خۆتو سواریو بار لێبارکردن؟

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب٢- ل ٣٠٧.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب٢- ل ٣١٦.

کابرا گوتی: بۆ سواریو بار لێبار کردن کڕیومە.

واسیلە گوتی: دەی کاکە گیان با پێت بڵێم ئەو حوشترە هی منە، لە ڕێگادا زۆر سستەو باری قورسی بۆ هەڵناگیرێ، بە ڕواڵەتەکەی هەڵمەخەڵەتێ کە توندو تۆڵو قەڵەوە، قاچەکانی زۆر بێهێزە.

کابراش پەشیمان بوویەوە، گوتی: دەی ئەگەر وابێ لە (٢٠٠) درهەم زیاتری پێ نادەم، ئەویش (١٠٠) درهەمی پێ دایەوە لەگەڵ حوشترەکە، کابرا برادەری گوتی: ڕەحمەتی خوات لێبێ خۆ کابرا وشترەکەی لەبەر چاو بوو بۆچی وازت لێ نەهێنا؟

واسیلە گوتی: براکەم دەزانم تۆ لەبەر خاتری منتە بەڵام ئێمە دینەکەمان فێری کردووین بۆ هەموو خەڵکێك دڵسۆز بین[1].

### ٦٧٠. بەرەکەتی یارمەتی دانی منداڵی بێباوك

د. موحەممەد ڕاتب نابلسی دەڵێ: برادەرێکم بۆی گێڕامەوە گوتی: جارێکیان سەرم لە زەوی برادەرێکم دا کە گەنمی چاندبوو، بینیم گەنمەکەی زۆر جوان سەوز بووە، زەوییەکەی تەنیشتی وەك هی ئەو نەبوو زۆر جیاواز بوو، منیش لێم پرسی بۆچی زەویەکەی تۆ لەگەڵ هی تەنیشتی خۆت ئەوەندە جیاوازە؟

ئەویش گوتی: هەر لەگەڵ چاندنی گەنمەکە نیەتم هێنا کە نیوە داهاتەکەی لە کاتی دروێنە بدەم بە منداڵەکانی براکەم کە یەتیمنو باوکیان نەماوە، هەر لەبەر ئەوەشە خوای گەورە بەرەکەتی خستۆتە نێوی[2].

هەر سەبارەت بە یارمەتی دانی بێ باوکان، دەگێڕنەوە پیاوێك لە وڵاتی سعودیە سێ شەو لەسەر یەك خەو بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینێ، هەر سێ شەو پێی دەفەرمووێ: بڕۆ بۆ لای فلانی کوڕی فلان لە فلانە شوێن پێی بڵێ: کە هاوەڵی منە لە بەهەشت، ئەویش پاش ئەو سێ شەوە دەست دەکا بە پرسیار کردن تاوەکو ماڵی ئەو کەسە دەدۆزێتەوە،

---

[1]) دینو ژین- لا ٥١٤.

[2]) هەزارو یەك- ب٢- ل ٣٠٧- ٣٠٨.

پیاوەکە دەبینێ زۆر لێی وورد دەبێتەوە کەسێکی ئاساییەو هیچ جیاوازیەکی لێ بەدی ناکات، لەدڵی خۆیدا دەڵێ: تۆ بڵێی ئەو کەسە خۆی بێ.

بۆیە دووبارە لێی دەپرسێ: بەڕاست تۆ فلانی کوڕی فلانی؟

دەڵێ: بەڵێ من هەوم.

کابرای کە خەوەکەی بینیوە دەڵێ: تۆ چیت کردووە سێ شەو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتۆتە خەوم کە پێت ڕابگەیەنم کە تۆ هاوەڵی ئەوی لە بەهەشتدا.

کابرا لە خۆشی ئەو موژدە خۆشەیە دەستی کرد بە گریانو گوتی: ماڵێکی دراوسێمان پیاوەکە مردووە چەند منداڵێکی لەپاش بەجێ ماوە، خوا نەبێ کەسی تریان نییە یارمەتیان بدا، بۆیە من بڕیارم دا مانگانە چیم دەست بکەوێ نیوەی بدەم بەوان.

دیارە ئەو خێرە گەورە گەیاندوویەتی بەو پلە بەرزە، چونکە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی: {منو کافیلی یەتیم بەم شێوەیەن لە بەهەشتدا، ئاماژەی بە هەردوو پەنجەی ناوەڕاستو شایەتمانی کرد}، کەواتە: بۆیە ئەو پیاوەش ئاوا نزیەکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەهەشتدا[1].

### ٦٧١. ئەنجامی واز هێنان لە فەرمانی خوای پەروەردگار

جوبەیری کوڕی نەفیر دەڵێ: کاتێ قوبرس فەتح کردا خەڵکی ناوچەکە هەموو بۆ یەکدی دەگریان، مسوڵمانان گورزێکی چاکیان لە شەڕ کەرەکانیان وەشاند، لەو کاتەدا ئەبو دەرداثم بینی بەتەنیا دانیشتبوو دەگریا.

منیش چوومە لای و پێم گوت: لەو ڕۆژە خۆشەدا کە خوای گەورە مسوڵمانانی سەرخستووە کەچی تۆ دەگری.

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب٢- ل ٣٢٠.

ئەبو دەرداء گوتی: هاوار بۆتۆ ئەی جوبەیر نابینی بەندە لای خوا چەند سووکن ئەگەر فەرمانی خوا بشکێنن، ئەو گەلە چەند بەهێزو زاڵ بوون، کەچی بەهۆی شکاندنی فەرمانی خواوە چۆن تێك شکان‌و تەفرو تونا بوون[1].

## ٦٧٢. ئەمیمی یەکێکە لە مەترسیدارترین گوناهەکان

پیاوێك هەبوو بەدوای غولامێکدا دەگەڕا بیکڕێت بۆ ئەوەی خزمەتی بکات، کاتێ بە بازاردا دەگەڕا بینی غولامێك وا دەفرۆشرێ، گوتیان ئەو غولامە هیچ عەیبێکی نیە ئەوە نەبێ کە ئەمیمی دەکات، کابراش گوێی بەو گوناهە نەداو غولامەکەی کڕی، چەند ڕۆژێ ئەو غولامە لای کابرا مایەوە.

پاشان غولامەکە بە خێزانی خاوەنەکەی خۆی گوت: خاوەنەکەم دەیەوێ ژنت بەسەر بێنێ، بەڕاستی ئەو تۆی خۆش ناوێ، ئەگەر دەتەوێ سۆزت بۆت هەبێت‌و واز لەوە بێنێ کە ژنت بەسەر بێنێ ئەو کارە بکە کە من پێت دەڵێم.

ژنەکەش دەڵێ باشە.

غولامەکە دەڵێ: شەو کە پیاوەکەت خەوی لێکەوت مقەسێك ببە هەندێ تاڵە مووی ژێر ریشی لێ بکەوەو لای خۆتیان دابنێ.

پاشان غولامەکە هات بۆ لای مێردەکەی‌و پێی گوت: گەورەم خێزانەکەت خۆشەویستێکی هەیەو حەز دەکات ڕزگاری بێ لە تۆ، سوورە لەسەر ئەوەی ئەمشەو سەرت ببڕێ.

ئەگەر بڕوام پێ ناکەی ئەمشەو خۆت بنوێنەو وا خۆت وا پیشان بدە کە خەوتوویت، خاوەنەکەی بڕوای پێ کردو کە شەو داهات خۆی وا پێشاندا کە خەوتووە، ئافرەتەکە مەقەسێکی هێنا تا چەند تاڵە موویەکی ژێر ڕیشی لێ بکاتەوە، پیاوەکەش زانی وا

---

[1]) ئەبو نەعیم لە (الحلیة)دا هێناویەتی ج١- ص٢١٦.

خێزانەکەی شتێکی لەدەستەو بۆ لای دێ، لەدڵی خۆیدا گوتی: بەخوا غولامەکەم ڕاستی گوت.

کاتێ موقەسەکەی لە گەردنی نزیك کردەوە مێردەکەی مەقەسەکەی لێ سەندو هەر بەو مەقەسە کوشتی، خزمو کەسی ئافرەتەکەش کابرایان کوشتەوە، بە هۆی ئەو نەمیمیەوە شەڕو دوژمنداری کەوتە نێوان دوو هۆز[1].

٦٧٣. گوتنی هەق لای سەرکردەکان

ئیبن ڕاهەوەی لە حەسەنەوە هێناویەتی کە ڕۆژێکیان ئوبەی کوڕی کەعب قورئانی دەخوێند پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوێندنەوەی یەکێ لە ئایەتەکانی لەلایەن ئوبەی ڕەت کردەوە، ئوبەی گوتی: ئەی عومەر من بەو شێوەیەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە، لەو کاتەی کە تۆ خەریکی چەپڵە لێدان بووی لە بەقیع.

پێشەوا عومەر گوتی: ڕاست دەکەی ویستم تاقیتان بکەمەوە، بزانم هەتا چەند هەق بێژن، هەق لای سەرکردەیەك نییە کەسی هەق بێژی نەبێ[2].

٦٧٤. بەرەنگار بوونەوەی خراپەو خراپەکاران

پیاوێك دێتە لای زانایەك گلەیی لە خراپەی خراپەکاران لێدەکاتو باسی بڵاوبوونەوەی بەد ڕەوشتی دەکا، ئەویش دەڵێ: کوڕی خۆم خراپەکاران ئالایان هەڵکردووەو خەڵکی لە دەوریان کۆبوونەتەوە، تۆش ئالایەك بۆ خێر هەڵکەو با خەڵکی لە دەورت کۆببنەوە[3].

٦٧٥. ئیسلام هات خووە خراپەکانی لەناو برد

دەڵێن عەمری کوڕی عاص فەتحی وڵاتی میسری کرد خەڵکەکەی هاتنە لایو پێیان گوت: ئەی والی میسر ئێمە بۆ بژێوی ژیانو کشتوکاڵ کردنمان پشت بە ڕوباری نیل

---

[1]) چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان- ب١- ل ١٨٠.

[2]) حياة الصحابة- ب١- ل ٧١٩.

[3]) هەزارو یەك- ب٢- ل ٤١٩.

دەبەستین، ئەم ڕوبارەش عادەتێکی هەیە، ساڵانە لەو کاتەدا ئاوەکە دەوەستێ، دەبێ کچێکی گەنجی بۆ برازێنینەوە بە خشڵو زێڕ بیخەینە نێو ئاوەکە ئنجا دەست دەکاتەوە بە ڕۆیشتن، عەمری کوڕی عاص گوتی: هەرگیز ئیسلام ئەمەی قبوولْ نییە، ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە خوە خراپەکان تێك بشکێنێ، عەمری کوڕی عاص نامەی نارد بۆ پێشەوا عومەرو هەواڵی ئەو ڕووداوەی پێدا، پێشەوا عومەریش نامەیەکی بۆ نووسیو هەواڵی پێدا کە نامەکەی فڕێ بداتە نێو ڕووباری نیل، لە نامەکەدا نوسیبووی (لە بەندەی خوا عومەری کوڕی خەتتاب بۆ ڕووباری نیل، ئەگەر تۆ بە فەرمانی خۆت دێیتو دەچیت، ئەوە پێویستمان پێت نییەو مەڕۆ، ئەگەریش بە فەرمانی خوا دێیتو دەچیت، داوا لە خوای تاکو تەنها دەکەین بتبات بەڕێوە، عەمری کوڕی عاص بەبەرچاوی خەڵکی میسرەوە نامەکەی فڕێدایە نێو نیل، خوای پەروەردگار شانزە میل ئاوەکەی بەڕێ کردو لەو ڕۆژەوە بەدواوە ئەو خووە خراپە لەسەر دەستی مسوڵمانان لەنێو برا، مسوڵمانانی ڕاستەقینە هەردەم ڕەحمەتن بۆ هەموو جیهان[١].

### ٦٧٦. ڕەوشت بەرزی

خوای پەروەردگار وەحی نارد بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ، پێی فەرموو: تۆ خەلیلی منی، دەتگەیەنم بە پلەی چاکەکاران فەرمانی من بۆ ئەو کەسانەی ڕەوشت بەرزو چاکەکاران دەرچووەو کۆتایی پێهاتووە، کە لە ڕۆژی دواییدا لەژێر سێبەری عەرشی خۆم دایان دەنێم لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نییە، نیشتەجێیان دەکەم لە بەهەشت[٢].

### ٦٧٧. لەخواترسان مرۆڤ بە توانا دەکات

جارێکیان دایکی ئیمانداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پیاوێکی بینی لەنێو حەرەمی مەککە لەکۆڵیان گرتبوو تەوافیان پێ دەکرد، گوتی: ئەو پیاوە کێیە دەیگێڕن؟

---

[١]) حياة الصحابة- ب٣- ل ٥٠٦- ٥٠٧.

[٢]) حكاياة وقصص من حياة السابقين- ص ١٨٢.

گوتیان: ئەوە پیاوێکە لەترسی خوا لە پەل‌و پۆ کەوتووەو توانای نەماوە، عائیشە گوتی: بێگومان ئیماندار بەهۆی لەخوا ترسان گزو نابووت نابێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەهێزو بەتوانا دەبێ، سەیری عومەری کوڕی خەتتاب بکەن، لەهەمووان زیاتر لە خوا دەترسێ لە هەمووانیش بەهێزترە، کاتێ بە ڕێگادا دەڕوا بە خێرا دەڕوا، کە قسە دەکات هەموومان گوێمان لە دەنگی دەبێ[1].

### ٦٧٨. هەموو کەسێ تووشی دڵ تەنگی دەبێ

ئەسکەندەری مەکدۆنی بەدایکی گوت: دایکە هەر کاتێ مردم لەدوای شاردنەوەم خواردنێکی چاك ئامادە بکە هەموو ئەو کەسانەی لە ژیاندا تووشی دڵ تەنگی نەهاتوون بانگیان بکە با ئامادەبن، دایکیشی دوای مردنی ڕاسپاردەکەی بۆ جێبەجێ کرد بانگی کرد هەموو ئەو کەسانەی لە ژیاندا تووشی خەم‌و خەفەت نەهاتوون بێن بۆ دەعوەتەکە، چاوەڕوانی کرد بەڵام کەس نەهات، دایکی گوتی: ئێستا تێگەیشتم کوڕەکەم بۆ ئەوەی بوو دڵنەواییم بکا، بەو کارەی کەس هەندەی ئەو دڵنەوایی نەکردووم[2].

### ٦٧٩. صەڵەوات لێدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ مایەی شیفاو دڵخۆشییە

ئەبو عەبدوڵڵای بوصەیری دەڵێ: قەدەری خوای گەورە وابوو تووشی ئیفیجی بووم، نیوەی گیانم لە جووڵە کەوت، پزیشکەکان سەرگەردان بوون لە چارسەر کردنم، شەوێکیان دڵم زۆر توند بوو، سەد سەڵەواتم لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لێدا، پاشان خەوتم شەو بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتم لە خەودا، دەستی موبارەکی بەسەر گیانمدا هێنا، منیش لە خۆشیانا لەخەوەکەدا خەبەرم بوویەوە، کە سەیری خۆم کرد بینیم چاك بوومەتەوە،ك پێشترم لێهاتووە[3].

### ٦٨٠. دادوەری هەق بێژ

---

[1]) دۆستی باوەڕداران- ل ١٩٤.

[2]) دۆستی باوەڕداران- ل ١٩٣.

[3]) دۆستی باوەڕداران- ل ١٤٦- ١٤٧.

یەکێ لە فەرمانـدە سـەربازییە گـەورەکانی سوپای ئیسلامی سـەردەمی هارونـە ڕەشـید، بۆ دەربڕینی شایەتیەك کە لەلای بوو پێویست بوو لـە دادگا ئـەو شایەتیە بـدا، دەچـێتە لای دادوەر بەناوبانگی ئەو سەردەمە ئەبو یوسف، بەڵام ئەبو یوسف دەڵێ: تـۆ بەشـاهێد ناشێیو لێت وەرناگیرێ، ئەویش زۆر تووڕە دەبێ، ڕاستەوخۆ دەچـێتە لای هارونـە ڕەشـیدو شکات لـە ئەبو یوسفی دادوەر دەکا، هارونە ڕەشیدیش دەچـێتە لای ئـەبو یوسفـو هۆکاری ئەمـەی لـێ دەپرسێ، دادوەر دەڵێ: لەبەر ئەوەی ڕۆژێك لـەلای تـۆ دانیشـتبووم بـەر لـەوەی ببمـە دادوەر، ئەو پیاوە هاتە لاتو گوتی: {أنا عبد أمير المؤمنين}، واتـە: مـن بەنـدەو کۆیلـەی ئـەمیری ئیمانداران‌م، کەسێکیش کۆیلە بێ شاهێدی لێ وەرناگیرێ، چونکە خـۆی خـاوەنی خـۆی نییـەو بیرو ڕای ئازاد نییە.

هارونە ڕەشید گوتی: باشە ئەوە زانیم شاهێدی ئـەوت بۆچـی وەرنـەگرت، بـەڵام مـن لـە نزیکـەوە ئاگـاداری ئـەو کێشـەیەمو خـۆم شـاهێدی دەدەم، دادوەر ئـەبو یوسـف گـوتی: تـۆش بەشاهید وەرناگیرێی.

هارونە ڕەشید تووشی سەرسوڕمان بوو گوتی: شاهێدی من لەبەرچی وەرناگری؟!

ئەبو یوسف گوتی: (لأنك تتكبر على الله فلا تخرج إلى الجماعة، ولا تصلي مع عامّة المسلمين، وهو تكبّر على الله، ولا يليق بالعبد هذا)، واتـە: تـۆ لەبـەر ئـەوەی تەکەببوڕ لەسەر خوادا لێدەدەی بەوەی کە نایەی بۆ نوێژی جەماعـەت، لەگـەڵ مسـوڵماناندا نوێژ ناکەی، ئەمەش کارێکی ناڕەوایەو کەسێ کە بەنـدەی تەواوی خوا بێ، نـابێ بـەم شـێوەیە بێ، پێشەوا دەبێ لەنێو خەڵك بێو لەگەڵ خەڵکیدا نوێژ بکات، هارونە ڕەشـید گـوتی: ڕاسـت دەکەی من گوناهبارم بەو کارەم، لەمڕۆ بەدواوە نوێژەکانم بـە کۆمـەڵ دەکـەم، لەبـەر ئـەوەی مزگەوتەکە زۆر دوور بـوو لـە کۆشـکی خەلیفـە بۆیـە بڕیاریـدا مزگـەوتێك لەبـەردەم کۆشـك دروست بکرێ، هەموو نوێژەکان لەگەڵ مسوڵمانان بە کۆمەڵ بکات[1].

### ٦٨١. چۆن دڵەکانمان نەرم دەبێ؟

---

[1]) دینو ژین- ل ٥٧٣-٥٧٤.

ئەبو دەرداء بۆمان دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای ئەوەی کرد کە دڵی ڕەقەو هەرچەند قورئانی بۆ بخوێنرێ‌و باسی قەبرو قیامەتی بۆ بکرێ دڵی نەرم نابێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی گەر دەتەوێ دڵت نەرم بێ بەزەییت بە هەتیودا بێتەوە، دەست بەسەریدا بهێنە، لەو خواردنەی کە بەخۆت دەیخۆی دەرخواردیان بدە، دڵت نەرم دەبێ‌و پێویستییەکانت جێبەجێ دەبێ[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٧٧.

### ٦٨٢. جوانی حۆریەكانی بەهەشت

رۆژێكیـان هەنـدێ لـە هـاوەڵان لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ دانیشـتبوون داوایـان لێكـرد وەسفی حۆریـەكانی بەهەشـتیان بـۆ بكـات، ئـەویش فـەرمووی: ( ئەگـەر یـەكێ لـەو حۆریانـە بێتە سـەر زەوی ئەوەنـدە جوانو قەشـەنگو ناسـكە هـەموو مـەخلوقاتی سـەر زەوی عاشـقی دەبن، بۆنی ئەوەندە خۆشە نێوانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا پـڕ دەكـات، هـەموو خـەڵكی لـە بـۆنی خۆشی ئەو حۆریە بێ هۆش دەبن)[1].

### ٦٨٣. وەسفی ئەهلی بەهەشت

بۆمان ریوایەت كـراوە جارێكیـان یـەكێ لـە ئـەهلی كیتـاب دێ بـۆ خزمـەت پێغەمبـەری خـوا ﷺ و دەڵـی: (یـا أبـا القاسـم) ئێـوە بانگەشـەی ئـەوە دەكـەن لـە بەهەشـت خـواردنو خواردنەوە دەخۆن ئەمە چۆنە ئەی بەهەشت پیس ناكەن؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {سوێند بەو خوایەی كە گیـانی مـنی بەدەسـتە، خـوای گەورە بۆ هەریەكێ لە ئەهلی بەهەشت هێـزی سـەد ئینسانی پـێ دەدا خـواردنو خواردنـەوە دەخۆن، پاشەڕۆیان نییە، ئەو خواردنـەی دەیخۆن دەبێتـە عـەرەقو بـۆنی وەكـو عـەتر وایـە، هـەركات نزیـك بوونـەوە لـەوەی ئارەزوویـان نـەمێنێ داوای شـەرابی تـەهور دەكـەن، هـەر كـە خواردیانەوە هەرچی ماددەی زیادە لە لەشـیان بەشـێوەی عـەرەق لەلەشیان دەردەچـێ، پـاش ئەمـە ئـارەزووی خواردنیـان دەبێتـەوە، لـە بەهەشـتدا هـیچ شـتێكی پـیس نییـە، خـەڵكی بەهەشـت خـەریكیو خۆشـیو رابـواردنن، هـەر یـەك لـە ئـەهلی بەهەشـت ژمارەیـەكی زۆر خزمەتكاری هەیە}[2].

---

[1]) مەكتوباتی كاك ئەحمەدی شێخ- ب٤- ل ١٦٩.

[2]) مەكتوباتی كاك ئەحمەدی شێخ- ب٤- ل ١٧٥- ١٧٦.

### ٦٨٤. وەسفی کۆشکەکانی بەهەشت

ڕۆژێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا باسی کۆشکەکانی بەهەشتتان بۆ بکەم؟

گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کۆشکەکانی بەهەشت ئەوەندە سافن وەکو بلوورن چ لە ناوەو چ لە دەرەوە، لەزەتو نازو نیعمەت لەنێو ئەو کۆشکانەدا ئەوەندە زۆرو جۆراو جۆرن کە نەچاو بینویەتی نە گوێ بیستوویەتی، نە بەدڵی کەسدا هاتووە، کەسێکی دەشتەکی لە مەجلیسەکەدا دانیشتبوو پرسیاری کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایکو باوکم بە قوربانت بێ ئەو کۆشکو نازو نیعمەتانە بۆ کێن؟

فەرمووی: (بۆ کەسانێکن کە سەلام لەناو خەڵکدا بڵاو دەکەنەوە، زۆر سەلام لە خەڵك دەکەن، زۆر نان بە خەڵك دەدەن، زۆر بەڕۆژوو دەبن، لە شەویشدا کە خەڵك نوستوون نوێژ دەکەن)[1].

### ٦٨٥. ئەنجامی سووکایەتی کردن بە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب

ئیبنو لجەووزی دەڵێ: ئەبو حەنیفە گوتی: دراوسێیەکی ڕافزییمان هەبووناشەوان بوو دوو هێستری هەبوو یەکیانی ناو نابوو ئەبو بەکر ئەویتریش عومەر، شەوێکیان یەکێ لە هێسترەکان لوشکەیەکی لێدەدا دمیکوژێ، هەواڵیان بە ئەبو حەنیفەدا، ئەویش گوتی: ئەوەیان لێیداوە کە ناوی ناوە عومەر، بەیانی کە سەیریان کرد بەو شێوەیە بوو[2].

### ٦٨٦. بەرهەمی ڕێزگرتنو دوعا کردن بۆ هەر چوار خەلیفە بە ڕێزەکە

یەکێ لە پیاوچاکان دەگێڕێتەوە کە جیرانێکی هەبوو زۆر تاوانی دەکرد، منیش لەلای ڕۆیشتمو لە دراوسێیەتی ئەو ئەمام، کاتێ هەواڵیان پێدام دراوسێکەت مرد، شەو خەونم پێوە بینی پیاوێکی بەژن درێژ هاتە لام منیش لێی ترسام لەبەر بەژنە درێژەکەی، پێی گوتم: لەگەڵ من وەر بچین بۆ لای گۆڕی فلان کەس کە لەگەڵ دراوسێکەمی بوو، گۆڕەکەی

---

[1]) مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ- ب٤- ل ١٦١- ١٦٢.

[2]) هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ- هارون نوح- ل٢٤.

هەڵكەند بینیم دراوسێكەم لە باخچەیەكی سەوزی خۆشدا دانیشتووە، پێم گوت: چۆن ئەو ڕێزەیان لێنای؟

گوتی: من هەموو جار لەدوای نوێژەكانم دەمگوت (اللهم ارض عن أبي بكر وعمر و عثمان وعلي وارحمني بحبهم)، واتە: خوایە ڕازی بیت لە پێشەوایان ئەبو بەكرو عومەرو عوسمانو عەلی و بەزەییت بەمنیشدا بێتەوە بەهۆی خۆشەویستیم بۆ ئەوان، لەبەر ئەو دوعایەم خوای گەورە منی بەو شوێنە خۆشە گەیاند[1].

### ٦٨٧. دڵ كوێری خراپترە لەچاو كوێری

یەحیای كوڕی بەستام دەڵێ: ڕۆژێك لەگەڵ كۆمەڵێ لە هاوەڵانم چووین بۆ لای ئافرەتێكی خوا پەرستی كوێر كە ناوی عەفیرە بوو، یەكێ لە دۆستەكانم بە كەسێكی تەنیش خۆی گوت: بێگومان كوێری شتێكی زۆر ناخۆشە بە تایبەت بۆ كەسێ كە پێشتر چاوەكانی ساغ بووبن، عەفیرە خاتوونیش گوێی لە قسەكە بوو، گوتی: ڕۆڵە كوێری دڵ زۆر ناخۆشترو خراپترە لە كوێری چاو، من ئەگەر خوای گەرە خۆشەویستی خۆیم پێ ببەخشێ ئەو كات هەموو شتێكم لێ بستێنێتەوە گوێم پێ نەدەدا[2].

### ٦٨٨. شەو نوێژ نەكردن

حەسەنی كوڕی صالح جاریەیەكی هەبوو جاریەكەی فرۆشت، ئەو جاریەیە چووە ماڵێك، یەكەم شەو لە ماڵەكەدا لە نیوە شەو هەڵسایەوە بانگی كردن ئەی خەڵكینە هەڵسن بۆ نوێژ، ئەوانیش پرسیان كوا بانگی بەیانی داوە؟

جاریەكە گوتی: بۆ ئێوە تەنها نوێژە فەرزەكان دەكەن؟

گوتیان: بەڵێ.

---

[1]) حكايات و قصص من حياه السابقين- ص ١٩٩.

[2]) دۆستی باوەڕداران- ل ٢٠٩.

گەڕایەوە لای حەسەن‌و گوتی: گەورەم منت فرۆشتووە بە کەسانێك جگە لە نوێژە فەرزەکان نوێژی تر ناکەن، بۆیە دەمەوێ بمگەڕێنیەوە لای خۆت، ئەویش گەڕاندیەوە لای خۆی[1].

٦٨٩. ترسی بێ باوەڕان لە سوپای موسڵمانان

سەرکردەی سوپای موسڵمانان خالیدی کوڕی وەلید نامەیەکی بۆ کیسرای سەرۆکی وڵاتی فارس نارد لە نامەکەیدا نووسی: ئەی کیسرا موسڵمان ببە واز لە نەزانی‌و ئاگر پەرستی بێنە، ڕێگە بدە ئیسلام بگەیەنینە خەڵکەکە، سوێند بەخوا ئەگەر ڕێگر بیت لە گەیاندنی پەیامی خوا سوپایەکت بۆ دەنێرم ئەوەندە حەزیان لە مردنە بەقەد ئەوەی کە ئێوە حەزتان لە ژیانە، کاتێك نامەکە گەیشتە دەستی کیسرا، ئەویش خێرا نامەیەکی بۆ پادشای چین نارد داوای یارمەتی لێکرد، پادشای چین نامەکەی بۆ ناردەوەو تێیدا نووسی: ئەی کیسرا تۆ دەتەوێ بەگژ کۆمەڵێکم بکەی ئەگەر بیانەوێ کێوێك لە زەویدا دەربێنن دەری دێنن بۆیە ناتوانم یارمەتیت بدەم[2].

٦٩٠. لەترسی دەرگاکانی دۆزەخ ( ٧ ) بەندەی ئازاد کرد

هیشامی کوڕی حەسسان دەڵێ: چووین بۆ سەفەری حەج لە ڕێگادا لە شوێنێك لاماندا و دانیشتین، پیاوێکمان لەگەڵ بوو ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾الحجر، ئافرەتێك گوێی لێبوو بە پیاوەکەی گوت: ڕەحمەتی خوات لێبێ دووبارەی بکەوە، پیاوەکەش دووبارەی کردەوە، ئافرەتەکە گوتی: من لەماڵەوە حەوت بەندەم هەن، ئێوە شاهێد بن هەر حەوتیان ئازاد دەکەم، بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە ڕەحمم پێ بکاو دەگاکانم بەڕوودا نەکرێنەوە[3].

---

[1]) صفحات مشرقة في حياة السابقين- ص ٥٧.

[2]) دۆستی باوەڕداران- ل ٧٤.

[3]) صفحات نيرات من حياة السابقات- ص ١٦٤.

### ٦٩١. ئەگەر نەمیمەیەکت لەلا کرا بەم شێوەیە ئامۆژگاری کەسەکە بکە

پیاوێک هاتە لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو خەریکی قسە هێنانو بردن بوو، واتە: نەمیمییەکی لەلا ئەنجامدا، عومەر ڕەحمەتی خوای لێبێ پێی گوت: ئەگەر قسەکەت ڕاست نەبێو درۆ بکەی ئەوە ئەو ئایەتەت لەسەر جێبەجێ دەبێ کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ٦ ﴾ الحجرات، ئەگەر ڕاستیش بکەی ئەوە ئەو ئایەتەت لەسەر جێبەجێ دەبێ کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ١١ ﴾ القلم، کەواتە: بەهەردوو باردا بەو قسە هێنانو بردنەت گوناهباری! پیاوەکەش شەرم دایدەگرێو پەشیمان دەبێتەوەو تەوبە دەکات[1].

### ٦٩٢. مافی دراوسێو خۆشویستنی مسوڵمانان

موسلیمی کوڕی سەعد خوارزایەکی هەبوو ناوی عەبدوڵڵا بوو، عەبدوڵڵا دەڵێ: ساڵێکیان چووم بۆ سەفەری حەج، خاڵم دە هەزار درهەمی پێدام، گوتی: ئەگەر چوویتە مەدینە بگەڕێ بە دوای هەژارترینماڵو ئەو پارەیان پێ بدە، منیش کە چوومە شاری مەدینە پرسیارم کرد ماڵێکیان پێشان دام، منیش لە دەرگام دا ئافرەتێک وەڵامی دایەوەو گوتی: تۆ کێی؟

منیش گوتم: خەڵکی بەغدام هەندێ پارەم پێیە بۆ هەژارترین ماڵم هێناوە لە مەدینە، پرسیارم کردووە ماڵی ئێوەیان پێشان داووم.

ئافرەتەکە گوتی: ئەی بەندەی خوا هەژارترین ماڵ ئەو دراوسێیەی تەنیشتمانە ئەویان بەتۆ نیشان داوە لەوانەیە تۆ هەڵەت کردبێ.

---

[1]) حكايات وقصص في حياة السابقين- ص ١٤٤.

لە دەرگای دراوسێیەکمم دا هەمان قسەم پێ گوت، ئەویش گوتی: ئێمە لەگەڵ دراوسێکەم وەك یەك هەژارین، تۆ پارەکە لە نێوانمان دابەش بکە، لەبری ئەوەی هەموویم پێ بدەی، منیش پارەکەم لەنێوانیان دابەش کرد[1].

### ٦٩٣. حەقیقەتی مرۆڤ

ئەصمەعی دەڵێ: ڕۆژێکیان مەهلەبی کوڕی صفرە بەلای مالیکی کوڕی دینار تێپەڕی بەجۆرێك بەڕێگادا دەڕۆیی کە بەئاشکرا لووت بەرزی پێوە دەبینرا، مالیك پێی گوت: دەزانی ئەو جۆرە ڕۆیشتنە ناپەسندو گوناهە، مەگەر لە حاڵەتێك بەرامبەر بە سوپای کافران.

مەهلەب گوتی: بۆچی مەگەر تۆ من دەناسی؟

مالیك گوتی: بەڵێ چاکت دەناسم.

مەهلەب گوتی: چۆن؟

مالیك گوتی: سەرەتات ئاوێکی قێزەونەو کۆتاییەکەشت لاشەیەکی بۆگەن، لەنێوان سەرتاو کۆتاییەکەشت هەڵگری بارێك پیساییت[2].

### ٦٩٤. ئامۆژگاری بۆ سەرکردەکان

دەڵێن ڕۆژێك ئیبنو لجەوزی ئامۆژگاری خەلیفە( مستنصر بالله )ی دەکرد پێی گوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەگەر قسە بکەم لەتۆ دەترسم، ئەگەرقسەش نەکەم لەسەرت دەترسم، بەڵام من ئەوەی دووەمیان بەپێش دێخم، بڵێم لە خوا بترسە باشترە لەوەی باشترە لەوەی بڵێم ئێوە خانەوادەی خوا لێخۆشبوونو ئاواو ئاوان، چونکە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ: ئەگەر پێم گەیشت کەسێ زوڵمی لێکراوە منیش زوڵمەکەم هەڵنەگرتووە، ئەوە من ستەمکارم.

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب١- ل ٢٤٤.

[2]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب١- ل ٢٢٣.

ئەی خەلیفە(مستنصر) بزانە کە پێغەمبەر یوسف سەلامی خوای لێبێ، هەتا گرانیو قاتو قڕی بوو تێری نەخوارد نەوەکو هەژاران لەبیر بکات.

پێشەوا عومەر لەکاتی گرانی لە سکی خۆی دەدا دەیگوت: بەخوا قورە قوڕ بکەیت یا نەیکەیت هەرگیز تێرت ناکەم لەکاتێکدا خەڵك برسین.

خەلیفە کە گوێی لەم قسانە بوو سەری خۆی داخستو بڕیاریدا پارەیەکی زۆر بکاتە خێرو هەموو ئەو کەسانەی بەند کراون بە ناهەق ئازادیان بکات و هەموو ڕۆژ چەندەها برسی تێر نان بکات[1].

### ٦٩٥. شارەزایی ئەبوهورەیرە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ

مالیکی کوڕی عامر دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای تەڵحەو ئاماژەی بۆ ئەبو هورەیرە کرد گوتی: ئەو پیاوە دەناسی زۆر شارەزایە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە زۆر شتی وامان لێ بیستووە لە ئێوەمان نەبیستووە، تەڵحە گوتی: لەبەر ئەوەیە کە ئێمە خەریکی کاسبیو ماڵو منداڵ بووین کەمتر دەمانتانی بێین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا بەڵام ئەبو هورەیرە بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەری خوا بوو، بۆیە ئەو شتانێکی بیستووە کە ئێمە نەمان بیستووە[2].

### ٦٩٦. ئەدەبی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ

دوای شەڕی ئوحود پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ماندوو بوو ویستی سەرکەوێتە سەر بەرزاییەك بەڵام نەیتوانی تەڵحە چووە ژێر باڵەکانیو پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵگرت، لەگەڵ ئەوەی کە تەڵحە لەو شەڕەدا قاچێکی زامدار بووبو بە سەختی، دەشەلی بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵگرتبوو زۆر تۆبزی لەخۆی دەکردو خۆی ئەزیەت دەدا تا بە جوانی بڕواو نەشەلێ نەوەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆیشتنەکەی ئەو ئەزیەت بخوا[3].

---

[1]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب١- ل ٢٤٢.

[2]) ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ- ب١- ل ٢٥٥.

[3]) ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ب١- ل ٢٥٤.

### ٦٩٧. لە دوعا لێکردنی باوك بترسە

گەنجێك هەبوو بزنو مەڕی بۆ باوکی دەلەوەڕاند ، ڕۆژێك داوای لە باوکی کرد گوتی: دەمەوێ ببم بە فەرمانبەر، باوکیشی ڕازی نەبوو. بەڵام کوڕەکەی بەردەوام ئەو داوایەی دووبارە دەکردەوە، باوکب گوتی: هیچ دەسەڵاتێکم نییە کە تۆ بەگوێم ناکەی تەنیا ئەوە نەبێ دوعات لێدەکەم چونکە ئەزیەتم دەدەی، کوڕەکەی هەندێ پارەی لە خزمو کەسەکانی وەرگرتو ڕۆیشت بۆ سەفەرەکەی، باوکیشی دوعای کرد کە خوای گەورە تووشی ناخۆشیەکی بکا لەو سەفەرە ئازاری پێوە ببینێ.

ئەوەبوو کوڕەکەی لە ڕێگادا هەردوو چاوەکانی کوێر بوون، بۆیە گوتی: تازە من بۆ ئەو کارە ناشێم، هاورێکانی هێنایانەوەماڵەوە باوکی کە چاوی پێکەوت کوڕەکەی وای بەسەر هاتوووە زۆر ناڕەحەت بوو، شەو بە گریانەوە هەر دوعای بۆ کرد کە چاوەکانی چاك بێتەوە، ئەوەبوو لە کاتی نوێژی بەیانی خوای گەورە شیفای داو چاوەکانی چاك بوونەوە، ئەوانیش زۆر سوپاسی خوای گەورەیان کرد[١].

### ٦٩٨. ڕق لێبوونەوەی شەرعی

دەڵێن: ئەبو دەردا بەلای پیاوێکدا تێپەڕی پیاوەکە بەهۆی ئەوەی گوناهێکی کردبوو خەڵکی جنێویان پێ دەدا، ئەبو دەرِدا گوتی: جنێو بە براکەتان مەدەن، بەڵکو سوپاسی خوا بکەن کە ئێوەی لەو گوناهە پاراستووە.

گوتیان: ئەی تۆ ڕقت لێی نابێتەوە؟

گوتی: نەخێر من ڕقم لەخۆی نابێتەوە بەڵکو ڕقم لە کردارەکە دەبێتەوە، ئەگەر وازی لێ بێنێ ئەوە وەك برای خۆم سەیری دەکەم[٢].

---

[١]) بەسەرهاتو پەند وەرگرتن- ب١- ل ٢٦٦.

[٢]) ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ- ب٢- ل ٢٢٣.

### ٦٩٩. دڵ سافی بەرامبەر مسوڵمانان

زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێ: چووم بۆ لای ئەبو دوجانە لەو كاتەی كە نەخۆش بوو، لێیان پرسی چ كارێكت هەبوو جێگەی ئومێدت بێ لای خواو دڵت پێی خۆش بێ؟

ئەویش گوتی: دوو كردەوەم هەن ئومێدم وایە خوای بەبەزەیی بەمیهرەبانی خۆی بە هۆی ئەو دوو كردەوەیە لێم خۆش بێ، جێگەی ئومێدی منن، یەكەمیان: هەر كارێكم مەبەستم خوا نەبووبێ قسەم تیایدا نەكردووە، دووەمیان: هەردەم دڵم ساف و بێگەرد بووە بەرامبەر مسوڵمانان[1].

### ٧٠٠. تەوازوعی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود

دەڵێن ڕۆژێكیان عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود بەڕێگایەكدا ڕۆیشت خەڵكی شوێنی كەوتن، ئەویش گوتی: پێویستییەكتان هەیە؟

گوتیان نەخێر هەر حەز دەكەین شوێنت كەوین و لەگەڵت بە ڕێگادا بڕۆین.

ئیبن مەسعود گوتی: بگەڕێنەوە چونكە دواكەوتن بێ دەستەڵاتیە، بۆ كەسێك كە خەڵكی دوای دەكەون بەڵایە.

حاریسی كوڕی سوەید دەڵێ: ئیبن مەسعود دەیگوت: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم سەبارەت بە خۆم ئێوە بیزانن، لە جیاتی شوێنم كەون، قوڕتان بەسەر دەكردم[2].

### ٧٠١. بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژانی سەختی گەرما

ئافرەتێك هەبوو چ ڕۆژێك زۆر گەرما بووایە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبوو، لێیان پرسی تۆ بە ئانقەست چ ڕۆژێك گەرمە لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبی، بۆ وا دەكەی؟

ئافرەتەكە گوتی: شتێك نرخی كەم بێ هەموو كەس دەتوانێ بیكڕێ، بەڵام شتێك بە نرخ و بەها بێ هەموو كەس ناتوانێ دەستی بۆ ببا[1].

---

[1]) ئەصحابەكانی پێغەمبەر ﷺ- ب٢- ل ١٢٩.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب١- ل ٤١٤.

### ٧٠٢. ئاواتی هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ

ئەبی زەنادە دەڵێ: ڕۆژێکیان لەماڵی موصعەب هەریەکە لە عوروەو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو کۆ ببوونەوە گوتیان دەی با هەریەك لە ئێمە ئەو ئاواتەی هەیەتی بیخوازێ، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر گوتی: من ئاواتم بوون بە خەلیفەیە تا لەو ڕێگەوە خزمەت بکەم، عوروە گوتی: من ئاواتم ئەوەیە خەڵك لێمەوە فێری زانست بێ، مەصعەب گوتی: ئاواتمە ببمە والی عێراق و هەردوو عائیشەی کچی تەڵحەو کچی حوسەین ببن بە خێزانم، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گوتی: ئاواتم تەنها ئەوەیە خوای گەورە لێم ببورێ، گێڕەوە (راو)ی ئەو بەسەرهاتە دەڵێ: هەموویان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن، ئومێدم هەیە عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش گەیشتبێ بە ئاواتی خۆی[٢].

### ٧٠٣. چەند ئامۆژگارییەکی ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ

سوفیانی ثوری دەڵێ: ڕۆژێکیان ئەبو زەڕ لەلای کەعبە ڕاوەستاو هاواری کرد ئەی خەڵکینە کۆ ببنەوە ئامۆژگارییەکم بۆتان هەیە، خەڵکیش کۆبوونەوە، ئەبو زەر گوتی: ئایا هەر کام لە ئێوە ئەگەر بیەوێ بڕوات بۆ سەفەرێك بای ئەوەندە توێشوو لەگەڵ خۆی نابات بۆ ئەوەی بگاتە جێی مەبەست؟

گوتیان: بەڵێ ڕاست دەکەی.

گوتی: دەی کەواتە بۆ ئەو سەفەرەی کە گەڕانەوەی نییەو لە هەموو سەفەرێك دوورترە توێشوو کۆبکەنەوە.

گوتیان: جا پێمان بڵێ چ توێشووەك بۆ ئێمە چاکە؟

گوتی: بۆ هەر پرسیارێك وەڵامێك ئامادە بکەن، هەروەها لە ڕۆژە گەرمەکاندا بەڕۆژوو بن، بۆ زۆریی ڕاوەستانی ڕۆژی مەحشەر، هەروەها شەو نوێژ بکەن بۆ تاریکی سامناکی نێو گۆڕ، ئەگەر قسەیەکی خێر هەبوو بیکەن، ئەگەرنا خۆتان لە قسەی خراپ بپارێزن، لەوەی

---

[١]) صفحات نيرات في حياة السابقات- ص ٦٦.

[٢]) ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ- ب٢- ل ٣٧٢.

هەتانە بیكەن بەخێر تا ڕزگارتان بێ، دونیا بكەن بۆ دوو مەبەست مەبەستێكیان بەدەست هێنانی نانی حەلاڵ مەبەستەكەی تر بۆ بەدەست هێنانی دوا ڕۆژ، لەوە زیاتر سێهەمەكەی زیانی هەیەو لێی دوور بكەونەوە، ماڵەكەتان بكەن بە دوو بەش بەشێكی بۆ منداڵەكانتان بەشەكەی تری پێش خۆتان بخەن بۆ قیامەت، واز لە سێهەمەكەی بێنن دڵنابن سوودی نییە بۆتان بەڵكو زیانتان لێ دەدا، پاشان بە دەنگێكی بەرز گوتی: ئەی خەڵكینە بەڕاستی سوور بوونو پێداگیریتان لەسەر ئەو شتەی كە نایگەنێ لە نێوی بردوون[١].

## ٧٠٤. گریانو ترسانی عومەری كوڕی خەتتاب لە خوای گەورە

ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێ: ڕۆژێكیان لەگەڵ عومەری كوڕی خەتتاب دەرچووین بۆ شوێنێك، لەكاتی ڕۆیشتن لە جێگایەكدا دیوارێك كەوتە نێوانمان گوێم لە عومەر بوو خوا لێی ڕازی بێ بە نەفسی خۆی دەگوت: عومەری كوڕی خەتتاب ئەمیری ئیمانداران بەھ بەھ، سوێند بە خوا ئەگەر لەخوا دەترسی باشە، ئەگەرنا سزایەكی سەختت دەدا[٢].

## ٧٠٥. ڕۆڵی ئافرەت لە ئیسلام

ئوم شورەیكی غوزمییەی ئەنصاری هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلام مسوڵمان بوو، لە شاری مەككە، بەچاوی خۆی زەبرو زەنگو ستەمی كافرانی ئەدی دژ بە مسوڵمانان، كافران زۆر لێی داخ لەدڵ بوون، بەتایبەت كە ئەو ئافرەتە بەڕێزە قورەیشی نەبوو، كەسیشی نەبوو لە مەككەدا بەرگری لێبكات، كافرەكان گرتیان بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ هۆزەكەی ئەودا هاوپەیمانیان لە نێوان بوو نەیانویست ڕاستەوخۆ بیكوژن، گرتیان بۆ ئەوەی بیگەڕێننەوە بۆ لای كەسو كاری، دەستیان بەستو خستیانە سەر پشتی حوشترێكی ڕووت بۆ ئەوەی لەسەر پشتی ئەو حوشترە نازار بخوات، سێ ڕۆژ لە ڕێگادا ڕۆیشتن نەنانیان دایە نەئاو، لە هەر شوێنێكیش بیانویستایە پشوویەك بدەن خۆیان دەچوونە شوێنێكی سێبەر بەڵام ئەویان لەبەر گەرمای هەتاو جێدەهێلا، داوای ئاوی دەكرد پێیان نەدەدا،ختێك كە كافرەكان پشوویان دەدا لەژێر سێبەرێكدا، ئەو ئافرەتە بەڕێزەش لەبەر هەتاوی گەرم لە تینوویێتیو

---

[١]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٢٧٨- ٢٧٩.

[٢]) صور من حیاة الأنبیاء والصحابة والتابعین- ج٢- لا ٤٦٤.

گەرمییدا خەریك بوو گیان بدات، لەناكاو دەفرێك ئاوی سارد لە ئاسمانەوە پێی گەیشت، تێری ئاو لێخواردەوە، پاشان ئاوەكەی پێداكراو فێنكی بوویەوە وەكو دارێكی وشك گەشایەوە، كافرەكان هەڵسان بینیان ئەوم شورەیك ئاوی پێداكراوەو ئاسەوارەكەی بەبەرییەوە دیارە، ڕەنگو ڕووی گەشاوەتەوە، گومانیان برد ئاوەكەی وانی خواردبێتەوە، بەڵام سەیریان كرد هەم ئاوەكەیان وەكو خۆیەتی، هەم كۆتو زنجیری دەستەكانی وەكو خۆیەتی، بەم هۆیەوە گوتیان: بەڕاستی ئایینەكەی وی ڕاستەو هی ئێمە پووچە، بۆیە بڕیاریاندا مسوڵمان بن[1].

### ٧٠٦. كەرامەتی شێخ سەعیدی نووڕسی

شێخ سەعید جارێكیان لەكاتی گرتنیدا كەلەپچەی لەدەست دەبێ دوو پۆلیس لەگەڵیدا دەبن، دەیانەوێ بیبەن بۆ شاری بەتلیس، لە ڕێگادا كاتی نوێژ هاتو بانگی فەرموو، شێخ سەعید داوای لە پاسەوانەكانی كرد كەلەپچەكەی بكەنەوە بۆ ئەوەی نوێژەكەی بكا، بەڵام پۆلیسەكان ئەمەیان قبووڵ نەبوو، پاش ماوەیەكی كەم كەلەپچە لە دەستەكانی بوویەوەو هەڵی دایە بەردەم پاسەوانەكان، نوێژەكەی دابەستا، پۆلیسەكان واقیان وڕماو زۆریان لا سەیر بوو، بۆیە گوتیان: مامۆستا ئێمە تا ئێستا پاسەوانو چاودێر بووین لە سەرت، بەڵام لە ئێستاوە ئێمە خزمەتكاری تۆین[2].

### ٧٠٧. خوای گەورە بە هانای بەندەی خۆی دێ

شێخ موحەممەد حەسسان كە بانگخوازێكی میصرییە دەڵێ: شەوێك جەندرمەكانی حكومەت ئەدەن بەسەرماڵی بانگوازێكدا ڕاپێچی دەكەن بۆ بەندیخانە، ئەو شەوە منداڵێكی بچووكی زۆر نەخۆش جەبێو تەندروستی زۆر خراپ تێك دەچێ، خێزانەكەشی بەو شەوە تاریكە لەبەر نەبوونی دەستی بەهیچ شتێك ڕاناگا، لە دوانزەی شەو لە دەرگای ماڵەكەیان دەدرێ كە دەرگاكە دەكاتەوە دەبینێ دكتۆرێكە، دكتۆرەكە دەڵێ: كوا منداڵە نەخۆشەكەتان؟

---

[1]) دۆستانی خوا- ل ١٦- ١٧.

[2]) هەمان سەرچاوە- ل ٤١.

ئەویش منداڵەکەی بۆ دەهێنێ فەحسی دەکات‌و دەرمانی پێ دەدا، پاشان چاوەڕێ دەکا تا هەقی خۆی وەرگرێ.

ئافرەتەکە دەڵێ: بەخوا هیچمان نییە پێتی بدەم!! وە مێردەکەشم بەند کراوە.

دکتۆرەکە دەڵێ: ئەی تۆ نەبووی تەلەفونت کرد؟

ئافرەتەکە دەڵێ: نەخێر.

دکتۆرەکە دەڵێ: بۆ ماڵی ئێوە شوقفەی ژمارە چەندە؟، کە ئافرەتەکە ژمارەکەی پێ دەڵێ ئنجا دەزانێ کە هەڵەی کردووە ئەوەی کە تەلەفونی بۆ کردووە دراوسێی ئەو ئافرەتە بووە نەك ئافرەتەکە خۆی، دیارە ئەوانیش منداڵیان نەخۆش بووە، بەلام دکتۆرەکە ئەوەندە مسوڵمان‌و جوامێر دەبێ، کە دەبینێ حاڵی ئەو ئافرەتە ئەوەندە خراپەو هیچ شتێکی نییە لە ماڵەوە، پیاوەکەشی گیراوەو کاسب کارێکی نییە، بۆیە بڕیار دەدا مانگانەیەکی بۆ ببڕێتەوە تا پیاوەکەی ئازاد دەبێ[1].

### ٧٠٨. بێ ئەدەبی کردن بەرامبەر بەخواو ئە نجامەکەی

ئەو بەسەرهاتە لە ولاتی فەلەستین لە شاری غەززە ڕووی داوە، کچێکی سفوور پۆشاکەکانی زۆر خراپ بوون بەجۆرێك هەمیشە سەرنجی دەورو بەری بۆخۆی ڕادەکێشا، لە ناوەڕاستی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٠١٣ ئەو ئافرەتە سواری تەکسییەك دەبێ بە جل‌و بەرگێکی زۆر خراپ، شوفێری تەکسییەکە زۆر بە نەرم‌و نیانی‌و ڕەوشت بەرزییەوە ئامۆژگاری ئەو ئافرەتەی کرد کە ئەو جل‌و بەرگانە ناشەرعین‌و پێویستە مسوڵمان لێیان دووركەوێتەوە، بەتایبەتیش لەو مانگە موبارەکەدا.

ئافرەتەکە زۆر بە لەخۆبایی بوونەوە مۆبایلەکەی دەرهێناو بۆ پیاوەکەی درێژ کرد گوتی: ها ئەوە مۆبایل تەلەفۆن بۆ خواکەت بکە با شوێنێك لە دۆزەخ بۆ من دابنێت‌و شوێنێکیش بۆ تۆ لەبەهەشت دابنێ، خوای زاڵ‌و کاربەجێ بەخێرایی وەلامی ئافرەتەکەی دایەوەو دەست بەجێ گیانی دەرچوو، شوفێرەکەش بەپەلە گەیاندییە نەخۆشخانە، کچەکە

---

[1]) هەمان سەرچاوە- ل ٤٥.

خرایە بەستەری نەخۆشخانەکە تا کەس و کاری هاتن، کە جەنازەکەیان دەرهێنا ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕابوو، مۆبایلەکەی لەدەستی نەدەهاتە دەرەوە ناچار بە مۆبایلەوە ناشتیان، تا ببێتە شاهێد بەسەریەوە لە ڕۆژی دوایی[1].

## ٧٠٩. دونیا نەویستی هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ

حەبیبی کوڕی مەسلەمە والی شام بوو، (٣٠٠) دیناری نارد بۆ ئەبو زەڕ، بۆ ئەوەی بۆ پێداویستییەکانی خۆی خەرجی بکا، ئەبو زەڕ گوتی: بڕۆن بیگێڕنەوە بۆخۆی، کەسی تری دەست نەکەوتووە یاخی تر بێ لەمن؟

ئێمە جگە لە سێبەرێك کە لەژێری بحەوێینەوە بەسمانە[2].

## ٧١٠. پاداشتی نەخۆشی و ئارام گرتن

زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێ چاوم دێشا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دیدەنیم فەرمووی: ئەی زەید ئەگەر چاوەکانت لەدەستدا چی دەکەی؟

زەید گوتی: ئارام دەگرم و داوای پاداشت لە خوا دەکەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر وا بکەی دەچیتە بەهەشتەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە فەرمووی: دەچیتەوە دیداری خواو تاوانت نامێنێ[3].

## ٧١١. ڕەشبینییەکانت بکە بە گەشبینی

وەك چۆن هەموو کۆمپانیایەك بە حیساباتی خۆیدا دەچێتەوە ساڵانە، مرۆڤیش پێویستە بەم شێوەیە ناوڕ لە ڕابردووی خۆی بداتەوە، بە خۆشی و ناخۆشیەکانی ڕۆژگاری ڕابردوویدا بچێتەوە، دەبێتە هۆی دەرس وەرگرتن بۆی، بەڵام لە بیرکردنەوەکانیدا با هەردەم گەشبین بێ نارەحەت نەبێ بە قەدەرێك کە خوای کاربەجێ بۆی نووسیوە.

---

[1]) ئەسرینەکانی تەوبەکاری- ل ٩٣- ٩٤.

[2]) ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ- ب٢- ل ٢٧٧.

[3]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل١٦٩.

ڕۆژێکیان پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەی دادەنیشێ لە ساڵی نوێدا بیر لەو بەسەرهاتو ڕووداوانە دەکاتەوە کە لەساڵی ڕابردوو تووشی هاتن، بە خێزانەکەی دەڵێ: لە ساڵی ڕابردوودا عەمەلیاتێکی زراوم کردو ئازاری زۆرم پێوە دیت، هەر لەو ساڵەدا تەمەنم بوو بە (٦٠) ساڵو خانەنشین کرامو بەرەو پیریو مردن چووم، هەروەها باوکم وەفاتی کرد، کوڕەکەشمان بەهۆی ڕووداوی هاتوچۆ نەیتوانی ئەوساڵ خوێندنەکەی تەواو بکات.

بەڵام دیارە خێزانێکی زۆر عاقڵو ژیرو سوپاسگوزاری دەبێ، ئافرەتەکەی دەڵێ: پیاوەکە بۆچی وا دەڵێیو وا بیر دەکەیتەوە لەبەرچی ئاوا ڕەشبینی؟

پیاوەکە گوتی: ئەی چۆن بیر بکەمەوە، چۆن گەشبین بم بەم هەموو ڕووداوەی کە ڕوویداوە؟

خێزانەکەی دەڵێ: بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری خوای گەورە بی، بۆ ئەوەش کە گەشبین بی پێویستە بڵێی: لەم ساڵ کە تێپەڕی سوپاس بۆ خوا عەمەلیاتی زراوم کرد ڕزگام بوو لەو ئازارەی کە بەرۆکی گرتبووم، هەروەها خانەنشین کرام بۆخۆم دەستم بەتاڵ دەبێو دەرفەتی زیاترم بۆ خوێندنەوەی کتێبو سەردانو گەشتو سەیران دەبێ ڕزگارم بوو لە جەنجاڵی دەوامو ماندووبونی کارکردن، هەرلەو ساڵەشدا سوپاس بۆ خوا باوکم لەتەمەنی (٨٥)ساڵیدا مردنێکی زۆر بەجوانی مردو ، خوای گەورە تەمەنێکی چاکی پێ بەخشی، نەبووە ئەرك بەسەر کەسیشەوە، کوڕەکەشمان سوپاس بۆ خوا لەگەڵ ئەوەی تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بوو، بەڵام گیانی سەلامەت بوو نەمرد، خوێندنەکەشی ساڵێکی تر هەر تەواو دەکا بە پشتیوانی خوا[1] .

## ٧١٢. کاتت بە فیڕۆ مەدە سوود لە کاتت وەربگرە

م. عەمرِ خالید دەڵێ: لە تەمەنی بیست ساڵیدا چووم بۆ بەریتانیا، بۆ خوێندن، ساڵێك مامەوە، لە ماوەی ئەو ساڵەدا ڕۆژانە سەعاتێك لەم سەرو سەعاتێك لەو سەر لەنێو میترۆ دەبووم بۆ هاتوچۆکەم، سەرەتا هەستم بە بێزاری کرد، بەڵام دواتر بڕیارم دا ئەو

---

[1]) زەردەخەنەی هیوا- ل٢٢.

دوو سەعاتەی ئەمسەرو ئەوسەر قورئان بخوێنم، توانیم سوورەتی (نساء) لەبەر بكەم، لەسایەی خوا ئەمە بووە هۆی ئەوەی بیست جوزم قورئان لەبەر بكەم[1].

## ٧١٣. كرێكاری دڵسۆز

لە وڵاتی ئەڵمانیا گەنجێكی كە لە پۆلی دوانزەی ئامادەییە، هاوینان كرێكاری دەكات، كارەكەشی خاوێن كردنەوەو چاكردنی باخچەی ماڵانە، بەم كار كردنەی هەم بۆخۆی شتێكی دەست دەكەوێ لە پارەو پوول، هەم لەو وڵاتە قوتابی كە پۆلی (١٢) تەواو دەكات دەبێ كارێك بكات سوودی گشتی تێدا بێ، ئینجا دەچێتە زانكۆ واتە ئەو كارەی دەیكا دەرەجەی لەسەرە.

ڕۆژێكیان لە دوكانێكەوە مۆڵەت دەخوازێ بۆ ئەوەی تەلەفۆن بۆ ماڵێك بكا بۆ ئەوەی كاری پێ بكەن لە باخچەی ماڵەكەیان، دوكاندارەكە مۆڵەتی دەدا ئەویش تەلەفۆن دەكا بۆ ئافرەتەكەو دەڵێ: من كرێكاری باخچەم دەمەوێ بێم باخچەكەتان بۆ خاوێن بكەمەوە، ئافرەتەكەش دەڵێ: سوپاس ئێمە كرێكارمان گرتووە بۆ خاوێن كردنەوەو چاكردنەوەی باخچەكەمان.

گەنجەكە دەڵێ: ئێ باشە باخچەكەی ژوورەوە با ئەو خەریكی بێ هی دەرەوەی بدەن بەمن.

ئافرەتەكە دەڵێ: نەخێر چونكە من لە كاركردنی كرێكارەكەم زۆر مورتاحم‌و لێی ڕازیم.

گەنجەكە دەڵێ: ئێ باشە چەند پارە دەدەن بەو من بەنیو ئەوەندە كارەكەتان بۆ دەكەم ئەگەر بتانەوێ.

ئافرەتەكە دەڵێ: ببورە، ئێمە لە كاركردنی كرێكارەكەی خۆمان ڕازین‌و بەهیچ شێوەیەك حەز ناكەین بیگۆڕین.

گەنجەكەش دەڵێ: باشە ببوورە لە كاتم گرتی، تەلەفۆنەكە دادەخا.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥.

خاوەن دوکانەکە دەڵێ: دیارە تۆ زۆر پێویستی، ئەگەر حەز دەکەی لای من کار بکە.

گەنجەکە دەڵێ: نا زۆر سوپاس من کارم هەیە، کار بۆ ئەو ئافرەتە دەکەم، ویستم تاقی بکەمەوە بزانم تا چەند لە کارەکەم ڕازین[1].

## ٧١٤. گەورەیی جیهاد لەلای هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ

لە غەزای خەندەقدا سەعدی کوڕی موعاز بەهۆی تیرێکەوە کە بەربالی کەوت بریندار بوو، برینەکەی سەخت بوو، سەعد لە خوای گەورە پاڕایەوە گوتی: خوایە گیان خۆت دەزانی هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەوە لام خۆشەویستتر نییە کە لە پێناوی تۆدا تێبکۆشم بکەم، خوایە گیان ئەگەر شەڕێکمان ماوە لەگەڵ قوڕەیش بمهێڵەوە بۆیان، تا لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگم کە پێغەمبەری خوایان بەدرۆ خستەوەو شاربەدەریان کرد، ئەگەر ئەمە کۆتا شەڕیشە با بەهۆیەوە شەهید بم، خوایە تەمەنم بدەی تا سەرشۆڕی بەنی قوڕەیزەش دەبینم، کە جەنگی بەنی قوڕەیزە کۆتایی هات دوعاکەی هاتە دیو خوێنی برینەکەی بەربوو، جوبریل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەوە کێیە وەفاتی کردووە دەرگای ئاسمانەکانی بۆ کراوەتەوەو عەرشی خوای بۆ هاتۆتە لەرزین[2]؟

## ٧١٥. موعازی کوڕی جەبەل و مردن

موعازی کوڕی جەبەل لە کاتی سەرە مەرگ گوتی: ڕۆژ بۆتەوە؟

گوتیان: بەڵێ.

گوتی: پەنا دەگرم بەخوا لە شەوێك کە بەیانییەکەی پەلکێشت دەکەن بۆ ئاگر، سلاو لە مردن خوایە خۆت دەزانی کە من لە تۆ دەترسم، خوایە خۆت دەزانی من دونیام خۆشنەویستووەو حەزم لە دونیا نەبووە بۆ جۆگە لێدانو دارچاندن، بەڵکو حەزم لێی بووە

---

[1]) زوردەخەنەو هیوا- ل ٣٦.

[2]) سلاو لە فریشتەکان- ل ١٧.

بۆ شەو نوێژو ڕۆژوو گرتن‌و داواکردنی زانست، لەسەرەمەرگ بوو هەندێ جار دەبوورایەوە کە بەهۆش خۆی دەهاتەوە دەیگوت: سوێند بە گەورەو عیززەتی خۆت خۆشم دەوێی[1].

### ٧١٦. حاڵی مردوو لە گۆڕەکەیدا

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز جارێکیان لەنێو گۆڕستان دەیویست نوێژ لەسەر جەنازەیەك بکا خەڵکی چاوەڕێیان دەکرد، ئەویش بەناو گۆڕەکاندا دەهات‌و دەچوو، کە گەڕایەوە چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوون لەبەر گریان.

گوتیان: لەبەر چی زۆرت پێچوو؟

گوتی: بەنێو گۆڕی خزم‌و کەسەکانم داچووم، سەلامم کرد وەڵامیان نەبوو، بەزمانی حاڵ پێمیان دەگوت: ئەی عومەر ناپرسی چیمان بەسەرهات، کفنەکانمان ڕزین، لاشەمان لەت لەت بوو خوێنمان مژرا، گۆشتەکانمان خورا نێسقانەکانمان لێك ترازان، پاشان عومەر دەستی کرد بە گریان‌و گوتی: بەڕاستی ئەو دونیایە زۆر بێ بایەخە، عەزیزەکەی زەلیلە دەوڵەمەندەکەشی هەژار[2].

### ٧١٧. شەرم کردن لە خوا

گێڕراوەتەوە کە پێشەوا ئیبن‌و عەبباس نەدەچوو بۆ حەمام بەبێ جل‌و بەرگ، دەیگوت: بەڕاستی من شەرم دەکەم خوای گەورە بمبینێ‌و جل‌و بەرگم لەبەر نەبێ[3].

### ٧١٨. ئیسراف نەکردن

موجاهید دەڵێ: خەلیفەی مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ لەسەفەری حەجدا لە چوونی بۆ مەککەو مانەوەی تا گەڕانەوەی بۆ مەدینە هەشتا درهەمی سەرف کرد، پاش گەڕانەوەی زۆر پەشیمانی دەربڕی لە بێتاقەتیدا دەستێکی دەدا

---

[1] سڵاو لە فریشتەکان- ل١٨.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٠.

[3] صور ومواقف من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين- ج٢، ل٤٢٣.

بە دەستەکەی تری دەیگوت: ئێمە بۆ ئەوە دروست نەکراوین ئیسراف بکەین لە ماڵی خوادا[1].

### ٧١٩. ترسان لە خوا

عەبدوڵلای کوڕی عامر دەڵێ: ڕۆژێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خەتتابم بینی پووشێکی لە زەویدا هەڵگرتەوەو گوتی: خۆزگە من ئەو پوشە بوومایە، خۆزگە دایکم منی نەبوایە[2].

### ٧٢٠. کارکردن و هەوڵدان لە دونیا

ڕۆژێك یەکێ لە پاشا دادوەرەکان بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت، تووشی پیرەمێردێك بوو پشتی چەمابۆوە، خەریکی چاندنی دار گوێزێك بوو، پادشاکە پێی گوت: تۆ کە قژت وەکو شیر سپی بووە چەند ڕۆژێکت لە دونیادا ماوە بۆچی درەخت دەچێنیت کە (١٠) ساڵی تریش بەرهەمەکەی پێ ناگا؟

پیرەمێردەکە گوتی: ئەوەندە بەسسە کە مرۆڤ باوەڕی بەوەبێ کە هەتا لە دونیادا ماوە تاکو زیندووویت دەبێ کار نەبی‌و کارێك ئەنجام بدەی، هەروەك ئەوانەی پێش خۆمان داریان بۆ ئێمە چاندو ماڵ ئاواییان لێکردین، بۆیە تاکو زیندووین دەبێ سوودمان بۆ خەڵکی دوای خۆمان هەبێ[3].

### ٧٢١. پاداشتی وتەی جوان

پیرەمێردێك لەلای پادشایەك گوتی: ئەوان چاندیان ئێمە دەیخۆین، پادشا ئەم قسەیەی پێ خۆش بوو کیسەیەك زێڕی دا بە پیرەمێردەکە، پیرەمێردەکە گوتی: ئەی پادشا درەختەکەی من هەر ئەمڕۆ بەرهەمی خۆیدا، بێ ئەوەی چاوەڕێ بکەم تا دەساڵی تر، ئێستا

---

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٤٢٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[3]) ڕەوشت بەرزی- ب١- ل ٣٢.

کە من تەمەنم لە حەفتا تێپەڕیوە سوودی خۆم لێی بینی، پادشا لەبەر ئەم قسەشی مووچەیەکی مانگانەی بۆ دانا[1].

## ٧٢٢. لەخۆبایی نەبوون

خوای گەورە وەحی نارد بۆ موسا سەلامی خوای لێبێ بۆ ئەوەی بەبەنی ئیسرائیل بفەرمووێ: چاکترین کەس لە نێوان خۆیان هەڵبژێرن، ئەوانیش سەد کەسیان دەست نیشان کرد، پاشان وەحی بۆ ناردن لەو سەد کەسە باشترینی هەڵبژێرن، ئەوانیش دە کەسیان هەڵبژارد، ئەو جارە وەحییان بۆ هات کە لەو دە کەسەش سێ کەسی باش هەڵبژێرن، ئەوانیش سێ کەسیان هەڵبژارد، پاشان دیسان پێیان گوترا لەو سێیەش بەك کەس هەڵبژێرن کە چاکترین بێ، ئەوانیش کەسێکیان هەڵبژارد.

ئەو جارە بە پێچەوانەوە وەحیان بۆ هات بەو کەسە باشە بڵێن تا خراپترین کەس هەڵبژێرێ، ئەویش داوای مۆڵەتی (٤) ڕۆژی کرد تا لە ماوەی ئەو چوار ڕۆژە بتوانێ خراپترین کەس بدۆزێتەوە، زۆر گەڕا تاوەکو لە ڕۆژی چوارەم پیاوێکی بینی کە هەموو خەڵکی شاهێدی خراپیان بۆ دەدا داوێن پیسو خراپەکار بوو، ئەو پیاو چاکە کە تەکلیفی ئەو کارەی لێ کرابوو، ویستی ئەو پیاوە لەگەڵ خۆی ببا، بەلام بە خەیاڵی داهات کە نابێ لە سەر ڕواڵەت حوکم بکا لەگەڵ ئەوەی کە بە پیاوێکی خراپ ناسراوەو پێگەیەکی کۆمەلایەتی خراپی هەیە، بەلام خۆ بەندە ناس هەر خوایە (جل جلالە)، لەبەر خۆیەوە گوتی: ئێستا کە خەڵکی منیان بە پیاوی باش لەقەڵەم داوە نابێ لەخۆ بایی بم، هەرچیەکیش بەرامبەر ئەو پیاوە بنوێنم هەر گومانە چونکە بە ڕەهایی هەر خوا دەزانێ خراپترین کەس کێیە، بۆیە چاکتر وایە لە جیاتی ئەوەی گومانی خراپ بەو کەسە ببەم بەخۆمی ببەم باشترە، بۆیە گەڕایەوە لای پێغەمبەر موسا سەلامی خوای لێبێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەچی گەڕام لەو ماوەیەدا لەخۆم خراپترم نەبینی، بۆیە من خۆم

[1] ڕەوشت بەرزی- ل٢٣.

هەڵدەبژێرم بە خراپترین کەس،حی هات بۆ پێغەمبەر موسا کە ئەو پیاوە چاکترین پیاوە نەك لەبەر ئەوەی زۆر خوا پەرستە بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆی بە خراپترین کەس دەزانی[1].

## ٧٢٣. بەخششی خوای بەخشەر

یونسی کوڕی عەبید دەڵێ: پرسیار کرا لە هەندێك پیاوچاکان کە چۆن بەیانیت کردەوە؟

گوتی: بەیانیم کردەوە لە بەینی دوو بەخشش‌و خەڵات کە نازانم کامیان لە کامیان گەورەترە، گوناهێك کە خوای گەورە بۆی داپۆشیوم کەس ناتوانێ پێیانەوە عەیبدارم بکا، خۆشەویستیەك کە خوای گەورە خستویەتیە دڵی بەندەکانی کردەوەکانی من پێیان ناگات[2].

## ٧٢٤. پشت بەستن بەخوا

کابرایەك ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمی بینی دەچوو بۆ سەفەری حەج بە پیادە، گوتی: ئەی کوڕی ئەدهەم ئایا هیچ ئاژەڵێکت نییە پێیەوە بڕۆی؟

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم گوتی: هەرکاتێك بەڵایەکم تووش هات ئەوا سواری کەشتی ئارام گرتن دەبم، هەر کاتێك نیعمەت‌و بەخششێك ڕووی تێکردم ئەوا سواری کەشتی شوکرو سوپاس گوزاری دەبم، ئەگەر شتێکی نەخوازراوم تووش هات ئەوا سواری کەشتی ڕەزامەندی دەبم، کابرا خۆی سوار چاك بوو، بەڵام کە گوێی لەو قسانە بوو گوتی: بڕۆ ئەی ئیبراهیم لەسەر پێت‌و بەرەکەتی خوا تۆ بەکەشتی‌و منیش بەپیادە[3].

## ٧٢٥. ترسان لە سزای خوا

عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزیدی کوڕی جابر دەڵێ: بە یەزیدی کوڕی مورسەم گوت: ئەوە بۆچی نابینم چاوەکانت وشك بێتەوە؟

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ٢٥- ٢٦.

[2]) صور ومواقف من حياة الأنبياء والصحبة والتابعين- ج٢- ص٣٨٠.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ج٢- ص٣٨٠.

ئەویش گوتی: بۆچی ئەو پرسیارە دەکەی؟

عەبدوڕەحمان: بۆ ئەوە پرسیار دەکەم بەڵکو لە وەڵامەکەت سوودێك ببینم.

یەزید: ئەی براکەم خوای گەورە وەعدەی داوە کە ئەگەر بێ فەرمانی بکەم، لە ئاگرێکدا بەندم بکات هەمیشە ئەو هەڕەشەیەی خوای گەورە لەبەر چاومە تەنانەت ئەو کاتانەی لەنێو ماڵو منداڵیشم دانیشتووم[1].

### ٧٢٦. دڵسۆزبە لە کارەکانت

دارتاشێك لە کۆمپانیایەك کاری دەکرد پاش سی ساڵ لەکار کردن داوای لە بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە کرد کە خانەنشینی بکا، بەڕێوەبەرەکە زۆر تکای لێکرد کە بمێنێتەوە، بەڵام کابرای دارتاش ڕازی نەبوو، بەڕێوەبەرەکە گوتی: بەڵام من داواکاریەکم هەیە، دەبێ بۆم جێبەجێ بکەی، ئەویش گوتی: باشە.

بەڕێوەبەرەکە گوتی: پارچە زەویەکم هەیە دەمەوێ لەسەر ئەو پارچە زەویە خانوویێکم بۆ دروست بکەی لەدار، هەرچەندی خەرجی دروستکردنەکەیەتی من دەیدەم، کابرای دارتاش دەستی کرد بە دروست کردنی خانووەکە بەڵام هەر لەکۆڵ خۆی دەکردەوە، هیچ بایەخی پێ نەدەدا، کە خانووەکە تەواو بوو هەواڵی دا بەبەڕێوەبەرەکە، ئەویش لەگەڵ کارمەندانی کۆمپانیاکە بەیەکەوە هاتن بۆ ئەوەی سەیری خانووەکە بکەن، کاتێ هەموویان کۆبوونەوە لەوێ، بەڕێوەبەرەکە گوتی: بەبۆنەی خانەنشین کردنیەوە بڕیارمان دا ئەو خانووە وەك خەڵاتو ڕێزێك پێی ببەخشین (مەبەستی کابرای دارتاش بوو)، کابرای دارتاش واقی وڕما وە زۆر پەشیمان بۆوە لەوەی کە بەبێ بایەخی ئەو خانووەی دروست کردووە[2].

### ٧٢٧. سەخاوەت

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] زەردەخەنەی هیوا- ل ٤٢.

پیاوێکی خەڵکی مەدینە زۆر حەزی بە نان دان بوو، بۆ ئەو مەبەستە لە مانگی ڕەمەزاناندا سفرەیەکی دوورو درێژی لە مزگەوتی مەدینە ڕادەخست بۆ ڕۆژووەوانان، لە غەیری ڕەمەزانیشدا لە ڕۆژانی دوشەممەو پێنج شەممان ئەو کارەی دەکرد، کاتێ وەفاتی کرد ئامۆزایەکەی دەڵێ: لەسەر قەبران گوێم لە پیاوێك بوو دەیگوت: خوایە ڕێزی لێبگرە وەك چۆن ڕێزی لە ئێمە گرت، دەڵێ منیش گوتم: خوایە تۆ کەریمی ئەو پیاوەش خاوەن کەرەم بوو، لێی خۆش بە، خزمەتی خەڵکی کردووەو نانی پێداون، پاش سێ شەو خەونم پێوە بینی گوتم: حاڵت چۆنە؟ گوتی: زۆر باشم.

گوتم: بەچی؟

گوتی: بە دوعاکەی تۆو بەو نان دانەی کە کردبووم بە پیشە[1].

### ٧٢٨. دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی

م. عەمر خالید دەڵێ: ئافرەتێك لە وڵاتی بەریتانیا گیری خواردبوو بەهۆی کوڕە گەورەکەی بەهۆی تلیاك کێشان، بەتەمابوو لەماڵەوە دەری بکات، نەوەك سەر لەدوو براکەی تریشی بشێوێنێ، پیاوێکی عاقڵ بە دایکی گوت: نەکەی کاری وا بکەی لە ماڵەوە دەری بکەی، بەڵکو لەجیاتی ئەمە خۆشەویستی بۆ دەربڕەو ئامۆژگاری بکە، ئافرەتەکە زۆر لەخۆی دەکاتو بە کوڕەکەی دەڵێ: کوڕم هەرچی بیت من تۆم خۆش دەوێ، تۆ جەرگی منیت، ئەو وشانە زۆر کاریگەری دەبێ لەسەر کوڕەکەیو باوەش دەکات بە دایکیدا، لەمەوە بڕیار دەدات واز لەو کارە بهێنێ ڕێگای چارەسەر بگرێتە بەر[2].

### ٧٢٩. هۆکارەکانی نەمانی شەرمو عەقڵو بەزەیی

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ئادەم سەلامی خوای لێبێ لەناکاو سێ پەیکەری نورانیو جوانی بینی لەلای ڕاستی، لەلای چەپیشی سێ پەیکەری ڕەشو ناشیرینی بینی، سەیری پەیکەرەکانی لای ڕاستی کرد پێی گوتن: ئێوە کێن؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٤.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٩.

یەکەمیان گوتی: من عەقڵم، دووەمیان گوتی: من شەرمم، سێیەمیان گوتی: من بەزەییم، پێغەمبەر ئادەم فەرمووی: شوێنی ئێوە لەکوێیە؟

عەقڵ گوتی: شوێنی من سەری مرۆڤە، شەرم گوتی: شوێنی من چاوی مرۆڤ، بەزەیی گوتی: دڵی مرۆڤ.

ئاوڕی لای چەپی دایەوە گوتی: ئێوە کێن؟

یەکەمیان گوتی: من لووت بەرزییم، دووەمیان گوتی: من تەمماعم، سێیەمیان گوتی: من ئیرەییم (حەسوودی)م.

پێغەمبەر ئادەم فەرمووی شوێنی ئێوە لەکوێیە؟

لووت بەرزیی (تەکەبوور) گوتی: شوێنی من سەری مرۆڤە، ئادەم فەرمووی: عەقڵ دەڵێ: شوێنی من سەری مرۆڤە.

لووت بەرزی گوتی: هەرکات من بچمە سەری مرۆڤ عەقڵ لەوێ نامێنێ.

تەمماع گوتی: شوێنی من نێو چاوی مرۆڤە، ئادەم فەرمووی: شەرم دەڵێ: شوێنی من چاوی مرۆڤە، تەمماع گوتی: هەرکات من بێمە نێو چاو شەرم نامێنێ.

حەسوودی گوتی: شوێنی من دڵی مرۆڤە، ئادەم فەرمووی: ئەی بۆچی بەزەیی دەڵێ: شوێنی من دڵی مرۆڤە؟

حەسوودی گوتی: هەرکات من بچمە دڵی مرۆڤەوە، بەزەیی نامێنێ[1].

**٧٢٠. مرۆڤ ـــــــــــ خۆراکی زەوییە**

لە سەردەمی پێغەمبەر عیسا سەلامی خوای لێبێ دوو پیاو دەبێتە کێشمە کێشمیان لەسەر پارچە زەوییەك خەریك بوو یەکتر بکوژن، کێشەکەیان دەبەنە لای پێغەمبەری عیسا، پێغەمبەر عیسا فەرمووی: بەڵام زەوییەکە شتێکی تر دەڵێ.

دوو پیاوەکە بەسەر سوڕمانەوە گوتیان: چی دەڵێ؟

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل٢٩-٣٠.

فەرمووی: زەویەکە دوڵێ، ئەوان هەردووکیان هی منن ![1].

## ٧٣١. هەژارو دەست کورت ئەو کەسەیە کە قەناعەتی نەبێ

پیاوێـك بـە شـێخ ئیبراهیمـی کـوڕی ئەدهـەمی گـوت: دەمـەوێ ئـەو پارچـە قوماشـەت بدەمێ بۆ ئەوەی جلو بەرگێك بۆخۆت بدووری.

شێخ ئیبراهیم گوتی: ئەگەر هەژار نەبیت لێت وەردەگرم، بـەڵام ئەگـەر هـەژار بـی لێـت وەرناگرم.

پیاوەکە گوتی: من پیاوێکی دەوڵەمەندو بێنیازم، دوو هەزار دینارم هەیە.

شێخ ئیبراهیم پێی گوت: حەز دەکەی ببی بە چوار هەزار دینار؟

پیاوەکە گوتی: بەڵێ.

شێخ ئیبراهیم گوتی: ها بگرە پارچە قوماشەکەت تۆ پیاوێکی هەژارو هەژاری[2].

## ٧٣٢. یەقینی مامۆستا مەلا عەبدولەجیدی گڕاوی

ڕۆژێکیان دەمەو نیوەڕۆ مامۆستا دوو میوانی دێنەماڵی، خێزانی دەسـتو بـرد دەکـاتو نانیان بۆ حازر دەکا، نزیك دەبنەوە لە کاتی نان خواردن کۆمەڵێك کەسـی تـر دێـن ژمارەیـان دەبێتـە (١٥) کـەس، کوڕەکـەی دێتـە لایو بـەگوێی مامۆسـتا دەچـرپێنێو دەڵێ: بابـە، دایکـم سەری لێ شێواوەو نازانێ چی بکا شیوەکە هەر بایی دوو نەفەرە.

مامۆسـتا دەڵـێ: بـڕۆ بـە دایکـت بڵـێ: کـە کـەوگیری لێـدا بـا (بسـم الله) بکـا شـیوەکە بەرەکەتی دەکەوتێ.

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ٤٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٦.

کوڕەکەی دەڵێ: بەخوا نەك بسم الله هەموو قورئانیشی لەسەر بخوێنێ خواردنەکە بەش ناکا.

مامۆستا دەڵێ: هەر نەفام ئەتو تێناگەی، بڕۆ وا بڵێ حەقت نەبی.

ئنجا خێزانەکەی بسم الله دەکاتو بەبەرەکەتی خوا بەشی هەر (١٥) میوانەکە دەکاتو هەموویان تێر دەخۆن[١].

## ٧٣٣. هەڵوێستی زانایان دەبێ وابێ

د. عەلی ئیحسان دەڵێ: لە ساڵی هەشتاکاندا ڕۆژێکیان وەزیری ئەوقاف دێتە شەقڵاوە لە یەکێ لە ئوتێلەکانی ئەو شارۆچکەیە دادەبەزێ، دەنێرێ بەشوێن مەلاکان، زۆربەی مەلاکان دەچن، بەڵام مەلایەك ناچێ،زیر پاشان خۆی دەچێ بۆ سەردانی مامۆستا، گلەیی ئەوەی لێدەکا کە بۆچی لەگەڵ مامۆستاکاندا نەهاتووە بۆ لای لە ئوتێلەکە پاش ئەوەی کە لەدوی ناردووە.

مامۆستاش بە وەزیر دەڵێ: تۆ وەزیری ئەوقافی نەك وەزیری گەشتو گوزار لەو هەموو مزگەوتە بۆچی دەچی بۆ هوتێل کە شەڕابی لێ دەخورێتەوە، ئاخر چۆن دەبێ ئەو هەموو مەلایە بە جوببەو مێزەرەوە بێنە شوێنێك کە شەڕابی لێدەخورێتەوە، قوربان شوێنی تۆ مزگەوتە نەك ئوتێل، بەم جۆرە وەزیر دەم کوت دەبێ[٢].

## ٧٣٤. خۆشەویستی خوا

شێخ مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی دەکەوێتە نەخۆشی سەرەمەرگ، یەکێ لە هاوڕێکانی دێتە سەردانیو دەڵێ: خوای گەورە شیفات بدا، مەولانا دەڵێ: خوا شیفای تۆش بدا، دەبێ لابردنی پەردە لەنێوان دوو خۆشەویست دەبێ چ زیانێکی تێدا بێ[٣].

## ٧٣٥. خۆشویستنی مردن لەلایەن عاریفانەوە

---

[١]) دۆستانی خوا- ل ١٠٠.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٩- ١٠٠.

[٣]) سلاو لە فریشتەکان- ل ٣٦.

پیاو باشێك لە سەرەمەرگدا پێدەکەنی، گوتیان بەچی پێدەکەنی؟

گوتی: لەخۆشی ئەوەی دەگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگارم کە چاوەڕوانی خێری لێدەکرێ، ڕزگارم دەبێ لەو کەسانەی کە دڵنیا نیم لە شەڕیان ![1].

۷۳٦. خۆ ئامادە کردن بۆ ڕۆژی قیامەت

فوزەیلی کوڕی عیاز پیاوێکی پیری بینی لێی پرسی تەمەنت چەندە؟

پیاوە پیرەکە گوتی: تەمەنم شەست ساڵە.

فوزەیل گوتی: دەزانی تۆ شەست ساڵە بەرەو لای خوای گەورە نزیك دەبیتەوە، نزیکە بەیەکجاری بگەی بە دیداری خوای گەورە.

پیاوەکە گوتی: {إنّا لِله وإنّا إليْهِ راجعون}.

فوزەیل گوتی: دەزانی مانای ئەو ڕستە چییە؟

پیاوەکە گوتی: یەعنی هەموومان هی خواینو بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە.

فوزەیل گوتی: هەرکەس بزانێ کە بەندەی خوایەو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا دەشزانێ کە کاتێکی هەیە بۆ حەشرو حیساب، ئەبێ بشزانێ کە پرسیاری لێ دەکرێ لە وردو درشت.

پیاوە پیرەکە گوتی: ڕەحمەتی خوات لێبێ ئەی چارە چییە؟

فوزەیل گوتی: ئاسانە!، ئەوەندەی لە تەمەنت ماوە لە خوا بترسە، خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووت خۆش دەبێ، لەو تەمەنەی کە ماوتە دەتپارێزێ لە گوناح[2].

۷۳۷. گەیاندنی خزمایەتی

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٤.

[2]) صور ومواقف- ج١- ص ٥٣٧.

ئەبی بەردە دەڵێ: هاتمە شاری مەدینە، عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ هاتە لامو سەردانی کردم، گوتی: دەزانی بۆچی هاتوومەتە لات؟

منیش گوتم: نەخێر.

گوتی: چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێ حەز دەکات سەردانی باوکی بکات لە گۆڕەکەیدا، با سەردانی برادەرەکانی بکات لەدوای باوکی، لەنێوان باوکی منو باوکی تۆ برادەرایەتی هەبوو، بۆیە منیش دەمەوێ ئەو سیلەی ڕەحمە جێ بەجێ بکەم[1].

## ٧٣٨. چاکە کردن لە پێناو خوا

ڕۆژێك لە بازاڕی کۆیلە فرۆشانی شاری بەغدا ئاگرێکی زۆر گەورە دەکەوێتەوە، خەڵکێکی زۆر بەو ئاگرە دەسووتێن، لە یەکێ لە دوکانەکان دوو غولامی ڕۆمی گیر دەخۆن ناتوانن بێنە دەرەوە لەبەر ئەوەی ئاگر دەوریان دەدا، خاوەنەکەیان لە دەرەوە هاواری کرد ئەوەی ئەو دوو غولامەم بۆ ئازاد بکا هەزار دیناری پێ دەدەم، بەڵام کەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد، لە ناکاو پیاوێك کە ناوی ئەبو لحەسەنی ڕۆمی بوو، چاوی بەو دوو غولامە بەستەزمانە دەکەوێ دەڵێ: بسم الله الرحمن الرحیم، خۆی دەکا بە دوکانەکەو زۆر بەبوێری هەردوو غولامەکە ڕزگار دەکا، خاوەنەکانیان هەزار دینارەکەی دەرێنێو دەڵێ: کاکە گیان ئەوە پاداشتی ئەو فیداکارییەت کە ئەو دوو غولامەت ڕزگار کرد.

ئەبولحەسەنی ڕۆمی گوتی: ئەو پارەیە لابە شوکری خوای گەورە بکە کە ڕزگاری کردن، ئەو جورئەتەی کە خوای گەورە بەمنی داوە بۆ ئەو کارانە بەهۆی ئەوە پێیداوم کە ئەو پارە وەرناگرم لەبریدا، بەڵکو بۆ خوای دەکەم[2].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب٢- ل ٢٧

[2]) ڕەوشت بەرزی- ل ٤٧- ٤٨.

### ۷۳۹. دوعای خێر کردن بۆ مسوڵمانان

ڕەبیعی پیاوچاك ئەسپێکی بە سی هەزار بۆ غەزا کردن کڕی ، ڕۆژێکیان ئەسپەکەی بەستابۆوە نوێژی دەکرد، دز هاتن بەبەردەمیەوە ئەسپەکەیان لێکردەوەو دزییان، کە نوێژەکەی تەواو کرد خزمەتکارەکەی هات بۆ ئەوەی ئەسپەکە ببا بیلەوەڕێنێ، بەڵام نەمابوو، بە ڕەبیعی گوت: دیارە ئەسپەکەیان دزیوە، ڕەبیع گوتی: من لەناو نوێژو لەکاتی موناجات بووم، خوایەگیان ئەو کەسەی ئەسپەکەی دزیوم ئەگەر دەوڵەمەندە با دیاری بێ بۆی، ئەگەر هەژاریشە بەهۆی ئەو ئەسپە دەوڵەمەندی بکە !![1]

### ۷٤۰. ڕەوشت بەرزی

برادەرێك لە شوێنێك کار دەکات کرێکارێکی هیندۆسی لای کار دەکات، ڕۆژێ کابرا بە پیاوە هیندۆسییەکە دەڵێ: تۆ نوێژ ناکەی؟

هیندۆسەکە دەڵێ: نەخێر من هیندۆسیم ئێمە نوێژ ناکەین.

ئەو برادەرە بە ڕەوشتێکی جوان زۆر ڕێز لەو هیندۆسیە دەگرێ، ڕۆژێکیان بۆنێکی خۆشی پێ دەبێ بۆنەکە دەردەهێنێو هەندێکی لێدەدا، پاشان بەدیاری پێی دەدا.

کرێکارە هیندۆسییەکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی: تۆ زۆر گرنگی بەمن دەدەی کەچی خەڵك سوکایەتیم پێ دەکا.

پیاوە خاوەن کارەکە دەڵێ: من دینەکەم فەرمانم پێ دەکا ڕێز لە هەژارو دەوڵەمەندو کافرو مسوڵمان بگرم.

هیندۆسەکە بەم ڕەفتارە دەبێتە مسوڵمانو شایەتمان دێنێ، ئەوەیە ڕەوشتی بەرز، بەڕاستی بەهۆی ڕەفتاری جوانەوە ئیسلامەتی بڵاو دەبێتەوە، قەشەیەك لە ولاتی مصر کە بیست ساڵە مسوڵمان بووە، کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانێکی زۆر سەرنج ڕاکێش بەناوی (بڵاوبوونەوەی ئیسلام بە شمشێری ڕەوشت)[2].

---

[1]) صور ومواقف من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين- ج٢- ص ٦٥.

[2]) زەردەخەنەی هیوا- لا ٢٩- ٣٠.

**٧٤١. تا حاڵی نەبووی لە شتێك بڕیار مەدە**

م. عـەمرِ خالیـد دەڵـێ: بـرادەرێکم هـەبوو بـەناوی حوسـین، ڕۆژێکیـان سـواری شەمەندەفەرێك دەبێ لە قاهیرەوە بۆ ئەسکەندەریە، پیاوێك‌و کوڕێکی هـەرزەکار کـە بـاب‌و کـوڕن لـە نزیکیـەوە دادەنیشـن، کـوڕە هەرزەکارەکـە هـەر دەم نـا دەم، دەڵێ: باوکـە سـەیرکە درەختە، باوکە سـەیرکە هـەورە باوکـە سـەیرکە ئۆتۆمبێلـە، باوکیشـی هـەموو جـار ماچێکی لێدەکردو باوەشی پێدا دەکرد، پاشان کوڕە هەرزەکارەکە خەوی لێکـەوت، حوسـێنی هاوڕێشـم دەڵێ: بەباوکیم گوت: من دکتۆرێکی دەروونی باش پێدەزانم ئەگـەر دەتـەوێ ناونیشـانەکەیت پێ دەدەم.

باوکی منداڵەکە گوتی: کوڕەکەم شێت نییە، ئێستا لـە نەخۆشخانە دێینـەوە چاوەکانی کوێر بوون، نەشتەرگەری بۆ کراوەو تازە چاکبۆتەوە[١].

**٧٤٢. حیکمەت بەکار هێنان لە بڕیارداندا**

دەگێڕنـەوە پادشـایەك هـەبوو لـە وڵاتـی فەڕەنسـا، بـۆ ئـەوەی یەکسانی دروسـت کـا لـە نێـوان خەڵکیـدا بڕیاریـدا نـابێ هـیچ ئافرەتێـك زێـڕو زیـو بـەخۆی وەبکـا، هەرچـی ئـافرەت هەبوو بەو هۆیەوە دەسـتیان کـرد بـە خۆپێشـاندان دژی ئـەو بڕیـارە، کـەس بڕیارەکـەی جێ بەجێ نەکرد، پادشا زۆر دڵی توند بوو، ڕاوێـژی بـە وەزیرەکـانی کـرد، یـەکێ لـە وەزیرەکـانی گـوتی: پادشـا غـەمبار مەبـە، بڕیـارێکی تـر دەردەکـەین دەڵـێین: ئـەو ئافرەتانـەی ناشـیرینن ئاسایيە زێـڕ بـە خۆیانـەوە بکـەن، ئەوانـەی جـوانن بـا زێـڕ بـەخۆیان وەنەکـەن، بـەم جـۆرە بڕیارەکە جێبەجێ بوو بە ئاسانی هەر ئافرەتێـك کـە دەیویسـت زێـڕ بـەخۆی بکـات یەکسـەر لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئەگەر زێڕ بەخۆم بکـەم دەڵـێن ناشـیرینە، بۆیـە بـەبێ زێـڕ دەچـووە دەرەوە[٢]

**٧٤٢. بەزەیی‌و لێبوردەیی خوا بۆ بەندەکانی**

---

[١]) زەردەخەنەی هیوا- لا ٤١- ٤٢.

[٢]) زەردەخەنەی هیوا- لا ٥٠.

قەتادە ڕەحمەتی خوای لێبێ ڕۆژێکیان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾ طـه، گوتی: خوایە گیان پاکو بێگەردی بۆتۆ ئەمە ئارامیو نەرمو نیانیت بێ بەرامبەر کەسێك کە دەیگوت: ﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾النازعات، دەبێ بەرامبەر ئەوکەسە چەند بەزەییو بەسەبر بی کە ڕۆژانە چەندەها جار دەڵێ: {سُبْحَانَ رَبِّيَ الأعْلى}؟[1].

## ٧٤٤. خەم لە شتێك مەخۆ کە خوا نوسیویەتی

دەگێڕنەوە پیاوێك کوڕێکی مرد، ئەوەندە بۆی گریا تا چاوەکانی کوێر بوون، یەکێ لە هاوڕێکانی هاتە لای و سەرزەنشتی کرد پێی گوت: تۆ کە چاوەکانت کوێر بوونە خەتای خۆتە، چونکە کەسێکی مردووت خۆش دەوێ، ئەگەر کەسێکی زیندووو خۆش بویستایە وات بەسەر نەدەهات[2].

## ٧٤٥. خۆ پەسەندی

خوای گەورە بە پێغەمبەر موسا سەلامی خوای لێبێ دەفەرمووێ: ئەی موسا داوای نهێنییەك لە شەیتان بکە، ئەو فەرمایشتەی خوا لە دڵی موسا دەمێنێ تا ڕۆژێکیان بە ئیبلیس دەگا، داوای نهێنییەکەی لێدەکا، ئیبلیسیش دەڵێ: ئەی موسا ئەو قسەیەت لەبیر بمینێ، وشەی (من) نەڵێی، تاکو وەك منت لێنێ[3].

## ٧٤٦. ئەوەی زمانی پاك بێ ناخیشی پاکە

---

[1]) صور ومواقف من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين- ج٢- ص٩٣.

[2]) موسوعة الخطب المنبرية- في الحقوق الأسلامية- ج١- ص لا ١٠٧.

[3]) ڕەوشت بەرزی- ل ٦٥.

پرسیاریان کرد لە شێخ ئەبو حەسەنی خەرەقانی چۆن بزانین بەرامبەرەکەمان ناخی پاکە، ئەویش گوتی: ئەگەر زمانی پاك بێ ناخیشی پاکە، هەر کەس زمانی پەرشو بلاو بێ ناخیشی پەرشو بلاوە، زانایان گوتوویانە دڵ مەنجەڵەو زمانیش کەوچکە، دڵ دەریایەو زمان قەراغەکەیەتی، کە شەپۆڵ دەدا قەراغەکە هەما ئەوە دەردەکا کە لەدرەریاکەدایە[1].

### ٧٤٧. ئەنجامی ڕاستگۆیی

سالآنێك بەر لەدایك بوونی مەسیح، لە ئیمپڕاتۆریەتی چین شازادەی ئەو ولاتە بڕیاریدا ژیانی هاوسەری پێك بێنێ، لەگەڵ پیاوێکی ژیر ڕاوێژی کرد، پاشان بڕیاریدا هەموو کچانی ناوچەکە بانگهێشت بکا، بۆ ئەوەی یەکێکیان هەڵبژێرێ، کاتێك خزمەتکارەکەی کۆشك ئەمەی بیست غەمبار بوو، چونکە کچەکەی عەشقی شازادە بوو حەزی دەکرد ببێتە خێزانی شازادە، کچەکە بە دایکی گوت: منیش دەچم بۆ ئەو میواندارییە.

دایکی گوتی: تۆ نە بەختت هەیە، نە جوانیی.

کچەکەی گوتی: دەزانم هەرگیز من هەڵنابژێرێ، بەلام دەرفەتێکە هەرچی نەبێ جارێك لە نزیکەوە دەیبینم.

ڕۆژی دیاری کراو هات، شازادە بە هەریەك لەو کچانەی گوت:هەریەکەو تۆوێکتان پێ دەدەم ئەوەی بتوانێت لە ماوەی شەش مانگدا جوانترین گوڵم بۆ بێنێ دەبێت بە شاژنی داهاتووی من.

کچی خزمەتکارەکە تۆوەکەی وەرگرت و هێنایەوە لە نێو گوڵدانێك چاندی، پاش تێپەڕ بوونی سێ مانگ هیچ گوڵێك نەڕوا، کچەکە ڕاوێژی بە چەندین باخەوان کرد ئەوانیش فێریان کرد کە چۆن گوڵ پەروەردە دەکرێ، بەلام بێ ئەنجام بوو هیچ گوڵێك نەڕوا.

---

ئەو ڕۆژە هات کە دەبوایە بچنەوە بۆ خزمەتی شازادە، کچەکە بە گوڵدانە بێ گوڵەکەیەوە هات، چاوەڕێ بوو، کچەکانی تر هەریەکەو گوڵدانەکانیان پڕ بوو لە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگی جوان، شازادە هات بە وردی سەیری یەکە یەکەی گوڵدانەکانی دەکرد، لە کۆتاییدا بڕیاریدا کچی خزمەتکارەکە هاوسەری ئایندەی ئەو دەبێ.

هەموو کچەکانی تر نارەزاییان پێشاندا بەوەی کە ئەو کچە هیچ گوڵێك لە گوڵدانەکەیدا نەڕواوە، چۆن دەبێ ئەوان هەڵنەبژێررێن، ئەو هەڵبژێررێ.

شازادە گوتی: ئەو کچەم بۆیە هەڵبژارد چونکە گوڵی ڕاستگۆیی بەرهەم هێناوە، ئەو تۆوەی من دام بە ئێوە نەزۆك بوو مەحاڵ بوو ببێتە گوڵ، تەنیا کچی ئەو ئافرەتە خزمەتکارە ڕاستگۆ بوو[1].

٧٤٨. **خەم مەخۆ**

مارتن لۆتەر دامەزرێنەری مەزهەبی پرۆتستانت لە دینی مەسیحی ڕووبەڕووی سەختیو نارەحەتییەکی زۆر بوویەوە، خێزانەکەی کە بینی پیاوەکەی بەو شێوەیە نارەحەتە هەستا جلی ڕەشی پۆشی بەرامبەر پیاوەکەی وەستا.

مارتن لۆتەر پرسی بۆچی ڕەشت پۆشیوە؟

هاوسەرەکەی بە هێمنییەوە گوتی: نازانی کە ئەو مردووە؟

مارتن: کێ مردووە؟

هاوسەرەکەی: خوا.

لۆتەر: بەسەر سوڕمانەوە پرسی چۆن دەتوانی قسەی وا بکەی؟

خێزانەکەی؟ باشە ئەگەر خوا نەمردووە بۆچی وا نائومێدی؟

لۆتەر یەکسەر بۆخۆی دا چوویەوەو زەردەخەنەیك لەسەر لێوانی نیشت گوتی: بەڵێ نائومێدی پیشەی شەیتانە[1].

---

[1]) بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری- لا١٥٤- ١٥٥.

### ٧٤٩. لێبوردن لە تاوانبار

یەکێك لە سەربازەکانی ناپلیۆن کەسێکی کوشت، لە ئەنجامدا سزای مەرگیان بەسەردا سەپاند، ڕۆژی ئەوە هات کە لە سێدارەی بدەن، دایکی سەربازەکە دەپاڕایەوە کە لە کوڕەکەی خۆش بن.

ناپلیۆن گوتی: خانم کردەوەی کورشەکەی ئێوە شایەنی بەخشین نییە.

دایکی سەربازەکە گوتی: دەزانم ئەگەر هەق بوایەو شایەنی بەخشین بوایە پێویستی بەوە نەدەکرد داوا بکەم ببەخشرێ.

کاتێ ناپلیۆن گوێی لە قسەکانی ئەو ژنە بوو بڕیاریدا سزای لە سێدارە دانەکەی بگۆڕن بۆ دوورخستنەوە[٢].

### ٧٥٠. ترسان لە لێپرسینەوەی خوای گەورە

دەگێڕنەوە ڕۆژێك لە مەجلیسی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود پیاوێك دانیشتبوو گوتی: من حەز ناکەم نامەی کردەوەکان بەدەستی ڕاست وەربگرمەوە، بەڵکو حەز دەکەم لەگەڵ کۆمەڵی (المقربين) بم.

عەبدوڵڵا گوتی: ئێستا لەو مەجلیسەدا کەسی وا هەیە حەز دەکات کە مرد هەر زیندووو نەکرێتەوە[٣] (مەبەستی خۆی بوو).

### ٧٥١. ترسان لەسەرە مەرگ

دەگێڕنەوە سوفیانی سەوریی لەسەر مەرگ گریا پیاوێك پێی گوت: ئەی باوکی عەبدوڵڵا دیارە گوناهت زۆرە، بۆیە وا دەگری؟ سوفیان هەندێك گڵی لەسەر زەویەکە

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٨.

[٢]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١١١.

[٣]) صور ومواقف من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين- ج٢- ١٤٨.

هەڵگرتو فەرمووی: سوێند بەخوا تاوانەکانم لەلای من ئاسانترو کەمترە لەمە بەڵام من لەوە دەترسم بەر لەوەی بمرم لە مسوڵمانێتی هەڵبگەڕێمەوە بەهۆی فیتنەی سەرەمەرگ[1].

## ٧٥١. گریان لە ترسی خوا

کاتێك دایکی شێخ ڕەبیعی کوڕی خەیسەم بینی کەوا کوڕەکەی بەردەوام دەگری‌و شەو خەوی لێناکەوێ گوتی: کوڕم چییە دەڵێی کەسێکت کوشتوە؟

ئەویش گوتی: بەڵێ، ئەی دایکە کەسێکم کوشتوە.

دایکی گوتی: کێیە ئەو کەسەی کوشتوتە؟ من دەچم بۆ لای کەس‌و کاری تا بتبورن، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوان بزانن تۆ حاڵت بەم شێوەیە بێگومانم دەتبورن.

ڕەبیع گوتی: دایکە گیان ئەو کەسەی کوشتومە نەفسی خۆمە[2].

---

[1]) صور ومواقف من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين- ج٢- ص ١٥٤.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ج٢- ص ١٥٤.

### ٧٥٢. دڵی پاك هۆكاری هیدایەتە

ڕۆژێك لە شاری بەغدا سەر خۆشێك بە زەویدا كەوتوبوو هێزی ڕۆیشتنی نەمابوو، شێخ جونەید بەلایدا تێپەری سەرخۆشەكە چاوی بە شێخ كەوت زۆر خۆی پێ شەرمەزار بوو گوتی: یا شێخ خۆم ناخم چۆنە هەر ئەمەش پێشاندەدەم ئاخۆ تۆ كە بەم جۆرە خۆت پیشان دەدەی ناخیشت بەم شێوەیە؟

شێخ گوێی لەم قسەیە بوو چاوی پڕ بوو لە گریان، پیاوە سەر خۆشەكەش بەو دیمەنەی شێخ كاریگەر بوو بووە هۆی گەڕانەوەی بۆلای خوا[1].

### ٧٥٤. خواناسان بە بەزەیین بەرامبەر بە دروست كراوەكانی خوا

ڕۆژێك پیاوێكی خواناس كەوانێكی بە دەستەوە بوو تیرێكی بۆ چۆلەكەیەك هەڵدا بەڵام بەری نەكەوت یەكێك لە هاورێكانی گوتی هەر بژی خەلیفەی ڕۆژگار، كابرای خواناس گوتی خۆ بەری نەكەوت بۆ پێمدا هەڵدەڵێی؟

هاورێكەی گوتی: وام زانی بە ئەنقەست لێت نەداوەو بەزەییت پێدا هاتۆتەوە چونكە تۆ كابرایەكی خواناسی دڵ نەرمی بەرامبەر بەندەكانی خوا.

كابرای خواناس ئەم قسەیەی لەلا سەرنج ڕاكێش بوو بۆیە هەزار درهەمی دایە[2].

### ٧٥٥. یا ناخت پاك بێ وەك جل و بەرگت

جارێك یەكێك لە زاناكان پیاوێكی بینی جل و بەرگێكی زۆر جوانی لەبەر بوو بەڵام قسەی زۆر ناشرینی دەكرد.

زاناكە گوتی: تۆ یەكێكیان هەڵبژێرە یان با قسەكانت وەك جل و بەرگت بێ، یا جل و بەرگت وەك قسەكانت بێ[3].

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ٥٩- ٦٠.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٠.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل٦٠.

### ٧٥٦. سەیری شتە جوانەکانی خەڵك بکە

جارێکیان پێغەمبەر عیسا سەلامی خوای لەسەر بێ لەگەڵ کۆمەڵێك لە شوێن کەوتوانی خۆی بەلای کەلاکی سەگێك تێپەر بوون شوێن کەوتوانی گوتیان: بۆنی چەند ناخۆشە؟

پێغەمبەر عیسا فەرمووی: ددانەکانی چەند جوانە[1]

### ٧٥٧. گرینگی دان بە بەرامبەرەکەت

کاتێك شاری مەککە ڕزگار کرا بیلالی حەبەشی چووە سەر کەعبەو بانگی دا لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ گوێی لە گەنجێك بوو کە ناوی سەلەمەی کوڕی موعەممەر بوو لاسایی بیلالی دەکردەوە کۆمەڵێکیش لەوانەی کە بێ باوەر بوون بە دیارییەوە پێدەکەنین، پێغەمبەر ﷺ بانگی سەلەمەی کرد ئەویش ترسا وای زانی سزای دەدا، بەلام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ دەنگت زۆر خۆشە دەڵێی چی فێری بانگت بکەم؟

سەلەمە گوتی: باشە، پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردو دەستی موبارەکی بە سینگی داهێنا پاشان پێی فەرموو: دەتەوێ ببی بە بانگ بێژی مەککە؟

سەلەمە گوتی: جا ئەم کارە بەمن دەسپێری؟

فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر بەزەیی‌و میهرەبانی پێغەمبەری خوا نەبوایە ئەو گەنجە دنیاو دوارۆژیشی دەفەوتا[2].

### ٧٥٨. وەفا بۆ هاوسەر

پیاوێکی جوتیاری هندی ناوی (دشراش مەنجا)یەو لە دێیەکی هندستان دەژیا، دووری ئەو دێیە لە نزیکترین شار (٧کم)ە، بەلام لەبەر ئەوەی زنجیرە چیایەکی زۆر سەخت لە دەوری ئەو لادێیەیە، تەنها یەك ڕێگا هەیە بۆ گەیشتن بە شار ئەو ڕێگایەش (٧٠کم)ە، ژنی ئەو پیاوە جوتیارە نەخۆش دەکەوێت، پیاوە جوتیارەکە ناتوانێت بیگەیەنێتە شار بۆ

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦١.

[2]) زەردەخەنەی هیوا- لا ٧٧.

نەخۆشخانە، لە بەر ئەو ڕێگا سەختە لەو گوندەدا نەخۆشخانەش نەبوو، ئافرەتەکەی وەفات دەکا ساڵی (١٩٦٠)، ئەو پیاوەش لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەی خۆی زۆر خۆش دەویست،ك وەفایەك بۆی‌و پارمەتی دانی کەسانی تر، بڕیاریدا کە لەو شاخە سەختەدا ڕێگایەك بکاتەوە بۆ گەیشتن بە شار، دەست دەداتە خاکەناس‌و پێمەڕە، خەڵکی وا دەزانن شێت بووە، پاش بیست ساڵ‌و لە ساڵی (١٩٨٠) ڕێگایەك بە پانی (٩م) دەکاتەوە، لە کۆتایی ڕێگاکە دەنووسێ هاوسەری بە وەفای خۆشەویست[1].

٧٥٩. سوود گەیاندن بە مسوڵمانان

دەگێڕنەوە پیاوێکی پیر لە نێو شەمەندەفەرێکدا دەبێ بە نیازی سەفەر کردن، بەهۆی کەمتەرخەمی تاکێك لە پێلاوەکانی لە پەنجەرە دەکەوێتە خوارەوە خەڵکی ناو شەمەندەفەرەکە بۆی پەرۆش دەبن، بەڵام پیاوە پیرەکە ڕاستەوخۆ تاکەکەی تریش فڕێدەداتە خوارەوە خەڵکەکە هەموویان سەریان سوور دەمێنێ.

پیاوە پیرەکە دەڵێ: تاکە پێلاوێك بۆ من هیچ سوودی نییە بۆیە وام کرد لە دەرەوە کەسێك بۆ خۆی هەڵیان گرێتەوەو سوودیان لێ ببینێ[2]

٧٦٠. برایەتی نێوان مسوڵمانان دەبێ وابێ

دەگێڕنەوە مەسروق قەرزێکی زۆری لەسەر دەبێ یەکێك لە برا مسوڵمانەکانیشی کە ناوی خەیسەمە بەهەمان شێوە قەرزێکی زۆری لەسەر بوو، مەسروق بڕێ پارەی دەست دەکەوێ لەبەر خۆیەوە دەڵێ: جارێ کاتی ئەوە ماوە من قەرزەکانی خۆم بدەمەوە بۆیە پارەکەی دا بەو کەسەی کە پارەی دابوو بە خەیسەم واتە قەرزی خەیسەمی پێداچیەوە، لە هەمان کاتدا خەیسەم بڕە پارەیەکی دەست دەکەوێ هەمان کاری مەسروق دوبارە دەکاتەوە، ئەمە لە کاتێکدا هیچ کامیان ئاگاداری ئەوی تریان نەبوو[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٧٩.

[2]) بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری- ل ١٢٢.

[3]) صور و مواقف من حياة الأنبياء والصحابة والتابعين- ج٢- ص٢٣٥.

### ٧٦١. عەشق بۆ ژن و مێرد مایەی سەرکەوتنە

خانمێك لە ماڵ هاتە دەرو لە پێش دەرگای حەوشە تووشی سێ پیرەمێرد بوو، پێی گوتن: ئێوە ناناسم بەس دەزانم برسیتانە تکایە فەرموون با بچینە ژوورەوەو شتێك بخۆن، پیرەمێردەکان پرسیان ئایا مێردەکەت لە ماڵە؟

ئافرەتەکە گوتی: نەخێر لەسەر کارە.

پیرەمێردەکان گوتیان: کەواتە ئێمە ناتوانین بێینە ژوورەوە.

پاش نیوەڕۆ کاتێك مێردی ژنەکە هاتەوە هاوسەرەکەی مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە، مێردەکەی گوتی: ئێستا بڕۆ پێیان بڵێ کە من لە ماڵەوەم بانگیان بکە.

ئافرەتەکە بانگی کردن کە بێنە ژوورەوە، بەڵام ئەوان گوتیان ئێمە هەرسێکمان ناتوانین بەیەکەوە بێینە ژوورەوە.

ئافرەتەکە گوتی: لەبەرچی ناتوانن بەیەکەوە بێنە ژوورەوە؟

یەکێکیان بۆی ڕوون کردەوەو گوتی: من ناوم سامانە هاوڕێکانیشم یەکیان ناوی سەرکەوتنەو ئەی تریشیان ناوی عەشقە، ئێستا بڕۆ بە مێردەکەت بڵێ: با ڕاوێژ بکەین بزانە خوازیاری کامەمانن؟

مێردەکەی زۆر بەمە خۆشحاڵ بوو بە خێزانەکەی گوت: وەرە با بانگی سامان بکەین‌و ماڵەکەمان پڕ بکەین لە پارەو دارایی، ژنەکە گوتی: ئازیزم بۆچی سەرکەوتن بانگهێشت نەکەین، لەو بەینەدا کە کچەکەیان ئاگاداری مەسەلەکە بوو گوتی: واباشتر نییە عەشق بانگهێشت بکەین‌و ماڵەکەمان پڕ بکەین لە عەشق‌و خۆشەویستی؟

کابرا سەیری ژنەکەی کردو گوتی: با بەگوێی کچەکەمان بکەین، بڕۆ عەشق بانگ بکەرە ژوورەوە.

ژنەکە چووە لای پیرەمێردەکان‌و گوتی: کامەتان عەشقە؟ فەرموو با بێتە ژوورەوە.

عوشق هەستاو هەنگاوی نا بۆ ژوورەوە، پاش ئەو دووەکەی تریش هەنگاویان نا بۆ ژوورەوە، ژنەکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی: من تەنیا عەشقم بانگ کردووە، عەشق هاتە

وەڵام و گوتی: ئەگەر سەرکەوتن یان سامانتان بانگ بکردایە ئەوە دووانەکەی ترمان ناچار دەبوون لەدەرەوە بمێننەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی عەشقتان هەڵبژارد ئەوان هەمیشە لەگەڵ مـنن، کەواتـە ئـەو ژن و مێردانـەی بـە عەشـقەوە دەژیـن هەمیشـە سـەرکەوتوون و دەوڵەمەندن[1].

### ٧٦١. چۆن دەبیتە کەسێکی زانا

یەکێ لە قوتابییەکانی سوقڕات، پرسیاری لە سوقڕات کرد کەی زانایی و تێگەیشتنی من تەواو دەبێ؟

سوقڕات گوتی: ئەو کاتە کە پیاهەڵگوتنت لەلا وەکو لۆمەکردن بێ.

قوتابییەکە گوتی: کەی وام لێ دێت؟

سوقڕات گوتی: ئەو کاتەی کە چوار شتت هەبێ، دوو گوێ کە قسەی بەنرخی گوێ لێبێ، دوو گوێش کە کەڕ بێت لە ناست قسەی کەسی نەزان[2].

### ٧٦٢. بەرگەی قسە پێگوتن بگرە

یەکێك لە خواناسان پاڵەوانێکی بینی کە زۆر تووڕەو بێتاقەت بوو گوتی: ئەوە بۆ وای لێهاتووە؟

گوتیان: فلانە کەس جوێنی پێداوە.

گوتی: ئەو پیاوە پاڵەوانە دەتوانێ سەدان کیلۆ هەڵبگرێ بەڵام ناتوانێ بەرگەی قسەیەك بگرێ[3].

---

[1] بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری- ل١٢٩- ١٣٠.

[2] ڕەوشت بەرزی- ل ٦٢.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٣.

**٧٦٤. بەندایەتی خۆت بۆخوا بسەلمێنە بوونی خوا بەبێ بەڵگە سەلماوە**

کەسێك هاتە لای مەولانا شەمسەدینی تەوریزی پێی گوت: مـن دەتـوانم بەبەلگە بیسەلمێنم کە خوای گەورە بوونی هەیە، مەولانا شەمسەددین گوتی: کاکە گیان بوونی خوا سەلمێنراوە، تۆ هەوڵ بدە بەندایەتی خۆت بسەلمێنی بەرامبەر بەخوای گەورە[1].

**٧٦٥. دەرگای بەهەشتو دۆزەخ**

ڕۆژێك جەنگاوەرێك هاتە لای مامۆستایەكو لێی پرسی: مامۆستا دەرگای بەهەشتو دەرگای دۆزەخ کامەیە؟

مامۆستا گوتی: تۆ جەنگاوەری؟

سەربازەکە گوتی: بەڵێ.

مامۆستاکە گوتی: تۆ لە سوالکەر دەچیت.

جەنگاوەرەکە تووڕە بوو شمشێرەکەی هەڵکێشا، بۆ لێدانی مامۆستا، مامۆستاش دەستی کرد بە پێکەنین.

جەنگاوەرەکە گوتی: بەچی پێدەکەنی؟

مامۆستا گوتی: ئەو شمشێر هەڵکێشانەت دەرگای دۆزەخە.

جەنگاوزەرەکە تێگەیشتو شمشێرەکەی هاوێشتەوە نێو کالانەکەی.

مامۆستا گوتی: ئەمەش دەرگای بەهەشتە[2].

**٧٦٦. وازهێنان لە تورە بوون شوێنەواری هەر دەمێنێ**

مێرد منداڵێك هەبوو زۆر تورە دەبوو، باوکی بۆ ئەوەی ئامۆژگاری بکات یەك قوتو بزماری پێدا پێی گوت: کوڕم لەگەڵ هەر تورەبونێك بزمارێك لە دیوار بوکتە.

[1] ڕەوشت بەرزی- ل ٦٧.

[2] بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری- ل ١٤٤.

ڕۆژی یەکەم کوڕەکەی (٣٧) بزماری لەسەر دیواری ماڵەکەیان کوتا، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا هەموو بزمارەکانی تەواو کرد بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەکە کەمتر دەبوویەوە بەمشێوەیە منداڵەکە تێگەیشت کە چۆن بەسەر تورەبوونی خۆیدا زاڵ بێت وای لێهات ئەو مێرد منداڵە تورە نەدەبوو.

ئەو مەسەلەیەی بۆ باوکی پێشنیار کرد کە چۆن بەسەر تورەبوونی خۆی زاڵ بووە ئەمجارە باوکی پێی گوت: هەر ڕۆژەو لە کاتی زاڵ بوونی بەسەر تورەبووندا بزمارێك دەر بهێنێ ئیتر بزمارەکانی هەموو دەرهێنا.

باوکی گوتی: کوڕم سەیری دیوارەکە کە لە ئەنجامدا توانیت بەسەر تورەبونی خۆت زاڵ بی بەڵام سەیری شوێنی بزمارەکان بکە شوێنەواریان هەر دیارە تورەبونیش بەمشێوەیە ئەگەر داوای لێبوردنیش بکەی شوێنەوارەکەی هەر دەمێنێ[1].

### ٧٦٧. چاکە کردن لە دونیادا وون نابێ

ڕۆژێکیان کوڕە جوتیارێك لە دێیەکەیانەوە دەچێ بۆ دێیەکی تر، زۆر برسیو تینوو دەبێ لە دەرگایەك دەدا کچێك دەرگا دەکاتەوە ڕووی نایێ داوای خواردن بکات تەنها داوای ئاو دەکات کچەکەش یەك جامی گەورە شیری بۆ دێنێ ئەمیش تێری لێدەخواتەوەو دەست لە گیرفانی دەنێ دەڵێ: ببورە تەنها یەك جونەیهم پێیە.

کچەکە دەڵێ: من دایکم وای فێر کردووم پارە لەسەر چاکە کردن وەرنەگرم، پاش چەند ساڵ ئەم کوڕە دەخوێنێ دەبێتە دکتۆرێکی ناودار کچەکەش تووشی نەخۆشییەکی قورس دەبێ دکتۆرەکان پشکنینی بۆ دەکەن پێویستی بە نەشتەرگەری دەبێت بە پارەیەکی زۆر پرسو ڕاوێژ بەو دکتۆرە دەکەن ئەمیش دەچێ بۆلای کچەکەو پرسیاری لێدەکاو خەڵکی کوێی؟

کچەکەش دەڵێ: خەڵکی فلانە دێم.

دکتۆرەکە دەڵێ: ئێوە ماڵتان لەسەرەتای دێیەکەیە.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٦- ١٤٧.

کچەکە دەڵێ: بەڵێ، دکتۆرەکە بیری دەکەوێتەوە کە کچەکە هی ئەوماڵەیە کە کاتی خۆی بێ بەرامبەر شیری پێداوە بۆیە نەشتەرگەرییەکەی بۆ دەکاو پسوولەی پارەکە خۆی دەیدات لە ژێرەوەی پسوولەکە بۆ خانەوادەی کچەکە دەنووسێ ئەو ڕۆژەی شیرەکەتان پێدام پارەکەی دراوە[1].

### ٧٦٨. مسوڵمانان دەبێ غەمی یەکترییان بێ

پیاوێک جەڵتە لێی دەدا لە بازاڕ دەیبەن بۆ نەخۆشخانە لە گیرفانی دا ژمارەی تەلەفۆنەکان دەردەهێننو تەلەفۆن دەکەن بۆ لاوێک دەڵێن: باوکت نەساغەو لە نەخۆشخانەیە کوڕەکەش بە پەلە دێو بۆلای پیاوەکە دەست دەخاتە نێو دەستیەوەو ئەو شەوە لەلای دەمێنێتەوە وە زۆر دوعای خێری بۆ دەکات هەرچەندە پیاوەکە بێهۆشەو ئاگای لە دەوروبەری خۆی نییە بۆ بەیانی کوڕە گەنجەکە بە دکتۆرەکان دەڵێ: لەوە دەچێ بەهەڵە تەلەفۆنتان بۆ من کردبێ کە سەیری ژمارەکە دەکەن دەزانن بەهۆی شپرزە بوونیانەوە ژمارەکەیان بە هەڵە لێداوە گوتیان: بە کوڕە گەنجەکە مادام باوکت نەبوو بۆ ئەمشەو لەلای مایەوە.

گەنجەکە گوتی: کە سەیرم کرد دڵم نەهات بەجێی بێڵم[2].

### ٧٦٩. بەکەم سەیری خەڵک مەکە

ژنو پیاوێکی بەتەمەن کە جلو بەرگێکی سادەیان لەبەردا بوو خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شار بوون چوون بۆ لای سکرتێری نووسینگەی سەرۆکی زانکۆی هارفاردی ئەمریکی کە یەکێکە لە زانکۆ دێرینەکانی ئەمریکا، تا چاویان بە سەرۆکی زانکۆکە بکەوێ، لەبەر ئەوەی پێشتر مەوعیدیان وەرنەگرتبوو سکرتێرەکە گوتی: سەرۆک زۆر سەرقاڵەو ڕەنگە نەتوانێ ئاوا زوو بتانبینێ، ژنەکە گوتی: چاوەڕێی دەکەین.

---

[1]) زمردەخەنەی هیوا- ل ٨٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٨٤.

سکرتێرەکە هەر تاخیری دەکردن بۆ ئەوەی بڕۆن، بەڵام ئەوان هەر دانیشتن، تا چاویان بە سەرۆکی زانکۆ کەوت سەرۆکی زانکۆش زۆر بە پشت گوێ خستنەوە پێشوازی لێکردن، زۆر گرنگی پێ نەدا.

ژنەکە گوتی: ئێمە کوڕێکمان لەو زانکۆیە دەیخوێند ساڵی پار بە ڕووداوێکی هاتوچۆ گیانی لەدەستدا، هاتووین بۆ ئەوەی لەزانکۆدا شتێکی بۆ بکەین وەك یادەوەریەك.

سەرۆکی زانکۆش کە سەیری جلو بەرگو شێوەیانی کرد گوتی: ئێمە پەیکەر بۆ هیچ کەس دانانێین لە زانکۆدا.

ژنەکە گوتی: جەنابی سەرۆك تۆ بە هەڵە لە ئێمە گەیشتووی ئێمە دەمانەوێ بینایەکی بۆ دروست بکەین‌و بەناوی ئەوەوە ناوی بنێین.

سەرۆك بە سەرسوڕمانەوە گوتی: دەزانن دروست کردنی بینایەك بۆ زانکۆ چەند پارەی تێدەچێ؟ ئەو بینایەی ئێمە حەوت ملیۆن‌و نیوی تێچووە.

بەڵام ئەوان گوتیان ئێمە سوورین لەسەر دروست کردنی زانکۆیەك بە ناوی کوڕەکەمان، چوون بۆ ویلایەتی کالیفۆڕنیاو زانکۆیەکیان دروست کرد بەناوی کوڕەکەیانەوە کە ناوی (ستانفۆرد) کە یەکێکە لە زانکۆ دێرینەکانی ئەمریکاو لە پلەی (١٥)هەمینە لە ڕیزبەندی جیهانی زانکۆکان تا ئێستا بەناوی کوڕی ئەو خانەوادەیەیە[1].

### ٧٧٠. خوای گەورە ڕزق‌و ڕۆزی دەری هەموو بوونەوەرە

ئەندازیار عوسمان بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕووداوێك هەیە لەم بارەیەوە کە خۆم لە دەمی خاوەنەکەییم بیستووە، لەو کاتەی تەمەنم دوانزە ساڵێك بوو، لە ساڵانی شەست مام حەمە ئەمین ناوێکی بەتەمەن لە شەقامی کاوە لە شاری سلێمانی دەهاتە دووکانی باوکم، خۆی بۆ باوکمی گێڕایەوە کە ڕۆژێکیان قەرزا دەبێ‌و لە ماڵەوە پاڵی دابووە کۆلەکەی هەیوانەکەیان، ماڵیان لە کۆڵانی مەتحەفەکەی سەرکارێز بوو، لە ناکاو لە دەرگا درا کچەکەم دەرگای کردەوە پیاوێك بڕە پارەیەکی پێدا بوو پێی گوتبوو: ئەو پارەیە بدەوە بە باوکت

---

[1]) زەردەخەنەی هیوا- ل ٨٦- ٨٧.

مـن قـەرزاری بـاوکتم، یەکسـەر ڕۆیشـتبوو، مـام حەمـە ئـەمین دەڵێ ئەمـە تـەنها ڕەحـمو میهرەبانی خوا بوو لەگەڵم، ئەگینا کەس قەرزاری من نەبوو، پارەم لای کەس نەبوو[1].

### ٧٧١. ئازاری خێزانەکەت مەدە

مامۆسـتا مـەلا موسای بیـارەیی دەڵێ: لـە سـاڵی ١٩٨٢ لـە دێیـەکی شـارەزوور مـەلا بـووم ڕۆژێکیان ئافرەتێك هات بۆلام پێی گوتم: مێردەکـەم زۆر لـێم دەدات و ئـازارم دەدات لەگـەڵ ئەوەش کە حەجی ماڵی خـوای کـردووە، ئەمشـەو خـەوم بـینی بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە خەونـدا پێـی فـەرمووم: (بـە پیاوەکـەت بڵێ: ئـەمجارەیان لێـت بـدات هـەردوو چاوی کـوێر دەکەین، ئەم دوو ناونیشانەشی پێ بڵێ : یەکـەمیان ڕۆژێکیـان لـە کـاتی حـەج لـە مزگەوتەکەی مندا پاڵی دابوو بـە دینگەیـەك لـە زەتێکی ڕۆحـی پێبەخشـرا، دووەمیـان پێـی بڵێ: کە بـاخێکی کردبـوو لـە شارۆچکەی خورمـاڵ لە باخەکەیـدا تـوتنی کردبـوو وە چـوار چەپك توتنی لە باخی دراوسێکەیان دزی) ئەنجا ئافرەتەکە پێی گوتم: دەترسـم ئـەو خـەوەی بۆ بگێڕمەوە دووبارە لێم بدات، مامۆسـتا مـەلا موسا دەڵێ: بە ئافرەتەکـەم گـوت: مـن پێـی دەڵێم بە ناوی تۆوە پێی ناڵێم، چووم بۆ لای پیاوەکەو پێم گوت: کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی ئـەمجارەیان لـە ژنەکـەی بـدات هـەردوو چـاوی کـوێر دەبێـت بـەم دوو ناونیشانەوە، پیاوەکە لە ترسا یەکسـەر بـە سـوجدەدا کـەوت و چی دیکـە دەسـتی بـۆ خێزانـی نەبرد تا لێی بدات[2].

### ٧٧٢. کەرامەت بریتییە لە کردەوەو دینداری

ڕۆژێکیـان بـە شـێخ ئـەبو سـەعیدی ئـەبول خـەیریان گـوت: فڵانـە کـەس بەسـەر ئـاودا دەڕوا شێخ گوتی: ئاسانە بۆق و مێشیش بەسەر ئاودا دەڕۆن، گوتیان: فڵانـە کـەس لـە هـەوادا دەفڕێ، شێخ گوتی: زەرگەتەو مێشولەش بە هەوادا دەفـڕن، گوتیـان: فڵانـە کـەس بـە سـاتێك لـە شـارێکەوە بـۆ شـارێك دەچـێ، شـێخ گـوتی: شـەیتانیش لـە سـاتێکدا لـە ڕۆژهەڵاتـەوە بـۆ ڕۆژئـاوا دەچـێ، مرۆڤـی خوانـاس و دینـدارو خـاوەن کەرامـەت بـە کەسـێك دەڵـێن کـە لەگـەڵ

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٩- ١٠٠.

[2]) زەردەخەنەی هیوا- ل ١٠١.

خەڵکی هەستیّو دانیشیّو وەکو ئەوان بژیو لەگەڵ گەلەکەی کڕینو فرۆشتن بکاو ساتێکیش لە خوا غافڵ نەبیّ[1].

### ٧٧٣. هۆکاری زیادبووی عەقڵو ژیری

پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەکێ لە هاوەڵانی فەرموو: (ئەگەر تێ بکۆشیتو هەوڵ بدەی بۆ زیاد کردنی عەقڵو ژیریت ئەوا لە خوای پەروەردگار نزیک دەبیتەوە).

هاوەڵەکە فەرمووی بە دایکو باوکەوە بە قوربانت بم چۆن بتوانم عەقڵو ژیریم زیاد بکەم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆت بپارێزە لەوشتانەی کە خوای پەروەردگار قەدەغەی کردووە، هەموو ئەو کارانە ئەنجام بدە کە لەسەی واجب کردووی، ڕەفتاریشت باش بکە عەقڵت زیاد دەکاو وە لە خوای گەورەش نزیک دەبیتەوە[2].

### ٧٧٤. مافی دایکو باوك بە تەواوی نادریّ

پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دایکو باوکم زۆر پیر بوونە، بێهێزو ناتەواون بە جۆرێك بەخێویان دەکەم وەك ئەو کاتەی کە ئەوان بە بچوکی منیان بەخێو دەکرد، ئایا ئێستا مافی ئەوانم داوە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، چونکە ئەو کاتەی تۆ بچوك بووی ئەوان تۆیان بەخێو دەکردو دەپارانەوە کە خوای گەورە پێت بگەیەنیّ، بەڵام ئێستاکە کە تۆ ئەوان بە خێو دەکەی دەپارێیتەوە کە خوای گەورە بۆ خۆی ببیان باتەوە ئەمەیە جیاوازییەکە[3].

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ٧٠.

[2]) بەهارو گوڵزار- ل ٣٦.

[3]) بەهارو گوڵزار- ل ٤١- ٤٢.

### ٧٧٥. بەزەیی هاتنەوە بە گیانداران

جارێکیان شێخ بایەزیدی بەستامی لە سەفەری مەککە دەگەڕایەوە، گەیشتە شاری هەمەدان هەندێ تۆوی گوڵی (عصفر)ی کڕیو خستیە باخەڵیەوە، لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ بەستام، کاتێ سەیری کرد بینی مێرووڵەی زۆری تێکەوتووە، لەبەر خۆیەوە گوتی: من ئەو مێرولانەم لە شوێنی خۆیان ئاوارە کرد، بۆیە بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ شاری هەمەدان لەو شوێنەی کە تۆوەکەی لێ کڕیبوو[1].

### ٧٧٦. پاداشتی نەخۆش

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك لە مسوڵمانان بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: ئەو نەخۆشیە نابینی کە تووشمان هاتووە ئایا چ پاداشتێکمان بۆ هەیە؟

ئەویش فەرمووی: کەفارەت.

ئوبەییەی کوڕی کەعب گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچەندە نەخۆشییەکە کەمیش بێ؟

فەرموی: تەنانەت ئەگەر دڕکێکیش بێ.

ئوبەییە دوعای کرد کە لەو لەرزو تایەی هەمیتی چاك نەبێتەوەهەتا دەمرێ، تەنها نەبێتە ڕێگر لەبەردەم حەجو جیهاد کردنو نوێژی جەماعەتو ڕۆژوو، ئوبەییەی کوڕی کەعب تایەکەی بە شێوەیەك بوو هەر کەس دەستی بەر بکەوتایە هەستی بە گەرمی لاشەی دەکرد، هەتا وەفاتی کرد.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە ئوبەییەی کوڕی کەعب دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پاداشتی لەرزو تا چییە؟

---

٢) ڕەوشت بەرزی- ل ١١٤.

فەرمووی: چاکە بەسەر خاوەنەکەیدا دێنێ، ئوبەییە گوتی: خوایە! داوات لێدەکەم تام لێبێ بەڵام قەدەغەم نەکا لە عیبادەتەکانم[1].

### ٧٧٧. قورئان پێشەوامانە

ئەبولعالیە دەڵێ: پیاوێك بە ئوبەییەی کوڕی کەعبی گوت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش گوتی: قورئانەکەی خوا بکە بە پێشەوای خۆتو ڕازی بە بە قەزاو قەدەرە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو قورئانەی بۆ بەجێ هێشتوون هەواڵی ئێوەو گەلانی دیکەی تێدایە[2].

### ٧٧٨. گومانی باش بە دۆستو خزمان

ژنێك بە مێردەکەی خۆی دەڵێ: ئایا ئەو هاوڕێیانەت نابینی لە کاتی دەوڵەمەندیدا چۆن لە دەورت کۆدەبنەوەو لەکاتی لەکاتی تەنگانەو هەژاریشدا لێت دوور دەکەونەوە؟

مێردەکەی گوتی: ئەوە گەورەییو چاکەی ئەوان دەردەخات، کاتێ دەزانن هەمانە دێن بۆ لامان بۆ ئەوەی چاکەیان لەگەڵدا بکەین، لەکاتی تەنگانەش وازمان لێدەهێنن[3].

### ٧٧٩. ئادابی میوان

حەسەنی کوڕی سەهل توانی بچێتە خزمەت خەلیفە مەئموون، مەئموون پێی گوت: تا چەند ئاشنای مرۆڤایەتی؟

ئەویش گوتی: ناتوانم وەڵام بدەمەوە چونکە نازانم مەبەستت چییە؟

مەئمون گوتی: برۆ بۆ لای عەمری کوڕی مەسعەدبا پەروەردەت بکا.

حەسەن دەڵێ: چووم بۆ لای عەمر بینیم ژمارەیەك کرێکار وا کار دەکەنو ئەمیش لەسەر خشتێك بە دیاریانەوە دانیشتووە، منیش چوومە لایو پێم گوتك: خەلیفە مەئموون منی ناردۆتە لای تۆ بۆ ئەوەی فێری مرۆڤایەتیم بکەی.

---

[1] ئەصحابەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ- ل ٤٩٦.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ٤٩٧.

[3] ڕەوشت بەرزی- ل ١١٧.

ئەویش داوای خشتێکی تری کردو منی لەسەر دانیشاندو قسەی زۆری بۆ کردم.

منیش بەهۆی ئەو مامەڵە ناخۆشەی لەگەڵی کردم لە دڵەوە زۆر لێی زویر بووم،ختێك بانگی یەکێك لە کرێکارەکانی کردو گوتی: بڕۆ بزانە هیچ خواردنێکمان هەیە لە ماڵەوە، کرێکارەکەش هاتەوە هەندێ نانو سێ قاپی بچووکی هێنا لەگەڵ خۆی، قاپێکیان هەندێ سەوزەو ئەوەی تریان هەندێ سرکەو هی سێیەمیان خوێی تێدا بوو، بەیەکەوە دانیشتینو دەستمان کرد بە نان خواردن، پاشان خزمەتکارەکە هەندێ ئاوی هێنا ئێمەش دەستو دەمو چاومان شووشت.

ئنجا عەمر بەمنی گوت: ئەگەر بەتەمای ڕۆیشتنیت ئەوا بڕۆ.

منیش لە شوێنی خۆم هەستام لە کاتێکدا تووڕەیی سەرتاپا گیانمی داگیر کرد، بەڵام بەزۆر خۆم ڕاگرت، کە ڕۆیشتم خواحافیزیم لێ نەکرد، ئەویش گوتی: جارێ هیچ شتێ بۆ مەئموون باس مەکە فلان ڕۆژەش ئەگەر پێت خۆش بوو وەرەوە بۆ لام لە ماڵەوە.

منیش گوتم: کێشە نییە، تا ئەو ڕۆژە هات کە ئەو داینابوو، منیش چوومەوە بۆلای، کاتێك گەیشتمە بەردەرگای ماڵەکەی بانگیان کردمە ژوورەوە باوەشی پێدا گرتمو هاتە پێشوازیم ماچی کردمو بەرێزەوە منی پێش خۆیدا بۆ ژووری میوان، لەشوێنی تایبەتی خۆی منی دانیشاند خۆیشی لە بەرامبەرم دانیشت، ئەوەندە بەخێر هاتنی کرد بەژیانم ئەوەندە ڕێزەم لێ نەگیرابوو، کاتی نان خواردن هات سفرەیان ڕازاندەوە بە جۆرەها خواردنو میوە، کە کاتی گەڕانەوەم هات زێڕو خشڵی زۆری بەگەردام لەگەڵ کۆمەڵێك پۆشاك، دواتر کۆمەڵێك غولامو کەنیزەی خۆی لەگەڵدا ڕەوانە کردم، پێمیان گوت: ئەگەر برایەکت ڕووی کردە ماڵت خۆت مەخەرە زەحمەتەوە قەناعەت بەوە بکە کە لەماڵەوە هەیەن بەڵام ئەگەر ڕۆژێك کەسێکت بە تایبەت بانگهێشت کرد ئەوەندەی لە دەستو توانات هەیە پێشوازی لێبکەو بۆی ئامادە بکە، هەروەکو دیداری تۆ لەگەڵ من یەکەم ڕۆژو مامەڵەی ئەمڕۆی ئێمە لەگەڵ تۆ کە خۆمان بانگهێشتمان کردووی بۆ ئێرە، شێخ حەسەن دەڵێ: ئەو ڕۆژە زانیم واتای مرۆڤایەتیو جوامێری چییە![1].

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ١١٨، ١٢٠.

### ٧٨٠. وەڵام دانەوەی خراپە بەچاکە

باوکێك سێ کوڕی هەبوو دەیویست جێگرەوەی خۆی دەست نیشان بکا، هەموویانی بانگ کردو پرسیاری ئەوەی لێکردن کە هەر کامێکتان باشترین کارو کردەوەی خۆی بڵێ، کە لە ڕۆژانی رابردوو ئەنجامیان داوە، یەکیان گوتی: چەند ڕۆژێك بەر لە ئێستا بازرگانێکی دەوڵەمەند کۆمەڵە خشڵێکی زۆری لای من دانا خۆی نەیدەزانی چەندە ئەگەر چەند دانەیەکیشم لێ ببردایە، بەڵام بەو پەڕی ئەمانەتەوە وەك خۆی دامەوە پێی‌و ئەمانەتەکەم پاراست، باوکی لەسەر ئەو کردەوە جوانە ستایشی کوڕەکەی خۆی کرد، پاشان کوڕی دووەمی هاتە قسە کردن‌و گوتی: چەند ڕۆژێك بەر لە ئێستا بە پێ دەڕۆیشتم منداڵێك لە پێشمەوە دەڕۆیشت، لە پڕ کەتە نێو گۆمە ئاوێکی قووڵەوە، منیش بە خێرایی خۆم بە ناوەکە داداو منداڵەکەم لە مردن رزگار کرد.

نۆرەی کوڕە چووکەکەی هات‌و گوتی: ڕێم کەوتە شاخێکەوە بەقەد پاڵی شاخەکەوە دەڕۆیشتم، پیاوێکم تووش هات لە ڕێگاکە پیاوەکە زۆر لەگەڵم خراپ بوو، زۆر ئازاری دەروونی دام، ماوەیەکی زۆر بە پێ ڕۆیشتین لە ڕێگادا پاش ماندو بوون، لە قەد پاڵی شاخەکە کەمێك پشووماندا پیاوەکە خەوی لێکەوت، لەو کاتەدا دەمتوانی جێی بهێڵم‌و شەوی بەسەر دادەهات ڕەنگە تووشی مەترسی‌و زەحمەتی زۆر دەبوویەوە، بەڵام من بە خراپەی ئەوم نەکردو بانگم کرد بۆ ئەوەی جێ نەمێنێ، باوکی گوتی: کورشم تۆ شایەنی ئەوەی شوێنگرەوەی من بی، چونکە چاکەت لەگەڵ کەسیکدا کردووە کە خراپەی لەگەڵ کردووی[1].

### ٧٨١. تێگەیشتنی ڕاست‌و دروست لە بابەتە ئایینییەکان

جارێك پیاوێك هاتە خزمەت ئیمامی مالیك پێ گوت: قوربان من بولبول فرۆشم، بولبولێکم بەو پیاوە فرۆشتووە کەچی بۆی هێناومەتەوە دەڵێ بولبولەکە ناخوێنێ، منیش لێی تووڕە بووم‌و سێ بە سێ تەڵاقم خواردوە کە بولبولەکە بەردەوام دەخوێنێ، ئایا تەڵاقم کەوتووە؟

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣١.

مالیک گوتی: بەڵێ، تەڵاقەکەت کەوتووە، چونکە هیچ کاتێکو لە هیچ رۆژگارێک نەبووە بولبول شەوو رۆژ بەبەردەوام بخوێنێ، کابرا رەنگی زەرد هەڵگەڕا لە تاو ئەو تەڵاقەی کە خواردبووی تازە ژنەکەی بێوەژنو منداڵەکانی سەرگەردانو ماڵی وێران بوو، بەدڵی ساردەوە لای پێشەوا مالیک هاتە دەرەوە، لەو کاتەدا پێشەوا شافیعی تەمەنی پانزە بۆ شانزە ساڵانێك دەبوو، قوتابی پێشەوا مالیك بوو، کابرای بەم شێوەیە بینی گوتی: بۆچی وا غەمباری؟

کابرا گوتی: من گرفتار بووم مالیك نەیتوانی چارەسەرم بکا، چی بۆتۆ باس بکەم.

شافیعی گوتی: کەسی گرفتار زیانێك ناکا ئەگەر گرفتەکەی لای کەسێکی تر باس بکا، کابرا کێشەکەی خۆیو فەتواکەی مالیکی بۆ گێڕایەوە، شافیعی گوتی: هەرچەندە من قسەیەکم نییە لەسەر قسەکانی مامۆستاکەم، بەڵام وای تێدەگەم کە تەڵاقەکەت نەکەوتبێ، کابرا رووی گەشایەوەو چووە لای مالیكو فەتواکەی شافیعی بۆ گێڕایەوە، مالیکیش گوتی: برۆ بۆمی بانگ بکە بزانین بەڵگەی چییە؟

ئەمە نیشانەی زانایی پێشەوا مالیكو خاکی بوونیەتی، نەیگوت: ئەو منداڵە با بۆخۆی هەر بڵێ، چی دەزانێ، بەڵکو گوتی: با بێ بزانین چ بەڵگەیەکی لایە.

شافیعی گوتی: قوربان چەند رۆژێك بەر لە ئێستا من ئەو فەرموودەیەم لای جەنابت خوێند کە بەم شێوەیە بوو، رۆژێکیان فاتیمەی کچی قەیش هاتە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست ﷺو پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا دوو پیاو هاتوونەتە خوازبێنیم منیش دەمەوێ پرسو راوێژت پێ بکەم، یەکیان ئەبو جەهمەو ئەو تریان موعاویەیە، ئایا شوو بەکامەیان بکەم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَرَجُلٌ تَرِبٌ لاَ مَالَ لَهُ وَأَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَرَجُلٌ ضَرَّابٌ لِلنِّسَاءِ وَلَكِنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ}، واتە: موعاویە پیاوێکی لاتو نەدارە ژنی پێ بەخێو ناکرێ، ئەبو جەهمیش پیاوێکە گۆچانەکەی لەسەر شانی لانابات واتە: پیاوێکی توورەیە هەر رقی هەڵسا گۆچانێکت پێ دەکێشێ، بەڵام وەرە شوو بە ئوسامە بکە، شافیعی گوتی: قوربان ئەگەر سەیری فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین دەفەرموێ: ئەبو

جەهم پیاوێکە گۆچان لەسەر شانی لانابا، مەبەستی ئەوەبووە زۆربەی کات بەم شێوەیە ئەگینا خۆ مانای ئەوە نییە شەوو ڕۆژ گۆچانی لەسەر شانی بێ، دەی ئەو پیاوەش مەبەستی ئەوەیە کە زۆربەی کات بولبولەکەی دەخوێنێ، نەك شەوو ڕۆژ لە خوێندن نەکەوێ مەبەستی ئەوە نەبووە، مالیك کەمێك بێدەنگ بوو پاشان گوتی: ڕاست دەکەی، ئافەرینی لە شافیعی کردو بە پیاوەکەشی گوت: ئەو گەنجە باشتر لە مەسەلەکە گەیشت نەك من[١].

فەتوای ئەبو حەنیفە دەگێڕنەوە کابرایەك بوو بە دەمەقالێیان لەگەڵ خێزانەکەی لەسەر عیبادەتو خوا پەرستی، کابرا تەلاقی خوارد دەبێ عیبادەتێك بکات لەسەر زەویدا کەس ئەو عیبادەتەی نەکردبێ، کابرا ئەو قسەیەی لە دەم دەرچوو زۆر پەشیمان بۆوە، چونکە هەر عیبادەتێك بکات کەسێك هەیە ئەو عیبادەتەی کردبێ، بۆیە زۆر لە زانایانو شەرع زانان گەڕا هەموویان گوتیان: تەلاقەکەت کەوتووە، چونکە هەر عیبادەتێك بکەی لەو هەموو خەڵکەی سەر زەوی ڕێی تێ دەچێ کەسێکی تریش لەو کاتەدا هەمان عیبادەت ئەنجام بدات، کابرا چووە خزمەت پێشەوا ئەبو حەنیفە، پێشەوا ئەبو حەنیفە گوتی: تەلاقەکەت نەکەوتووە، بەکابرای گوت: بچۆ کەعبە لە نیوە شەودا چاودێر بە تا کاتێك چۆڵ دەبێ، تۆ بڕۆ تەواف بکە، ئەو کاتە عیبادەتێکت کردووە کەس ئەو عیبادەتەی نەکردووە، (لەو سەردەمەدا وەکو ئێستا نەبوو بەشەوو بەڕۆژ دەوری کەعبە خەڵکی لێبووبێ)[٢].

### ٧٨٢. زانایی و دانایی

پیاوێك دەچێتە خزمەت پێغەمبەری سولەیمان سەلامی خوای لێبێ، دەڵێ: ئەی سولەیمان من قازم هەیە چەند جارێکە قازم لێ دەدزرێ دڵنیام یەکێ لە دراوسێکان ئەو دزیەم لێدەکا بەڵام نازانم کامیانە، تکایە تۆ چارەیەکم بکە.

---

[١] ئاسودەیی ئیسلام- ب١- ل٥٧٢-٥٧٤.

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب١- ل ٥٧٤.

سولەیمان سەلامی خوای لێبێ پێی دەڵێ: باشە من کارێك دەکەم تا بزانین کێ ئەو دزییە دەکا.

ڕۆژێکیان هەموو دراوسێکانی ئەو پیاوەی لە شوێنێك کۆ کردەوە، پێی گوتن: کەسی وا هەیە لەو کۆڕەدا کە دادوەر دراوسێکەی دەدزێو ئێستاش وا پەڕی قازەکە بەسەریەوەیە.

لەناو کۆڕەکەدا پیاوێك بە ئاسپایی دەستی بۆ سەری خۆی برد، بەو مەبەستەی کە پەڕی قازەکە لە سەری خۆی بکاتەوە.

پێغەمبەری سولەیمان پیاوەکەی دەست نیشان کرد، دوای کۆڕەکە فەرمانی کرد پیاوەکەی بۆ بانگ بکەن، هێنایە لای خۆیو پێی گوت: تۆ قازەکانی دراوسێکەت دەدزی.

پیاوەکەش دانی بە تاوانەکەی خۆی هێنا، بەم شێوەیە بە زیرەکییو دانایی توانی ئەو دزە بدۆزیتەوە بەبێ لێدانو گرتن[1].

### ٧٨٣. نوێژی بەیانی

پێشەوا مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆمان ڕیوایەت دەکا کە ڕۆژێکیان پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ لە نوێژی بەیانیدا چاوی دەگێڕێ بۆ سولەیمانی کوڕی ئەبی حەسمە، بەڵام نایبینێ، بۆ بەیانی پێشەوا عومەر دەچێتە ماڵی سولەیمانو لە دەرگاکەیان دەدا دایکی سولەیمان کە ناوی شیفا بوو دەرگاکەی لی کردەوەو فەرمووی لە پیشەوا عومەر کرد کە دانیشێ، ئەویش گوتی: دانانیشم تەنها بۆ ئەوە هاتووم لە ئەحواڵی سولەیمان بپرسم کە بۆچی لە نوێژی بەیانی دیار نەبوو.

دایکی گوتی: سولەیمان ئەمشەو تا نزیك نوێژی بەیانی هەر خەریکی شەو نوێژ بوو بەرەبەری بەیانی خەوی لێکەوتو نوێژەکەی بە جەماعەت فەوتا.

پێشەوا عومەر گوتی: سوێند بەخوا ئەگەر نوێژی بەیانی بکەم بە جەماعەت پێم خۆشترە لەوەی هەموو شەوەکە زیندووو بکەمەوە نەك جەماعەتی نوێژی بەیانیم بفەوتێ[1].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب١- ل ٥٧٩.

### ٧٨٤. دزی کردن‌و نرخی دزیکەر لە ئیسلام

هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان دەگێڕنەوە کە جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بینی وا خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە لەدەوری لاشەی مردوویەك، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە پێشەوە بینی مردووەکە کوژراوە، فەرمووی: ئەمە بۆچی‌و لەسەرچی کوژراوە؟

ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پیاوە ئەمشەو خۆی گەیاندووەتە ڕانە مەڕەکەی بەنی زەهرە، مەڕێکی گرتووەو دزیویەتی، بەڵام سەگی ڕانە مەڕەکە پێی زانیوەو پەلاماری داوەو وازی لێنەهێناوە تا کوشتوویەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە هاوەڵان‌و کەس‌و کاری کوژراوەکە فەرمووی: ئەو کەسە کە ئاوا کوژراوەو گۆشتی لاشەی پچڕ پچڕ کراوە، خۆی بووەتە هۆی ئەوەی کە ئاوای لێبێ‌و لەناو بچێ، بۆیە کەس بۆی نییە داوای خوێنەکەی بکا، ئەو کەسە سەرپێچی خوای کردو خیانەتی لە براکەی خۆی کرد، بەوەی کە لە نیوە شەودا پەلاماری مەڕەکانی داوەو یەکێکیانی دزیوە، ڕەوشتی وەك هی گورگی هارو برسی لێهاتووە، ئەو سەگە چەند پاروو نانێکی لای خاوەنەکەی خواردووە، سەلماندی کە بەوەفایە بەرامبەر خاوەنەکەی، خیانەت لە خاوەنەکەی ناکا، سەلماندی کە لەو پیاوە دزە بەوەفاترە[٢].

### ٧٨٥. نوێژی بەیانی لای هاوەڵانی بەڕێزخوا لێیان ڕازی بێ

ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ یەکێ بوو لەو هاوەڵانەی کە بەشداریان لە فەتحی شاری توستەردا کرد، ئەو شارە قەڵایەکی زۆر مەحکەمی هەبوو، شەڕێکی زۆر سەخت بوو ژمارەی مسوڵمانان (٣٠٠٠٠) بوو لە بەرامبەردا بێ باوەڕان ژمارەیان (١٥٠٠٠٠) سەرباز بوون، کەمێك پێش نوێژی بەیانی دەرگای قەڵاکە بوویەوە مسوڵمانان لەناو قەڵاکەدا شەڕێکی دەستەو یەخەیان کرد بۆ فەتح کردنی ئەو قەڵایە کاتێ ڕۆژ لە ئاسماندا دەرکەوت‌و بەرز بوویەوە مسوڵمانان سەرکەوتن، ئەنەسی کوڕی مالیك پاش ئەو شەڕە سەختە هەرکاتێك باسی ئەو شەڕە بکرایە یان بیری بکەوتایە، دەستی دەکرد بە گریان

---

[١]) نوری مینبەر- ب٢ ل ٩٧.

[٢]) نوری مینبەر- ب٢- ل ٧٩-٨٠.

لەجیاتی ئەوەی دڵی پێ خۆش بێ، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەبەر سەختیو دژواری شەڕەکە نوێژی بەیانی لەکاتی خۆی نەکردبوو تا ڕۆژهەڵات، بەڕاستی ئەوانە پیاوانێك بوون خوای پەروەردگاریان ناسی بوو، بۆیە ئاوا بە گرنگییەوە لەو شتانەیان دەڕوانی کە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر مسوڵمانان[1].

## ٧٨٦. لەبەر تەنها خراپەیەك چاکەی بەرامبەرەکەت لەبیر مەکە

ڕۆژێکیان جوتیارێك دانیشتبوو یەکێ لە هاوڕێکانی خەیاری نۆبەرەی بۆ هێنا، جوتیارەکە حیسابی ماڵەوەی جیا کردەوەو خەیارێکی دا بەکارەکەرەکەی، کرێکارەکەش دەستی کرد بە خواردنی خەیارەکەی، کابرای جوتیار ئیشتیهای بۆ خەیارەکە چوو بە کرێکارەکەی گوت: قەپاڵێك لەو خیارە بدە بەمنیش، کرێکارەکە کەرتێکی لە خەیارەکە بە جوتیارەکە دا، جوتیارەکە قەپێکی لە خەیارەکەدا زۆر تاڵ بوو، بە کرێکارەکەی گوت: ئەو خەیارە تاڵە چۆن وا دەخۆی؟

کرێکارەکە گوتی: ئەو دەستی خۆشەویستیە کە زۆر شیرینی بەمن داوە تاوەکو ئێستا، چۆن گلەیی تاڵی خەیارێکی بۆ بکەم[2]؟.

## ٧٨٧. وەڵامەکانت بۆ کەسی قسە ڕەق با نەرمو نیان بێ

ڕۆژێك شێخ ئەبو سەعید ئەبولخەیر، لەگەڵ کۆمەڵێك لە قوتابیانی بەڕێگادا دەڕۆیشتن، گەیشتن بە ئاشێك کە باراشی بۆ خەڵکی لێ دەکرد، لەنزیك ئاشەکە کەمێك پشوویان دا، پاشان ئەبو سەعید گوتی: دەزانن ئەو ئاشە دەڵێ چی؟

عەرزیان کرد نەخێر قوربان، دەڵێ چی؟

ئەبو سەعید گوتی: ئەو ئاشە دەڵێ: ڕەوشتی بەرزو پەسند ئەوەیە کە منی تێدام، شتی درشتو ڕەق وەردەگرم، بەڵام شتی وردو نەرم دەدەمەوە، کەوابوو کاتێك کەسێك قسەیەکی

---

[1]) نوری مینبەر- ب٢- ل ١٠٦- ١٠٨.

[2]) ڕەوشت بەرزی- ل ١٢٢.

ڕەق و گەورەت پێ دەڵێ، تۆ لە بەرامبەریدا بەنەرم و نیانی وەڵامی بدەوە بەرامبەر خراپەی ئەو تۆ چاك بە[1].

### ٧٨٨. وازهێنان لە ڕق و کینە

ڕۆژێك مەولانا جەلالەددین بە شوێنێکدا تێدەپەڕێ دەبینێ دوو کەس مشت و مڕیانە، جنێویان بەیەکتر دەدا، یەکێکیان گوتی: وەڵڵاهی هەر قسەیەکم پێ بڵێی سەد قسەت پێ دەڵێمەوە، مەولانا چووە بەرامبەری و گوتی: وەرە هەرچی قسەت پێیە بەمنی بڵێ، هەزار قسەم پێ بڵێ وەڵڵاهی یەك قسەشت پێ ناڵێمەوە، هەردووکیان کە ئەمەیان بیست بێدەنگ بوون و سەریان شۆڕ کردەوەو ئاشت بوونەوە[2].

### ٧٨٩. هەست کردن بەبەرپرسیارەتی

دەگێڕنەوە عومەری کوڕی خەتتاب زۆربەی کات بە دانیشتنەوە خەوی لێدەکەوت، پێیان گوت: بۆچی شەوان تێر ناخەوی، یان بۆچی لە ڕۆژدا چەند کاتژمێرێك لەماڵەوە پشوو نادەی؟

لەوەڵامدا گوتی: (لئن نمت النهار لأضيعن الرعية، ولئن نمت الليل لأضيعن نفسي)، واتە: ئەگەر بەڕۆژ بخەوم ئەوا مافی هاوڵاتیانم دەفەوتێنم، ئەگەر بەشەویش بخەوم ئەوا نەفسی خۆم دەفەوتێنم[3].

### ٧٩٠. سەرکردەی دادپەروەر

عەبدوڵڵای کوڕی پێشەوا عومەر خوا لێیان ڕازی بێ بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: جارێکیان هەندێ وشترم کڕی بۆ ئەوەی بەخێویان بکەم پاشان کە قەڵەو بوون بیانفرۆشمەوە، بۆ ئەوەی قازانجێك بکەم، وشترەکانم کڕی بۆ ئەوەی بیانلەوەڕێنم و قەڵەو

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ١٢٣.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ب١- ل ١٠٢.

[3]) ئاسودەیی ئیسلام- ب١- ل ١٠٢.

بن، بردم بۆ لەوەڕگای گشتی، ماوەیەکی باش لەوێ مانەوە تاوەکو قەڵەو بوون، ئنجا بردمن بۆ بازاڕ لەبەر ئەوەی وشترەکان باش قەڵەو بووبون کڕیاری زۆری لێ کۆبوویەوە، لەو کاتەدا باوکم هات بۆ بازاڕی ئاژەڵ فرۆشان بۆ ئەوەی حاڵو وەزعی خەڵکی بەسەر بکاتەوە، چاوی بەوشترە قەڵەوەکانی من کەوتبوو گوتی: ئەم حوشترانە هی کێن؟

خەڵکەکەش گوتبوویان: هی عەبدوڵڵای کوڕتە.

باوکیشم گوتی: بەخ بەخ کوڕی ئەمیری ئیمانداران!!، بڕۆن بۆمی بانگ بکەن، منیان بانگ کرد منیش چوومە خزمەتی.

باوکم گوتی: عەبدوڵڵا وەرە بۆم باس بکە ئەو وشترە قەڵەوانەت لە کوێ بوو؟

منیش گوتم: ئەو وشترانەم بە پارەیەکی کەم کڕی، لەڕو لاواز بوون، ماوەیەکی زۆرە دەیانبەم بۆ لەوەڕی گشتی لەوێ قەڵەو بوونو جوان بەخێو کران، ئنجا بەتەمام بیانفرۆشم بۆ ئەوەی قازانجێکم دەست کەوێ.

پێشەوا عومەر گوتی: بەڵام لە لەوەڕگای گشتیدا جیاوازی کراوە لە نێوان وشترەکانی تۆو خەڵکی دیکە، گوتوویانە ئەم وشترانە هی عەبدوڵڵایە کوڕی ئەمیری ئیمانداران باشتر بەخێویان کردووەو ئاویان پێ داونو کامە شوێن لەوەڕی خۆش بووە بردراون بۆ ئەو شوێنە، بەهۆی سوود وەرگرتن لەمن باشتر بۆیان لەوەڕاندووی، بۆیە هەر ئێستا وشترەکانت بفرۆشە پێشتر بەچەندت کڕیون پارەکەی خۆت بگێڕەوە پاشان قازانجەکەی بخە نێو بەیتولمالی مسوڵمانان[1].

### ٧٩١. خزمەت کردن بە وڵات

مامۆستایەك دەڵێ: قوتابییەکی کوردی دانیشتووی شاری سولێمانی لە ساڵی پەنجاکاندا دەڕوات بۆ بەریتانیا بەمەبەستی خوێندنی دکتۆرا، ئەو قوتابییە خۆی بەسەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ڕۆژێك لە شاری لەندەن پیاوێکی کەنناسی سەرجادە ئامۆژگارییەکی زۆر کاریگەری کردم کە هەرگیز لەبیرم ناچێ، ئەویش ئەوەبوو ڕۆژێکیان بە جلو بەرگێکی

---

[1]) ئاسودەیی ئیسلام- بـ١- ل ١٠٥ ١٠٦.

جوان‌و قات‌و بۆینباغ‌و پێڵاوی نوێ‌و بۆنی خۆش بەشەقامێكدا دەڕۆیشتم ناگام لەبەردەمی خۆم نەبوو پێم بەتەنەكە خۆڵێكدا كێشاو تەنەكەكە بەربوویەوە، خۆڵەكەی ناوی ڕژا، منیش گوێم نەدایە ڕۆیشتم، لە پشتمەوە یەكێ بانگی كردم ئاوڕم دایەوە بینیم پاككەرەوەی شەقامەكانە، پێی گوتم: خەڵكی ئەم وڵاتەیت؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: بێگومان خەڵك عێراق یان ئێران یان جیهانی سێیەمیت؟

گوتم: بەڵێ، كوردی عێراقم.

گوتی: پلەی خوێندن‌و بڕوانامەت چییە؟

بە كەشخەو فیزەوە گوتم: خەریكی خوێندنی دكتۆرام، ڕۆیشتم.

دیسان بانگی كردم‌و دەستی كرد بە گیرفانی چەند بڕوانامەیەكی دەرهێنا یەكێ لە بڕوانامەكانی ماستەر بوو، پێی گوتم: من ژینگە پارێزو خۆڵ ڕێژم، ئەوەش بڕوانامەكەمە، شانازیش بە كارەكەمەوە دەكەم، بڕۆ سەیری داری میوە بكە هەتا زۆرتر بەردار بێت، دەبێ سەرت بەرەو خوارتر بێ، خۆبەزل نەزانین‌و لەخۆبایی نەبوون بە فیزەوە نەڕۆیشتن لە ئایین‌و فەرهەنگ ئێوەدا بایەخی زۆری پێدراوە، باشە بۆچی ئەوەندە زوو لەخۆتان بایی دەبن‌و خۆتان ون دەكەن؟ منیش زۆر تەریق بوومەوەو شەرمەزار بووم داوای لێبوردنم كرد[1].

## ٧٩٢. ڕەوشتی پیاو چاكان

شەوێكیان شێخ بایەزیدی بەستامی لە گۆڕستان دەگەڕایەوە لە ڕێگادا بینی وا گەنجێك ساز دەژەنێ، شێخیش سەیری گەنجەكەی كردو گوتی: (لا حول ولا قوة إلاّ بالله) گەنجەكە بەس لەبەر ئەوەندە لە شێخ تووڕە بوو سازەكەی كێشا بەسەری شێخدا سازەكەی شكا، شێخ گەڕایەوە مزگەوت بەیانی هەندێ پارەو حەڵوای بەیەكێكدا بۆ نارد، گوتی پێی بڵێن: بایەزید داوای لێبوردنی لێدەكات، ئەو پارەیە بابچێ بۆخۆی سازێكی تری پێ بكڕێتەوە،

---

[1]) ئاسودەیی ئیسلام- ب١- ل ١٢٧- ١٢٩.

حەڵواکەش بخوات بەڵکو تووڕە بوونەکەی نامێنێ، گەنجەکە کە ئەم ڕەوشتە جوانەی شێخی بینی یەکسەر هات بۆ لای و بووە هۆی گەڕانەوەی لە گوناح و تاوان[1].

## ٧٩٣. چەند ئامۆژگارییەکی بەنرخ

لەناو حەوزێکدا چەند گەنجینەیەکیان دۆزیەوە کە هی سەردەمی مەلیك شاپوور بوو، لەناو خەزێنەکەدا لەوحەیەکی زێڕنی تێدا بوو، ئەو ئامۆژگارییانەی لەسەر نووسرابوو:

ئامۆژگاری یەکەم: هەر کەسێك دەرسەکانی ڕۆژگار عاقڵی نەکات، هەر دەرسیکی تر پەروەردەی بکات ڕەنج بە خەسارە.

ئامۆژگاری دووەم: هەر کەسێك عەقڵی بەسەر خووەکانی و سۆزی و لاشەی زاڵ نەبێ لە چوار پێ خراپترە.

ئامۆژگاری سێیەم: هەر پیاوێك کەڵکی بۆ میللەتەکەی خۆی نەبێ بە زیندووو هەژمار ناکرێت و لە مردوو خراپترە.

ئامۆژگاری چوارەم: فاسقێك کە خاوەنی دڵێکی خاکی و خۆبەکەمگر بێ، زۆر چاکترە لە قورئان خوێنێکی زاهید کە لووت بەرز بێ و خۆی پێ لە خەڵکی پەسند تر بێ[2].

## ٧٩٤. ڕێزی مامۆستا

لە ئەفلاتوونیان پرسی بۆچی ئەوەندەی ڕێز لە مامۆستاکەت دەگری ڕێز لە باوکت ناگری، یاخود بۆچی زۆر زیاتر ڕێز لە مامۆستاکەت دەگری وەك لە باوکت؟

لەوەڵامدا گوتی: باوکم منی لە ئاسمانەوە هێنایە سەر زەوی، بەڵام مامۆستاکەم لەسەر زەوی بەرەو ئاسمانم دەبا[3].

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ١٢٤.

[2]) ڕەوشت بەرزی- ل ١٣٦.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣٥.

**٧٩٥. شەرم نەکردن لە فێربوونی زانست**

بە زانا موحەممەدی غەزالیان گوت: چۆن بەم ئاستەی زانست گەیشتووی؟

گوتی: هەرچییەکم نەزانیبا بێ شەرم کردن پرسیارم دەکرد![1].

**٧٩٦. خەڵکی بە خراپ مەزانە**

موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان نامەیەك دەنووسێ بۆ ئەبو دەرداو داوای ئەوەی لێدەکا ناوی هەموو ئەو کەسانەی بۆ بنێرێ کە فاسقن لە دیمەشق، ئەبو دەردا کە نامەکەی پێ گەیشت گوتی: باشە من چۆن بزانم کێ فاسقە لە دیمەشق؟

کوڕەکەی گوتی: من دەیانناسم، دەستی کرد بە نووسینی چەند ناوێك باوکی گوتی: تۆ چوزانی ئەوانە فاسقن مەگەر خۆت یەکێ نەبی لەوان، کەواتە دەبێ یەکەم ناو ناوی خۆتی لێ بنووسی، ئەوەبوو ئەبو دەردا هیچ ناوێکی نەنووسی بۆ موعاویە خوا لێیان ڕازی بێ[2].

**٧٩٧. گوێڕایەڵی هاوەڵان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ**

بەڕائی کوڕی عازب دەڵێ: کاتێ قیبلە لە (بیت المقدس)ەوە گۆڕا بۆ کەعبە کابرایەك لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوو کە نوێژەکە تەواو بوو هەڵسا بۆ ئەوەی ئاگاداری نوێژخوێنان بکاتەوە لە گۆڕینی قیبلە، کۆمەڵێك لە هاوەڵان نوێژیان دەکرد بە کۆمەڵ، ئەویش پێیان گەیشت بۆیە پێی گوتن: من لە خزمەت پێغەمبەری خوا بووم کەمێك بەر لە ئێستا، پێغەمبەری خوا وەحی بۆ هاتووە قیبلە گۆڕاوە لە بیت المقدسەوە بۆ کەعبە، لەو کاتەدا ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە لە ڕکوع بوون بێ چەندو چوون یەکسەر فەرمانەکەیان جێبەجێ کردو لەناو نوێژەکەدا ڕووی خۆیان وەرگێڕایە کەعبەی پیرۆز[3].

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣٦.

[2]) صفحات نيران من حياة السابقين- ص ٢٠١.

[3]) ئاسودەیی ئیسلام- ب١- ل ٢٦٥.

### ٧٩٨. گوێڕایەڵی ئافرەتان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

لە شاری مەدینەدا ژنو پیاوێك هەبوون پیاوەکە ناوی (مغیث) بوو ژنەکەش ناوی (بریرة) بوو، تووڕە بوون کەوتە نێوانیان، ژنەکە زیز بووماڵەکەی بەجێ هێشت، پێغەمبەری خوا پاشی ماوەیەك چوو بۆ لای ئافرەتەکەو پێی فەرموو: خۆزگە دەگەڕایتەوە لای پیاوەکەت، ئافرەتەکە گوتی: فەرمانم پێ دەکەی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من تەنها تکاکارم زۆرم لێت نییە، ئارەزووی خۆت بکە.

ژنەکە لەگەڵ ئەوەی زۆر لە پیاوەکەی بێزار بوو، بڕیاریدا بوو نەچێتەوە بۆلای، بەڵام لەبەر گوێڕایەڵی زۆری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چووەوە بۆ لای[1].

### ٧٩٩. زیرەکیی شێخ حەسەنی بەصری

جارێکیان سەرکردەی ڕۆمەکان کوپێکی بۆ هارونە ڕەشید نارد، پێی گوت: لە هەر شتێکدا شتێکی تێ بکاو بۆی بنێریتەوە، هارونە ڕەشید سەری سوڕما گوتی: چۆن لە هەر شتێکدا شتێکی تێ دەکرێ، هەمووی لەناو یەك کوپەشدا، بۆیە لە شێخ حەسەنی بەصری پرسی، ئەویش پێی گوت: ئاوی تێ بکە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾الأنبیاء، هارونە ڕەشیدیش کوپەکەی پڕ ئاو کردو بۆی ناردەوە[2].

### ٨٠٠. سەرکردەی ڕاستەقینە ئەوەیە کە خاکی بێ نەك خۆی جیا بکاتەوە لە خەڵکەکەی

لە سەردەمەکانی ڕابردوو، پیاوێکی دەشتەکی دەچێتە لای یەکێ لە بەناو خەلیفەکانی ئەو کات، دەبینێ خەڵکی هەموو لەدەورو بەری بەپێ وەستاون یاخود لەسەر زەوی

[1]) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٢٦٧- ٢٦٨.

[2]) ئاسودەیی ئیسلام- ب١- ل ٣١٧.

دانیشتوون، جەنابی خەلیفەش لەسەر تەختو کورسی ڕازاوە دانیشتووە، پیاوە دەشتەکیەکەش لەبەر دەمی وەستاو گوتی: السّلام علیك یا أللہ.

خەلیفە گوتی: من أللہ نیم.

کابرای دەشتەکی گوتی: السّلام علیك یاجبریل.

خەلیفە گوتی: من جبریل نیم.

کابرای دەشتەکی گوتی: کەوابوو لەبەر چی چوویتە ئەو شوێنەو نایەی لەگەڵ خەڵك دابنیشی؟ وەرە خوارەوەو لەگەڵ خەڵکەکە دابنیشە مادەم تۆش ئینسانێکی[1].

### ٨٠١. گاڵتە بەکەس مەکە

زانای تابعی شارەزا لە لێکدانەوەی خەون ئیبنو سیرین ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەکۆتاییەکانی ژیانی تووشی قەرزاریەکی زۆر دەبێ، قەرزاری تەنگی پێ هەڵدەچنێو ژیانی لێ تاڵ دەکات، بۆخۆی لە وتەیەکدا دەڵێ: دەزانم بۆچی وام لێ بەسەرهاتیەو کەوتوومەتە ژێر قەرز، (٤٠) ساڵ بەر لە ئێستا پیاوێك هاتە لام لە موعامەلەدا ئیفلاسی کردبوو، منیش پێم گوت: بڕۆ هەی موفلیس، (دیارە لەبەر تووڕەبوون یان مامەڵەیەکی ناشیرین وای بە پیاوەکە گوتووە)، ئەوا ئەمڕۆ منیش بەچاوی خۆم ئیفلاسی خۆم دەبینم، جا لێرەدا ئەبو سولەیمانی دارانی کە ئەو قسەیەی ئیبنو سیرین دەبیستێ قسەیەکی زۆر جوان دەکاو دەڵێ: ئەو پیاوچاکانە ناهەقیان نییە بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە، گوناهیان هێندە کەم بوو دەیانزانی دووچاری کامە گوناح بوونەتەوە، بەڵام ئێمە گوناهمان هێندە زۆرە، نازانین کامە لە گوناهەکانمان گیرۆدەی کردووین[2].

### ٨٠٢. ڕێزو گەورەیی پێشەوا بوخاری ڕەحمەتی خوای لێبێ

پێشەوا بوخاری لەبارەی صەحیحەکەیەوە، کە بریتییە لە (صحیح البخاری) دەڵێ: لە ماوەی (١٦) ساڵدا نووسیومە، کە پوختەکەی (٦٠٠٠) فەرموودەیە، هیچ فەرموودەیەکم

---

[1]) ڕەوشت بەرزی- ل ١٥٠.

[2]) ئاسودەیی ئیسلام- ب١- ل ٣٨٨.

ئەنووسیوە ئیللا خۆم شۆردووەو نوێژی ئیستیخارەم کردووەو دڵنیا بوومە لەوەی کە صەحیحە ئنجا نووسیومە، دەڵێ: ئەو کتێبەم لە نێوان مینبەرو گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیوە، کاتێ بوخاری وەفاتی کرد، ئەوانەی ئامادەی ناشتنی بوون دەڵێن: بۆنی میسك لە گۆڕەکەی دەهات، تا چەند ڕۆژێکیش ئەو بۆنە بەردەوام بوو، عەبدولواحیدی کوڕی ئادەم دەڵێ: شەوێك بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتم لەخەودا، چەند هاوەڵێك خوا لێیان ڕازی بێ لە خزمەتی دابوون، لە شوێنێکدا وەستابوون، منیش سەلامم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد،لامی دامەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی وەستاویو چاوەڕێی چی دەکەی؟

فەرمووی: چاوەڕوانی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل (بوخاری) دەکەم، پاش چەند ڕۆژێك لە بەدوا داچوونم، بۆم دەرکەوت ڕێك لەو ڕۆژەدا وەفاتی کردووە کەمن خەوەکەم تێدا بینی!![1].

## ٨٠٣. زێدەڕۆیی کردن لە ڕێزگرتنی بەرپرسان

پێشەوا عەلی کوڕی ئەو تالیب کاتێ دێ بۆ عێراقو دەچێتە کوفە، خەڵکی لەبەر خۆشحاڵییان ڕادەکەن لەبەر دەم ولاخەکەی، ئەویش بانگیان دەکاتو لێیان دەپرسێ بۆچی وا دەکەن؟

ئەوانیش دەڵێن ئێمە ئەوە عادەتمانە بەرامبەر گەورە پیاوانو بەرپرسانمان، بەم شێوەیە ڕێزی لێدەگرین، پێشەوا عەلی دەڵێ: ئەو کارە مەکەن، تووشی ڕەنجو مەینەتیتان دەکات لە دونیا، لە دواڕۆژیشدا تووشی عەزابی خوا دەبن، خۆتان لەو کارانە بپارێزن کە سووكو ڕیسواتان دەکا[2].

## ٨٠٤. دینداریی لەسەر خۆت قورس مەکە

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: لە خزمەت عومەری کوڕی خەتتاب بووم خوا لێیان ڕازی بێ، گوێم لێبوو دەیگوت: (نهینا عن التکلف)، واتە: لێمان قەدەغە کراوە کە زۆری لە

[1] ) هەمان سەرچاوەو بەرگ- ل ٤١١.

[2] ) ڕوشت بەرزی- ل ١٥٦.

خۆمان بکەین‌و دین لەسەر خۆمان قورس بکەین، تەنانەت جارێکیان کە قورئانی دەخوێند گەیشتە ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ۝٣١ ﴾ عبس، ویستی پرسیار بکا کە ئایا مانای پڕ بە پێستی وشەی (وأبا) چییە؟ پاشان لەوە ترسا کە ئەمەش بچێتە چوار چێوەی دین لەخۆ قورس کردن، کە شەرع نەهی لێکردووە، پاشان هەر بەخۆی بەخۆی گوت: (ماذا على عمر إذا لم يعرف وأباً؟)، واتە: باشە عومەر چی لەسەرە ئەگەر نەزانێ مانای (وأبا) چییە؟[1].

## ٨٠٥. بەرۆژوو بوون دەبێ فێری هیممەت بەرزی‌و خۆڕاگری‌و پشوو درێژی‌و ڕابەرایەتیمان بکات

بانگخوازی میصری عەمرۆ خالید بۆمان دەگێڕێتەوە جارێکیان لە وڵاتی بەریتانیا لەگەڵ پیاوێکی ئیسپانی یەکترمان ناسی کەوتینە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتری، قسە کردنەکەمان لەسەر مەسەلەی بەرۆژوو بوون بوو، ئەو پیاوە ئیسپانییە نەیدەزانی بەرۆژوبوونی مسوڵمانان چۆنە، بۆیە پرسیاری کرد کە ئایا مسوڵمانان چۆن بەرۆژوو دەبن؟

منیش پێم گوت: لە ساڵێکدا مانگێك بەرۆژوو دەبین هەموو ڕۆژەکانی ئەو مانگە لەدوای یەکتری، هەر لەپێش ڕۆژهەڵاتەوە تاوەکو ڕۆژئاوا خۆمان دەگرینەوە لە خواردن‌و خواردنەوەو جووت بوون.

پیاوە ئیسپانییەکە زۆر سەری سوڕما بە سەرسوڕمانەوە گوتی: ئایا ئەو هەموو کاتژمێرە بەرۆژوو دەبن؟ لە کاتێکدا وڵاتانی ئێوە زۆر گەرمە!!؟

گوتم: بەڵێ، پیاوو ژن‌و گەنج‌و پیرو تەنانەت منداڵانیش زۆر کات بەرۆژوو دەبن لەگەڵ ئەوەی لەسەریان پێویست نییە.

پیاوە ئیسپانییەکە گوتی: ئێوە ئەوەندە هیممەت بەرزن، ئەی بۆچی ئاوا دواکەوتوون، ئێمەی ئیسپانی ئەگەر خاوەنی هیممەتێکی ئاوا بەرز بووینایە ئێستا ڕابەرایەتی هەموو جیهانمان دەکرد.

---

[1]) ئاسودەیی ئیسلام- ب١- ل ٦١١.

منیش بەو قسانەی ئەو زۆر هەستم بە شەرمەزاری کرد، بەڕاستی زۆر ڕاست دەکات، بۆچی ئێمە هەردەم پاشکۆی ولاتانینو چاو لە دەستی خەلکانی ترین لەکاتێکدا خاوەنی مانگی ڕەمەزانین، چونکە دەبێ هەموو کات ئەوانەی هیممەت بەرزن پێشەوای خەلکانی ترین[1].

٨٠٦. ڕێزو پلەو پایەی کەسێك کە ڕازییە بە حوکمی خواو، پاش گوناح کردنی دان بە دێنێ

گەنجێکی خێزان دار لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، دان خۆی دان بەوەدا دەنێ کە زینای کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لێ وەردەگێڕێ، جارێکی تر دەلێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من زینام کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری دەورو بەری خۆی دەکا، پرسیاری ئەو گەنجەی لەخەلکەکە دەکات، خەلکەکەش دەلێن: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی دەربارەی نازانین تەنها خێر نەبێ، (واتە: لەو کەسانە نییە درۆ بکا)، بۆیە چالکی بۆ هەلدەکەنن و ڕەجم دەکرێ تاوەکو گیانی دەردەچێ، پاش وەفات کردنی ئەو گەنجە، پیاوێك دێ پرسیاری لاشەکەی دەکا بە هاوەلان، پیاوەکە باوکی گەنجەکەیە، ئەوانیش دەچنە لای پێغەمبەری خوا ﷺو دەلێن: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوە هاتووە داوای جەنازەی پیسی کوڕەکەی دەکات،

پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان دەفەرموێ: بۆنی لاشەی ئەو گەنجە لای خوا لەبۆنی میسك خۆشترە!، بەلێ، لەبەر ئەوەی ئەو گەنجە بەڕێزە تەسلیم بە فەرمانی خوای گەورە بوو، دانی بە تاوانەکەیدا هێنا، بۆیە هاوەلان هەلسان لەگەل باوکەکەی لاشەکەیان شووشتو کفنو دفنیان کرد[2].

٨٠٧. غەیبەت مەکە

یەکێك لە پیاو چاکان کە ناوی (خالد الربعی)ە دەلێ: جارێکیان کە لە مزگەوت دانیشتبووم کۆمەلێکی لێبوو باسی کەسێکیان دەکردو غەیبەتیان دەکرد، منیش

---

[1]) نوری مینبەر- ب٢- ل ١٣٠- ١٣١.

[2]) ئەم بەسەر هاتە ئەبو داود لە سونەنەکەیدا هێناویەتی.

غەیبەتەکەم پێ بڕین، کەچی دوای ماوەیەك دەستیان کردەوە بە غەیبەت کردنی هەمان کەس، ئەمجارەیان منیش لەگەڵ وان یەك دوو قسەم کرد، شەو لە خەومدا گۆشتی بەرازیان بەزۆر دەرخوارد دەدام، هەرچەند هاوارم دەکردو دەمگوت: من مسوڵمانم گۆشتی بەراز حەرامە، بێ سوود بوو، دوو سێ کەرتە گۆشتی بەرازیان بەزۆر دەرخوارد دام، ماوەی یەك مانگ هەرچیم دەخوارد بۆگەنی ئەو گۆشت بەرازە هەر لەنێو دەمم مابوویەوە![1].

### ٨٠٨. پادشا ئەو کەسەیە کە ئاسوودە بێ

دەگێڕنەوە پادشایەکی دەستەڵاتدار لەوەزیرەکەی پرسی کێ پادشایە؟

وەزیر گوتی: قوربان جەنابت پادشای.

پادشاکە گوتی: نەخێر من پادشا نیم چونکە من لە پادشایەتیم دڵ ئارامو ئاسوودە نەبووم، پادشای ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئێمەی خاوەن دەستەڵات ئێمە ناناسێتو ئێمەش ئەو ناناسین، بۆ خۆی خانوویەکی بچکۆڵانەی هەیە کە تیایدا ئاسوودە دەژیو لە سەرماو گەرما دەیپارێزێ، ژنێکی گوێڕایەڵو ڕێكو پێکی هەیە کە دڵی ڕازی دەکاتو ماندوو بونی دەرەوەی ماڵی لە لاشە دەردەکات، ئەوەندەش ڕۆزی هەیە کە پێی دەژیو قەرزاری خەڵك نابێ، بەڕاستی ئەوەیە پادشاو مەلیکی ڕاستەقینە[2].

### ٨٠٩. هۆکاری باران بارین

لەسەردەمی عەبدوڕەحمانی داخیل کە یەکێك بوو لە دەستەڵاتدارەکانی ئەندەلوس باران نەدەباری، خەڵکی چوونە لای دادوەر وڵات کە ناوی مونزیری کوڕی سەعید بوو، گوتیان: ئەی ئیمام بەڵکو لە خوا بپاڕێیتەوە بەڵکو خوا بەزەیی پێماندا بێتەوەو بارانمان بۆ ببارێنێ، دادوەرش ناردی بەدوای عەبدوڕەحمانی دەخیل پێی گوت: وەرە لەگەڵمان بۆ نوێژە بارانە، کە چوونە دەشتو دەر دەستیان کرد بە دوعاو پاڕانەوە، دادوەر گوتی: ئەی پێشەوای مسوڵمانان نەوچەوانی خۆت لەسەر زەوی دابنێو پێش هەموو کەس تۆ بەزەلیلی لە قاپی خوا بپاڕێوە، چونکە ئەگەر تۆ زەلیلی خۆت بۆ خوا دەربڕی ئەوا خوای گەورە

---

[1]) نوری مینبەر- ب٢- ل ٣٧٠.

[2]) هەمان سەرچاوە- ب١- ل ١٩٣.

بەزەیی پێماندا دێتەوەو دەرگای ڕەحمی خۆیمان بۆ دەکاتەوە، خەلیفە سەری خستە سەر زەوی‌و گوتی: ئەی خوای گەورە ئەگەر لەبەر تاوانەکانی من بارانت گرتۆتەوە لە مسوڵمانان ئەوا من زەلیلی بەردەستی تۆم، خوایە بەزەییت بە منو بەم میللەتەشدا بێتەوەو بارانمان بۆ ببارێنە.

دادوەر گوتی: دەی خەڵکینە بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆتان، دڵنیابن لەوەی ئێستا باران دەبارێ، خەڵکەکە گوتیان: بەچی دەزانی؟

دادوەر گوتی: چونکە ئەگەر گەورەی زەوی مل کەچ بوو ئەوا گەورەی ئاسمان بەزەیی دەنوێنێ، بێگومان خوای گەورە بەزەیی بەویش‌و بە گەلەکەشیدا دێتەوە[1].

### ٨١٠. وەسیەتەکانت بنووسە

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ پێی گوت: فلان کەس مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئێستا لامان نەبوو؟ خۆ کەمێك لەمەو بەر بەیەکەوە بووین.

گوتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەو پیاوەی کەمێك بەر لەئێستا لەگەڵ ئێمەبوو کە لە ئێمە جیا بوویەوە مرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لەو کاتە گونجاوەکە وانەیەك فێری ئوممەتەکەی بکا بۆیە فەرمووی: پاکو بێگەردی بۆ خوا دەڵێی ئەم پیاوە لەسەر تووڕە بوونی خوا مردووە، چونکە وەسیەتی نەکردبوو کە مرد، بێبەش ئەو کەسەیە کە لەوەسیەت نووسین بێ بەشە[2].

### ٨١١. چۆنیەتی وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە سەرچاوەکان

هەموو کارەکانی بانگەوازو گەیاندنی پەیامی خوایی بنیاتانی کۆمەڵگای نوێ لەسەر چەسپاندنی یەکخواپەرستی‌و لەناو بردنی بت پەرستی‌و پەیامداری پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[1]) نوری مینبەر- ب١- ل ٢١٧- ٢١٨.

[2]) هەمان سەرچاوە- ب٢- ل ٦٦٥.

تێرو تەواو بوو، هەروەکو دەنگێکی نهێنی بێتە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ تێی بگەیەنێ کە ئیتر کاری ئەو لەوم دونیایە تەواو بووە، تا ئەوەی موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن لە ساڵ (١٠)ەی کۆچیدا، بە موعازی فەرموو: ئەی موعاز لەوانەیە تۆ ساڵانی تر بێیتەوە من نەبینیەوە، لەوانەیە کە بێیتەوە بۆ ناو مزگەوتەکەی منو بەلای گۆرەکەمدا تێپەڕی، کە موعاز گوێی لەو فەرموودەی خۆشەویست بوو ﷺ دەستی کرد بە گریان، زانی ئەمە خوا حافیزی کۆتایی پێغەمبەری خوایە ﷺ[1].

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاند کە دەیەوێ حەج بکات، خەڵکێکی زۆر لەگەڵیدا چوون بۆ سەفەری حەج کە ژمارەیان لە (١٠٠٠٠٠) کەس زیاتر بوون، لە کاتی حەج کردنەکەی وتارێکی بۆ ئەو خەڵکە زۆرەدا کە لەگەڵی هاتبوون بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج، چەند وتەیەکی پێ گوتن حەقی خۆیەتی بە ئاوی زێڕ بنووسرێنەوەو لەماڵی هەموو مسوڵمانێك هەڵبواسرێ، کە دەرمانی هەموو دەردێکە، باسی هەموو وتارەکەی ناکەین، لەسەرەتای وتارەکە چەند شتێکی بە خەڵکەکە فەرموو: کە ئاماژە بوو بۆ وەفاتی، فەرمووی: خەڵکینە گوێڕایەڵم بن، چونکە نازانم لەوانەیە ساڵێکی تر لەم شوێنە پیرۆزەدا هەرگیز نەتانبینمەوە[2].

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەی بوویەوە ئایەت هاتە خوارەوە خوای گەوە فەرمووی: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب گوێی لەو ئایەتە بوو دەستی کرد بە گریان، گوتیان بۆ دەگری؟

فەرمووی دوای تەواو بوون ئیلا ناتەواوی دێ[3].

لەکاتی (جمرة العقبة)دا پێغەمبەری خوا ﷺ مەناسیکی حەجی خۆتان لەمنەوە وەربگرن، چونکە لەوانەیە ساڵێکی تر من حەج نەکەم.

---

[1]) گولاوی سەرمۆر- ل ٥٤٢.

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٤٤.

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٤٥.

لە ڕۆژەکانی تەشریفدا سورەتی (نصر)ی بۆ هاتە خوار ئیتر زانرا کە هەواڵی خوا حافیزی پێدراوە[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم حەج کردنەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری مسوڵمانان بە دڵێکی کراوەو سینگێکی فراوانەوە ئەنجامدا، چونکە ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردبوو ڕایگەیاند، باری سەرشانی گەیاند، خوای گەورە دوژمنانی پێغەمبەری خوای لەناو بردبوو.

پێغەمبەری خۆشەویست هەستی دەکرد کۆتایی تەمەنی نزیك بووەتەوە، هەندێ ئایەتیش هەن بەتەواوی ئاماژە بە کۆچی پێغەمبەری خوا دەکەن وەك:

١- ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران.

٢- ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الزمر.

لەمانگی صەفەری ساڵی (١١)ەی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد مسوڵمانان خۆیان ئامادە بکەن بۆ غەزای ڕۆم، ئوسامەی کوڕی زەیدیشی دیاری کرد وەك سەرکردەی سوپای مسوڵمانان، کە ئەو کات تەمەنی (١٨) ساڵان بوو، لە ڕۆژی سێیەمی ئامادەکردنی سوپاکە، کە دەکاتە ڕۆژی چوارشەممەی کۆتایی مانگی صەفەر لە ساڵی یانزەی کۆچی، پێغەمبەری خوا، سەر ئێشەو تای تووش هات، لە ڕۆژی پێنج شەممەی یەکەمی (ربیع الأول) بەدەستە موبارەکەکانی خۆی ئاڵای جەنگی بۆ ئوسامە هەڵکرد، فەرمووی: بەناوی خواو لە پێناوی خوا ، لەگەڵ ئەو کەسانەی کوفر بە خوا دەکەن بجەنگن ، بڕۆ ئەو شوێنەی کە باوکتی تێدا شەهید کراوە، من تۆم کردە سەرکردەی لەشکرەکە، لە ڕێگەدا بەپەلە بڕۆ، ئوسامە لە دەرەوەی مەدینە سەربازگەی دانا ژمارەی سوپاکەی (٣٠٠٠) مسوڵمان بوو، گەورە پیاوانی موهاجیرو ئەنصاری لەگەڵدا بووکو پێشەوا ئەبو بەکرو عومەرو ئەبو عوبەیدەو سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص، خوا لێیان ڕازی بێ، هەندێ بە فەرماندەیی ئوسامە ناڕازی بوون لەبەر ئەوەی تەمەنی بچووك بوو، گوتیان ئەو منداڵە دەبێتە سەرکردەی موهاجیرو

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٥٠.

ئەنصار!، ئەو هەواڵە گەییە پێغەمبەری خوا ﷺ، بەم هەواڵە تووڕە بوو، بۆیە لە ڕۆژی شەممەی (١٠)ەی ربیع الأول هاتە سەر مینبەر لەبەر نەخۆشیەکەشی بە پەڕۆکێك نێوچەوانی موبارەکی خۆی بەستبوو، فەرمووی: ئەوە چییە سەبارەت بە ئەمیرایەتی ئوسامە قسەیەکم لە ئێوە بیستووە، ئێستا تانە دەدەن لە ئەمیرایەتی ئوسامە پێشتریش تانەتان داوە لە ئەمیرایەتی باوکی، سوێند بەخوا باوکی ئوسامە شیاوی ئەمیرایەتی بوو، لەو کەسانەش بوو کە زۆر لام خۆشەویست بوو، ئوسامەش دوای باوکی شیاوی ئەمیرایەتییەو لای من وەك باوکی خۆشەویستە، ئامۆژگاریی ئەو کەسانە دەکەم لەگەڵ ئوسامەدا چاك بن، جا بەهۆی ئەو قسانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاش ئەمە بە ئوسامە گوترا (الحب إبن الحب) واتە: خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست.

ئنجا دوای وتارەکە پێغەمبەری خوا چوو بۆماڵەوە نەخۆشیەك زیاتر گران بوو لەسەری، بێ هێزی کرد، بۆیە پێغەمبەری خوا پێشەوا ئەبو بەکری لەلەشکرەکە جیا کردەوە بۆ ئەوەی پێش نوێژی بۆ مسوڵمانان بکات[1].

لە ئەبو مویهبەوە دەگێڕنەوە گوتوویەتی: عَنْ أَبِي مُوَيْهِبَةَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ فَقَالَ {يَا أَبَا مُوَيْهِبَةَ إِنِّي قَدْ أُمِرْتُ أَنْ أَسْتَغْفِرَ لِأَهْلِ الْبَقِيعِ فَانْطَلِقْ مَعِي} فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ فَلَمَّا وَقَفَ بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ {قَالَ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الْمَقَابِرِ لِيَهْنِ لَكُمْ مَا أَصْبَحْتُمْ فِيهِ مِمَّا أَصْبَحَ فِيهِ النَّاسُ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا نَجَّاكُمْ اللَّهُ مِنْهُ أَقْبَلَتْ الْفِتَنُ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يَتْبَعُ أَوَّلُهَا آخِرَهَا الْآخِرَةُ شَرٌّ مِنْ الْأُولَى} قَالَ ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيَّ فَقَالَ {يَا أَبَا مُوَيْهِبَةَ إِنِّي قَدْ أُوتِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الدُّنْيَا وَالْخُلْدَ فِيهَا ثُمَّ الْجَنَّةَ وَخُيِّرْتُ بَيْنَ ذَلِكَ وَبَيْنَ لِقَاءِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ وَالْجَنَّةِ} قَالَ قُلْتُ بِأَبِي وَأُمِّي فَخُذْ مَفَاتِيحَ الدُّنْيَا وَالْخُلْدَ فِيهَا ثُمَّ الْجَنَّةَ قَالَ {لَا وَاللَّهِ يَا أَبَا مُوَيْهِبَةَ لَقَدْ اخْتَرْتُ لِقَاءَ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ وَالْجَنَّةَ} ثُمَّ اسْتَغْفَرَ لِأَهْلِ الْبَقِيعِ ثُمَّ انْصَرَفَ فَبُدِئَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي وَجَعِهِ الَّذِي قَضَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِ حِينَ أَصْبَحَ.

واتە: فەرمانم پێ کراوە بچمە گۆڕستانی بەقیعو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەم، با بەیەکەوە بچین ئەی ئەبو مویهیبە، دەڵێ لەگەڵیدا ڕۆیشتم کاتێك گەیشتین بەوێ فەرمووی: سەلام لە ئەهلی گۆڕستان، دواتر پیرۆزبایی ئەوەی لێکردن کە ئەوان پێشکەوتنو

[1]) ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار- ﷺ ل ٥٢٦.

فەرمووی پیرۆزتان بێ کە ئێوە پێش کەوتن چونکە فیتنە وەك پارچە شەوی تاریك وا بەدوای یەکتریدا دێن، ئەوەی لەدواوەیە لە هی پێشەوە خراپترە، دەڵێ پاشان ڕووی لەمن کردو پێی فەرمووم: ئەی ئەبو مویهیبە سەر پشك کراوم لەنێوان ئەوەدا کە کلیلی خەزێنەکان دونیام بە نەمری پێ بدرێ، پاشان بچمە بەهەشت، لەگەڵ ئەوەی بچمە خزمەت پەروەردگارمو نەمێنمەوە یەکسەر بڕۆم بۆ بەهەشت، ئەڵێ منیش گوتم: دایكو باوکم بە قوربانت بێ دەی مانەوە لە دونیا هەڵبژێرە پاشان چوونە بەهەشت.

فەرمووی: نا بەخوا ئەبو مویهیبە چوونە لای پەروەردگارو بەهەشتم هەڵبژاردووە، پاشان دوعای لێخۆشبوونی بۆ مردووەکانی گۆڕستانی بەقیع کردو گەڕایەوە ماڵەوە.

هەروەها عوقبەی کوڕی عامر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا لە شار دەرچوو نوێژی مردووی لەسەر شەهیدانی ئوحود کرد، پاشان گەڕایەوە چوو بۆ سەر مینبەرو فەرمووی: {إِنِّي فَرَطُكُمْ وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ إِنِّي وَاللَّهِ لَأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الْآنَ وَإِنِّي قَدْ أُعْطِيتُ خَزَائِنَ مَفَاتِيحِ الْأَرْضِ وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ بَعْدِي أَنْ تُشْرِكُوا وَلَكِنْ أَخَافُ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا}، واتە: من پێشتان دەکەومو لەسەرتان دەبم بە شاهێد، سوێند بەخوا ئێستا من سەیری حەوزەکەم دەکەم، من لەوە ناترسم دوای من شەریك بۆخوا بڕیار بدەن، بەڵام لەوە دەترسم لەسەر دونیا مونافەسەو ڕکابەری یەکتر بکەن[1].

لە کاتی نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەڕا بەسەر خێزانەکانیداو هەر ڕۆژەو لای یەکێکیان دەمایەوە، تا بەیەك چاو تەماشایان بکا، بۆ دواجار سەردانیان بکاو ماڵئاواییان لێبکا، ڕۆژێکیان لە نۆرەی مەیموونەی خێزانی خوا لێی ڕازی بێ خۆشەویست ﷺ لەهۆش خۆی چوو، گوتیان: لەوانەیە پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشی (ذات الجنب)ی بێ، واتە بەرەنگی، بۆیە بێ ئیزنی خۆی دەرمانیان لە دەمی موبارەکی کرد، جا کەهاتەوە هۆش خۆی فەرموی کێ وای لێکردم؟

گوتیان: عەبباس خوا لێی ڕازی بێ، چونکە مەترسی نەخۆشی بەرەنگی لێ دەکردی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەو نەخۆشییە لە شەیتانەوەیە، خوای گەورە شەیتان

[1]) ژیانی نازیزمان- ب-٢- ل ٨٤٢.

بەسەر مندا زاڵ ناکات، هەرکەسێ لەوماڵەدا بێ دەبێ ئەو دەرمانەی لە دەمیدا بکرێ جگە لە عەباسی مامم[1].

پاشان داوای مۆڵەتی لە خێزانەکانی کرد کە بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە لەماڵی عائیشەدا بمێنێتەوە، تا ئەوەی لەوێ چارەسەریەکانی بۆ بکرێ، ئەوانیش هەموویان ڕازی بوون، ئەوەبوو لە ماڵی مەیموونە هاتە دەرەوە عەبباسی مامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب خوا لێیان ڕازی بێ چوونە ژێر قۆڵی موبارەکی هەردوو پێیەکانی لە زەوی دەخشان گەیاندیانە ماڵی عائیشە، کە گەیشتە ئەوێ ئازارەکانی لەلەشی زیاتر بوون.

عائیشە خوا لێی ڕازی بێ سورەتی ئیخلاص‌و مەعوزەتێنی لەسەر دەخوێند، پاشان فووی دەکردە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، ئازارەکان تا دەهات زیاتر دەبوون لەسەری فەرمووی: ئاوی حەوت کوندەم بەسەردا بکەن، کە دەم بەستەکانی کوندەکە نەکرابنەوە، پاشان کەمێك حاڵی باشتر بوو هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکەکە، عائیشە دەڵێ: هیچ پیاوێکم نەبینیوە بەقەد پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشی بە توندی گرتبێ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: لەکاتی نەخۆشیەکەیدا هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تایەکی زۆر توندی تووش بووبو، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا تایەکەت زۆر توندە، ئایا بەمە دوو پاداشتت بۆ دەنووسرێ؟ ئەویش فەرمووی: {أَجَلْ وَمَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى إِلَّا حَاتَّتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ كَمَا تَحَاتُّ وَرَقُ الشَّجَرِ} واتە: بەڵێ، هەر مسوڵمانێك تووشی ئازارێك بوو، ئەوا چۆن گەڵای دار دەوەرێ، بەهەمان شێوەش گوناهەکانی دەوەرن[2].

جا پاشان فەرمووی بە عائیشە، باوکت‌و کوڕەکەی بانگ بکە تاوەکو وەسیەتێك بنووسم[3].

عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: هاوسەرانی پێغەمبەری خوا لێی کۆبوونەوەو هەموویان لەلای ئامادە بوون، فاتیمەی کچیشی هات خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەری خوا

---

[1]) ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ- ٥٢٩.

[2]) ژیانی ئازیزمان- ب٢- ل ٨٤٣.

[3]) ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ- ل ٥٣٠.

ﷺ فەرمووی: {مَرْحَبَاً يا إبنتي}، پاشان لەلای ڕاستی یان چەپی دانیا، بەنهێنی قسەیەکی بەگوێیدا چرپاند، فاتیمە دەستی کرد بە گریان، پاشان دووبارە شتێکی تری بەگوێیدا چرپاند ئەو جارەیان زەردەخەنەی هاتە سەر دەمو چاو، منیش پێم گوت: بۆچی جاری یەکەم گریایتو پاشان زەردەخەنەت کرد چی پێ فەرمووی: فاتیمە گوتی: نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ نادرکێنم، پاشان کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، ڕۆژێکیان پێم گوت: لەبەر ئەو مافەی من بەسەر تۆم هەیە داوات لێدەکەم پێم بڵێی؟

ئەویش گوتی: ئێستا بەسەرچاو، گوتی: یەکەمجار پێغەمبەری خوا ﷺ بەنهێنی چرپاندی بەگوێماو فەرمووی: {أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُهُ بِالْقُرْآنِ كُلَّ سَنَةٍ مَرَّةً وَإِنَّهُ قَدْ عَارَضَنِي بِهِ الْعَامَ مَرَّتَيْنِ وَلَا أَرَى الْأَجَلَ إِلَّا قَدْ اقْتَرَبَ فَاتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي فَإِنِّي نِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ} واتە: ساڵانی ڕابردوو جبریل سەلامی خوای لێبێ لە ساڵێکدا یەکجار قورئانی پێ دەور دەکردەوە، بەڵام ئەمساڵ دووجار قورئانی پێ دەور کردەوە، وا ئەبینم کە مردنم نزیك بۆتەوە، جا تۆش تەقوای خوا بکەو ئارام بگرە، چونکە من چاکترین کەسم لە ڕۆژی دوایی پێشت دەکەوم، نیتر کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو قسانەی بە گوێما چرپاند دەستم کرد بە گریان، جا کە بینی من وا غەمبارم بەم شێوەیە منی بینی، دووبارە بەگوێما چرپاندیو پێی فەرمووم: {أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ أَوْ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ}، واتە: ئایا ڕازی نابی کە تۆ گەورەی ئافرەتانی بەهەشت یاخود ئافرەتانی ئیمانداران بی (واتە: ئایا ببەمە خەفەتباریت لاناچێ؟)[1].

پێشی گوتم: ئەی فاتیمە یەکەم کەسی لە ئالو بەیتەکەم کە بەدوای مندا دێیو پێم دەگەی، بۆیە پێکەنیم[2].

هەروەك باسمان کرد کە ناوی حەوت کوندەیان بۆ هێناو پێیاندا کرد، فەرمووی بەسسە بەسسە، ئنجا فەرمووی: تا ئێستاش هەست بە ئازاری ئەو ژەهرە دەکەم کە لە خەیبەر جوولەکەکان بۆیان کردمە خوارن، ئەوە کاتی پچڕانی دەماری دڵمە لەهۆی ئەو ژەهرەوە، پەڕۆکێکی لە نێوچەوانی موبارەکی خۆی بەستو چوو بۆ سەر مینبەر بەر لە

---

[1] ) ژیانی ئازیزمان- ب٢- ل ٨٣٩.

[2] ) ژیانی پێغەمبەر ڕێزدار ﷺ.

هەموو شتێك حەمدو سەنای خوای تەعالای کرد، ئنجا دوعای لێخۆشبوون و ڕەحمەتی بۆ شەهیدانی ئوحود کرد، ئنجا فەرمووی: {إِنَّ اللهَ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ فَاخْتَارَ ذَلِكَ العَبْدُ مَا عِنْدَ اللهِ}، بەڕاستی یەکێ لە بەندەکانی خوا، خوای گەورە سەرپشکی کردووە لەنێوان مانەوەی لە دونیا، یاخود گەڕانەوەی بۆ لای خوا، ئەو بەندەیەش لای خوای هەڵبژاردووە بەسەر دونیا، پێشەوا ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ یەکسەر لە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت، بۆیە دەستی کرد بە گریان، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەخۆمان و دایك و باوکمان بە قوربانت بین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر لەسەرخۆبە، ئنجا فەرموی: لەهەموو کەس زیاتر کە منەتی بەسەرمەوە هەبێ ئەبو بەکرە، لە هاوڕێیەتی کردن، لە ماڵ بەخشین، ئەگەر کەسێکم کردبا خەلیلی خۆم ئەوا ئەبو بەکرم دەکرد بە خەلیلی خۆم، فەرمووی: هەموو ئەو دەرگایانەی کە خەڵکی بۆی دێنە نێو مزگەوتەکەم بیگرن تەنها ئەو دەرگای ئەبو بەکر نەبێ[1].

هەروەها لەوتارەکەدا فەرمووی: ڕاتاندەسپێرم بە ئەنصارەکان ئەوانە جێگای متمانەی منن ئەوەیان کرد کە لەسەرشانیان بوو، چاکە لە چاکەکارانیان وەرگرن و چاوپۆشی بکەن لە خراپەکارەکانیان[2].

لەدوا ڕۆژەکانی ژیانیدا پێغەمبەری خوا ﷺ تا دەهات نەخۆشییەکەی سەری سەخت تر دەبوو، لە ڕۆژێکدا چەند جار دەبووڕایەوە[3].

بەکورتی وەسیەتەکانی چەند ئامۆژگارییەك بوون، لەکاتی نزیك بوونەوەی لە مردن ئەم وەسیەتانەی کرد:

١- چاودێری کردنی ئەنصارەکان.

٢- دەرکردنی موشریکان لە دوورگەی عەرەبی.

٣- خۆپاراستن و دوورکەوتنەوە لە پەرستنی قەبرەکەی.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٣١.

[2]) بوخاری لە صەحیحەکەیدا ئەمەی هێناوە.

[3]) ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ- صەللابی- ب٢- ل ٥٧٣- ٥٧٤.

٤- گومانی باش بردن بە خوای گەورە .

٥- ئەنجام دانی نوێژەكان بە رێكو پێكی.

٦- ئاگامان لە كۆیلەكان بێ.

هەروەها دەیفەرموو: {أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ عَزَّ وَجَلَّ وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ}، واتە: لە مـوژدەی هـاتنی پێغەمبەرایەتیدا تـەنها خـەونی چـاك مـاوە كـە موسوڵمانان دەیبینن، من خوێندنی قورئانم لەكاتی ڕكوعو سوجدە بـردن لـێ قەدەغـە كـراوە، ئێوەش كە ڕكوعتان بـرد خـوای گـەورەی تیدا بەگەورە بگرن و كاتێ چوونە سوجدە زۆر دوعا بكەن، چونكە شایستەی ئەوە دەبێ لێتان وەربگیرێ[1].

تا دەهات نەخۆشییەكە توندتر دەبوو، بۆیە كاتێك وەختی نوێژ هاتو بیلال خوا لێی ڕازی بێ بانگی دا پێغەمبەری خوا فەرمووی: {مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ}، واتە: ئەبو بەكر ڕاسپێرن با پێش نوێژی بۆ خەڵكەكە بكا، عائیشە فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەكر پیاوێكی دڵ ناسكە ئەگەر بێتو لە شوێنی تۆ نوێژ بكات لەوانەیە لەبەر گریان نەتوانێ دەنگی بگاتە هەموو خەڵكەكە، ئەگەر یەكێكی تر ڕاسپێری، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {إِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ}، ئێوە وەكو نافرەتنەكانی مەسەلەی یوسفن سەلامی خوای لێبێ، پێتان دەڵێم بە ئەبو بەكر بڵێین با پێشنوێژی بۆ خەڵكەكە بكا، جا لە نوێژی عیشای شەوی هەینی پێشەوا ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ، دەستی كرد بە پێشنوێژی كردن بۆ موسوڵمانان، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ڕۆژانی جومعەو شەممەو یەكشەممە نەیتوانی بێ بۆ مزگەوتو پێش نوێژی بكات، لە ڕۆژی دوو شەممەش لەكاتی چێشتەنگاودا وەفاتی كرد.

جا لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا یەكێ لە ڕۆژەكان پێشەوا ئەبو بەكر لەكاتی نوێژی بەیانی لەوێ ئامادە نەبوو لە شوێنی ئەو پێشەوا عومەر پێشنوێژی كرد، پێغەمبەری خوا

---

[1]) ژیانی نازیزمان- ٨٤٤- ٨٤٦.

ﷺ کە گوێی لەدەنگی پێشەوا عومەر بوو فەرمووی: نا نا دەبێ ئەبو بەکر پێش نوێژی بۆ خەڵکی بکا، جا لەو کاتەدا ئەبو بەکر بەدیار کەوت، پێشەوا عومەر لاکەوتو ئەبو بەکر هاتە شوێنی، ڕۆژێکی تریش کاتێ ئەبو بەکر پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد لە نوێژی نیوەڕۆ، پێغەمبەری خوا ﷺ کەمێك لەشی موبارەکی خۆشتر بوو، هات بۆ مزگەوت، کاتێ ئەبو بەکر هەستی بەمە کرد لاکەوتو پێغەمبەری خوا پێشنوێژییەکەی بۆ خەڵکی کرد بە دانیشتن، پێشەوا ئەبو بەکرد تەکبیرەکانی پێغەمبەری خوای بەدەنگێکی بەرزتر دەگوتەوە بۆ ئەوەی مسوڵمانان بیبیستن[1].

لە ڕۆژی کۆتاییدا کە ڕۆژی دوشەممە بوو، لە نوێژی بەیانی هاوەڵان ریزیان بەستبوو بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەکەی عائیشە کە لەناو مزگەوت بوو، پەردەی ژوورەکەی هەڵدایەوە تا سەیری مسوڵمانان بکات بۆ جاری کۆتایی چاوی پێیان بکەوێ، بینی کە مسوڵمانان لەبەردەم پەروەردگاریان وا بەڕیز وەستاون، سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر ئەوەی کە بانگەوازو جیهادەکەی بە شوێنی خۆی گەیشت، چاوە موبارەکەکانی گەش بوون بەبینینی مسوڵمانان بەم شێوەیە لە دوای ئەبو بەکر، پێشەوا ئەبو بەکر ویستی دووبارە بچێتە دواوە، بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئاماژەی بۆ کرد کە لە نوێژەکەتان بەردەوام بن، هاوەڵان کە زانییان پێغەمبەری خوا ﷺ سەیریان دەکا، وایان زانی نەخۆشییەکەی لەسەری سووکتر بووە، بەرەو باشتر بوون دەچێ، بۆیە پێشەوا ئەبو بەکر پاش نوێژی بەیانی چوو بۆ دەرەوەی مەدینە چونکە ماڵی یەکێ لە خێزانەکانی لەو شوێنە بوونو نۆرەی ئەویان بوو، شایانی باس کردنە ڕۆژی یەکشەممە واتە ڕۆژێك بەر لەوەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەندەکانی خۆی ئازاد کردو حەوت دیناریشی لابوو کردی بە صەدەقە، چەكو تفاقی جەنگیەکەشی پێشکەش بە مسوڵمانان کرد.

ئوسامەی کوڕی زەید بەر لە وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ چووە لای، بەڵام خۆشەویستمان ﷺ توانای گفتو گۆ کردنی نەمابوو، دەستی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمانو دەینایە سەری ئوسامە، ئوسامە تێگەیشت کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ دەکا، پاشان

---

[1]) ژیاننامەی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ.

عائیشەی دایکی ئیمانداران سەری پێغەمبەری خوای بە سنگی خۆیەوە نا، تا ئەوەی دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار عائیشە دەیگوت: یەکێ لە نیعمەتە گەورەکانی خوای گەورە لەگەڵی کردووم ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەکەی منو لەسەر سنگی من وەفاتی کرد، هەر لەو ڕۆژەدا عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو بەکر هاتە لای پێغەمبەری خوا کە دەکاتە برای عائیشەش خوا لێیان ڕازی بێ، سیواکێکی بەدەستەوە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری سیواکەکەی دەکرد، عائیشەش پێی گوت: بۆتی وەرگرم؟

بەسەری موبارەکی ئاماژەی بۆ کرد بەڵێ.

عائیشە سیواکەکەی وەرگرتو بەدەمی خۆی بۆ پێغەمبەری خوای نەرم کردەوەو ئنجا سیواکی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئنجا بەر لە وەفاتی بەردەوام دەیفەرموو: {فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى} دەستیشی دەخستە نێو دەفرێکەوە کە ئاوی تێدا بوو دەمو چاوی موبارەکی خۆی پێ تەڕ دەکرد، ئەی فەرموو: {إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ} واتە: بەڕاستی مردن ئێشو ئازاری زۆرە، پاشان دەستی بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: خوایە یارمەتیم بدە لەسەر ئازارەکانی مردن، جا فاتیمە خوا لیی ڕازی بێ گوتی: هەی هاوار لەو ناخۆشیەی باوکم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: لەمڕۆ بەدواوە باوکت هیچ ناخۆشی نابینێ، جا لەو حاڵەتی سەرەمەرگەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرمو: لەعنەتی خوا لە جولەکەو دیانەکان بدا گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردۆتە مزگەوت، سوجدەی بۆ دەبەن[1].

بەردەوام پەنجەی موبارەکی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمانو دەیفەرموو: {فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى}، سێ جاران ئەمەی دووبارە کردەوە، تا گیانی موبارەکی دەرچوو، گەورەترین موصیبەتو گەورەترین غەمو پەژارەو گەورەترین کارەسات بوو بۆ سەر دڵی هاوەڵانو هەموو ئوممەتەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان تووشی کارەساتێك بوو با کارەساتی مردنی من بیر خۆی بێنێتەوە[2].

---

[1]) ژیانی ئازیزمان.

[2]) ژیانی پێغەمبەر ﷺ- د. صەللابی- ب-٢- ل ٥٧٨.

عائیشە سەلامی خوای لێبێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی کە گیانی موبارەکی دەرچوو، بۆنێکی یەکجار خۆش لە لاشەی موبارەکی دەھات[1].

فاتیمە خوا لێی ڕازی بێ دەستی کرد بە گریانو گوتی:

يَا أَبَتَاهُ أَجَابَ رَبًّا دَعَاهُ

يَا أَبَتَاهْ مَنْ جَنَّةُ الفِرْدَوْسِ مَأْوَاهْ

يَا أَبَتَاهْ إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعَاهْ

ئەی باوکە وەڵامی پەروەردگارت دایەوە بۆ دەعوەتەکەی، ئەی باوکە بەھەشتی فیردەوس شوێنتە، ئەی باوکە ھەواڵی وەفاتت بۆ جبریل دەبەین.

وە کاتێ پێغەمبەری خوایان بە خاك سپاردو گەڕانەوە فاتیمە بە ئەنەسی کوڕی مالیکی گوت: ئەی ئەنەس چۆن دڵتان بەرایی ھات چۆن دڵتان ھات خۆڵ بەسەر باوکمدا بکەن؟

ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دوشەممەدا لەدایك بوو، لە دوشەممەدا بووە پێغەمبەر، لە دوشەممەدا ھیجرەتی کرد بۆ مەدینە، لە دوشەممەشدا وەفاتی کرد، لە چێشتەنگاوێکی درەنگی نزیك نیوەڕۆ، ڕۆژی دوشەممەی سالی یانزەی کۆچی ڕۆژی دوشەممەی دوانزەی ربیع الأول، بەرامبەر (٨)ی حوزەیرانی ساڵی (٦٣٣)ی زایینی، بەر لە وەفاتی (١٣) ڕۆژ بە نەخۆشی مایەوە، کە وەفاتی کرد تەمەنی (٦٣) ساڵ بوو، لە سەرو ڕیشی موبارەکیدا (٢٠) تاڵی سپی نەبوو، ماوەی پێغەمبەرایەتیەکەی (٢٣) ساڵ بوو، (١٣) ساڵ لە مەککەو (١٠) ساڵیش لە مەدینە[2].

ئەنەس دەڵێ: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ھاتە مەدینە ھەموو شتێك ڕووناك بوویەوە، بە پێچەوانەوە ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد ھەموو شتێك تاریك ھەڵگەڕابوو.

[1]) ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ.

[2]) ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ- عەبدوڵلا ھەرتەلی.

ئوم ئەیمەن کە شیری پێدابوو دەگریا دەیگوت: ئیتر جارێکی تر وەحی خوای گەورە نایەتە سەر زەوی[1].

ئنجا هاوەڵان کە هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوایان بیست سەریان لێ شێواو هۆشیان تێک چوو، تووشی صەدمەیەکی زۆر گەورە بوون، هەموویان تاسا بوون، پێشەوا عەلی چۆکی شل بوو نەیتوانی لەسەر پێیەکانی خۆی بوەستێ، پێشەوا عوسمان نەیدەتوانی بدوێ‌و قسە بکا، عومەر خوا لەهەموویان ڕازی بێ، لە مزگەوتدا وتاری دەداو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە، پێغەمبەری ﷺ نامرێ، بەڵکو وەکو پێغەمبەر عیسا سەلامی خوای لێبێ چووەتە خزمەت خوای پەروەردگار دەگەڕێتەوە ناومان، هەرکەسێك بڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە دەیکوژم تا پێشەوا ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ هات فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتنە خوارەوە ڕووی کردە ژوورەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەڕۆکەکەی سەری لاداو نێوچەوانی موبارەکی پێغەمبەری خوای ﷺ ماچ کردو گوتی: بەدایك‌و باوکەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا بە زیندوویتی‌و مردوویتی پاك‌و جوان‌و بۆن خۆشی، ئنجا هاتە دەرەوەو هەندێ قسەی بۆ خەڵکەکە کردو گوتی: ئەی خەڵکینە ئەوەی پێغەمبەری خوای دەپرست ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، هەر کەسێ خوا دەپەرستێ ئەوا خوای گەورە زیندووەو هەر دەمێنێ‌و نەمانی بەسەردا نایەت، پاشان ئەو ئایەتە موبارەکەی خوێند کە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران، واتە: موحەممەد هەر پێغەمبەرێکە وەك پێغەمبەرانی پێش خۆی، جا ئەگەر موحەممەدیش بمرێ یان بەدەستی کافرەکان بکوژرێ، ئایا ئێوە لە ئایینی ئیسلام پاشگەز دەبنەوە؟ هەر کەسێك لە ئایینی ئیسلام پاشگەز بێتەوە ئەوە هیچ زیانێك لە خوا نادات، بێگومان خوای گەورە پاداشتی شوکرانەبژێران دەداتەوە.

---

[1]) ژیانی ئازیزمان- ب٢- ل ٨٤٩- ٨٥٠.

جا پێشەوا عومەر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: کە گوێم لەو ئایەتە بوو ئەبو بەکر خوێندییەوە وامزانی یەکەمجارە ئەو ئایەتەم گوێ لێدەبێ، یەکسەر لەپێ کەوتمو خۆم پێ ڕانەگیرا، پاشان دوای نیوەڕۆ مسوڵمانان دەستیان کرد بە بەیعەت دان بە ئەبو بەکر، ئەویان هەڵبژاردو کردیان بە جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ مەسەلەی شوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوەڵان دوودڵ بوون لەوەی کە ئایا وەکو کەسێکی ئاسایی بیشۆن، واتە جلو بەرگی لەبەر بکەنەوە یاخود بە جلو بەرگی خۆیەوە بیشۆن، بۆرژانێکیان بەسەرداهات دەنگێك لە سووچێکی ژوورەکە هاتو پێی فەرموون لەبەرگی خۆیدا بیشۆن، جا دەستیان کرد بە شوشتنی، کراسەکەشی هەر لەبەردا بوو، دەیانگوشی، ئەوانەی پێغەمبەری خوایان شووشت، پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبو عەبباسی مامیو هەردوو کوڕەکان عەبباس، لە بیری ئەریس ئاویان هێنا، ئنجای شوشتنی کراسەکەیان لەبەر کردەوەو لە سێ پارچە کفنی سپیدا کە لۆکە بوون کفنیان کرد[1].

پاش شووشتنی پێغەمبەری خۆشەویستیان ﷺ لەسەر تەختەیەك دانا، هاوەڵان یەك یەك بەبێ ئیمام نوێژی جەنازەیان لەسەر کرد، هۆی ئەمەش زاناکان دوو بۆچوونیان هەیە:

هەندێکیان دەڵێن بۆ ئەوەی زۆرترین صەڵاواتی لەسەر لێبدرێو نوێژی زیاتری لەسەر بکرێ، هەندێکی تریش لە زانایان دەڵێن: لەبەر ئەوەی خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: خواو فریشتەکان صەڵاوات دەدەن لە پێغەمبەری خوا، ئەی ئیمانداران ئێوەش صەڵاواتی لەسەر بدەن یەك یەك فەرموویەتی، بۆیە بەم شێوەیە نوێژیان لەسەر کرد والله أعلم[2].

سەبارەت بە ناشتنی پێغەمبەری ئازیزیش ﷺ ڕای جیاواز هەبوون:

هەندێك گوتیان: لە بەقیع بینێژین، هەندێ گوتیان لای ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ، هەندێکی تر گوتیان: لای مینبەرەکەی، هەندێك گوتیان لە شوێنی نوێژ کردنەکەی، بەڵام پێشەوا ئەبو بەکر گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ فەرموویەتی: {هەر

[1] ) ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ- لا ٥٣٤- ٥٣٥ .

[2] ) ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار- ل ٥٣٥.

پێغەمبەرێك وەفات بكات لە شوێنی وەفات كردنەكەی دەنێژرێ}، جا لەبەر ئەمە هەر لە شوێنی ناشتنەكەیو لە ژوورەكەی دایكی ئیمانداران عائیشە ناشتیان.

سەبارەت بە چۆنیەتی گۆڕەكەشی دوو بۆچوون لە نێو هاوەڵان هەبوون: هەندێ گوتیان با (لحد) لادڕ بێ، هەندێكیشیان گوتیان: (شق) ناودڕ بێ، تەڵحە وەستای لێدانی گۆڕی لا دڕ بوو، ئەبو عوبەیدەش وەستای گۆڕی ناودڕ بوو، پێشەوا عەومەر گوتی: بەدوای هەردووكیاندا بنێرن كامیان زووتر هات با بەم شێوەیە بێ، گوتی: خوایە بۆ پێغەمبەرەكەت چاكترین هەڵبژێرە، جا ئەبو تەڵحە لە پێشدا هات گۆڕێكی لادڕی هەڵكەند، جا عەلیو عەبباسو فەزڵ دابەزینە ناو گۆڕەكەو پارچە جلێكیان لە نێو گۆڕەكە ڕاخست، ڕاخستنی ئەو پارچە جلەش تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ چونكە لاشەی پێغەمبەران لە نێو گۆڕەكانیان نارزێ،ك فەرموویەتی: {«إنَّ اللَّـهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ»}.

ئنجا لە شەوی چوارشەممەی (ربیع الأول) گڵ بەسەر لاشەی موبارەكیدا كرا، كاتێ دەنگی خۆڵ بەسەر كردنەكە هات هاوسەرانیو مسوڵمانانی نێو مزگەوت دەستیان كرد بە گریانێكی بەكوڵ[1].

ئێستا گۆڕەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ كەوتۆتە نێو مزگەوتەكەی لە مەدینە، هەردوو پێشەوایان ئەبو بەكرو عومەر لە هەمان ئەو ژوورەی پێغەمبەری خوا ﷺ نێژراون[2].

﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ البقرة، هەزاران هەزار صەلاتو سەلام بڕژێ بەسەر پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، خوای بەبەزەیی بەزەیی خۆی بەسەر ئێمەدا بڕێژێو لەبەر خاتری ناوو سیفەتە بەرزو بەڕێزەكانی بەبەر شەفاعەتی ئەو ئازیزەمان بخا بە گوناهی خۆمان لەگەڵمان نەكا.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٣٥- ٥٣٦.

[2]) ژیاننامەی پێغەمبەری ڕێزدار- ل ٥٣٦.

۸۱۲. ڕێزی مرۆڤ لە ئیسلام دا

ئەگێرنەوە کاتێ (صلاح الديني الايوبي ) ڕەحمەتی خوای لێبێ، بۆ دەست گرتنەوە بەسەر شاری (نەینەوا)دا هێرشێکی دلێرانەی کردە سەریان، لەوکاتەدا شاژنی موسڵ دوو گیان بووە و کاتی بوونی منداڵەکە نزیک بووبوویەوە و هەموویان لە کۆشک خەمیان لێهات کە بترسێت لەم جەنگە و منداڵەکەی لەبار بچێ. بۆیە دایکی شاژن بڕیاری دا بچێت بۆلای سەرکردەی موسڵمانان (صلاح الدین) و تکای لێبکات کە بەڵکو دوو مانگ ئەو جەنگە دوابخات تا کچەکەی بە هێمنی و بێ دڵە ڕاوکێ شازادەی ببێ.

پاشا گوتی: دایە گیان ڕۆیشتنەکەت بێ سوودە چونکە سۆز و بەزەیی لەگەڵ جەنگدا یەك ناگرنەوە، کاتی پیرەژنەکە هاتە خزمەتی (صلاح الدین) و داواکارییەکەی خستەڕوو، سەرکردە بێ وەستان و دوودڵی فەرمووی: ئێمە نابینە هۆی دڵداکەوتن و تۆقاندنی ژنانی سك پڕ و لەبار چوونی منداڵانی بێ تاوان، تا دوو مانگی تر با جەنگەکە بوەستێت. ئایا ئەم هەڵوێستەی (صلاح الجين) بەرهەمی هەبوو؟ بەڵێ، پاش دوو مانگ پاشا و شاژن و دایکی شاژن و وەزیر و دەست و پێوەنددان و بە کۆرپەلەی تازە لە دایك بوو چوونە خزمەتی سەرکردە و بەبێ شەڕ کلیلی شاری موسڵیان پێدا و فەرمووی هاتنە ژوورەوەیان لێکردن.

( ئەوەیە مافی مرۆڤ تا بەو جۆرە گرنگی تەنانەت بە ساوایەکی هێشتا لە دایك بووش دەدرێ ).[1]

---

[1] هونەری هاوڕێ گرتن ل ۹۹ - ۱۰۰

## ٨١٣. تەوەسول كردن بە پیاوچاكان

أحمد كوڕی یحیی الحلاء دەڵێ: گوێم لە باوكم بوو وتی: ڕۆژێك لە مەجلیسی شێخ (معروف) بووم پیاوێك هاتە ژوورەوە وتی: ئەی (أبو محفوظ) ئەم شەو شتێكی سەیرم بینی.

وتی: چیت بینی؟

وتی: ماڵ و خێزانم داوایان لێكردم كە ماسی بكڕم بۆیان، چووم بۆ بازاڕ ماسیم كڕی و هەڵم گرت لەگەڵ حەمباڵێك ئەویش لەگەڵم ڕۆیشت و بەرەو ماڵەوە كەوتینە ڕێگا.

كە گوێی لە بانگی نیوەڕۆ بوو وتی: مامە ئەرێ نوێژەكەمان نەكەین؟ وەكو ئەوە بوو كە بێدارم بكاتەوە و منیش وتم: بەڵێ دەكەین، ئینجا حەمباڵەكە شتەكانی دانا و ماسییەكەشی لەسەر دانا لە شوێنێك كە جێگای حەسانەوە بوو. منیش بە خۆم گوت ئەم منداڵە بە شتەكەی خۆی سەخیە تر بوو لەمن بۆ ماسی، هەركە چاوم لێبوو چووە ناو مزگەوت نوێژی سوننەتی كرد تاكو بانگدەر قامەتی كرد، ئینجا نوێژی نیوەڕۆمان كرد و ئەویش لە پاش نوێژ كردن دەرچووین.

بینیم شتەكانی وەكو خۆی دانراوە، یەكسەر چوومە ماڵەوە و باسی ئەو پیاوەم بۆ گێڕانەوە.

وتیان: هەڵسە بڕۆ و پێی بڵێ با بێ ئەو ماسییەمان لەگەڵ بخوات، منیش چووم و پێم گوت كە لەگەڵمان نان بخوات.

وتی: بە ڕۆژووم، وتم: ئێوارە لەلای ئێمە فتار بكەوە. وتی: باشە ڕێگەی مزگەوتم پێ نیشان بدەن، منیش پێم نیشان دا. نوێژی مەغریبمان كرد و چوومە لای گوتم وەرە با بچین بۆ ماڵمان نان بخۆین، وتی: نوێژی عیشا نەكەین ئەوجا بڕۆین؟ منیش بە خۆمم وت: ئەوەش دووەم مەبەستی ئەوە بوو چاكە لەوەیە نوێژی عیشا بكەین ئینجا بڕۆین. دەڵێ كە نوێژمان كرد چوینە ماڵێ، ئێمەش لە ماڵەوە سێ ژوورمان هەبوو، یەكیان بۆمن و خێزانم، ئەوی تریان بۆ كچێكی پەككەوتە بوو كە لە زگماكی بە پێ نەدەڕۆیی تەمەنی لەسەرووی بیست ساڵ دەبێ، سێیەم ژووریش بۆ میوان و میوانداریە. لەم سەین و بەینەدا من و خێزانەكەم

لەژووریٚ بووین لە دەرگای ژووری ئێمە درا. وتم کێیە بەم شەوە لە دەرگا دەدا؟ وتی: منم ( کچە پەککەوتەکە )، وتم چیی ؟!! پارچە گۆشتێکی کەوتوو لە ماڵ ئێستا هەڵساوە ؟ ئەوە مەحاڵ تۆبی.

کچەکە وتی: باوکە بکەوە منم. منیش دەرگام کردەوە کە بینیم خۆیەتی و بە قاچی خۆی هاتۆتە ژوورەکەم، وتم ها دەنگ و باس چییە خێرە بە قاچی خۆت هاتی؟ کچەکە وتی: گوێم لە ئێوە بوو کە باسی ئەو میوانەتان بە چاکی و بە باشی کرد منیش وام بە خەیاڵ داهات کە داوا لە خوا بکەم و بپاڕێمەوە لەبەر خاتری ئەم پیاوە چاکە شیفام بدا و وتم: خوایە لەبەرخاتری ئەم میوانە باشەمان، لەبەر خاتری چاکەی ئەم میوانە باشە لەم بەندیخانەیە ڕزگارم بکەی. یەکسەر هەڵسام بە پێی خۆم ڕۆیشتم ئێستا چۆن دەمبینیت وام و چاك بوومەتەوە.

دەڵێ منیش بەدوای میوانەکە گەڕام لە ژووری میوانان ویستم بچمە لای بەڵام کەسی لێ نەبوو و ڕۆیشتبوو. شێخ معروف فەرمووی: بەڵێ ئەوانە بچووك و گەورەیان تێدا هەیە واتا پیاو چاکان.[1]

### ٨١٤. هاوارکردن بو پێغەمبەر ( صلی الله علیه و سلم ) لە پاش وەفاتی

ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە کە لە سەردەمی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لەسەر) خەڵك تووشی باران نە بارین بوون، پیاوێك هاتە لای گۆڕی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) گوتی: (یا رسول الله (ﷺ) و في روایة یا محمد إستسقِ لأمتِكَ فإنهم قد هلكوا)

واتا: ئەی محمد (ﷺ) داوای باران بۆ گەلەکەت بکە، خۆی وشەی (إستسقِ) بە مانای (باران ببارێنە) دێ بەڵام لێرە بەمانای (داوای باران بکە) دێ، گەلەکەت فەوتا.

---

[1] صفة الصفوة الإمام الإبن الجوزي – جزء ٢ – ص ٦٠٠

ئینجا لەخەو بە پیاوەکەیان وت: برۆ بۆلای حەزرەتی عومەر (ﷺ) سەلامی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ کە کە بارانت بۆ دێت و پێی بڵێ با وریا و ژیر بێت، ئەویش چوو پێی ڕاگەیاندن و حەزرەتی عومەر گریا و وتی: خودایە بێ خەمی ناکەم تەنها ئەوەی لە توانامدا نەبێ[1].

### ٨١٥. تەوەسول و تەبەڕوك بە خوێنی پێغەمبەر (ﷺ)

تەبەڕانی لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە هێناویەتی مالیکی کوڕی سینان کە باوکیەتی لە ڕۆژی ئوحوددا خوێنەکەی ڕووخساری پێغەمبەری (ﷺ) لێسییەوە و قوتیدا، پێی وترا خوێن دەخۆیتەوە؟ وتی: بەڵێ، خوێنی پێغەمبەر (ﷺ) دەخۆمەوە و ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوێنم تێکەڵ بە خوێنی بوو، ئاگری دۆزەخی پێناگا[2].

### ٨١٦. هاوارکردن بو پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لە پاش وەفاتی

لە هەیسەمی کوڕی خونەیس (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەڵێ ئێمە لەلای حەزرەتی عبداللە ی کوڕی عومەر دانیشتبووین (ﷺ) قاچی سڕببو پێیان گوت: یادی خۆشەویستترین کەس بکەوە لەلای خۆت، فەرمووی: یا محمد (ﷺ). واتا: هاوار یا محمد (ﷺ)[3].

### ٨١٧. پلەکەت بەقەدەر بەندایەتی کردنتە لەگەڵ خوا

عبداللە ی قواریری دەفەرموێ: لە ژیانمدا نوێژی عیشام بە جەماعەت نەفەوتاوە، قەدەری خوا وابوو شەوێك بەهۆی میوانەوە دابڕام لە نوێژی بە جەماعەت، زۆربەی مزگەوتەکانی بەسرە گەڕام بە هیوای ئەوەی بە نوێژی جەماعەت ڕابگەم بەڵام بێ سوود بوو هەموو

---

[1] اخرجه إبن شيبة في المصنف (٣١/١٢ و ٣٢) والبخاري في تأريخه (٣٠٤/٧) والحافظ أبو يعلى الخليلي في (الإرشاد) ص ٦٣ والبهيقي في دلائل النبوة (٤٧/٧) و قال الحافظ إبن حجر في فتح الباري (٦٣٩/٢) كتاب الإستسقاء إسناده صحيح و قال الحافظ إبن الكثير في البداية و النهاية (١٠٥/٧) و في التفسير (٩١/١) اسناده الصحيح.

كتاب الموسوعة اليوسفية ص ١١١ – ١١٢.

[2] حياة الصحابة – ج ٢ – ص ٢٠٨.

[3] أخرجه البخاري في الأدب المفرد (٩٦٤) و ذكره الشيخ إبن التيمية في الكلم الطيب في الفصل السابع والأربعين ص ١٦٥.

كتاب الموسوعة اليوسفية في بيان أدلة الصوفية ص ١١٣.

نوێژیان کردبوو. منیش بە ناچاری گەڕامەوە ماڵ بە دڵی سارد و داماوییەوە و هاتەوە بیرم کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: نوێژی بە جەماعەت خێری ٢٧ پلە زیاتری هەیە لە نوێژی بە تەنیا و ئینجا خەوتم، لە خە ونـدا بینیم لەگەڵ هاوڕێیانم پێشبڕکێم دەکرد بەڵام من لە دوای هەموویان بووم و زۆر بە سستی دەڕۆشتم.

لەناو هاوڕێکانم یەکێ پێی گوتم: وڵاخەکەت ماندوو مەکە چونکە تۆ بە ئێمە ناگەی. وتم: بۆچی؟ وتیان: ئێمە نوێژی عیشامان بە جەماعەت کردووە بەڵام تۆ نەتکردووە و دوا دەکەویت.

منیش لە خەوەکەم بە ئاگا هاتم، بە م هویە وە دڵم پڕ بوو لە ئاخ و پەژارە[1].

## ٨١٨. تەوەسول و هاوارکردن بە زیندووان

لە عوسمانی کوڕی حونەیف (ﷺ) دەگێڕێتەوە: پیاوێکی کوێر هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و گوتی: بۆم لە خوا بپاڕێوە چاوەکانم چاك بکاتەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی ئارام بگرە، ئارام گرتن باشترە. کوێرەکەش گوتی: دوعام بۆ بکە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کە دەست نوێژێك بشوا و ئەم دوعایە بکات ( اللهم إنی أسألك و أتوجه إالیك بنبیك محمد نبیَ الرحمه فتقی لی اللهم شفعه فیّ ).

واتا: خودایە من داوات لێدەکەم و ڕووم لە تۆ دەکەم بە پێغەمبەرەکەت محمد (ﷺ) کە پێغەمبەری ڕەحمەتە، ئەی (محمد) (ﷺ) من بەهی تۆوە ڕووم لە خوا دەکەم بۆ جێبەجێ کردنی پێویستییەکانم تاکو جێبەجێ ببێ، ئەی خوایە خاتری پێغەمبەر (ﷺ) وەربگرە لە کارەکەمدا، ئینجا کابرا کە ئەو دوعایەی کرد چاکبووەوە[2].

## ٨١٩. هۆکارێکی زیرەك بوونی قوتابییان

د. محمد العریفی (رحمه الله ) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ڕۆژێك لە قوتابخانە دەربارەی نوێـژ وانـەم بـە کۆمـەڵێك قوتـابی بچـووك دەگوتـەوە، پرسـیارم لێکـردن دەربـارەی

---

[1] انیس المؤمنین ل ١٢٥

[2] اخرجه احمد (١١٢/١) فی المسند والنسائی (٦٥٨) والترمذی (٣٥٧٨) و إبن ماجه (١٣٨٥) و قال أبو إسحاق هذا حدیث صحیح و إبن خزیمة (١٢١٩) والحاکم (٣١٣/١) و صححه و افقه الذهبی.

فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر گرنگی نوێژ، یەكێك لە قوتابییەكان بە فەرموودەیەك وەڵامی دامەوە و گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: بین الرجل و بین الكفر أو الشرك يترك الصلاة.

واتا: جیاوازی لە نێوان مرۆڤی موسڵمان و بێ باوەڕ و هاوەڵدانەر وازهێنانە لە نوێژ. وەڵامەكەیم زۆر لا جوان و سەرنج ڕاكێش بوو، ئەوەندە كاری لێكردم كاتژمێرەكەی دەستم دانا و پێشكەشیم كرد، هەرچەندە كاتژمێرێكی ئاسایی و هەزارانە بوو. ئەم هەڵوێستە بووە هۆی هاندانی ئەو قوتابییە و زانست و زانیاری خۆش ویست و بەرەو ئاراستەی قورئان لەبەر كردن هەنگاوی نا و خۆی بۆ ئەو بوارە تەرخان كرد، ڕۆژەكان تێپەڕین و چەندین ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا ڕۆیی پاشان ڕۆژێك لە یەكێك لە مزگەوتەكاندا بینیم پێشنوێژی مزگەوتەكە ئەو قوتابییە كە كاتژمێرەكەمم پێشكەش كرد، ئەو كوڕە كۆلێژی شەریعەی تەواو كردبوو و لە یەكێك لە دادگاكانیشدا دەیخوێند، من ئەو ڕووداوەم بیر نەمابوو ئەو بیری خستمەوە، سەیر بكە لە دوای چەندین ساڵ ئەو هەڵوێستە لە یادەوەرییەكانی تۆمارە و لە یادی نەچووە[١].

## ٨٢٠. قسە خۆشی و ڕوو خۆشی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئافرەتانی موسڵمان

جارێك ئافرەتێك دێت بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و سكاڵا لە مێردەكەی دەكات، پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرموێ: مێردەكەت ئەو پیاوەیە كە لە چاویدا سپیایەك هەیە؟ ئافرەتەكە كاتێك گوێی لەم قسەیە دەبێت دڵی ڕادەچڵەكێت و وا گومان دەبات كە پیاوەكەی كوێر بووە. هەروەك پەروەردگار لە باسی حەزرەتی یەعقوب (علیه السلام) دا دەفەرموێ: (وابيضت عيناه من الحزن فهو كظيم) يوسف ٨٤. واتا: لە ئاخ و داخ و خەفەت و ئێشدا چاوەكانی سپی هەڵگەڕا.

---

[١] بەختەوەر بژی ل ٤٣ — ٤٤ (د.محمد العريفي).

ئافرەتەکە دەگەڕێتەوە لای مێردەکەی و سەیری چاوی دەکات و لێی ورد دەبێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەچاوی مێردەکەت سپیاییەك هەیە، مێردەکەشی دەڵێت: ئایا چاوی هەموو کەس سپیاییەکەی لە ڕەشییەکەی زیاتر نیە؟[1]

### ٨٢١. بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەر ئاژەڵان (١)

جارێك پێغەمبەر (ﷺ) لەگەشتێکدا دەبێت، بۆ پێداویستی خۆی کەمێك دوور دەکەوێتەوە و دەبینێ هاوەڵەکان هەندێ بێچووە باڵندەیان گرتووە و دایکی بێچووەکانیش لەتاو بێچووەکانی هەر بە دەوریاندا دێت و دەچێت، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە دەبینێت ئاوڕیان لێ دەداتەوە و دەفەرموێ: کێ بێچووی ئەم باڵندەیەی گرتووە و ناڕەحەتی کردووە؟ دەی با بەری بدات و بۆی بگێڕێتەوە[2].

### ٨٢٢. بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەر ئاژەڵان (٢)

ڕۆژێکی تر پێغەمبەر (ﷺ) دوو پیاو دەبینێت لەسەر وشترەکانیان وەستاون و قسە لەگەڵ یەکتری دەکەن، کاتێك وشترەکانی بەم شێوەیە بینی سۆزی بۆیان جوڵا و داوای لە پیاوەکان کرد کە وشترەکانیان وەك کورسی بەکارنەهێنن، چونکە ئاژەڵ بۆ ئەوە دروست نەکراوە و دروستیش نیە بەم شێوەیە سواری ئاژەل بین، تەنها بۆ کاتی پێویستی نەبێ و کاتێك پێویستییەکانمان تەواو بوون، دابەزین بۆ ئەوەی ئەوانیش پشوویەك بدەن.

### ٨٢٣. شاهێدی بێ باوەڕان بۆ ڕەحم و بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ)

جابری کوڕی عبدالله (ﷺ) دەفەرموێ ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) خەوتبوو لە ژێر سێبەری دارێك و شمشێرەکەی هەڵواسیبوو بە دارەکە، پیاوێکی بێباوەڕ لەولاوە هات و شمشێرەکەی هێنایە خوارەوە و بەرەو ڕووی ڕایگرت و وتی: لێم دەترسی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی نەخێر. گوتی: کێ ڕزگارت دەکات لە دەستم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوا. شمشێرەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و پێغەمبەر (ﷺ) هەڵیگرت و فەرمووی: ئەوجارە کێ تۆ لە دەستی من ڕزگار دەکات؟ کابرا وتی: پیاوی باش بە مەمکوژە.

---

[1] بەختەوەر بژی ل ٤٦-٤٧ (د.محمد العریفی)

[2] هەمان سەرچاوە ل ٥٩.

لە ڕیوایەتێکی تر: سۆز و بەزەیی تۆ ڕزگارم دەکات، چاکترین پیاوبە نەمکوژیت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: شایەتی دەدەی کە هیچ خوایەك نیە جگە لە الله و منیش پێغەمبەری ئەوم؟ کابرا وتی: نەخێر موسڵمان نابم بەڵام بەڵێن دەدەم کە نەتکوژم و لەگەڵ ئەوانەش نابم کە شەڕ لەگەڵ تۆ دەکەن. پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێی کرد. کابرا چووە لای هاوڕێکانی و وتی لەلای باشترین کەسەوە هاتووم[1].

### ٨٢٤. بە توندی زوو چوون بۆ نوێژ

دەڵێن کە شیخ داوودی تائی (رحمە الله التعالی) دەچوو بۆ مزگەوت زۆر بە توندی ڕای دەکرد، ڕۆژێك عەرزیان کرد قوربان: بۆ کە دەچی بۆ مزگەوت ئاوا بە توندی ڕادەکەی؟ ئەویش فەرمووی: ئاخر لەشکرێك لەدەرەوەی شار چاوەڕوانی من دەکات. عەرزیان کرد: کام لەشکر قوربان؟ فەرمووی: لەشکری مردووەکانی گۆڕستان، نەبادا بە دوام بنێرن و فریای نوێژەکەم نەکەوم[2].

### ٨٢٥. چارەی دڵ ڕەقی

پیاوێك چووە لای ( أم الدرداء - ﵂ ) گوتی: دڵم زۆر ڕەقە و هیچ وەرناگرێ و فرمێسك نایەتە خوار لە چاوانم. فەرمووی: بەڕاستی ئەمە گەورەترین دەرد و نەخۆشی یە، بەڵام بڕۆ سەردانی نەخۆش بکە و بەدوای جەنازەدا بڕۆ، هەروەها بڕۆ بۆ سەر لێواری گۆڕەکان تاکو دڵت نەرم دەبێ، ئینجا پیاوەکە وای کرد کە فەرمانی پێکرابوو، دەڵێ: گەڕایەوە لای و پێی گوت: ئەی أم الدرداء خوای گەورە پاداشتی بە خێرت بداتەوە[3].

### ٨٢٦. زانایی ئیمامی عەلی

ڕۆژێکیان حوزەیفەی کوڕی یەمان دەچێتە لای ئیمامی عومەری کوڕی خطاب ( رضي الله عنهم ) حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی کوڕی یەمان حاڵت چۆنە؟ ئەویش پێی دەڵێ:

---

[1] رواه إمام أحمد في مسند ج ٢٣ ص ١٩٣ رقم ١٤٩٢٩

[2] مەجلیسی ئەولیا – ل ٢٨٧

[3] مرشد الخطیب ص ٤٥.

قوربان من فیتنەم خۆش دەویٚ و ڕقیشم لە حەقە و نویٚژیش بەبیٚ دەستنویٚژ دەکەم. من شتیٚکم هەیە لەسەر زەوی کە خوا نیەتی لە ئاسماندا.

حەزرەت بەم قسانە زۆر تورەبوو و دەموچاوی گرژ کرد، لەم کاتەدا ئیمامی علی (ﷺ) دیٚتە ژوورەوە و دەموچاوی حەزرەتی عومەر دەبینیٚت و لیٚی دەپرسی بۆوا تورەی؟ ئەویش قسەکانی حوزەیفەی بۆ دەگیٚڕیٚتەوە، ئیمامی عەلی دەلیٚت: قسەکانی ڕاستە، حەزرەت دەفەرمویٚ: چۆن؟ ئیمام دەفەرمویٚ: حوزەیفە فیتنەی خۆش دەویٚ بە پیٚی فەرموودەی خودای گەورە ( إنما أموالكم و أولادكم فتنة ) ئەو ماڵ و منداڵەکەی خۆی خۆشدەویٚ، کاتیٚك دەلیٚت ڕقم لە ڕاستییە مانای ڕقی لە مردنە کە مردن حەقە ( وجاءت سكرة الموت بالحق ذلك ماكنت منه تحيد ) وە نویٚژیش بە بیٚ دەستنویٚژ دەکات مەبەستی صەلاوات دانە لەسەر پیٚغەمبەر (ﷺ) نەوەك نویٚژە فەرزەکان، وەکاتیٚك دەلیٚت من شتیٚکم هەیە لەسەر زەوی کە خوا نیەتی لە ئاسمان دووبارە ڕاست دەکات چونکە حوزەیفە منداڵی هەیە و خوای گەورە نیەتی کە دەفەرمویٚ ( لم يلد و لم يولد و لم يكن له كفوا احد ). پاشان حەزرەتی عومەر قسەکانی زۆر بەدڵ بوو و بە حەزرەتی عەلی فەرموو: بەڕاستی قسەکانت زۆر ڕاست و بە جیٚن من هەڵە بووم کە لە حوزەیفە تورە بووم[1].

## ٨٢٧. بوختان و درۆ بە دەم خواوە

أحمدی کوڕی الطوسي دەڵیٚ: کاتیٚ ئیمامی أحمدی کوڕی حنبل ( رحمه الله التعالى ) سەیری پیاویٚکی گاوری دەکرد چاوەکانی دەنوقاند و سەیری نەدەکردەوە، لیٚیان پرسی بۆچی وا دەکەی؟ فەرمووی: ناتوانم سەیری کەسیٚ بکەم کە قسەی درۆ و بوختان هەڵدەبەستیٚ بۆ خودا و خودا بە درۆزن (پەنا بەخوا) لەقەلەم دەدا لەوەی کە دەڵیٚ عیسا (عليه السلام) کوڕی خوایە و لە سیٚدارە دراوە و بیٚگومان ئەمەش پیٚچەوانەی فەرمایشتی خوایە.

## ٨٢٨. بەرەکەتی مووی پیٚغەمبەر (ﷺ)

دەگیٚڕنەوە لەشاری بەلخ بازرگانیٚك هەبوو زۆر دەوڵەمەند بوو و تەنها دوو کوڕی هەبوو، ئەم پیاوە وەفاتی کرد. موڵك و سامانەکەی بۆ ئەم دوو کوڕە بە جیٚما بەلام لەناو ئەو موڵك

---

[1] سۆمای دیدە – ب٢ – ل ٥٤١.

و سامانه سێ تاڵه مووی پێغەمبەر (ﷺ)ی تێدابوو هەریەکە و دانەیەکی بەرکەوت و یەکێك مایەوە. کوڕە گەورەکە گوتی: با ئەم تاڵە مووە بکەینە نیوە. بەڵام کوڕە بچووکەکە گوتی: نەخێر، مووی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر لەوە گەورەترە بکەینە پارچە.

کوڕە گەورەکە گوتی: باشە تۆ موڵك و سامانەکەی خۆت هەموو بدە من، منیش هەر سێ تاڵە مووەکەت دەدەمێ، کوڕە بچووکەکە ڕازی بوو و هەرسێ تاڵە مووەکەی خستە گیرفانی. هەرجارێك سەیری دەکرد صەڵەواتی لەسەر پێغەمبەر لێدەدا (ﷺ)، دوای ماوەیەك برا گەورەکەی ماڵ و موڵکەکەی هەموو لەدەست چوو و خۆیشی بووە خاوەن موڵکێکی زۆر، کاتێك برا بچووکەکە وەفاتی کرد هەندێك لە پیاوچاکان خەویان پێوە بینی کە بە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە خەڵك بڵێن هەرکەسێك پێویستی بە شتێك هەبوو با بچێتە سەر گۆڕی ئەم کوڕە و داوا لەخوای گەورە بکات و خوای گەورە داواکەی بۆ جێبەجێ دەکات. وای لێهات هەر کەسێك بە پیادە یان بە سواری ئەگەر بەلای ئەو گۆڕە تێپەڕیبا دەچوو سەردانی دەکرد و ئەمەش بەرەکەتی صەڵەوات لێدان بوو لەدیداری حەزرەت (ﷺ)[1].

## ٨٢٩. داواکردن لە پێغەمبەر (ﷺ) پاش وەفاتی لەسەر گۆڕەکەی

کوڕی جەعفەری حەدداد دەفەرموێ: جارێکیان لە مەدینە بووم ماوەی ١٥ ڕۆژ هیچ خواردنێك نەبوو بیخۆم، منیش چووم سکی خۆم بە دیواری مەزاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) نووساند. زۆر سەڵەواتم لێدا و گوتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) برسییەتی زۆری بۆ هێناوم و عیبادەتی خوای گەورەم پێناکرێ، لە برسان خەوم لێکەوت. لە خەومدا پێغەمبەر (ﷺ) نانێکی پێدام کە لە خەو هەڵسام لەتە نانێك لە دەستم بوو و سکیشم تێر بوو[2].

---

[1] حدائق الأولياء – ج١ – ص ٢٨.

[2] حدائق الأولياء – ج١ – ص ٣٦.

### ٨٣٠. خوا پەرستی و خوا ناسینی ڕاستەقینە

دەگێڕنەوە جارێك خوا ناسێك لە بەنی ئیسرائیل حەفتا ساڵ خوا پەرستی کرد و خوای گەورە ویستی وا بوو بە فریشتەکانی بناسێنێت و فریشتەیەکی نارده لای ئەو خواناسە و پێی گوت هەندێ وشەی پێ بڵێ کە نەگونجێ لەگەڵ خواناسییەکەیدا. لە گێڕانەوەیەکی تردا گوایە فریشتەکە بە خواناسەکەی گوتووە: ئایا دەزانی لەگەڵ ئەو هەموو خوا پەرستیەشدا لەوانەیە تۆ ئەهلی ئاگر بیت؟

خوا ناسەکە گوتی: خوای گەورە ئێمەی دروست کردووە تاکو بیپەرستین ئیتر لە ڕۆژی قیامەت دەمان خاتە دۆزەخەوە یان بەهەشت، ئارەزووی خۆیەتی و ئێمە موڵکی ئەوین. کاتێك فریشتەکە دەگەڕێتەوە لای خوای گەورە و خوای گەور لێی دەپرسێ کە قسەی خوا ناسەکە چی بوو؟

فریشتەکەش گوتی: خوایە گیان خۆت باشتر ئەزانی کە وەڵامی چی بوو.

خوای گەورە فەرمووی: ئەو لە خوا پەرستی دوور ناکەوێتەوە و ئێمەش بەخشندەین و ڕێگا لەو ناگرین.

ئینجا فەرمووی: ئەی فریشتەکان شاهد بن کەمن لەو خوا پەرستە خۆش بووم[1].

### ٨٣١. بەرپرسی لە کەس و کارەکانت

لوقمانی حەکیم (ﷺ) لە گەشت دەگەڕاوە و بە بەندەکەی گوت: باوکم لە کوێیە؟ گوتی: مرد. گوتی: ئەی دایکم؟ گوتی: مرد. گوتی: خەمم نەما. فەرمووی: ئەی خێزانەکەم؟ گوتی: مرد. فەرمووی: خەوگام نوێ بۆوە. فەرمووی: ئەی خوشکم؟ گوتی: مرد. فەرمووی: عەیب و عارم داپۆشرا. فەرمووی: ئەی براکەم؟ گوتی مرد. فەرمووی: پشتم شکا[2].

### ٨٣٢. برادەر و دۆستی دڵسۆز

---

[1] کورتە چیرۆك بۆ منداڵان ل ٧٨.

[2] ئامۆژگاری لە ١٠٠٠ چیرۆکی ڕاستەقینە ل ٤٤.

دەگێڕنـەوە جـارێ لـە هەنـدێ تـابیعی جـارێ میـوانی هـات هیچـیان نـەبوو چـووە مـاڵی برادەرێکی، مەنجەڵێك لەسەر ئـاگر بـوو، مەنجەڵە شـیوەکە و هەنـدێ نـانی هێنـا لـە پـێش میوانەکـەی دانـا. کـە خـاوەن مەنجەڵەکـە هاتـەوە گوتیـان: فلانـی بـرادەرت مەنجەڵەکـەی بردەوە. گوتی: کارێکی چاکی کردووە[1].

۸۳۳. **دکتۆری زیرەك**

دەگێڕنـەوە پیاوێـك ژنەکـەی بـردە لای دکتۆرێـك و پێـی گـوت کـە منـداڵی نـابێ. پزیشـك سەیری دەماری کرد و پێی گوت ئـەوە لـە پـاش ٤٠ ڕۆژی تـر دەمرێـت، ژنەکـە لـە ترسـا نـانی پێ نـەدەخورا و زۆر لاواز بـوو. کاتێـك ٤٠ ڕۆژ تێپـەڕی نـەمرد، پیاوەکـەی بـە پزیشـکی گـوت ئەی بـۆ تـۆ گوتـت شـڕە و دەمرێـت؟ گـوتی: ئـەو ژنـە قەڵـەو بـوو و دەمـی ڕەحمـی هەمووی چەوری بوو بۆیە ترساندم تاکو لاواز بێ و ئینجا ان شاءالله منداڵی دەبێ[2].

۸۳٤. **کەرامەتی ئەصحابە (ﷺ)**

ئیمـام بەیهـەقی و ئیمـام عـەدیی – بەسـەنەدەوە – لـە ئەنەسـەوە دەگێڕنـەوە: لاوێکـی ئەصرانی کە تاقانەی پیرەژنێکی کوێر بوو، کۆچی دوایی کرد و ئێمەش کوڕەکەمان داپۆشـی و سەرەخۆشیمان لە دایکی کرد. پیرەژنەکە گوتی: کوڕی مـن؟ گوتمـان: بـەڵێ. وتـی: خوایـە! خۆت دەزانی کە ئەگەر من بۆلای خۆت و پێغەمبەرەکەت کۆچـم کـردووە، بـەو هیوایـەی کـە لە هـەموو تەنگانەیەکـدا یارمـەتیم بـدەی، ئـەو موسـیبەتەم بەسـەردا مەهێنـە. ئـەوەبوو لـە جێی خۆمـان نـەجولاین کوڕەکـە پارچـە قوماشـەکەی لەسـەر دەموچـاوی لادا و هەسـتا نـانی خوارد و ئێمەش خواردمان[3].

ئیمام بوصەیریش لە قەصیدەکەیدا (بردە المدیح) ئامـاژەی بـۆ ئـەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرە کردووە کە وتوویەتی

لو ناسبت قدره آیاته عظیما

---

[1] ئامۆژگاری لە ۱۰۰۰ چیرۆکی ڕاستەقینە ل ۹۷.

[2] ئامۆژگاری لە ۱۰۰۰ چیرۆکی ڕاستەقینە ل ۱۱۷

[3] موعجیزاتی ئەحمەدی ل ۱۲۹.

أحيا إسمه حين يدعى دارس الرمم.

### ٨٣٥. كەرامەتی ئەصحابە ( ﷺ )

لە شەعبی دەگێڕنەوە كە خەڵكانێك لە كۆچكەران بۆ جیهاد كردن لە پێناو خوای گەورە چوونە دەرەوە، گوێ درێژی یەكێك لە پیاوەكان گیانی دەرچوو ئەوانی لەگەڵی دابوون گوتیان لەگەڵ ئێمە وەرە ئەویش لەگەڵیان نەچوو. یاوەرەكانی بە جێیان هێشت و ڕۆیشتن و ئەویش هەستا دەست نوێژێكی گرت و دوو ڕكاعەت نوێژی كرد و دەستی بەرز كردەوە بۆ ئاسمان. گوتی: خوایە من لە ( دەفینە )[1] دەرچووم بۆ تێكۆشان لە پێناو تۆ و ڕەزامەندی تۆ و شاهێدی دەدەم كە تۆ مردوو زیندوو دەكەیەوە و ئەوانەی لە گۆڕەكان دان هەموویان زیندوو دەكەیەوە، خوایە گوێ درێژەكەی من بۆمن زیندوو بكەیەوە، پاشان هەستا چووە لای گوێ درێژەكەی و لێیدا و گوێ درێژەكە هەستایەوە و گوێیەكانی بادان و ئەویش كورتان و لغاوی كرد و تا گەیشتەوە هاوەڵەكانی و پێیان گوت: ئەوە چیتەوە چی دەكەی؟ وتی: كاری من ئەوەیە كە خوای گەورە گوێ درێژەكەی منی بۆمن زیندوو كردەوە[2].

### ٨٣٦. ڤالانتاین ( جەژنی خۆشەویستی )

لە ئینساكلۆپێدیای كاسۆلیكی هاتووە و دەڵێت: لە كۆتاییەكانی سەدەی سێیەمی زایینی قەشەیەك هەبوو بەناوی ( ڤالنتاین) ئەو قەشەیە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی (كلاودیس)ی دووەمدا دەژیا، ئیمپراتۆر بڕیاری بەند كردنی ئەو قەشەیەی دا و لە بەندیخانە قایمی كرد، چونكە بێ فەرمانی ئەوی كردبوو ( هۆی گرتن و پاشان لە سێدارەدانی لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە ئیمپراتۆریەت تێبینی كرد كە لەكاتی شەڕدا گەنج و بێ خێزانەكان خۆگرتر و ئازاترن لەوانەی كە ژنیان هێناوە و ماڵ و منداڵیان بە جێ هێشتووە لەبەر ئەوە فەرمانی دەركرد كە نابێ هیچ سەربازێك ژن بهێنێت، بەلام

---

[1] شوێنێكە لەنێوان مەككە و بەصرە.

[2] كرامات الصحابة و الصالحين و آل البيت ص ٧٩.

قەشە فالنتاین بەرهەڵستی ئەو فەرمانەی کرد و بە دزییەوە لە کەنیسە بەردەوام گرێبەستی ژن و مێردایەتی دەکرد هەتا پێی زانرا و گیرا).

جا ئەو قەشەیە لە بەندیخانە کچی پاسەوانی بەندیخانەی چاو پێ دەکەوێ و دەکەوێتە داوی خۆشەویستی ئەو کچە، پاشان وای لە کچەکە کرد کە بوو بە گاور و چل و شەش لە خزمانی کچەکە بوون بە گاور، کچەکە زۆر جار کە دەهاتە لای گوڵێکی سووری بۆ دەهێنا. جا فالانتاین کە زانی کاتی لە سێدارەدانی نزیک بۆتەوە، نامەیەکی بۆ خۆشەویستەکەی نووسی و لە نامەکەدا نووسی لە فالانتاینی دلسۆزەوە،.......... دواتر لە ٢٧٠/٢/١٤ ی زایینی لە سێدارە درا و لەساڵی ٣٥٠ش کەنیسەیەکیان لەو شوێنە دروست کرد کە تیایدا مردبوو بۆ بە پیرۆز راگرتنی ئەو بۆنە و ڕۆژە. جا کاتێکیش ڕۆمانییەکان چوونە سەر ئایینی گاوری هەر ئاهەنگیان بەو جەژنە دەگێڕا بۆیە ناویان نا ( جەژنی خۆشەویستی ) کە بە گومانی خۆیان وایان دادەنا کە قەشە فالانتاین شەفاعەت دەکات بۆ عاشقان و ئەو ڕۆژەیان کردە جەژنی خۆشەویستی[1].

## ٨٣٧. کەرامەتی تابیعییەك

سیلەی کوڕی ئەشیەم (ﷺ) کە تابیعیە دەگێڕێتەوە لە کاتی گەڕانەوەی لە یەکێك لە جەنگەکان لە ڕێگا ئەسپەکەی مردار دەبێتەوە و دەفەرموێ: خوایە منەتی کەسم نەخەیە سەر، چونکە من شەرم دەکەم جگە لەتۆ داوا لەکەسی تر بکەم، یەکسەر خوای گەورە ئەسپەکەی بۆ زیندوو کردەوە و ئەویش سواری پشتی بوو، کاتێ گەیشتەوە ماڵەوە بە محمد ی کوڕی فەرمووی: کوڕم ئەو زینە بەو ئەسپە وەکە چونکە ئەوە خواستوومەتەوە واتە: لە خوام وەرگرتووە بە ئەمانەت، هەرکە زینەکەی لێکردەوە یەکسەر ئەسپەکە مردار بودوە[2].

---

[1] خۆشەویستی خوێندنەوەیەکی شەرعییانە و سەردەمییانە ل ١٦١-١٦٣.

[2] أصحاب الرسول (ﷺ) ج١ ص ٣٨٦.

### ٨٣٨. هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)

بە وڵاخەکانیان بەسەر رووبارێك پەڕینەوە، وە لەگەڵ گیانلەبەرەکانی سەر زەوی قسەیان دەکرد، ( عەقبەی کوڕی نافع ) لەسەر دەرگای شاری قیرەوان ڕاوەستا و فەرمووی: ئەی گیاندارەکان، ئەی مارەکان ئێمە هاوەڵانی محمدین (ﷺ) هاتووین بۆ بەرزکردنەوەی وشەی (لا اله الا الله ) کەوابوو ڕێگەمان بۆ واڵا بکەن، تەواوی گیانلەبەرەکان هاتنە دەرەوە[1].

### ٨٣٩. زوهدی ئیمامی أحمد

عبدالله ی کوڕی ئیمامی أحمد (رحمهما الله) دەڵێ: ڕۆژێك دانیشتبووم لەلای باوکم و سەیری هەردوو قاچی کردم کە زۆر نەرم و ناسك و بێ قڵش بوون.

پێی گوتم: ئەوە چییە ئەو قاچانە؟ بۆچی بێ پێڵاو ناگەڕێی تاکو زبر و قەڵشدار بن؟

عبدالله دەڵێ: باوکم بە پێخواسی چۆتە شاری تەڕابلوس بەبێ ئەوەی سواری هیچ پیڕۆیەك ببێ.

ئینجا دەڵێ: باوکم لە هەموو کەس زیاتر خۆڕاگر بوو لەسەر تەنیایی لەکاتی ڕۆیشتن و دانیشتندا، کەس نەیدەبینی مەگەر لە مزگەوت و لەسەر جەنازە و سەردانی نەخۆش نەبا، دەڵێ: زۆریش ڕقی لە ڕۆیشتن دەبۆوە لە بازاڕەکان[2].

### ٨٤٠. وەفای پێغەمبەر (ﷺ)

دەگێڕنەوە لە قەتادە جارێکیان وەفدی نەجاشی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێغەمبەر (ﷺ) بەخۆی خزمەتی دەکردن، یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە خزمەتیان دەکەین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوان لەگەڵ هاوەڵانی من زۆر چاك بوون بۆیە چاکەیان دەدەمەوە.

---

[1] ئەصحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ل ٥٣٤

[2] بەسەرهات و پەند وەرگرتن – ب ٢ – ل ١٨٦

## ٨٤١. گوێڕایەڵی ئەصحابەکان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

ئەبو نوعەیع لە کینانییەوە تەخریجی کردووە کە نێردراوی خەلیفە عومەر (رضي الله عنه) بووە بۆلای هیرەقل و ناویشی جەثثامەی کوڕی موساحیقی کوڕی ڕەبیعی کوڕی قەیسی کینانی بووە کە گوتوویەتی: دانیشتم و نەمزانی چ شتێك لە ژێرمایە! کاتێك کە پێم زانی لەسەری دابەزیم و ئەویش دەستی بە پێکەنین کرد و لێمی پرسی: لەسەر ئەو کورسییەی کە ڕێزی تۆمان پێی دەگرت بۆچی دابەزی؟

وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە دووره پەرێزی کردووە لە جۆری ئەمە[1].

## ٨٤٢. موعجیزەی پێغەمبەر (ﷺ)

ئیمامی حەسەنی بەصری (رضي الله عنه) کە ئیمامی زانایانی (ظاهر) و (باطن) بووە لەسەردەمی تابعیین دا یەکێك بووە لە قوتابییە هەرە ڕاستگۆکانی ئیمام عەلی (کرم الله وجهه) دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باس کرد کە کچێکی مردووی خۆی فڕێ داوەتە فلانە شیوەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بەزەیی بۆ پیاوەکە هاتەوە و لەگەڵیا تەشریفی بۆ شیوەکە برد و کچەکەی بەناوی خۆیەوە بانگ کرد ( یا فلانة أجیبي بإذن الله التعالى ). فەرمووی: فلانە کەس بە ئیزنی خوای باڵا دەست وەڵام بدەوە، کچەکە هاتە دەرەوە و دەیگوت ( لبیك و سعدیك ) پێی فەرموو: ( إن أبویك قد أسلما – فإن أحببت – أن أردك علیهما ) فەرمووی: دایك و باوکت موسڵمان بوون و گەر پێت خۆش بێت دەتگێڕمەوە بۆلایان. وتی: پێویستیم پێیان نیە، خوای گەورە لەوان باشترە بۆمن[2].

## ٨٤٣. فەتوای هەڵە دەربارەی قورئان

جارێکیان (إبن الباز) گوتبووی: دەبێت ئایەتەکانی قورئان بەگوێرەی لەفزەکەی مانا بکرێتەوە، نابێت لە زاهیری ئایەتەکە لابدەیت، یەکێك لە ئامادەبووان پێی گوتبوو: کەوابوو جەنابت کە لە دونیا کوێر و نابینای، لە قیامەتیش هەر کوێر و نابینا دەبی چونکە خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: ( ومن كان في هذه الدنيا أعمى فهو في الأخرة

---

[1] ژیانی ئازیزمان – ب ١ – ل ٦٩١ - ٦٩٢

[2] موعجیزاتی ئەحمەدی ل ١٢٩.

أعمي و أضل سبيلا ). واتە: ئەوەی لەم دونیایەدا کوێر بێت ئەوە لە قیامەتیشدا چاوی کوێرە و زۆر سەرگەردانتر و سەرلێشواوترە.

(إبن الباز) قسەی پێنەمابوو زانیبووی کە فتواکەی هەڵەیە سەری داخستبوو[1].

**٨٤٤. بەردەوام بوون ( الإستقامة )**

ئەگێڕنەوە: فەقێیەك هەبووە کە زانایان دەفەرموون ( إبن الحجر العسقلاني یان إبن الحجر الهیثمي بووە ) (رحمهما الله).

هەرچەندە دەرسی دەخوێند دەرسەکەی بۆ لەبەر نەدەکرا و ڕەنجەکەی بێ هوودە ئەمایەوە. نائومێد بوو، ناچار بوو دەست لە خوێندنەکەی هەڵبگرێ. ڕۆژێکیان بەڕێگایەکدا ئەڕۆیی و ڕێی کەوتە کاچێکی بەرز و سەخت. کە تەماشای کرد دیتی ئاوێك لەو کاچەوە دێتە دەرەوە و دڵۆپ ئەتکێتە خوارەوە بۆسەر تەختە بەردێکی پان. کەمێك لە تەختە بەردەکە ورد بووەوە و دیتی ئەو تەختە بەردە بەهۆی ئەو دڵۆپە ئاوانەوە چاڵێکی لێ پەیدا بووە. زۆر سەری سووڕما ئاخر چۆن بەهۆی ئەو دڵۆپە ئاوەوە بەو نەرمی و ناسکییە ئەو بەردە ڕەقە کوون بووە. لەئەنجامدا حاڵیی بوو کەبەهۆی بەردەوامی داچوڕانی ئاوەکەیەوە، لەم بیرکردنەوەی خۆیەوە بێداربووەوە بۆحاڵی خۆی و وتی: چۆن ئەو دڵۆپە ئاوە بەهۆی بەردەوامیەوە کار لەو بەردە دەکات و من نەتوانم بەهۆی بەردەوام بوونم لەسەر خوێندن نەتوانم بخوێنم هەرچەندە ڕۆژی یەك وشە فێرببم.

گەڕایەوە خوێندنگاکەی خۆی و دەستی کردەوە بە خوێندن و خوداش بەهرەیەکی باشی پێ بەخشی و بوو بە خوێندەوارێك ( زانایەکی ) باش لە ئاینی ئیسلام[2].

[1] کێ دەپەرستی. ل ٣٦ – ٣٧.

[2] بەهار و گوڵزار.ل: ٧٩-٨٠.

## ٨٤٥. خیانەت لە ئەمانەت

ئەگێڕنەوە لەسەردەمی فەرمانداری (عضد الدولة )ی بومیهیدا لە بەغدا کابرایەك لە دوورەوە هات بۆ بەغدا بۆئەوەی بچێت بۆحەج. لە بەغدا پرسیاری کرد کێ لەم شارەدا بە ئەمینی ناوبانگی دەرکردووە؟

کابرایەکیان پیشان دا کە بە ئەمینی ناوبانگی دەرکردبوو، چووە لای و لەپاش مەرحەبا و خۆ پێناساندن پێی وت: من گەردن بەندێکم پێیە بایی هەزار دینارە، ئەمەوێ لای تۆ بە ئەمانەت دایبنێم تا لەم سەفەری خێرە دەگەڕێمەوە بۆبەغدا.

ئەویش وتی: باشە فەرموو، گەردن بەندەکەی لێوەرگرت. کابراچووە حەج و گەڕایەوە بۆ بەغدا و دوو سێ ڕۆژ پاش حەسانەوە چووە لای کابرای ئەمین و پاش سەلام و مەرحەبا داوای ئەمانەتەکەی لێکردەوە و ئەویش ئینکاری کرد و گوتی ئەمانەتی تۆم لانیە. حاجی هەرچەند ناونیشانی هەڵدا سوودی نەبوو. پاش نائومێد بوون ڕاوێژی بەچەند دۆست و برادەرێك کرد ئەوانیش پێیان گوت پێویستە بەتایبەتی بچیتە لای (عضد الدولة ) ئەو ڕێگایەکت بۆ دادەنێ و چارەیەکت نیشان دەدا.

حاجی هەرچۆنێك بوو چووە لای (عضد الدولة ) و باسەکەی بۆ گێڕایەوە و (عضد الدولة ) وتی چارت ئەوەیە کە سبەینێ لە فلانە سەعاتدا بچیتە سەر دوکانی کابرای ئەمین دانیشی. من بەوێدا تێدەپەڕم و سەلامت لێدەکەم و گلەییەکی زۆرت لێدەکەم کەوا بۆچ هاتوی بۆ بەغدا و سەرت لەمن نەداوە و تۆش بێ موبالاتانە وەلامی من دەدەیەوە بزانین ئەنجامی چۆن ئەبێ. بۆ بەیانی حاجی چووە لای کابرا و لەسەر دوکانەکەی دانیشت و ئەوەندەی پێ نەچوو (عضد الدولة ) بەویادا گوزەری کرد، کە حاجی دی دابەزی و سەلامی کرد و گلەیی ئەوەی کرد کە بۆچی سەردانی نەکردووە و وتی کەی دۆستیی و برادەریی وادەبێ !.

حاجی وتی: ئەمجارە بە سەفەری دین هاتم و نەمتوانی دنیای تێکەڵ بکەم، هەڵی گرە بۆجارێکی تر، دوای ئەم گفتوگۆیە (عضد الدولة ) چوو بەڕێی خۆیدا. کابرای بەناو ئەمین کە ئەمەی دی گیانی تیا نەما گوتی مادام ئەوە ئەوەندە دۆستی (عضد الدولة ) بێ

ئەوا سکالای لای ئەو دەکات و (عضد الدولة ) لەناوم دەبا. ڕووی کردە حاجی و گوتی بۆ خاتری خودا تۆبۆچی منت شەرمەزار کرد! بۆچی ناونیشانی خۆت بەباشی هەڵنەدا تا بتناسمەوە ؟ ئێستا ئەتناسمەوە و فەرموو ئەوە ئەمانەتەکەت و گەردن بەندەکەی دایەوە، حاجی چووە لای (عضد الدولة ) و پاشماوەی سەرگوزەشتەکەی بۆ گێڕایەوە و ئەویش فەرمانی کرد و گرتیان و کردیان بە دارا و تەختەیەکیشیان بەسەریا هەڵواسی لێیان نووسی بوو: ئەوە سزای ئەو کەسانەیە کە خیانەت لە ئەمانەت دەکەن[١].

## ٨٤٦. پێگەیشتن و پێناسەکەی

کەسێك دەڵێت سەبارەت بە پێگەیشتن پرسیارم لەگەورەیەك کرد و وتی: لە نووسینەکاندا هاتووە کە سێ نیشانەی هەیە: یەکەم تەمەنی پانزە سالآنی و دووەم لەخەودا ئیحتیلام بوون و سێهەمیش دەرهاتنی مووی بەر. بەڵام لە ڕاستیدا تەنیا نیشانەیەکی هەیە ئەویش کە لەلای خوای گەورە و مەزن خۆت لەوە زیاتر پیشان بدەی تا ئەوەی کە گیرۆدەی نەفس و هەوەسی خۆت بیت، ئەو کەسەش کە ئاوا نەبێت زانایان بە پێگەیشتووی نازانن[٢].

## ٨٤٧. ڕێزی ئایین بگرە

ڕۆژێکیان دزێك پاکەتێکی دۆزییەوە زۆرشتی بەنرخی تێدابوو هەروەها ئایەتی کورسیشی پێوە لکا بوو. دزەکە پاکەتەکەی گەڕاندەوە بۆلای خاوەنەکەی، هۆیەکەیان لێپرسی وتی: بەبڕوای خاوەنی ئەمماڵە ئەم ئایەتە ماڵەکەی لە دەستی دز دوور ڕادەگرێت، من دزی ماڵم نەك دزی ئایین و بیر و باوەڕ ! گەر من ئەوەم نەگەڕاندبایەوە شك و دوو دڵی لەلایەن خاوەنەکەی بەرامبەر ئایینەکەی درووست دەبوو، ئەوکات من دەبووم بە دزی ئایینیش[٣].

---

[١] بەهار و گوڵزار، ل١٥٧-١٥٨

[٢] ڕەوشت بەرزی،ل: ٨٣

[٣] ڕەوشت بەرزی، ل: ٨٥

### ٨٤٨. تۆبەی عەتر فرۆش

دەگێرنـەوە هـۆی تۆبـەی عـەتر فـرۆش نـەوەبوو: ڕۆژێـك لـە دوكانەكـەی خـەریكی خوێندنەوە بوو، دەروێشێك هاتە ژوور و چەندین جار وتـی ( الله اكبر ) بـەلاَم عـەتر فـرۆش هەر بۆلای نەهات.

دەروێش وتی: تۆ چۆن دەمری؟

عەتر فرۆش: هەروەك ئەو شێوازەی كە تۆ دەمری.

دەروێش: تۆ دەتوانی وەكو من بمری؟

عەتر فرۆش: بەڵێ.

دەروێش پیاڵەیەكی چێوی هەبوو، لەسەر سەری دانا و وتی ( الله ) و مـرد. عـەتر فـرۆش كـە ئەمەی بینی پەشۆكا و دوكانەكەی تێكدا و هاتە سەر مەسلەكی ئەو[١].

### ٨٤٩. نەخۆش بوون نیشانەی باوەڕدارییە

پیاوێك داوای ئاوی لە خێزانەكەی كـرد و ژنەكـەش چـوو ئـاوی بـۆ هێنـا و سـەیری كـرد كـە پیاوەكـەی خـەوی لێكـەوتووە و لەسـەر سـەری وەسـتا تـا بـەیانی. كاتێـك پیاوەكـە لەخەو هەستا بینی ژنەكەی وا لە ژوور سەری وەستا و پەرداخە ئاوەكەشـی هـەر لـە دەسـت دایە، زۆری پێ خۆش بوو و كەیفی هات. بە ژنەكەی گوت شـتێكم پـێ بڵـێ بـا بـۆتی بكـەم و ژنەكەش گوتی تەلاَقم بدە.

پیاوەكەش پێی ناخۆش بوو، ژنەكە وتی ئەگەر دەتەوێ پاداشتم بكـەی ئـەوا تـەلاقم بدە، پێكەوە چوونە لای حـەزرەتی پێغەمبـەر ( ﷺ ) لـەڕێگا پیاوەكـە كـەوت و قاچـی شـكا، ژنەكـە وتـی: بـا بگەڕێینـەوە تـازە پێویسـت ناكـات تـەلاَقم بـدەی لەبـەر ئـەوەی تـۆ فەرموودەیەكی پێغەمبەر ( ﷺ )ت بۆمن باس كرد كە دەفـەرموێ ( هەركەسـێك كـە خـوای گـەورە حـەز بكـا و بیهـەوێ چـاكەی بـداتێ ئـەوا تووشـی بـەلاَ و نەخۆشـی دەكـات، ئـەتوش ئەوەندە و ئەوەندە ساڵە لای منی هیچ بـەلاَ و نەخۆشـییەكت بەسـەر نـەهاتووە و وام دەزانـی

[١] ڕەوشت بەرزی، ل: ٨٧

کە خوای گەورە تۆی خۆش ناوێ بەڵام کاتێک ئەوەت بەسەر هات زانیم کە خوای گەورە تۆی خۆش دەوێ[1].

## ٨٥٠. گومانی باش بەخوا ببەن

ئیمام محمد النیسابوری ( رحمە الله ) دەفەرموێ: کەسێکم لە خەو بینی و پێم گوت: ئایا خوای گەورە چی لەگەڵ کردی؟

گوتی: ئەی پیاوی پیری خراپ تۆ دەچوویە لای بەرپرسەکان و حەزت لەماڵی دونیای وان بوو. منیش گوتم: ئەی پەروەردگار ژیانی دونیا ناخۆش و بە غەم و زەحمەت و تەنگ بوو و منیش خێزان و ماڵ و منداڵم هەبوو. خوای گەورە ئەمری کرد کە بمبەنە جەهەننەم و منیش گوتم ئەی خوای گەورە من بەرامبەر تۆ گومانم وا نەبوو.

خوای گەورە فەرمووی: ئەی گومانت بەرامبەر من چۆن بوو؟ منیش گوتم یەحیا لە شوعبە بۆی باس کردووم و پێی ڕاگەیاندووم و ئەویش لە حەزرەتی قەتادە و ئەویش لە حەزرەتی ئەنەسی کوڕی مالیك و ئەویش لە حەزرەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەویش لە حەزرەتی جوبرائیل ( علیە السلام ) و ئەویش لە تۆ کە تۆ فەرمووتە: من لای گومانی بەندەی خۆمم بەمن، کەچۆن گومانم پێدەبا ئایا لێی خۆش دەبم یان عەزابی دەدەم ). خوای گەورە فەرمووی: یەحیا و شوعبە ز قەتادە و ئەنەس و پێغەمبەرەکەم محمد ( ﷺ ) و جوبریل ( علیە السلام ) ڕاستدەکەن کە من وام گوتووە، بۆنی خۆش کردم و حەفتا زێڕیشی بەبەر کردم و تاجیشی لەسەر نام و بەناو منداڵە زیندووەکانی ئەهلی بەهەشتدا منیان برد بۆ بەهەشت[2].

## ٨٥١. خێرکردن و دوعای پیاو چاکان

مەنصوری کوڕی عەممار (ﷺ) ڕۆژێك وتاری بۆخەڵك دەدا و پیاوێك لەوێ هەستاوە و داوای چوار درهەمی کرد و مەنصور فەرمووی: هەرکەسێك چوار درهەمی بداتێ من چوار دوعای بۆ دەکەم، کابرایەك کە بەندە و کۆیلەی کەسێکی یەهوودی بوو

---

[1] حکایات و قصص من حیاة السابقین، ص:٧٦ .

[2] حکایات و قصص من حیاة السابقین، ص: ١٠٩ .

هەستاوە و چوار درهەمی پێدا و پاشان گوتی: دوعام بۆ بکە لە بەندایەتی ڕزگاربم و مـن هەژارم لە خوا بپاڕێوە کە دەوڵەمەندم بکات و تاوانبارم و گوناهم هەیە لەخوا بپاڕێوە لە تاوانەکانم خۆش بێ و دوعام بۆبکە کە گەورەکەم موسڵمان بێ و ئەویش دوعاکانی بۆکرد.

کاتێك گەرایەوە لای گەورەکەی و گەورەکەی لێی پرسی: ئایا بۆچی دواکەوتی لە هاتنت بۆلای من؟ وتی: لە مەجلیسی مەنصوری کوڕی عەممار دانیشتبووم و چوار درهەمم کردە خێر و ئەویش چوار دوعای بۆکردم کە لەبەندایەتی ئازاد بم. گەورەکەی وتی: ئەوە لە پێناو خودای گەورە تۆ ئازادی.

دوعای کرد کە خوای گەورە ماڵ و سامانم پێ ببەخشێ و گەورەکەی وتی ئەوە چوار هەزار درهەم بۆتۆ. وە دوعای کرد تاکو تو موسڵمان ببی و گەورەکەی گوتی ( أشهد ان لا اله الا الله و أشهد أن محمدا رسول الله ). وە دوعای کرد کە خوای گەورە لەمن و تۆ خۆش بێ و ئەویش گوتی ئەوە لە دەسەڵاتی من نیە.

گەورەکەی لە خەودا بینی کە کەسێك بانگی دەکرد: ئەتۆ ئەوەی لە دەستت دابوو جێبەجێت کرد، ئێمەش ئەوەی لە دەسەڵاتمان دا بێ دەیکەین ئەوە لە تۆ و لەبەندەکەت و لەو وتاربێژە و هەموو ئامادەبووان خۆش بووین[1].

س:.

**٨٥٢. عیزرائیل ( ملك الموت ) خۆشەویستی دەگەیەنێت بە خۆشەویستی ( سیفەتێکی خۆشی عیزرائیل )**

حەزرەتی (ملك الموت) (علیه السلام) گەیشتە ئیمانداریك ئیماندارەکەلیی پرسی تۆکێی ؟ حەزرەت وەڵامی دایەوە: من لەناو بەری چێژەکانم و چووتەکان لەیەك جیادەکەمەوە. کابرا وتی: هەی جوامێر تۆ هەر خەسڵەتە خراپەکان (ترسناکەکان)ت نیشان دەدەی و سەبارەت بە خەسڵەتە باشەکانت بۆ بەندەکانت هیچ نالێی؟

حەزرەت فەرمووی: خەسڵەتی باشم چیە ؟

---

[1] هە مان سە رچاوە،ل: ١٠٩

ئیماندار: تۆ هەڤاڵ دەگەیەنی بۆلای هەڤاڵەكەی![1]

### ٨٥٣. ژماردنی نیعمەت

عبدالله الفرج العابد وتی: لەماوەی شەو و ڕۆژێكدا لە خۆمدا چوارده هەزار نیعمەتم ژمارد، وتیان: ژماردنەكەی چۆن بوو؟ وتی: لە شەو ڕۆژێكدا هەناسەكانی خۆم ژمارد چواردەهەزار دانە بوون[2].

### ٨٥٤. حەج كردنی تەواو

كەسێك هاتە لای شیخ شبلی ( رحمه الله) پێی گوت: لە كوێوە دێی ؟ وتی: لە حەج بووم. فەرمووی: حەجت كرد ؟ وتی: بەڵێ.

فەرمووی: سەرەتا كە چوویتە دەرەوە ماڵئاواییت لە نیشتمان كرد، ئاخۆ لە گشت گوناهەكانیشت ماڵئاواییت كرد ؟

وتی: نا. فەرمووی: كەواتە تۆ كۆچت نەكردووە. فەرمووی: چووی بۆ مەككە ؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: ئاخۆ لەلایەن خوای گەورە ئاگادار كرایەوە بۆچوون بۆ مەككە ؟ وتی: نا. فەرمووی: كەواتە بۆ مەككە نەچوویت. فەرمووی: چوویە ژووری حەرەمەوە (ناو حەرەمی مەككە)؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: كاتێك چوویە ژوورەوە بەڵێنت دا كە واز لەهەموو شتێكی حەرام بێنی. وتی: نا. فەرمووی: كەواتە نەچوویە ژوورەوە. فەرمووی: كەعبەت بینی؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: ئەو شتەی كە بە نیازی بویت بینیت ؟ وتی: نا. فەرمووی: كەواتە كەعبەشت نەدیوە. فەرمووی: سێ بەردەكەت هەڵاویشت و ئامادەی بەردی چوارەم بویت؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: كەوایە تۆ لە دنیا ڕات كرد بەم شێوازە كەتۆ بزانی لێی دووركەوتیتەوە و واتزت لێ هێنابێ دواجار بە هاویشتنی بەردی چووارەم هێور بوویتەوە و بەم هۆیەش سوپاسی خوات كردبێ؟ وتی: نا. فەرمووی: كەوایە بەردت هەڵنەداوە. فەرمووی: لە صەفا هاتیتە خوارەوە ؟ وتی:بەلی. فەرمووی: هەموو هۆیەكت لێ دووركەوتەوە بۆئەوەی كە صەفا بدۆزیتەوە؟ وتی: نا. فەرمووی: كەوایە سەرنەكەوتووی لە

[1] ڕەوشت بەرزی، لا: ٩١.

[2] ڕەوشت بەرزی، لا: ٩٣.

صەفا و نەهاتویتە خوارەوە. فەرمووی: عەرەفاتت تێپەڕ کرد؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: زانیت لەبەر چی خولقێنراوی ؟ وتی: نا. فەرمووی: کەواتە نەچوویە عەرەفاتیش.

فەرمووی: تۆ دەبێ بگەڕێیتەوە بۆئەوەی بزانی چۆن لەمەو دوا گشتی ئەوکارانە بکەیت، ئێستاکە من حەجم بەتۆ ناساند بۆئەوەی کە هەرجارەی چووی بۆ حەج هەوڵدەی گشتی ئەو کارانە بکەی[1].

## ٨٥٥. شوێن کەوتنی پیاو چاکان

شێخ حەسەنی بەصری (ﷺ) پۆلێك خەڵکی بینی کەلەسەر تەرمی پیاو چاکێك کۆببونەوە، فەرمووی: بۆچی لەسەر تەرمەکەی کۆدەبنەوە؟ کار و کردتان وەك ئەو بێت بۆئەوەی وەکو ئەوبن[2].

## ٨٥٦. ماڵ و ژیانی دونیا

گەشتیارێکی ئەمریکی چووە قاهیرە بۆئەوەی سەردانی ڕۆحانییەکی گەورە بکات. گەشتیارەکە بەو پەڕی سەرسوڕمانەوە بینی پیاو ە ڕۆحانییەکە لە ژوورێکی سادەدا دەژی. ژوورەکە پڕ لە کتێب بوو و جگە لەوە تەنیا مێز و کورسیەك دەبینرا. گەشتیارەکە پرسی: کوا شتومەکی ناو ماڵتان؟ ڕۆحانی وتی: هی تۆ لە کوێیە ؟ گەشتیار وتی: بەڵام مانەوەی من لێرە کاتییە و پێویستم بە شتومەك نیە.

ڕۆحانی وتی: هەروەها منیش. ( واتا منیش ژیانم لەم دونیایەدا کاتییە ).

## ٨٥٧. خەمەکانت مەبە ماڵەوە

پیاوێك، دارتاشێکی بۆ یارمەتی لە نوێ کردنەوەی خانووەکەیدا دامەزراند. لەهەمان ڕۆژی یەکەمدا چەند کیشەیەك بۆ کابرای دارتاش دروست بوو، سەرەتا شووشەی ئۆتۆمبێلەکەی شکا. بووە هۆی ئەوەی کاتژمێرێك لە کاتی بەفیڕۆ بچێ، پاشان مشارەکەی

---

[1] ڕەوشت بەرزی، ل: ٩٣-٩٤.

[2] ڕەوشت بەرزی، ل: ١٠١.

تێکچوو و ئۆتۆمبێلە بارهەڵگرە کۆنەکەی دانەگیرسا. ئەو پیاوەی کە دایمەزراندبوو بڕیاری دا بیگەڕێنێتەوەماڵەوە و دارتاشەکەش لە بێدەنگییەکی قورسدا مابۆوە و چووە ماڵەوە، دارتاشەکە فەرمووی لە کابرا کرد کە بێتە ژوورەوە و چاوی بە خانەوادەکەی بکەوێت. کاتێك لە دەرگای ماڵەوە نزیك دەبوونەوە دارتاشەکە لە نزیك درەختێکی بچووك کەمێك وەستا و پەلێکی دارەکەی بە هەردوو دەستی گرت، کاتی کرانەوەی دەرگای ماڵەکە گۆڕانێکی سەیر بە سەر روخسار و رەفتاری دارتاشەکەدا هات. روخساری بە خەندەیەك کرایەوە و دوو منداڵەکەی لە باوەش گرت و هاوسەرەکەی ماچ کرد. پاش ناساندنی ئەو پیاوە بە خانەوادەکەی، تا نزیك ئۆتۆمبێلەکەی هاوڕێیەتی کرد و ئەوان بە نزیك درەختەکە تێپەڕین. کابرا خۆی پێ نەگیرا و لەبارەی ئەوەی روویدا لەنێوان دارتاشەکە و درەختەکە پرسیاری کرد.

دارتاش گوتی: ئەو درەختە درەختی کێشەکانی منن. دەزانم ئەو ناتوانێ لە چارەسەرکردنی کێشەکانم یارمەتیم بدا بەلام لەبەر ئەوەی دڵنیام لەوەی کە کێشەکانم پەیوەندی بە ماڵ و منداڵمەوە نیە هەر بۆیەش شەوانە کاتێك دەگەڕێمەوە ماڵ، کێشەکانم بە درەختەکە هەڵدەواسم، پاشان کە بەیانی هەڵیان دەگرمەوە، سەیر لەوەدایە کاتێك بەیانی دەچمەوە لای درەختەکە تاکو کێشەکانم هەڵبگرم، زۆربەیان نەماون و ئەوانی تریش زۆر سووکتر بوونە[1].

**٨٥٨. هێزی ئیرادە**

یەکێك لە خەلیفەکان لە منداڵییەوە خووی بە گوڵ خواردنەوە گرتبوو، ڕۆژێك بە پزیشکەکەی خۆی گوت چی بکەم تا ئەم خووە تەرك کەم؟ پزیشك وتی: ئیرادەیەك وەك ئیرادەی مرۆڤی بەرز.

وتی: ڕاست دەکەی و ئیتر ئەم کارەی دووبارە نەکردووە[2].

---

[1] بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری؟. ل: ١٧١ — ١٧٢.

[2] ڕەوشت بەرزی، ل: ١٠٣.

### ٨٥٩. گەورەترین بەخشش سەلامەتییە

شێخ زەننونی حەکیم ( رحمه الله ) پیاوێکی خەفەتباری لە کەنار دەریا بینی خەمی بو دنیا دەخوارد، شێخ فەرمووی: خەم لە دونیا مەخۆ ئەگەر لەو پەڕی هێز و دەسەڵاتدا لەناو کەشتیەك بویتایە و کەشتیەکەت شکابا و بەرەو نقووم بوون رۆیشتبا، ئایا دوا ئاواتی تۆ ئەوە نەبوو کە ڕزگارت بێ و هەموو سەروەت و سامانەکەت لە دەست بدەی ؟ وتی: بەڵێ. شیخ فەرمووی: ئەگەر فەرمانڕەوای دونیا بویتایە و هەموو خەڵکی دەوروبەرت نیازی کوشتنی تۆیان هەبووایە. ئایا ئاواتی تۆ ڕزگار بوون نەبوو لەدەستی ئەوان ؟ تەنانەت بە لەدەست دانی هەموو دەسەڵاتەکەت ؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: ئێستا بیر بکەوە تۆ هەمان خاوەن دەسەڵات و هەمان پاشای کە سەروەت و سامانەکەت لە دەست داوە بەڵام گیانت پارێزراوە و کابرا بەم قسانە هێور بووەوە[١].

### ٨٦٠. دڵخۆشکردنی موسڵمانان، ڕێگەی گەیشتن بە خودا

محمد بن منور دەڵێ: پرسیاریان لە شێخی ئێمە کرد کە مەودای گەیشتن بە خوا چەندە؟

وتی: لەهەزار ڕێگە زیاترە و هێندەی ژمارەی بوونەوەران ڕێگە هەیە بۆ گەیشتن بەخوا، بەڵام هیچ ڕێگەیەك باشتر و نزیکتر و ئاسانتر نیە لەوەی کە دڵی باوەڕدارێك خۆش بکەی و ئێمە بەم ڕێگەیەدا ڕۆیشتین و ئەمەمان هەڵبژارد[٢].

### ٨٦١. ڕەمزی ژیان

منداڵێکی هەشت ساڵان لە پیرە پیاوێك نزیك بۆوە، چاوی برییە ناو چاوی و پێی وت: من دەزانم کە ئێوە زۆر زۆر پێگەیشتوون و حەز دەکەم ڕەمزی ژیان لە زاری ئێوەوە ببیستم. پیرە پیاو سەیرێکی کوڕەکەی کرد و وەڵامی دایەوە و وتی: من سارد و گەرمی ڕۆژگارم چەشتووە و بەم ئەنجامە گەیشتووم کە ڕەمزی ژیان لەچوار وشەدا کورت دەکرێتەوە.

---

[١] ڕەوشت بەرزی، ل: ١٠٦.

[٢] ڕەوشت بەرزی، ل: ١١١.

١- بیركردنەوە: هەمیشە بیر لەو بەهایانە بكەرەوە كە پێت خۆشە ببن بە كۆڵەگەی ژیانت.

٢- باوەڕ: كاتێك بیرت لەو شتانە كردەوە و دەست نیشانت كردن، باوەڕت بەخۆت بێ.

٣- خەیاڵ: تەنیا خەیاڵی ئەو داخوازییانەت لەسەر دابێ كەلەسەر بنەمای باوەڕ بەخۆبوون و بەهاكانی ژیانت شێوەیان گرتبێ.

٤- بوێری: كاتێك كە باوەڕت بەخۆت بو و بەتەواوی هەستت بە بەهای بوونی خۆت كرد، نۆرەی ئەوە دێت كە بەو پەڕی بوێریەوە خەیاڵەكانت بكەی بە ڕاست.

ئەم پیرەمێرد جگە لە ( واڵت دیزنی ) كەسی تر نەبوو، لە كۆتاییدا وتی: كوڕم ئەم چوار وشەیەت لەبیر نەچێت: بیركردنەوە، باوەڕ، خەیاڵ و بوێری[١].

## ٨٦٢. زانایی عبداللە كوڕی ئیمامی عەبباس

لە حەزرەتی أبو صالحەوە ( ﷺ ) من كۆڕی وام لە ئیبن عەبباس دیوە ( ﷺ ) ئەگەر هەموو قوڕەیش شانازی پێوە بكات جێگەی خۆیەتی. دیومە ئەوەندە خەڵك كۆبۆتەوە هەتا ڕێگا نەماوە بۆلای و كەس نەیتوانیوە لە جێگەی خۆی هەڵسێ و بڕوا.

دەگێڕێتەوە: چوومە لای و پێم ڕاگەیاند ومزعی بەردەرگا چۆنە؟ فەرمووی: بڕۆ ئاوی دەست نوێژەكەم بۆ ساز بكە. دەفەرموێ: دەست نوێژی هەلگرت و چووە دەرەوە پێی فەرموون: هەركەس دەیەوێ دەربارەی قورئان و پیتەكانی و هەرچی دەربارەی قورئان پرسیاری هەیە با بێتە ژووری. دەفەرموێ: چوومە دەرەوە و ڕێگەم پێدان هەتا ماڵ و ژوورەكەیان پڕ كرد. هەرچی لێیان پرسی وەلامی دانەوە و زۆر لەوەش زیاتر كە پرسیاریان دەكرد و قسەی بۆ كردن.

دوایە فەرمووی: ئەمجارە نۆرەی براكانتانە. چوونە دەرەوە. دوایە فەرمووی: بچۆ پێیان بڵێ هەركەس پرسیاری هەیە دەربارەی تەفسیری قورئان و لێكدانەوەی با بێتە ژووری.

[١] بەهەشت یان دۆزەخ كامیان هەڵدەبژێری؟، ل : ٢١٧-٢١٨.

دەفــەرموێ: چــوومە دەرەوە و ڕێگەمـــدان هاتنـــە ژوورەوە تـــاکو مـــاڵ و ژوورەکەیان پڕ کرد، هەرچی لێیان پرسی وەلامی دانەوە زۆر زیاتریش.

دوایە فەرمووی: براکانتان. دەفەرموێ: چوونە دەرەوە. دوایە فـەرمووی: بـڕۆ دەرەوە و پێیـان بڵێ هەرکـەس دەیـەوێ دەربـارەی ڕەوا و نـا ڕەوا و شـەرع پرسـیار بکـات بـا بێتـە ژوورەوە. چوومە دەرەوە و پێم وتن، چوونە ژوورەوە هەتا ژوور و ماڵەکـەیان پـڕ کـرد و وەڵامـی هـەموانی داوە و زۆر زیـاتریش. دوایـە فـەرمووی: براکانتـان. پاشـان فـەرمووی: بـڕۆ دەرەوە پێیـان بڵـێ هەرکـەس دەیـەوێ دەربـارەی زمـانی عـەرەبی و شـیعر و وشـە گرانەکان پرسیار بکات با بفەرموێ.

## ٨٦٣. عیبادەت كردن بۆ خوا و ئە نجامەكەی

سولەیمان لە مەنصوری كوڕی عەممارەوە دەگێڕێتەوە: لە مەجلیسی بابی مەنصور دانیشتبووم كاغەزێك كەوتە مەجلیسەوە تێیدا نووسرابوو ( بسم الله الرحمن الرحیم ) ئەی بابی مەنصور من پیاوێكم تۆ لەسەر دەستی تۆ تەوبەم كرد، من حۆرییەكم لە خوای گەورە كڕیوە بە سێ خەتمە قورئان و من بیست و نۆ خەتمم كردووە و لە سییەمین بووم خەو بەسەرمدا زاڵبوو و چاوەكانم كەوتنە سەر یەك و لە خەوندا بینیم هەروەكو ئەوە وابوو حۆرییەك هاتە دەرەوە و تەماشای كردم و شیعرێكی گوت بە دەنگە ناسكەكەی:

أغطب مثلي و عني تنا م    و نوم المحبيت عني حرام

لأنا خلقنا لكل امر يء    كثير الصلاة براه الصيام

واتە: داخوازی هاوشێوەی من دەكەی و لەباتی منیش دەخەوی وە خەوتنی خۆشە و سیتا لەمن حەرامە من درووست كراوم بۆ هەموو كەسانێك كە زۆر نوێژ دەكەن و بە ڕۆژوو دەبن[1].

## ٨٦٤. كەرامەتێكی حەزرەتی شێخ عوسمانی بیارە ( قدس الله سره )

خوا لێیخۆشبێت: حاجی شێخ حەمە سەعیدی دەگاشێخان ی مەریوان دەگێڕێتەوە: باخێكمان هەبوو ماوەی پێنج ساڵ بەری نەدەگرت و سەمەری نەئەدا، تا هاتمە خزمەت شێخ عوسمان و عەرزم كرد: قوربان زەحمەتی زۆرم لەگەڵ ئەو باخە كێشاوە و بەهەموو جۆرێ لەگەڵی خەریكم و بەر ناگرێ، حەزرەت فەرمووی: بڕۆوەماڵەوە و تەورێ لەگەڵ خۆت ببە ناو باخەكە و لە زمانی منەوە هەر بە ئاشكرا بڵێ: باخەكە شێخ دەفەرموێ: لەمەولا وەكو هەموو باخێكی تر بەر بگرن ئەگەرنا بە خاوەنەكەتان دەڵێم بتانبڕێ، ئیتر بەر ئەگرن.

[1] روائع حكايات أهل الجنة – ص ١٣٩

حاجی وتی: منیش کە چوومەوە ئەمرەکەی شێخم بە جێهێنا و خوا دەزانێ هەر ئەو ساڵە بەرێکی زۆر زۆری گرت و تا ئێستاش هەر بەردەوامە و لەبەر گرتن نەکەوتووە[1].

**٨٦٥. گەورەیی دانیشتن لە خزمەت پیاوچاکان**

جارێک سوڵتانێك چووە خزمەت یەکێ لە شێخەکان و پرسیاری لە حەزرەتی ( أبو یزیدی بسطامی ) لێکرد کە پیاوێکی چۆن بووە؟

ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: هەرکەسێك سەعاتێك لە خزمەتی بووبێ بە سەعادەتی ئەبەدی گەیشتووە، سوڵتانیش بەسەرسوڕمانەوە گوتی: باشە کافرەکان زۆر لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوون و هیچیان بە سەعادەت نەگەیشتن.

ئەویش فەرمووی: کافرەکان لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) نەبوون بەڵکو ڕەفاقەتی محمد ی کوڕی عبدالله یان کردووە، کەچی هاوەڵان بە خزمەتی گەیشتن و بە سەعادەت گەیشتن[2].

**٨٦٦. کەرامەتی حەزرەتی شێخ عوسمانی بیارە ( قدس الله سره )**

جارێك کەسێك هات و هاوار و دادێکی زۆری کرد و وتی بە حەزرەتی شێخ عوسمان: قوربان هەرچیم هەبوو دز بردی یەکسەر. شێخ فەرمووی: چی بردووە؟ هەر گوێ درێژێکی بردووی نرخی هەر پێنج قڕان ئەژیا.

کابرا فەرمووی: قوربان ڕاست ئەفەرموی، بەڵام هەموو کار و بارم بەو وڵاخە دەڕۆیی، کاروانم ئەکرد و باڕاشم پێ دەهاڕی و دارم پێ دەهێنا و هەموو ئیش و کارم ئەو تێیدەپەڕاند. زۆر زۆر بە عاجزی خۆی دەرخست و حەزرەت زۆر بەزەیی پێدا هاتەوە و فەرمووی: بڕۆرەوە و سێ ڕۆژی تر ئەیدۆزیتەوە، هەروابوو کە فەرمووی[3].

[1] بریسکەی یاقووت — ل ١٣٥

[2] باخچەی بۆن خۆشان — ل ٣٤.

[3] باخچەی بۆن خۆشان ، ل ٧٧ — ٧٨.

## ٨٦٧. کەرامەتی حەزرەتی شێخ عوسمانی بیارە ( قدس الله سره )

مامۆستا مەلا عبدالله ی کاتب دەفەرموی: شێخ عوسمانی بیارە دەیفەرموو: جارێك لەگەڵ جەماعەتێك چووین بۆ سەردانی شیخ وەیسی قەرەنی (ﷺ) کە بەسەر شاخێکەوەیە و هیچ ئاوی لێ نیە و هەر کەس بچێ بۆ زیارەتی دەبێ ئاو لەگەڵ خۆی ببا، وە مەرقەدەکەی نزیکەی بیست تا بیست و پێنج کیلۆمەتر کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری کرماشان ی ئێران، لەهەموو لایەکەوە خەڵك ئەچن بۆ زیارەتی.

شێخ فەرمووی: ماوەیەکی بەسەرا چوو ویستم دەست نوێژ نوێ بکەمەوە بەبێ ئاگاداری ڕەفیقەکانم مەسافەیەك دوور کەوتمەوە لە مەرقەد، تەماشام کرد ئاوێکی زۆر ڕوون و جوان دەرئەقولێ و منیش زۆرم حەز کرد و وتم لەوانەیە ئەو ئاوە بە بەردەوامی بێ بۆ سەردانیکەران، هاتمەوە بۆلای ڕەفیقەکانم و بۆیانم گێڕاوە و زۆریان پێ سەیر بوو و وتیان:/ چەند ساڵە خەڵك دێن بۆ ئێرە و هیچ کەسێکیش ئاوی نەدیوە، منیش پێم وتن ئەگەر باوەڕ ناکەن وەرن با بچین تەماشای بکەین، کە چووین تەماشامان کرد ئاوەکە وشك ببوو بەڵام تا ئەو کاتیش تەڕایی شوێنەکە مابوو. ئینجا بۆمان دەرکەوت کە ئەوە لوتفێکی تایبەتی ئەو زاتە بوو لەگەڵ شێخ عوسمان.

شێخ فەرمووی: سوپاس بۆ خوا.

## ٨٦٨. بەهانای موسڵمانی هەژار بێی خوای گەورە فەرەبووت بۆ دەکاتەوە

ڕاوچییەك هەبوو ناوی بیلال بوو، لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا لە خانووێکی بچووکی نزیك ڕووباری نیل دەژیا، ئەو ڕاوچییە هەژار بوو هەموو ڕۆژێ دەچوە سەر ڕووباری نیل بۆئەوەی ڕاوی ماسی بکات و پاشان لە بازاڕ دەیفرۆشتەوە و بە نرخەکەی خواردنی دەکڕی بۆ ژن و منداڵەکانی، ڕۆژێك بیلال لە خەو هەڵسا بینی منداڵەکانی دەگرین، لە ژنەکەی پرسی بۆچی دەگرین؟ ژنەکەی وتی: ئەوان بەهۆی برسییەتیەوە دەگرین چونکە لە دوێنێوە پاروویەك نانیان نەخواردووە. بیلالیش گوتی: ئێستا ئەڕۆم پشت بەخوا لە ڕووبارەکە ماسی ڕاو دەکەم و پاشان دەیفرۆشم و بە پارەکەی خواردن دەکڕم. بیلال تۆڕی ماسییەکەی ئامادەکرد و ڕۆیشت بەرەو ڕووبارەکە و وتی بسم الله

تۆڕەکەی هەڵدایە ناو ئاوەکە و دوای ماوەیەکی کەم تۆڕەکەی دەرهێنا و بینی وا ماسییەکی گەورەی پێوە بووە. بیلال زۆر دڵخۆش بوو بە ماسییەکە و چووە بازاڕ فرۆشتی و پاشان گەڕایەوە ماڵ تا خواردن بە ژن و منداڵەکانی بدا، کاتێك بەڕێگادا دەگەڕایەوە ئافرەتێکی بە تەمەنی بینی کە زۆر بە خەفەتەوە دەگریا، لێی پرسی: پووری گیان بۆچی دەگری؟ ئەویش وتی: بەهۆی برسییەتی زۆرەوە دەگریم چونکە دوو ڕۆژە پاروویەك نانم نەخواردووە نەخۆم و نە منداڵەکانم و هیچ پارەیەکیشم نییە تا خواردنی پێ بکڕم. بیلال زۆر خەفەتبار بوو و بەخۆی وت: ئێستا ژن و منداڵەکانم بەهۆی برسییەتیەوە دەگرین، ئەو ئافرەتە و منداڵەکانیشی هەر بەهۆی برسییەتیەوە دەگرین، ئەی من چی بکەم باشە؟ بۆیە بیلال بڕیاری دا تا خواردنەکە هەمووی بدات بەو ئافرەتە و منداڵەکانی چونکە بیلال دڵنیابوو لەوەی کە خوای گەورە قەرەبووی بۆ دەکاتەوە، ئافرەتەکە خواردنەکەی لێ وەرگرت و لەو پەڕی خۆشی و شادی دا بوو و دوعای خێری بۆ دەکرد، بیلالیش کەوتە ڕێ و هەر بیری دەکردەوە باشە من چی وەڵامی ژن و منداڵەکانم بدەمەوە؟! لە پڕ بیلال گوێی لە دەنگێك بوو بانگی دەکرد و ئەویش لای کردەوە و ئاوڕی داوە بینی پیاوێکە و بانگی دەکات.

بیلال گوتی: فەرموو چیت ئەوێ؟ پیاوەکەش گوتی: من کاتی خۆی پێنج هەزار درهەمم پێش دە ساڵ لە باوکت قەرز کرد، پاشان سەفەرم کرد و بازرگانیم پێوەکرد و بەهۆی ئەو پارەیەوە قازانجێکی زۆرم کرد و کاتێکیش پاش چەند سالیك لەسەفەرکەرامەوەوبەدوایباوکت گەرام وبۆم دەرکەوت کە مردووە فەرمووئەوەش پارەکە بوتۆوتکادەکەم بەهۆیدواکەوتنمەوەلە دانەوەی قەرزەکە بمبوورە.

بیلالیش پارەکەی هەڵگرت و باوەڕی بەخۆی نەدەکرد، ڕۆیشت بۆ بازاڕ و خواردنی خۆشی بۆ ژن و منداڵەکانی کڕی و گەڕایەوسالێك لەسەفەر گەڕامەوە و بە دوای باوکت گەڕام و بۆم دەرکەوت کە مردووە، فەرموو ئەوەش پارەکە بۆتۆ و تکا دەکەم ە بەهۆ

ە ماڵ، پاشان دەستی کرد بە بازرگانی کردن بەو پارەیە و دەوڵەمەنـد بـوو، وە خانوویەکی زۆر جوانی دروست کرد و لەدوای ئەوەش هەژار و کەم دەرامـەت و هـەتیوی لە یاد نەدەکرد[1].

## ٨٦٩. ئازانی خێر لە چی دایە

د. محمـد راتـب النابلسـی دەڵێـت: بـرادەرێکم بـۆی گێڕامـەوە گوایـە ویسـتوویەتی لـە شارێکەوە بچێت بۆ شارێکی تر، هەرچەند لە کۆلیژی پزیشکی دەیخوێند بەڵام بە ڕەنـگ و ڕوو منداڵکار دیاربوو، سواری ئۆتۆمبێلێك بوو کەچی دوو پیاوی بـە قەڵافـەت هـاتن و باڵیان گرت و دایانگرت بۆئـەوەی جێـی خۆیـان بێتـەوە و ڕۆیشـتن، سـووکایەتییەکی زۆر گەورە بـوو بەلایـەوە و ئـازارێکی دەروونـی گـەورەی چەشـت، برادەرەکـەم وتـی: هـەرگیز حەزم نەکردووە تاوانکار بم تەنها ئەو چرکە ساتە نەبێت بۆئەوەی هەقیان لێ بستێنم، بەهـەر حـاڵ بـە ئۆتـۆمبێلێکی تـر ڕۆیشـتم لـە ڕێگـا بینـیم ئۆتۆمبێلەکـەیان لـەلای بەرزاییـەك وەرگەڕابوو، کـە ئـەوەم بـینی یەکسـەر سوپاسـی خـوام کـرد و تێگەیشـتم بـە ڕاستی ( وعسی أن تكرهو شیئا و هو خیر لكم و عسی أن تحبوا شیئا و هو شـر لكـم و الله یعلم و أنتـم لا تعلمون)[2] البقره: ٢١٦.

## ٨٧٠. دەرمانی گوناهـ

ئەگێڕنەوە: کە شێخی شیبلی ( رحمە الله ) ڕۆژێك بـە بـەردەرگای خانووێکـدا تێپـەڕی و بینی دکتۆرێك خەریکی دەرمـان کـردن و چارەکردنی شـێتێکە، شـێخ شـیبلی فـەرمووی: دکتۆر! دەرمانی گوناهت لایـە؟ ئـەویش وەڵامـی نەدایـەوە. شـێخ فـەرمووی: وەرە بـۆلای ئێمە تا دەرمانی گوناهت پێ بڵێم.

عەرزی کرد: دەرمانەکەی چییە؟

فەرمووی: بڕۆ تۆوی تەوازع و خاکینەیی و گەڵای پەشیمانی و ڕیشەی لـە خـوا پاڕانـەوە بکەرە ناو هاوەنی تەوبەوە و بە دەسـکە هـاوەنی ( ربنـا ظلمنـا أنفسـنا ) کـە بریتییـە لـە

[1] چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵان — ب١ — ل ٤٨.

[2] هەزار و یەك — ب٢ — ل: ٢١١-٢١٢

پێنان و دان پێنان بە گوناها بیانکوتەوە و بە ناوی دڵ صاف و دڵسۆزی حەلیان بکە و بیانکەرە قاپ لەمەی دڵەوە و بە ئاگری تیژ و بەتینی خۆشویستن بیان کوڵێنە و بە کەوچکی تاعەت تێکیان بدە و بە کەتانی زیکر ( سبحان الله و بحمده سبحان الله العظیم) بیانپاڵێوە و ئەمجارە بیانکەرە ناو پیاڵەی عەشق و لە سێبەری ( الحمدالله )دا دای بنێ و لەبەرە بەیانی ( الله أكبر ) واتە خوا بە گەورە زانینا بیان خۆرەوە هەتا لە شیفا خانەی ( و ننزل من القرآن ماهو شفاء و رحمة للمؤمنین )ەوە شیفاتان بۆ بێت. ئەی دکتۆر ئەگەر ڕزگاریت دەوێ تۆ خۆت نەخۆشی. چاری نەخۆشییەکەی خۆت لەو شێتە داوا بکە، چار و عیلاجی ئەو بەتۆ نیە[1].

### ٨٧١. ترسی دۆزەخ خەندەی فریشتەکانیشی نەهێشتووە

ڕیوایەت کراوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەرچی جبرائیل (علیه السلام) هاتبێتە لام هەر بە ڕوو گرژی چاوم پێ کەوتووە. جارێك لێم پرسی: بۆچی تۆ وا شێوەت گرژە؟ وتی: لەوکاتەوەی کە دۆزەخ دروست کراوە من پێنەکەنیوم، وتم ئەی میکائیل شێوەی بۆوا گرژە؟ وتی: ئەویش هەر لەترسی دۆزەخ و لە ترسی غەزەبی خوایە[2].

### ٨٧٢. مافی ئافرەت لە ئیسلام

عبدالرزاق لە ئیبن جورەیجەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك کە جێی متمانەیە پێی وتم ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) بەشەقامەکاندا دەگەڕا گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوودەیگوت:

تطاول هذا اللیل و أسود جانبه

وارقنی أن لا حبیب الا عبه

فلولا حذار الله لا شیئ مثله

لزعزع من هذا السر جوانبه

---

[1] مەکتوباتی کاك أحمدی شێخ – ب٤ – ل ٧٢ (چاپی نوێ).

[2] هەمان سەرچاوە– ب٤ – ل ١٣٠ (چاپی نوێ).

ئیمام فەرمووی: چیتە؟ وتی: چەند مانگێکە پیاوەکەمت لێ دوور خستۆتەوە و منیش تامەزرۆیم، فەرمووی: خراپەت دەوێ؟ وتی: پەنا بەخوا. فەرمووی: دە خۆت ڕاگرە وا دەنێرم بە شوێنیا و ناردی بە شوێنیدا. دوایی چوو بۆلای حەزرەتی حەفصەی ( دایکی ئیمانداران ) فەرمووی: پرسیارێکت لێ دەکەم ڕاستم وەڵام دەوە، ئافرەت بەماوەی چەند شەو شەیدای پیاوەکەی دەبێت و بیری دەکات؟ ئەویش سەری دانەواند و شەرم دایگرت.

ئیمام فەرمووی: خوا شەرم لە حەق ناکا، ئەویش بە پەنجەی دەست ئاماژەی بۆ سێ مانگ کرد ئەگەرنا چوار مانگ. ئیمامی عومەر فەرمانی دەرکرد نابێت لە سەروو چوار مانگ زیاتر سوپا بمێنێتەوە.

### ٨٧٣. ڕێز لە خەڵکی مەدینە بگرن ( هیدایەتێکی سەر )

دوو لاوی دوور لە خوای خەڵکی مەدینە دەچن بۆ تورکیا و لە شاری ئستانبول مەشروبات دەکڕن و بە تەکسی دەچنە دێیەکی ، کە فەرمانبەری پرسگەکە پاسپۆرتیان لێ وەردەگرێ و ناویان تۆمار دەکات و دەزانێت کە خەڵکی سعوودییەن، لێیان دەپرسێ خەڵکی کوێن لە سعودیە؟ یەکێکیان دەڵێ: خەڵکی مەدینەی مونەوەرەین، ئەویش لەبەر خۆشەویستی بۆ ئەو شارە خۆشەویستە لە جیاتی ژوور جێگایەکی گەورەیان دەداتێ. ئەو دوولاوە تا نیوە شەو خەریکی خواردنەوە دەبن و یەکێکیان فوول سەرخۆشە و ئەوی تریان کەمتر، بەرەبەیان سەعات چوار و نیو لە دەرگا دەدرێت و دەڵێن: کێیە؟ فەرمانبەری پرسگەکە بوو گوتی: ئیمامی مزگەوتەکە کە زانی ئێوە خەڵکی مەدینەن نوێژخوێنانی ڕاگرتووە و حەز ئەکات ئێوە ئیمامەتیمان بۆ بکەن، جا تا ڕۆژ نەبۆتەوە وەرن یەکێکتان ئیمامەتیمان بۆ بکەن. ئەمەش بەڕاستی شەرمەزارییەکی گەورە بوو بۆمان، بەپەلە خۆمان شوشت و ناچار دابەزین و چوون بۆ مزگەوتەکە و پێشوازییەکی گەرممان لێکرا و یەکێکیان چووە پێشەوە و سورەتی فاتحە

و الإخلاص ی خوێند چونکە هەر ئەوەندەی لەبەر بوو، لە پاش ئـەو ڕووداوە تەوبـەیان کرد و ئێستا یەکێکیان بۆتە بانگخوازێکی دیار بۆ ئیسلام[1].

### ٨٧٤. بانگخوازێکی ژیر و زانا

موسڵمانێکی بە هیممەت بە ویلایەتەکانی ئەمریکادا دەگەڕا، ئەگـەر بیزانیبـا لـە شـوێنێك موسـڵمانان کۆنابنـاوە بـۆ نوێـژی جەماعـەت دەچـوو شـوقەیەکی بـە کـرێ دەگرت و موسڵمانانی بانگدەکرد بۆ جەماعەت و نوێژی هەینی و وتاری ئـەدا دەیـوت: وا من هەفتەیەکە لێرەم و ئەم شوێنەم بە کرێ گرتووە و ویستم کۆتـان بکەمـەوە، پارەشـم نییە بەردەوام بم لە دانی کرێیەکە، فەرموو خۆتان پارە کۆبکەنـەوە و کـرێ بـدەن و کـۆ ببنەوە بۆ نوێژ و خوا پەرستی.شیخ جاسم المطو دەڵێت: لەو کەسـەم پرسی کـە چـەند مزگەوتی وات کردۆتەوە ؟

پێکەنی و وتی: نەمژماردووە بەڵام لە ٣٠٠ مزگەوت زیاترە.

بەڕاستی داهێنانێکی مەزنی ئەنجام داوە کە سەدەقەیەکی بەردەوامی گەورەیە[2].

### ٨٧٥. ئاواتی شەهید بوون

بـراء کـوڕی مالیـك ( رضـي الله عنهمـا ) لەسـەر پشـت پاڵکـەوتبوو و هەنـدێ سـروودی حەماسـی وت، حـەزرەتی ئەنـەس پێـی وت تـۆ هـاوەڵی حـەزرەت بوویـت و سـروودیش دەڵێـی؟ بـراء فـەرمووی: بێـدەنگ بـە بـەو خوایـەی کـە هـەر خـۆی خوایـە لەچـەندجەنگدا لەگـەڵ کافرانـدا جـەنگاوم، بـەو خوایـەی کـە هـەر خـۆی خوایـە بـە شەهیدی دەمرم! بەڵێ، سوێندی خوای دا کە شەهید دەبێ، شەهید بوو! کـە ئەمـەش لـە فەرموودەدا هاتووە کە کەسی وا هەیە ( لو أقسم على الله لأبره )[3].

---

[1] هەزار و یەك – ب٢ – ل ٤١٣

[2] هەزار و یەك – ب٢ – ل ٤١٩.

[3] هەزار و یەك – ب٢ – ل ٤١٨.

### ٨٧٦. خێرکردن تەمەن درێژ دەکاتەوە

گەنجێك برادەر و هاوەڵی حەزرەتی داود بوو ( علیه السلام ) حەزرەتی (ملك الموت) هەواڵی پێدا کە ئەو گەنجە سێ ڕۆژی ماوە لە ژیان، لە دوای سێ ڕۆژی تر دەمرێ.

ئەو هەواڵە قورس و گران بوو لەسەر حەزرەتی داود، کاتێك سێ ڕۆژ تێپەڕی و حەزرەتی داود بینی ئەو گەنجە سەلامەتە و نەمردووە دوایی مانگێکیش تێپەڕی هەر نەمرد و حەزرەتی داود پێی سەیر بوو، ملك الموت کاتێك هاتە لای و فەرمووی: کاتێك دوای سێ ڕۆژ هاتم گیانی ئەو گەنجە بکێشم خوای گەورە پێمی فەرموو: ئەی ملك الموت ئەوە پێشی تەمەنی تەواو بێ بە ڕۆژێك چووە دەرەوە و دەست کورتێکی بینی و بیست درهەمی دا بەو دەست کورتە و کەسەکەش دوعای بۆکرد و گوتی: خوای گەورە تەمەنت پیرۆز و بە بەرەکەت بکات، منیش دوعا و نزاکەم لێ قبوڵکرد و لەبەرامبەر هەر درهەمێك ساڵێکم دا بە تەمەنی ئەو گەنجە و تەمەنیم درێژ کردەوە[1].

### ٨٧٧. زەکات نەدەر

لەزەمانی حەزرەتی عبداللە ی کوڕی عەبباسدا ( ڕەزای خوایان لێبێ ) پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو ماڵی زۆر هەبوو، کاتێك کە مرد و گۆڕیان بۆ هەڵکەند مارێکی گەورەیان لەناو گۆڕەکەی بینی و ئەو هەواڵەیان بە حەزرەتی عبداللە ڕاگەیاند ئەویش فەرمووی گۆڕێکی تری بۆ هەڵکەنن، چوون گۆڕێکی تریان بۆ هەڵکەند و مارێکی تریان لەناو گۆڕەکە بینی، تا حەوت گۆڕیان بۆ هەڵکەند هەر حەوتی مارێکی گەورەی تیابوو، حەزرەتی عبداللە پرسیاری لە کەس و کاری ئەو پیاوە کرد کە ئایا ڕەوشتی چۆن بووە؟ وتیان زەکاتی نەدەدا

[1] حکایات و قصص من حیاة السابقین — ص ١١١.

## ٨٧٨. گەورەیی دایك

پیاوێك بە ئەبو ئیسحاقی وت: ئەم شەو تۆم لە خەو بینی کە ڕیشت نەخشێنرابوو بە یاقووت و گەوهەر، ئەویش فەرمووی: ڕاست دەکەی چونکە من بە ڕیشم قاچی دایکمم سڕیەوە.

لە فەرموودەدا هاتووە: کەیەکەم شت خوای گەورە لە (لوح المحفوظ) نووسیویەتی ئەوەیە بسم الله الرحمن الرحیم من خوام و جگە لەمن هیچ خوایەکی تر نیە هەر کەسێك دایك و باوکی لێی ڕازی بن منیش لەو ڕازیمە[1].

## ٨٧٩. نیازپاکی و نوێژ و گوێڕایەڵی

ئیبن جەریر لە ئیبن ئەبو مەریەمەوە هێناویەتی دەفەرموێ: حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) دای بەلای حەزرەتی موعازی کوڕی جەبەلەوە فەرمووی: بڵندی ئەم ئوممەتە چیە؟ حەزرەتی موعاز وتی: سێ شتن کە ڕزگارکەرەکانن نیازپاکی فیترەتێکە کە خوا بۆ خەڵکی داناوە، نوێژ کە میللەتە و گوێڕایەڵیش پاکییە. حەزرەتی عومەر فەرمووی: ڕاست دەکەی، کاتێك ڕۆی حەزرەتی موعاز فەرمووی: ئەو قسەت لە هی ئەوان باشترە دوای تۆش ناکۆکییەك دەبێت و تەنها شتێکی کەم دەمێنێتەوە[2].

## ٨٨٠. ڕەوشت چاکی

خوای گەورە وەحی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم (علیە السلام) نارد فەرمووی تۆ خەلیلی منی کردەوەت باش بکە ئەگەر لەگەڵ بێباوەڕانیش بی لەگەڵ چاکەکاران داتدەنێم و دەتگەیەنم بە پلەی ئەوان. چونکە وتەی من بۆ ئەو کەسانەی ڕەوشتیان بەرز و چاکە، دراوە و دەرچووە کە لەژێر سێبەری عەرشی خۆم حەشریان بکەم کە لەو ڕۆژە جگە لە سێبەری عەرشی من هیچ سێبەرێکی تر نیە و جێگیری دەکەم لە لێوار بەهەشتی خۆم.

[1] حکایات و قصص من حیاة السابقین – ص ١٧٤.

[2] حیاة الصحابة – ب ٣ – ص ٥٩١.

## ٨٨١. قوربانی کردن

کەسێك دەگێڕێتەوە: کە دادوەرێکی دەست کورت و هەژار هەبووە، کاتێك جەژنی قوربان هات بە هاوسەرەکەی گوت: هیچ نیە بۆ قوربانی کردن جگە لەو کەڵەشێرە، ئەو هەواڵە بە جیرانەکەی گەیشت و ئەویش هەموو بەرانەکانی خۆی بۆ نارد کە ژمارەیان سی بەران دەبوو، کاتێك دادوەر لە نوێژی جەژن گەڕایەوە بینی وا لەماڵەکەی سی بەران هەیە، بە خێزانەکەی وت: ئەوە چیە؟ ئەویش باسەکەی بۆ گێڕایەوە.

دادەوەرەکەش گوتی: ئەو کەڵەشێرە بەرەڵا بکە لەوانەیە لە ئەوەی حەزرەتی ئیسماعیل بێت ( علیە السلام ) کە خوای گەورە بەرانێکی کردە قوربانی، بەلام سی بەرانی کردە قوربانی کەڵەشێری ئێمە[١].

## ٨٨٢. خوای گەورە بیەوێ کەسێك چاك بکا چاکی دەکا

حەزرەتی موسا (علیە السلام ) پیاوێکی ئاگرپەرستی بینی و پێی گوت: تۆ ئێستا بۆت هەیە لە بەندایەتی کردنی ئاگر بگەڕێیەوە بۆ بەندایەتی کردنی خوای گەورە.

کابرا فەرمووی: ئەگەر بگەڕێمەوە قەبوڵم دەکا؟ حەزرەت فەرمووی: بەڵێ و ڕۆیشت و وازی لێ هێنا و کابرا هەر دەگریا تا لە هۆش خۆی چوو، حەزرەتی موسا دەستی لێدا و جولاندی بینی مردووە و حەزرەت فەرمووی: خودایە ڕەحم بەم بەندەیە بکە هەروەك تۆ بەخشندە و میهرەبانی ( یارب عامله کما انت أهله ).

خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسا ئایا نەتزانیوە ئەگەر ئێمە بمانەوێ کەسێك چاك بکەین هەر چاکی دەکەین و هەر کەسێکیش بمانەوێ نزیکی بکەینەوە نزیکی

---

[١] حکایات و قصص من حیاة السابقین – ص 194.

دەکەینــەوە بەراسـتی مــن ئــەو بەندەیــەم لەگـەڵ ئــەهلی یــەکتا پەرسـتان لــە جێگـای نزیکەکانەوە دامناوە[1].

### ٨٨٣. نەشکاندنی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ)

لە غەزای خەیبەردا پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵای ئیسلامی دایە دەست ئیمامی عەلی (رضي الله عنه) پێی فەرمووی: بڕۆ بۆ فەتحی قەڵای خەیبەر و ئاوڕ نەدەیتەوە، ئەویش چەند هەنگاوێك ڕۆیشت و وەستا بە بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە چەند پرسیارێکی لە حەزرەت (ﷺ) ئەویش وەڵامی دایەوە و ئینجا ئیمام بەرەو قەڵاکە ڕۆیشت و ئاوڕی نەدایەوە تاکو قەڵاکە فەتح کرا[2].

### ٨٨٤. لاشە نەخۆش بی باشترە لە دڵ

منذر (رضي الله عنه) دەفەرموێ: خەڵکانێکی دێهاتی هاتن بۆ خزمەت عبدالله ی کوڕی مسعود (رضي الله عنه) خەڵك سەریان سوڕما لە مل نەستووری و لەش ساغییان و فەرمووی: ئێوە دەبینن بێ باوەڕان لە هەموو کەس لەش ساغترن بەڵام لەهەموو کەس دڵ نەخۆش ترن، کابرای بڕواداریش نەخۆشە بەڵام لەهەموو کەس دڵی ساغترە.

سوێند بەخوا ئەگەر دڵتان نەخۆش بێ و لاشەکەتان ساغ بێ ئەوە بەلای خواوە ئاسانترە لە (جعلان) بەرتیل خۆری[3].

### ٨٨٥. زیارەتی گۆڕستان

عوسمانی کوڕی سەوادی تەفاوی بۆمان دەگێڕێتەوە: کە دایکی یەکێ لە خوا پەرستەکان بووە پێیان دەوت: گۆشەنشین و لێبڕاو بۆ ژینی دوایی. دەفەرموێ: لە کاتی سەرەمەرگ سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و وتی ئەی پارێزەری من ئەی ئەو کەسەی کە پشتی خۆم پێی دەبەستا لە ژیانم و لەکاتی مردن و لە دوای مردن. زەلیلم نەکەی و

---

[1] حکایات و قصص من حیاة السابقین – ص ٣٩.

[2] دین و ژین – ل ٦٥٠ – ٦٥١.

[3] نەصحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) – بـ١ – ل ٤١٧.

لەناو گۆڕ بێ سێبوری و تەنیام مەکە، دەفەرموێ کاتێك وەفاتی کرد، من هەموو ڕۆژی هەینییان دەچوومە سەر گۆڕەکەی و دوعام بۆ دەکرد و داوای لێخۆشبوونم بۆ دەکرد، شەوێك لە خەونم بینیم و پێم گوت: ئەی دایە تۆ وەزعت چۆنە ئێستا؟ وتی: کوڕم بەراستی مردن زۆرناخۆشیە من ئێستا جێم باشە سوپاس بۆ خوا، هەموو گیانی بۆن خۆشی لێدەهات و بە پارچە ئاوریشمی سپیاڵ گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە.

پێم وت: ئایا هیچ کارێکت بەمن هەیە؟ وتی: هەرگیز نەکەی واز لە سەردانی ئێمە بهێنی، بێگومان ڕۆژانی هەینی بە هاتنی تۆ من دڵخۆشم کاتێك دێیتە ناو کەس و کارت. دەڵێن ئەی ڕاهیبە ئەوە کوڕی تۆیە هاوە منیش دڵم خۆش دەبێ و خۆشحاڵ دەبم و ئەوەی لەدەوری منیشە لە مردووەکان خۆشحاڵ دەبن بە هاتنی تۆ[1].

### ٨٨٦. کۆڕی زیکر

عەونی کوڕی عبدالله (رحمە الله ) دەفەرموێ: ئێمە دانیشتبووین لەلای أم الدرداء زیکری خوامان دەکرد پێیان وت: لەوانەیە بێزارمان کردبی؟ فەرمووی: ئێوە دەڵێن منتان بێزار کردووە کە بەڕاستی من هەموو بەندایەتییەکم کردووە و دەستم نەکەوتووە و نەگەیشتم بە شتێك کە بۆ سەلامەتیم لە دینداریيەکە چاکتر بێ لە کۆڕی زیکر و یادی خوا[2].

### ٨٨٧. خوا ناسین

لە زەمانی حەزرەتی موسا (علیە السلام) پیاوێك هەبوو تەوبەی دەکرد و بەردەوام نەدەبوو لەسەر تەوبەکەی، خوای گەورە وەحی نارد بۆ حەزرەتی موسا و پێی فەرموو بەو پیاوە بڵێ تەوبەکەی نەشکێنی ئەگەر ئەوجارە بچێتەوە سەر تاوان، تەوبەکەی لێ قەبوڵ ناکەم و سزای دەدەم.

---

[1] صفحات النيرات من حياة السابقات ص ٢٧.

[2] صفحات النيرات من حياة السابقات ص ٢٩.

حەزرەتی موسا پەیامەکەی خوای بەو پیاوە گەیاند و ئەویش چەند ڕۆژێك سەبری گرت و پاشان دووبارە گەڕاوە سەر تاوان، خوای گەورە وەحی نارد و بە حەزرەتی فەرموو بەو پیاوە بڵێ کە من لێی تووڕەم و تووڕەیی خۆمی بەسەردا دەبارێنم و حەزرەتی موساش بە کابرای ڕاگەیاند و پیاوەکەش چووە بیابان و گوتی خوایە گیان ئەو پەیامە چیە بە حەزرەتت گەیاندووە؟ ئایا خەزێنەی ڕەحمەت و لێخۆشبوونت تەواو بووە؟ یان بەخیل بووی لەسەر بەندەکانت؟ چ تاوانێك گەورەترە لە لێبوردەیی تۆ؟ وە چ تاوانێك زیان لە لێبوردەیی تۆ دەدا تا بفەرموی من لێت خۆش نابم؟ خوایە گیان چۆن لێم خۆش نابی لە کاتێکدا سەخاوەت سیفاتی تۆیە؟ ئەگەر تۆ بەندەکانت نائومێد بکەی لە ڕەحمەتی خۆت و ئەگەر دەریان بکەی لە دەرگای ڕەحمەتی خۆت، ئەی ئەوان ئومێدیان بە کێ هەبێ؟ وە کێیان مەبەست بێ؟ خوایە گیان ئەگەر ڕەحمەت و بەخششت تەواو بووە و دەتەوێ سزام بدەی ئەوا تۆ تاوانی هەموو بەندەکانت بخەرە سەر ئەستۆی من و من لە جیاتی ئەوان سزا بدە و من خۆم دەکەمە قوربانی ئەوان.

خوای گەورە وەحی بۆلای حەزرەت نارد و پێی فەرموو ئەی موسا بەو پیاوە بڵێ ئەگەر تاوانەکانت هێندەی نێوان ئاسمانەکان و زەوی بێت ئەوا من لێیان خۆش بووم و دەی بوورم هەروەك چۆن لێبوردەیی و میهرەبانیی منی ناسی[1].

### ٨٨٨. گەورەیی تاوان لەسەر میزان

بەیهەقی لە ئیبن مەسعود (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) دەگێڕێتەوە: ڕەبەنێك لە خەڵوەتگەی خۆیدا بۆماوەی شەست ساڵ خوا پەرستی کرد، ئافرەتێك هات و لە نزیك ئەو لایدا و ئەویش چووە لای و بۆماوەی شەش شەو کاری ناشەرعی لەگەڵ کرد، لەم کارەی پەشیمان بۆوە و ئەوێی بەجێ هێشت و چووە مزگەوتێك و سێ شەو تیایدا مایەوە، کولێرەیەکیان بۆ هێنا و ئەویش کردی بە دوو لەتەوە و دای بەو دوو کەسەی کە لەلای ڕاست و چەپی بوون و خوای گەورە فریشتەی گیان کێشانی بۆ نارد و گیانی

---

[1] حکایات و قصص من حیاة السابقین – ص٩٤.

کێشا و شەست ساڵ خوا پەرستییەکەی بۆ خرا تایەکەیەوە و شەش شەو بێ شەرعییەکەی خرا تایەکەی تر و تای تاوانەکان قورس تر بوون، پاشان کولێرەکەیان بۆ خستە تاکەی بەرامبەری و قورسی کردەوە واتا خوا لێی خۆش بوو[1].

## ٨٨٩. خودناسین و شوکرانە

ڕۆژگارێك پیاوچاکێك دەژیا کە هەشت ساڵی ڕەبەق بەدوای دۆزینەوەی ڕێگای خواوە بوو، ئەو هەموو ڕۆژێك لە خەڵك جیا دەبۆوە و دوعای دەکرد تاکو ڕۆژێك لەگەڵ یەکێك لە پیاوچاکان یان پیرێکی تەریقەت ئاشنا بێت، ڕۆژێك هەروا کە دوعای دەکرد: دەنگێك پێی وت کە بچێت بۆ شوێنێك لەوێ چاوی بە پیاوێك دەکەوێت کە ڕێی ڕاست و خوداوەندی پێ نیشان دەدا، پیاوچاك کاتێك گوێبیستی ئەم دەنگە بوو بێ ئەندازە دڵخۆش بوو و ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنەی کە پێی وترابوو. لەوێ بە دیتنی پیاوێکی سادە و هەژار بە جلی شڕ و قاچی تۆزاوی واقی وڕ ما.

پیاوچاك تەواو سەیری دەوروبەری کرد بەڵام کەسی نەبینی و ڕووی کردە کابرای هەژار و پێی فەرموو: ڕۆژتان باش. کابراش وەڵامی دایەوە بە هێمنی: هەرگیز ڕۆژێکی خراپم نەبووە. پیاو چاك گوتی: خوداوەند خۆشبەختت بکات. پیاوەکە فەرمووی: هەرگیز بەدبەخت نەبوومە. پیاوچاك زیاتر سەری سوڕما و فەرمووی: خوا دڵخۆشت بکات. پیاوەکە گوتی: هەرگیز خەفەتم نەبووە. پیاوچاك گوتی: تێناگەم، تکایە ئەوانەم بۆ شی بکەوە. پیاوەکە گوتی: بە خۆشحاڵیەوە ئەو کارە دەکەم. تۆئارەزووی ڕۆژێکی باشت بۆمن کرد، من هەرگیز ڕۆژێکی خراپم نەبووە ئەگەر بۆ خواردنیشم نە بیت دیسان هەر ستایشی خوا دەکەم. ئەگەر باران ببارێ یان بەفر ئەگەر کەش و هەوا خۆش بێ یان ناخۆش من هەر خواپەرستی دەکەم. ئەگەر سووکایەتیم پێبکرێ یان کەس هاوڕێیەتیم نەکا دیسان هەر ستایشی خوا دەکەم، کەاوبوو هەرگیز ڕۆژێکی خراپم نەبووە. تۆ ئارەزووی خۆشحاڵیت بۆ من کرد کەچی من هەرگیز خەفەتبار

[1] ئەسرینەکانی تەوبەکاری — ل ١٠.

نەبوومە چونکە لە قوڵایی دڵمدا یەك ئاوات هەیە، ئەویش ژیانکردنە بە ویستی خودا، من ویستی خۆم بە تەواوی داوەتە دەست خودا و ویستی ئەو ویستی منە[1].

[1] بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری، ل ٥٤.

**٨٩٠. با كەسانێكی خوایی بین**

لەسەرما و سۆڵی زستان كوڕێكی شەش ساڵان لەبەردەم دوكانێك وەستابوو و پێڵاوی لە پێ نەبوو جلەكانی شڕ بوون. ژنێكی لاو لەوێوە تێپەڕی، كاتێك چاوی بە كوڕەكە كەوت مەیل و ئارەزووی لە چاوەكانی كوڕەكە خوێندەوە و دەستی كوڕەكەی گرت و بردیە ناو دوكانەكە. جووتێك پێڵاو و تاقمێك جلی زستانەی بۆ كڕی، هاتنە دەرەوە و ژنەكە پێی وت ئێستاش بڕۆوە بۆ ماڵ. كوڕەكە سەری بەرزكردەوە و پرسی: خانم ئێوە خودان.

ژنەكە خەندەیەكی بۆكرد و گوتی: نا كوڕم من تەنیا یەكێكم لە بەندەكانی.

كوڕەكە وتی: دڵنیابووم كە پەیوەندییەكتان لەگەڵ ئەودا هەیە[١].

**٨٩١. هۆكاری پێشنەكەوتن**

خاوەن كارگەیەكی گەورە لافیتەیەكی لە كارگەكەی هەڵواسی كە لەسەری نوسرابوو، دوێنێ ئەوەی كە ڕێگر بوو لەبەردەم پێشكەوتندا مرد، سبەینێش دەتوانن بێن بۆ سەرەخۆشی كردن و بەیانی هەموو هاتن بۆ سەرەخۆشی كردن و بەڕیز وەستابوون، بە جلی ڕەش و بۆینباخی ڕەشەوە. ئەبێ ئەوە كێ بێ مردبێ و لە كۆڵیان بووبێتەوە.

خاوەن كارگەكە یەك یەك دەیكردنە ژوورێكەوە كە ئاوێنەیەكی گەورەی تیابوو بەگەورەیی لەسەری نووسرابوو ئەوە خۆتی ڕێگری لەبەردەم سەركەوتن و پێشكەوتن و هەڵەكانت نەبوونی ئیرادەیە كە لە جێی خۆتدای. هەركەس كە ئەوەی دەدیت بە سەرسامییەوە دەچوە دەرەوە بێئەوەی هیچ بڵێ[٢].

---

[١] بەهەشت یان دۆزەخ كامیان هەڵدەبژێری، ل ١٢١.

[٢] زەردەخەنەی هیوا. ل ٤٣ — ٤٤.

## ٨٩٢. ئارامی و سەبر چییە؟

ئەبو حەسەن نوری (رحمه الله) پیرێکی بینی لاواز و بێ هێز بە لام بە سەبر بوو، دواتر بردیان بۆ زیندان. چوو بۆلای و پرسی: ئەی پیرەمێرد! تۆ کە وەها پیر و لاوازی چۆن سەبرت گرت بەرامبەر بەو؟ پیرەمێرد کەمێك تێراما و گوتی: ڕۆڵە بەلا کە هات بە هیممەت بەرامبەری دەوەستمەوە نەك بە جەستە. لێی پرسی: سەبر بەلای تۆوە چییە؟ کابرا گوتی: ئەوەی کە لە هاتنی بەلادا وا دەکات وەك ئەوەبێت کە بەلات لێ دوور بووبێتەوە[١].

## ٨٩٣. گەورەیی خزمەتکردنی موسڵمانان بە زانست

نزیکەی سەد ساڵێك لەمەو بەر گەنجێکی بۆخوا سوڵحاوی خەڵکی شام دەچێت بۆ شاری مەدینە و حەز دەکات لەناو ئەو خاکە پیرۆزە نزیك بێت لە پێغەمبەر (ﷺ) و حەزرەت دێتە خەوی و پێی دەڵێت: کارکردن لە وڵاتەکەی خۆت باشترە لەوەی لەلای من بیت، لەلای من بەختەوەر دەبی بەلام کارت بۆ ناکرێ و پلەت بەرز نابێتەوە. ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ شام و قوتابخانەیەکی ئایینی دادەمەزرێنی بۆماوەی هەشتا ساڵ و خەڵکی فێرە ئیسلامەتی دەکات و جار جار بە قوتابییەکانی دەگوت: باوکت و باپیریشیت قوتابی من بوون لێرە، ئەم پیاوە خوا ناسە نەوەد و شەش ساڵ ژیا و خزمەتێکی گەورەی ئیسلامی کرد و ئێستاش قوتابخانەکەی ماوە، لێیان پرسی چۆنە وا ئەندامەکانی لەشت لەگەڵ ئەو تەمەنەت بە باشی ماون؟ وتی: لەگەنجیدا پاراستمن لە گوناه کردن و خوای گەورەش لە پیریدا بۆی پاراستین (موسوعة الأسماء الحسنى محمد راتب النابلسي ج٢، ص ٨١)[٢].

## ٨٩٤. باوەڕداری خۆپارێز زاهیدە

پاشایەك تووشی گێچەڵێك بوو، گوتی: ئەگەر بە ئاکامێکی دڵخواز بۆمن تەواو بێ، درهەمێکی زۆر دەدەم بە خەڵکی ئیمانداران. نیازەکەی بەدیهات و پێویست بوو

---

[١] ڕەوشت بەرزی. ل ٣٤.

[٢] دۆستانی خوا، ل ٩٨ — ٩٩.

پەیمانەکـەی جێبـەجێ بکـات. هەربۆیـە توورەکەیـەك درهـەمی دا بـە یـەکێك لـە فەرمانبەرانی تاکو لە نێوان خەڵکی بە ئیمان و خۆپارێز دابەشی بکات. دەگێڕنەوە هیزمە (خولام) کە ژیر و وریا بوو و تەواوی ڕۆژ گەڕا و شەو هاتەوە بۆلای پاشا و تورەکە درهەمەکەی پێدایەوە و وتی خەڵکی بە ئیمانم نەدۆزیەوە. پاشا گوتی: ئەوە چ بەزمێکە؟ ئەوەندە من دەزانم لەم شارە چوار سەد بە ئیمانداری تێدایە. وتی ئەوەی بە ئیمانە نایەوێ و ئەوەی بێ ئیمانە دەیەوێ[1].

**٨٩٥. ملکەچی حەزرەتی سەلمانی فارسی ( ﷺ )**

حەزرەتی جەریری دەفەرموێ: گوێم لە شێخێکی بەنی عەبس بوو کە لەباوکییەوە باسی دەکرد و دەیفەرموو: هاتمە بازاڕ و عەلەفم کڕی بە درهەمێك، حەزرەتی سەلمانی فارسیم بینی و نەمناسی هێنامە لای خۆم و بە بێ کرێ و پارە عەلەفەکەم بەو بار کرد و بەناو خەڵکی دا ڕۆیشتین.

خەڵکەکە پێیان وتم: ئەی باوکی عبداللە ئێمە شت بە تۆ هەڵدەگرین؟ وتم: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە حەزرەتی سەلمانی فارسییە. منیش پێم گوت: عەلەفەکە دانێ من تۆم نەناسییە. ئەویش عەلەفەکەی دانەناوە تاکو گەیاندییەماڵەوە[2].

**٨٩٦. تا حاڵی نەبی لە شتێك بڕیار مەدە**

م. عەمر خالید دەفەرموێ: برادەرێکم بەناوی ( حوسین ) سواری شەمەندەفەر بوو لە قاهیرەوە بۆ ئەسکەندەرییە، پیاوێك و کوڕەکەی کە تەمەنی نزیکەی ٢٥ ساڵ دەبوو لەلایەوە بوون، کوڕەکە کە لای پەنجەرەکەی گرتبوو جار جار دەیگوت بابە سەیر بکە ئەوە درەختە، بابە سەیر بکە ئەوە هەورە، ئەوە ئاژەڵە...... باوکیشی هەموو جارێ بۆی پێدەکەنی و باوەشێکی پیا دەکرد، حسین لە هەڵسوکەوتی منالانەی ئەو گەنجە زۆر ناڕەحەت بوو و کوڕەکەی پاش ماوەیەك خەوی لێکەوت و ئەویش بە باوکی گەنجەکەی گوت پزیشکێکی دەروونی باش دەناسم کوڕەکەت بۆ نابەیت بۆلای؟

---

[1] ڕەوشت بەرزی. ل ٤٩.

[2] صور و مواقف من حياة الأنبياء و الصحابة و التابعين، ج٢، ص ٦٢.

پیاوەکەش گوتی: چەند ساڵە کوڕەکەم چاوی نابینێ وا تازە لە خەستەخانە دێینەوە و چاوی نەشتەرگەری بۆ کراوە و سوپاس بۆخوا چاوی دەبینێت، بەڕاستی ئەوە بوو بە پەند بۆی تاکو پەلە نەکات لە حوکم دان بەسەر هیچ شتێکدا تا بەتەواوی لێی تێدەگات[1].

## ٨٩٧. مردنت پێ خۆش بێ

ئیدریسی کوڕی عبدالله ئەلەروزی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرموێ: پیاوێکی ئەعرابی نەخۆش کەوت و پێیان وت: تۆ دەمری ئەویش گوتی: ئەگەر بمرم بۆ کوێم دەبەن؟ وتیان: دەتبەنەوە لای خوای گەورە. ئەویش وتی: چ خراپە و ناخۆشییەکی بۆمن تێدایە کە بگەڕێمەوە لای کەسێك کە جگە لەو خێر لە هیچ کەسی تر نابینم[2].

## ٨٩٨. چۆن بژین لە دونیا

کەسێك چووە لای مامۆستاکەی و لێی پرسی: مامۆستا ڕۆژگارم چۆن بەسەر بەرم تاکو خودا لێم ڕازی بێت؟ مامۆستاکە وتی: تەنیا یەك ڕێگە هەیە ئەویش ژیان بە عیشقەوە.

دوای چەند خولەکێك کەسێکی تر چووە لای و هەمان پرسیاری لە مامۆستاکە کرد و مامۆستاکەش گوتی: تەنیا یەك ڕێگە هەیە ژیانی ناوێتە بە شادی. کەسی یەکەم سەری سوڕما و بە مامۆستاکەی گوت: بەڵام ئامۆژگارییەکی ترت بۆمن کرد و مامۆستاش گوتی: نا، کت و مت هەمان ئامۆژگاریم کرد[3].

## ٨٩٩. زانایی و هۆکاری زانایی تەواو

قوتابییەکی مامۆستا سوقرات لێی پرسی: تێگەیشتن و زانایی من کەی تەواو ئەبێ؟ وتی: ئەوکات کە بە پیا هەڵگوتنێك شادمان نەبیت و بە لۆمە کردنێکیش

---

[1] زەردەخەنەی هیوا، ل ٤١ – ٤٢.

[2] صور و مواقف من حياة الأنبياء و الصحابة و التابعين، ج٢، ص ١٧١.

[3] بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری، ل ١٢٢.

بەپەرۆش نەبێت. قوتابییەکە وتی: من کەی وام لێدێ؟ وتی: ئەو کات کە چوار شت هەبێ، دوو گوێ کە قسەی بەنرخی گوێ لێبێت و دوو گوێشی کەڕ کە قسەی پوچ نەبیستێ[1].

### ٩٠٠. وازهێنان لە ڕق و کینە

یەکێك لە مرۆڤە مەزنەکان بە پاکداوێنێکی وت: ڕات چییە سەبارەت بەو پەرستارەی کە خەڵکی قسەی زۆری بۆ هەڵدەبەستن و تەشەری زۆری لێ دەدەن؟ ئەویش گوتی: لە ڕواڵەتیدا خراپە نابینم و لە ناخیشی ئاگادار نیم[2].

### ٩٠١. دڵخۆشی هەڵبژێرە نەوەك خەم

پیرەمێردێك لە بەرنامەیەکی بەناوبانگی تەلەفزیۆنیدا چووە پێش کامێرا، لە ڕاستیدا ئەو بۆ بەشداریکردن لە پێشبڕکێیەك هاتبوو. ئەو بە ورەی بەرز و گەپ لێدان هەموویانی خستبووە ژێر کاریگەری خۆی، پێشکەشکاری بەرنامەکە بە پیرەمێردەکەی گوت: مرۆڤ بە ئاسانی هەست بەوە دەکات کە ئێوە شادمانن ئایا ڕەمزی ئەو شادمانییەی ئێوە چییە؟ پیرەمێردەکە لەوەڵامدا گوتی: زۆر سادەم و ئاشکرایە هەروەکو بوونی لووت لەسەر دەموچاوتان. من بەیانییان کە لەخەو هەڵدەستم دوو ڕێگەم لە پێشە، یەکێکیان ئەوەیە کە خەمۆك و نیگەران بم، ئەوی تریش ئەوەیە کە دڵخۆش و شادمان بم و دەبێ پێتان بڵێم کە ئەوەندە وشیار و ژیرم بۆ ئەوەی بزانم دەبێ کامیان هەڵبژێرم. بەڵێ، زۆر بە سادەیی ڕێگەی دووەم هەڵدەبژێرم[3].

### ٩٠٢. بەزەیی هاتنەوە بە مێرووولە

شێخ بایەزیدی بوستامی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) کە لە مەککە دەهاتەوە گەیشتە هەمەدان، تۆوی گوڵی (عصفر)ی کڕیبوو. هەندێکی خستە باخەڵی و هێنایەوە بۆ بوستام. کاتێك سەیری کرد مێروولەیەکی زۆر کەوتبوونە ناو تۆوەکە. فەرمووی:

---

[1] ڕەوشت بەرزی، ل ٦٢.

[2] ڕەوشت بەرزی، ل ٦٤.

[3] بەهەشت یان دۆزەخ کامیان هەڵدەبژێری، ل ١٣٩.

ئەمانەم لە شوێنی خۆیان ئاوارە كردووە. هەستا و گەڕاوە بۆ هەمەدان و مێرووڵەكانی بردەوە زێدی خۆیان[1].

### ٩٠٣. ڕەوشتی دەروێش

پیاوێك بە شێخ شەقیقی بەڵخی وت: دەروێش و هەژارەكانی ئێوە چۆنن؟ فەرمووی: ئەگەر شتێكیان دەست بكەوێت دەیخۆن و ئەگەریش نەبوو سەبری لەسەر دەگرن. كابرا وتی: خۆ سەگەكانی بەڵخیش هەروا دەكەن! شێخ شەقیق فەرمووی: كەوابوو ئێوە چۆنن؟ وتی: گەر شتێكمان كەوتە دەست دڵی كەسانی تری پێ شاد دەكەین و دەیبەخشین، گەر نەشبوو سوپاسی یەزدان دەكەین[2].

### ٩٠٤. پاداشتی نەخۆش

لە حەزرەتی ئەبو سەعیدی خودرییەوە (ﷺ) دەفەرموێ: پیاوێك لە موسڵمانان بە حەزرەتی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو نەخۆشییە نابینی كە توشمان بوون؟ ئێمە چ پاداشتێكمان هەیە لەسەریان؟ فەرمووی: كەفارەت. حەزرەتی ئوبەیەی كوڕی كەعب (ﷺ) فەرمووی: هەرچەندە كەمیش بێ؟ حەزرەت فەرمووی: هەتا ئەگەر چقڵێكیش بێ لەو هەوراز. حەزرەتی ئوبەیە دوعای كرد خوایە لەو لەرز و تایە ڕزگاری نەبێ هەتا دەمرێ، بەڵام پێشی نەگیرێ لە حەج و عومرە كردن و جیهاد و نوێژە فەرزەكان و ڕۆژوو و عیبادەت. فەرمووی: هەركەسێك دەستی بەر لەشی بكەوتایە هەستی بە گەرمی دەكرد هەتا وەفاتی كرد.

لە گێڕانەوەیەكی تردا حەزرەتی ئوبەیە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاداشتی لەرز و تا چییە؟ فەرمووی: چاكە بەسەر خاوەنەكەیدا دێنێ. ئەویش

[1] ڕەوشت بەرزی، ل ١١٤.

[2] ڕەوشت بەرزی، ل ١١٦.

فەرمووی: خوایە داوات لێدەکەم تام لێ بێنی بەلام قەدەغەم نەکا لەچوون بەرەو جیهاد لە ڕێی تۆدا، هەرکەسێك دەستی بەر بکەوتایە هەستی بە گەرمی لەشی دەکرد[1].

### ٩٠٥. تەقوا و لە خوا ترسان بۆ وتاربێژ کاریگەرە

دکتۆر إسماعیل لە زانکۆی (إمام أعظم) لە کۆلێژ لەکاتی دەرس گوتنەوە بۆمانی باس کرد و گێڕایەوە: وتی برادەرێکم بۆی باس کردم کە ڕۆژێك چووم بۆلای شێخ مصطفی نەقشبەندی لە هەولێر، دەڵێت کاتێك چووینە ناو مزگەوت حەزرەتی شێخ چەند کەسێکی لە دەورە دانیشتبوو ئەویش چاوی لەسەر یەك دانابوو و چاوەکانی کردنەوە و دەستی بە وتار کرد و تەنیا وتی (اتقوا الله) لەخوا بترسن، دەستمان بە گریان کرد فەرمووی( یارەبی خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت بۆ خاتری ئایینی پیرۆزی خۆت و باوەڕی پیرۆزی باوەڕداران، تەقوا و ترسی خۆت بخەیە دڵمان بۆ ئەوەی موسڵمانان سوودی زیاتر بکەن لە وتارەکانمان بۆئەوەی ئومەتی حەزرەتی محمد (ﷺ ) لە گوناهـ و تاوان دوور بکەونەوە[2].

### ٩٠٦. دوعا گیرابوونی مامۆستا عبدالکریم المدرس (رحمه الله )

هەر دکتۆر إسماعیل بۆمانی باس کرد جارێکیان پیاوێك دەچێتە لای مامۆستا عبدالکریم المدرس، عەرزی مامۆستا دەکات و پێی دەڵێ: قوربان شەهوەت و ئارەزووم بەرامبەر ئافرەتان زۆرە و دوعایەکم بۆ بکە بەڵکو شەهوەتم دابەزێ. مامۆستاش دەستی بە پشتی کابرا داهێنا و ڕۆیشت، پاش دە ڕۆژ هاتەوە لای مامۆستا و عەرزی کرد قوربان ئەوە چ دوعایەکت لەمن کردووە؟ خۆمن بەرامبەر خێزانی خۆشم شەهوەتم نەماوە. مامۆستاش فەرمووی: ئەی بۆ نەتگوت خێزانم هەیە؟

### ٩٠٧. تێگەیشتنی ڕاست و درووست لە بابەتە ئایینیەکان

کابرایەك لەگەڵ ژنەکەی بوو بە دەمەقاڵێیان لەسەر عیبادەت کردن و خواپەرستی، کابرا تەلاقی خوارد کە دەبێ عیبادەتێك بکات هیچ کەسێك لەو کاتە ئەو

[1] ئەصحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، ب٢، ل ٤٩٦.

[2] لە دەرسی حقائق التصوف ڕۆژی چوارشەممە ٢٠١٤/١٢/١٧ دکتۆر إسماعیل بۆمانی باس کرد.

عیبادەتەی نەکردبێ لەسەر زەوی ، کابرا قسەکەی لەدەم دەرچوو و پەنجەی خۆی گەست کە چ هەڵەیەکی گەورەی کرد، خۆ ئەگەر هەر عیبادەتێك بکات لەسەر زەوی یەکێکی تر ئەو عیبادەتە هەر دەکات. چەندین زانای شەرعیی گەڕا هەموویان گوتیان تەڵاقەکەت کەوتووە چونکە ئەگەر هەر عیبادەتێك بکەی لەناو ئەو ملیۆنەها خەڵکەی سەر زەوی یەکێکی تر هەمان عیبادەت هەر دەکات. ئەو کابرایە گەیشتە خزمەتی ئیمام (أبو حنیفە ﵁) و ئیمام پێی فەرموو ئەگەر بچیە دەوری کەعبە لەوکاتەی کەسی لێ نیە تەلاقەکەت ناکەوی[1]، برۆ لەوکاتەدا کە کەس تەواف ناکات تۆ تەواف بکە و ئیتر تەڵاقەکەت ناکەوێ چونکە عیبادەتێکت ئەنجام داوە کە کەس نەیکردووە لەوکاتە[2].

### ٩٠٨. حاکم و دادوەری موسڵمان بە بەزەیی و دانایە

لە حەزرەتی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (﵁) دەگێڕنەوە کە: جارێکیان ئافرەتێك دێت بۆ لای و دەڵێت: من زینام کردووەتاوەکوحەددی لی دەرنەکا. حەزرەت دەفەرموێ: لەوانەیە لەوکاتەی کە ئەو پیاوە پەلاماری تۆی دابێت و زینای لەگەڵت کردبێ تۆ لەناو جێگاکەی خۆت خەوتبێتی و ئاگات لەخۆت نەبووبێ تا لەگەڵت جووت بووە یاخود زۆری لێکردبی و لەژێر فشار و زۆردا ناچار بووبی زینا بکەی[3].

### ٩٠٩. لێبوردەیی پیاوچاکان

دەگێڕنەوە جارێك شیخ بایەزیدی بوستامی شەوێك لە گۆڕستان دەگەڕایەوە، گەنجێك لە خانزادەکانی بوستام سازی دەژەنی و کاتێك شیخ نزیك بووەوە فەرمووی (لا حول ولا قوة إلا بالله) گەنجەکە سازەکەی بەرزکردەوە و لەسەری شێخیدا شکاند، شێخ گەڕایەوە حوجرەی خانەقا و پارەی سازە شکاوەکە و تەبەقێك حەڵوای بۆ گەنجەکە

[1] دیارە لەو کاتەدا بە شەوان دەوری کەعبەی پیرۆز چۆڵ بووە و وەکو ئێستا نەبووە کە هەردەم خەڵکی لێبی.

[2] ئاسوودەیی ئیسلام، ب ١، ل ٥٧٤.

[3] ئاسوودەیی ئیسلام، ب١، ل ١٦٤.

ناردەوە و فەرمووی: پێی بڵێن کە بایەزید داوای لێبوردن دەکات و دەڵێت سازەکەت لەسەری ئێمەدا شکاند ئەو پارەیە وەرگرە و یەکی تر بکڕە و ئەو حەڵوایەش بخۆ تاکو ئەو خەفەتە لەدڵت دەرچێت، گەنجەکە کاتێك ئەوەی زانی هات و بە پێی شێخدا نووسا و تۆبەی کرد و زۆر گریا[1].

### ٩١٠. هاوڕێی دڵسۆز

دوو هاوڕێ زەمەنێك لە سەفەر و شاردا بەیەکەوە بوون. دواتر بارودۆخێکی وا هاتە پێش کە دەبوایە لە دەریادا سەفەر بکەن. کاتێك کەشتییەکە گەیشتە ناوەڕاستی دەریا یەکێکیان لە سەکۆی کەشتییەکە کەوتە ناو ئاوەکە و نقووم بوو، هاوڕێکەشی دوابەدوای ئەو خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە و پاشان هەردووکیان ڕزگارکران و دوای سەعاتێك هەناسەیان هاتەوە بەر، یەکەم هاوڕێ بەوی تر وت: ئەوا من کەوتمە ناو ئاوەکە، تۆ بۆچی خۆت بە ئاو دادا؟ وتی: من بەبێ تۆ هەستم بەخۆم نەدەکرد و وام دەزانی کە تۆم[2].

### ٩١١. داپۆشینی عەیبی خەڵك

لە دەفیری باوکی هەیثەم کە نووسەری عوقبەی کوڕی عامر بوو (ﷺ) دەڵێت: گوتمە عوقبەی کوڕی عامر ئێمە دراوسێیەکمان هەیە شەراب دەخواتەوە و من داوام لەسەر تۆمارکردووە کەبێن بیبەن، عوقبە فەرمووی: هاوار بۆتۆ وانەکەی چونکە من گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە فەرموویەتی ( من ستر مسلماً فكأنما إستحيا موؤدة في قبرها ).

واتە: کەسێك عەیب و عاری کەسێکی تر بپارێزێت وەك ئەوە وایە کەسێکی زیندە بەچاڵی لەناو گۆڕدا هێنابێتە دەرەوە و ڕزگاری کردبێ[3].

---

[1] ڕەوشت بەرزی، ل ١٢٤.

[2] ڕەوشت بەرزی، ل ١٢٦.

[3] صفحات نيرات من حياة السابقين.

### ٩١٢. فەرمان ڕەوایی قورسە

دەگێڕنەوە ئیمامی عەباس داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە من بکە بە فەرمان ڕەوای قەومێك و پێغەمبەر پێی فەرمووو: مامە من تۆم کرد بە میری نەفسی خۆت. مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە تۆ ناتوانی بەسەر نەفسی خۆت زاڵ بیت، چۆن دەتوانی حکومەت و فەرمان ڕەوایی بەسەر خەڵکیدا بکەی[1].

### ٩١٣. گوێڕایەڵی ئافرەتان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

ژن و مێردێك هەبوون لەشاری بەناوەکانی ( مغیث ) و ( بریرة )، ڕۆژێکیان ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان و ژ نەکە دەتۆرێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە لای ژنەکە و پێی فەرموو: (یا بریرة لو راجعته) واتە: ئەی بورەیرە خۆزگە بگەڕایتایەوە لای موغیث یەکسەر ئافرەتە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمانم پێ دەکەی؟ ئەگەر ئەوە ژەهریش بێ دەیخۆم و بە قسەت دەکەم. پێغەمبەر فەرمووی: من تەنها داوات لێ دەکەم و زۆرت لەسەر ناکەم بۆ چوونەوەت ئەگەر ئارەزووت هەیە بمێنەوە. سەرنج بدەن ئەو ژنە چەندە لە مێردەکەی بێزارە و ناتوانی لەگەڵی بژی بەڵام ئەگەر فەرمانی پێغەمبەری خوای لەسەر بێ ئەوا بێ چەند و چوون دەچێتەوە لای و ناتۆرێ[2].

### ٩١٤. لە مەجلیس لەناو خەڵك دانیشە نەك لەسەر کورسی

عەرەبێکیان بردە خزمەتی خەلیفە و بینی خەلیفە لەسەر تەخت دانیشتووە و ئەوانی تر لە خوارەوەی وەستاون. عەرەبەکە وتی: السلام علیك یا الله. خەلیفە وتی: من الله نیم. وتی: السلام علیك یا جبرائیل. وتی: من جبرائیل نیم. وتی: الله نیت و جبرائیل نیت؟ کەوابوو بۆچی چویتە سەر ئەو کورسیە و بە تەنیا دانیشتووی؟ تۆش وەرە خوارەوە و لەناو خەڵك دانیشە[3].

---

[1] ڕەوشت بەرزی، ل ١٢٦.

[2] ئاسوودەیی ئیسلام، ب١، ل ٢٦٧ — ٢٦٨.

[3] ڕەوشت بەرزی، ل ١٥٠.

### ٩١٥. هۆکاری لەناو چوونی حکومەتەکان ( بەرپرسی لێنەهاتوو )

لە کتێبی مێژووی عەرەب دا هاتووە کە پاش ڕووخانی ساسانییەکان، بۆزۆرگمێهر ڕۆیشت بەرەو تەبەرستان پرسیاریان لێکرد کە هۆکاری کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی ساسانییەکان چی بوو؟ لە وەڵامدا گوتی: لەبەر ئەوەی کاری گەورەیان بە خەڵکی بچووك ئەسپارد و کاری بچووکیشیان دەدا بە خەڵکی گەورە، گەورەکان بە کارە بچووکەکان ڕازی نەبوون و بچووکەکانیش دەرەقەتی کارە گەورەکان نەدەهاتن و سەرەنجام هەموو هەوڵەکان تووشی شکست بوون[1].

### ٩١٦. گاڵتە بە کەس مەکە

زانای گەورەی ئیسلام ئیبن سیرین لە دوا ڕۆژەکانی ژیانی دا تووشی قەرزارییەکی گەورە دەبێت و قەرزاریی ژیانی لێ تاڵ دەکات و ئەویش بە خۆی دەفەرموێ: خۆم دەزانم بۆچی وام لێهات چونکە چل ساڵ لەمەو بەر بە کەسێکم گوت بڕۆ هەی موفلیس، چونکە لە مامەڵەدا ئیفلاسی هێنابوو. کە هات داوای یارمەتی لێکردم و گاڵتەم پێکرد گوتم بڕۆ هەی موفلیس! ئەوا منیش ئەمڕۆ بە چاوی خۆم ئیفلاسی خۆمم بینی! ئەبو سلێمانی دارانی کە ئەم قسەیە دەبیستێت دەفەرموێ: ئا حەقیان نییە، گوناهیان کەم بوو دەیانزانی دووچاری کام گوناه هاتوون، بەڵام ئێمە ئەوەندە گوناهمان زۆرە نازانین کامیان گیرۆدەی کردووین[2].

### ٩١٧. پیاوی ژنانی با نەیەتە لاتان

حەزرەتی ئوم سەلەمە دەفەرموێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی کردین لەوکاتەدا پیاوێکی ژنانی لەماڵمان بوو و گوێم لێبوو ئەو پیاوە قسەی بۆ عبداللە ی کوڕی ئەبی ئومەیە دەکرد و دەیگوت: ئەی عبداللە ئایا ئەگەر ڕۆژێك شاری طائف ڕزگار کرا و کەوتە دەستی موسڵمانان ئاگات لێبێ کچی فلانە کەسی لێیە، ئەوە سمت و شانیەتی، لە پێشەوە چوار لا و لە پشتەوە هەشت لایە لە قەڵەوی، پێغەمبەریش گوێی

---

[1] ڕەوشت بەرزی، ل ١٥١.

[2] ئاسوودەیی ئیسلام، ب١، ل ٢٨٨.

لیّ بوو و ئامۆژگاری کردین کە ئەو جۆرە کەسە ژنانیانە کە باسی کچ و ناموسی خەڵك دەکەن هاتوچۆتان نەکەن و نەیەنە ماڵتان[1]. (رواه البخاری و مسلم ٢١٧٩).

[1] ئاسوودەیی ئیسلام، ب١، ل ٤٥٧.